# میتافیزیک



## ئەرستۆ تالیس



وەرگێڕانی: سیدۆ داود عەلی

لـــــــــــەبڵاوکراوەکـــــانی خانەی چاپ و پـــەخشی ڕێنما

زنجیرە.١٦٥)

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: میتافیزیك

بابەت: فەلسەفە

نوسینی: ئەرستۆتالیس

وەرگێڕانی: سیدۆ داود عەلی

دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩ سلێمانی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ناونیشان: سلێمانی ـ بازاڕی سلێمانی ـ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: .٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، .٠٧٥٠١١٩١٨٤٧ )



# پێرست



کتێبی یەکەم:

"ئالفـــای گەورە"

## کتێبی دووەم:

## "ئالفای بـــچووك"



## کتێبی سێهەم:

## "بـــــێتــــــا"



## کتێبی چوارەم:

## "گـــــامــــــا"

## کتێبی پێنجەم:
## "دەڵـــتـــــــا"

## کتێبی شەشەم:

## "ئێپسیــــلۆن"



## کتێبی حەوتەم:

## "زێـــــــتا"

## کتێبی هەشتەم

## "ئـــــێتـــا"



## کتێبی نۆیەم:

## "سێتـــــــا"

## کتێبی دەیەم:

## "یـــــــــوتا"



## کتێبی یانزەیەم:

## "کاپـــــــا"

## كتێبی دوانزەیەم:

## "بێ بـــــــــنەما"

## کتێبی سیانزەیەم:
## "مـــــــــوو"



## کتێبی چواردەیەم:
## "نــــــــــو"

# پێشەکی:

کتێبی((میتافوسیکا)) لە نێوان بەرهەمەکانی ئەرستۆدا، یەکێکە لە هەرە قورسترینیان، ئەم قورسیەش بۆ چەند هۆکارێك ئەگەڕێتەوە، کە ئێمە لە پێش گوتارەکەی وەرگێڕدا ئاماژەمان بە هەندێکیان داوە، بەڵام ئەتوانین بڵێین کە گرنگترین هۆکاری ئەم قورسیە شێوازی تێڕوانین ودارشتنی پەخشان و نووسینی یۆنانیە، بەرجەستەترین خەسڵەتی نوسینەکانی ئەرستۆ، بەتایبەتی لەم کتێبەدا،خوازیاری خودی دەربڕینی ئەرستۆیە بۆ ئەوەی کە بە قورسی چەمکە فەلسەفیەکان دەرببڕێت، قورسیەك کە هەندێ جار تێك ئەچێت، هۆکارە سەرەکیەکەشی ئەوەیە کە ((ئەرستۆ)) هەندێ لە وەرزەکانی ئەم کتێبەی بەشێوەی یادداشت و بەمەبەستی وانە واتنەوە و قسە کردن بۆ فێرخوازەکان و بیسەرەکانی لە زەمەنە جیاجیاکاندا و هەندێ جار سەردەمی زۆر درێژ کە تەنانەت چەند ساڵێکیان لە خۆ گرتووە، فەراهەم کردووە و سەرەنجام خۆیشی فریای ئەوە نەکەوت کە رێکیان بخات و هەر لەبەر ئەمەش رێکخستنی زۆرێك لە بابەت و مەبەستەکانی بەتەواوی و بە شێوەیەکی سەربەخۆ رێك نەخراون.

لە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە فارسیەدا،وەرگێڕ هەوڵی داوە کە تائەندازەی پێویست((رەسەنایەتی نووسینە یۆنانیەکە)) و زمانە((دەربڕەکەی)) ئەرستۆ بپارێزێت، زۆرینەی وەفاداری و پەیڕەوی و پارێزگاری لە بەرامبەر نووسینە یۆنانیەکە،و رەوانی و خۆش خوێنی و رێکخستن لەلایەن وەرگێڕە فارسیەکەوە،پەیڕەوی لێ کراوە، تا زمانە زانستیە ووشکەکەی ئەرستۆ،((بتێگەیشتنرێت،))[1] بەتایبەتی هەوڵ دراوە کە بەدەر لەو مەسەلانەی کە واتایی و خەیاڵێتیەکەیان دارشتنەکەی ئەرستۆ قورس وگران ئەکات، هیچ زیادەیەك نەخرێتە سەر پێکهاتەی دێرەکان،ئەتوانین بڵێین کە زۆرترین وەرگێڕانەکانی ئەم کتێبە لە زمانە ئەوروپیەکاندا،وەرگێڕانێکی لێکدانەوەیین، واتە نوسینەکەی ئەرستۆییان مانا کردۆتەوە، واتە ئەوەی کە خودی وەرگێڕ لە نوسینەکە

---

[1] وای لێ بکرێت کە شایەنی تێگەیشتن بێت.

تێگەیـــشتووە، هـــەر وەك دارشـــتەیەکی تازە،دایرشـــتوەتەوە و هەنـــدێ دەربـــڕین و ڕونکردنەوەی هێناوەتە ناو باسەکە، لەگەڵ ئەوەشدا، بەو شێوەیەی کە ئاماژەی بۆ کرا، ئـەم ئیـشە بـە سـەرنجدانی شـێوەی دارشـتن و خەسـڵەتی یاداشـتێتی هەنـدێ لـە مەبەستەکانی ناو کتێبەکە، هەندێ جار نەتەنیا بەسود بەڵکو پێویستە و لێرەشەوەیە ڕونکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر بەرهەمەکانی ئەو بەتایبەتی ئەم کتێبەی،هەر لە ڕۆژی مردنیـەوە تـا هەنوکە هاتونەتە ئاراوەو، بەردەوامن، بەم شێوەیە ((وەرگێڕ))یش هەنـدێ جـار ناچـار بـووە کـە دەربڕینـەکان یـان واژە گـەلێکی زیـادە و ڕونکـەرەوە، بـۆ نووسـینەکەی ئەرسـتۆ زیـاد بکـات یـان بخاتـە نـاو کەوانـەوە تـا تێگەیـشتنی بابەتەکـە ئاسانتر ببێت.

وەرگێـر هـەوڵی داوە کـە لەبەرامبـەر دەسـتەواژە یۆنانیـە فەلـسەفیەکانی ئەرسـتۆ،تا ئەگەرێکی زۆر هەمان دەستەواژەو دەربڕینانەکان و هـاوپێچ لـە زمـانی فارسـی و عـەرەبی بەکاربهێنێت، کە هەموو یان هەندێك لەوانە وەرگێرە کۆنەکانی عەرەب یان فارسەکان یان ئەوانـەی کۆتـایی لـە فەیلەسوفەکانی ئیسلام بـەکاریان هێناون،لەگـەڵ ئەوشـدا لەهەنـدێ شوێندا کە ناچار بووەو، دریغی لەوە نەکردووە کە هاوبەرامبـەرێکیان لـە زمـانی فارسـی پەتیدا بۆ بەکاربهێنێت،لەهەنـدێ لـە مەسـەلەکاندا ئیشمان لەسـەر بنچینەناسی و رەگ و ریـشەناسی و بەدواداچـونی دەسـتەواژەکانی ئەرسـتۆ کـردووە، لـەم شـێوە بوارانـەدا مەبەسـت لـە ڕێکخستنی هاوبەرامبەریـە فارسیەکان،پیشاندانی وردبینـی دەربڕینـەکانی ئەرسـتۆیە کـە دواتـر لـە وەرگێرانـە جۆراوجۆرەکـانی تریـشدا وون بـوون، وەرگێـر بـە مەبەسـتی هاوکـاری، خوێنـەر، بـۆ هـەر وەرزێـك لـە کتێبـە چواردەیینەکە،ناونیـشانێکی هەڵبـژاردووە، کـە ناوەرۆکـە سـەرەکیەکەی هـەر وەرزێـك پیـشان ئـەدات،و لەسـەرتاپای وەرگێرانەکـەدا ژێـر نووسـەکان یـان پـەراوێزەکان چـەند روونکردنەوەیـەك لـەخۆ ئـەگرن لەبارەی هەنـدێك لـە نوسینەکانی نـاو کتێبەکـە و ئـامـاژە بـە مەبەسـتە وەك یەکـەکان یـان تەواوکـەرەکانی مەبەسـتەکە، لـە سـەرتاپای ئـەم کتێبـەی ئەرسـتۆ، یـان لـە نوسـینەکانی تریدا، وهاوکات راگەیاندنە مێژوییەکان وسەرچاوەی بڕواکان و گوتەکان، گونجێنراوە.

لێـرەدا بـۆ ئامـادەکردنی هـزری خوێنـەرەکان،ئامـاژە کـردن بـەم خاڵانـە پێویـستە بگەرێنـەوە بـۆ بـەناوبانگترین و پربایـەخترین نووسـراوی چـاپی هـەموو بەرهەمـەکانی ئەرسـتۆ کـــە لەســـەدەی پێـــشترەوە تـــا هەنووکە،تـــەنیا سەرچـــاوەیەکی گـــشتی ئەرستۆناسەکان و وەرگێرەکـان و توێـژەروان بـووەو هەیـە لـەبارەی ئەرستۆ، نوسراوێك کە زانا و توێژەری زمانناسی ئەڵمانی((ئیمانوێل بیکەر)Immanuel Bekker ١٨٢١-

١٨٧٠)لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای شاهەنشایی پروسیا لە بەرلین، لە نێوان ساڵەکانی ١٨٣١تا١٨٣٦، چاکسازی تێدا کردووەو بڵاوکردۆتەوە،[1] لەوکاتەوە تاهەنوکە ژمارەی لاپەڕەکان ،ستونی نوسینەکان و ژمارەی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لەم نوسینەدا و لەم کۆمەڵەیەدا، لەلایەن توێژەروان و وەرگێڕەکانی ئەم چاپەوە گواستراوەتەوەو بگەڕێنەوە بۆیان.ئەم وەرگێڕەش لەسەر بنەمای((میتافیزیک))ی ئەرستۆی ئەم کۆمەڵەیە ئەنجام دراوە.

لە((سەرو سروشت))لەماوەی سەد و چەندێك ساڵی رابردوو چەندین وەرگێڕان بە چەندین زمانی ئەوروپایی ئەنجام دراون، کە لەو نێوانەدا وەرگێڕ لەم وەرگێڕانانەی ژێرەوە سودی بینیوە کە زمانەکانی(( ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی))ن:

١-Aristotle, metaphysik INS Deutsche ubertr, von, A, lasson, Jena ١٩٠٧, ١٩٢٨.

٢-Aristotles, metaphysik .uberstzt von f.bassenge, berlin ١٩٦٠

بەرگی هەشتەم لە وەرگێرانی کۆمەڵە بەرهەمەکانی ئەرستۆ بە ئینگلیزی

٣-W.D.Ross, metaphysica ٢nd, Ed, oxford ١٩٦٠

نووسینە یۆنانیەکەی ((میتافیزیك)) لەگەڵ پێشەکی و رونکردنەوە لەهەمانRoss

٤-Arstotle s metaphysics.A, revised text with introduction and commentary, ٢nols-oxford ١٩٢٤, ٢nd, Ed, ١٩٥٨.

نووسینە یۆنانیەکە لەگەڵ وەرگێڕانی ئینگلیزی:

٥-Arstotle, the metaphysics, with an English translation BT H.tredennick, and G.C.Armstrong.the leob classical library ٢vols.١٩٦١, ١٩٦٢.

[1] ناو نیشانی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە بەم شێوەیەیە:لەم کۆمەڵەیەدا بەرگی یەکەم و دووەمی بەرهەمەکانی ئەرستۆ، بەرگی سێهەمی وەرگێرانی لاتینی سەدەکانی ناوەراست و سەرەتەمی رێنیسانس لەبەرهەمەکانی ئەرستۆ، بەرگی چوارەم پەراوێزەکان، و بەرگی پێنجەم بەشە پاشماوەکان لە بەرهەمە وون بووەکانی ئەرستۆ لەخۆ ئەگرێت،ناوەرۆکی((میتافیزیك))لەبەرگی دووەم لە لاپەرە ٩٨٠ تا١٠٩٣ لە دوو ستوونی a(ئالف)وb(ب)ی لەخۆ گرتووە، چاپی ئۆفستی دووەمی ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٦١ لە لایەن بڵاوکراوەی(w.de.gruyter) لە(بەرلین) چاپ کراوەتەوە.

نووسینە یۆنانییەکەی ئەم چاپە بەکار هێنراوە لەم وەرگێڕانەدا

٦-Aristotle, metaphysics-Newly Trans, as a postscript to natural science …by R.Hope, New York ١٩٥٣.

٧-Aristotles, metaphysik, schriften zur Ersten philosophie, ubersetzt von Franz schwarz, Philipp Reclam, Struttgart ١٩٧٠.

٨-Aristotle, La Metaphysique, nouvelle Ed, aveecommentair par J. Tricot ٢vols, Paris ١٩٦٤.

٩-Aristotle s metaphysics, translated with commentary and glossary by.G.Apostle Bloomington, London ١٩٦٦.

١٠-Aristotle s Metaphysik ,Griechisch-deutsch,in der Uberset zung hermann Bonitz,Neu Bearbitet,mit Enleitung und Kommentar,herausgegeben von horst seidl,Griiechischer text in der Edition von Wilhelm christ.Felix Meiner Verlag,٢Bande ,١٩٧٨-١٩٨٠.hamburg.

تەنیا وەرگێڕانە عەرەبییەکەی کتێبی یەکەم تا دوانزەیەم (کتێبەکانی یانزەیەم و سیانزەیەم و چواردەیەم بەوەی کە دیارە بە عەرەبی نەنوسراونەتەوە) لە ناوەرۆکی ((لێکدانەوەی سەروسروشت)) لە (ابن رشد) گەورە فەیلەسوفی ئیسلامی،٢ بەرگ بە هۆی توێژەری فەرەنسەیی((موریس بویژ Maurice Bouyges) لە ماوەی نێوان ساڵەکانی(١٩٢٤ و ١٩٤٢ ش و ە ساڵی ١٩٦٨ لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی((کتێبخانەی عەرەبی ئسکۆلاستیکی)) لە((بەیروت)) بڵاوکرانەوە.

وەرگێر هاوکات لە پێشکوتارێکی دوورودرێژدا پێداچوونەوەیەکی مێژوویی لەبارەی ((میتافیزیک)) کردووە و توێژینەوەی رابردووەکان و هاوچەرخەکان و لەگەڵ ئەوەشدا ناوەرۆکی هەریەکە لە چواردە کتێبەکە و روونکردنەوە و لێکدانەوەی مەبەستەکانیان و سەرەنجام،خۆی سەرقاڵی مەسەلە ڕەسەن و گرنگەکانی((فەلسەفەی یەکەمین))(فەلسەفەی یەکەمین،زانستی گشتی،زانستی بەرزتر) و((تئۆلۆژی یان خوداناسی)) ئەرستۆ کردووە، بژاردەیەك لە گرنگترین توێژینەوەکان لە زمانە ئەوروپاییەکان لە پێرستی کتێب ناسی ئەرستۆ ولە کۆتایی کتێبەکە گونجێنراوە.

# ئەرستۆ( ٣٨٤ -٣٢٢ق )

## بەشی یەکەم: ژیانی ئەرستۆ

ناوە یۆنانیەکەی ئەو( ئەریستۆتێلیس) کە عەرەبەکان پێی ئەڵێن (ئەرستاتالیس،ئەرستۆتالیس، ئەرستالیس،ئەرستاتیلیس، و ئەرستۆتیلیس)، لە ژیاننامەی ئەرستۆ ئێستاکە چەند نوسراوێکی یۆنانی و سریانی ولاتینی و عەرەبی لەبەر دەستدایە، لە نێوان ئەمانەدا گرنگترین سەرچاوەی ژیان و سەرگوزەشتەی ئەرستۆ و بەرهەمەکانی ئەو لە سەردەمی کۆنەوە بە ئێمە گەیشتون، ئەمانەن:

١. کتێبی دیۆگنس لائیرتیۆس بەناوی(ژیاننامەی و بڕوای فەیلەسوفە گەورەکان) لە ١٠ کتێبدا،کتێبی ٥ بەشەکانی ١-٣٥.
٢. (ژیاننامەی ئەرستۆ) لە هێسۆخیۆس سەدەی ٥م.
٣. (ژیاننامەی ئەرستۆ مارسیانا).
٤. (ژیاننامەی ئەستۆ و ڤولگاتا).
٥. (ژیاننامەی ئەرستۆ) بەلاتینی.
٦. دوو(ژیاننامەی ئەرستۆ) بە سوریانی.
٧. چوار(ژیاننامەی ئەرستۆ )بە عەرەبی( لە پێرستی ابن ندیم،مختار الحکم و محاسن الکلم ابن فاتك، تاریخ الحکمة قفطی عیون لانباء ابن ابی اصیبعة).

سەرچاوەی سەرەکی هەموو ئەمانە، لە لایەکەوە(ژیاننامەی ئەرستۆ لە هێرمیپۆس(دح ٢٠٠ پ.ن)کۆتا ژیاننامە نوسی گەورەی سەردەمی (هلینیسم)، پەیرەوکاری فەلسەفەی ئەرستۆ و بەڕێوەبەری کتێبخانە بەناوبانگەکەی ئەسکەندەرییە،

و لەلایەکی ترەوە(ژیاننامەی ئەرستۆ) لە (پتۆلیمایۆس) کە لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا ناوی بە(بطلمیوس الغریب) هاتووە.

لەم نێوانەدا ژیاننامەکەی دیۆگنس,و ژیاننامەی کورتەکەی هێسوخیۆس،فەرهەنگ نووسە بەناوبانگەکەی ئەسکەندریە، لە سەرچاوە گەلێکی تر سودیان بینیوە، لەبارەی (پتولمایۆس) زانیاریەکی زۆر لەبەر دەستدا نیە، لێکۆڵەرەوەکان ماوەیەکی زۆر ئەویان لەگەڵ (پتولمایۆس خنوس) کە یەکێك بوو لە ئەندامانی قوتابخانەی( ئەرستۆگەرا ئەسکەندەرییەکان)ی سەرەتای ئیمپراتۆری رۆم،(نیوەی سەدەی یەك و نیوەی سەدەی دوو.ز) بە یەکێك ئەزانی. بەڵام دوای ئەم بروایە لەلایەن ئەرستۆ ناسی گەورەو بەناوبانگی هاوچەرخ( ئینگمار دورینگ) (د ١٩٨٤ .ز) رەت کرایەوە، بە بڕوای ئەو، ئەو کەسە کە لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا کە بە (بطلیموس الغریب) ناوی هاتووە،(پتۆلیمایۆس کسینۆس)(بێگانە)، یەکێك لە پەیڕەوانی قوتابخانەی (ئەفلاتونیە نویێ یەکان)ی ئەسکەندەریەیە، کە ژیاننامەی ئەرستۆی لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٣.ز) دا نوسیوە، وە نازناوی (الغریب) لەوەوە دراوە بە سەریدا کە تا بە هۆیەوە لە ناوی(بطلیموس)ی دانەری کتێبی(المجسطی)،جیا بکرێتەوە و بناسرێتەوە،(لاپەرە ٢٩٨ بە دواوە،٤٦٩ بە دواوە،٤٧٢-٤٧٤) دورینگ هاوکات ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە(٣) ژیاننامە تازە ئەفلاتونیەکەی مارسیانا، و ڤولگاتا، و لاتینی،(ژمارە٣,٤,٥,) کورتکراوەیەکن لە ژیاننامەکەی (بطلیموس) و دوو ژیاننامە سوریانەکە کورتەیەکی ترن لە هەمان ئەو ژیاننامەیە، و تا ئەندازەیەکی زۆر بۆ هەمان سەردەم ئەگەرێنەوە، هاوکات ٤ ژیاننامە عەرەبیەکەی ئەرستۆ، کورتەیەکن لە وەرگێڕاوە عەرەبی و سوریانیەکەی ژیاننامەکەی (بطلیموس الغریب)ن،(لاپەرە ٤٧٢-٤٧٤) نوسراوە یۆنانیەکەشیان لەناو چووە و وەرگێڕانە عەرەبیەکە لە وەرگێڕانە سوریانیەکەوەن و تا رادەیەك ئەتوانین بڵێین کە هی( اسحاق بن حنین)ە(٩١١.ز).

بەو شێوەیەی کە ئاماژەی پێ درا، ژیاننامەی ئەرستۆ لە چوار سەرچاوەی عەرەبیدا هاتووە.

١. فهرست ابن ندیم(لاپەرە ٢٤٦-٢٥٢)
٢. مختار الحکم و محاسن الکلم ابن فاتك(لاپەرە ١٧٨-١٨٤).
٣. تاریخ الکحمة قفطی(لاپەرە ٢٧-٤٩).
٤. عیون الانبة ابن ابی اصیبعە(٢/٥٤-٦١).

ئەڵێن کە ئەم چوار ژیاننامەیە کورتەیەکن لە ژیاننامەی عەرەبی(بطليموس الغريب)، هەرچەندە لە هەندێك لەوانەدا چەند خاڵێك دەست ئەکەون کە تا رادەیەك لە چەند سەرچاوەیەکی ترەوە هێنراون، نوسراوە راستەقینەکەی ژیاننامەی(بطليموس الغريب) کە هەموو سەرچاوەکانی تری عەرەب سودیان لێ بینیوە، تا ماوەیەك لەمەوبەر بەدەست نەهێنرابونەوە، تەنیا دەست نوسێکی کە مابوو لە کتێبخانەی(ایا صوفیه)ی ئێستاکە لە کتێبخانەی (سليمانيه استانبول) بە ژمارە(٤٨٣٣) بە دەست هێنرایەوە، کە وێنەکیمان لایە، ئەم دەست نوسە کۆمەڵە نوسراوێکە کە بەرهەمەکانی ئەفلاتوون و فەلسەفەکەی و ژیاننامەی ئەرستۆ و بەرهەمەکانیشی و کورتەیەك لە فەلسەفەی ئەرستۆ کە دراوەتە پاڵ فارابی، تێدایە، لەم کۆمەڵەیەدا ژیاننامەی ئەرستۆ و نووسینەکانی بەرگی(١٠ تا ١٨ ئەلف) لە خۆ ئەگرن، هەڵە و لادانێکی زۆر لەم نوسراوانەدا لە لایەن(نوسەرەکەیەوە) بەرچاو ئەکەون، نوسراوەکە لە دوای هێنانی ناوی خودا بەم شێوەیە دەست پێ ئەکات،(هذا(هذة) مقالة بطليموس و فيها وصية ارسطوطاليش فهرست كتبة و شيء من اخبارة الى (غلس)(گالوس).

پاشان نوسەر ئەنوسێت کە لەبەر ئەوەی گالوس لەوی خواستوە، تا کتێبێك لە بارەی نوسینەکانی ئەستۆوە دابنێت، ئەو نوسراوێکی کورت لە بارەی ئەرستۆوە ئامادە ئەکات و لە دەربڕینی ئامانجی ئەرستۆ لە نووسینەکانی، بە هۆی قورسی زمانەکەی، کەمێك خۆپارێزی کردووە، پاشان ئاماژە بە نوسراوەکەی (ئەندرۆنیکۆس رۆدیسی) ئەکات و ئەڵێت کە ئەم نوسراوە هەوڵی خودی خۆیەتی و کتێبێکی تاك و تەنیایە کە ئەو لە نووسینیدا یارمەتی لە کەس نەخواستووە، چونکە نوسراوەکەی ئەندرۆنیکۆسی لەبەر دەستدا نەبووە، لەبەر ئەوە نوسینەکەی ئەو نابێتە بەربەست لەوەی کە گالوس سود لە نوسراوەکەی ئەندرۆنیکۆس ببینێت، چونکە،ئەندرۆنیکۆس لە نوسراوەکەی خۆیدا ناوی زیاد لە هەزار بەرهەمی ئەرستۆ ئەبات لە کاتێکدا (بطليموس)زۆر لەوە کەمتر باس ئەکات،(گ ١١ ئەلف) بەتلیمۆس پاشان بە کورتی باسی ژیانی ئەرستۆ ئەکات و دەست ئەکات بە گێڕانەوەی وەسیەت نامەکەی ئەرستۆو و پاشان ناوی پێرستی نوسینەکانی ئەهێنێت.

بەراوردی ژیاننامە سوریانیەکەو عەرەبیەکەی ئەرستۆ لەگەڵ باقی ئەو ژیاننامانەی تر کەناویان برا، ئەوە پیشان ئەدات کە ئەتوانین ئەوانە بە تەواوکەری یەکتری بزانین،لە کاتێکدا کە خودی ژیاننامە سوریانیەکە گرنگیەکی لەو شێوەیەی نیە، ژیاننامە عەرەبیەکە برێکی زۆر لە زانیاری کەڵەکە کراو لەخۆ ئەگرێت کە زۆریش گرنگن،

هەرچەندە کە لاف وگەزافی ئەفسانە شێوەیی لێ نەبڕاوە لە بارەی ئەرستۆوە، و لەگەڵ ئەوەشدا تەنراوە بە هەڵەو هەڵە تێگەیشتن و لادان و وەرگێڕانی نادروست کە هەمویان بۆ ئەوە ئەگەڕێنەوە کە شێوازی روبەڕوو بونەوەکە لەگەڵ ئەرستۆ و بەرهەمەکانی، رەخنەگرانە نەبووە، مەبەست زیاتر گەورە کردن ئەرستۆ بووە، واتە خوازیارییەك لە سەرچاوەی ئەفلاتونیە تازەکاندا ئەبینرێت و لەناو(بطليموس الغريب)دا زیاتر.

لێرەدا ئەبێت ئامارە بۆ ئەو خاڵە بکەین کە زۆربەی دارشتنەکانی ناو سەرچاوە عەرەبیەکان لەبارەی ژیاننامەی ئەرستۆ لە ناوەرۆکی (بطليموس الغريب) وەرگیراون، پێش گوتارەکەی کە خاڵێکی زۆر گرنگە، لابراوە، ئەگەر ئەو پێشگوتارە لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بەتەواوی بهاتایە، ئیشی لێکۆڵەرەوان لەبارەی ئەرستۆوە زۆر ئاسانتر ئەبوو، و ئیدی جێگایەك بۆ گومان و هەڵهێنجانی دژ نەدەمایەوە، و لە ئەنجامدا بڕواکان جیاوازیەکی لەو شێوەیەیان بە خۆوە نەدەبینی، ئێستا ئەم خاڵە روون ئەبێتەوە کە بە پێچەوانەی ئەوەی کە تا ئێستاکە زۆربەی توێژەرەوان باوەڕیان پێی بووە، نوسینی (ئەندرۆنیکۆسی رۆدیسی) ئیشی (بەتلیمۆس ) نەبووە، و ئەو پێرستە تایبەتەی کە ئەو لەبارەی بەرهەمەکانی ئەرستۆوە ئامادەی کردووە، بەدەرو جیایە لەو پێڕستەی کە لە نوسینەکەی ئەندرۆنیکۆسیدا هاتووە.

لێرەدا ئێمە بە سود وەرگرتن لە هەموو ئەو سەرچاوانەی کە باسی ئەرستۆیان کردووە، هەوڵ ئەدەین کە تا ئەندازەیەکی زۆر ژیان وسەرگوزەشتەی ئەرستۆ بخەینە روو:

ئەرستۆ لە هاوینی ٣٨٤ پ.ز لە شاری (ئستاگیرا) لە دوورگەی خالکیدیکە، لە باکوری دەریای (ئەژە) لە ناوچەکانی ((توراکیا)) لەدایك بووە، باوکی ئەرستۆ ناوی (نیکۆماخۆس) و دایکی (فایستیس)ە، باوکی بۆ نیکۆماخۆسێکی تر ئەگەڕێتەوە کە لە وەچەی(ماخائۆن) کوڕی(ئاسکیلیپس) بووە، ناوی ئەم دوانە لە ریزی قارەمانەکانی( ئیلیاد)ەی (هۆمیرۆسن) داهاتووە، دایکی ئەرستۆش هەر لەو وەچانە بووە، باوکی ئەرستۆ هاورێ و پزیشکی پادشای مەقدونیە، بەناوی(ئامونتاسی سێهەم)(٣٩٣-٣٧٠پ.ن) بووە، و ئەڵێن کە پیاوێکی زانا بووە، و نوسراوی زۆری لەبارەی سروشت و پزیشکیەوە نوسیوە، ئەو خاوەنی ژیانێکی بەختەوەرو سامانێکی زۆر بووە، باوکی ئەرستۆ لە نزیك ساڵەکانی(٣٦٧ پ.ن) و دایکیشی لە لاوێتی ئەرستۆدا مرد، و (پۆرکسینۆس) مێردی خوشکەکەی ئەرستۆ، سەرپەرشتی ئەوی گرتە ئەستۆ، ئەو لە

خووشـكەكەی ئەرسـتۆ كـوڕێكی هـەبوو بـەناوی (نیكـانۆن) كـە ئەرسـتۆ لـە وەسـیەت نامەكەیدا چەندن جار ناوی هێناوە،

لە سەردەمی منداڵی ولاوێتی ئەرستۆ، زانیاریەكی زۆر بەدەستەوە نیە بەلاّم لەوێوە كە باوكی پزیشكی ئامونتاس بووە، ئەتوانن بڵێین كە ئەو سەردەمی منداڵی لە شاری (پێلا) پایتـەختی(مەقدۆنیـە) بەسـەر بـردووە، و هـەر لـەوێش یەكـەمێن شـتەكانی فێـر كراوەو فێر بووە، لە هەمو ژیاننامەكانی ئەرستۆدا ئەوترێت كە لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا لەگەڵ (پركسنس) –كە ئەڵێن لە هاورێكانی ئەفلاتون بوە– هاتۆتە (ئاتن) و چووەتە ناو بازنـــەی فێـــر خوازەكـــانی ئەفلاتوونـــەوە و لـــە قوتابخانـــە تایبەتەكـــەی ئـــەودا بـەناوی(ئـەكادیمیا) دەسـتی كـردووە بـە خوێنـدن و لـەویَ بـۆ مـاوەی(٢٠) سـاڵ ماوەتەوە(مایەوە).

ئـەبێت ئامـاژە بـەوە بكـەین كـە ئەرسـتۆ لـە بەهاری ٣٦٧ پ.ز هاتـە ئـاتن، ئـەفلاتون پێش ئەوە سەفەری كردبوو بۆ(سیسیل) لـە دوورگـەی(سیراكۆس) و لـە نـەبوونی خۆیدا قوتابیـە ناسـراوەكەی خـۆی(ئودۆكـۆس)ی كردبـوو بـە جێگـری خـۆی و بەرێوەبـەری ((ئەكادیمیا))، ئـەفلاتوون لـە ٣٦٥-٣٦٤ پ.ز گەرایـەوە بۆ ئـاتن، بەم شـێوەیە ئـەتوانین بڵێین كە ئەرستۆ لەماوەی پاش ٣ ساڵ چوونە ناو ((ئاتن))، توانی ئـەفلاتون ببینێت، و بڕواتە ناو ئەكادیمیاكەیەوە،دەی ئەو لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا چی كردووە؟ لە هەندێ لە سەرچاوەكاندا بەتایبەتی(مختار الحكم) هـاتووە كە ئەرسـتۆ پـێش ئـەوەی بڕواتـە نـاو ئەكادیمیاكەی ئەفلاتون، دەستی كردووە بە فێر بوونی ((شیعر)) و((نحو)) قسە كردن و پاشـان ڕوی لـەویَ كـردووە:(ابـن فاتـك،لا ١٧٩-١٨٠) لـە لایـەكی تـرەوە ئـەزانین كـە لـەو سەردەمەدا، قوتابخانەی(گوتـار بێژی) ومامۆستا بەناوبانگەكـەی(ئیسۆكراتێس)(٤٣٦-٣٣٨)پ.ز لە ئاتن، گرنگی و بەهایەكی زۆری هەبووە، و فێرخوازێكی زۆریشی لە هەموو سـەرزەمینەكانی یۆنـانی هـەبووە، بابـەتی سـەرەكی فێركاریـەكانی (ئیـسۆكراتێس) گووتاربێژی سیاسی بووە، بەم شێوەیە، ئەتوانین دابنێین كە ئەرسـتۆ پـێش ئـەوەی لە ئـەكادیمیا نـاونووس بكـات، ماوەیـەك لـە قوتابخانـەی ئیسۆكراتێس خـۆی سـەرقاڵی فێربونی هوونەری گوتاربێژی (گوتار ورەوانبێژی) كردبێـت، لە لایـەكی تـرەوە لـە(مختار الحكم) دا هـاتووە كـە ئەرسـتۆ كاتێك كە چووە نـاو ئـاتن لـە شـوێنێك بەناوی (لۆكیـۆن) گیرسـایەوە. كـە سـەیرانگایەك بـوو لـە بەشـی خۆرهـەڵاتی ئـاتن(سەرچـاوەی پێـشوو ،لا ١٧٩) بـە پێـی گێڕانـەوەكان ،قوتابخانـەی ئیـسۆكراتس لـە نزیـك (لۆكیـۆن)ەوە بـووە، هاوكات لە گێڕانەوەكاندا هـاتووە كە سەرەتای چالاكیە ئەدەبیـەكانی ئەرسـتۆ لە بواری

گووتار بێژی دا بوون، و یەکەمین نوسراوی ئەو(گرۆلۆس)( لەبارەی گووتاربێژی )ی بووە، و نوسراوێکی تری وون بوو بەناوی (پۆرتریپتیکۆس)( خوازیاری بۆ فەلسەفە)ی هەبووە، کە ئەتوانین بە نوسراوێك لە دژ و رەخنەی فێرکاریەکانی ئیسۆکراتس بزانین بۆ نوسراوی(ئانتی دۆسیس)(گۆڕینەوە یان دانەوە)، کە تیایدا بڕواکانی ئەرستۆ رەت کرابوونەوە، بە هەر شێوەیەك بێت، تارادەیەك ئەتوانین بڵێین کە ئەرستۆ پێش ئەوەی بڕواتە ناو ئەکادیمیا، ماوەیەك بۆ قوتابخانەی ئیسۆکراتس لە هات چۆدا بووە.

بەو شێوەیەی کە ئاماژەمان پێ دا، ئەرستۆ ٢٠ ساڵ لە لای ئەفلاتوون وەکو ئەندامێك و بەشێك لە ئەکادیمیا ژیانی فێرخوازی بردەسەر، لە چەندین دارشتەدا هاتووە کە ئەفلاتون، لە نێوان فێرخوازەکانی دا سەرنجێك و دڵ هەڵواسراوییەکی تایبەتی بۆ ئەرستۆ هەبووە، و ئەوی بە ژیرترین و بە تواناترین فێرخوازی خۆی ئەژمار کردووە، ئەڵێن کە ئەفلاتون وانەکانی خۆی بە بێ ئامادەیی ئەرستۆ نەدەووتەوە، و وتویەتی کە((راوەستن تا هەموویان بێن)) و بەهاتنی ئەرستۆ وتوویەتی کە((ئێستا خوێندن دەست پێ بکەن چونکە هەمووان هاتون و هەمووان ئەبیستن)) یان زۆر جاری تر ووتویەتی کە(( وانەکان دەست پێ ناکەین تا (ئەقڵ) نەیەت)) هەرکاتێك ئەرستۆ لە دانیشتنەکەدا نەبوایە، ئەفلاتون وتویەتی(ئەقڵ ئامادە نیە)) ئەفلاتون هاوکات ئەوی بە ((خوێنەری کتێبەکان)) ناو ناوە، ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە ئایا ئەرستۆ ماوەی ٢٠ ساڵ کە لە قوتابخانەی ئەفلاتوون بوو، تەنها فێرخوازێك بووەو بەس، یان بیریشی کردۆتەوەو نووسیویەتی؟

وتویانە کە ئەرستۆ پێش ئەوەی بڕواتە ناو ئەکادیمیا، ئەو سەردەمەی کە بە تەواوەتی روون نیە، لە هات وچۆی قوتابخانەکەی ئیسۆکراتس دا بووە، لێرەدا ئەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئیسۆکراتس و هاورێکانی لە نەیارە سەرسەختەکانی ئەفلاتون و ئەکادیمیا بوون.

ئەرستۆ لە دوای واز هێنان لە قوتابخانەی ئیسۆکراتس و چوون بۆ ئەکادیمیای ئەفلاتوون،دژایەتیەکی زۆری قوتابخانەو فێرکاریەکانی ئیسۆکراتس کردووە لەبارەی بڕوا سیاسیی و گوتاربێژیەکانی و بەمەش (گرۆلس)یان ((لەبارەی گوتاربێژی))نموونەیەکە لەوە، ئەم نوسراوەی لاوێتی ئەرستۆ ئێستا جگە لە چەند پارچەیەك ئەویش بە گێرانەوەی هەندێ لە دانەرەکان، شتێکی لەبەردەستدا نیە، ...ات ئاماژە کرا بەوەی کە (ئانتی دۆسیسی)ی ئیسۆکراتس وەڵامێکی هێرشکەرانە ئەو نوسراوەیەی ئەرستۆ، ئەرستۆ ماوەیەك خەریکی ووتنەوەی ((رێگاکانی

گووتاربێـژی)) بـوو، ئـەو ئـەم وانانـەی لـە دانیـشتنەکانی دوانیـوەڕۆدا ووتۆتـەوە، و بـە فێرخوازەکانی ووتووە کە ئەم دووشێوازە باوەڕپێکەرە گووتاریە هەن، ((گووتاربێژی)) و ((دیالێکتیک))، و بانگشەی ئەو لەو وانانەدا ئەمە بووە کە شەرمە کە ئێمە بێدەنگ دانیشین و ئیسۆکراتس قسە بکات، بە پێی بڕوای لێکۆڵەرەوان، ئەرستۆ دیالۆگی(گرۆلۆس)ی لەماوەی ساڵەکانی ٣٦٠ پ.ز دا واتە نزیکەی ٦ ساڵ پاش چوونە ناو ئەکادیمیای ئەفلاتوون نوسیوە، ئەم نوسینە یەکەمین بەرهەمی چالاکیە ئەدەبیەکانی ئەوە،ئیسۆکراتسیش هاوکات بەردەوامی بە دژایەتی ئەرستۆ و باقی پەیڕەوکارەکانی ئەفلاتوون داوە، لەلایەکی ترەوە، فەیلەسوفی لاوی سەردەمی ئەرستۆ(ئەبیکۆر)(٣٤١-٢٧٠پ.ز) و پەیڕەوکارەکانی ئەویش سەرسەختانە دژایەتی ئەرستۆیان کردووە تا پلەی دوژمنکاری، هەندێ لە ئەرستۆناسەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە لە کتێبی(گوتاربێژی) کە ئێستاکە لەبەر دەستدایە، ئەتوانین تێبینی یەکەمین وانەکانی ئەو لەم بوارەدا بکەین، بەدەر لەمەش ئەرستۆ لەو ماوەیەدا کە لە ئەکادیمیای ئەفلاتووندا ژیانی بردۆتە سەر، نوسین گەلێکی تر، کە زیاتر لەبارەی شێوازی دیالۆگ بە شێوازی ئەفلاتونی و هاوکات چەند بەشێك لە بەرهەمە جاویدانەکانی پاشتری خۆی هێناوەتە بوون.

ئەفلاتوون لە بەهاری ٣٤٧پ.ز لە ٨٠ ساڵیدا مرد، لە هەموو سەرچاوەکاندا هاتووە کە ئەرستۆ لە دوای مەرگی مامۆستاکەی، ئاتنی بە جێ هێشت،لەبارەی پاڵنەری بە جێهێشتنی ئاتن لە لایەن ئەرستۆوە، زۆربەی بڕواکان لەسەر ئەوەن کە هەرچەند ئەفلاتون ستایشی توانا ئەقڵیەکانی ئەرستۆ و ئەندێشەکانی ئەکرد، و ئەوی بە باشترین قوتابی خۆی ئەژمار ئەکرد، بەڵام خوشکەزاکەی خۆی بەناوی(ئسپۆسیپۆس)ی کردە جێگری خۆی بۆ ئەکادیمیا، و ئەرستۆش بە هۆی ئەمە زۆر دڵگران ونائومێد بوو، و بڕیاری دا کە ئاتن بە جێ بهێڵێت، بەڵام ئایا ئەم رووداوە بۆ روون کردنەوەی بەجێهێشتنی ئاتن لە لایەن ئەرستۆوە بەسە؟

لەلایەکی ترەوە ئەڵێن کە ماوەیەك لەدوای مەرگی ئەفلاتوون، ئەرستۆ لە دونیابینی فەلسەفەکەی خۆی گەیشتە قۆناغێك کە لەگەڵ زۆریك لە بابەتەکان و بنەمای بڕواکان وتیۆرەکانی ئەفلاتوندا نەدەگونجا و لەبەر ئەمەش کەم کەم لە نێوان فێرخوازە مامۆستا شێوەکاندا بێگانەییەکی بیروباوەڕی و لێك حاڵی نەبوون دروست بوو، بە هۆی ئەمەوە ئەرستۆ بە هۆی ئەو رێزەی کە بۆ ئەفلاتون و ئەکادیمیاکەی هەیبوو، بە ئەنقەست یەکسەرە بەجێی نەهێشت و دوای خست، و ئەم نەگونجانە فیکریە لە نوسینەکانی ئەو

سەردەمەی ئەرستۆ کە_هەنوکە هەندێکیان ماون_ بە ڕوونی دیارە، وەك (چەند دیالۆگێك لەبارەی چاکە) و ((لەبارەی ئایدیەکان)) یان لە (پرترپتیکس) و (( لەبارەی فەلسەفە)).

بەڵام هەرچەند جیاوازی بیرو ڕا لە نێوان ئەرستۆ و ئەفلاتوون و باقی فێرخوازەکانی ئەفلاتوون ئەتوانێت پاڵنەرێك بێت بۆ بە جێهێشتنی ئاتن لەلایەن ئەرستۆوە، بەڵام ناتوانین بە تەنیا پاڵنەرێکی دابنێین بۆ ئەو بڕیارە.

لەلایەکی ترەوە،ئەبێت سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە ئەرستۆ لە سەرزەمینێکی تر بەناوی(توراکیا)،لە دەرەوەی سەرزەمینەکەی یۆنان هاتبوو، و بەم شێوەیە لە ڕوانگەی دانیشتوانی ((ئاتن))ەوە وەك( دانیشتوویەکی بێگانە) و بێبەش لە مافەکانی شارستانیەت ئەژمار ئەکرا، لەبەر ئەمە ئەتوانین وادابنێین کە ئەرستۆ لەدوای مردنی ئەفلاتوون، دڵخۆشی وپشتیوانیەکی تری وەك ئەفلاتوونی لە ئاتندا نەبوو، بەڵام ئەمەش ناتوانێت ببێتە پاڵنەری سەرەکی و کاریگەرترین یان بۆ بەجێهێشتنی ئاتن لەلایەن ئەرستۆوە، بۆ ئەم بڕیارە ئەبێت بەدوای پاڵنەری بەهێزتر و گەورەتردا بگەڕێین.

لەماوەی چەند ساڵێك لە دوای مردنی ئەفلاتون، لە مێژووی یۆنانی ئەو سەردەمەدا، ڕوداوگەلێکی زۆر خرۆشێنەر ئەبینرێن، کە تارادەیەك زۆر پەیوەیان بە سەرگوزەشتەی ئەرستۆوە هەبووە، لەم ماوەیەدا، لە مەقدۆنیە، کە یۆنان دانیشتوانەکەیان بە (نیوە وەحشی) ئەزانین، چەند ڕوداوێك هاتنە ئاراوە کە دواتر شێوەی –یۆنان– و لە پێش هەموویانەوە (ئاتن) یان بە تەواوی گۆڕی،(ئامونتاسی سێهەم) هاوڕێ و خۆشەویستی باوکی ئەرستۆ، لە ساڵی(٣٧٠پ.ن)دا مرد، و ئەو ٣ کوڕی هەبوو بە ناوەکانی(ئەلیکساندرۆسی دووەم،پریدیکاس و فیلیپ)، ئەلیکساندەری دووەم بوو بە جێگری باوکی بەڵام لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا زۆر منداڵ بوو، مامی(پتولمایس ئالرۆسی) سەرپەرشتی ئەو و جێگیرایەتی پادشای گرتە ئەستۆ، ئەو(ئەلیکساندرۆسی دووەمی )کوشت، و میرایەتی خۆی بۆ مەقدونیە ڕاگەیاند،بەڵام (پریدیکاس) بە نۆبەی خۆی (پتولمایس)ی لابرد (٣٦٠ پ.ن) و خۆی بوو بە پادشا، ئەو کە کوڕێك و جێگیرێکی بەناوی ئامونتاسی چوارەم هەبوو، لە شەڕێکدا کوژرا (٣٦٠پ.ن)، لەدوای مەگی ئەو( فیلیپ) سەرپەرشتی ئامونتاسی چوارەمی گرتە ئەستۆی خۆی کە لەو کاتەدا زۆر منداڵ بوو، بوو بە جێگری دەسەڵات لە مەقدۆنیە، بەڵام لە ساڵی ٣٥٦پ.ز ئەویش میرایەتی خۆی ڕاگەیاند، فەرمانڕەوایی (فیلیپ)و بەرفراونی وڵات و سیاسەتەکانی فیلیپ فاکتەری زۆر گرنگ و کاریگەرن لەسەر ژیانی ئەرستۆ، لێرەدا ئەبێت ئەوە بە یاد بهێنینەوە کە نووسەرانی ژیاننامەی ئەرستۆ، لەسەر بنەمای نەریتە بێ بنەماو

نادروستەکەی ئەو سەردەمە، کەمتر سەرنجی بارودۆخی کۆمەلأیەتی و سیاسی و فاکتەرو رووداوە مێژوویی و سیاسییەکانیان داوە و کەمتر ئەوانەیان بە سەرگوزەشتەو ژیانی ئەوەوە بەستۆتەوە و ئەم هەژاریە لە ژیاننامەکەی ئەرستۆ نەبێت قەرەبوو بکرێتەوە.

لە دوای مردنی ئەفلاتون، ئەرستۆ میوانداریەکی لە(هیرمیاس) فەرمانڕەوای شاری(ئاتارنیئۆس)ی پێ گەیشت، ئەم شارە لە کەنارەکانی خۆرئاوای ئاسیای بچوك و لەناوچەی (میسیا)وە بوو، ئەڵێن کە (هیرمیاس) لە پەیڕەوانی قوتابخانەکەی ئەفلاتوون ولە هاوڕێیانی ئەرستۆ بووە، و لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵێن کە(پرکسنس) مێردی خوشکەکەی و سەرپەرشتی ئەرستۆ لەدوای مردنی باوکی،لە هاوڕێیان وهاوشارییانی (هیرمیاس) بووە، هەرچۆنێك بێت ئەرستۆ لە بەهاری (٣٤٧پ.ن) بە هاوڕێی قوتابیە بەرجەستە و ژیرەکەی ئەفلاتون (کسینۆکراتێس) ئاتنیان بە جێ هێشت و چوون بۆ شاری(ئاتارینۆس) ،مەڵبەندی فەرمانڕەوایی (هیرمیاس).

ئەرستۆ ٣ ساڵ لە لای هیرمیاس بوو لە ئاسۆس،لەم نێوانەدا هێرمیاس،خوشکەزاکەی یان بە گووتەی یەکێکی تر خووشکەکەی خۆی بەناوی(پۆسیاس),کردە خێزانی ئەرستۆ، ئەرستۆ لەدوای ئاسۆس چوو بۆ (میتۆلنە) کە سەنتەری دوورگەی(لیسۆبس) لە لێوارەکانی ئاسیای بچووك و ٣٤٣ تا ٣٤٢ لەوێ مایەوە، ئەرستۆ ماوەیەك لەو دورگەیەدا مایەوە، بۆ توێژینەوە زانستیەکانی خۆی بە تایبەتی لە بواری ژیان ناسی و زیندەوەرزانی و گیاناسی زۆر سودمەند و بەهرەدار بوو، لەلایەکی ترەوە لەم ماوەیەدا پانتایی سیاسی یۆنان روبەرووی چەندین رووداوی چارەنوس ساز بووبوویەوە، فیلیپ میری مەقدۆنیە داگیرکاریەکانی خۆی دەست پێ کردبوو و پانتایی ولأتەکەی فراوان ئەکرد و شاری خالیدیکەشی خستبوویە ژێر رکێفی خۆیەوە،لەگەڵ شاری ئاستاگیرا ٣٤٩پ.ن. زێدی ئەرستۆی داگیر کردوو و وێرانی کرد، و ئەم شارە دواتر بە یارمەتی ئەرستۆ و بەهۆی خودی فیلیپ یان کوڕەکەی ئەسکەندەرەوە بوونیاد نرایەوە.

لە ساڵی ٣٤٣پ.ز ئەرستۆ مێوانداریەکی لەلایەن فیلیپەوە پێ گەیشت،کە بانگ کرابوو بۆ دەربار، گوایە ئەویان بە ئامۆژگارو فێرکاری کوڕەکەی فیلیپ (ئەسکەندەر) هەڵبژاردووە کە ئەوکات(١٣ یا ١٤)ساڵأن بوو، ئەرستۆ ئەم میوانداریەی قبوڵ کرد، هۆکاری چوونی ئەرستۆ بۆ مەقدۆنیە بە ئەگەرێکی زۆر بە هۆی ئەو پەیەندیەوە بوو کە خێزانەکەیان لەگەڵ دەربار‌دا هەیانبوو،و لەگەڵ ئەوەشدا هاوکاری و هاندانی هاوکارو

هاورێکانی بوو بەتایبەتی لەسەر قسەی(هێرمیاس)، چونکە ئەوکات (هێرمیاس) لەو سەردەمەدا لە هاورێ و لایەنگرە سیاسیەکانی فیلیپ بوو و ئەژمار ئەکرا، بەو شێوەیەی کە ئەبینین، سەرەنجام ژیانی خۆی لەبەر وەفادری بۆ فیلیپ لەدەست دا.

لەلایەکی ترەوە لەم بارەیەوە کە ئایا ئەرستۆ لە راستیدا مامۆستاو سەرپەرەشتی (ئەسکەندەر) بووە، ناتوانین داوەریەکی یەك لاکەرەوە بکەین، بەلاَم لەهەندێ لە سەرچاوەکاندا قسە لەسەر ئەوە کراوە،(بطلیموس الغریب) تەنها ئاماژە بەو خاڵە ئەکات کە لە دوای مەرگی هێرمیاس، ئەرستۆ گەرایەوە بۆ ئاتن و فیلیپ میوانداری ئەوی کرد و ئەو بە دەم ئەو میوانداریەوە چوو بۆ مەقدۆنیە، هەتا ئەو کاتەی کە ئەسکەندەر بەرەو سەرزەمینەکانی ئاسیا کشا، سەرقاڵی فێرکردن و مامۆستایەتی ئەو بوو(گ ١١ب)،بەهەر شێوەیەك بێت لەوانەیە ئەرستۆ لەماوەی چەند ساڵێك جار بەجار بە شێوازی چەندین رێنمایی، هەندێ فێرکاری و رێنوێنی ئاراستەی ئەسکەندەر کردبێت و لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی ئەو لە فێرکردنی ئەسکەندەر، پەروەراندنی ئەو بۆ رابەرایەتی داهاتووی یۆنان بووە، ئەوەی لەبارەی پەیوەندی ئەرستۆ و ئەسکەندەر لە سەرچاوەکاندا هاتووە، دروستکراوەو دواتر و لەسەردەمەکانی تردا خراوەتە سەری، بەتایبەتی لە سەردەمی (هلینیسم)دا.

ئەرستۆ ٨ ساڵ لە مەقدۆنیە مایەوە و ماوەی ٢ ساڵ لە مانەوەی لەوێ تێ پەڕیبوو کە هەواڵی کۆتایی دەسەلاَت و مەرگی هێرمیاسی پێگەیشت، لەو سەردەمەدا پێکدادانێك لەنێوان فیلیپ و گەورەترین دوژمنە سیاسیەکەی ،واتە ئێران هاتبوویە ئاراوە ، ئاتن یش بە رابەرایەتی(دۆمستێن) ٢٨٤-٣٢٢ پ.ز گوتاربێژ و سیاسەتمەداری بەرجەستەی خۆی، دەستی کردبوو بە دژایەتی و ململانێ لەگەڵ فیلیپدا، لەم سەردەمەدا(ئەردەشێری سێیەم) (٣٥٩-٣٢٨ پ.ن) فەرمانرەوایی ئێرانی ئەکرد، سەرۆکی فەرماندەیی نیزامی ئەو لە ئاسیای بچووك پیاوێك بوو بەناوی(مێنتۆر) کەخەڵکی(رۆدۆس) بوو، ئەویش دەستی کرد بە ماشینەوەو لەناو بردنی لایەنگرانی فیلیپ لەوێ،لەم نێوانەدا هاوکاری هێرمیاس کە لە لایەنگرە باشەکانی فیلیپ بوو،بۆ فەرمانرەوایی مەقدۆنیە زۆر پێویست بوو، چونکە لەو کاتەدا فیلیپ نەخشەی هێرش کردنە سەر ئاسیا و ئێرانی لە ژێر سەردا بوو، نەخشەیەك کە پاش ماوەیەك کورەکەی ئەنجامی دا،بەم شێوەیە بازنەی فەرمانرەوایی هێرمیاس، بەهۆی ئەوەی کە لەسەر رێگای ئاسیایی بچووك و دراوسێی سنورە سیاسیەکانی ئێران بوو، ئەیتوانی بۆ بەدی هاتنی نەخشەکانی ناو مێشکی فیلیپ زۆر سودمەند بێت.

لەسەر بنەمای باسەکەی(دیۆگنس لاشرتیۆس)( کتێبی ٧ وەرزی ٢٧) ئەرستۆ نامە گەلێکی بۆ بەرێوەبەر نووسیوە، بەو مەبەستەی کە ئەو هان بدات بە پێچەوانەی ئەوەی کە یارمەتی ئێران بدات، دۆستایەتیەکەی لەگەلچ فیلیپ دا لەناو نەبات، بەلآم بەرێوەبەر قبوڵی نەکردبوو، ئەو ماوەیەك شاری (ئاتارنئۆس)ی ئەلقە دابوو کە سەنتەری فەرمانرەوایی هیرمیاس بوو،و لەبەر ئەوەی ئەم ئیشە بۆ ئەو سەری نەگرت ،هیرمیاسی بۆ سەر مێزی گفتگۆ بانگ کرد و مێوانداریەکی زۆر گەورەی بەرێ کرد و لەم میوانداریەدا دەست گیری کرد و بۆ (شوش) ی پایتەختی ئێران ناردی، هیرمیاس بە فرمانی ئەردەشێری سێیەم لە دار درا،(٣٤١پ.ن).بەم شێوەیە گێردراوەتەوە کە ئەو پێش مردن وتوویەتی: ((بەهاورێیان و هاونشینەکانی من بڵێن کە هیچ ئیشێك کە ناشایستە و ئاخێنراو بە فەلسەفە نەبێت ئەنجام نەدەن))، هیچ دوور نیە کە ئەم قسانە پەیامێك بۆ ئەرستۆ و ئێراستۆس و کۆرسیکۆس نەبووبن، هەواڵی مەرگی هیرمیاس، ئەرستۆی بە توندی دڵگران کرد، بە شێوەیەك کە ئەو سرودێکی بۆ یادگاری و ستایشی هیرمیاس نوسی و تابلۆیەکی بۆ هێشتنەوەی ئەو لە پەرستگای (دێلفی) نووسی کە هەردووکیان ئێستاکە لەبەر دەستدان(هـ.س.پ.کتێبی ٧ وەرزەکانی ٦-٨).

ئەرستۆ لە ٣٣٥پ.ز لە مەقدۆنیە گەرایەوە بۆ ئاتن، لەبارەی پاڵنەری ئەو گەڕانەوەیە،لە یاننامەکانیدا زانیاری روون بوونی نیە، لە زۆرینەی ئەم سەرچاوانەدا هاتووە کە لەبەر ئەوەس ئەسکەندەر لە ٣٣٤پ.ز ئەیویست هێرش بکاتە سەر ئاسیا، ئەرستۆ کە بە روکەش لەگەڵ ئەم نەخشەیەدا نەبوو، هەلێکی بۆ رەخسا کە مەقدۆنیە جێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ئاتن، بە پێی نوسینەکانی (بطلیموس الغریب) ئەو هاورێکەی خۆی واتە (کلایستێنێس)ی لە لای ئەسکەندەر هێشتەوەو خۆی گەڕایەوە ئاتن، لەلایەکی ترەوە، لەهەندێ لە سەرچاوە کۆنەکاندا هاتووە کەهۆکاری گەڕانەوەی ئەرستۆ بۆ ئاتن ئەو نامۆییە بوو کەلە نێوان ئەو ئەسکەندەردا دروست بوو،پلوتارك (دح ١٢٠ن)ئەگێرێتەوە کە ئەسکەندەر لە سەرەتادا بەو شێوەیەی کە خۆی ئەیووت_ئەرستۆی لە باوکی زیاتر(فیلیپ)خۆش ئەویست، و ستایشی ئەکرد، چونکە ئەو ژیانی پێ بەخشی، و ئەوە کە ژیانی ئەوی بونیاد ناو جوانی کرد، لەگەڵ ئەمەشدا ئەسکەندەر دواتر گومانی لەبەرامبەر ئەرستۆ هەبوو، نەك بەو ئەندازەیەی کە ئازاری پێ بگەیەنێت، بەڵکو سەرنجە میهرەبانەکەی جارانی لەبەرامبەر نەماو گەرم و گوڕیەکەی جارانی لەبەرامبەری لەدەست دا،(VII/٢٤٢-٢٤٤)، بەلآم گەڕانەوەی ئەرستۆ بۆ ئاتن هاوکات ئەتوانین بۆ رووداوێکی سیاسی ئەو سەردەمەی یۆنانی بگەڕێنینەوە، لەدوای

کوژرانی فیلیپ لە هاوینی ٣٣٦پ.ز کوڕەکەی ئەسکەندەر هاتە سەر کورسی دەسەڵات، پێش ئەوە لە ساڵی ٣٣٨پ.ز لە شەڕی (خایۆرنیا) سوپای ئاتنیەکان و لایەنگرەکانیانی شکست پێ هێنابوو، و ئاتنی خستبوویە ژێر رکێفی خۆیەوە، بە بیستنی لەناو چوونی فیلیپ، دانیشتوانی شارەکانی یۆنان و بەتایبەتی ئاتن دەستیان کرد بە شۆڕش، ئەوان وایان ئەزانی کە ئەسکەندەری لاو هیچ نازانێت و بێ ئەزموونە و لەدژی ئەمان ڕاناوەستێت، نەتەوە پەرستەکانی ئاتن، دوژمنە کۆنەکانی فیلیپ و مەقدۆنیە، ئومێدێکی تازەیان بۆ دروست بوویەوە و کاڵ فامانەو بە بیرکردنەوەو ئەندێشەیەکی سادەوە دەستیان کرد بە جم وجووڵ، بەڵام ئەسکەندەر بە خێراییەکی تیشك ئاسا،شۆڕشی شارەکانی یۆنانی یەك لە دوای یەك دامرکاندەوە ولەم نێوانەدا شاری(تێب)ی بەتەواو و زۆر بێ بەزەییانە وێران کرد، و پاشان ڕووی لە ئاتن کرد،بەڵام ئەم شارە هیچ بەرگریەکی نەنواند و یەکسەرە خۆیان بەدەستەوەدا.(پاییزی ٣٣٥ پ.ز).

ئەرستۆ لەم کاتەدا گەرایەوە بۆ ئاتن، وەك چۆن دیارە گەرانەوەی ئەو، هاوتای یەکەمین ریزەکانی سوپاکەی ئەسکەندەر بووە، لەلایەکی ترەوە ئەسکەندەر لە بەرامبەر دەستپێشخەری ئاتنیەکان لەدژی مەقدونیە و بە تایبەتی کردنەوەی دەرگاکانی گفتگۆو قسە کردن لەگەڵ ئێران، لەبەرامبەر ئەو شارە لەخۆی نەرمی و گەورەیی پیشان دا، و چاوی لە وێرانکردنی پۆشی،ئەم شێوە رەفتارەی ئەسکەندەر لەگەڵ ئاتن تا ئەندازەیەك مایەی سەرنج بوو، بەو شێوەیەی کە ئاماژە کرا، ئەرستۆ لە ٣٤٨ پ.ز بە هۆی دەرخستنی هەستە دژایەتی کەرەکانی لە بەرامبەر مەقدۆنیە، و ئەو وێرانکاریەی کە فیلیپ لە شاری(ئالۆنتۆس) کە لایەنگری ئاتن بوو، ئەم شارەشی بە جێ هێشت، و چوویە لایی هێرمیاس و پاشان لە مەقدۆنیە چوویە لای فیلیپ و خزمەتێکی زۆر گەورەی لە بارەی سیاسەتی دەرەوە لەبەرامبەر ئەودا بە ئەنجام گەیاند،کە لەوانە هەوڵدان بۆ هاوئاهەنگ کردنی سیاسەتی هێرمیاس لە گەڵ سیاسەتی فیلیپ بوو،بەم شێوەیە ئەگەری هەیە کە لە ساڵی ٣٣٥پ.ز ئەرستۆ خودی خۆی دەستی هەبوو بێت لەوەی کە ئەسکەندەر ئاتن وێران نەکات و مامەڵەی خراپ لەگەڵ خەڵکەکەیدا نەکات.

لە لایەکی ترەوە لەهەندێ لە ژیاننامەکانی ئەرستۆدا هاتووە، کە دانیشتوانی ئاتن لەبری ئەو چاکەکاریانەی کە ئەرستۆ لە بەرامبەر ئەواندا کردبوونی، نووسینێکیان لەسەر بەردێکی گەورە لە شوێنێکی بەرزەوە لە شاری (ئاکروپۆلیس لە ئاتن) هەڵکۆڵی بوو، و لەو نووسینەدا ستایشی خزمەتەکانی ئەوبە شاری ئاتن و ئەو یارمەتیەی کە لە فیلیپی بۆ شارەکە خواستبوو،خرابونە ڕوو،(بطلیموس غریب، گ ١٢ ب،قس ابن ابی

اصیبعه١/٥٥) هەرچەندە لەم نوسینەدا ئاماژە بۆ ئەسکەندەر ناکرێت بەڵام دیارە کە راستخوازی ئاتنیەکان ئەبێت زیاتر بۆ یارمەتی ئەرستۆ بگەڕێنینەوە لە بەرامبەر ئەسکەندەر، نەك لە بەرامبەر فیلیپ، ئەرستۆ لە ٣٤٨ یا ٣٤٧ پ.ز ئاتنی بە جێ هێشت، چونکە لەو سەردەمەدا خەڵکی هەڵچوونێکی زۆری لە بەرامبەر و لە دژی فیلیپ لە قورگدا بوو، وە ئەرستۆش بە نزکایەتی لە مەقدۆنیەکان و خێزانی پادشا ناوبانگی دەرکردبوو، و ئاتنیەکان تەنانەت ئەویان بە هەواڵگری دەرباری مەقدۆنیە ئەژمار ئەکرد.

ئەرستۆ لە دوای گەڕانەوەی بۆ ئاتن لە سەیرانگاکانی (لوکین) –کە لە یاریگایەك لە باکووری خۆرهەڵاتی ئاتن بوو–چالاکیە فێرکاریەکانی خۆی دەست پێکرد،بە ناوی(پێریپاتۆس) کە لە عەرەبیدا پێی ئەوترێت((مشا))، شوێنگەی فێرکاریەکانی ئەرستۆ هی خۆی نەبوو،وەك چۆن ئاماژە کرا، ئەرستۆ لە ئاتن بە (نیشتەجێی بێگانە) ئەژمار ئەکرا و بە پێی یاسای ئاتن نەیئەتوانی لەوێ پارچە زەوییەکی بۆ خۆی هەبێت، پێناسەو شێوەی قوتابخانەکەی ئەرستۆ لە وەسیەتنامەی فێرخوازەکەی و جێگیرەکەی (سێئۆفراستۆس)دا ئەبینرێت (سە:دیۆگنس،کتێبی V،وەرزی ٥١ بەدواوە) ئەم قوتابخانەیە جارێك لە٢٩٤پ.ز و جارێکی تر لە٢٠٠پ.ز و سەرەنجام لە ٨٧پ.ز بە تەواوی وێران بوو،( لەبارەی قوتابخانەی رێ پێوەکان،سە،پاولی،V١١/٨٩٩ بە داوە، بە تایبەتی٩٠٥).

ئەرستۆ ١٢ ساڵ لە ئاتن خەریکی وانە وتنەوە و توێژینەوەو نوسین بوو، ئەو لە ساڵی ٣٢٣ پ.ز جارێکی تر ئاتنی بە جێ هێشت، و چوو بۆ (خالکیس)،پاڵنەری دوبارەی ئەو لە ئاتن، لە سەرچاوەکاندا بەم شێوەیە هاتووە، کە (کاهینێك) بەناوی(ئورۆمێدۆن) و دانەیەکی تر بەناوی(دێمۆفیلۆس) ئەرستۆیان بەوە تاوانبار کرد کە گوایە سوکایەتی بە دین و پیرۆزمەندیەکانی دین کردووە، و سرودە ستایش ئامێزەکەی ئەرستۆیان بۆ مەرگی هیرمیاس بۆ ئەو بیانووە ئەهێنایەوە لەگەڵ ئەو تابلۆیەی کە لە پەرستگای (دۆلفی)(دیۆگنس ،کتێبی V،وەرزی ٥)، لە ژیاننامەی ئەرستۆ لە (بەتلیمۆسی غەریب)دا ئەمە هاتووە کە پیاوێك بەناوی (ئورۆمێدۆن) ئەرستۆی بە کوفر وێژی و بە گەورە نەزانینی بتەکان تۆمەت بار کرد و هۆکارەکەشی کینەیەك بوو کە ئەو لەدڵیدا بوو لەبەرامبەری، ئەرستۆ کە ئاگاداری ئەم رووداوە بویەوە، ئاتنی جێ هێشت، و گەڕایەوە بۆ خالکیس، چونکە نەیئەویست دووچاری چارەنوسەکەی سوقرات بێت کە ئاتنیەکان بەسەریان هێنا، ئەو بە سەرپشکی خۆی چوو،وە کەسیش نەبووە بەربەست لە بەردەمیدا و ئازاریشیان نەدا بە هیچ شێوەیەك،

ئەرستۆ لەبەرامبەر ئەم تۆمەتە پۆزشی نەهێنایەوەو ئەوی کە ئەوترێت بۆی دروست کراوە،(بطليموس غريب،گ ١٢ ئەلف،قس:ابن ابي اصيبعه،١/٥٤).

بەڵام چوونی ئەرستۆ لە ئاتن دووبارە بە هۆی روداوە سیاسیەکانەوە بووە، لە ٣٣٥پ.ز بە دواوە،ئاتن خۆی لە بەرامبەر ئەسکەندەر بەدەستەوە دا،گروپە لایەنگرەکانی مەقدۆنیە و ئەسکەندەر، ژیانیان هێمن و ئارام بوو، بەڵام لە لایەکی ترەوە بەشە نەتەوە پەرست و نیشتیمان پەروەرەکە کە دژی مەقدۆنیەی ئاتن و دژی فەرمانرەوایی ئەسکەندەر بوون، رق و کینەی زۆریان لە دڵدا بوو لە بەرامبەریاندا.

لەو سەردەمەدا، پەیوەندیە تایبەتیە کەسیاریەکانی[1] نێوان ئەرستۆو فیلیپ و پاشان ئەسکەندەرو دواتر ئانتی پاترس، لە نێوان ئاتنیەکان ئاشکرا بوو، و بەو شێوەیەی کە دیاریشە ئەرستۆ لەدوای گەرانەوەی بۆ ئاتن ٣٣٥پ.ز ، لەلایەن ئانتی پاترسەوە پشتیوانی لێ ئەکرا و بەچەند هۆیەکی نەزانراو پەیوەندیەکی زۆر باش لە نێوان ئەرستو و ئانتی پاترس دا بوونی هەبوو،بەشێوەیەك کە ئەرستۆ،ئەوی بە ئامۆژگاری خۆی ئەژمار ئەکرد، بەم شێوەیە ئەرستۆ، پشتیوانی لە سیاسەتەکانی ئانتی پاترس ئەکردو لەبەر ئەمەش هیچ سەیر نیە کە ئاتنیە نیشتیمان پەروەرەکان،لەودا دوژمنایەتیەکی گەورەو فاکتەری سیاسەتەکانی مەقدۆنیەیان ئەبینیەوە و زۆر بێزار بوون بەدەستیەوە.

لەلایەکی ترەوە ، لە پرێکدا هەواڵ گەیشت کە ئەسکەندەر لە (بابل) مردووە(ژوئن ٣٢٣پ.ز) ئەسکەندەر ،ئانتی پاترس کە نوێنەری خۆی بوو لە یۆنان و مەقدۆنیە،ناردبوو بۆ ئاسیا و بەم شێوەیە ئەو ئیدی نەیئەتوانی پشتیوانی لە ئەرستۆ بکات، لە نوسینەکەی (بەتلیمۆسی غەریب)دا هاتووە کە لەدوای ئەو دەست پێشخەریە گەورەیە ك ئاتنیەکان بۆ ستایشی ئەرستۆ ئەنجامی دا،بە دانانی بەردە گەورەکە کە نوسراوە ستایش ئامێزەکەی لەسەر بوو سەبارەت بە ئەرستۆ،لە پرێکدا پیاوێك لەدانیشتوانی ئاتن بەناوی(هیمرایۆس) دەستی کرد بە دژایەتی و بەردەکەی لە شوێنی خۆی هەڵکەند(گ ١٢ ب)،ئەزانن کە ئەم پیاوە یەکێکە لە بەرجەستەکانی ئاتن و یەکێکە لەئەندامانی گروپی دژایەتی کردنی مەقدۆنیە لە ئاتن،و لەوانەشە دوژمنی سەرسەختی ئەرستۆ بوو بێت، ئەو لە ئۆکتۆبەری ٣٢٣پ.ز لەگەڵ باقی رێبەرە سیاسیەکانی ئاتن دژی مەقدۆنیە، لە دوای شەری (کرانۆن) و تێك وپێکدانی ئاتن لە لایەن مەقدۆنیەکان، هەر لەئاتن لە دار درا،ئەتوانین بە ئاشکرا بگەینە ئەو ئەنجامەی کە بارودۆخی سیاسی

[1] مەبەست لە پەیوەندی شەخسی یە.(کەسیاری-هەمبانە بۆرینە-هەژار موکریانی).

ناتن له هاوینی ۳۲۳پ.ز کۆچەکەی ئەرستۆی بۆ خالکیس خێراتر کردبێت،تۆمەتی بێ دینی وهاوشێوەی ئەوە لەلایەن ئاتنیە نیشتیمان پەروەرەکانەوە، جگە لە بیانوویەك هیچی تر نەبوو،هەتا هەرچی رق و کینەی خۆیان هەیە لەبەرامبەر هەرچی مەقدۆنیەو بەتایبەتی ئەرستۆ،وەك فاکتەرێکی گریماناوی سیاسی مەقدۆنیە، ئاشکرا بکەن، لە لایەکی ترەوە ئەڵێن کە ئەرستۆ لەدوای بە جێ هێشتنی ئاتن لە نامەیەکدا بۆ ئانتی پاترس گلەیی لەوەی کە ئاتن پڕە لە هەواڵگر و ئەویٚ بۆ مەقدوونیەکی(واتە ئەرستۆ) شوێنێکی ترسناکە، چونکە ئەو شتانەی کەبۆ هاوشارییەکی ئاتنی رێی پێدراون، بۆ بێگانەیەکی مەقدۆنی رێ پێدراو نین.

سەرەنجام یەك ساڵ لەدوای بە جێ هێشتنی ئاتن و چوونی بۆ خالکیس، لە دورگەی (ئوبۆیا)ئەرستۆ لە کۆتایی هاوین یان سەرەتای پاییز، بەهۆی کاریگەری ئەو نەخۆشیەی کە ماوەیەکی زۆر بوو تووشی بووبوو، مرد، ئەڵێن کە دانیشتوانی شاری(ئاستاگیرا) زێدگاکەی ئەرستۆ، لاشەکەی ئەویان لە خالکیسەوە بۆ شوێنێك کە لە (بەتلیمۆسی غەریب) بەناوی(ئەرستۆتالیسی) هاتووە، گواستەوە، ولە ئێشە گەورەکاندا و لەوەی کە دەبووە مایەی خەمناکیان لەوێ دا کۆئەبونەوە، و راوێژیان لەگەڵ یەکتری دا ئەکرد، چونکە ئەرستۆ کەسێك بوو کە بۆ ئاستاگیرا چەندین یاسای دانابوو،(گ ۱۲ ئەلف)، بۆ زانیاری و ئاگاداری لە چارەنوسی ئەرستۆ،بەدەر لەوەی کە لە ناوەرۆکی مەقالەکەدا هاتووە، ئەتوانین توێژینەوە گرنگەکەی (کروست) لە ژێر ناوی((ئەرستۆ،لاپەرەیەکی تازە لە ژیان و هەندێ لە بەرهەمە ون بووەکانی ئەو)) بەتایبەتی ج I ،وەرزەکانی ۱-۱۲ و هاوکات کتێبی دوریڤنگ((ئەرستۆ لە ئەریتی....))بخوێنینەوە.

## بەشی دووەم: نوسینەکانی ئەرستۆ و چارەنوسیان

ئەرستۆ بێگومان نوسەرێکی زۆر چالاك بووە، زانستی واژەناسیەکەی ئەو زۆر سەیرو سەمەرە بووە،ئەو لە بواری هەمو زانستەکاندا بیری کردۆتەوەو نوسیوویەتی، بەشێوەیەك کە لە هەندێ لە زانستەکاندا، ئەتوانین ئەو بە دانەریان بزانین، و هاوکات ئەتوانین ئەو بە دانەر و دۆزەرەوەی شێوازی بەدواداگەڕانی زانستی بزانین، لە لایەکی ترەوە نوسینەکانی ئەو چارەنوسێکی تایبەتیان هەبووە، ئەرستۆ هەندێ لە نووسینەکانی خۆی بۆ تەواوی خەڵکی و تەواوی خوێنەران و لەدەرەوەی بازنەی

فێرخوازەکانی لە (لوکێن) ئامادە کردووەو ڕێك خستووە، ئەمانە ئەو دەست نووسانە بوون کە لە ڕوانگەی ئەدەبی و شێوازی تێڕوانینەوە، لەلایەن خودی ئەرستۆوە پێداچوونەوەیان بۆ کراوە، و خاوەنی چەند دیالۆگ و نامەیەك بووە کە ئەرستۆ ناوی لێ ناون(( نووسینە دەرەکیەکان))، لەم نووسینانەدا ئێستاکە جگە لە هەندێکیان کە نوسەرانی دواتر هێناونیانەتە ناو نووسینەکانی خۆیانەوە شتێکیان لێ نەماوەتەوە، گروپێکی تر لە نوسینەکانی ئەرستۆ، کەڵەکەیەکن لە یاداشتەکان، دارشتنەکان وبابەتە جۆراوجۆرەکان کە توێژینەوەیان بۆ کراوە، و ئەرستۆ ئەمانەی زیاتر بۆ وانە وتنەوە بەکار هێناوە و کۆکردۆتەوە، و ناوی لێ ناون((نووسینە بیستەکیەکان)) و بە شێوەیەکی ڕێکخراو بۆ تەواوی چینەکانی خەڵکی بوون، هەندێ جار ئەرستۆ خۆی داونیەتە دەست (لەبەر گرەوەکان[1]) کە چەند دانەیەکیان لێ بنووسنەوە، یان فێرخوازەکانی خۆی لەبەریان ئەگرتنەوە، ئەم نوسراوانە یان لە کتێبخانەی (لوکێن) ئەپارێزران، یان لە لای فێرخوازەکانی ئەمانەوە، زۆربەی ئەم نوسینانە تایبەت بوون،و تایبەتمەندیەکی ئەدەبی و جوانی نوسینیان تێدا نەبووە، شێوازی تێڕوانینی ئەرستۆ بۆ ئەم بەرهەمانە زیاتر ووشك ولالوتانەیە، چونکە هەندێ جار تێگەیشتن لێیان زۆر قورس ئەبێت، لێرەدایە کە لە سەردەمەکانی تردا، ڕونکردنەوەی زۆر لەسەر نوسینەکانی ئەرستۆ نوسران، بەڵام ئەو لە هەندێ لە نوسینەکانی تریدا زۆر بە ڕوونی باسی لە شتەکان کردووە(بۆ نموونە لە فیزیك،کتێبەکانی III-VII،وەرزەکانی ١-١٩، میتافیزیك،کتێبی XII، ((ئەخلاقی نیکۆماخۆس))کتێبیIII).

لەدوای مردنی ئەرستۆ، قوتابیە بەرجەستەکەی ئەو(سئۆفراستس)( ٣٧٠- ٢٨٦پ.ن) بوو بە جێگری ئەو سەرپەرەشتی (لوکێن)ی گرتە دەست، ئەویش وەسیەتی کردبوو کە لە دوای مردنی هەموو کتێبخانەکەی بدرێتە دەست (نێلێئوس) کە لە فێرخوازەکانی خۆی و ئەرستۆ بوو، وە بە ئەگەرێکی زۆر ئەو بکرێتە بەرێوەبەر و سەرپەرشتی قوتابخانەی (ڕێ پێوەکان)، بەڵام لەدوای مردنی ئەو(قوتابیەکی بەرجەستەی ئەرستۆو خۆی، بەناوی (ئستراتۆن) بوویە سەرپەرەشتی (لوکێن)،(لە ٢٨٦ تا٢٦٨ پ.ن) بەم شێوەیە (نلئوس) بە ئەگەرێکی زۆر بە هۆی نائومێدی و شڵەژاوی خۆی ئاتنی بە جێ هێشت و گەڕایەوە بۆ زێدەکەی خۆی(ئسکپسیس) و کتێبەکانی (سئۆفراستس) کە نوسراوەکانی ئەرستۆشیان لەناودا بوو، لەگەڵ خۆدا برد بۆ ئەوێ،

[1] مەبەستمان ئەوانەیە کە دوبارە نوسیویاننەتەوە.

ئەڵێن کە خودی ئەو بەشێك لە کتێبخانەکەی خۆی بە فەرمانڕەوای (میسر)(پتولیمایۆس فیلادێلۆفس ،٢٨٣-٢٤٦ پ.ن) فرۆشتووە، بەڵام نوسراوە فێرکاریەکانی ئەرستۆی لەلای خۆی هێشتۆتەوە، لەدوای ئەوەش چارەنوسی نوسراوەکانی ئەرستۆ لە دوو گێڕانەوەدا ئەبینرێنەوە:

یەکەمیان/ لە مێژوونوس و جوگرافی زانی گەورەو بەناوبانگ(ئسترابۆن ٦٤-٧ ز)ە ، لەوێدا ئەوترێت کە (نلئوس) کتێبخانەی (سئۆفراستس) کە نوسینەکانی ئەرستۆشی تێدا بووە، لەگەڵ خویدا بردوە بۆ زێدەکەی خۆی و شاری(ئسکپسیس) و لەوێ بۆ نەوەکانی خۆی بە جێی هێشتووە، ئەمانە کەسانێکی ئاسایی بوون، ئەوانیان لە شوێنێکد ئەنبار کردبوو، لە دوای ئەوەی پادشاکانی(بێرگامۆن) کە شاری (ئسکپسیس)یان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە، بۆ بونیادنانی کتێبخانەکەی خۆیان بەدوایاندا گەڕان، و نەوەکانی نلئۆس کتێبەکانیان لە چاڵێکدا شاردەوە، ماوەیەکی زۆر تێ پەڕی تا منداڵەکانی ئەمانیش کتێبخانەکەی ئەرستۆو سئۆفراستس کە (شێ) و مۆرانە، زیانی پێ گەیاندبوون، بە نرخێکی کەم فرۆشتیان بە پیاوێك بەناوی(ئاپێلیگۆن)، ئەو کە زیاتر خۆشەویستی کتێب بوو نەك فەیلەسوف، چەند دانەیەکی لەبەر گرتنەوەو و شوێنە خاڵیەکانی خۆی بە نادروستی پڕ ئەکردنەوەو کتێبەکانی بە پڕ لەهەڵەیی بڵاوکردەوە، پاشان کاتێك کە سولا(فەرمانڕەوای رۆم) ئاتنی داگیر کرد،(٨٦ن) کتێبخانەی(ئاپلیکن)ی بۆ رۆم گواستەوەو و لەوێ تۆرانیۆنی رێزمانی کە لایەنگرانی ئەرستۆ بوو، بە خۆ نزیك کردنەوە کتێبەکانیان لەویش سەند،(ئسترابن،کتێبی XIII،وەرزی ٥٤).

دووەمیان/ لە ((پلوتارك))ەوەیە،لەوێدا هاتووە کە سولا، کتێبخانەکەی (ئاپلکین) کە زیاتر نامەکانی ئەرستۆو سئۆفراستسی تێدا بوو، وە ئەوکات بۆ هەموو خەڵکی نەناسراو بوون، بۆ خۆی برد و دەستی گرت بەسەریدا، ئەوکات گواستیەوە بۆ رۆم و پاشان،(تورانینی رێزمانی)، زۆربەیانی رێك خست و پاشان چەند دانەیەکی خستە بەردەم(ئەندرنیکس رۆدسی) و ئەو بلاوی کردنەوە، و لەگەڵ ئەوەشدا پێرستێکی لێیان دروست کرد، (پلوتارك، چIV،وەرزی ٢٦، لەبارەی ئاپلکین و تورانین ، و هەڵسەگاندنی ئسترابن و پلوتارك:سە:مۆرو٤٤-٣٢,٣١-I/٢٩).

ئەندرنیکس رۆدسی، بە رێکخستنی نوسینەکانی ئەرستۆ، سەردەمێکی تازەی لە ئەرستۆگەرایی و توێژینەوە لە بارەی بەرهەمەکانی دەست پێ کرد، لەبارەی ئەم کەسایەتیەوە،کە لە سەرچاوە عەرەبیەکانیشدا ناوی براوە، و چالاکیەکی زۆر گرنگی لە

رێکخستنەوەو پێداچوونەوەی بەرهەمەکانی ئەرستۆ کردووە، لە نێوان توێژەرەوەکاندا بیروڕاو تیۆری زۆر جیاواز لەیەك بەرچاو ئەکەوێت، تەنانەت لەبارەی سەردەمی ژیان و شوێنی چالاکیەکانی زانیاریەکی زۆر ورد لەبەر دەستدا نیە، ئایا ئەو لە ئاتن بووە یان لە رۆم؟ هەندێ لە توێژەرەوەکان چالاکیەکانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١ پ.ز و لە ئاتن ئەزانن، و هەندێکی تر لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەو زۆر درەنگتر لە نێوان ساڵەکانی ٢٠-٤٠ ز. لە (رۆم)دا چالاکی هەبووە، بەشێوەیەك کە لە گێڕانەوەکەی پلوتارك دا بینیمان کە تورانین ، بەرهەمەکانی ئەرستۆی خستە بەردەم ئاندرنیکس، لەبەر ئەوە هاوکات ئەو لەگەڵ (تورانین) لە رۆم ژیاوە، تورانین لە ساڵەکانی سەرووی تەمەن و لە ٢٦ ز. مردبوو، لە لایەکی ترەوە ئەڵێن کە ئاندرنیکس دەیەمین یان یانزەیەمین جێگری ئەرستۆ لە قوتابخانەی(رێ پێوەکان) بووە لە ئاتن،(واتە تارادەیەك لە نێوان ساڵەکانی ٤٦-٤٣ پ.ز)دا، هەندێکی تر لە توێژەرەوان، سەردەمی ژیانی ئەو لە نێوان ساڵەکانی ١٢٥-٤٧پ.ز ئەزانن، لەسەر بنەمای ئەم توێژینەوانە ئەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو پێش ئەم مێژووە، لە رۆم یان لە ئاتن، نوسینە فێرکاریەکانی ئەرستۆی رێك خستووەو بلاوی کردوونەتەوە،( لەبارەی ئەو و شێوەی ئیشەکەی لە رێکخستن و بلاوکردنەوەی نوسینەکانی ئەرستۆ و روون کردنەوەی هەندێ لەوانە،سە:مرو،١٤١-I/٤٥-٩٧,٩٤).

لێرەدا ئەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئەوەی لەبارەی چارەنوسی بەرهەمەکانی ئەرستۆوە لە دوای مردنیەوە، لە گێڕانەوەکاندا هاتووە_ تەنانەت ئەگەر ئەوانە بە دروست و راست بزانین_بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە نوسینەکانی ئەرستۆ، بە تەواوی لەناوچوون و لەبەرچاو نەمان، و پاشان لەدوای دوو سەدە دۆزرابێتنەوە، لە نێوان فێرخوازەکانی پێشووی قوتابخانەکەی، ئەرستۆ زۆرینەی ژیانی خۆی لە زێدەکەی و لە شاری(رۆدس) بەسەر بردووە،و لەوێ لقێکی لە قوتابخانەکەی ئەرستۆی کردۆتەوە، لەم رووەوە ناتوانین بە ئاسانی وێنای ئەوە بکەین کە کۆمەڵەیەك لە نوسینەکانی ئەرستۆ لە لای ئەو، یان لەلای باقی فێرخوازەکانی تری نەبووە، لەلایەکی ترەوە ،بەتەواوی ئەوە لە خۆ هەڵ ئەگرێت کە تەواوی نوسینەکانی ئەرستۆ لەلای ئەوانی تر، بە تایبەتی فەیلەسوفەکانی دواتری وەك (ئەبیکۆر، بەرهەیوانیەکان(رەواقیەکان)...)بووبن و ئەمان لە رێگای ئەوانەوە ئاشنای فەلسەفەکەی ئەرستۆ بووبن.

ئەوەی ئێستاکە لە نووسینەکانی ئەرستۆ و پێرستەکانیان بەدەست هاتووە، دانەیەکیان پێرستێکە کە (دیۆگنس لائرتیوس)، لەکتێبەکەی خۆیدا کۆی کردوەتەوە،

ئەوی تریشیان پێرستی(هسوخیۆس)ە کە لە سەدەی(٦ ز.) لە ئەسکەندەریە کۆی کردۆتەوە، و سەرەنجام پێرستی(بەتلیمۆسی غەریب) کەلە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بەدەست دێت، بەو شێوەیەی کە ئاماژەی بۆ کرا، (بەتلیمۆسی غەریب) لە گێڕانەوەکەی خۆیدا، بە گێڕانەوەی لە (ئاندرنیکس رۆدسی) ئاماژە بۆ هەزار نوسراوی ئەرستۆ کردووە،بەلأم خودی خۆی لە پێرستەکەیدا ناوی(١٠١) نوسراو ئەبات،(گ ١٤ب-١٨ئالف)کە زیاتری ئەوانە لە(تاریخ الحکماء قفطی وعیون لانباء )ابن ابی اصیبعة، لەگەڵ چەند زیادکراوێکەوە گوازراونەتەوە.

بەلأم پێرستی نوسینەکانی ئەرستۆ کە لە سەردەمی(هیلینیسم) کە بە بونیادی ئاشنایی لەگەڵ فەلسەفەکەی ئەودا ئەژمار ئەکرێت،خاوەنی دووبەش بووە، بەشی یەکەم ١٩ نوسراو لە خۆ ئەگرێت کە بە شێوەی دیالۆگ بوون، جگە لەو پارچانەی کە تیایاندا لەناو چوون، بەشی دووەم ١٢٤ ناونیشانی لە خۆ گرتووە، و گرنگترین نوسینە فێرکاریەکانی ئەرستۆی لە خۆ گرتووە،لە پاڵ ئەمانەدا لە ماوەی چەند سەردەمێکدا نووسین گەلێکی دروست کراو لەلایەن کەسانێکی ترەوە بۆ سەر نووسینەکانی ئەرستۆ زیاد کراون،(بۆ پێداچوونەوە و سەیر کردنی بەرهەمەکانی ئەرستۆ،سە:مرو((پێرستە کۆنەکانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ)).

لەسەدەی ١٩ هەمدا،توێژەری بەناوبانگی ئەڵمانی(بیکەر) بەرهەمەکانی ئەرستۆی لە ساڵەکانی(١٨٣تا ١٨٧٠.ز.) رێك خست و لەلایەن ئەکادیمیای شاهەنشایی (پروس)ەوە بلأوکرانەوە، ئەم کۆمەڵە بە ناوەرۆکە مانادارەکانی ئەرستۆ ئەژمار ئەکرێن، و لەو سەردەمەوە تا ئێستاکە، ژمارەی ستونەکان و دێرەکانی، تەنها سەرچاوەیەکی بنەڕەتی گوێزەرەوەیە بۆ نووسەرەکان و توێژەرەکان لە بارەی ئەرستۆو بەهەمەکانیەوە، بەرگی ١ و٢ یان، ناوەرۆکی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە خۆ ئەگرن و بەرگی ٣ی وەرگێڕانە لاتینیەکانی لەسەردەمی (رێنیسانس) و بەرگی ٤، پەراوێز دانانە بۆیان، وبەرگی ٥ بەشێکی بەجێ ماوی بەرهەمەکانی ئەرستۆیە، کۆمەڵە پێداچوو، رێکخراوەکەی (بیکەر) ١٠٦ نامە(مەقالە) لە خۆ ئەگرێت کە لە نزیکەی(٢٥٠٠)ستون ،(٨٧٥٠٠) دێڕ ،(٨٧٥٠٠٠) ووشە لە خۆ ئەگرێت،چاپی(ئۆفست)ی ئەوانەش لە(١٩٦٠.ن) بلأوکرایەوە، توێژەرێکی تری ئەڵمانی بەناوی(بونیتس) لە ساڵی(١٨٧٠.ن)..((پێرستی ئەرستۆیی)) کە هەموو پێرستە زانستی و واژەیی و دەستەواژە ئەرستۆیەکانی لە خۆئەگرت، بلأو کردەوە، هەموو بەرهەمەکانی ئەرستۆ، بەزمانە بەناوبانگە ئەوروپاییەکان وەرگێڕاون.

لێرەدا پێڕستی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لەسەر بنەمای کۆمەڵەکەی (بیکەر) ئەخەینە روو(هاوڕێ لەگەڵ ناونیشانە لاتینیەکانی لە پەراوێزدا):

(مەقالەکان)(پری هرمنیاس،کتێبی دەربڕین)( یەکەمین شی کردنەوەکان_دوو کتێب لە خۆ ئەگرن)(شی کردنەوە دووەمینەکان _لەبارەی سەلماندن و دوو کتێب لە خۆ ئەگرێت)(توپیکا _یان کتێبی گفتوگۆ و بەڵگەداریە دیالێکتیکیەکان لە هەشت کتێبدا)(رەتدانەوەی سەفسەتە کارەکان_کتێبێك لە ٢٤ وەرزدا)(فیزیك، لەبارەی سروشت)( لەبارەی ئاسمان، لە چوار کتێبدا)(لەبارەی دروست بوون و لەناوچوون، لە دوو کتێبدا)(میتیورۆلۆژیکا) لەبارەری دروست بوونی بۆشایی)(لەبارەی دەروون، لە سێ کتێبدا)(پاروانانورالیا(سروشتیە بچووکەکان)کە ئەم شتانە لە خۆ ئەگرێت،لەبارەی هەست و هەست پێکراو، لە بارەی یادگە و بەیادهێنانەوە، لەبارەی خەو و بێداری،لەبارەی خەونەکان، لەبارەی پێشگۆیی لە خەون، لەبارەی درێژی و کورتی ژیان،لەبارەی هەناسەدان،لەبارەی ژیان و مەرگ،)(مێژووی گیانەوەران، لە دە کتێبدا)( لەبارەی بە رێگاداچونی گیانەوەران)( لەبارەی جووڵەی گیانەوەران)(ئەخلاقی گەورە)( ئەم نوسراوە لە دوای سئۆفراستس دروست بوو، و تیایدا فێرکاریە ئەخلاقیەکانی ئەستۆ کراونەتە بنەما)(ئەخلاقی نیکۆماخۆس، لە دە کتێبدا)(ئەخلاقی ئودێمۆس، لە هەشت کتێبدا)(گووتاربێژی لە سێ کتێبدا)(شیعر لە ٢٦ وەرزدا،ناتەواو) (لەبارەی باشیەکان و خراپیەکان)(میتافیزیك یان سەروسروشت)لە سیانزە کتێبدا و(لە ئەلفای بچووکەوە چواردە کتێب).

بێجگە ئەمانە ئەرستۆ کومەڵەیەکی لەبارەی ١٥٨ یاسای بنەمای دەوڵەت و شارەکانی یۆنان کۆکردبوویەوە کە هەموویان لەناو چوون و تەنها بەشێکی تایبەت بە ئاتنی لێ بەجێ ماوە،لە ١٨٩٠.ز. لە لەندەن بەدەست کەتووەو ئێستاکە بە ناونیشانی(یاسایی بنەڕەتی ئاتن) بڵاوکراوەتەوە، و لەبەردەستدایە،لەتە بەجێ ماوەکان لە دیالۆگەکانی ئەرستۆ لە لایەن دو توێژەر و ئەرستۆناس کۆکرانەوە،و رێکخران و بڵاویش کرانەوە،(راس،چەند پارچە نوسراوێکی هەڵبژێراو لە ئەرستۆ،ئۆکسفۆرد ١٩٥٥.ز. وەرگێڕانە ئینگلیسیەکەی لەهەمان،ئۆکسفۆرد ١٩٥٢.ز و١٩٦٧.ز)(والتسێر، چەند بەشێك لە دیالۆگەکانی ئەرستۆ).

هاوکات لە کۆمەڵەی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە لایەن (بیکەر)ەوە چەند نوسراوێك ناویان هاتووە کە هی ئەرستۆ نین، بەڵام لە پێڕستی پێشینەکانیشدا ناویان براوەو ئێمە چاو لەوانە ئەپۆشین.

## بەشی سیهەم: دارشتەیەك لە دونیابینی فەلسەفیانەی ئەرستۆ

لەسەرەتادا ئەبێت ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەین کە ئەو وێنەیەی مێژووی فەلسەفە دوو هەزار ساڵ لە ئەرستۆی کێشابوو، وێنەیەکی رەق و نەجولاو بێ جم وجووڵ بوو، ئەم وێنەیە بە درێژایی سەدەکان،واتە لە سەردەمی کۆن بە دواوە و هاوکات بە درێژایی سەدەکانی ناوەراستی زایین، لەسەر بنەمای ئەو وێنانە هاتبویە ئاراوە کە فەلسەفەی ئەرستۆ لە هەمان سەرەتاوە، سیستەمێکی بیرکردنەوەی داخراو و رێك و پێك وپێکەوە بەستراو یەکپارچەیە، هەروەك زنجیرێك کە ئەڵقەکانی بە شێوەیەکی یەکسان و یەك ئەندازە و بەدەستی دروستکەرێك،یەك جارو بۆ هەمیشە خراونەتە پاڵ یەك و دراوەتە دەست نەوەکانی داهاتوو، هۆکاری ئەم رووبەرو بونەوە نادروستە، ئەم گریمانەیە بووە کە وەك بڵێی ئەو هەر لەو سەردەمەی کە لە ئەکادیمیای ئەفلاتون خوێندوویەتی،هەر بەو شێوەیە بیری کردۆتەوە و لە پاش بونیادنانی قوتابخانە تایبەتەکەی خۆی لە (لوکێن) و لەگەڵ ئەوەشدا تا کۆتایی ژیانی، لەم رێرەوەدا هیچ گۆڕان و وەرگەڕانێکی هزری و هیچ دووبارە هزراندنێك و دوبارە تێڕامانەوەیەك رووی نەداوە و سەیری نووسینەکانی پێش خۆی نەکردووە، دیارە کە تێگەیشتنێکی لەم شێوەیە لە هەر دیاردەیەك،چ سروشتی وچ مرۆیی، نەبینراوی بنەمای یاساییێتی سەرنگومکاری، بۆ خۆی بەرفراوانی وپەرەسەندنە، بەم شێوەیە ،لە سەرەتاوە،چ لە نێوان جێگرەوەکان و فێرخوازە نزیکەکانی ئەرستۆ، و چە لەماوەی سەدەکان و لەلایەن پەیڕەوکارەکانی فەلسەفەکەی ئەرستۆ، ئەم پرسیارە،_جگە بە شێوەیەکی زۆرکەم و تەنیا لەبارەی هەندێك لەمەسەلەکانەوە_ نەهاتبویە ئاراوە، کە ئایا لەنێوان بەرهەمە بەردەستەکانی ئەرستۆ ئەتوانین نیشانەیەك لە سەرنگومی و بەرفراوانی پلەبە پلە لە رێڕەوی بیرە فەلسەفیەکەی ئەودا بدۆزینەوە، یان نا؟ ئەرستۆ،((مامۆستای یەکەم))،((فەیلەسوفی رەها))،((پێوەری راستی)) ئەژمار ئەکرا، تەنانەت لە ((واژە ئیسکولاستیکیەکانی)) سەدەکانی ناوەراست مەبەست لە((حەقیقەتی ئەرستۆیی))[1] هەمان((حەقیقەتی رەها)) بوو.

---

[1] مەبەست لەوە ئەوەیە کە((ئەرستۆ-رەهاییەتی)) واتە گەر ووترا فلآنە شت ((ئەرستۆییە))واتە ئەو شتە((رەهایە))،بەدڵنیاییەوە دروست بون و لە مێشکدا چەسپانی ئەم واژەیە بەم مانایە، بێگومان پێویستی بەو کاریگەرییەکی زۆر قوڵ هەیە و ماوەیەکی درێژیشی پێوسیتە.(سیدۆ.داوود.ع)

لەلایەکی ترەوە ، بەتایبەتی لە نێوان فەیلەسوفە ئەفلاتوونیە تازەکان و ڕوونکەرەوە ئەفلاتونیە تازەکانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ، ئەم خوازیاریە دروست بوو بوو کە لە مەسەلە بنەڕەتیەکاندا، لە نێوان سیستەمی ئەفلاتونی و سیستەمی ئەرستۆییدا جیاوازیەکی بەو شێوەیە نەدەبینرا، ئەم خوازیاریەش بۆ سەردەمەکانی دواتر گواسترایەوە، و لەنێوان فەیلەسوفە ئیسلامیەکاندا ڕێچکەی نەخشاند، بە شێوەیەك کە (فارابی) بەرجەستە ترین نوێنەری ئەم خوازیاریە بوو، بەمەشەوە تێگەیشتنی بنەمایی لە فەلسەفەکەی ئەرستۆ ئەمە بوو کە بەدیهێنەرە مێژوییەکەی ئەویان بە بوونەوەرێکی مێژوویی ئەژمار نەدەکرد کە لە قۆناغێکی دیاریکراو لە مێژووی بیری فەلسەفی یۆنانی و لەبارودۆخ و کەش وهەوایەکی مێژوویی_کۆمەڵایەتی دیاری کراو هاتبێتە ئاراوە، و لەو بارودۆخ و کەش وهەوایەو لە ژێر کاریگەری زۆر فاکتەری جۆراوجۆر_ چ ناوەکی و چ دەرەکی، و لە کەش وهەوای ئەندێشەی سیاسی_کۆمەڵایەتی پڕ لەکێشمەکێشمی قۆناغەیی مێژوویی کۆنی یۆناندا پەروەرێنراوە،و بەهرەمەندی فەلسەفەکەی خۆی کەم کەم شکڵاندووە.

بەڵام لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، وردە وردە ڕوانگەیەکی تازە بوویە جێگری ڕوانگە نادروستە نەریتیەکە، سیمای ئەرستۆ و فەلسەفەکەی لە شێوە پەیکەریەکە مەڕمەڕیەکەی هاتە دەرەوە وگۆڕا بە شێوەی مرۆڤێك و مێژوویەکی شایەنی وێران بوونی لێ هات، بۆ یەکەمین جار توێژەری ئینگلیزی (کیس)، لە مەقالەیەکی درێژ لەبارەی ئەرستۆ، لە ئینیسکلۆپیدیای(بریتانیکا)(II/501 بەدواوە) سەرنجی لێکۆڵەرەوانی بۆ گۆڕانی بیر و بەرفراوانی ئەندێشەی پلە بەپلەی فەلسەفەکەی ئەرستۆ ڕاکێشا، ئەو بە ئاماژەکردن بۆ یەکەمین نووسینەکانی ئەرستۆ(واتە دیالۆگەکان)ی، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەرستۆ،وردە وردە لە ئەفلاتوون و بەرهەمە نادیار و تەم و مژاویە دیالۆگیەکانی ئەفلاتوون دوور و بە وردیەکی زانستی و نوسراوی فێرکاریانە نزیك ئەبێتەوە، لە ڕوانگەی بابەتیشەوە ئەرستۆ،تەنانەت لە یەکەمین نوسراوەکانی دا،ئەخوازێت کە بواری توێژینەوەی فەلسەفی بەرفراوان بکات، بە شێوەیەك کە نە تەنیا (میتافیزیك و سیاسەت) لەخۆ نەگرێت، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەفلاتوونیش هانی گوتاربێژی و شیعریش ئەدات.لەلایەکی ترەوە یەکەمین نوسراوەکانی ئەرستۆ پیشاندەری ئەوەن کە ئەو لە بیرو باوەڕو ئەندێشەکانی خۆی لە چەند لایەکەوە لە گەڵ ئەفلاتوونی مامۆستایدا یەك ناگرێتەوەو لەچەند لایەکی تریشەوە هاوڕایەتی.

بەلاّم ئەرستۆناسی تازە ئەم گۆڕانە بنەماییە لە روانگەی تێڕامان لە ئەرستۆ بە قەرزاریاری توێژینەوەکانی زانای گەورەی ئەڵمانیا،(ورنرییگر)(١٩٦٠.ز.) ئەزانێت، ئەو یەکەم جار لە ١٩١٢.ز. توێژینەوە شیتەڵکاریەکانی خۆی لە بارەی کتێبی(میتافیزیك یان سەروسروشت)ی ئەرستۆ، لە ژێرناوی((خوێندنەوەیەك لەبارەی مێژووی هاتنە ئارای میتافیزیکی ئەرستۆ) بلاّو کردەوە، ئەم کتێبە،لەدوای بلاّوکردنەوەی لە نێوان پسپۆڕان و ئەرستۆناسان زریانێکی دروست کرد،(یگر) دامێنی کاریگەری ئەم توێژینەوەیەی پاش ١١ ساڵ بە نووسراوێکی تر بەرفراوانتر کردەوە، ئەو بنەمایی ترین کتێبی شێوازی ئەرستۆناسی هاوچەرخی لە ١٩٢٣.ز. بەناوی ((ئەرستۆ،بوونیادنانی مێژووی بەرفراوانی ئەندێشەی ئەو...))بلاّوکردەوە، ئەم کتێبە بوارێکی تەواو تازە بوو لەبارەی ئەرستۆناسیەوە، لەوکاتە بەدواوە چەندین شکڵگەلێکی هاوڕا و دژانە لە نێوان ئەرستۆناسانی هاوچەرخ لە بەرامبەر شێواز،بڕواکان، و ئەنجامگیریەکانی ئەو ئاشکرا بوو، بە بوونی ئەمەش ئەو کتێبە بە شێوەیەك بناغەی خۆی لە بواری ئەرستۆناسیدا پتەو کردبوو کە ئەتوانین بڵێین ئەرستۆناسی نوێ بەو کتێبەو بە هۆی نووسەرەکەیەوە بناغەی دارێژرا،تێکەیشتنی بنەمایی(یگر) لەو کتێبەدا ئەمەیە کە ئێمە ئەبێت ئەو نوسراوانەی کە ئێستاکە بەناوی(( کۆمەڵە بەرهەمەکانی ئەرستۆ)) کەلەبەر دەستمانن_ هیچ نەبێت لە هێڵە بنەمایی سەرەکیەکانیان_ هەروەك ئاوێنەی بەرفراوانی پەرەسەندنێکی تەواوکەر، جۆراوجۆر و جێگۆرکێیەکی شڵەژاو و دژ، لە ڕێڕەوی مێژوویی پەیدا بوونی بیری فەلسەفی خودی ئەرستۆدا ئەژماریان بکەین،و لە هەر شێوە توێژینەوەیەك و تەنانەت خوێندنەوەیەك بۆ بەرهەمەکانی ئەرستۆ، ئەم برفراوانیە تەواوکەرو پێچاوپێچ و لارە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەودا لەبەرچاوبگرین.

ئێستاکە لەم بارەیەوە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین گومان لەوە بکەین کە ئەرستۆ لە بیرکردنەوەدا روانگەیەکی جێگرەوەیی لە سیستەمی فەلسەفی خۆیدا رێڕەوێکی لە بەرفراوان بوون و پەرەسەندن پێوابووە، یەکەمجار ئەفلاتونیەکی توندڕەو و لایەنگر و دروست باوەرێکی (ئەرسەدۆکس) بووە کە بە تایبەتی لە بڕواکەی ئەفلاتوون لە بارەی (ئایدیەکان) و بنەمای،فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەت ئەدوا لایەنگری و مەیلێکی زۆری لەسەر ئەو هەبووە، پاشان وردە وردە لەو دوور ئەکەوێتەوەو و دەست ئەداتە ئەندێشەو بنەما تایبەتەکانی خۆی و ئەیانشکڵێنێت، ئەو لە گوزەری مێژوویی و پەرەسەندنی پلە بەپلەی بیرکردنەوەی خۆی، لە ئەفلاتوونیەکی باوەڕدارەوە، بۆ رێکخەرێکی زانستە سروشتیەکان و توێژەرو شیتەڵکار، سروشتناسێکی ئەزموونگەرا و بەرجەستە گۆڕاوە.

لە پێداچوونەوەی هەمەلایەنە لە بارەی پەیوەندی ئەندێشە فەلسەفیەکانی ئەرستۆ لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوون ئەتوانین بڵێین کە ئەو لەدوای تێ پەڕاندنی چەند ساڵێك لە ئەکادیمیا، وردە وردە لە جیاوازی نێوان تێڕوانینی فەلسەفی خۆی لەگەڵ هەندێك لە بنەما فەلسەفیەکانی ئەفلاتوون ئاگادار بوویەوە، ئەم بڕوایە کە ئەرستۆ تا کاتی مردنی ئەفلاتوون بە شێوازی ئەو بیری کردۆتەوە، و تیۆریەی(ئایدیە)ی پێ قبوڵ بووە، بێ بنەمایە، ئەو لە یەکەمین تیۆریەکانی خۆیدا-لە پێش هەموویانەوە لە ((توپیکا))- دژایەتی خۆی لە بەرامبەر ئەفلاتوون پیشان ئەدات، ئەرستۆ لەم نووسراوەدا تیۆریەی (ئایدیە)کان ڕەت ئەکاتەوە و تیۆریەی(گووتارەکان) وبەتایبەتی (ئوسیا-ناوەرۆك) ئەخاتە ڕوو، لە پانتایی ڕوداوە سروشتیەکان، (یاسا)یەتیەك ئەخاتە جێی فاکتەری پێش بینی نەکەری ئەفلاتون و و تیۆریە گرنگەکەی خۆی لە بارەی((ئامانج-مەبەست)) ئەخاتە ڕوو، کە پاڵنەری هەموو گوزەر و گۆڕانە بوونایەتیەکان لە ڕووداوەکانی ئەودایە، ئەخاتە ڕوو،(چاکە) کە لای ئەفلاتوون چەمکێکی ڕەها بوو، لە لای ئەرستۆ ئەبێت بە چەمکێکی ڕێژەیی و مێژوویی، ((چاك)) ئەوەیە کە مرۆڤە بەئەخلاق و بەرێزەکان لە هەل و مەرجە تایبەتەکاندا هەڵی ئەبژێرن.

ئەمانە و بابەتەکانی تر، پیشاندەری ئەوەن کە ئەرستۆی لاو لەهەندێ شتدا دژایەتی ئەفلاتوون کردووە، بەلأم ئەمەش بەو مانایە نایەت کە ئەو مادە ئەندێشەیی و تەنانەت پێکهاتە بیریەکانی لە ئەفلاتوون قبوڵ نەکردووە،و ئەوانی لەگەڵ تێڕوانینە فەلسەفیەکەی خۆی تێکەڵ نەکردووە، هەرچەند کات بەسەر تەمەن و ئەزموونەکانی ئەودا تێ ئەپەڕی، زیاتر دڵنیایی باوەشی بە ئەندێشەکانی ئەودا ئەکردەوە و لەبارەی باوەڕەکان و ئەندێشەکانی ئەوانی تر زۆر بە ویژدانەوە داوەری ئەکرد، ئەو زۆر بە جوانی ئاگاداری ئەوە بوو کە فەلسەفەکەی ئەو تەواوکەری ئەندێشە فەلسەفیەکانی ڕابردوی یۆنانە، و جەختی لە هەموو شتەکانی خۆی و ئەوانی تر ئەکردەوە.

ئەرستۆ لە سەردەمی پاڵفتەیی و پێگەیشتنی ئەندێشەکانی خۆیدا دانی بە گەورەیی ئەفلاتوندا ناوە،بەلأم ئەم دان پێدانانەی ، خۆشەویستی ئەو بۆ ((حەقیقەت-ڕاستی))کەم ناکاتەوە و بیگەیەنێتە ئاستێك هاوڕێیەتی ((ڕاستی))چەواشە بکات.

ئەولە شوێنێکدا دەست ئەکات بە توێژینەوە لەبارەی (چاکەی گشتی) لە ڕوانگەی ئەفلاتوون و هەوڵ ئەدات کە پێداچوونەوە بۆ ئاستەنگەکانی ئەم تیۆریە بکات، و پاشان ئەوەشی ئەخاتە سەر کە ئەمە ئیشێکی ترسناکە، چونکە ئەوانە هاوڕێکانی ئێمە بوون کە تیۆریەی(ئایدیە)یان دارشت، بەلأم بێ گومان چاکترو تەنانەت پێویستترە کە ئێمە بۆ

رزگاری((راستی)) بەتایبەتی لەو روانگەوە کە فەیلەسوفین، هەرشتێك کە خوازیاریەکی (کەسیاری)[1]مان بۆی هەیە ئەبێت وەلای نێین،هەردوکیان بۆ ئێمە ئازیزن، بەلأم ئەرکی ئێمە خستنە ڕوو و هاندانی((راستی))یە.(ئەخلاقی نیکۆماخۆس،کتێبیI،وەرزی ٦،گ1096a دێڕەکانی ١٧-١١)

ناتوانین پێکەوە پەیوەندی نێوان ئەرستۆو ئەفلاتون بە وردی دیاری بکەین،بەلأم ئەتوانین بڵێین کە تا ئەندازەیەك هەموو ئەو شتانەی کە لە نوسراوەکانی ئەفلاتوندا هاتووە،هەمیشە لە ئەندێشەی ئەرستۆدا ئامادە بوون، لەیەکەمین نووسینەکانی ئەرستۆدا، بەتایبەتی دیالۆگەکانی کاریگەری زمان و دەستەواژەکانی ئەفلاتوون بەسەر ئەرستۆوە بە ڕوونی دیارە، هەرچەندە ناتوانین ئەوە بڵێین کە ئەرستۆ تەنانەت بە شێوازی ئەفلاتوونی بیری کردۆتەوە، بەلأم لە لایەکی تر،فەلسەفەی ئەرستۆ لە پێك هەڵپڕژانی نێوان ئەفلاتوون و ئەرستۆوە هاتۆتە ئاراوە،و بەرفراوان بووە، لە هەموو نوسینەکانی ئەرستۆدا ئەتوانین کاریگەریە بە تواناکەی ئەفلاتوون لەسەر بیرکردنەوەی ئەو بدۆزینەوە و پەی پێ ببەین، تەنانەت ئەوبەشانە لە فەلسەفەکەی ئەو کە ئەتوانین ئەوانە تایبەت بە ئەرستۆ بزانین،دیسانەوە تێکەڵەیەکن لە میراتی واتایی ئەفلاتوون و هەرگیز لێی جیانابنەوە.

هەوڵەکانی ئەرستۆ ئەمە بووە کە فەلسەفەی ئەفلاتوونی لە روانگەی خۆیەوە لە توخمە نائەقلأنیەکان ڕەها بکات و بە پێدانی چەند شێوەیەکی تازە بە دونیا بینی ئەفلاتوون، چاکسازی تێدا بکات. ئەرستۆ بە تایبەتی تیۆریەی (ئایدیە)ی ئەفلاتوونی زۆر بە ناپێویست ئەزانی و تەنانەت ئەوی بە (بەردەستگر)[2] ئەزانی، و بەردەوام بە چەندین بەڵگەی جۆراوجۆر رەتی ئەکردەوە،تەنانەت لە شوێنێکدا بوێرانە دەست ئەکات بە سوکایەتی پێ کردنیشی و ئەڵێت(( ئەبێت ماڵئاوایی لە ئایدیەکان بکەین،چونکە ئەوان جیرە جیری باڵندەکانن))((شیکردنەوە دووەمینەکان))،کتێبیIوەرزی ٢٢،گ 83a دێڕی ٣٤).

ئێمە لێرەدا هەوڵ ئەدەین کە نەخشێکی کورت،بەلأم هەمە لایەنە لە دوونیا بینی ئەرستۆ بخەینە ڕوو، فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی( هیگل-١٧٧٠-١٨٣١.ز.) لەوانە

[1] واتە شەخسی(هەمبانە بۆرینە،مامۆستا هەژار موکریانی)

[2] ئەو شتەی کە ناهێڵێت تۆ نیشەکەی خۆت بە جوانی ئەنجام بدەیت.

فەلسەفیەکانی خۆیدا لەبارەی ئەرستۆوە وتوویەتی((ئەگەر فەلسەفە بە هەند وەربگرین، ئەو کات هیچ شتێك لەوە شایستەتر نابێت کە لەبارەی ئەرستۆوە قسە بکرێت)).

## دابەشکاری فەلسەفەو شێوازی ئەرستۆ:

ئەوەی لەبارەی دابەشکاری بوارەکان ومەسەلە فەلسەفیەکان لە روانگەی ئەرستۆوە ئەزانین،هیچ کامیان بەوردی ناگەڕێنەوە بۆ خودی خۆی، لە نوسینەکانی خۆیدا ئاماژە بە دابەشکاریەکی دیاری کەرو یەکلاکەرەوە کە بنەمای توێژینەوەکانی فەلسەفەکەی ئەرستۆ بێت نادۆزرێتەوە، ئەو لە شوێنێکدا زۆر بە کورتی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە مەسەلە و بابەتە فەلسەفیەکان ئەتوانین لە ۳ گروپدا جیٚ بکەینەوە:ئەخلاقیات،سروشت، ومەنتیق(توپیکا کتێبیI، وەرزی ١٤،گ١٩٥b ،دێری ١٩). بەلاّم ئەم دابەشکاریە خودی خۆیشی بە کاتی ئەزانێت.لە لایەکی ترەوە لە قوتابخانەی ئەودا و پاشان لەلای روونکەرەوان و لێکۆڵەرەوانی بەرهەمەکانی ئەستۆوە، بەتایبەتی لەلای (ئەفلاتوونیە تازەکان) دابەشکاریەکی بنەمایی بۆ زانست و زانیاریە فەلسەفیەکان هێنراوەتە ئارا کە بنەمای ئەوەش بۆ خودی ئەرستۆ ئەگەڕێنرێتەوە، لەم روانگەیەوە ئەرستۆ زانستە فەلسفیەکان بۆ دوو گروپ دابەش ئەکات، (تیۆری و پراکتیکی) فەلسەفەش بۆ خۆی دابەش ئەبێت بۆ ۳ بەش:فیزیا(ناسینی سروشت)،بیرکاری و خوداناسی، کە هاوکات بە (فەلسەفەی پێشین یان سەروسروشت)یش ناوی ئەبرێت، فەلسەفەی پراکتیکیش، ئەخلاق و ئابووری(بەرێوەبردنی مالّ) و سیاسەت لەخۆ ئەگرێت.ئاماژەی خودی ئەرستۆ لە نوسراوەکانیشی دا جەخت لەسەر ئەو گروپ بەندیە(دووانەییە) ئەکاتەوە، لەشوێنێکدا ئەلّێت:( فەلسەفە بە دروست ناسینی راستی ناو نراوە)،ئامانجی ناسینی تیۆری،راستیە و ئامانجی ناسینی کرداری(پراکتیکی)،کردارە(میتافیزیك،کتێبی II,وەرزی ١,گ٩٩٣b،)فەلسەفەی پراکتیکی لە لای ئەرستۆ، دوو شێوازە، یەکێکیان (ئەفراندن یان هێنانە بون یان دروست کردن و پێکهێنان) ئەوی تریان(کردار)کە لەم نێوانەدا، یەکەمین بە ئامادەیی و توانایی هوونەری-و ئەوی تریان پەیوەستە بە خواست و ئیرادەوە(هەمان کتێب،کتێبیVI، وەرزی ١،گ ١٠٢٥b،).

بۆ پێداچوونەوەی فەلسەفەکەی ئەرستۆ، ئەبێت یەکەمجار لە شێوازی بیرکردنەوەی ئەوەوە دەست پیٚ بکەین، فەلسەفەی ئەرستۆ ئەتوانین بە ئەنجام و شێوەی پڕاوپڕ بووی هەموو تیۆرەکان و ئەندێشەکانی فەلسەفەی یۆنان، لە سەرەتاوە تا سەردەمی ئەو

بزانین، یەکێك لە گرنگترین بەدەست هێنانە فەلسەفیەکانی ئەرستۆ دژایەتی کردنی ئەوە لەگەڵ ئەفلاتوون، و رەهاکردنی بیرکردنەوەو توێژینەوەی فەلسەفی لە چوارچێوەی دیالۆگ و دەربڕینە شاعیرانە-وعیرفانانیەکانی ئەوە.

لە فەلسەفەی ئەرستۆدا هەمیشە و پێش هەموو شتێك گەڕانەوە بۆ واقعیەت و رووکردنە دیاردە بینەکیەکانی دونیای دەوروبەر و بوونەوەرە هەست پێ کراوەکان بەرچاو ئەکەوێت،و بانگەشەی هەمیشەیی ئەو((مامانی دیاردەکان))ە، ئەمە بەرجەستە ترین تایبەتمەندی شێوازی ئەندێشەی فەلسەفی ئەوە، ئەرستۆ بە هەوڵدانی زۆر و لە گوزەری بەرفراوان کردنی پلەبەپلەی بیرکردنەوەکاندا توانی خۆی لە ژێر قورسە باری دونیابینیەکەی ئەفلاتوون رەها بکات، لە کاتێکدا کە ناوکی ئەقڵانی و دروستی تیۆرەکانی (سوقرات) و ئەفلاتوونی ئەدۆزیەوەو ئەی پاراستن، ئەفلاتوون بە تەواوی پەیوەستی تەواوی چەمکە بیرکردنەوەییەکان بوو، بە شێوەیەك لە شێوەکان حەزی لە مەسەلە لاوەکیەکان نەبوو،واتە دیاردە بینەکیەکانی دوونیای هەست پێکراوی پیشان نەدەدا، مەعریفەی راستەقینە بۆ ئەو ناسینی دونیای ئایدیەکان بوو، دوونیای دیاردەکان بۆ ئەو لە بەرامبەر ئایدیەکان زۆر هیچ و پوچ بوو ،دوونیای دروستکراو،پێویستایەتی و بوون و سەرنگوومی بۆ ئەفلاتوون هیچ فێلێکی تێدا نەبوو، و بە دوونیایەکی لاوەکی و سلبی و لێ دوورکەرەوەی ئەزانی، ئەرستۆ بە پێچەوانەی ئەفلاتوون گرنگیەکی زۆری بە هەست پێکراوەکان و ئەزموونی هەستی ئەدا،لەگەڵ ئەوەشدا روانگەکەی ئەو ئامانجی (مەعریفە)و ناسینی (تەواوێتی) واتە(ناسینی ماهیەتی گشتی و تەواوێتی(گشتایەتی) شتەکان) بوو، بەڵام ئەبێت دیاردەکان بەو شێوەیەی کە جەختکەرەوەو بە هەر شێوەیەك کە نەگۆڕ و پاشگەز نەبووەوەن لە رێگەی هەستەوەرەکانەوە کە پیشانمان ئەدرێن،بناسین،( لەبارەی ئاسمان)کتێبیIII،وەرزی ٦،گ a٣٠٦) ولەم رێگایەدا هیچ شتێك ،تەنانەت بێ بایەخترین شتەکانیش نابێت بە پوچ بزانین،چونکە لەمانەشدا کەڵەکەیەکی ناکۆتا لە مەعریفە بوونی هەیە،((لەبارەی بەشەکانی گیانەوەران،کتێبیI ،وەرزی ٦، گ٢٤٥a،دێڕی ٥).

بەم شێوەیە ئەبێت بەدوای شێواز و یاسای توێژینەوەی مەعریفەو ناسینی زانستی، کرداریدا بگەڕێین، هەر بوارێکی توێژینەوە خاوەنی ئەندازەیەکی وردو تایبەت بە خۆیە، و ئەم ئەندازەیە پەیوەستە بەو وردبینیەی کە لە بەرامبەر سروشت و پێکهاتەی بابەتەکانی توێژینەوەکاندا هەیە، کەسێك کە بەدوای فەلسەفەو مەعریفەدا ئەگەڕێت، هەرچەند نەتوانێت پەی بەهۆکاری راستەقینەی هەر شتێك ببات، ئەبێت هەوڵ بدات کە

وەرگیراوترین و قبوڵکراوترین شێوازی چارەسەری هەر مەسەلەیەك بدۆزێتەوە، بەڵام بۆ ئەم ئیشە، لە روانگەی ئەرستۆوە مرۆڤ ئەبێت خاوەنی مەوهیبەو توانایەکی تایبەت بێت و بە دەربڕینی خودی ئەو بۆ ناسین و تێگەیشتنی فەلسەفی، پێکەوە بینینی دووبنەما دانراوە و جیاکاری هەر یەك لەو دووانە، ئامێرێکی بچووك نیە، بۆ ئەم ئیشە مرۆڤ ئەبێت سروشتێکی چاکی هەبێت، ئەوی کە ئەمێنێتەوە، هەر ئەو هەڵبژاردنە دروستەی یەکێك لەوانە، سروشت چاکی،لە راستیدا بەتوانا بوونە لە هەڵبژاردنی ئەوەی(ئەوی) کە دروستە، و هەڵهاتنە لەوەی کە درۆیە، کەسانێك کە سروشتی لەم شێوەیەیان هەیە، توانای ئیشێکی لەم شێوەیەیان هەیە، چونکە ئەوەی کە ئەخرێتە بەردەم ئەوانەوە،بە هەستی سۆزداری،یان ڕقەوە، بە دروستی داوەری ئەکەن،(توپیکا،کتێبی VII،وەرزی ١٤، گ ١٦٣b،دێرەکانی ١٦-١٠).

بەم شێوەیە تایبەتمەندی شێوازی فەلسەفی ئەرستۆ هەمان شێوازی دیالێکتیکیە، کە سوقرات و ئەفلاتوون پێش ئەو هێنابویانە ئاراوە، بەڵام ئەم شێوازە دیالێکتیکیە لە لای ئەو هاوکات و هاورێ لە گەڵ ئەزموون و تێبینی هەستی زانایەکی سروشت ناسە، ئەو بەردەوام پەیڕەوی لە دیاردەکان ئەکات و پاشان هەوڵ ئەکات کە بگات بە چەمکێکی گشتی لە بابەتکەی ژێرەوە،خودی شت(یان بابەت) رێگا لەبەردەم مرۆڤدا ئەکاتەوە(میتافیزیك،کتێبی I، وەرزی ٩٨٤a،٣، دێری ١٨،) مرۆڤەکان لە لایەنی خودی ((راستی))یەوە ناچار ئەبن کە بگەڕێن(هەمان وەرز،گ ٩٨٤b،دێری ١٠).

ئامانجی ئەرستۆ، هەمیشە بەدەست هێنانی روون کردنەوەیەکی سروشتی،بینەکی و ئەقڵانی بووە، بۆ ئەوەی بتوانرێت هۆکاری دیاردەکانمان دەست بکەوێت و پێداچوونەوەیان لەسەر بکەین، یەکەم جار ئەبێت خۆیان بناسین، ئامانجی سەرەکی هەر توێژینەوەیەکی زانستی، ناسینی ماهیەتی شتەکانە،چەمکی گشتی،بابەتی ئەم ناسینەیە، ئەم چەمکە گشتیە، سیفەتی جێگیر و هەمیشە یەکسان و پەرتەوازە لە خۆ ئەگرێت لەناوبەشەکاندا، یان بە دەربڕینی ئەرستۆ(تاکە شت)[1]ە،بەڵام ئەم چەمکە گشتییانە،_کە دەرخەری ماهیەتی شتەکانن_ تەنها ئەتوانین لە رێگای شتە تاکەکانەوە،واتە لایەنە بەشەکیەکانەوە بەدەست بهێنین، تەنیا لە رێگای دیاردەوە ئەتوانین ماهیەت بەدەست بهێنین،بەهەمان شێوە کە تەنیا لە رێگای(هۆکارێنراو)ەوە

---

[1] (شتی تاك) لە گەڵ(تاکە شت)جیاوازە،چوونکە ئێمە ویستمان وەك (ناو) دایرێژین بۆیە دوومیان بەکار ئەهێنین،ئەرستۆش مەبەستی هەر ئەمە بووە.

ئەتوانین هۆکار بە دەست بهێنین،ئەندێشەو هزری مرۆڤ خاڵیە لە هەموو جۆرە ئاگاییەکی زگماکی و مەعریفە، بە پێچەوانەی ئەفلاتوون (دووبارە بەیادهێنانەوە)ی زانینەکانی ئێمە پێش هاتنە ناو دونیا نیە، سەرچاوەی هەر جۆرە مەعریفەو ناسینێك سەرەتا وەرگرتن یان (پەی بردنی هەستەکی)یە و ئەو ناسین ومەعریفانەی کە لە رێگای تێڕوانینی دەروونیەوە بەدەست دێن، لە راستیدا ئەنجامی کاریگەری ئەندێشەیەکن لەسەر ئەندێشە گەلێکی تر،بەهەمان شێوە کە پەی بردنی هەستەکی، یان هەست کردن، ئەنجامی شت گەلێکی هەست پێ براوە لە سەر هەستەوەرەکان، هەر(تاکە شتێك)ی هەست پێکراو، خەسڵەتێکی دڵنیایی زیاتری هەیە، هەرچەندە چەمکی گشتی، لەسەر بنەمای سروشتی خۆی خاوەنی بەرفراوانی هەمەلایەنەیە، بەلام(پەی بردنی هەستەکی)هەمیشە ئەبێت بکرێتە بنەما، بە بێ (پەی بردنی هەستەکی) ئەندێشەیەك ناتوانین بەدەست بهێنین(..(لەبارەی دەروون)کتێبی III،وەرزی ٨،گ ٤٣٢a،دێرەکانی ٨-٤).

چەمکەکان و بنەما گشتیەکانی هەر زانستێك، ئەبێت لە(ئیستیقرا[1]) ەوە بەدەست بهێنین،واتە پێشکەوت لە رێگای (تاکە شتەکان)ەوەو بە ئاراستەی (مەسەلەیەکی) گشتی و لە شتە ناسێنراوەکان بەرەو شتە نەناسێنراوەکان.(توپیکا،کتێبیIII،وەرزی ١، ١٥٦a ،دێرەکانی ٧-٤) کەواتە بونیادی خودی(ئیستقرا )پەی بردنی هەستەکیە، ئەرستۆ جەخت ئەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە هەستەوەرەکانی ئێمە دووچاری هەڵە ئەبن و هەرچەندە زانیاریەکانی ئەوان رێژەییە،لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین واقعیەتێك کە هەستەوەرەکان و ئەندامەکانی هەست کردن پیشانمانی ئەدەن، رەت بکەینەوە، چونکە پەی بردنی هەستەکی،پەی بردنێکی لە خۆ نیە،بەڵکو شتێکی جیا و بەدەرە لە پەی بردنی هەستەکی کە وەك پێویستیەك(پێویستایەتییەك) پێش ئەو، بوونی هەیە، چونکە (پاڵنەر) هەمیشە لە پێش (پاڵنراو)ەوەیە(میتافیزیك،کتێبیI V،وەرزی ٥، گ ١٠١٠b).

پەی بردنی هەستەکی لە خۆیدا و لە سنوری خۆیدا هەرگیز گومراکەر نیە، بەڵکو هۆکاری گومرایی و هەڵە ئەبێت لە وێناکردنەکان و داوەریەکانی خودی خۆماندا بدۆزینەوە، بەمەشەوە،تیۆریەی ناسین و مەعریفەی ئەرستۆ لە پەی بردنی هەستەکیەوە دەست پێ ئەکات تائەگات بە ناسینی ئەقڵی و ئەبستراکت و گشتی،چکێنراوی تیۆریەکەی ئەرستۆ ئەتوانین لەم قسانەی خۆیدا بەدەست بهێنین:ئاشکرایە کە ئەگەر

---

[1] مەبەست لەوەیە کە(لەبەشەوە بچین بۆ گشت)(نم:...ئەرستۆ مرۆڤە..مرۆڤ ئەمرێت..کەواتە ئەرستۆش ئەمرێت)

هەر شتێك وون بووبێت.وەك شتێكی پێویست ئاگایی و ناسینێك لەگەڵیدا وون ئەبێت، و ناتوانین بەدەستی بهێنین، چونکە ئێمە یان لە ڕێگایەکی ئیستیقراوە فێر ئەبین یان لە ڕێگای بەڵگەیەکەوە، بەڵام تێڕوانینێك لە گشتایەتی دا بوونی نیە،جگە لە ئیستقرا (تەنانەت ئەوەش کە ئەبستراکت ناوی ئەنرێت، تەنیا لە ڕێگای ئیستقراوە بەدەست دێت) چونکە ئەوان لە هەموو مەسەلەو شتێکی لاوەکی دا بوونیان هەیە وخۆ لەخۆدا جیا نین لەمانە، بەکارهێنانی ئیستقراش،بە بێ پەی بردنێکی هەستەکی، ئەگەری نیە، چونکە پەی بردن بە بەشە لاوەکی و بەشەکیەکان لە ڕێگای هەست کردنەوەیە، و ئەگەری بەدەست هێنانی ناسینێکی زانستیش لەوانەوە نیە، چونکە نە ئەتوانرێت لە(گشتایەتی) بە بێ ئیستقرا بەدەستی بهێنین، وە نە لە ئیستقرای بە بێ پەی بردنی هەستەکی(شیکردنەوە دووەمیەکان) کتێبی I،وەرزی ١٨، گ ٨١a، دێڕی ٩).

ئەرستۆ ڕێك بە پێچەوانەی ئەفلاتوون، نکوڵی لە بوونی (گشتایەتی)ئەکات بە بێ بوونی(تاك شتەکان)،لای ئەو، هزر لە ڕێگای ئەبستراکتیەوە ئەگات بە ناسینی چەمکە گشتیەکان،و ئەمەش لەسەر بنەمای تێبینی و پەی بردنی هەستەکیەوەیە، بەڵام پەی بردنی هەستەکی پەیوەست نیە بە (گشتایەتی)یەوە،چۆن لە ڕێگای پەی بردنی هەستەکی بەشەکانەوە ئەتوانین بگەین بە ناسینێکی گشتی؟ ئەرستۆ ئەڵێت: {لە پەی بردنی هەستەکیەوە بەیاد هێنانەوە دروست ئەبێت، بەو شێوەیەی کە ئەڵێین(لە بەیادهێنانـــەوە)ی زۆر و بەردەوامـــەوە (ئـــەزموون) لـــەدایك ئـــەبێت، چـــونکە بەیادهێنانەوەکان،هەرچەندە کە زۆرن لە ژمارەدا، بەڵام (ئەزموونێك) دروست ئەکەن، ئەزموون، کاتێك کە بە تەواوی لە ڕۆحدا جێگیر ئەبێت،(گشتانەیە)، واتە (تاقانەییەکە) لە سەرووی(زۆریەوە)یەو لە هەموو (بەشەکاندا) بوونی هەیە، و بە مەڵبەندی هونەر و زانست ئەژمار ئەکرێت،ئەگەر لە پەیدا بوون و بەرهەم هێناندا بێت، (هونەر)ەو ئەگەر لەبارەی بوونەوەرەوە بێت (زانست)ە(هەمان سەرچاوە،کتێبیII، وەرزی ١٩، گ١٠٠a، دێڕەکانی ٩-٥) }بەمەشەوە، شێوازی توێژینەوە لە لای ئەرستۆ بەم شێوەیەیە: ئەم یەکەمجار خۆی سەرقاڵی زمان و پێداچونەوەو جیا کردنەوەی مانا جیاوازەکان و چەمکە بنەماییەکان ئەکات، واتە سەرەتا لە نێوان بەکارهێنانەکانی زمان و دەستەواژەکان لە مانا بنەڕەتی و ڕاستەقینەو مانا خەیاڵیەکەیان جیاوازی ئەکات، و ئەوکات پێداچوونەوە لەسەر شێوازە بەڵگەداریەکانیان و شێوە جۆراوجۆرەکانیان ئەکات،لای ئەو ئیشی ناسین یان مەعریفە، لە دوو قۆناغدا ئەنجام ئەدرێت، یەکەمیان پەی بردنی هەستەکی بە پشت بەستن لەسەر ڕوونی واقعیەتی بینەکی

ـیارەکانی،چونکە بەو شێوەیەی کە ئامارژەی پیێ کرا،ئەرستۆ لەسەر ئەو بڕوایەیە کە ئەوەی لە هەستەوەرە تەندروستەکانەوە پەی پێ ئەبرێت، واقعیە و ئەبێت زانیاریەکانی قبول بکەین، هەرچەندە لە قۆناغە سەروترەکاندا پێویستی بە ڕوون کردنەوەیە، قۆناغی دووەم کە لە سەر بنەمای ڕوونی پەی بردنی هەستەکیەوە بونیاد ئەنرێت، هەمان ئەو ئیستقرایەیە کە یەکەمجار لە قوتابخانەکەی سوقراتدا هاتۆتە کایەوەو ئەرستۆ ئەوی بە شێوە پڕاوپڕەکەی خۆی دەرهێنا.

ئەرستۆ بەتەواوی بە داهێنەرو بونیادنەری ((مەنتیق)) ناسێنراوە، لە سەرچاوە عەرەبیە ئیسلامیەکاندا، بەردەوام ئەو بە ((صاحب المنطق)) ناوئەبەن،بەلاّم خودی ئەرستۆ هەرگیز ئەو شێوەیە لە نووسینەکانی کە بە(مەنتقی)ناوبانگیان دەرکرووە،بە مەنتیقی نەزانیوون و بەو شێوەیە سەیری نەکردوون، ئەوەی ئێمە پێی ئەڵێین((مەنتیق)) ئەو بە((شیتەڵکاریەکان)) ناوی ئەبات، مەنتیق زانست نیە، بەڵکۆ(فێرکاریەکی پێشینەیە)،مەرجی پێشینەی هەر جۆرە توێژینەوەیەکە، بەگوتەی ئەرستۆ، هەندێك کەس کە هەوڵ ئەدەن لە بارەی چۆنیەتی بەدەست هێنانی ڕاستیەوە قسە بکەن،بە بێ زانینی(شیتەڵکاریەکان)دەست ئەدەنە ئەم ئیشە، لە کاتێکدا ئەبێت پێشتر لەم مەسەلەیە تێگەیشتبن(میتافیزیك،کتێبیIV، وەرزی ٣، گ١٠٠٥a).

لە سەردەمەکانی دواتردا، کۆمەڵە نووسراوە مەنتیقیەکانی ئەرستۆ یان ناونا ((ئۆرگانۆن_ئامێر)) ،واتە مەنتیق وەك ئامێرێکی فەلسەفە ئەژمار ئەکرا،واژەی((مەنتیقی))لای ئەرستۆ بەشێوەیەکی گشتی بەم مانایەیە کە لە پێداچوونەوەیەك لە بارەی بابەتێك یان مەسەلەیەك لە ڕوانگەی(شێوە و زمانەوە) بکرێت و لە بەرامبەری ئەوەش((شیتەڵکاریەك)) جێگیرە(بوونی هەیە)، کە بە مانای هاوشێوەیی لەگەڵ یاسا بەڵگەداری سەلمێنەرەکان(شیتەڵکاریە یەکەمینەکان،کتێبی I، وەرزی ٢٢، ٨٤a، دێڕی ٧)، بەیاد هێنانەوەی ئەم خاڵە زۆر گرنگە کە یاساکانی مەنتیقی ئەرستۆ، نە تەنیا پەیوەندیان لەگەڵ شیتەڵکارەکانی شێوازی بیرکردنەوەوە هەیە، بەڵکو ئامانجی ئەو ناسینی واقعیەتە،بەو شێوەیەی کە لە هزر و ئەندێشەدا پەرچدانەوەی هەیە، بەم شێوەیە شێوازەکانی بەڵگاندن ئەبێت ئاگاییەکی دڵنیاکەرەوەمان لە بارەی چۆنیەتی پەیوەندی دیاردە بینەکیەکانەوە پێ بدون ودروستی ئەنجامەکانی ئێمە ئەبێت هاوشێوەی یاسا بینەکیەکانی بیرکردنەوە بن، و بە یارمەتی دیاردە واقعیەکان پشتگیری بکرێن، و ئەمەش ڕێك هاوشێوەی تیۆریەی مەعریفی ئەرستۆیە، شیکردنەوەی شێوازەکانی ئەندێشە، لە واقعدا شی کردنەوەی ئەندێش گەلێکە کە ئێمە

لە واقعیەت و لەبارەی ئەوەوە هەمانن،واتە واقعیەتێك کە لەناوئێمەدا بووە بە شێوەیەك لە ئەندێشە، لێرەدایە کە ئەرستۆ لە هاوشێوەیی ئەندێشە لەگەڵ واقعیەت،مەسەلەی(( گووتارەکان))ئەخاتە ڕوو,

گووتارەکان لە لای ئەرستۆ، لە لایەکەوە شێوە گەلێك پیشان ئەدەن کە ئێمە لەواندا بیر لە واقیەت ئەکەینەوە، و لە لایەکی ترەوە پیشاندەری شێوەگەلێك لە واقعیەت، بەو شێوەیەی کە لە خۆیدا بوونی هەیە، خودی واژەی((کاتێگوریا))یان((گووتار))واتە شێوە گەلێکی جۆراوجۆر کە لەواندا ئەتوانرێت لە بارەی شتێکەوە قسە بکرێت،ڕێك هەر بەم هۆیەوە،ئەرستۆ ئەوان بە((گووتاری پەیوەست بە بوونەوەر)) ناو ئەنێت(فیزیك، کتێبیIII، وەرزی ١،گb٢٠٠، دێڕی ٢٨) ئەو هاوکات((گوتارەکان)) بە((ڕەگەزەکانی بوونەوەر))یش ناو ئەبات.

لێرەدا ئەبێت ئاماژە بەم خاڵە بکەین کە ئەرستۆ خۆی، لە حاڵەتێکی زۆر دەگمەندا لە بەدەست هێنانەکانی مەنتیقی خۆی سود ئەبینێت،و خوێنەری بەرهەمەکانی ئەو هەرگیز خۆیان ناچار بەوە نازانن کە یارمەتی((ئۆرگانۆن))ەکەی ئەو بدەن، لەم نێوەندەدا ریزبەندی گووتارەکان یان پۆلێن کردنیان، گرنگترین بەشێکە کە لە سنوری نێوان مەنتیق و بوون ناسیدا،جێگرە، گووتارە(دە)یینەکانی ئەرستۆ ئەمانەن:

(ناوەڕۆك،ئوسیا)(چەندایەتی)(چۆنایەتی)(پەیوەست،زیادکراو)(شوێن،ڕێگا)(کات)(بزەچە)(موڵکداری)(کردار)(هەڵچوون-کرداراندن) (گووتارەکان،وەرزیIV،گ b١،دێری ٩٥-2a، دێڕی ٤).

لەم نێوانەدا گووتاری (ناوەڕۆك) لای ئەرستۆ گرنگیەکی تایبەتی هەیە، لەبارەی ئەم واژەیەو ماناکەی لێرەدا ڕوونکردنەوەیەکی کورت ئەخەینە ڕوو، ئەوەی لە دەستەواژەی فەلسەفی،لە ڕێگای وەرگێڕانە عەرەبیەکانی نووسینەکانی ئەرستۆ((جوهر))ناو نراوە، بەرامبەری واژەی یۆنانی(ousia)یەو خۆیشی وەرگیراوە لە کرداری یۆنانی(eimi) بەمانای(هەبوون)ە و شێوەکەی لە(ناوی بکەری تاك و مێ)ی ousa، وەرگیراوە کە ڕێك بەمانای(هەبوو)یان (کائن)ەو ئوسیا وەك بەرهەمی(مصدر) یان(اسم مصدر)ی واتە بەمانای((هەبوونێتی))((کینونت))ی عەرەبی و بەدەر لە واژەیەکی فەلسەفی بەمانای(دارایی،خواستراو، موڵکداری کەسیاریانە،وهاوکات باروودۆخ وحاڵەت ،دێت،لە وەرگێڕانە لاتینیەکانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ کە دواتر بوویە بنەمای وەرگێڕانەکانی لە

ئــەوروپادا، ousia بــە شــێوە گــەلی (essential)، (queentia)، (substantia) و هاوکات(entitia)(کە لە هەموویان وردترە) هاتووە.

ئوسیا ئەوکات لە سەردەمی ئەفلاتوون بەدواوە، هاومانا لەگەڵ سروشت و ناوەرۆك و دژی (genesis) بەمانای (دروست بوونی)(زایین) بەکار هێنراوە، و بەڵگە بووە لەسەر بوونایەتی و بوونێکی جێگیر و ناسەرنگوم، (بۆنموونە،سە:ئەفلاتوون، تیمایۆس،٢٩c، ٢٣٢c).

لــەلای ئەرســتۆ ئوســیا بــە مانــای( بــونێتی قــەدەری یەکــەم) و لــە نوســینە جۆراوجۆرەکانیدا ئەولە شێوە جیاوازەکانی ماناکانی دا بەکار ئەهێنێت، لە لایەکەوە ئەو بە هاومانای(چیەتی)(ما الشیء یان ما هوالشیء ) دائەنێت و لە لایەکی ترەوە،بەو شێوەیەی کە ئەبینین،ئەو پێناسە ئەکات و بۆ دووبەش دابەشی ئەکات، زۆربەی یەکەمین وەرگێڕانە کۆنە عەرەبیەکان،(ئوسیا)یان _لەوانەیە هاوشێوەی پێشەنگە فارسیەکەی بێت_ بە (جوهر) وەرگێڕاوە،هەندێکیش بە((الذات)) وەریان گێڕاوە،(جوهر) لە زمانی پەهلەویــدا بــەمانای (سروشــت ،ماهیــەت ونــاوەرۆك)هــاتووە، بەهــەر حــاڵ، لــە واژەی(جــوهر)دا مانــا زۆر ورد و گــرنگ و هەمەلایەنەکــەی (ئوســیا) وون ئــەبێت، بــەم شێوەیە باشترین شێوە ئەوە بووە کە یەکەمین وەرگێڕەکان ئەم واژەیەیان بە هەمان شێوە بنچینەییەکەی خۆی(ئوسیا)بەکار بهێنایە، وەك چۆن هەندێك لە واژەکانی تری زمانی یۆنانییان وەك خۆی یان بە کەمێك گۆڕانەوە دارشتووەتەوەو عەرەبێنراوە،و بەکار هێناوەتەوە،(وەك قاتیغۆریاس،باری ارمینیاس،انالوطیقا و...)ئێستاکە باشتر وایە وردە وردە لــە وەرگێڕانــە فارســیەکەی و کوردیەکــەی بەرهەمــەکانی ئەرســتۆ هــەمان واژەی(ئوســیا) بــەکار بهێنرێــت، تــا مانــا و چــەمکە بنــچینەییەکەی ئەرســتۆ لــەناو نەچێت(لەبارەی ئوسیا،سە،ئۆوێنس،١٥١-١٣٧).

ئەرستۆ چەند پێناسەیەکی لە(ئوسیا) هەیە، لە شوێنێکدا ئەڵێت: ئوسیا لە وردترین و یەکــەمین وباشــترین دەربڕینێکــدا ئەوەیــە کــە نــە لــە بابەتێکــدا ئــەوترێت وە نــە لــە بابەتێکدایە، وەکو کەسانێك یان ئەسپێك، بەڵام ئەو لە ناوەرۆکە دووەمینەکانیش قسە ئەکات، واتە ئەو جۆرانەی کە ناوەرۆکە یەکەمینەکانیان تێدایەو ئەوانەش کە هەروەك رەگــەزەکان،جۆرەکان لــە خــۆ ئــەگرن،وەك جــۆری (مــرۆڤ) کــە مرۆڤێــك لــە خــۆ ئــەگرێت و رەگەزێك کە ئەم جۆرە پەیوەستە پێیەوە،واتە گیاندار(ئاژەڵ)، واتــە مرۆڤ و ئاژەڵ-یان جــۆرو و رەگــەز-بــە ئوســیا دووەمینــەکان ناویــان ئــەبرێت،(گوتارەکــان،وەرزی ٥،گ ٢a، دێرەکــانی ٩-١١) لــە نێــوان ناوەرۆکــە دووەمینەکانــدا،جۆر زیــاتر ناوەرۆکــە تــا

رەگەز،چونکە زیاتر نزیکە لە ناوەرۆکی یەکەمەوە، چ، ئەگەر بە سەرنجەوە لە ناوەرۆکی یەکەم بپرسرێت کە ئەمە چیە؟ و لە وەڵامدا جۆرەکان دەربڕن،ئەم وەڵامە ئاگایەترو شایستەترە لەوەی کە (رەگەزەکان) دەربڕن،بۆ نموونە ئەگەر لەبارەی تاکێکی دیاری کراو بڵێن((مرۆڤ))ە، ئاگایەنەترە لەوەی کە بڵێن ((ئاژەڵ))ە، چونکە ئەوە (جۆرێك)ی تایبەت بەوە، و ئەم (رەگەزە) زۆر گشتگیرتر و هەمەلایەنترە لەو(هەمان وەرز، گ2b، دێرەکانی ١٢-٨) لە لایەکی ترەوە،ئوسیا پێش هەر شتێکی تر لای ئەرستۆ بەڵگەیە لەسەر((ئەم شتە لێرەدا))(هذا الشيء)) و ئەمەش لەبارەی (ناوەرۆکە یەکەمینەکان)ەوە راستە، کە بەڵگەیە لەسەر((ئەم شتە لێرەدا))، چونکە ئەوەی کە ناوەرۆکی یەکەم بەڵگەیە لەسەری، کەسێکە و ژمارەییانەش(یەکێك)ە،(هەمان وەرز، گ3b، دێرەکانی ١٢-١٠).

بەلام گوتاری ئوسیا لای ئەرستۆ،تایبەت نابێت بە((گووتارەکان))، بەڵکو بە توێژینەوەیەکی گرنگی ئەو لەبارەی میتافیزیك ئەژمار ئەکرێت، بە تایبەتی کتێبەکانی چوارەم و شەشەم و حەوتەمی کە بە درێژی لە بارەی (ناوەرۆك) لێکدانەوە ئەکات، لە شوێنێکدا ئەڵێت:(( یەکەمین بوونەوەر کە نەك فلأن بونەوەرە، بەڵکو بونەوەرە بە شێوەیەکی رەها،ئەبێت کە ناوەرۆك(ئوسیا) بێت))...((یەکەمین)) بە زۆر مانا هاتووە، بە بوونی ئەمەش لەسەر بنەمای پێناسە یان لەسەر بنەمای مەعریفە وناسین ویان لەسەر بنەمای زمان، و بە هەموو ماناکانیەوە،(ئوسیا) یەکەمینە، چون هیچ یەك لەم هەڵگیراوانەی تر ناتوانن بەجیا بوونیان هەبێت، و تەنها(ناوەرۆکە)کە بەم شێوەیەیە،بە پێی پێناسە یان (چەمك و تێگەیشتن و مانا)ش ئوسیا یەکەمینە، چونکە لە پێناسەی هەموو شتەکاندا ئامادەیی پێناسەی (ناوەرۆك) شتێکی بێ قسەیە(میتافیزیك،کتێبی VII،وەرزی ١، گ 1028b،دێرەکانی ٣٥-٣٠) لە شوێنێکی تردا هاتوە کە ئوسیا(ناوەرۆك) بە شێوەیەك، مەبەست لە تەنە سادە و ئاسانەکانە، وەك خاك، ئاگر، ئاو، و وەکو ئاوێنەکان، و بە شێوەیەکی گشتی تەنەکان و ئەوەش کە تێکەڵەیەکە لەوان لە گیانەوەران و بوونەوەرە بەهەشتیەکان و ئەندامەکانی ئەوان، هەموو ئەمانە بە (ناوەرۆك)ناو ئەبرێن، چونکە هەلگیراویی بابەتێك، شتێکە نایەتە ئاراوە، بەڵکو شتگەلێکی تر ئەبنە هەڵگیراوی ئەوانە، هاوکات(ناوەرۆك) بەوە ئەوترێت کە هۆکاری(خودێتی)(دەرونی بوون) بوونایەتی شتەکانە ونابێتە هەڵگیراوی بابەتێك، وەکو دەروون لە گیانەوەراندا، و هەموو بەشە دەروونی یان خوودیەکانی ئەو شتانەی کە ئەوان سنووردار ئەکەن، و بەڵگەن لەسەر((ئەم شتە لەم شوێنەدا))،لە ئەنجامدا ئوسیا بە دوو شێوە ئەوترێتەوە:١_هەروەك کۆتا بابەت کە بەدەر لەو، بە شتێکی تر ناسەلمێنرێت

٢_ئەوەی((ئەم شتە هەیە لێرەدا))یە و جیایە(هەمان سەرچاوە،کتێبیV، وەرزی ٨، گ ١٠١٧b، دێرەکانی ١٥,٢٥–١٠ ).

ئەرستۆ هاوکات لەبارەی هەڵگیراوەکان،واتە پەیوست کەرەکانی چەمکە گشتیەکان لەگەڵ ئەو بابەتانەی کە ئەوان ئەبنە هەڵگیراویان، قسە ئەکات،ئەم هەڵگیراوانە کە لە دەستەواژەی مەنتیقی دا(( پێنجینەکە))ناو نراون، کە بریتین لەمانە(رەگەز)(جۆر)(جیاوازی)(تایبەتمەندی)(رووداو–دەرکەوت).

ئەرستۆ ئەم دابەشکاریەی هەڵگیراوەکان لە سەر بنەمای پەیوەندی نێوان بابەت و هەڵگیراوی مەسەلەیەکدا جێگیر ئەکات،چونکە هەر شتێك ببێتە هەڵگیراوی شتێکی تر، یان پێچەوانە ئەبێتەوە بۆ بابەت، یان نیە،ئەگەر پێچەوانە (هەڵگەڕاوە) بێت، یان پێناسەی بابەتەکە ئەدات یان تایبەتمەندی بابەتەکە، هەر کە چیەتی (ماهیەتی) بابەتەکەی دەربڕی،((پێناسەیە)) و ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، تایبەتمەندیە، بەلام ئەگەر هەڵگیراوەکە هەڵگەراوە (پێچەوانە بوو) نەبێت، یان یەکێکە لەو سیفەتانەی کە لە پێناسەی بابەتدا دراوە(کاتێك کە رەگەزە) یان ئەگەر یەکێك لە سیفەتەکان نەبێت کە لە پێناسەکەدا دراون، ئەوکات((رووداوە))،چونکە رووداو ئەوەیە کە لە حاڵەتێکدا کە پەیوەست و لکاوە بە بابەتەوە،نە پێناسەیە وەنە رەگەز و تایبەتمەندیە(توپیکا،کتێبی I،وەرزی ٨،گ ١٠٢b،دێرەکانی ١٩–١).

ئەرستۆ لە بارەی پێناسە یان( ئاست) ئەڵێت:پێناسە خستنە سەر یەکی رەگەز و جیاوازیەکانە،رەگەز ئەوەیە کە هاوبەشە لە نێوان (جۆر)گەلێکی زۆردا، (جیاوازی) جۆنایەتی گەلێکی (بێ دەرکەوتە)، کە (جۆر)ەکان لێك جیائەکەنەوەو و دیاریان ئەکەن، پێناسەی چیەتی(ماهیەتی) شتێك دیاری ئەکات و دەرئەبڕێت، بۆ نموونە لە وەڵامی ئەوەی کە مرۆڤ چیە؟ سەرەتا ئەڵێین کە(گیاندار)ە–کە رەگەز دیاری ئەکات–پاشان ئەبێت هەموو ئەو جیاوازیانەی بخەینە سەر کە مرۆڤ خاوەنیانە،و باقی گیانەوەرەکانی تر خاوەنیان نین، واتە قسە کردن یان بیرکردنەوە و لە پێناسەی ئەودا ئەوترێت((مرۆڤ بوونەوەرێکی قسەکەر و بیرکەرەوەیە).

توێژینەوەیەکی تری زۆر گرنگ لە مەنتیقی ئەرستۆدا، قسەکردنە لەسەر(مەسەلە)،مەسەلەی سادە قسەیەکە کە بەڵگە بێت لەسەر بوون یان ئامادەیی شتێك لە شتێکی تردا، لەرابردوو، ئێستا و داهاتوو،(مەسەلە) یان ئیجابیە یان سلبی، واتە یان شتێك ئەداتە پاڵ شتێکی تر، یان لێی ئەسێنێتەوە(پری هرمنیاس،وەرزی ٥،

گ١٧a،دێری ٢٣) ئەرستۆ لە(شیتەڵکاریە یەکەمیەکاندا) زۆر بە درێژی قسە لەسەر (مەسەکان)ئەکات.

قسەو لایەنێکی زۆر گرنگتر لە مەنتیقی ئەرستۆ(پێوانە) یان( هاوگووتەکان)، ناسینی زانستی بە مانا راستەقینەکەی، لە هەڵهێنجاندنی بەشەکی لە گشتایەتی و هۆکارێنراو لە هۆکاردایە، بە دەربڕینی خودی ئەرستۆ ناسێنراوی هەر شتێك بە شێوەیەکی رەها، کاتێك بەدەست دێت کە بزانین هۆکارەکەی چیە، و ئەمە هۆکاری ئەو شتەیە نەك هۆکاری شتێکی تر، و ئەبێت بشزانین کە ئەو شتە ناتوانێت بە شێوەیەکی تر بێت (شیتەڵکاریە دووەمیەکان،کتێب I، وەرزی ٢، گ٧١b،دێری ١٠) واژەی (پێوانە) ناونیشانێکە کە یەکەمین وەرگێرە عەرەبەکانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە بەرامبەر واژەی یۆنانی(سولۆگیسموس) هەڵیان بژاردووە، ئەم واژەیە لەپاڵ مانا جۆراوجۆرەکانیدا،جۆریکە لە(هاوگوتەکان) یان (گووتە لەسەر یەکخراوەکان) کە مەبەست لەوانە(هەڵهێنجانە)، ئەرستۆش ئەم دەستەواژەیەی بەم مانا گشتیەکەی(ئاساییەکەی) بەکار هێناوە(گوتار،کتێبی I،وەرزی ١١، گ ١٣٧١b، دێری٩) بەلام وەرگێرە عەرەبیەکان چەندین جار هەمان واژە یۆنانیەکەیان عەرەباندوەو بە شێوەی(سلوجسموس)و (سلیجسموس) بەکاریان هێناوە (بۆ نموونە، سە: ئەرستۆ، مەنتیق،١ /١٠٤،١٠٦).

ئەرستۆ لە سەرەتای قسەکردن لەسەر((پێوانە)) ئەڵێت: ئێمە ئەبێت سەرەتا ئیش لەسەر ئەوە بکەین کە بابەتی توێژینەوەکەی ئێمە چیە،و لەبارەی چیەوەیە؟ توێژینەوەکەی ئێمە لە بارەی(بەڵگە) و ناسینی بەڵگەیەکە (مەعریفەی بەڵگەداری)، و پاشان ئەبێت بزانین کە پێشەکی،ئاست و پێوانە چیە و کامیان کامڵەو کامیان کامڵ نیە (شیتەڵکاریە یەکەمیەکان)،کتێبیI،وەرزی ١، گ ٢٤a، دێری ١٠). پێشەکی گووتەیەکە کە شتێك لەبارەی شتێك بە پێویست ئەزانێت یان لێی ئەسەنێتەوە، ئەویش یان (گشتێك)ە یان(بەشێك)،یان دیاری نەکراوێك و پشت گوێ خراوێك (هە.س،دێری ١٦)، پێشەکی هاوکات بە دوو شێوازە، یان(بەڵگە)ییە،یان (دیالێکتیکی)یە، جیاوازی نێوان ئەم دووانە ئەوەیە کە پێشەکی بەڵگەداریانە دەربڕینی یەکێکە لەو دوو بەشە لێك جوودایە، چونکە بەڵگەهێنەرەوە لە بارەی پێشەکیەوە پرسیار ناکات،بەڵکو دایئەنێت، لەکاتێکدا کە پێشەکی دیالێکتیانە لە بارەی هەڵبژاردنی یەکێك لە دو لایەنە لێك جیا وناهاوتاکەیە(هەمان، کتێبی I،وەرزی ١، گ ٢٤a، دێرەکانی ٢٥-٢٣) .

ئەوکات ئەرستۆ لە پێناسەی پێوانەدا ئەڵێت: پێوانە گووتارێکە هەر کە شت گەلێك بخرێنە ناو دەروون(یان کایەکە)، وەك پێویستیەك شتێکی تر لە خودی ئەو دەرووناندنەدا دێت بە دوایدا،مەبەست لەمەش ئەوەیە کە ئەنجام لە خودی ئەوانەوە بەدەست دێت، و پێویست بە هیچ شتیکی دەرەکی ناکات کە ئەنجامەکە بکاتە شێوە پێویستیەك (هەمان وەرز،گ 24b، دێرەکانی ٢٣-١٩).

هەر پێوانەیەك خاوەنی (٣) ئاستە،ئاستی گەورە ، ئاستی بچووك ،ئاستی مامناوەندی، پەیوەندیە جیاوازەکانی ئاستی ناوەندی لەگەڵ دوو ئاستەکەی تر، شێوە(سێینەکانی) پێوانە ئەهێننە ئاراوە، ئەگەر ئاستێکی ناوەندی لە پێشەکی گەورە و بابەت لە پێشەکی بچوکدا، هەلگیراو بێت، شێوەی یەکەم بەدەست دێت، و ئەگەر لە هەردووکیان پێشەکی، بابەت بێت، شێوەی سێهەمی پێوانە دروست ئەبێت، لە نێوان شێوە(سێینەکانی) پێوانەدا، شێوەی یەکەم زانستی ترینیانە، چونکە نە تەنیا لە زانستە بیرکاریەکاندا،بەڵکو لە زانستی ژمێریاری،ئەندازیاری و بەدەر لەمەش لە هەموو ئەو زانستانەی کەلە بارەی(بۆ چیەتی)(هۆکار) تویژینەوە ئەکەن، هەر بەکار دێت( شیتەڵکاریە دووەمیەکان، کتێبی I،وەرزی ١٤، گ 70a، دێرەکانی ٢١-١٨ وە بە درێژیش، سە: وەرزی ٤، گ 25b، دێری ٣٢،وەرزی ٥، گ 26b، دێری ٢٤، وەرزی٦ ،گ 28a ١٥-١٠).

پێوانە نە تەنیا بەڵگەداریەکە لە گشتەوە بۆ بەش، بەڵکو هاوکات بەڵگەداریەکە لە بەشەوە بۆ گشت، واتە دۆزینەوەی گشتایەتیەك لە رێگای بەشایەتیەکەوە، ئەرستۆ ئەم شێوازەی ناو ئەنا(ئیستقرا)، واتە کەوتنە رێ بەرەو گشتێك لە رێگای ئەژمارکردن و پێداچوونەوەی تاکەکان و بەشەکان، ئەم دەستەواژەیە بۆ یەکەمین جار لە لای ئەرستۆ دەست ئەکەوێت، ئیستقرا بەرەو پێش چوونە لە (تاك شتەکانە)وە بەرەو گشتایەتیەکان، بۆ نموونە، کەشتیوانی باش، باشترین کەشتیوان و،گالیسکەوان باش، باشترین گالیسکەوانە، کەواتە بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێکی لێزان لە هەر مەسەلەیەکدا، باشترینە، ئیستقرا باوەڕپێکەرترو ڕوونترە و لەسەر بنەمای پەی بردنی هەستەکی ناسراوترە، و لە نێوان خەڵکی ئاساییدا هاوبەشە، بەلام پێوانە پێویست هێنەرتر و لەدژی ناهاوتاییەکان،چالاکترە.(توپیکا،کتێبی I، وەرزی ١٢، گ 105a، دێرەکانی ١٩-١٣ ).ئەرستۆ لە نووسینێکی تردا ئەڵێت: ئیستقرا بنەمایەك گشتێك بەدەست ئەهێنێت و پێوانەش لە گشتایەتیەکانەوە دەست پێ ئەکات، کەواتە گشتایەتی گەلێك هەن کە پێوانە لەوانەوە دەست پێ ئەکات، لە کاتێکدا کە بۆ ئەوانە پێوانەیەك

بـوونی نیـە و لـە رێگـای ئیـستقراوە بەدەسـت دێـت(ئـەخلاقی نیکۆمـاخۆس، کتـێبی VI،وەرزی ٣، گ ١١٣٩a، دێرەکـــانی ٢٨،٣١) ئەرســـتۆ یاســـاکانی ئیـــستقرا لـە(شـیتەڵکاریە یەکەمینـەکان)دا بەدەسـتەوە ئـەدات.(کتـێبی II، وەرزی ٢٣، گ ٦٨b، دێری ١٥ بەدواوی).

ئەرسـتۆ بـە شـێوە بەڵگەهێنانەوەیـەکی تـر، واتـە بـاس لـە (سـەلماندن ) ئـەکات،( سەلماندن) پێوانەیەکە کە لە پێشەکیە راستەقینەو یەکەمینەکانەوە بەدەست دێت، یان بـەو شـێوەیەیە کـە کانگـای ناسـینی ئێمـە بـۆ ئەوانـە، لـەو پێـشەکیە یەکـەمین و راسـەقینانەوە بەدەسـت دێـت، پێشەکیە یەکـەمین و راسـتەقینەکان ئەوانـەن کـە نـەك لـە رێگای شتێکی ترەوە بەڵکو لە رێگای خۆیانەوە باوەڕدارێتی دروست ئەکەن، چونکە لـە روانگـەی بنـەما مەعریفیـەکانی دڵنیـای زانـستییەوە ،پێویـست ناکـات کـە لـە(بـۆ چی)یەتیەکـەی بپرسین،بەڵکو هەریەکە لـەو بنەمایانـە لە خـودی خۆیانـدا بـاوەڕدارێتی دروست ئەکەن، بەڵام بیڕراو قبوڵکراوەکان ئەوانـەن کـە هـەموو خـەڵکی یـان زۆرترینیـان، یـان بەهرەمەنـدەکان یـان زۆرترینیـان یـان بـەناوبانگترینیان، یـان بەرجەسـتەترینیان گومانیان لێیان هەیە(توپیکا،کتێبیI,وەرزی ١،گ١٠٠a، دێری ٢٣).

ئەرستۆ لـە شـوێنێکی تـردا ئـەڵێت:( سـەلماندن ) پێوانەیەکـە کـە بەرهـەم دەرەکـەی مەعریفـەی زانـستی دڵنیایـە،( شـیتەڵکاریە دووەمیـەکان،کتێبی I، وەرزی٢،گ ٧١a، دێرەکانی ١٩-١٠) ئەگـەر ناسین بەم مانایەیە، کەواتـە (زانستی سـەلماندن ) ئـەبێت لـە پێشەکی گەلێکی راستەقینە،یەکەمین،و بێ پەیوەند،ناسراوتر و پێشتر لە ئەنجام بێـت و هۆکارەکانی ئـەو بـدات بەدەستەوە(هـەمان،دێرەکانی ٢٣-٢٠)،سەرچاوەی ( سـەلماندن) پێشەکیەکی بێ پەیوەندە کە پێشەکیەکی تری لە پێش خۆیەوە نیە، پێشەکیش یـەکێك لە دوو بەشەکەی (مەسەلە)یە کە لەودا بەشێك ئەبێتە هەڵگری بەشێکی تـر(هـەمان وەرز، گ٧٢a، دێرەکانی ٩-٧)، لەلایەکی ترەوە ئەرستۆ ئاگاداری ئەوە بوو کە لە بەڵگـەداری پێوانەییـدا، پێـشەکیەکان، خۆیـان پێویـستیان بـە سـەلماندنە، و بـەم شـێوەیە ئەگـەر بمانەوێت ئەم ئیشە بکەین، دوچاری شتێکی بێ کۆتایی ئەبین، لەبەر ئەمە ئـەبێت بـە دوای(بنـەما)یەکدا بگەڕێین کە لـە سـەرەتاو بێ بوونی پەیوەندێك، لـە رێگـای تێڕوانین دەروونـی و بـەبێ یارمـەتی وەرگـرتن لـە هـیچ (سـەلماندن)ی تر،باوەڕمـان بـە رێکـی و دروسـتی هەیـە، و گـرنگترین بنـەمای (نەسـەلمێن) (بنـەمای نـەبوونی ناهاوتـایی)یـە، کەلەسەر بنەمای ئەوە بوون و نەبوونی شتێك،هەردوکیان، لەیـەك شوێن و لەهـەمان شت

و لەهەمان کاتدا، هەم هەبوون و هەم نەبوونی ئەو شتە قبول بکات (میتافیزیك، کتێبی IV،وەرزی ٣، گ ١٠٠٥b؛دێری ٢٠ بەدواوە).

**فەلسەفەی سروشت:**

ناسینی سروشت لە لای ئەرستۆ،یەکێکە لە بەرجەستەترین بەدەست هێنانە فەلسەفیەکانی ئەو، کە ئاگاییەکی تەواو لێی، لەناو توێژینەوەکانی دایە،و لەبازنەی مەبەستایەتیەکەی ئێمە لەم گووتارە، بەدەرە،لێرەدا تەنیا باس لە ناوکە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سروشتی ئەو ئەکەین، یەکەم ئەبێت ئەوە بەیادی خۆمان بهێنینەوە کە تا ئێستاکە، بە شێوەیەکی نەریتی وائەزانرێت کە فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ،تێبینی کردنی تەواوی سروشتە لەسەر بنەمای((هۆکارە چوارینەکان))-کە ئاماژەیان پێ ئەکەین-ئەم تێگەیشتنە بەهیچ شێوەیەك درست نیە، فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ،تێڕوانینێکی گشتی و هەمەلایەن ویەکێتیەکی شێوە سیستەم نیە، بابەتی سەرەکی ئەو پرۆسەی سروشت و شتە سروشتیەکانە و ئەوەی کە تیایدا ڕوو ئەدات، وەك، دروست بوون،جوولە، سەرنگوومی، تیۆریەی هۆکارە چوارینەکان، شێوازێکە لە گەڕان کە بە هۆیەوە توێژینەوە لەسەر پیکهاتەی ڕووداوەکان سروشت ئەکرێت. تیۆریەی بنەماکان و هۆکارەکان، لای ئەرستۆ،ئامراز گەلێکن کە ئەو بە یارمەتی ئەوانەوە هەوڵ ئەدات کە دوونیای ئەزموونە سروشتیەکان پەی پێ ببات، لە ڕوانگەی ئەوەوە،دونیای ئەزموونی بێ پەیوەند، زیاتر((تێکەڵ و پێکەڵی))یەکی هەستیە، کە تۆخم و بنەماکانی دواتر لە ڕێگای شیتەڵکاریەوە بۆ ئێمە ئەناسرێن (فیزیك،کتێبیI،وەرزی ١،گ١٨٤a، دێری ٢٢) .

لەلایەکی ترەوە،فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ، بەرهەم هاتووی مقۆمقۆکانی ئەوە لە گەڵ تیۆرەکانی پێشوودا، واتە سروشت ناسی فەیلەسوفەکانی پێش سوقرات و بەتایبەتی زۆر لەکێشمەی تیۆرەکانی ئەفلاتوندایە، ئەوەی ئێستاکە بە فیزیای ئەرستۆ ناوئەبرێت، ٤ کۆمەڵەیە کە ئەندرۆنیکس ناوونیشانی فیزیا یان(بیستایەتی سروشت) کۆکردۆتەوە، ئەم کتێبە لە ڕاستیدا یادداشت گەلێکن کە ئەرستۆ بۆ گووتار و وانەکانی خۆی نوسیوونی.

پرسیاری بنەمایی ئەوەیە لە لای فەیلەسوفەکانی پێش ئەرستۆ،کە شتەکان چۆن دروست بوون و ئەم دروست بوونەش چۆن ڕووی دا،وسەرەنجام پاڵنەری لەناوچوون لە بوونەوەراندا چیە؟ ئەرستۆ خۆی سەرقاڵی هەموو ئەم پرسیارانە ئەکات و هەوڵ ئەدا کە

وەلاّم گەلێکی زۆر مەنتیقی و ئەقلاّنەیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەو لەبارەی سروشتەوە ئەلّێت کە هەندێ لە بوونەوەرەکان بە شێوەیەکی (سروشتی) phusei بوونیان هەیە، و هەندێکی تر بە چەند هۆیەکی کە(تر)، واژەیphusis لە یۆنانیدا لە چاوگی phuo بەمانای هێنانە بوون و پەروەراندن و ڕواندن و زایین دێت، ئەو بوونەوەرانەی کە بە شێوەیەکی سروشتی بونیان هەیە وەکو گیانەوەران و بەشەکانیان، گیاکان و هەموو تەنە سادەکانی وەك زەوی، ئاگر و ئاو وهەوا، ئەمانە هەمویان لەگەلّ ئەو شتانەی مانەوەیان بە شێوەیەکی سروشتیە،جیاوازن، هەریەك لە بوونەوەرە سروشتیەکان، لە خۆیاندا خاوەنی سەرچاوەی جولّەو وەستانن-هەندێ لە ڕوانگەی جوولّە لەشوێندا،هەندێ لە ڕوانگەی زیادکردن یان ڕواندن،و هەندێکی تر لە ڕوانگەی لەناوچوون (هەمان ،کتێبی II،وەرزی ١،١٩٢a، دێری ١٤).

ناوکی بنەمایی لە فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ، چەمکی(جولاّنەوە) یان(جوولّە)یە، تێبینی و پەی بردنی هەستەکی، پیشان ئەدات کە شتەکان بەردەوام لە حالّەتی لەناوچووندان، شتێك ئەبێت بە شتێکی تر، وئەو ئەویتر بووەش جارێکی تر لەناو ئەچێت و بەم شێوەیە، بوونەوەران هەموویان بەردەوام لە حالّەتی(ببوون)دان،ئێستاکە پالّنەری ئەم لەناوچوونە چیە؟ ئەرستۆ بە جوولّەی ئەزانێت، بەژمارەی جۆری بوونەوەرەکان لە جیهاندا،جوولّەو لەناوچوون بونیان هەیە،هەرشتێك کە ئێمە پێی ئەلّێین(بوونەوەر)، یان کردارێتی و واقعیەتە، یان شوێن و توانایی(هێز)، بەم شێوەیە ئەرستۆ ئەلّێت:( جوولّە واتە کردارێتی یان کەمالّ، ڕوودان، یان بە مانایەکی وردتر((بەئامانج گەیشتن))ی ئەوەی لە((تواناداا بوون)) و هێزداری هەیە، لەو ڕوانگەیەوە کە (خۆهێزە)، بۆ نموونە کردارێتی ئەوەی (لەناوچووە)،هەروەك (لەناوچوونی)یە، یان کردارێتی ئەوەی دروستکراوە یان لەناوبراوە، بە(هاتنەئارا و لەناچووچوون) ناو ئەبرێت، و ئەوەش کردارێتی ئەوەی کە جێگۆرکێی پێ ئەکرێت، هەمان ئەو جوولّەیە لە شوێندا،(هەمان،کتێبیIII،وەرزی ١، گ٢٠١a،دێرەکانی ١٤-٨).

دوو چەمکی تری گرنگ لە فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ، (مادە-هیولی) و(شێوە) یە، لە هەر شتێکدا کە لەناو ئەچێت، هەمیشە ئەبێت بابەتێك بوونی هەبێت، واتە شتێك لە(ببون)دایە، وهەرچەندە ژمارەییانە" یەك"ێکە، بەلاّم لە ڕوانگەی شێوەوە "یەك"ێك نیە(هەمان،کتێبی I،وەرزی ٧،گ١٩٠a،دێری ١٤) ئەم بابەتانە ئەرستۆ بە(مادە)ناویان ئەبات، ولە پێناسەیدا ئەلّێت کە: مادە یەکەمین بابەتی هەر(تاك شتێك)ە کە ئەو شتە لەو پێك دێت_لەودا نەك بە شێوەیەکی دەرکەوتانە تیایدا بێت_ و ئەگەر ئەو(مادە)یە لەناو

بڕوات، ئەو شتەش هاوکات لەگەڵ ئەودا لەناو ئەودا لەناو ئەچێت،(هەمان کتێب، وەرزی ٩، گ١٩٢a، دێری ٣٠ بەدواوە) مادە خۆی لە خۆیدا ناسێنەر نیە، هەندێك لە مادەکان هەست پێکراون و هەندێکی تریان(ئەقڵ پێ براون-ئەقڵێنراون)، مادەی هەست پێکراو وەك، تەختە و هەرشتێك کە جووڵەی تێدایە، مادەی ئەقڵ پێبراو، ئەوەیە کە لە (هەست پێ کراوەکان)دا بوونی هەیە، بەلاّم نەك هەروەك (هەست پێکراوەکان)بێت،وەك بابەتە بیرکاریەکان(میتافیزیك، کتێبی VII، وەرزی ١٠، گ١٠٣٦a).

لێرەدا ئەبێت ئامارژە بەوە بکەین کە واژەی(هیولی، یان مادە) لە یۆنانی دا لە بنەچەدا واتە(تەختە و دارستان)،مادە هاوکات(بوونەوەرێکی خۆهێزە) واتە(هێشتا نیە)یەکە(فیزیك،کتێبی I، وەرزی ٩، گ١٩٢a، دێری ٤) بەلاّم شێوە، ئەو شکڵ یان وێنەیەیە کە مادە لە حاڵەتی لەناوچوونیدا ئەیگرێتە خۆ، مادە یان شێوە،((هاوکات هۆکاری پایەدار)) بۆ شتە دروستکراوەکانن، بۆ نموونە وەك دایك(هەمان گ، دێرەکانی ٢٤-٢٠).

بوونەوەرەکان بریتین لە بوون و ئامادەیی هاوکاتی مادە و شێوە، و ئەم دوانە هەرگیز لە شتەکاندا لێك جودا نین،بە کورتی لە روانگەی ئەرستۆوە، لە هەر لەناوچوونێکدا سێ حاڵەت ئەبینرێت، مادە،واتە بابەتێك کە لەناوچوونەکە لەودا روو ئەدات، و شێوە کە هەموو شتێکی لەناوروچوو ئەگرێتە خۆ، و (نەبوون)، واتە حاڵەتێك لەشت، پێش ئەوەی کە لەناو بچێت، یان حاڵەتێکە لە شتێك کە هێشتا شێوەیەکی دیاری کراوی نەگرتۆتە خۆ(هەمان کتێب،وەرزی ٧، گ ١٩١a، دێری ١٢ بە دواوە).

بوونەوەری واقعی، هەمان(گشت)ی دیاری کراو، یان(گشت)پێکەوە، یان تێکەڵەیەکە لە (مادەو شێوە)، مادە بە تەنیایی بە پێی ئەم تیۆریە ئەناسرێت، چونکە پەیوەندی برۆنز و پەیکەر، یان تەختە بە سەکۆ-لەگەڵ ئەوەشدا مادەو ئەوەش کە بێ شێوەیە- پێش قبوڵکردنی شێوە،-وەك پەیوەندی مادە بە (ئوسیا) و ئەم شتەش لێرەدا- واتە- (تاك شت)ێك-بە بوون(هەمان گ، دێرەکانی ١٢-٨).

لە پەیوەندی لەگەڵ مادە و شێوە،ئەرستۆ دوو گووتاری تری هێناوەتە ئارا،(هێز) و(کردارێتی) یان واقعیەت و(ئەوپەڕی هاتنە ئارایی).ئەم دوو واژەیە هەر دووکیان دروستکراوی خودی ئەرستۆن و لەلای ئەفلاتوون و ئەوانی تر بەدی ناکرێن، واژەی((ئنتلخیا) ئەرستۆ بۆ دەربڕین لە قۆناغێکی دروستکردوە کە (شت)ەکە لەو کاتەدا (گەیشتووە بە ئامانج)، هەر دوو واژەکە مانای جووڵە لە خۆ ئەگرن، جوڵەو کردارێتی دو خەسڵەتن، ئەرستۆ لەم بارەیەوە لە شوێنێکدا ئەڵێت: {یەکێك لە رەگەزەکانی

بوونەوەرەکان،(ئوسیا)یە کە هەندێك لێی مادەیە کە خۆی بۆ خۆی (ئەم شت) هیەك نیە، و ئەوی تر شێوە و شکڵە کە بەو (ئەم شتە) ئەوترێت، سێهەم لەسەر یەك خراوەیەك لەو دووانە، مادە(توانایی) یان (هێزە) و شێوە(ئەوپەڕی هاتنە ئارایی)(لەبارەی دەروون، کتێبیII، وەرزی ١، ٤١٢a، دێری ٦ بەولاوە).

لە شوێنێکی تردا ئەوترێت کە لە شتە دروستکراوەکاندا،مادە، هەروەك هۆکار،ئەگەری (بوونایەتی) یان(نەبوونایەتی)یە ،(لەبارەی دروست بوون و لەناوچوون) کتێبی II، وەرزی ٩، گ ٣٣٥a، دێری ٣٢) و لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست لە مادە ئەوەیە کە وەك خۆکردارێتیەك (ئەمە شت)ێك نیە، بەڵکو وەك خۆهێزیەك(ئەمە شت)ێکە.بەم شێوەیە ئەوەی لە حاڵەتی لەناوچوون و بووندا،هێشتا شێوەیەکی قبوڵ نەکردووە، واتە نەبووە بە شتێکی تر، بوونایەتی ئەو تەنیا ئەگەرێك یان بە دەربڕینێکی تر (بەتوانا)ییەکە کە لەدوای قبوڵکردنی شێوەیەك، لە شێوەی(کردارێتیەك) یان واقعیەتێك دەردێت، واتە لە حاڵەتی(ببون)دا ئەگات بە ئامانجەکەی، لەم نێوانەدا گرنگی ووشەی (جووڵە) دەر ئەکەوێت،کردارێتی کە بە(ئەوپەڕی هاتنەئارایی) یان واقعیەتەوە پەیوەستە، بەتایبەتی لە جووڵەکانەوە بۆ شتەکانی تر ئەگوازرێتەوە، چونکە بە گووتەی ئەرستۆ، گوومانی ئەوە هەیە کە کردارێتی پێش هەموو شتێك جووڵە بێت(میتافیزیك، کتێبیIX،وەرزی ٦،١٠٤٨a، دێری ٣١).

کردارێتی (ببوونێتی شت)ە،(هەمانکتێب، وەرزی ٦،گ١٠٤٨a، دیری ٣١)،کردارێتی لە هەر روانگەیەکەوە، لە پێش تواناداری یان هێزداریەوەیە، لە لایەکی ترەوە، بەو شێوەیەی کە ئاماژە کرا،هەمان ئامانج یان(مەبەست)ە،ئیش ئامانج و لەگەڵ ئەوەشدا کردارێتیشە، بەم شێوەیە، کردارێتی بە ئاراستەی ئەوپەڕی هاتنە ئارایی،واقعیەت، یان دۆزینەوەی ئامانج لار ئەبێتەوە(هەمان کتێب، وەرزی ٨، گ ١٠٥٠a، دێرەکانی ١٠,٢٣وە بۆ توێژینەوەی دوور ودرێژ لەبارەی (هێز و کردار) سە:هەمان کتێب،وەرزەکانی ٨-١).

لە قسە لەسەر کراوە گرنگەکانی فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆ، بابەتی (هۆکارە چوارینەکان)ە، کاتێك ئەتوانین شتێك بناسین کە بتوانین(چەندایەتی) و(چۆنایەتی)یەکەی روون بکەینەوە، بۆ ناسینی (چۆنایەتی و چەندایەتی) شتەکان کە دێنە ئاراوەو دروست ئەبن، و لەناو ئەچن، ئەبێت سەرنجی فاکتەرە سەرەکیە لەناو بەر و دیاردە پەیوەست کەر بەیەکەکان بدەین، لێرەدایە کە ئەرستۆ ٤ بنەما یان رەگەز ئەخاتە

بوو. كە هەر شتێك پەیوەستە بەوانەوەو هەر لەناوچوونێك بە هۆی كاریگەری ئەوانەوە بوو ئەدات:

١. هۆكار لەلایەكەوە بە شتێك ئەوترێت كە(شتێك لەو) دروست ئەبێت و لەودایە(مادە،هۆكاری مادی) برۆنز بۆ پەیكەر، یان ئەڵماس بۆ شوشە،.

٢. هۆكارێكی تری شێوە(پێشەنگ )و ئەمە مانای (چیەتی – ماهیەت)وجۆرەكانیەتی.

٣. هۆكارێكی تر، ئەو شتەیە كە سەرچاوەی لەناوچوون و بێدەنگ كردن و وەستانە، وەك باوك كە هۆكاری مناڵە،و بە شێوەیەكی گشتی (بكەر بۆ بكەرێنراو)و لەناوبەر بۆ لەناوچوو، هۆكارە،(هۆكاری بكەری).

٤. هۆكارێكی تر (ئامانج)ە كە هەمان((بۆ ئەو))ە، یان((لە پێناو ئەو))،واتە( هۆكاری ئامانجی)،وەك بە رێگادا چوون لەبەر تەندروستی (فیزیك،كتێبی II، وەرزی ٣، گ١٩٤a، دێرەكانی ٢٤-٢٦).

لەنێوان ئەم هۆكارە چوارینانەدا، هەر چەند كە دوو هۆكارەكەی یەكەم زۆر گرنگن، بەلأم (هۆكاری ئامانجی) گرنگیەكی بنەمایی هەیە، سروشت لە روانگەی ئەرستۆوە((ئامانجمەند))ە، لای ئەرستۆ((چیەتی)) و شێوە، لەو رووەوە زۆر گرنگن كە ئامانج، و((بۆ ئەو))یان تێدایە، سروشت بۆ شتێك، ئیش ئەكات،(هەمان كتێب،وەرزی ٧، گ١٩٨a،دێرەكانی ٤-٢). لە شوێنێكی تردا ئەوترێت كە خودا و سروشت،هیچ ئیشێكی بێ هۆ ئەنجام نادەن ( لەبارەی ئاسمان،كتێبی I، وەرزی ٤، گ ٢٧١a، دێری ٣٣).

لێرەدا شایستەیە كە ئەوەی لای ئەرستۆ ((ماهیەت))ی ناوە،كەمێك باسی لێوە بكەین، یەكێك لە تایبەتمەندیەكانی ئەرستۆ ئەوەیە كە هەوڵ ئەدات لایەنە جۆراوجۆرەكانی زمانی یۆنانی بۆ وردتر دەربڕینی چەمك و مەبەستەكانی خۆی بەكار بهێنێت، ئەو بۆ دەربڕین لەوەی كە زۆر جار((چیەتی)) یان((ماهیەت))ی پێ ئەوترێت، تێكەڵەی (to ti en einai) پێك هێناوە، ئەم دەربڕینە یەكەمجار وەرگێڕە عەرەبەكان، لە نووسینە مەنتیقی و سروشتیەكانی ئەرستۆ، زۆر جار بە ((ماهیەت))وەریان گێڕا بوو،بەلأم هەندێ كاتیش بە(الانیە)(انیە الشیء )و(ماهو بالانیە)و(الهویە) وەریان گێڕاوە، كە هیچ كامیان مەبەستە وردەكەی ئەرستۆ ناگەیەنن، تەنها لە یەك شوێندا لە بەرامبەر دارێژراویەكەی(ما هو وجو الشیء فی نفس جوهرە) هاتووە كە بۆنێكی تازەیی پێوە دیارە(سە:ئەرستۆ، مەنتیق٣٧٤/٢، لە وەرگێڕانی ابو بشر متی بن یونس،وەرگێراو لە

اسحاق بن حنین لە یۆنانیەوە بۆ سوریانی، و لەگەڵ شیتەڵکاریە دووەمیەکان، کتێبی I، وەرزی ٢٢،گ 82b، دێری ٣٨)، لە زمانی عەرەبیدا هیچ ئەگەرێك بۆ وەرگێڕانی نیە، لە دەربڕینە ئەرستۆییەکەیدا ئەمە لە سەر یەك ئەبێت بە((هەر چی ئەبێتە بوونایەتی(ئەو شتە)..))، لە فارسیدا بە وردی و بەسادەیی ئەتوانین بڵێین ئەبێت بە(چە میبودستی) و لەکوریدا ئەیکەین بە(چی ئەبێت)ێتی یان(چی ببوونێتی).

واژەی ((چیەتی-چی بوون))یش لە بەرامبەر ماهیەت بەکار دێت، بەڵام ئەو مانا وردە ناگەیەنێت، بەڵام ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە، بۆ چی ئەرستۆ ئەم دەربڕینەی بۆ بەیان کردنی ((ماهیەت)) دروست کردووە، لە کاتێکدا هاوکات چەند دەربڕینێکی تری وەك(to ti estin چی یی)) و(( ti estin چیە)) کە زۆرجار لە نوسینەکانیدا بەکار ئەهێنێت؟ بەو شێوەیەی کە بینیمان هەر بوونەوەرێکی دیاری کراو، لەسەرخراوییەك(کەڵەیەك) لە مادەو شێوەیە، کە بە سەیرکردن و تێبینی کردنی ئەتوانین دابەشی بکەین بۆ دوو بەش، بەڵام کاتێك بمانەوێت ئەو بوونەوەرە لە روانگەی مانا و مەنتیقەوە پێناسە بکەین، یارمەتی لە دوو چەمکی مادە و شێوە وەرئەگرین، سەیری شێوە ئەکەین و ئەزانین کە ئەو شتە لە رابردودا بەردەوام چی بووە، ئێستاکە چیە، بە دەربڕینی خودی ئەرستۆ، مەبەستی من لە شێوە،(چی بوویەتی)یان(چیەتی) هەر تاك شت و ئوسیایەکی یەکەمینە(میتافیزیك، کتێبی VII،وەرزی ٧، گ1032a، دێری ١) و ناسینی هەر(تاك شت)ێك ناسینی (چیەتی-چی بوون)ەکەشیەتی.(هەمان کتێب، وەرزی ٦، گ1031b، دێری ٢٠).

پێشەنگی ئەرستۆ، لە نێوان ئەم پێکهێنراوە ئافراندراوە هونەریانەدایە، هەر هونەرمەند یان پیشەگەرێك مادەیەك یان کەرەستەیەکی (پێش بوون)[1] بەکار ئەهێنێت، و شێوەیەکی دیاری کراوو تایبەتی پێ ئەدات، ئەمە ((شێوە))یە کە لە هەر بارێکدا شتێك بە دیاری کەرەکانیەوە ئەشکڵێنێت، بەم شێوەیە ئەتوانین بڵێین کە ئەوشتە((شێوەی پێش بوونی)) ناو هزر یان ئەندێشەی هونەرمەندەکە یان پیشەگەرەکە بووە،پێش ئەوەی ئەو لە پێکهێنانەکەی خۆیدا جێی بکاتەوەو بیهێنێتە ئاراوە،بۆ نموونە ئەندازیار یان بیناساز، شێوەی خانووەکە، پێشتر لە هزری خۆیدا هەیە، و لە((چی ببونێتی))یەکەشی ئاگادارە، لێرەدایە کە ئەرستۆ ئەڵێت: سەرچاوەی شتە دروست کراوەکان لە خودی

[1] لێتان تێك نەچێت لێرە مەبەست لە(پێش بوون)واتە شتێك کە پێشتر بوونی هەبووبێت و فەیلەسوف یان بیرمەند بەکاری هێنابێت لەفەلسەفەکەی خۆیدا(سیدۆ.داوود.ع)

دروستکەردایە،کەیان (ئەقڵ)ە یان (هونەر)(هەمان ،کتێبی VI ،وەرزی ١، گ١٠٢٥b، دێری ٢٣)، بە دەربڕینی ئەرستۆ،شتێك کە خاوەنی مادەیە، لە شتێك پێك دێت کە بە بێ مادەیە، هونەری بیناسازی ((شێوە))ی خانووە(هەمان ،کتێبیVII، وەرزی ٨، گ ١٠٣٢a، دێری ١٤).

لە سروشتیشدا، بە جۆرێکی تر ئەتوانین((چی ببوونێتی)) بدۆزینەوە، بۆ نموونە درەختێك، کەڵەکەیە لە مادەکان، هاوکات شێوەیەك کە لە تۆوێك یان ناوکی ئەو، یان لە درەختی دایکدا شاراوە بووە، پێش ئەوەی جارێکی تر لە ناوك یان تۆوەکەدا بشارێتەوە، ئەوەی لەواندا شاراوە بووە، شێوەی ئەو درەختەیە، بونایەتی جۆر یان شێوە لەو تۆوە یان لەناو ئەو ناوکەدا بەشێوەیەکی بەردەوام بوونی هەبووە، کەواتە ئەتوانین بپرسین((چ بووە؟)) واتە لەبەرامبەرەی ئەوەی کە ئێستاکە(چیە)، لە بونایەتی جۆرێك لە بەردەوامێتی خۆیدا،چی بووە؟ لەم ڕوەوەیە کە ئەرستۆ پێناسە یان سنوور بۆ بەیانی (چی بوونێتی) یان وەك دەستەواژەیەك(ماهیەت)ی هەر بونەوەرێك ئەژمار ئەکات، ((شێوە))ش لە شتە سروشتیەکان و لە پێکهاتە هوونەریە مرۆییەکان، لە پێشترە، شێوەیەك کە ئەرستۆ لەگەڵ (ماهیەت)دا بە یەکێکیان ئەزانێت.

## دوونیاناسی:

ئەرستۆ دونیاناسیەکەی خۆی یەکەمجار لە نوسراوی(لەبارەی ئاسمان) و پاشان لە کتێبی ١٢ میتافیزیکی خۆی وێنە کێشا، لە نوسراوی یەکەمدا، نابێت بە دوای دوونیاناسیەك لەسەر بنەمایەکی وردو زانستی بگەڕێین، ئەوەی لە ٤ کتێبەکەی ئەودا نوسراوە،بەکەمی لایەنێکی زانستی پێوە دیارە، چەند تێبنیەکی سەرەتایی و ژمارەیەك بەڵگەهێنانەوەی بیرکاریو فیزیاییانەیە، و باقیەکەی بەرهەمەی مەزەندە و ئەندێشە جیاکاریەکانی خۆیەتی.

ئەرستۆ لە نوسراوی( لە بارەی ئاسمان)هەوڵ ئەدات، تا وێنەیەك لە دونیا بەدەست بهێنێت کە ڕێك خاڵی بەرامبەری دوونیاناسیەکەی ئەفلاتوونە و لە سنوری تیمایس دایە، تەواوی دونیا لە ڕوانگەی ئەرستۆوە، دابەش ئەبێت بۆ دوو بەشی زۆر گەورە، دونیایی سەرەوە(دنیای سەرەوەی ئاسمانی مانگ) و دوونیای ژێرەوە(دوونیای ژێرەوەی ئاسمانی مانگ)، سنوری بنەمای دوونیاناسیەکەی ئەرستۆ، (جوڵە)یە،تەنها ٣ شێوە جووڵە ئەگەری بوونایەتیان هەیە، جووڵەی ڕاستەوخۆ(ڕێك) بە ئاراستەی لێوار،

جووڵەی راستەوخۆ و رێك لە لێوارەوە بەرەو چەق، جووڵەی خولانەوەیی(بازنەیی) بە دەوری چەقدا، لە لایەکی ترەوە هەر جووڵەیەك وابەستەیە بە جەستەیەکی دیاری کراوەوە،و بەم شێوەیە ٣ شكڵی جووڵە پەیوەستن بە ٣ تەنەوە، کە هەر یەك لەوانە بە شێوەیەکی خودی و سروشتی خاوەنی ئەو جووڵەیەیە، جووڵەی(دوور کەوەوە لە ناوەند) تایبەتە بە ئاگر، جووڵەی( بەرەو ناوەند) تایبەتە بە زەوی، و جووڵەی بازنەیی هی تەنێکی تایبەتە کە ئەرستۆ پێی ئەڵێت((تەنی یەکەمین یان(سەرەتا)..))و بەدەرە لە زەوی و ئاگر و ئاوو هەوا،(ئەسیر) لە سەرترین خاڵی دونیادایە، و ئەرستۆ ناوەکەی لە واژەیەکی یۆنانی دروست ئەکات کە بەمانای((هەمیشە ڕاکردن))دێت، ئەمە هەمان ئەوەیە کە دواتر بە جەستە یان(ناوەرۆکی پێنجەم) ناوبانگ دەرئەکات، جووڵەی بازنەیی بە هیچ شێوەیەك لەناو ناچێت و لەبەر ئەمەش (جاویدان) و سەرمەدیە، هەر یەك لە توخمەکان لە جووڵانەوەدان، تا بە شوێنە تایبەتەکەی خۆیان ئەگەن، و لەوێدا ئارام ئەگرن، بەلاَم جێگە سروشتیەکەی (ئەسیر) لە هیچ خاڵێك لە بازنەی خوولانەوەکەی ئەودا نیە، بەڵکو (هەموویەتی) و بەردەوام لەناو ئەو بازنەیەدا لە جووڵەیەدایە، و بەم شێوەیە جاویدانە(سەرمەدیە)، زەوی نەجووڵاوە و لە چەقی جیهاندایە[1]، ئاسمان و دونیاش یەکێکن و دروست نەکراو،لەناونەچوو، بێ سەرەتاو بێ کۆتایین و بەم شێوەیە جاوێدانە.

ئەرستۆ تەواوی دونیا بۆ ٣ بەش دابەش ئەکات، لە چینی ژێرەوەدا، توخمە چوارینەکان جێگایان ئەبێتەوە کە بەردەوام پێکەوە بەستراون، و بەیەکداچوون و شتە لەناوچووەکان پێك ئەهێنن، ئەمە بۆشایی سروشتە کە سنورەکانی هەتا ژێرەوەی ئاسمانی مانگ ئەگەن، چینی سەرەوەی ئەو، ئاسمان و رووناکی ئەستێرە جێگیرەکان (فلك ثوابت)هەیە، بۆشایی نێوان مانگ و هەڵهاتنی ئەستێرە جێگیرەکان، بە(ئەسیر) یان(توخمی پێنجەم) تەنراوە، کە جاویدانانە بەردەوامە لەسەر سوڕانەوەکانی خۆی، ئەرستۆ لەوپەڕی هەموو ئەم شتانەوە، لەوپەڕی دوونیاو،شوێن و کاتەوە ،((یەکەمین پاڵنەری نەجووڵاو)) جێگیر ئەکات کە هەمان((خودا))یە.

[1] ئەمە پاش چەندین سەدە لە لەیەن گالیلۆ و کۆپەرنیکۆسەوە رەخنەی لێگیرا و لەو کاتەوە تا ئێستاکە خۆرتاو بەچەق و نەجووڵاو ئەژمار ئەکرێت و زەویش خاوەنی دوو جۆر جووڵەیە.(سیدۆ.داوود.ع)

**دەروونناسی:**

یەکێك لە گرنگترین نوسراو و بەدەست هێنراوەکانی ئەرستۆ،دەروونناسیەکەی ئەوە، و یەکێك لە بەرجەستەترین بەرهەمەکانی ئەو((لەبارەی دەروون))ی ئەوە، پێکهاتەیەکی ٣ کتێبی کە ئەم نوسینە لە خۆی ئەگرێت، یەك دەست و یەکسان نیەو خودی ئەرستۆ، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی لە شێوەی نووسینێکی ڕێکخراودا،ڕێکی نەخستووە،و هۆکاری نەبوونی هاوپەیوەندیەکەشی هەر بۆ ئەمە ئەگەرێتەوە، ئەم نوسراوە کۆمەڵەیەکە لە ناوەڕۆکەکان،دارشتنەکان ویادداشتەکان، کە ئەرستۆ ئەوانەی بەمەبەستی وانەوتنەوە بە قوتابیەکانی کۆکردۆتەوە، ئەمانە بە شێوەیەك کۆ کراونەتەوە کە تا ئەندازەیەك بتوانرێت تیایدا ڕێکخستن و ریزبەندیەك بەدی بکرێت، بەلام نازانین کە نایا شێوە هەنووکەییەکەی ئەمانە، لەخودی ئەرستۆوەیە، یان ئیشی قوتابیەکانیەتی لە دوای خۆی، یان بەتایبەتی ئیشی ڕێکخەری بەرهەمەکانیەتی(واتە ئەندرۆنیکس رۆدسی)؟ بە هەر حاڵ، ئەم ئەگەرە بوونی هەیە کە چەندین ناهاوسەنگی و ناهاوگۆیی لێرەو لەوێ بەرچاو کەوێت،کە لەوانەیە ئەنجامی ڕێك کاری و ڕێکخستنەکانی یەکێك لە فێرخوازەکانی یان پەیڕەوکارەکانی ئەرستۆ بێت.

هەمیشە ئەبێت ئەوەمان لەیاد بێت کە ئەم نوسراوە،دەروونناسیەکی فەلسەفیە، ئەرستۆ کە لە ناوەڕۆکی قوتابخانەکەی ئەفلاتوون هاتبووە ئارا، لە هەمان لاوێتیەوە خۆیشی سەرنجێکی زۆری مەسەلەی(دەروون- رۆح-نفس)ی ئەدا، چونکە مەسەلەی دەروون لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا خاوەنی گرنگی و بایەخێکی تایبەتی بوو.

دەروونناسی ئەرستۆش لە ناوەڕۆکی فەلسەفەکەی ئەفلاتوون و لە کێشمەکێش لەگەڵیدا، شکڵێنرابوو، ئەرستۆ لە لاوێتی دا، کاتێك ئەندامی ئەکادیمیای ئەفلاتوون بوو، بەو شێوەیەی کە ووتراوە، یەکەمین نووسراوەکانی خۆی بە شێوەیەکی ئەفلاتوونی و لە شکڵی دیالۆگدا بڵاوکردۆتەوە، یەکێك لەوانە دیالۆگێکە بەناوی (ئێدومس)، (ئێدومس یەکێك لە هاوفێرخوازەکان و هاورێ زۆر ئازیزەکانی ئەرستۆ بووە کە لە ماوەی ساڵەکانی ٣٥٤ یان ٣٥٣ پ.ز لە یەکێك لەشەڕەکاندا کوژراوە).ئەرستۆ ئەو دیالۆگەی کە هاوکات((لەبارەی دەروون))ناو لێ نرا، لە دەورووبەری ساڵی ٣٥٢پ.ز بۆ یادی ئەو هاورێیەی نووسی، پێشەنگی ئەو،دیالۆگی(فایدۆن)ی ئەفلاتوونە، کە ٢٠ ساڵ یان زیاتر لە پێش ئەو نوسرابوو.

ئەرستۆ لەم دیالۆگەدا، رۆح یان دەروون بە ناوەرۆکی نامادی ئەزانێت کە لەدوای مەرگی جەستە،هاوکات ئەژێتەوە، رۆح لەدوای مەرگ، لە بەراوردی ژیانە زەوینیەکەی، زۆر سروشتی تر و خۆشبەخت ترە،رۆح ئەمرو جاویدانە، بەشێوەیەك کە بەر لە پەیوەند بوونی بە لاشەوە بوونی هەبووە، رۆح کە جۆرێکە لە ((شێوە)) بەمانا ئەرستۆییەکەی، توانای (بەیادهێنانەوەی) هەیە، واتە ئەوەی کە لەکاتی دیلێتی لە بەندیخانەی جەستە لەم ژیانەدا فێر کراوەو ئەزموونی کردووە، وبەسەریدا تێپەڕیووە،ئەهێنێتەوە یاد، لەکاتێکدا کە لە دوای لکانی بەجەستەوە، ئەوی کە لە دوونیاکەی تر،بەسەریدا تێپەڕیووە، لە بیر ئەباتەوە(لە بارەی ئەم دیالۆگەوە،سە: وەرزی ۳، کروست،ج I ، وەرزی ٥).

لە لایەکی ترەوە ،ئەرستۆ لە رێرەوەی گۆڕان و بەرفراوانی دونیابینی فەلسەفەکەی خۆی لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی دەروونناسی، گەیشتۆتە ئەندێشە گەل و تیۆرگەلێکی زۆر جیاواز لە پێشینەکانی خۆی، ئەرستۆ لە نووسینەکانی خۆی لەبارەی دەروونناسی- بەتایبەتی((سروشتایەتیە بچووکەکان)) و((لەبارەی دەروون))- تارادەیەك وەك گریمانەیەك لە سالەکانی ۳٤۷-۳۳٤ .پ.ز نووسیوە، لەم ماوە زەمەنیەدا،دوونیابینی ئەو بەتەواوەتی گۆڕا بوو، ئەو لەم نێوانەدا خۆی سەرقالی گەلێك بابەتی وەك ژیاننانسی و گیانەوەرناسی کردبوو، ئەو لەم بوارانەدا گەلێك بەرهەمی پڕبایەخی هێنایە ئارا کە بە سەرنجدانی بارودۆخەکان،شوێنەکان،و پلەی زانیاری لەو سەردەمدا، بە توێژینەوە گەلێکی زۆر پڕبار و بەرهەمدار ئەژمار ئەکرێن، بە شێوەیەك لە سەردەمەکانی دواتردا، ئەم نوسراوانە زیاد لە نوسینەکانی تری کەوتبوونە ژێر سەرنج و توێژینەوەوە.

ئەرستۆ دەروونناسی بەتەواوەتی ئەلکێنێت بە ناسینی سروشتەوە، ئەو بە ئاماژە ئەکات بەوەی کە هەر شێوە ناسینێك و مەعریفەیەك جوان و بایەخدارە،بەلام هەندێك لە ناسینەکان ومەعریفەکان لە روانگەی وردبینیەوە،یان لەم روانگەیەوە کە رێنوێنی گەلێك شتی سەیرتر ئەبن، جوانتر و پڕبایەختڕن، ئەنوسێت: {بەسەرنجدانی ئەم خاڵە، پێویستە کە توێژینەوە لەبارەی دەروون لە ریزی یەکەمین زانستەکاندا جێگیر و ئەژمار بکەین،و لەلایەکی ترەوە بەسەرنجدانی تەواوی هەقیقەت، ناسینی دەروون ئەتوانێت بەشێکی زیاتری لە ناسینی سروشتدا هەبێت، چونکە دەروون هەروەك رەگەزێك یان سەرچاوەیەکی بوونەوەرە زیندووەکان ئەژمار ئەکرێت(بەبارەی دەروون، کتێبی I،وەرزی ۱، گ ٤۰۲a، دێرەکانی ۷-۱).}لە روانگەی ئەرستۆوە،سروشت خاوەنی زنجیرەیەك

یـه‌یـه، لـه بـێ گیانه‌كانـه‌وه ده‌سـت پـێ ئـه‌كات و ورده ورده ئه‌گاتـه گیانـداره‌كان، بـه شێوه‌یه‌ك كه سنوری نێوان هه‌ر یه‌ك له‌وانه و په‌یوه‌ندی نێوانیان، ئه‌شاردرێته‌وه، چونكه ئه‌وای ره‌گه‌ز و جۆری بێ گیانه‌كان، گیاكان جێگرن كه له نێوان ئه‌وانیشدا لـه روانگـه‌ی به‌شـدارێتیان لـه ژیانـدا جیاوازیـه‌كی زۆر بـه‌دی ئـه‌كرێت، گواسـتنه‌وه لـه گیـاوه بـۆ گیانـه‌وه‌رانیش، هاوپه‌یوه‌سـتیه‌ك پیـشان ئـه‌دات، چـونكه ،بـه‌و شـێوه‌یه‌ی كـه ئه‌رسـتۆ ئه‌ڵێت: له ده‌ریادا گه‌لێك شت هه‌ن كه ئه‌توانین بپرسین ئایا گیانه‌وه‌رن یان گیا؟(مێژووی گیانه‌وه‌ران،كتێبی VII، وه‌رزی ١، گ٥٨٨b، دێره‌كانی١٢-٤).

جه‌سـته‌ی گیانـداران ئـه‌و شـته‌یه كـه لـه خۆیـدا، خـاوه‌نی سه‌رچـاوه‌ی جووڵـه‌و وه‌ستانه(له‌باره‌ی ده‌روون،كتێبی II، وه‌رزی ١، گ٤١٢b، دێری ١٧). به‌ڵام ژیان به‌مانای جۆراوجۆر دێت و ئه‌وترێت، شتێك پێی ئه‌وترێت بوونه‌وه‌ری زیندوو كه خاوه‌نی هـه‌موو یان هه‌ندێك له‌م تایبه‌ته‌مندیانه بێت:{ئه‌ندێشه، په‌ی بردنی هه‌سته‌كی، جووڵه‌و وه‌ستان له شوێندا، جووڵه بۆ به‌ده‌ست هێنانی خۆراك و كه‌م كردن و زۆر بوون(هـه‌مان كتێب، وه‌رزی ٢،گ٤١٣a، دێره‌كـانی ٢٥-٢١)}، ئێـستاكه ئه‌رسـتۆ، بۆبه‌ده‌سـت هێنـانی پێناسـه‌یه‌ك لـه ده‌روون یـان رۆح، لـه‌م تیۆریـه بنه‌ماییـه‌ی خۆیـه‌وه ده‌سـت پـێ ئـه‌كات، كه(ئوسیا)كان یان(ناوه‌رۆكه‌كان) له ره‌گه‌زی بوونه‌وه‌ره‌كانن و له نێوان ئه‌واندا یه‌كێكیان ((ماده))یه، و ئه‌وی تریان ((شێوه))یه، كه به پێی ئه‌و هه‌ر بوونـه‌وه‌رێك (ئـه‌م شـت)ێكـی پـێ ئـه‌وترێت، و سـێهه‌م كه‌ڵه‌كه‌یه‌كـه لـه‌و دووانـه، مـاده، بـه‌و شـێوه‌یه‌ی كـه بینیمان(تواناداری)یان(هێزه) و شێوه(كردارێتی و ئه‌وپه‌ری هاتنه ئارایی)ه،ته‌نه‌كان، به تایبه‌تی ته‌نه سروشتیه‌كان، پێش هـه‌موویان(ئوسـیا)ن یـان(نـاوه‌رۆك)ن، چـونكه ئه‌مانـه ره‌گه‌زه بنه‌ماییه‌كانی شته‌كانی ترن، له نێوان ته‌نه سروشتیه‌كاندا، هه‌ندێكیان خـاوه‌نی ژیانن و هه‌ندێكی تریان به پێچه‌وانه‌وه، و هه‌ر ته‌نێكی سروشتی، شێوه‌یه‌ك له ته‌ن، واته خاوه‌نی ژیانه، و خۆی ده‌روون یان رۆح نیه، كه‌واته هه‌روه‌ك بابه‌تێك، واته به‌ماده‌یه‌ك بۆ ده‌روون ئـه‌ژمار بكرێـت، و له‌بـه‌ر ئه‌مـه پێویـسته كه ده‌روون بـه (ئوسـیا)یـه‌ك بـزانین كـه هه‌روه‌ك (شێوه)یه‌كه بۆ ته‌نێكی سروشتی كه‌له (تواناداری) یان(خۆهێزداری)دا خـاوه‌نی ژیانه(هه‌مان كتێب، وه‌رزی ١، گ٤١٢a، دێره‌كانی ٢١-٣)، لێره‌وه‌یه كه ئه‌رسـتۆ ده‌روون بـه‌م شێوه‌یه پێناسـه ئـه‌كات:یه‌كـه‌مین پراوپڕێتی یـان(كـه‌ماڵێتی) تـه‌نێكی سروشـتیه كـه خۆهێزدارانـه(هێزه‌كییانـه) خـاوه‌نی ژیانـه (هـه‌مان گ، دێـری ٢٨)، بـه‌ڵام ئـه‌م ته‌نـه سروشـتیه ئـه‌بێت بـه په‌یكـه‌ر، یـان تـه‌ن یـان تـه‌نێكی ئه‌ندام مه‌ند (ئۆرگانیك) بێـت كـه به‌شـه‌كانی به‌هۆیـه‌ك و بۆ ئامـانجێكی تایبـه‌ت پێكـه‌وه لكاون وئـامراز گـه‌لێكی دیـاری

کراون بۆ چالاکیە تایبەتەکان، بەم شێوەیە ئەرستۆ پێناسەیەکی کاملتری دەروون ئەخاتە روو:((یەکەمین پراوپڕێتی، یان گەیشتنە کەمالی تەنە سروشتیە ئۆرگانیکیەکانە))(هەمان وەرز، گ ٤١٢b، دێر ٥).

ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە پەیوەستی رۆح بە جەستەوە چیە؟ ئەرستۆ توێژینەوە لەم بارەدا بە پێویست نازانێت، کە ئایا دەروون و جەستە هەردوکیان یەکێکن؟ چونکە ئەم پرسیارەی وەك ئەوە وایە کە بڵێین قالی و ئەو نەخشەی کە لەسەریەتی یەکێکن؟ یان بە شێوەیەکی گشتی ئایا مادەی هەر(تاك شت) لەگەڵ خودی ئەو شتە، یەکێکە؟ (هەمان گ، دێرەکانی ٨-٦)بەلام لە لایەکی ترەوە،ئەرستۆ هەموو هەڵچوونەکانی رۆح،وەك (تووڕەیی، نەرم ونیانی،ترس، بەزەیی، ئازایەتی، شادی و ....)وابەستە بە جەستە ئەزانێت و لەم بارەیەوە ئەڵێت:ئەم هەڵچوونانە لەناوچوون گەڵیکن لەناو مادەدا، واتە لە جەستەدا(هەمان،کتێبی I،وەرزی ١، گ٤٠٣a، دێرەکانی ٢٢-٢٠).

دەروون خاوەنی گەلێك ووزەیە کە هەندێکیان لە هەموو گیانەوەران و هەندێکیان لە هەندێ لە گیانەوەراندا و هەندێکی تریان تەنها لە جۆرێك لە گیانەوەراندا بەدی ئەکرێن، ئەم ووزانە بریتین لە (خۆراك دەر[1])،مەیل یان (شەهوەت)،هەست کردن،جووڵە لە شوێن، وبیرکردنەوە(ئەندێشە)(هەمان کتێب،وەرزی ٣، ٤١٤a،دێری ٣١). ئەوکات ئەرستۆ لەبارەی هەریەك لە هەستەوەرەکان و بابەتەکانیان توێژینەوە و پێداچوونەوە ئەکات و پاشان خۆی سەرقالی ووزە تایبەتەکانی ناو مرۆڤ ئەکات، یەکەمیان پەی بردنی هەستەکیە کە هەمان بەدەست هێنانی شێوەی هەست پێکراوەکانە بە بێ مادەکەیان،(هەمنا کتێب،،وەرزی ١٢، گ٤٢٤a، دێری ١٨).ئەوی تریشیان ووزەی خەیاڵکردنە، کە جوڵەیەکە بەدەر لە پەی بردنی هەستەکی کردارییانە، و لەوێوە کە جێگیرەو هەروەك پەی بردنە هەستەکیەکان، گیانەوەران بە پێی ئەوە ئیش ئەکەن(هەمان،کتێبی III، وەرزی ٢، گ٤٢٩a، دێری ٢). ئیشی هەست لەوەیدا کە تایبەتە بەو،هەمیشە دروستە،بەلام بیرکردنەوە لەوانەیە نادروست بێت، خەیاڵ یان (خەیالاندن) بەدەرە لە بیرکردنەوە، خەیاڵ بە بێ پەی بردنی هەستەکی بوونی نیە، و بە بێ خەیاڵ کردنیش گوومان بەدەست نایەت، بەلام روونە کە ئەندێشە و گوومان جیاوازن، چونکە ئەندێشە،(تواناداری)هەڵچوونێکە، هەرکات کە هەلیبژێرین، بەلام

[1] ئەو هەستەی کە لەو دیوو برسیەتیەوەیە،نیچەش باس لەم بابەتەکە ئەکات لە((بنەماناسی ئەخلاق))دا.چونکە لەو دیوو هەستی برسیەتیشەوە پاڵنەرێکی تر هەیە....هتد.(سیدۆ داوود.ع)

بوونی باوەڕەکان لە سەرپشکی خۆماندا نیە، چونکە ناچارین لەوەی کە باوەڕێکی دروست یان نادروستمان هەبێت، ئێمە لە خەیاڵ کردندا وەك سەیرکەرێك واین، کە سەیری وێنەیەکی ترسهێنەر یان پێکەنیناوی ئەکات،کەواتە (خەیاڵاندن) حاڵەتێکە کە تێربونێك لە ئێمەدا دێتە ئاراوە، و ووزە یان ئامادەییەك نیە کە ئێمە بە یارمەتی ئەو–چ دروست چ نادروست–داوەری بکەین، بەڵام پەی بردنی هەستەکی، باوەڕ، ناسین و ئەقڵ لەو جۆرە ووزانەن. خەیاڵاندن پەی بردنی هەستەکی نیە، چونکە پەی بردنی هەستەکی یان خۆهێزە یان کردارێتیە،وەك بینایی، و بینین، بەڵام خەیاڵاندن شتێکە کە بەبێ ئەم دووانەش دێتە ئاراوە، وەك ئەو شتانەی کە لە خەونەکاندا ئایانبینین، لەلایەکی ترەوە پەی بردنی هەستەکی هەمیشە ئامادەیە،بەڵام خەیاڵاندن بەم شێوەیە نیە( هەمان وەرز، گـ٤٢٧b ، دێری ١٠، گـ٤٢٨a، دێری ٩).ئەرستۆ بەرجەستەترین تایبەتمەندی مرۆڤ بە((گیانی ئەقڵی یان ئەندێشەیی)) ئەژمار ئەکات، و هاوکات بە ((ئەقڵ))یش ناوزەدی ئەکات.

بابەتی ((ئەقڵ)) گرنگترین و هاوکات قورسترین بەشەکانی دەروونناسی ئەرستۆیە، کە لەدێر زەمانەوە تا هەنووکە بابەتی چەندین پێداچوونەوەی جۆراوجۆر و لێکدانەوەی جیاواز و ناهاوتا بووە، ئەرستۆ لە شوێنێکدا، دەروون یان رۆح بە خاوەنی دوو بەش ئەزانێت: بەشی خاوەن ئەقڵ(ئەقڵانی) و بەشی (نائەقڵانی) و بێ ئەقڵ، بەشی ئەقڵانی، دوو شێوەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە ئێمە بە هۆیەوە بوونەوەر گەلێك لەبەرچاو ئەگرین کە سەرچاوەکانیان لەوانە نیە لەناوبچێت و ئەوی تر ئەوەیە کە بە هۆیەوە ئەو مەسەلانە لەبەر چاو ئەگرین کە لە ئەگەری لەناوچووندان.

ئێمە یەکێك لەم دووانە بە((ناسێنەر)) و ئەوی تریان((ژمێنەر)) ئەناوێنین(ناو ئەنێین)، چونکە ژمێنەری و(گەڕان بەدوای بڕوای تر) بەیەکێك ئەژمار ئەکەین، و یەکێکن، لە رۆحدا ٣ پاڵنەر بۆ کردار و بە دەست هێنانی راستی بەرچاو ئەکەون: (هەست کردن، ئەقڵ، شەهوەت)( ئەخلاقی نیکۆماخۆس،کتێبی VI،وەرزی ٢، گـ١١٣٩a، دێرەکانی ١٩–٥).

لە لایەکی ترەوە، ئەقڵ کە تایبەتمەندیەکی مرۆڤە، دوو جۆر چالاکی هەیە، یەکێکیان هەروەك ئەقڵی تیۆری ((ناسێنەر)) کە لە گەڕاندایە بە دوای راستیدا بۆ خودی راستی، و ئەوی تر هەروەك( تێگەیشتن) یان( ئەقڵی پراکتیکی) کە ئامانجەکەی گەیشتنە بە مەبەستە زانستی و بەرژەوەندی ئامێزەکان. لە لایەکی ترەوە ئەقڵ خاوەنی دوو خەسڵەتی(پێدان و وەرگرتن)ە ئەرستۆ یەکێکیان بە (ئەقڵی بکەر) و ئەوی تریان بە

(ئەقڵی بکەرێنراو یان(کارتێکراو)..) ناو ئەبات، بەو شێوەیەی کە بینیمان، ئەرستۆ رۆح و هەڵچوونەکانیشی بە وابەستەی جەستە ئەزانێت، ئایا ئەقڵیش وابەستەی شتێکە، واتە یەکێکە لە هەڵچوونە دەروونیەکان یان شتێکی سەربەخۆ؟ ئەرستۆ لە شوێنێکدا ئەڵێت: لەبارەی ئەقڵ و وزەی بیرکەرەوە هێشتا شتێك نیە روون بێت، بەڵام وا خۆی دەرئەخات کە رەگەزێکی تری رۆح بێت، و تەنیا ئەوە کە ئەتوانێت جیا یان(سەربەخۆ) بێت، بەشێوەیەك لەوەی کە جاوێدانە، و لەوەی کە لەناوچووە، جیایە، بەڵام روونە کە بەشەکانی تری رۆح(لە جەستە) وەك چۆن هەندێك ئەڵێن، جیا نین، بەڵام روونە کە لە روانگەی تێگەیشتنەوە شت گەلێکی ترن(لەبارەی دەروون،کتێبی $\Pi$، وەرزی ٢، گ٤١٣b، دێرەکانی ٣٠-٢٥).

بەو شێوەیەی کە ئاماژەی بۆ کرا، تیۆریەی ئەقڵ لە دەروونناسی ئەرستۆدا، پێچراوە بە گەلێك تێکەڵ و پێکەڵیەوەو زۆریش قورسە کە لە دێرزەمانەوە لێکۆڵەرەوان خۆیان سەرقاڵی کردووە، لە بەڵگەداریەکانی ئەرستۆشەوە لەبارەی ووزەکانی تری رۆحەوە، وادەرئەکەوێت کە هەموویان پەیوەستن بە جەستەوە، بەڵام کە ئەگاتە مەسەلەی ((ئەقڵ))، لە هەموو رەگەز و بنەماکان جیای ئەکاتەوە، و تاریکی گووتارەکانیشی لەم بارەیەوە هەر بۆ ئەمە ئەگەرێتەوە، ئەرستۆ وەرزەکانی ٤ و٥ ی کتێبی سێهەم(( لە بارەی دەروون)) تایبەت ئەکات بە مەسەلەی ئەقڵ، ئەم دوو وەرزە کورت و فشێنراون و زۆریش سەیرە کە چۆن ئەرستۆ لەبارەی مەسەلەیەکی گرنگی لەم شێوەیە،رازی بووە بەم نووسینە کورتە..!

ئاماژەمان کرد کە ئەقڵ، لە روانگەی ئەرستۆوە بە دوو جۆرە،بکەر و بکەرێنراو(کارا و کارتێکراو)،ئێستاکە ئەو ئەڵێت، لە بارەی ئەو بەشە لە دەروون کە بەهۆی ئەوەوە بیر ئەکاتەوەو ئەناسێتەوە،-چ وەك جەستە لە جەستە جیا بێت، و چ لەمانا و تێگەیشتندا جیا بێت-ئەبێت بەوەدا بچینەوە کەچ جیاوازیەکی(لەگەڵ باقی ووزە دەروونیەکانی تردا) هەیە و بیرکردنەوە یان (ئەقڵاندن) چۆن لێیەوە دروست ئەبێت، ئەگەر( ئەقڵاندن) وەك هەست کردن بێت، ئەبێت ئەقڵ لە لایەن(ئەقڵ پێ براوە)وە کاری تێ بکرێت و ئەم بەشە، بەوەشەوە کە(کارتێنەکراوە) ئەبێت قبوڵکەری شێوەی (شتی ئەقڵ پێ براو) بێت، و خۆهێزانە(هێزەکییانە) هەمان بێت،بەڵام هەمان نەبێت، واتە ئەقڵیش ئەبێت نیسبەت بە (ئەقڵ پێ براوەکان) هەر بەو شێوەیە بێت کە ئەندامی هەستکەر نیسبەت بە هەس پێکراوەکانە، بەڵام لەوێوە کە ئەقڵ بیر لە هەموو شتێك ئەکاتەوە، ئەبێت (تێکەڵ نەبێت) لەگەڵ بابەتەکانی بیرکردنەوە، ئێستاکە ئەو بەشە لە دەروون کە ناوی ئەقڵە،-مەبەست

لەوبەشەیە لە دەروون کە بەهۆیەوە بیرکردنەوەو داوەری کردن ڕوو ئەدات- پێش ئەوەی بئەندێشێنێت(ئەندێشە بکات)، هیچ یەك لە بونەوەرەکان وونیان نیە وەك کردارێتیەك، کەواتە دروست نیە کە ئەوترێت کە ئاوێتەی لاشەیە، چونکە(ئەگەر بەم شێوەیە بووایە) بە شێوەیەك لە شێوەکان خاوەنی چۆنیەتی بوو، سارد یان گەرم ئەبوو، و دەبوو وەك هەستەوەرەکان(ئەندامەکانی هەست کردن) خاوەنی ئامراز بێت، بەڵام بەم شێوەیە نیە، کەسانێك کە ئەقڵ لە جیاتی( شێوەکان) دائەنێن، ناهەقیان نیە،جگە لەوەی کە ئەبێت بڵێین: {هەمووی بەم شێوەیە نیە، بەڵکو دەروونی ئەندێشەکەر بەم جۆرەیەو شێوەکان نە تەنیا لە کردارێتی و واقعیەت،بەڵکو لە هێزداری خویاندان، بەڵام ئەوەی کە ووزەی هەست کەر و وزەی ئەندێشەکەر، لە هەڵنەچووندا(لەکارتێنەکراوی)دا وەك یەك نین، کاتێك روون ئەبێتەوە کە ئێمە ئەندامەکانی هەست بە پەی بردنی هەستەکی لەبەر چاوبگرین، چونکە هەست ناتوانێت، هەست بە هەست پێکراوێکی توند بکات، بۆ نموونە بانگێگ لە نێوان چەند بانگێکی بەرز یان بۆنەکان و ڕەنگە توندەکان ناتوانێت بۆن بکات و ببینێت، بەڵام ئەقڵ کاتێك بیر لە (ئەقڵ پێبراوێکی توند) ئەکاتەوە، بە لاوازتر لەویش کەمتر بیر ناکاتەوە، بەڵکو باشتر بیر ئەکاتەوە، وەك ئەوەی کاتێك لە بارەی پیاوێکەوە ئەوترێت کە (کرداریان)ە ئەزانێت، واتە کاتێك کە ئەتوانێت خۆی(کارا)بکات، تەنانەت لەو کاتەشدا،(ئەقڵ) بە شێوەیەك لە شێوەکان(هێز)ەکییە، هەرچەند نە بەهەمان شێوەی پێش فێر بوون و دۆزینەوە، بەمەشەوە، ئەقڵ هاوکات ئەتوانێت بیر لە خۆیشی بکاتەوە( هەمان،کتێبی III، وەرزی ٤، گ٤٢٩a، دێری ١٠-گ٤٢٩b، دێری ١٠).

ئەرستۆ پاشان ئەم پرسیارە ئەهێنێتە ناوەوە کە ئەگەر ئەقڵ، سادەو هەڵنەچووە، و لە هیچ شتێکدا بە هیچ شتێك بەشدار نیە، کەواتە چۆن بیر ئەکاتەوە،چونکە بیرکردنەوە جۆرێکە لە هەڵچوون، چونکە ئەگەر لە نێوان بیرکردنەوەو بیرکەرەوە(ئەقڵ و ئەقڵێنراو)دا مەسەلەیەکی هاوبەش بوونی هەیە، کەواتە یەکێکیان (کردار)ی هەیەو ئەوی تریان(هەڵچوون)، لەلایەکی ترەوە ئەتوانین بپرسین کە ئایا (ئەقڵ پێ براو) هەمان( ئاقڵە)، واتە ئایا ئەقڵ ئەتوانێت بیر لە خۆیشی بکاتەوە؟ وەڵام ئەمەیە کە یا ئەقڵ لە شتەکانی تریشدا بوونی هەیە-ئەگەر خودی ئەقڵ بە شێوەیەکی تر (ئەقڵ پێ براو) نەبێت- و لەگەڵ(ئەندێشە پێ براو)یان(ئەقڵ پێ براو) وەك ((شێوە)) ، یەکێکە، یان خاوەنی جۆرێك لە تێکهەڵکێشانە کە ئەو ئەکات بە(ئەقڵ پێ براو)(لە ئەندێشەکردنی شتەکانی تردا).

بە پێی ئەوەی پێشتر وتمان کە(هەڵچوون) لەسەر بنەمای مەسەلەیەکی هاوبەش ڕوودەدات، کەواتە ئەقڵ بە شێوەیەك لە شێوەکان، هەمان( ئەقڵ پێبراوەکان)ە، بەلأم(کرداری)یانە، پێش ئەوەی بیر بکاتەوە هیچ یەك لەوانە نیە، لێرەدا ئەقڵ ئەبێت وەك(ڕوویەك) بێت کە(کرداری)یانە هیچی لەسەر نەنوسراوە، خودی ئەقڵیش، وەك(ئەقڵ پی براوەکانی تر)، ئەبێتە(ئەقڵ پیێ براو یان ئەندێشە پیێ براو)، چونکە لە شتە بێ مادەکاندا، ئاقڵ یان ئەندێشەکەر و ئەقڵ پێ براو یان ئەندێشە بۆکراو، ئەبن بە یەك،(یەکێ لە سەرچاوەکانی تیۆریەی یەکێتی (ئاقڵ و ئەقڵێنراو)[1](هـ م) لە فەلسەفەی ئیسلامی) چونکە لە ناسینەکان یان زانستە تیۆریەکاندا، هەریەك لە (ئەقڵێنراوەکان) وەك هێزێك بوونیان هەیە، چونکە لەواندا ئەقڵ بوونی نیە، ئەقڵ (لەگەڵ) ئەوانە-بە بێ مادەکەیان-وەك( هێزەکییانە)یەکێکە ، بەلأم ئەقڵ ئەتوانێت (ئقڵێنراوی) خودی خۆی بێت(هەمان وەرز، گـ٤٢٩b، دێری ٢٣_گـ٤٣٠a،دێری ٩).

سەرەنجام ئەرستۆ،بابەتی ئەقڵ بەم شێوەیە کۆتایی پیێ ئەهێنێت، کە هەمان شێوە لە هەموو سروشتدا (تاك شت)ێکی مادەیی بۆ هەموو ڕەگەزەکانە(کە هێزەکییانە هەریەك لەوانەیە) و شتێکی تر(هۆکار و بکەر)ە کە هەمووان دروست ئەکات- وەك چۆن هونەر بەمادەکەی خۆی ئەیکات- بەهەمان شێوە، جۆرێك لە ئەقڵە کە ئەبێت بە هەموو شتێك و جۆرێك کە هەروەك خەسڵەتێك یان ئامادەییەك، هەموو شتەکان دروست ئەکات، وەك ڕووناکی، چونکە ڕووناکی ڕەنگ گەلێکی هێزەکی لە ڕەنگ گەلێکی کرداریانە دروست ئەکات، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەقڵ جیا لە مادە، کە کارتێنەکراو و تێکەڵ نەکراوەو لە (ئوسیا یان ناوەرۆکی) خۆیدا (کردارێتی)یە، چونکە هەمیشە بکەر لە(بکەرێنراو) و سەرچاوە لە مادە بەرزترە، زانستی کردارییانە هەمان شتی ناسراو(دیار)ە، ناسینی هێزەکی، لە ڕوانگەی کات، لەتاك لە پێشترە، بەلأم بەگشتی لە پێش نیە، بەم شێوەیە نیە کە ئەقڵ هەندێ جار بیر ئەکاتەوەو هەندێ جار بیر ناکاتەوە، بەلأم تەنیا کاتێك کە جیایە، لەراستیدا بەتەواوەتی خۆیەتی و تەنها ئەم(ئەقڵە نەمر)و جاویدانەیە،بەلأم ئێمە ئەوە بە یاد ناهێنینەوە، چون هەندێکی کارتیێ نەکراوە،بەلأم (ئەقڵی کارتێکراو) لەناوچووەو لەناوئەچێت، و بە بێ ئەمەش، ئەندێشەو بیر ڕوو نادات(هەمان کتێب، وەرزی ٥، ٤٣٠a، دێرەکانی ٢٥-١٠).

[1] ئەقڵ پیێ براو-ئەقڵێنراو(ئەوەی کە ئەقڵ بیری لیێ ئەکاتەوە ،مەبەستمانە شتی بەرامبەرە.(سیدو داوود.ع)

وەك چـۆن وتمـان، تیۆرەكـانی ئەرسـتۆ لـەبارەی ئـەقڵ، پرسـیارگەلێكی لـە لایـەن لێكۆڵـەرەوان و توێژەرەوانـەوە وروروژانـدووە،و وەلأم گەلێكیـشیان دراوەتـەوە، بـەلأم مەسەلەكە هاوكات پێچاوپێچ و لە نادیاریدایە، لە لایەكەوە ئەوەی ئەو لە بارەی (ئـەقڵی كارتێكراو)ەوە ئـەیڵێت، كـەم تـا زۆر روونـە، بـەم مانایـە كـە ئیشی ئـەم ئەقڵـە،وەرگرتنی شێوە ئـەقڵێنراوە جیـا لـە مادەكانـە، تاكـەكانی مـرۆڤ هـەموویان ئـەم ئەقڵـەیان هەیـە، ئـەم ئەقڵە، وەك هێزێك هەموو شتێكە(واتـە هێزەكیانـە هـەموو شتێكە.و.ك)، بەلأم لـە لایـەكی ترەوە،ئەرسـتۆ ئـەم ئەئەقڵـە بـە روونـی بـە لەناوچـوو ئـەزانێت، واتـە ئـەو لـە پـاڵ بـاقی ووەزكانی تری رۆحدا دائەنێت، كە بە مردنی تاكەكە، مـرۆڤ بەتـەواوەتی لـەناو ئەچێت ، قورساییە زۆرەكە لە سە ئەو ئەقڵەیە كە ئەرستۆ بە (ئەقڵی كارا یان بكەری) ناوی ئەبات، و دواتر لـە لێكدانـەوەكانی ئەرسـتۆدا، (ئەسـكەندەر ئەفرۆدیـسی سـەدەكانی ٣-٢ .ز) بـە (ئـەقڵی كـارا) نـاوی ئـەبات، وپاشـان لـە رێگـای وەرگێڕانـە عەرەبییەكانـەوە، بەفەلسەفەی ئیـسلامیش ئـەگات، ئیـشی ئـەم ئەقڵـە، ئەوەیـە كـە(ئـەقڵێنراوە هێزەكیـەكان ئـەكات ،بـە كرداریتی) لەم روەوەیە كە ئەرستۆ لە بارەی ئەوەوە ئەڵێت كـە ئـەم ئەقڵـە((هـەموو شتێك دروست ئەكات)) ئێستاكە ئەتوانین بپرسین كە پەیوەستی ئەم ئەقڵە لەگـەڵ رۆحـی تـاكی مرۆڤدا چۆنە؟ ئایا لێی جیایە یان لە ناویدایە؟ بینیمـان كـە ئەرسـتۆ تـەنها ئـەم ئەقڵـە بـە نەمر و لەناونەچوو ئەژمار ئەكات ،ئایا هەموو تاكەكانی مرۆڤ خاوەنی ئەم ئەقڵەن؟

ئەرستۆ لە دوو نوسـراوی گرنگتریـدا ئامـاژەی بـە مەسـەلەی ئـەقڵ داوە، كـە لەوانەیـە بتوانین ئەندێشە گەلێكی روونتریان تێدا بدۆزینەوە، ئەو لە شوێنێكدا ئـەڵێت: ((بـەلأم لـە بارەی ئەقڵ و ئەوەی كە گیاندارەكان چۆن، چ كاتێك و لەكوێدا بەشدار ئـەبن لێـی،چەند بابەتێكی قورس بوونیان هەیە و ئێمە ئەبێت بە ئەندازەی توانـایی خـود و تاشـوێنێك كـە ئەگەری هەیـە، خۆمـان خـەریكیان بكـەین، ئـەو لـە كۆتـایی توێژینەوەكـەی خۆیـدا ئەگاتـە ئەو ئەنجامە كە(( تەنها شتێك كە ئەمێنێتەوە،ئەقڵە كە لە دەرەوە دێتە ناوەوە، و ئـەویش تەنها خودایەكە، چونكە هیچ جۆرە هاوبەشیـەكی لەگـەڵ كرداره جەستەییەكاندا نیـە))( لـەبارەی پەیـدا بـوونی گیانەوەرانـەوە،كتێبی II، وەرزی ٣، گ٧٣٦b، دێرەكـانی ٢٩-٢٧).

ئەرسـتۆ لـە شـوێنێكی تـردا، لـە دوای پێداچـوونەوە لـە بـارەی ژیـانی بەختـەوەر و چـۆنایەتی هـەل ومەرجـەكانی، واتـە ژیـانی هەماهـەنگ بـە چـالاكیە ئەقڵیـەكان كـە هەمان(تێڕامان و تێبینی)ن ئەڵێت: ((چالاكیەكی ئەقڵی لەم شێوەیە، هـەمان بەختـەوەری و كامەرانیە پڕاوپڕەكەیە، بەلأم ژیانێكی لەم شێوەیە لە سەروی تونای مرۆڤەوەیە، و مرۆڤ

نەك وەك (مرۆڤ بوونی)،بەڵكو وەك شتێكی خودایی كە لەناو دەرونیدا بوونی هەیە، ئەتوانێت بگات بە ژیانێكی لەو شێوەیە، ئەگەر ئێستاكە ئەقڵ لە بەراورد لەگەڵ مرۆڤدا، شتێكی خودایییە، كەواتە ژیانی هەماهەنگ لە گەڵ ئەقڵ، بۆ مرۆڤ ئیشێكی خوداییە، ئێمە ئەبێت بۆ جاویدان بوونمان ئەبێت بە ئەندازەی توانا هەوڵ بدەین و هەموو ئیشێك ئەنجام بدەین، تا ژیان لەگەڵ ئەو شتانەی كە لە مرۆڤدا بەرزترینن، هەماهەنگ بكەین، چونكە قەبارەی ئەم ئیشە هەر چەندە بچووكە، بەڵام لەكاریگەرێتی و بەهاداریدا، لە سەروی زۆرێك لە شتەكانەوەیە(ئەخلاقی نیكۆماخۆس،كتێبی X، وەرزی٧،گ١١٧٧b، دێری ٢٦-گ ١١٧٨a، دێری ١). ئەرستۆ لە شوێنێكی تری ئەم نوسراوەدا جارێكی تر ئاماژە بە مەسەلەی ئەقڵ ئەكات، و ئەڵێت: ((كەسێك كە هەماهەنگ بە چالاكیەكانی ئەقڵ ژیان بەسەر ئەبات، و ئەقڵ ئەپەروەرێنێت و پارێزگاری لێ ئەكات، باشترین ژیانی هەڵبژاردووەو لەلای خوداكان خۆشەویسترینیانە، چونكە-بەو شێوەیەی كە مرۆڤەكان باوەڕیان وایە-ئەگەر خوداكان بە شێوەیەك سەیری ئیش و كارەكانی مرۆڤ بكەن، كەواتە دروستە كە ئەوترێت:ئەوان لەوەی كە لە مرۆڤدا باشترین و لەوان نزیكترینە- واتە ئەقڵ- دڵخۆش ئەبن و بەو مرۆڤەی كە رێز لەو یەكەمین شتە ئەگرێت و پێگەیەكی بەرزی بۆ دائەنێت، پاداشتی چاكەی ئەدەنەوە، ڕوونە كە ئەم جۆرە سیفەتانە، پێش هەموو شتێك لەناو (مرۆڤی دانا) بەدی ئەكرێن و بەم شێوەیە، كەسێكی لەو شێوەیە لەلای خوداكان خۆشەویسترینە))( هەمان كتێب،وەرزی ٨، گ١١٧٩b، دێرەكانی ٣١-٢٣).

لەبەر ئەمە،لەوانەیە بتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئەوەی ئەرستۆ بە((ئەقڵی جوداو دەرەكی)) دائەنێت، هەمان توخمی خودایی بێت، كە بە گوتەی خۆی لە نوسراوێكی تردا ئەڵێت لەنێوان هەموو گیانداراندا، تەنها مرۆڤە خاوەنی ئەوەیە (لەبارەی بەشەكانی گیانداران، كتێبی II، وەرزی ١٠، گ٦٥٦a، دێری ٧) و ئەم ئەقڵە،واتە ئەم توخمە خوداییە، هەمانە كەلە مرۆڤدا نەمرە. ئێستاكە ئەتوانین بپرسین كە ئایا ئەقڵ لە هەر تاكێكی مرۆڤدا نەمرە، یان لە جۆری مرۆڤدا؟ بە مانایەكی ئایا مانەوەیەكی(كەسیاری) هەیە یان جۆری؟ لە دێر زەمانەوە ئەم پرسیارە هاتۆە ئارا كە ئایا ئەرستۆ هەمان رۆح یان دەروون بە نەمر ئەزانێت یان نا؟بەو شێوەیەی كە بینیمان ئەو هەموو ووزەی دەروونی-جگە لە ئەقڵ- پەیوەست بەلاشە ئەزانێت؛ و بە مردنی ئەو، ، هەموو ئەمانە پێكەوە بە لەناو چوو ئەزانێت ، وادیارە ئەرستۆ لە لاوێتیەوە تا كۆتایی ژیانی، باوەری بە نەمری توخمی خودایی لە مرۆڤدا-واتە ئەقڵ- هەبووە، چونكە لە یەكێك لە نووسراوەكانیدا(پۆرترپتیكس)،ئەم باوەرە ئەخاتە ڕوو كە مرۆڤ خاوەنی هیچ

شتێك نیه كه شایسته بێت به خودایی و شانازی پێكەر ئەژمار بكرێت، جگه لەوەی كه لەودا ئەقڵ و دانایی بوونی هەیە، لە هەموو ئەو شتانەی كە مرۆڤ هەیەتی، وا دەر ئەكەوێت كە تەنیا ئەمە بە نەمر و جاویدان و خوادیی ئەزانرێت، و لەو رووەوە كە ئەتوانرێت بەشدار بین لەمەدا، ژیان هەر چەند سروشت خراپ و ئەستەمە، بەلاّم هێندە بە ژیرانە رێك خراوە كە وەك بڵێی مرۆڤ لە پێوانەكردن لەگەڵ هەموو بوونەوەرەكانی تردا، خودایەكە، چونكە (ئەقڵ) بوونی خودایە لەناو ئێمەدا(راس، بەشی ١٠c).

لە گووتەكانی ئەرستۆدا خاڵێكی زۆر سەرنج راكێشتر لە بارەی رۆح، دەربڕینێكە كە لە نوسراوە گرنگترەكانی دا بەدەست دێت، ئەو لەوێدا ئەپرسێت كە سەرچاوەی جووڵە لە دەروون(رۆح)دا چییە؟ و وەلاّم ئەداتەوە كە روونە، بەهەمان شێوە كە لە گشت جیهاندا، و لە رۆحیشدا خودا هەموو شتەكان ئەهێنێتە جووڵە، چونكە ئەوەی كە لە ئێمەدا خوودایییە، بە جۆرێك لە جۆرەكان هۆكاری هەموو جووڵەكانە، سەرچاوەی ئەقڵ،ئەقڵ نیە، بەڵكو شتێكە سەرترو بەرزترە لە ئەقڵ، ئێستاكە، چ سشتێك سەرتر و بەرزترە لە ئەقڵ؟(ئەخلاقی ئودمس،كتێبی VIII،وەرزی ٢، گ١٢٤٨a، دێرەكانی ٢٩-٢٥).

## فەلسەفەی ئەخلاق:

نوسینەكانی ئەرستۆ لەبارەی فەلسەفەی ئەخلاق، بایەخ و گرنگیەكی زۆریان هەیە، و لە سەردەمی هەنووكەیدا پێش لە هەموو بابەتێك كەوتوونەتە بەر توێژینەوەو خوێندنەوەوە، بەلاّم لەم بوارەدا ئێستاكە ٣ نوسینمان لەبەر دەستدایە(( ئەخلاقی گەورە))،((ئەخلاقی نیكۆماخۆس))،((ئەخلاقی ئودمس))، ((ئەخلاقی گەورە)) كورترین نوسینی ئەرستۆیە لەم بوارەدا و لەوانەیە هۆكاری ناولێ نانەكەی، ئەوە بێت كە((لایەنە تۆماریەكانی پاپیرۆس) كە ئەم بەرهەمە لەسەر ئەوە نوسراوە، گەورەتر لە قەبارە ئاساییەكەی بووە،دابەشكاریەكانی ئەم نوسینە و ناونیشانەكەشی هی سەردەمەكانی دواترە، بەلاّم(( ئەخلاقی نیكۆماخۆس))ئێستاكە زیاتر ئەرستۆناسان، هەرچەند بەش بەشە، بە نوسراوێكی خودی ئەرستۆی ئەزانن، كتێبەكانی چوارەم و شەشەمی لەناو چوون، و ئێمە ئسێتاكە ئەومان لە شێوەیەكی گۆڕێنراو لەبەشەكانی پێنجەم تا حەوتەمی((ئەخلاقی نیكۆماخۆس)) لە لایە، هاوكات ئەوەش نەزانراوە كە هۆكاری ناولێ نانەكەی چی بووە، بەلاّم بە دڵنیاییەوە دانەرەكەی(ئودمس رۆدسی)، فێرخوازە بەرجەستەكەی ئەرستۆ نیە، شێوەی تێڕوانین و دارشتنەكەی لەگەڵ ستایلی ئەرستۆدا

جیاوازە، کتێبێك کە هەنووکە لەبەر دەستدایە لێی، بە جێماوی بەرهەمێکی گەورەترە، لەم نێوانەدا،((ئەخلاقی نیکۆماخۆس) گرنگترین و کاملترین نووسینی ئەرستۆیە لە بارەی فەلسەفەی ئەخلاق، ئەو ئەوەی یان بە ناوی باوکیەوە یان بە ئەگەرێکی نزیکتر، بە یادی کوڕەکەی کە لەلاویدا مرد داناوە، ئەم کتێبە لە کۆتا نوسینەکانی ئەرستۆیەو ئەتوانرێت مەزەندەی ئەوە بکرێت کە لە دوای مەرگی ئەو، لەلایەن فێرخوازەکانی قوتابخانەکەیەوە بلاوکرابێتەوە و بە یادی کوڕە جوانە مەرگەکەیەوە ناو نرابێت،بەدەر لەم نووسینە_بەو شێوەیەی کە ئەگووترێت_ باقی نووسینەکانی ئەرستۆ، هەمویان لە سەرەتاوە گووتار و وانە گەلێکی سەربەخۆ بوون کە دواتر کۆکراونەتەوەو بلاوکراونەتەوە، لە شێوازی دارشتن و دەربرینی ئەم نوسراوانەدا دیارە کە شێوازە هەنووکەییەکەیان بۆ خودی ئەرستۆ ئەگەرێتەوە، دەرخەری سەرەکی ئەوەش، ناسکی و ڕوونی بەڵگەکان و پێکهاتەی ئەندێشەکان و ڕیتمی ئارام و بێ چەلەحانێیانەیە لە خستنە ڕووی مەسەلەکان.

ئەم نووسراوە ١٠ کتێب لە خۆ ئەگرێت، فشێنراویی بابەتەکانی ئەمەیە، کتێبی یەکەم: چاکە یان چاکەکاری ئامانجی سەرەکی هەموو شتێکە، بڕوای جیاواز لە بارەی چاکە، سەرترین چاکەیەك کە مرۆڤ لە ڕێگای ئیشەوە ئەتوانێت بەدەستی بهێنێت، ژیانێکی بەختەوەرە، بەختەوەری شکلێکە لە چالاکی رۆح هاوتا لەگەڵ بەرزترین فەزیلەتدا۔ چونیەتی بەدەست هێنانی ئەم فەزیلەتە، کە هەندێك ئەخلاقی و هەندێکی تر(بیری) و واتاییە،کتێبی دووەم،وەرزی ١ تا کتێبی سێهەم،وەرزی ٨،تیۆریەو بڕوای جیاوازن لە بارەی فەزیلەت، کتێبی سێهەم،وەرزی ٩ بە دواوە، توێژینەوەن لەبارەی هەریەکە لە فەزیلەتە ئەخلاقیەکان( توێژینەوەیەکی کۆمەڵناسانەو دیاردەناسانە)، بابەتی گرنگ(یاسا)) یان((تێگەیشتنی دروست))...کتێبی شەشەم، فەزیلەتی ئەندێشەیی یان ئەقلی، کارامەیی هوونەری، ناسین یان زانست،ژیریی کرداری، دانایی، ئەقڵ، کتێبی حەوتەم،توێژینەوەیەك لە بارەی شەهوەتەکان و زاڵ بوون بەسەریاندا، یان زاڵ بوونی ئەوان بەسەر مرۆڤدا، زیادەڕەوی و ڕێکخستن، لەبارەی چێژ، کتێبەکانی هەشتەم و نۆیەم، توێژینەوە لەبارەی هاوڕێیەتی، کتێبی دەیەم، لەبارەی چێژ و بڕوای ئەوانی تر لەبارەی، پاشان توێژینەوەیەکی لەبارەی ئەوەی ژیانی فەلسەفی و ژیانی بەختەوەرانە ژیانێکی سەتری ئەخلاقیە و هەوڵ و تێکۆشانی ئەوێت و یاری نیە، بەرزترین بەختەوەری، ژیانی ئەقلانی و ئەندێشەییە، و مەرجەکەشی بوونی بوارە، تەنها هەڵبژێراوەکان ئەتوانن بگەن بەو ئامانجە، لەدوای ئەویش باشترین ژیان، ژیانی

ئەخلاقیە، گرنگی چاکە دەرەکیەکان، بە نەبوونی تەندروستی و باقی چاکە دەرەکیەکانی تر ناتوانرێت بە بەختەوەری ژیان بەسەر ببردرێت، هەرکەسێك کە خۆی سەرقاڵی ژیانی واتایی ئەکات، بە باشترین بەختەوەری ئەگات، و ئەتوانرێت لە رێگای پەروەراندنەوە، ببیت بە مرۆڤێکی چاك، گواستنەوە بۆ توێژینەوەیەکی(گووتارێکی) تر، واتە فەلسەفەی کۆمەڵگاو سیاسەت.

فەلسەفەی ئەخلاقی ئەرستۆو بە تایبەتی((ئەخلاقی نیکۆماخۆس))زۆرترین و قورسترین کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی خۆرئاوا هەبووە، و بە پێشەنگی هەر جۆرە ئەندێشەو توێژینەوەیەك لە بواری ئەخلاقی تیۆری و کرداری ئەژمار کراوە، ئەرستۆ یەکەمین بوونیادنەری سیستەمی بەهاکان و دژی بەهاکان لە بیرکردنەوەی خۆرئاوا بووە بە شێوەیەکی ئەقلانی و واقعیگەرایانە، گووتراوە کە ئەرستۆ زانستەکانی بۆ دوو گروپە سەرەکی دابەش کردووە، زانستی تیۆری و زانستی کرداری، ئامانجی زانستی تیۆری، راستی،و ئامانجی زانستی کرداری (کردار)ە، لەلایەکی ترەوە زانستە کرداریەکانیش خاوەنی دووبەشن، ئەخلاق و سیاسەت، فەلسەفەی ئەخلاق، لەبارەی تایبەتمەندیە تاکیە مرۆییەکانە بەو پێیەی کە لە کۆمەڵگادا ئەژین و سیاسەت لەبارەی ژیانەو، رەفتار و کرداری کۆمەلایەتی مرۆڤەکان بەربلاوتر ئەکات و لیێ ئەکۆڵێتەوە، لەسەر بنەمای فەلسەفەی ئەخلاقی ئەرستۆ، پێش هەموو شتێك، پەیوەندی بە کردار یان ئیشەوە هەیە، هەوڵدان بۆ ناسینی تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ ، ئامانجێك نیە لەخۆیدا، بەڵکو ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تر کە بریتیە لە ئیش یان کرداری مرۆیی، لێرەوەیە کە ئەرستۆ، ئەخلاق و سیاسەت ناوئەنێت بە((فەلسەفەی مەسەلە مرۆییەکان))(ئەخلاقی نیکۆماخۆس،کتێبی X، وەرزی ١١، گ١١٨١b، دێری ١٥) بەم شێوەیە ئامانجی سەرەکی لە فەلسەفەی ئەخلاق روون ئەبێتەوە، ئەرستۆ ئەڵێت مەبەستی لە نووسینی((ئەخلاقی نیکۆماخۆس)) توێژینەوەیەکی تیۆری نیە وەکو باقی کتێبەکانی تری، چونکە(( توێژینەوەکەی ئێمە لەمەدا نیە کە بزانین فەزیلەت چیە،بەڵکو لەوەدایە کە لە چاکەکان ئەژمار بکرێن،چونکە ئەگەر ئەمە نەبێت، ئەو توێژینەیە سودێکی نیە،کەواتە پێویستە کە لە بارەی کردارەکانەوە توێژینەوە بکەین کە بە چ شێوەیەك ئەنجامیان بدەین))(هەمان، کتێبیII، وەرزی ٢، گ١١٠٣b، دێرەکانی ٣٠-٢١).

لەسەر ئەم بنەمایە، ئەرستۆ ئەڵێت:((ئامانجی هەر جۆرە هونەرێك، و هەر جۆرە توێژینەوەیەکی کرداری، وەك هەر کردارێك و هەر هەڵبژاردنێك، وەك بڵێی چاکەیە(واتە بەو شێوەیە ئەنجامیان بدەین کەوەك بڵێی چاکەیەك ئەنجام ئەدەین.و.ك)، کەواتە

دروستیان ووتووه كه ئەوەی له هەمووان زیاتر حەزی لێیانه،چاكتره(هەمان،كتێبی I، وەرزی١،گم ١٠٩٤a، دێری ١ بەولاوه)، بەلاّم مرۆڤەكان، به شێوه گەلێكی جۆراوجۆر به دوای چاكەدا ئەگەرێن، لەبەر ئەمە، ئامانجەكانیشیان جیاوازه، و لەوێشەوه كه ئامانجەكانیان زۆره و ئێمه هەندێكیان بۆ هەندێكی شتی تر هەڵئەبژێرین، كەواته دیاره كه هەموو ئامانجەكان كامڵ نین، و باشترین چت ئەوەیه كه كامڵ بن، ئەگەر شتێك كامڵه، ئەبێت مەبەستی ئێمه ئەو بێت، و ئەگەر ئەم شتەكانه زۆر بن، ئەبێت به دوای كامڵترینیاندا بگەڕێین(هەمان كتێب، وەرز٧، ١٠٩٧a، دێرەكانی ٢١-٢٦).

له لایەكی ترەوه لەبەر ئەوەی ئامانجەكان زۆرن، لەوانەیه لەبەر ئامانجێكی تر به دوای ئامانجێك بكەوین، واته ئەو وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن به ئامانجێكی تر بەكار بهێنین، بەلاّم ئامانجێك هەیه كه ئێمه ئەو بۆ خۆی و باقی شتەكانی تر بۆ ئەو ئەخوازرێن،بەلاّم ئەگەر هەموو شتێك بۆ هەمو شتێك، تاناكۆتا، هەڵمانبژاردایه، تا ناكۆتا ئەچوین و خواستەكەی ئێمه بێسود ئەبوو، كەواته دیاره كه ئامانجی ئێمه ناتوانێت شتێكی تر بێت،جگه له چاكه، ئەویش بەرزترین چاكه( هەمان كتێب، وەرزی ٢، گ ١٠٩٤a، دێرەكانی ٢٢-١٨).

ئێستاكه ئەتوانین بپرسین، ئەو چاكەیەی كه هەموو مرۆڤەكان ئەیخوازن چیه؟ چونكه بینیمان كه ئامانجی هەر زانست و ناسین و هەڵبژاردنێك، چاكەیەكه، زۆربەی مرۆڤەكان و بیرمەندەكانیش، لەبارەی ناوی ئەو(بەرزترین چاكه)یه، هاوڕان و به(بەختەوەری،بەخت چاكی،) ئەزانن، و لەسەر ئەو بڕوایەن كه((خۆش ژیانی)) و((خۆش كرداری))هەمان ئەو((بەختەوەری))یەیه، بەلاّم لەبارەی ئەوەی ((بەختەوەری))چیه، جیاوازیەكی زۆر له ئارادا هەیه، زۆربەی مرۆڤەكان له پێناسەی بەختەوەریدا هاوڕا نین، هەندێك به مەسەلەیەكی ئاسایی و ڕوونی ئەزانن وەك، دەوڵەمەندی و چێژ و شانازی، و ئەوانی تریش به جۆرێكی تر وەسفی ئەكەن(هەمان كتێب،وەرزی ٤، گ١٠٩٥a، دێرەكانی ٢٤-١٤).

ئەرستۆ خۆی سەرقاڵی بڕوای ئەوانی تر ناكات لەبارەی بەختەوەری، بەلاّم ژیانی مرۆڤەكان له ٣ گووتاری هەمەلایەنەدا، دائەرێژێت، زۆربەی مرۆڤەكان ،بەختەوەری به چێژ ئەژمار ئەكەن، و بەم شێوەیه به ژیانی تەنراو به خۆشگوزەرانی ئەزانن، كەسانێكی تر ژیانی سیاسی، و گروپی سێهەم، لایەنگری تیۆر و ژیانی تیۆرین(تێڕوانین له راستیەكان) هەڵئەبژێرن(هەمان كتێب، وەرزی ٥، گ١٠٩٥b، دێرەكانی ١٩-١٧).

بـەڵام ئـەتوانین بپرسـین کـە بەختـەوەری تایبـەت بـە مـرۆڤ چـیە؟ ئـەوەی کـە ئەوترێت،بەختـەوەری بـەرزترین چاکەیە، مەسـەلەیەکی ڕوونـە، بەختـەوەری کردارێکـی مرۆڤە، چاکە یان باشەی هەر هوونەمەندێك و پێکهێنەرێك لە ئەرك و ئیشەکەی ئەودایە، کرداری تایبـەت بە مرۆڤ چیە؟ ئایا تـەنیا(ژیانـە)؟ مرۆڤ لـەم ئیشەدا هاورێیـە لەگـەڵ گیاکاندا، کەواتە ئەبێت ووزەی(خۆراك دەری) و(ڕوواني) خۆی بخاتـە لا، و لـە دوای ئـەو دوو هێزە، هێز ووزەی هەستەکی دێتە ئارا،بەڵام دیارە کەلەمەشدا(واتە لەم ووزەیەشدا) مرۆڤ هاوشێوەی ئەسپ و مانگا وتەواوی گیانەوەرەکانی تـرە، ئەوەشـی کـە ئەمێنێتـەوە، چالاکیەکی ئامانجـداری بەشـە ئەقلانیەکـەی مرۆڤـە، کـە ئـەویش دوو جـۆرە: هەنـدێکی فەرمانبەری ئەقڵەو هەنـدێکی تـری ئەندێشەکەرە، ئیشی تایبـەتی مـرۆڤ، چالاکی رۆحـی هەماهـەنگ لەگـەڵ ئەقڵـە_ یـان بەلایـەنی کـەم نزیـك لـە ئـەقڵ_ە، ئەگـەر ئـەرکی پیـاوێکی بەهەنـد وەرگـر، ئەنجامـدانی ئیـشەکانیەتی بـە شـێوەیەکی دروسـت و جـوان، کەواتـە ئـەتوانین بڵـێین کـە چـاکە یـان چاکەی مرۆیـی ((چـالاکی رۆحـی هەماهەنگـە لەگـەڵ فەزیلـەت))، و لەبـەر ئـەوەی فەزیلەتـەکان زۆرن، ئـەبێت بـەرزترین و کـامڵترین فەزیلـەت لەبەرچـاو بگـرین، ئـەم ئیـشە تەمـەنێکی کـامڵی(تێروتەسـەل) پێویـستە، وەك چـۆن بـە گەشانەوەی گوڵێك بەهار نایەت، رۆژێك یان سەردەمێك ژیانی بەختەوەری،هـەموو ژیـانی مرۆڤەکـە بەختـەوەر ناکـات(هـەمان کتێـب،وەرزی ٧،گ1097a، دێـری ٢١-گ1098b، دێری ٢٠). لە لایەکی ترەوە فەزیلەتی مرۆیی ،فەزیلەتی جەستەیی نیە، بەڵکو فەزیلـەتی رۆحە، و بەختەوەریش هەر چالاکی رۆحە(هەمان کتێب،وەرزی ١٣، گ1102a، دێرەکانی ١٧-١٥)، لەبـەر ئەمـە بەختـەوەری کـە جۆرێکـە لـە ئامـانجی ژیـانی مرۆڤ،جۆرێکـە لـە چالاکیش.

هەنـدێ لـە چالاکیەکان، بـۆ شـتێکی تـر هەڵئەبژێرن، بـەڵام هەنـدێکی تـر بـۆ خـودی خۆیانیان هەڵئەبژێرێن، بەختەوەری لەو چالاکیانەدایە کە بۆ خۆیان هەڵەبژێردرێت، نەك بـۆ شـتێکی تـر، چـونکە بەختـەوەری پێویـستی بـە هـیچ شـتێك نیـە، بـەڵکو خـۆی بەسـە(هـەمان،کتێبیX، وەرزی ٦،گ1176b، دێرەکـانی ٥-١).کەواتـە بەختـەوەری چـالاکی گـەلێکی هەماهەنگـە لەگـەڵ فەزیلەتـدا، و دژەکـانی ئـەوانیش، دژی بەختـەوەرین(هـەمان،کتێبیI، وەرزی ١٠،گ1100b، دێرەکـانی١١-٩).بەختـەوەر ئـەو کەسـەیە کـە هاوتـا لەگـەڵ فەزیلـەت، چالاکە، و بـە برێکـی پێویـست خـاوەنی چـاکە دەرەکیەکانە(وەك تەندروستی، جوانی، دارایی،و وەك ئەمانە) ئەویش نەك بۆ زەمـەنێکی کەم، بەڵکو لە تێکرای تەمەندا (هەمان وەرز،گ 1101a، دێری١٤).

لێرەدا ئەرستۆ لەبارەی بەختەوەری، ئاماژە بۆ خاڵێکی تر ئەکات، و ئەپرسێت: {ئایا بەختەوەری شتێکی فێر کراوە یا(خووگرتووە) یان بە شێوەیەکی تر،پەروەرێنەرە،یان بەهرەیەکە خودایی، یان لە ڕێگای (بەخت)ەوە دەست ئەکەوێت؟ پاشان وەڵام ئەداتەوە کە ئەگەر هەر بەشێك لە مرۆڤ خودایی بێت، کەواتە دروستە کە ئەوترێت، بەختەوەریش شتێکی خوودایییە، و لە گرنگترینی ئەو شتانەیە کە مرۆڤ هەیەتی، بەڵام ئەگەر بەختەوەری شتێکی خودا نێردراو نەبێت، بەڵکو فەزیلەتێك بێت کە بتوانرێت بە شێوەیەکی فێرکاریانە و پەروەردەییانە بەدەستی بهێنین، هاوکات خوودایی ترینیانە (هەمان کتێب، وەرزی ٨، 1099b، دێرەکانی ١٦-١٠).

ئێستاکە ئەگەر بەختەوەری،لە ڕوانگەی ئەرستۆوە، چالاکی ڕۆحی هاوئاهەنگ لەگەڵ فەزیلەت بێت، ئەبێت بپرسین ئەو فەزیلەتی چۆن پێناسە کردووە، لە شوێنێکدا ئەوترێت ((ئێمە خەسڵەتە شتایش کەرەکان بە فەزیلەت ئەزانین ))(هەمان کتێب، وەرزی ١٣، گ1103a، دێری ١٠)،ئەمە پێناسەیەکی گشتیە لە فەزیلەت، لەلایەکی ترەوە، ئەرستۆ فەزیلەتەکان بۆ دوو گروپ دابەش ئەکات: فەزیلەتی ئەندێشەیی(بیری) و فەزیلەتی ئەخلاقی، دروست بوون و زیادبوونی فەزیلەتی بیری، لە فیرکاریەوەیە و بەم شێوەیە پێویستی بە ئەزموون و کاتێکی دوور و درێژە، بەڵام فەزیلەتی ئەخلاقی، لە ڕێگای(خوو) ەوە بەدەست دێت،هیچ یەك لە فەزیلەتە ئەخلاقیەکان سروشتیانە دروست نابن، چونکە هیچ یەك لەو شتانەی کە سروشتیانە بونیان هەیە، ناتوانین لە ڕێگای خووەوە لەناویان ببەین، بۆ نموونە بەرد سروشتیانە بەرەو خوارەوە ئەجوڵێت، و ناتوانرێت ئەوە بکەینە خوو لەلای کە بەرەو سەرەوە بجووڵێت، هەرچەندە هەزار جار بۆ سەرەوە فڕێی بدەین، و بمانەوێت فێری ئەو جۆرە جووڵەیەی بکەین، ئاگریش ناتوانین لەسەر ئەوە ڕابهێنین کە بەرەو خوارەوە بجووڵێت، بەمەشەوە هیچ یەك لەو شتانەی کە سروشتیانە بەیەك جۆرن، ناتوانین ڕایانبهێنین بەوەی کە بە شێوەیەکی تر بن، لەبەر ئەوە فەزیلەتەکان، لە ئێمەدا نە سروشتیانە وە نە بەپێچەوانەی سروشتەوە دروست بن، بەڵکو ئێمە لە سروشتماندا ئامادەییمان هەیە کە ئەوانە قبوڵ بکەین، و پاشان ئەوانە بە یارمەتی (خوو)ەوە کامڵ بکەین(هەمان ،کتێبی II،وەرزی ١، گ1103a،دێرەکانی ٢٥-١٥).

ئەوکات ئەرستۆ لە درێژەپێدان بە مەسەلەی فەزیلەت، ئاماژە بەو خاڵە ئەکات کە ئەوەی لە ڕۆحی ئێمەدا ڕو ئەدات، ٣ شتە: هەڵچوونەکان، ووزەکان، و خەسڵەتە پایەدارەکان،کام یەك لەمانە فەزیلەتن؟ مەبەست لە هەڵچوونەکان ، شت گەلێکی وەك

توڕەیی و ترس و (وێران) و شادی و بەزەی و بەخیلی و توڕەیی و بەتەواوی هەموو ئەو شتانەن کە چێژ یان ئازارێکیان لەخۆدا هەیە، ووزەکان شت گەلێکن کە ئێمە بە هۆی ئەوانەوە ئەتوانین تووڕە بین یان خەمبار ببین یان بەزەییمان هەبێت، بەڵام خەسڵەتە پایەدارەکان یان حاڵەتەکان شت گەلێکن کە ئێمە بە هۆی ئەوانەوە لەبەرامبەر هەست و سۆزەکان یان هەڵچوونەکانەوە پەرچەدانەوەیەکی باش یان خراپمان هەیە(دەبێت))، ئەرستۆ لەدوای پێداچوونەوەی هەر یەك لە رووداوەکانی رۆح، ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە هیچ یەك لە فەزیلەتەکان یان نافەزیلەتەکان، لە ریزی هەڵچوونەکان و ووزەکاندا نیە، و ئەبێت ئەوانە لە خەسڵەتە پایەدارەکان ئەژمار بکەین (هەمان کتێب، وەرزی ٥، گ١١٠٥، دێـری ٢٠-گ ١١٠٦، دێـری ١٠). ئەرستۆ پاشان خۆی سەرقاڵی مەسەلەی ((زیادەرەوەی ))و ((کەم رەوی)) یان زۆری و کەمی لە ئیشەکان ئەکات، و تیۆرە گرنگ و مێژوویەکەی خۆی لەبارەی ((پێوانەی فەزیلەتەکان)) ئەمێنێتە ناوەوە، بەهەمان شێوە کە لە هەمو شتێکدا زۆری و کەمی بە دی ئەکرێت،و((نێوەند-نێوانێك))ێکیش بوونی هەیە، لە کرارەکانی مرۆڤیشدا هەر بەم شێوەیەیە، فەزیلەتیش پەیوەندی بە لایەنی سۆزداری و کردارەکانی مرۆڤەوە هەیە، (زیادەرەوی) و(کەم رەوەی) لە سۆزەکان و کردارەکان هەردووکیان هەڵەن، لەکاتێکدا کە ئاستی نێوەندی(نێوانی) هەمیشە ستایشکراوە، و هۆکاری سەرکەوتنە، و هەردووکیان لە تایبەتمەندیەکانی فەزیلەتن، کەواتە فەزیلەت جۆرێك((نێوەنجیە))کە ئامانجی ئەو ئاستی ناوەراستە، لێرەدایە کە ئەرستۆ پێناسە گشتگیرەکەی خۆی لە فەزیلەت ئەخاتە روو، ((فەزیلەت خەسڵەتێکی پایەداری هەڵبژێراوی نێوەنجیە لە بوونی ئێمەدا، (نێوانی)یەك، کە بە پێی تێگەیشتن و ئەو جۆرە سنورداریتیە کە مرۆڤی دانا دیاری ئەکات))، نێوەنجیەك لە دوو نافەزیلەتی زیادەرە و کەمرەو، چونکە هەندێك لە نافەزیلەتەکان، لەبارەی حاڵەتە سۆزداریەکان و کردارەکان و لەوەی کە ئەبێت،دووچاری کەمرەوی یان زیادە ڕەوی ئەبن، بەڵام فەزیلەت ئاستی نێوەندی ئەدۆزێتەوەو هەڵیئەبژێرێت، لەبەر ئەمە بەپێی(ئوسیا-ناوەرۆك)ەکەی و پێناسەیەك کە ماهیەت بەیانی ئەکات(دەری ئەبرێت)، لە روانگەی ئەوەی کە باشترین و بەرزترینە.(( ئاستی نێوەنجی))ە ،(هەمان کتێب، وەرزی ٦، گ١١٠٧a، دێرەکانی ٩-١).

ئەرستۆ رۆح بە تێکەڵەی دوو بەشی نائەقڵانی و ئەقڵانی ئەزانێت، لە تێکی بەشی نائەقڵانی، شەهوانی یان(خواستەکی)یە و لەتەکەی تری(نەفرینی،تووڕەیانە)یەو هەر یەك لەو دوو بەشە، لە خۆیاندا خاوەنی فەزیلەتێکن، لەلایەکی ترەوە، کرداری مرۆڤ

،(خوازراو) (نەخوازراو)ە، کردارە نەخوازراوە(سەپێنراوەکان) ئەوانەن وەك ترس و شێوەی ئەوانە، پاڵنەری دەرەکی و بەرگری نەکەریان هەیە، هەندێك لە کردارەکانی مرۆڤیش لە نەزانی مرۆڤەوە دروست بوون، بەڵام ئەو کردارانەی مرۆڤ کە بەهۆی ئەوانەوە شتایش ئەکرێت، هەمان کردارە خوازراوو(سەرپشکیەکان)ن، لێرەدایە کە ئەرستۆ خۆی سەرقاڵی مەسەلەی((هەڵبژێراوی پێوراو)) یان((هەڵبژاردنی هاندەری)) یان بە سادەیی((سەرپشکی)) ئەکات، هەڵبژاردنێتی گرنگترین تایبەتمەندی فەزیلەتە، و پێش هەمووان زاڵە بەسەر ئەخلاقیاتی مرۆڤ لە کردارەکانیدا، هەڵبژاردنی ئاشکرا، کردارێکی خۆویست و ئیرادییە، بەڵام (ئیرادە) نیە، کرداری ئیرادی، زیاتر کرداری هەڵبژاردەیین، چونکە مندالآن و گیانەوەران لە کردارە ئیرادەییەکاندا هاوبەشن، بەلآم هەڵبژاردنیان نیە، کردارە لەناکاوەکانیش، ئەتوانین بڵێین کە ئیرادین،بەلآم هەڵبژاردەیی نین، بڕوای کەسانێك کە ئەڵێن:هەڵبژاردنی شەهوەت،مەیل،خواست،یان جۆرێك لە بیروباوەڕە، ڕێك نیە، ئەرستۆ لەدوای بەڵگە هێنانەوە لە ڕەتکردنەوەی ئەو پێشنیارانە، ئەڵێت، وا دەرئەکەوێت کە هەڵبژاردن یان سەرپشکی، کردارێکی خۆویست و ئیرادی بێت، بەڵام ئەوەی کە خۆویست و ئیرادیە،هەڵبژێراو نیە، چونکە هەڵبژاردن پەیوەندی بە شتێکەوەیە کە(( لە پێشترەوە دیاری کراوە))، لەبەر ئەوە هەڵبژاردن لە ڕێگای ئەقڵ و ئەندێشەوەیە(هەمان، کتێبیIII، وەرزی ٢، گ١١١٢a، دێرەکانی١٧-١٤)، ئەرستۆ لە شوێنێکی تردا ئەڵێت :هەڵبژاردنی ئەقڵی خواستەکی یان (شەهوانی)،یان شەهوەت و خواستەکی ،بیری و ئەقلآنیە، و سەرچاوەکەشی مرۆڤە(هەمان، کتێبی VI،وەرزی ٢، گ١١٣٩b، دێری ٤).

ئەرستۆ پاشان خۆی سەرقاڵی توێژینەوەیەکی بەرفراوان لەباری خەسڵەتە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ ئەکات و فەزیلەتەکان و دژەکانی ئەژمێرێت، ئەو بەرزترین و زۆرترین بەختەوەری مرۆڤ لە چالاکیە ئەقڵی و ئەندێشەییەکانیدا ئەبینێتەوە، و ئەڵێت:

پیاوی دانا(فەیلەسوف) خۆشەویسترین کەسە لەلای خودا، کەسێك کە لەم شێوەیەیە، بەراستی بەختەوەرترین مرۆڤە(هەمان ،کتێبی X،وەرزی ٨،گ a١١٧٩،دێری ٣٠)،ئەرستۆ بە توێژینەوە لەبارەی خەسڵەتە ئەخلاقیەکان لە روانگەی(زیادەڕەوی) و(کەمڕەوی)و(ئاستی نێوەنجی)یانەوە ئەوانە بەم شێوەیە دابەش ئەکات:

| زیادەڕەوی | کەمڕەوی | ئاستی نێوەنجی |
|---|---|---|
| یاخییتی | ترسنۆکی | ئازایەتی،مەردایەتی |
| زیادەڕەوی | بێ هەستی | |
| فرە بەکارهێنان | بەخیلی | سەخاوەتمەندی |
| خۆبەگەورەزانی | خۆبەکەم زان | رۆح گەورەیی |
| پلەخوازی | هیچ نەویست | شانازیخواز |
| توڕەیی | بێ غیرەتی | ڕوو خۆشی-نەرم خوویی |
| زمان چەوری | رق ودوژمنایەتی | هاورێیەتی ومیهرەبانی |
| لاف لێدان | ریاکاری | ڕاستخوازی |
| لوتیێتی | مۆن | قسەخۆشی |
| شەرمنی | بێشەرمی | گوونجاوی |
| حەسودی | پیسی،دڵخۆش بە ئازاری ئەوانی تر | ئازار لەجێی خۆی |

## فەلسەفەی سیاسەت:

بەو شێوەیەی کە پێشتر ئاماژەی پێ کرا، فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەتی ئەرستۆ، پەیوەندیەکی نزیکیان پێکەوە هەیە، ئەوەی هەنووکە بە ناونیشانی(پۆلیتیکا)

یان(پۆلیتیکن)، لەبەر دەستدایە[1]، وەك بڵێی نووسراوەکانی ئەرستۆ،بەرهەمێکی یەك پارچە نیە، بەڵکو چەند نوسینی جیا لەیەك لە خۆ ئەگرێت کە لە سەردەمەکانی دواتردا لە لایەن خودی ئەرستۆ یان فێرخوازەکانیەوە کۆکراونەتەوە، ئەم کتێبە لە مانەوەی دووەم جاری لە (ئاتن)(٣٣٤-٣٢٣)پ.ز. هاتۆتە ئارا، و لە کۆتا نوسراوەکانی ئەوە، ئەم نووسینە ٨ کتێب یان گووتار لە خۆ ئەگرێت، کە ناوەرۆکەکەیان بەم شێوەیەیە: کتێبی یەکەم، پێشگووتارێکی کورت، ((بەڕیوەبەرایەتی خێزان))، وەك توخمێکی سەرەکی کۆمەڵگاو دەوڵەت، بە تایبەتی خەسڵەتە ئابووریەکەی، کتێبی دووەم: باشترین شێوەی دەوڵەت و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی سیاسی، ئەرستۆ لێرەدا،دەست بە توێژینەوەیەکی رەخنەگرانە لە بەرجەستەترین و ناسراوترین دەوڵەت ورێکخراوە سیاسیەکان ئەکات، چ ئەوانەی کە پێشتر(لە یۆنان) بونیان هەبووە،وە چ ئەوانەی کە بە شێوەیەکی پێویست لەلایەن ئەوانی ترەوە پێشنیاریان لەسەر کراوە، کتێبی سێهەم، چەند بڕواو تیۆرێکی گشتین لەبارەی دەوڵەت، لێرەدایە کە ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە، کە ئایا((مرۆڤی چاك)) لەگەڵ((هاووڵاتی چاك)) یەکێکن؟ و ئایا فەزیلەتی تایبەت بە سیاسەت بوونی هەیە؟ لەبارەی رێکخراوە سیاسی و شێوازە لادراوەکانی(٣ شێوازی باش و ٣ شێوازی یاسا خراپی بنەمایی"خراپ یاسایی بنەمایی")،دابەشکاری هێز لە کۆمەڵگا،مانا و گرنگی فێرکاری وشێوازەکانی حکومەتی پادشایی، یاسا هەروەك نوێنەری ئەقڵی گشتی، کتێبی چوارەم، باقی شێوازەکانی رێکخستنی سیاسی و دەوڵەتی، بەدەر لە حکومەتی پادشایی، یاسا بنەماییەکانی دیمۆکراتی و ئەلیگارشی،چینە کۆمەڵایەتیەکان، توانادارەکان و بێدەسەڵاتەکان، گرنگی چینی ناوەڕاست(نێوەنجی))، دابەشکاری پلەکان و فەرمانبەرانی دەوڵەت، دادوەرەکان،پارێزەرەکان، کتێبی پێنجەم، هۆکارەکان و پاڵنەرەکانی راپەڕین و شۆرشە کۆمەڵایەتیەکان، لێکترازان و لەناوچوونی رێکخراوە سیاسی و دەوڵەتیەکان وهۆکارەکانی، لەبارەی بەڕێوەبردن و پلەو پایەکان، کتێبی شەشەم، چۆنیەتی دابین کردنی جێگیری یاسای بنەمایی و دەوڵەت، لە بارەی بەڕێوەبەریەکان و پلەکان، کتێبەکانی حەوتەم و هەشتەم، لەبارەی باشترین رێکخراوی سیاسی ودەوڵەتی و پێداچوونەوەیەك لەبارەی بەختەوەری و کامەرانی تاکی و

---

[1] سوپاسی کاك (عیمران هاواری)ئەکەین کە((سیاسەت))ی ئەرستۆی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.(سێدۆ داوود.ع)

کۆمەڵی،چاکەیەك کە تاك ئەبێت بەدوایدا بگەرێت، (دەوڵەتی ئایدیاڵی) بەرنامەی فێرکاری و پەروەردە لەبارەی دەوڵەتی ئایدیاڵی(کتێبی هەشتەم ناتەواوە).

بەدەر لە کتێبی سیاسەت، ئەرستۆ بە هاوکاری فێرخوازەکانی، کۆمەڵەیەك لە ١٨٥ یاسای بنەمایی کۆکردبوویەوە کە _بە شێوەیەك لە پێرستی بەرهەمەکانیدا بینیمان_ لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دۆزرایەوەو بڵاوبویەوە.

لێرەدا ناوکی سەرەکی فەلسەفەی ئەخلاقی سیاسی ئەرستۆ، بە کورتی باسی لێوە ئەکرێت، لەسەرەتادا ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد کە فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەتی ئەرستۆ لێك ئالاوە، ئەو لە کۆتایی ((ئەخلاقی نیکۆماخۆس))دا ئەڵێت:((لەوێوە کە پێشینان بابەتی یاسادانانیان توێژینەوە نەکردووەو ڕەها کردووە، باشتر وایە کە خودی ئێمە بە تەواوی لە لێوارەکانی رێکخراوی سیاسیدا توێژینەوە بکەین، تا بە ئەندازەی توانایی ((فەلسەفەی مەسەلە مرۆییەکان)) تێر وتەسەل بکەین (کتێبی X، وەرزی١١، گ١١٧٨b، دێرەکانی ١٥-١٢).

ئەرستۆ لە سەرزەمین و سەردەمێکدا ئەژیا کە فەیلەسوفان و تەنانەت بیرمەندەکانی کۆمەڵگاش، خۆیان تەنیا بۆ ژیانی کۆمەلأیەتی دەورووبەریان دانابوو، وە هەرگیز خۆیان بە بێگانە نەدەزانی و تەنانەت زۆر چالاکانە بەشداریان تێدا ئەکرد، و نەیان ئەتوانی بەجێماوی تاکیان لە گشتێتی ئەو کۆمەڵگایە وێنا بکەن کە تێیدا ئەژیان، بەشێوەیەك لە بەسەرهاتەکەی ئەرستۆدا بینیمان، خودی خۆی نموونەیەکی دیاری بیرمەندێك بووە، لە لایەکی ترەوە ئەو وەك گەورەترین بیرمەندی دوونیای کۆن، لە چۆنایەتی ژیانی ئەخلاقی تاکەکانی مرۆڤ و لە هاوپەیوەندی فەزیلەتە ئەخلاقیەکان لە گەڵ فەزیلەتە کۆمەلأیەتیەکان بێ ئاگا نەبووە، ئەو تەنانەت ئەخلاقی سیاسی کۆمەلأیەتی لە سەرووی ئەخلاقی تاکیەوە ئەبینی، بە شێوەیەك کە خۆی ئەڵێت، هەرچەندە چاکە بۆ تاك و بۆ دەوڵەت یەکێکە، بەلأم وا خۆی دەرئەخات کە بەدەست هێنانی و پاراستنی بۆ دەوڵەت مەسەلەیەکی گەورەتر و تێر وتەسەلترە(هەمان ،کتێبی I، گ١٠٩٤b، دێری ٨).

یەکەمین خاڵێك کە ئەرستۆ لە پێداچوونەوەی ژیانی کۆمەلأیەتی جەختی لەسەر ئەکات و پشتی پێ ئەبەستێت، ئەوەیە کە مرۆڤ بە سروشت گیانەوەرێکی شارنشینە( یان کۆمەلأیەتی وسیاسی)یە،(سیاسەت،کتێبی I، گ١٢٥٣a، دێری ٢) لە ڕوانگەی ئەرستۆوە،پەروەراندن و پاراستنی فەزیلەتی تاکیش تەنها لە کۆمەڵگادا ئەگەری روودانی هەیە، وە هەر بە هۆی ئەم خەسڵەتە کۆمەلأیەتیەی مرۆڤەوەیە کە لە نێوان

گیانەوەراندا تەنها مرۆڤە کە خاوەنی (قسە کردنە)(هەمان کتێب، وەرزی ١، گ١٢٥٣a، دێری ١١) بەلأم کۆمەڵگا لە روانگەی ئەرستۆی یۆنانیەوە، هەمان((دەوڵەت شار))ی یۆنانیە، تایبەتمەندی مرۆڤ لە گەڵ باقی گیانەوەرەکانی تردا ئەوەیە کە تەنها ئەو پەی بە چاکە و خراپە ودادپەروەری و نادادپەروەری ئەبات، و بەشداری کردن لەم مەسەلانەدایە کە ((دەوڵەت شار)) پێك ئەهێنێت. لەبەر ئەمە دەوڵەت شار(کۆمەڵگا) سروشتیانە لە سەروی هەریەك لە تاکەکانی مرۆڤەوەیە، چونکە گشت هەمیشە لە سەرووی بەشەوەیە، چونکە، ئەگەر گشت لەناو بچێت، قاچ و دەستی بەش بەو شێوەیە نامێننەوە( هەمان گ،دێرەکانی ٢٢-١٦).

بەم شێوەیە،مەرجی یەکەم تویژینەوەی فەزیلەتی ئەخلاقی کۆمەڵگایە، لە لایەکی ترەوە ناوکی سەرەکی کۆمەڵگا، ((خێزان)) کە پاشان لە شێوە گەلێکی گروپیدا خۆی ئەنوێنێت و سەرەنجام شکڵە تەواوەکەی لە دەوڵەت شار یان (دەوڵەت)دا دەرئەکەوێت، یەکەمین شێوەی ژیانی هاوبەش، لە چەندین گیانەوەرەوە دەست پێ ئەکات، و پاشا شێوەی لادێیەك لە خۆ ئەگرێت، پاشخانی کۆمەڵگا چەند(شارەلأدی) یان باشتر وایە بڵێن کە(دەوڵەت شار) پێك ئەهێنن، ئەم قۆناغێکە لە تێروتەسەلی سەربەخۆیی، دەوڵەت شار لەو ڕووەوە پێك دێت کە((ژیان خۆشی))مرۆڤەکان دابین بکات، چونکە هەمان شێوە کە لە سروشتدا ئەبینرێت، لە بارەی مرۆڤەکانیش،پێشکەوت بەرەو(تێروتەسەلی) ئامانجی کۆتایی مرۆڤەکانە، لەلایەکی ترەوە بەهەمان شێوە کە لە دونیای گیانەوەراندا زنجیرە پلەیەك لەخوارەوە بۆ سەرەوە هەن، کەپلەکانی کۆتایی(مرۆڤ)لە خۆ ئەگرن، ئامانجی ژیانی مرۆڤەکانیش بەم شێوەیەیە، هەر جۆرە گیانەوەرێك بە دوای ئەو ئامانجە ئەکەوێت کە سروشت بۆی دیاری کردووە، مرۆڤیش بەم شێوەیەیە، ئەگەر مرۆڤ خودا بوایە،ئەیتوانی بەتەنهایی بژیت،بەلأم وەك چۆن بینیمان مرۆڤ گیانەوەرێکی کۆمەلأیەتیە، لەلایەکی ترەوە هەرچەند مرۆڤ کاتێك ئەگاتە (کەماڵ-تێروتەسەلی) ئەبێتە باشترین گیانەوەر، بەلأم ئەگەر لە یاسا ودادپەروەری بە جێ بمێنێت، ئەبێتە خراپترینیان، بە گوتەیەکی تر بە بێ فەزیلەت، مرۆڤ خراپترین و بێزراوترین و ئاژەڵی ترین گیانەوەرە لەروانگەی شەهوەتخوازی و(لەم دڕاوی)[1] یەوە لەلایەکی ترەوە ،دادپەروەری مەسەلەیەکی سیاسی(کۆمەلأیەتی)ە، چونکە((داد)) رێکخستن و ریزبەندیە لە بەشداری کردنی سیاسیدا( هەمان گ،دێرەکانی٢٧-٣١)ئەوکات ئەرستۆ بە درێژی

[1] بە شتێك ئەوترێت کە هەرنەخوات و بەشی ناکات(یانی سك دڕاو).

باسی ((خێزان))-وەك یەکەمین ناوکی توخمی کۆمەڵگا-لە بارەی پەیوەندی نێوان ژن وپیاو، دایکان وباوکان و منداڵان و پاشان گەورەکان و کۆیلەکان، قسان ئەکات، وەك چۆن ئەزانین، دەوڵەت شارەکانی یۆنانی، کۆمەڵگا گەلێکی کۆیلەداری بوون، کۆیلایەتی بە یەکێك لە بنەما گرنگەکانی ئابووری و خزمەتگووزاری کۆمەڵایەتی ئەژمار کراوەو پێکی هێناون، بڕواکانی ئەرستۆ لە بارەی کۆیلەکان وکۆیلایەتی، لەسەردەمی ئێمەدا نە تەنیا زۆر سەیرە، بەڵکو هاوکات زۆر نامرۆڤانەو ڕقهێنەرە، بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە ئەرستۆش وەك باقی فەیلەسوفەکانی تر و بیرمەندەکانی تر، لەهەر سەدەمێکدا کوڕی سەردەمەکەی خۆی بووە و لە چینێکی کۆمەڵگاکەو وپەیوەست بە یەکێك لە ئاستەکانی کۆمەڵگا بووە،هەریەکێك لە کۆمەڵگاکانی یۆنانی کۆن،ناتوانین بە بێ کۆیلەداری وێنایان بکەین، کۆیلەداری بوونادی مادی ژیانی کۆمەڵایەتی یۆنانی کۆن بووە، ئەرستۆ گوتارێکی کورت لەبارەی بڕوای کەسەکانی تر ئەخاتە روو کە لەو باوەڕەدا بوون کە زاڵبوون جۆرێکە لە زانست، و هەندێکی تر وتوویانە کە زاڵبوونی کەسێك بەسەر کەسێکی تر بە پێچەوانەی سروشتەوەیە، چونکە تەنیا(یاسا)یە کە یەکێك ئەکات بە کۆیلەو ئەوەی تر ئازاد ئەکات، ئەگەرنا سروشت جیاوازیەکی لە نێوان ئەوانەدا دانەناوە، و لەبەر ئەمە نادادپەروەرانەیە و لەسەر بنەمای هێزە(هەمان وەرز، گ1253b، دێرەکانی 23-16).

ئەرستۆ لە بەرگری کردن لە کۆیلەداری ئەڵێت، کە خاوەندارێتی بەشێکی بریتیە لە ماڵداری یان هونەری بەرێوە بردنی ماڵ و ئابووری و هیچ کەس بە بێ پێویستیەکانی ژیان ناتوانێت ژیان بەسەر ببات (یان بە خۆشی ژیان بەسەر ببات)، بەهەمان شێوە کە لە هوونەرە دیاری کراوەکاندا، مرۆڤ بۆ ئەنجاندانی ئیشەکانی، بێگومان ئەبێت ئامێری تایبەت بەو هونەرەی هەبێت، لە ئیشەکان و فرمانەکانی ناو ماڵیشدا هەر بەم شێوەیەیە، لە نێوان ئامێرەکاندا هەندێکیان بێگیانن، و هەندێکی ترین گیاندارن، بۆ نموونە کەشتیوان، سکان ئامێرێکی بێگیان و کەشتیوان و(ڕێناس)ئامێرێکی گیاندارن، لەم رووەوە، خزمەتکاریش ئامێرێکە، بەم شێوەیە داراییش ئامێرێکە بۆ ژیان و خاوەندارێتی کۆمەڵەیەکە لە ئامێرەکان، کۆیلە بریتیە لە داراییەکەی گیاندار و خزمەتکاریش ئامێرێکە کە ئیشی چەندین ئامێری تر ئەنجام ئەدات( هەمان گ،دێرەکانی32-23). کەواتە کۆیلەکان لەلای ئەرستۆ ئامێرگەلێکی پێویستن بۆ ژیان، چونکە بە گووتەی ئەو ئەگەر مەکۆکان خۆیان بیانچنیایە و ئامێرە مۆسیقیەکان

خۆیان لێیان بدایە، مامۆستاکان پێویستیان بە بەردەست و گەورەکان(زاڵمەکان) پێویستیان بە کۆیلەکان نەدەبوو(هەمان گ، دێری ٢٧- گ ١٢٥٤a، دێری ١).

ئەوکات ئەرستۆ بۆسەلماندنی جێگیری پەیوەستی پێویستایەتی کۆیلە بە پێشەوا، ئەڵێت: ((دارایی بە هەمان ئەوشتە ئەوترێت کە بە شتێك یان بەشێك لێی، چونکە لەت یان بەش نە تەنیا بەشێکە لە شتێکی تر،بەڵکو هەمەکێتیەکەی لەو شتەی ترەوەیە، لەبەر ئەوە پێشەوا یان گەورە تەنها گەورە یان پێشەوای کۆیلەیە وەی ئەوە، بەڵام کۆیلە نەتەنیا کۆیلەی گەورەکەیەتی، بەلکو بە تەواوی و هەمەکێتی هی ئەوە، لێرەدایە کە سروشت و خاسیەتی کۆیلە ئاشکرا ئەبێت، کەسێك کە لە سروشتیدا نەك هی خۆی بەڵکو هی کەسێکی ترە، بە سروشتی کۆیەلە، ئەتوانین بڵێین کە مرۆڤ ئەبێتە هی یەکێکی تر، هەرچەندە کە مرۆڤە، هاوکات بەشێك یان لەتێ لە دارایی، و ئەم بەشە داراییە، بەدەرە لەوەی کە ئەتوانی هەتبێت، ئامێرێکی کرداریشە( هەمان گ، دێرەکانی ٢٣-٣١).

لە لایەکی ترەوە ، ئەرستۆ لەنێوان کەسانێك کە بە کۆیلەیی لەدایك ئەبن، و کەسانێك کە لە شەڕەکاندا بە دیل ئەگیرێن و ئەکرێن بە کۆیلە، جیاوازی دروست ئەکات، ئەو بڕوای کەسانێك ئەگوازێتەوە کە ئەڵێن:((ئەگەر یۆنانیەکان لەشەڕدا بەدیل گیران، نابێت بکرێنە کۆیلە، بەڵام بەدەر لە یۆنانیەکان، ئەوانی تر کۆیلەن))،بنەمای بڕواکەی ئەوان ئەوەیە کە هەندێك سروشتیانە لە هەموو شوێنێکدا کۆیلەن و هەندێکی ترلە هیچ شوێنێکی تردا کۆیلە نین(هەمان وەرز، گ١٢٥٥a، دێرەکانی ٣١-٢٧).

پاشان ئەرستۆ لە بارەی(شاری-هاووڵاتی)یەوە بە درێژی قسە ئەکات و هەوڵ ئەدات کە پێناسەیەك لە (شاری-هاووڵاتی)یەکی واقعی بخاتە ڕوو، هاووڵاتی بە شێوەیەکی ڕەها کەسێکە، کە بتوانێت لە مەسەلەکانی بەڕێوەبردندا بەشداری بکات، ئەم پێناسەیە لە بارەی(هاووڵاتی) لە دیموکراتیدا ڕاستە(هەمان،کتێبی III، گ ١٢٧٥b،دێرەکانی ٢٣-٢٢، گ ١٢٧٥b، دێری ٦). لەسەر بنەمای پێناسەیەکی لەم شێوەیە، ئەرستۆ (دەس ئیشەکان) بە شایستەی(هاووڵاتێتی) لە باشترین ڕێکخراوەکانی دەوڵەتدا ئەژمار ناکات، ئەرستۆ پاشان دەست ئەکات بە پێداچوونەوەی جۆرە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت، و ئامانجی سەرەکی لە دەوڵەت، یان ڕێکخراوی سیاسی، ژیان خۆشی مرۆڤەکانە، چ بە شێوەیەك بۆ هەمووان بێت یان بۆ تاك، ڕێکخراوەی سیاسی دەوڵەت و حکومەت هەردوکیان یەکێکن، حکومەت بەرزترین پلەی دەوڵەتە، لەم نێوانەدا یان(کەسێك) یان(چەند کەسێك) فەرمانڕەوایی ئەکەن، یا زۆرینە،مەبەستی هەموو ئەمانە دابین کردنی

بەرژەوەندیـە هاوبەشـەکانە، یەکـەمین شـێوەکانی دەوڵـەت،(دەوڵـەتی پادشـایی) و دوەم جـۆر( فـەرمانرەوایی چـەند نەفـەرێك)ە و سـێهەم(فـەرمانرەوایی تـەواوی خـەڵکی) یـان دیموٚکراتی.

کاتێـك کـە هـەمو خـەڵکی بەلەبـەر چـاوگرتنی تـەواوی بەرژەوەندیـە هاوبەشـەکان و هەمەکیەکان فرمان ئەدەن، ئەو شێوە رێکخراوی سیاسی کۆماری نـاو ئـەنرێت، هەریـەك لە شێوەکانی حکومـەت، خـاوەنی شـێوازێکی لادانین، (ستەمکەری) شـێوازێکی لادراوی حکومـەتی پادشـایی، فـەرمانرەوایی چەند نەفـەرێك، شـێوازە لادراوەکـەی فـەرمانرەوایی ئەرسـتۆکراتی و دموکراسـی، شـێوازە لادراوەکـەی حکومـەتی کۆمارییـە، چـونکە لـە ستەمکاریدا فەرمانرەوایی سود لە یەك (کەس)وەر ئەگرێت، و حکومەتی چەند نەفەری، فـەرمانرەوایی بەسـودی بـەتواناکان(سـەرمایەدارەکان) و دیموٚکراسـی فـەرمانرەوایی بـە سـودی کـەم دەسـتەکان، هـیچ یـەك لـەم شـێوازانەی حکومـەت لـە رێـرەوی بەرژەوەنـدی گشتیدا نین(هەمان کتێب، وەرزی ٥، گـ١٢٧٩a، دێری ٢٥- گـ١٢٧٩a، دێری ١٠).

ئەوکات ئەرستۆ بە درێـژی باسـی سـود و زیـان وکـەم وکـوڕی هەریەکە لە شێوەکانی حکومـەت ئـەکات، و سـەرەنجام ئـەم پرسـیارە ئەهێنێتـە ئـارا کـە حکومـەت و دەوڵـەت بۆ زۆرینـەی دەوڵـەت شـارەکان و بـە شـێوەیەکی گشـتی بـۆ مـرۆڤ چیـە؟ ئـەو لێـرەدا بـەوەی لـە((ئـەخلاقی نیکۆمـاخۆس)) وتبـووی ئامـاژە ئـەکات( گـ١١٠١a، دێـری ١٤) کـە ژیـانی بەختەوەر، ژیانی بە بێ بەربەست و هاوئاهەنگە لەگەڵ فەزیلەتدا و فەزیلەتیش پـەیرەوی ئاستی نێوەنجی و ناوەراستینەییە، کەواتە ژیان لە سنوری ناوەندیدا، باشـترین شێوەی ژیانە، و بۆ هەر کەسێك ئەگـەری ئـەوە هەیـە کـە بگـات بـە ئاسـتی ناوەراسـت (سیاسـەت، کتێبی IV،وەرزی ٩، ١٢٩٥a، دێرەکانی ٢٨-٣٦). ئەوپاشـان ئـەوەی ئەخاتـە سـەر کـە هەمو دەوڵەتەکان خاوەنی ٣ بەش یان چینن لە مرۆڤەکان، بەتواناکان، کـەم دەسـتەکان، و کەسانێك کـە شـوێنیان لـە ناوەراسـتدایە،(چـینی ناوەراسـت).کەسـانێك کـە سـەروەت و داراییـەکی مامناوەنـدیان هەیـە، پێش هـەمووان ئامـادەی ئـەوەن کـە پـەیرەوەی لـە ئـەقڵ بکەن، بۆ ئەو کەسەی سەروئاسایی جوان و بەهێز و شەریف زادەیە، و بە پێچەوانەوە بۆ کەسـێك کـە سەرووئاسـایی کـەم دەسـت و بێتوانـاو ناشـیرینە، پـەیرەوی کـردن لـە بڕیارەکـانی ئـەقڵ زۆر سـەختە بۆیـان، چـونکە گروپـی یەکـەم دووچـاری ((خۆبەگـەورە زانین))ی زۆر ئـەبن، و گرووپـی دووەم دووچاری ئازاردان و ئیش نابەجێ ئـەبن(هـەمان وەرز، گـ١٢٩٥b، دێرەکـانی ١٠-١)،سـەرەنجام ئەرسـتۆ ئەگاتـە ئـەو ئەنجامـەی کـە باشـترین کۆمـەڵگای هاوبەشـی سیاسـی ئەوەیـە کـە ((چـینی ناوەراسـت)) فـەرمانرەوایی

لەسەر ئەکات و ئەم چینە لەودا زیاتر و بەهێزترە لە دوو چینەکەی تر(واتە زۆر بەتواناکان و زۆر کەم دەستەکان)(هەمان گ، دێرەکانی ٣٦-٣٥).

ئەرستۆ پێداچوونەوەیەکی درێژ لەبارەی هۆکارەکان و پاڵنەرەکانی شۆڕش و راپەڕینەکان لە سیستەمە سیاسیە جۆراوجۆرەکان و لە ناوەرۆکی نەتەوەکاندا، ئەکات، ئەم هۆکار و پاڵنەرانە لە سیستەمە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازن، هەریەك لە سیستەمە سیاسیەکان بە هۆی پاڵنەرێکەوە دروست ئەبن، بەڵام هەمووان لەمەدا یەکیان گرتووە کە ئامانج ئەبێت دادپەروەری و یەکسانیەکی گونجاو بێت، فەرمانڕەوایی گشتی(دیمۆکراسی) لەوێوە دێتە ئارا کە زۆرینەی خەڵکی وایان ئەزانی کەسانێك کەلە لایەکەوە یەکسانن، ((بە رەهایی بەرامبەرن))، و لەبەر ئەوەی خەڵکی ئازادن، کەواتە بە ڕەهاییش بەرامبەرو یەکسانن، پاڵنەری فەرمانڕەوایی لە ئەلیگارشی ئەم وێنایە بوو کە لەبەر ئەوەی ئەمانە لە روانگەیەکەوە-وەك دارایی- لەگەڵ ئەوانی تردا یەکسان نین، لەم روەوە، بەهرە و بەشێکی تر بۆ خۆیان ئەخوازن،-واتە فرەخوازی بکەن-کە یەکێکە لە شێوەکانی نایەکسانی و نابەرامبەری، لەهەریەك لە سیستەمە سیاسیەکاندا،جۆرێك لە دادپەروەری بەدی ئەکرێت، بەڵام نەك بە شێوەیەکی رەها، و بەم شێوەیە هەرکاتێك کە پشکی ئەوان لە دەوڵەتدا هەمەنگ و هاوتا لە گەڵ وێنا کردنەکانیان نەبێت، دەست ئەکەن بە شۆڕش، لەکاتێکدا کە کەسانێك بەو پێیەی فەزیلەتێکی بەرزتریان هەیە، لە پێش هەموویانەوە مافی ئەوەیان هەیە شۆڕش بکەن، بەڵام کەمتر لە هەموشیان دەستی بۆ ئەبەن، هەرچەند تەنیا ئەمانن کە بەراستی و ڕەهاییانە نایەکسان و نابەرامبەرن لەگەڵ ئەوانی تردا، نایەکسانی لە هەموو شوێنێکدا ئەبێتە پاڵنەری شۆڕش، لەم نێوانەدا سیستەمی دیمۆکراسی،پایەدارتر و سەلامەتترە لە فەرمانڕەوایی چەند کەسێکی تر، و کەمتر حەزیان لە شۆڕشە، چونکە ئەم سیستەمە کە لە چینی ناوەراست پێك دێت، لەخەڵکە ئاساییەکە نزیکترە و بەم شێوەیە لە نیوان باقی سیستەمەکانی تردا، پایەدارتر و هێمنترە، لە لایەکی ترەوە ئامانجی سەرەکی شۆڕشەکان، بەرژەوەندی خوازی و شانازی یان پلەوپایە خوازیە، ئەم دوو پاڵنەرە هاوکات ئەبنە هۆی ئەوە کە مرۆڤەکان لە دژی یەکتری هەڵسنەوە، نەك بۆ ئەوەی ئەو دوو پشکە بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، بەڵکو بە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە مرۆڤەکان لە چەند مە سەلەیەکدا بە هەقی خۆیان و لەهەندێ مەسەلەی تردا بە ناهەقی، پشکێکیی زۆرتریان لە بەدەست هێنانەکاندا هەیە، خوازیاری خۆبەگەورەزانی و بەرژەوەندی خوازی، لە پێش هەمو پاڵنەرەکانی ترەوە کاریگەرترن ( هەمان ، کتێبیV، وەرزەکانی ١و٢).لێرەدا سەرنجراکێشترین خاڵ کە

ئەرستۆ ئاماژەی پی ئەکات ئەوەیە کە سیستەمی سیاسی هەرچەندە تێکەڵاوتر لە (توخمی سیاسی جیاوازتر) بێت ، بەردەوامتر ئەبێت و گەورەترین هەڵەی ئەوانەی کە بەدوای جێگیرکردنی حکومەتێکی جێگیردان، ئەوەیە کە نەتەنیا کە پشکێکی زۆرتر بە دەوڵەمەندەکان ئەبەخشێت، بەڵکو هاوکات زۆرینەی خەڵکی نەخەڵەتێنن و تا ئەگاتە ئەوەی کە لە چاکەی درۆکانیان، شەڕ و خراپەیەکی راستەقینە دێتە ئاراوە، چونکە فرەخوازی بەتواناکان بۆ سیستەمی سیاسی لە فرەخوازیەکانی مێگەڵ گەلێك وێرانکەر ترە،(هەمان ،کتێبی IV، وەرزی ١٠، گ ١٢٩٧a، دێرەکانی ١٤-٦).لەبەر ئەمە پاڵنەری سەرەکی شۆرشەکان و راپەرینەکان لە روانگەی ئەرستۆوە هێزی خۆبەگەورەزانی و ستەم و فرەخوازی و بەرژەوەندیە، چونکە کاتێك کە ئیشکەرەکان و بەرپرسەکانی دوچاری خۆبەگەورەزانی و ستەم و فرەخوازی ئەبن خەڵکیش لە دژی ئەوان و ئەو سیستەمە سیاسیەی کە هانی ئەوان ئەدات، شۆرش ئەکەن، فرەخوازی و بەرژەوەندی خوازی، چاو ئەبڕێتە موڵك و بەشە تایبەتی و گشتیەکان ( هەمان، کتێبی V، وەرزی ٢، گ١٢٠٢b، دێرەکانی ١٢-٥).

لەبارەی باشترین شێوەی دەوڵەت وحکومەت، ناتوانین بە شێوەیەکی ڕەها قسان بکەین،یان بڵێین کە سیستەمی سیاسی کامەیە، چونکە لە زۆرێك لە بوارەکاندا،بەدەست هێنانی باشترین شتێکی مەحاڵە،لەبەر ئەوە، یاسادانەران و سیاسەتمەدارانی راستەقینە، ئەبێت لەگەڵ یەکتری بە شێوەیەکی ڕەهایی ئاشنا بن، و هاوکات بە باشترین شێوەی ئەو هەل و مەرجانەی کە هەن، نەتەنیا لەبارەی باشترین سیستەمی سیاسی، بیر ئەکەنەوە،بەڵکو لەوەش کە(ئەکرێت) و(کرداری)یە بیر ئەکەنەوە (هەمان،کتێبی،IV، گ١٢٨٦b، دێری ٢٥ بە دواوە) لە لایەکی ترەوە ،هەر دەوڵەتێك،کۆمەڵگایەك و کۆبووەوەیەکی هاوبەشە لە مرۆڤەکان و ئەمەش جۆرێك لە چالاکی بەکارهێنانەکانی فەزیلەتە، بەم شێوەیە، شێوازە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت و سیستەمە سیاسیەکان دێنە ئارا وە، چونکە مرۆڤە جۆراوجۆرەکان بە شێوە گەلێکی جیاواز و بە چەندین ئامرازی لێك جیا بەدوای خۆشبەختی و کامەرانیدا ئەگەڕێن و بەم شێوەیە بۆ خۆشیان شێواز گەلێکی جیاوازی ژیان و سیستەمی سیاسی هەڵئەبژێرن (هەمان،کتێبیVII، وەرزی ٧، گ١٣٢٨a، دێرەکانی ٤١-٣٦).

ئەرستۆ خۆی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو پێداچوونەوەی دەوڵەت و سیستەمی سیاسی ئەفلاتوون ئەکات ، بەو شێوەیەی کە لە نووسراوەکانی کۆمار و((یاساکان))ی ئەو وێنا ئەکرێت، و بە تایبەتی زۆر بە توندی رەخنە لە پێشنیارەکانی ئەفلاتوون لەبارەی

هاوبەشی کردنی منداڵان و ژنان و خاوەندارێتی ئەگرێت و بە نەخوازراو و زیانمەند و ناکرداری ئەژماریان ئەکات وبەتایبەتی پاڵپشتی لایەنە دژەئەخلاقیەکان سیستەمی دەوڵەتەکەی ئەفلاتوون ئەکات، لە سیستەمێکی لەو شێوەیەدا،پێش هەمو شتێك دوو فەزیلەتە ئەخلاقیەکە لەناو ئەچن،(خۆپارێزی)و دوورکەوتنەوە لە ژنان و سەختیەتی لەبەرامبەر دارایی، لەلایەکی ترەوە، ئەو سامانەی کە لەنێوان چەند خاوەنێکی زۆردا هاوبەشە، کەمترین چاودێری لێ ئەکرێت، چونکە مرۆڤەکان زیاتر گرنگی بەو شتەی خۆیان ئەدەن کە تایبەتە بە خودی خۆیان نەك هاوبەش لەگەڵ یەکێکی تر، هاوکات لە سیستەمێکی لەو شێوەیەدا چەمکی هاورێیەتی، کە گەورەترین چاکە لە دەوڵەتەکان و پارێزەری ئەوانە لەبەرامبەر شۆرشەکاندا، لەناو ئەچێت، ئەشقیش لە کۆمەڵگایەکی سۆشیالی لەو شێوەیەدا، بەهای نامێنێت، و باوك ناڵێت((کوڕی من)) و کوڕ ناڵێت ((باوکی من))( هەمان،کتێبی II،وەرزەکانی ١،٢،٣).

سەرەنجام ، ئەرستۆ باشترین سستەمی سیاسی یان بە دەربڕینەکەی خۆی، سیستەمی سیاسی (ئایدیالی) وێنا ئەکات، کە لێرەدا تایبەتمەندیە دیارەکانی ئەخرێنە روو، ئەرستۆ کتێبی حەوتەم و هەشتەمی نوسراوەکەی خۆی تایبەت کردووە بەم توێژینەوەیە(کۆمەڵگای ئایدیالی ئەرستۆ)،دەوڵەت شارێکی بچوکی یۆنانی و رێکخراوێکی سیاسی ئەوە، کۆمەڵگایەکی بێجووڵانەوەو بێ بەرفراوانی کە ئەبێت یەکجار بۆ هەمیشە رێك بخرێت، سیستەمی کۆمەڵگایەکی لەم شێوەیە ئەبێت رێك هاوتا بە سیستەمی گشتی ژیانی گیانەوەران و دونیا بێت، خودی ئەرستۆ لە یەکێك لە نووسراوەکانی دا ئامارژە بەو خاڵە ئەکات و ئەڵێت کە(ئۆرگانیسم)ی گیانداران ئەبێت هەروەك سیستەمی سیاسی دەوڵەت شارێکی حکومەتی وێنا بکەین، کە هەر یەك جار بەرقەراری رووی تێ کرد، ئیدی لەودا پێویست بە فەرمانرەواییەکی تاکگەرایانە ناکات، کە سەرپەرشتی ئەرکە جیاوازەکان بکات، چونکە، هەریەکە لە تاکەکان لەودا ، ئەرکە دیاری کراوەکەی خۆیان بە شێوەیەك کە پێشتر دیاری کرابێت بۆیان، ئەنجام ئەدەن، و هەر ئیشێك بە پێی سیستەمێکی گووزەری[١] روو ئەدات( لەبارەی جووڵەی گیانەوەران،گ ٧٠٣a، دێرەکانی ٣٤-٣٠).

کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئایدیالی ئەرستۆ، لە بەراورد بە((مدینة فاضلة))ی ئەفلاتوون، واقع بینانەتر و خاوەنی راستایەتیەکی روونترە، هەرچەندە بە نۆبەی خۆی،

[١] واتە سیستەمێك کە بە جوانی و بە رێکی بەرێوە ئەروات،بە بێ سەر ئێشە.

پەرچــدانەوەی خوازیــاری چــینە باڵاکــان و نوخبــەکانی کۆمــەڵگای یۆنانیــە، لــە سەردەمێکدایە کە ئەرستۆ تیایدا پەروەردە بووە،ئەرستۆ ئەڵێت:((باشترین ژیـان، چ بۆ تاکـەکان و چ بـە شـێوەیەکی هاوبـەش لـە دەوڵەتدا۔ ژیـانێکی پەیوەسـت بـە فەزیلەتـە، و هاوکات بوونی پشکێکە لە چاکە دەرەکیەکان، بۆ بەشداری کردن لە کردارە فەزیلەت ئامێزەکان))(سیاسەت،کتێبی VII،وەرزی ١،گ١٣٢٣b، دێری ٤٠، گ١٣٢٤a، دێری ٢)، لێرەدا ئـەتوانین بپرسـین کـە ئایـا بەختـەوەری دەوڵـەت یـان بەختـەوەری هەریەکـە لـە تاکەکانی مرۆڤ یەکێکە؟ وەڵامەکە ڕوونە، هەمووان لەسەر ئەوەن کە هـەردوکیان یـەکێکن (هەمان گ،دێرەکانی ٨-٥)بەم شێوەیە ڕوونە کە باشترین سیستەمی سیاسی ئەوەیە کە هـەمو کەسێك، هەرکەسێك بێت، بتوانێت بە باشترین شێوە چالاکی یان چاکە ئـەنجام بدات،بـەڵام تەنانـەت کەسـانێك کـە لایـەنگری ئـەم بڕوایـەن کـە ژیـانی پـڕ لـە فەزیلـەت، بـەرزترین شـێوەی ژیانـە، ئـەم پرسـیارە ئەهێننـە ئـاراوە کـە ئایـا ژیـانی سیاسـی و کرداری(بەرزترینە)، یان ئەو ژیانەی کە ڕەهایە لە هەمو ئیشە دەرەکیەکان، واتە جۆرێك لە ژیانی تیۆری و تێرامـان کە هەندێك پێـی ئەڵێن تـەنها ژیـانی فەیەسووفەکانە؟(هـەمان کتێب، وەرزی ٢، گ١٣٢٤a، دێرەکانی ٣٢-٢٣).

لـە لایـەکی ترەوە،کەسـانێك کـە ژیـانی فەزیلـەت ئـامێز بـە بـەرزترین شـێوە ژیـان دائەنێن،لەبارەی چۆنایەتیەکەیەوە جیاوازن، هەندێ کەس هەن لە وەرگرتن و قبوڵکردنی پلـە سیاسـیەکان لەسـەر بنـەمای ئـەو بڕوایـەی کـە ژیـانی مرۆڤێکـی ئـازاد، بـەدەرە لـە ژیانێکی سیاسی،نکۆڵی ئەکەن، لەکاتێکدا کە کەسانێکی تر ژیانی سیاسی بە باشترین ژیان ئەزانن و بەڵگەی ئەوە ئەهێننەوە، کەسێك کە هیچ ئیشێك ناکات، ناتوانێت ئیشێك بـە باشـی ئـەنجام بـدات، و بـە شـێوەیەکی جـوان ئیشەکانی ڕاپـەڕێنێت،و ئیشـی بـاش کردن،هەمان بەختەوەریە، هەردوو گروپەکەش ڕاست ئەکەن، و ڕاستیش ناکەن، دروستە کـە ژیـانی ئازاد،باشـترە لـە ژیـانێکی دەسـتبەسـەری یـان فەرمانـداری، وخزمـەت کردنـی کۆیلەیەك پلەیەکی بەرز نیە، یان فرماندان بە ئەنجام دانی ئیشە سەپێنراوەکان، شـتێکی خوازراو نیە، بـەڵام هەڵەیە ئەگـەر وا بزانرێـت کـە هـەموو جۆرە فرمانـدانێك(خـۆ خـوازی) و(بەرژەوەنـدی خـودی) لـە پشتەوەیە، چـونکە جیاوازیـەکی زۆر گـەورە هەیـە لـە نێـوان فرماندان بەسەر مرۆڤە ئازادەکان و مرۆڤە کۆیلەکان، بەهـەمان شێوە کە جیـاوازی هەیـە لـە نێوان کەسێك کـە بـە سروشـتانە ئـازادەو کەسێك کـە بـە سروشـتانە کۆیلەیـە(هـەمان کتێب، وەرزی ٣، گ١٣٢٥a، دێرەکانی ٣٠-١٦).

بەڵام پێکهاتەی سیستەمی سیاسی یان کۆمەڵگای ئایدیاڵی ئەرستۆ چییە؟ بەو شێوەیەی کە ئاماژەی پێدرا، رێکخستن و ریزبەندی دوو چەمکی بنەمایی لە دونیابینی ئەرستۆن، هەنووکە باشترین سیستەمی دەوڵەتی چییە؟ باشترین سیستەمی سیاسی،بە بێ ئامراز و کەل وپەلی شایستە ناتوانێت بێتە دی، لەم روەوە ئەبێت پێشتر بیر لە هەل ومەرجە ئایدیاڵیەکان بکەین، هەرچەندە هیچ یەك لەوانە نابێت مەحاڵ بن، یەکێك لە هەل و مەرجەکان، ژمارەی (هاوشاریەکانە-هاووڵاتیەکانە) و ئەوی تر (ناوچەی ژیان )یانە، بەهەمان شێوە کە پیشەگەرەکان بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانیان پێویستان بە ئامراز وکەل وپەلە، سیاسەتمەدارەکان و یاساگووزارەکان، بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانیان ئەبێت ئامرازی پێویستیان هەبێت، یەکەمجار ئەبێت ئامرازی سیاسی پێویست، ژمارە دانیشتوان و خەسڵەتی سروشتی خەڵکەکەو پاشان بەرفراوانی و پانتایی تایبەتمەندیەکانی ناوچەی ژیانی خەڵکەکە، زۆربەی خەڵکی وا ئەزانن کە دەوڵەت و کۆمەڵگای بەختەوەر ئەبێت خاوەنی سەرزەمینێکی گەورە بێت، هەرچەند ئەم بڕوایە لەوانەیە دروست بێت ،بەڵام ئەمانە بیر لەم خاڵە ناکەنەوە کە گەورەیی یان بچوکی دەوڵەت چۆنە، ئەمانە گەورەیی دەوڵەت لە زۆری دانیشتوانەکەیەوە ئەزانن، لە کاتێکدا کە ژماری دانیشتوان وکۆمەلاَن بە ئەندازەیەکی زۆر گرنگ نیە، هەر دەوڵەتێك ،وەك هەر تاکێکی مرۆیی ئەبێت ئیشەکانی ئەنجام بدات و گەورەترین دەوڵەت ئەوەیە کە بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانی زۆرترین ئامادەیی و شایستەیی هەبێت، لەلایەکی ترەوە، ئەزموون پیشانی ئەدات کە ناتوانرێت حکومڕانی دەوڵەتێکی فرە کۆمەڵ و خاوەن دانیشتووی زۆر بکرێت، ئەو دەوڵەت شارانەی کە ناوبانگی(باشێتی حکومەت)یان هەیە، خاوەنی دانیشتوویەکی سنوردارن، ئەم خاڵە لە روانگەی تیۆریەوە دیارە، و ڕوونە، چونکە یاسا جۆرێك لە رێکخستنە، و یاسای باش هاوریێ لەگەڵ رێکخستنی باشدایە، لە کاتێکدا کە هێنانە ئارای رێکخستن لەناو کۆمەڵێکی فراوانی دانیشتواندا کەمێك مەحاڵە، و ئیشێکی لەم شێوەیە تەنیا لە توانای هێزی خودادایە، کە تەواوی جیهان پێکەوە ئەبەستێت، لەلایەکی ترەوە، کەمی ژمارە دانیشتوانیش، بەو شێوەیەی کە پێویستەو ئەبێت هەبێت ،دەوڵەت بوونیاد نانێت، چونکە دەوڵەت ئەبێت خاوەنی زۆرترین (خۆ بەسێتی) بێت و شتەکانی هەبێت تا بتوانێت پێداویستیەکانی ژیانی خۆی دابین بکات،و بە هەمو کەسێکیانی بگەیەنێت،(خۆبەسێتی) واتە بوونی هەموو ئامراز و پێداویستیە پێویستەکان و بێ منەتی لە هەموو روویەکەوە، کەواتە، دەوڵەت ئەبێت لە روانگەی دانیشتوان و فراوانیەوە، بە شێوەیەك بێت کە خەڵکی بتوانن، لە ژیانی ئازاد

سیفەتانە ولەناو کەش وهەوایەکی مام ناوەندیدا بژین، هاوکات دەوڵەت ئەبێت دەستی بگاتە سەر دەریا و ووشکانی لە هەمانکاتدا (هەمان، کتێبیVII،وەرزەکانی ٨-١).

ئەرستۆ ئەوکات خۆی خەریکی دیاری کردنی ئەو خەسڵەتانە ئەکات کە کۆمەڵێك پێویستیانە لە دەوڵەتێکدا، و کاریگەری هەرێم وژینگەی ژیانی لە تێروتەسەل کردنی خەسڵەتەکانی مرۆڤدا ئەژمێرێت، نەتەوەکانی ناوچە ساردەکان، ئازایەتیەکی فراوانیان هەیە، بەلأم خاوەنی ژیرییەکی زۆر نین، نەتەوەکانی ئاسیا زۆر ژێر و کارامەن، بەلأم ئازا نین، بەڵکۆ زیاتر هۆشیارن، و لەبەر ئەوە زۆرجار لەوانەیە کۆیلە بن، و لەئەگەری بە کۆیلەبوندان ، بەلأم یۆنانیەکان، خاوەنی هەردو خەسڵەتەکەن، هەم ئازان و هەم ژیرن وهەر لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە هەمیشە ئازادن، وباشترین شێوەی حکومەتەکانیان هەیە، وئەگەر سیستەمێکی سیاسی تاك و تەنیایان هەبێت، ئەتوانن فەرمانرەوایی هەموو دونیا بکەن،.

ئەرستۆ پاشان باسی شەش ئەرکە پێویستەکە ئەکات بۆ ناو دەوڵەتی ئایدیالی، یەکەمیان،(دابین کردنی خۆراك)،دووەم(بوونی پیشە، چونکە پێویستی بە ئامێری زۆر هەیە،)سێهەم (دروست کردن و بەرهەم هێنانی چەك) چوارەم( بونی دەرامەتی پێویست بۆ دابین کردنی پێداویستیە ناوخۆییەکان وشەڕ) پێنجەم( و لەوانەیە لە سەرووی هەموویانەوە بێت،سەرنجدان بەمەسەلە دینیەکان و (خودا) کە هەمیشە ئیشی رۆحانیەکانە) شەشەم( و پێویستتر لە هەمویان، دروست کردنی چەند یەکەیەك کە دەوڵەت زۆر پێویستی پێیانە).

ئێستاکە هەریەك لەم یەکەو ئەرکانە ئەبێت تایبەت بە چینێکی دیاری کراو بن، ئەم چینانە بریتین لەمانە (وەرزێرەکان،شەڕکەرەکان،دەوڵەمەندان، پیشەگەران،رۆحانیەکان و داوەرەکان)، بەلأم لەلایەکی ترەوە، لە روانگەی ئەرستۆوە، هەمو تاکەکانی کۆمەڵگا شایستەیی(شارێتی=هاوشارێتی=هاوولأتێتی)یان نیە، چونکە قسە لەبارەی باشترین سیستەمی سیاسی و کۆمەلأیەتیە کە دەوڵەت لەودا ئەتوانێت بگات بە بەرزترین بەختەوەری، بەختەوەریش-بەو شێوەیی کە ئەرستۆ چەندین جار دووبارەی کردۆتەوە- بە بێ فەزیلەت نایەتە ئارا، بەم شێوەیە لە دەوڵەتێکی ئایدیالی لەو شێوەیەدا، هلوولأتیەکان، نابێت(=دەست گێڕەکان=دەست ئیشەکان=دەست ئیشەکان) و بازرگانەکان بن، چونکە ژیانێکی لەو شێوەیە، نزم و پێچەوانەی فەزیلەتە،هاوکات وەرزێر نابێت(هاوولأتی) بێت، چونکی پەروەردە کردنی فەزیلەت و بۆ ئەنجامدانی ئیشی سیاسی،کات و بۆشاییەکی ئازادانە پێویستە، لە لایەکی ترەوە، لەهەر

دەوڵەتێکدا چینێك شەڕکەرن، و چینێك کە لەبارەی بەرژەوەندیە هاوبەشەکان راوێژ ئەکەن، ولەبارەی مەسەلە پەیوەستەکان بە دادپەروەریەوە داوەری ئەکەن، بونیان هەیە،دامەزراوە ولیش و یەکەو ئەرکی هەر دەوڵەتێك، لەسەر ئەو بنەمایانە لەنێوانیان ئەماندا دابەش ئەبێت، هاوکات سامان ئەبێت بەرەهایی پەیوەست بێت بەم چینانەوە، چونکە ئەمانە هاوشاری راستەقینەن، و هاوشاریەکان ئەبێت بە توانابن و دەست گیر یان گروپێکی تر کە بەدی هێنەری فەزیلەت نین،پشکێکیان لە هاوولاتیدا نیە، ئەم مەسەلەیە لەسەر بنەمای ئەوەیە کە بەختەوەری بە بێ فەزیلەت نابێت، ودەوڵەتیش لەسەر بنەمای بەختەوەری تەواوی دانیشتوان و هاوشارییەکانی ئەتوانین بە بەختەوەر ئەژمار بکەین نەك لەسەر بنەمای بەختەوەری بڕێکیان، کەواتە ڕوونە کە خاوەندارێتیەکانیش ئەبێت هی ئەو چینانە بن، بەهەمان شێوە کە چاندن ئەبێت لەدەستی کۆیلەکان یان دانیشتوانی باقی سەرزەمینەکانی تر بێت(هەمان شوێن).

ئەرستۆ پاشان باس لەمەسەلەی کەلتور و فێرکاری و پەروەراندن لە کۆمەڵگای ئایدیالی خۆیدا ئەکات، ئەو لەداوی ئاماژەدان بە رۆڵی بەخت و رێکەوت لە دیاری کردنی چاکە دەرەکیەکانی کۆمەڵگایەك، جەخت لەسەر ئەوە ئەکاتەوە کە مەسەلەی فەزیلەت و بەختەوەری لە دەوڵەتێکدا، نە ئیشی بەختەوە ونە ئیشی رێکەوت، بەڵکو بۆ مەسەلەی زانست وهەڵبژاردنی هاندەری ئەگەرێتەوە، بەلام چۆن ئەتوانیت ببینە خاوەنی فەزیلەت؟ هەر چەند لەوانەیە کە تەواوی کۆمەڵگا ببێتە خاوەنی فەزیلەت، بە بێ ئەوەی تاکەکان بەو شێوەیە بن، بەلام فەزیلەت بوونی (تاکی بەرز)ە،٣ شت فاکتەری بەدی هاتنی مرۆڤ گەلێکی باش وبەرجەستەن، (سروشتی سروشتیانە) خوو-عادەت) تێگەیشتن)بەم شێوەیە ،لەلای ئەرستۆ، عادەت و ئەقڵ ئەبێت لەگەڵ یەکتری دا هاوتا وبگونجێن، چونکە ئەمانە هەمیشە هاوتا و هاوئاهەنگ نین، بەلام ئەگەر ئەقڵ وا لە مرۆڤەکان بکات،ئای کە چەندە ئیش بە پێچەوانەی سروشت و عادەت ئەنجام ئەدەن (هەمان،کتێبی VIII،وەرزەکانی ٥-١).

ئەرستۆ پاشان پێشنیاری بەرنامەیەکی دوور ودرێژ بۆ پیاوان، ژنان،منداڵان ولاوەکان، ئەکات، لەم نێوانەدا بەسوودترین فێرکاری،خوێندن، نووسین،وەرزش ومۆسیقایە، بەلام ئەوەی ئەرستۆ ناوی ئەنێت((مۆسیقا))، تەنها تایبەت بە دانانی سرود وچرینیان نیە، لە زمانی یۆنانیدا، واژەیەکی تایبەت بۆ ئەدەبیات بوونی نیە، لەبەر ئەمە،((موسیکە)) شیعر وهونەرە پەیوەستەکان بە شیعریش لەخۆ ئەگرێت، لەلایەکی ترەوە،مۆسیقا، بەمانا تایبەتەکەی پێویستە، چونکە مرۆڤەکان پێویستیان بە پشودان و

گەڕان و هێمنیە، لەم ڕووەوەیە کە کاتێك مۆسیقا-چ ئامێرێك وە چ ئاوازێك- بە پاڵنەری شیرینترین چێژەکان ئەژمار ئەکات، بەلأم ئامانج لە مۆسیقا تەنیا خۆپەشۆکاندن و پشودان نیە، بەڵکو ئەرکێکی بەرفراوانتر لەخۆ ئەگرێت، وپاڵنەری ئارامی دەروونی و ڕەزامەنـدی ڕۆح و دەرمـانی ئـازارە ڕۆحیەکانـە کـە بـەدەرن لـە ئازارەکـانی ژیـان، وفاکتەری((پاڵفتەکەری)) ڕۆحە (هەمان شوێن).

بەو شێوەیەی کە بینیمان، ئەو شێوەیەی کە ئەرستۆ لە کۆمەڵگا ئایدیاڵیەکەی خۆیدا وێنای ئەکات، ژیانی سیاسیە، ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە ئامانجی کۆتایی لە ژیانی(هاوولأتێتی) لە کۆمەڵگایەکی لەو شێوەیەدا ئەبێت چی بێت؟ وەلأمی ئەرستۆ ئەوەیە کە(ئارامی)یە، بەلأم ئارامی لە مانا ئەرستۆییەکەیدا بەمانای( بیّ ئیشی و قاچ خستنە سەرقاچ) نیە، بەڵکو بەمانای پشکداری(هاوولأتیەکان)یەکانە لە((کاتێکی ئازاد)) بۆخۆیـان، و ئەمـەش هاوبەرامبـەری (ئـیش کـردن=سـەرقاڵی)یـە، واتـە ئـەو ئـەرك و بەرپرسیاریانەی کە ئیشەکانی ڕۆژانە ئەیانخاتە سەریان، ئەرستۆ ئەڵێت:((ژیانی ئەوان خاوەنی (سەرقاڵی) و(ئارامی) و(شەڕ) و(ڕێککەوتن)ە، و لەهەموو ئیشەکانی ئێمەدا هەندێکیان پێداویستیەکانی ژیان وشتە بەسودەکان و هەندێکی تریان شتە جوانەکانن، لەم بارەیەوە ئەبێت(هاندان) بێتە ئاراوە، بۆ نموونە شەڕ بۆ ئاشتی و ڕێکەوتن، سەرقاڵی بۆ ئارامی، پێداویستیەکان وشتە بەسوودەکان بۆ شتە جوان وبەرزەکان، لەبەرئەمە ئەبێت بە لەبەرچاو گرتنی ئەم خاڵانە یاسا دابنرێت (هەمان،کتێبی VII، وەرزی ١٣، گ ١٣٣a، دێرەکانی ٣٨-٣١).

لە لایەکی ترەوە،لەبەر ئەوەی ئامانجی هەمو مرۆڤەکان-چ گروپ و چ تاك-یەکێکە، و لەگەڵ ئەوەش هەر ئەم ئامانجە، بێگومان هەم لەبارەی مرۆڤەکان وهەم لەبارەی باشترین ڕێکخراوە سیاسیەکانەوە دروستە، کەواتە ڕوونە کە فەزیلەتە تایبەت بە ئارامیەکانیش پێویستن، بەلأم فەزیلەتە سودمەندەکان بۆ ئارامی، نەك ئەوانەی کە لە ئارامیدا بەسودن، بەڵکو ئەوانەش کە لە کاتی سەرقاڵیشدا بە سودن، چونکە زۆرێك لە پێداویستیەکانی ژیان، پێش گەیشتنە حاڵەتی ئارامی ئەبێت دابین کرابن، لەبەر ئەمە دەوڵەت ئەبێت (خۆخـاوەن) و(ئـازا)و(ئیـشکەر) بێـت، چـونکە بـەو شـێوەیەی کـە لـە ئایدیاڵـدا هەیە((کۆیلەکان هیچ ئارامیەك(کاتێکی بیّ ئیش)یان نیە)..))و ((کەسانێك کە ناتوانن دلێرانە ڕوبەڕووی ترسناکی ببنەوە، کۆیلەکان ئەبنە هێرشبەر))کەواتە ئازایی و ئیشکەری و چالاکی، لە کاتی سەرقاڵیدا، فەلسەفە لەکاتی ئارامی، و خۆخاوەنی و

دادپـــەروەری لـــە هەردووکیانـــدا،و بەتایبـــەتی زیـــاتر لـــەکاتی ئارامیـــدا پێویـــستە (هەمان،کتێبیVIII،وەرزی١،گ١٣٣٧a، دێرەکانی ٢٦-١١).

ئەرستۆ سەرەنجام ئاماژە بەو خاڵە ئەکات کە هەرچەندە لە رۆژگاری ئەودا زۆربەی خەڵکی بۆ چێژبردن دەستیان داوەتە مۆسیقا، بەڵام کەسانێکی تر لە سەرەتادا لە گەڵ ئیشی فێرکاری و پەروەراندن و کەڵتوردا گونجاندبوویان، چونکە خودی سروشتیش خوازیاری ئەوەیە کە ئێمە نە تەنیا بتوانین بەدروستیەکی تەواو لە ئارامیدا بین، بەڵکو هاوکات بتوانین ئارامیەکی جوانمان هەبێت،چونکە، یەکەمین رەگەزی سەرەکی هەموو ئیشەکانی ئێمە هەمان(ئارامی)یە، هەرچەند سەرقاڵی و ئارامی، هەردوکیان پێویستن، بەڵام ئارامی ئامانجی ژیانە، وباشترە لە سەرقاڵی ( هەمان کتێب،وەرزی ٢،گ١٣٣٧b، دێرەکانی ٣٤-٢٥).

لەکۆتاییدا ئەبێت ئەوە بڵێین کە واژەی((ئارامی)) و لێدروستکراوەکانی لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی ئەرستۆدا و لە نێوانیاندا،٤٦ جار لە کتێبەکانی حەوتەم وهەشتەمی سیاسەتدا بەکار هێنراوە.

## میتافیزیك ( سەروسروشت ):

میتافیزیك، تاجی فەلسەفەکەی ئەرستۆیە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ،قورسترین بەشی فەلسەفەکەشیەتی، توێژینەوە لەبارەی میتافزیك، ئەرستۆ لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر دەستی پێ کرد، و تا ئێستاکەش بەردەوامە، و لەوانەشە هەرگیز نەگات بە کۆتایی،چونکە جیاوازی تێگەیشتنەکان و لێکدانەوەکان لەبارەی ئەم کۆمەڵە نوسینەی ئەرستۆ بەو شێوەیە نیە کە بتوانرێت لە نێوانیاندا جۆرێك لە یەککگرتن وئاشتی جێگیر و بەدی بکرێت، بەڵام ئەبێت ئەوە بڵێین کە ئەرستۆ خۆی-بەلایەنی کەمەوە تا ئەو شوێنەی کە ئەم نوسراوانە لە شێوە هەنووکەییەکەیاندا پیشانی ئەدەن- هۆکاری ئەم جۆرە تێگەیشتنە دژ بەیەك و بەرووکەش جیا لەیەکانە بووە، پێش هەموو شتێك ئەبێت شتێك بەیادبهێنرێتەوە کە ناوونیشانی((میتافیزیك)) خراوەتە پاڵ ئەو نووسینە گەورانەی کەلەم کتێبەدان، کە خۆیان ناویان((نوسینە یەکەمییەکان))ە.

لەبارەی ناوونیشانی هەنوکەیی ئەم نوسراوانە(میتافیزیك)یش لە نێوان لێکۆڵەرەوان و ئەرستۆناساندا جیاوازی لە بیرباوەردا هەیە، هەندێ لەسەر ئەوبروایەن کە (ئودمس رۆدسی) یەکێك لە بەرجەستەترین فێرخوازەکانی ئەرستۆ بۆ یەکەمین جار ئەم

ناوونیـشانەی داوە بـەم کۆمەڵـە نووسـینە، وبـە بـڕوای ئـەوانی تـر(ئانـدرنیکس ڕۆدسـی)یەکـەمین کۆکـەرەوە و ڕێکخـەری بەرهەمـەکانی ئەرسـتۆ کـە کۆمـەڵێك لـە نوسـراوەکانی ئەرسـتۆ کـە لـە دوای نووسـینەکانی تـری (لـە بـارەی سروشـت و سروشتایەتیەکان)ەوە بوون ناو نا(ناونیشانی میتافوسیکا)،واتە ئەوەی لەدوای بابەتی پەیوەست بە (سروشت) هاتوە، بەڵام ئەوەی کە لە ڕوانگەی مێژووییەوە ڕاستکراوەتەوە، ئەوەیـە کـە مێژوونوسـی گـەورە (نیکـۆلاس دمـشقی)(ح٦٤-دوای ٤پ.ز) بۆیەکـەمین جارهاوتـا لـەناو نوسـراوەکانی خۆیـدا، نوسـراوێکی بـەناوی((لـەبارەی فەلـسەفەی ئەرسـتۆ))،هێناوەتـەوە وئـەو نوسـراوانەی بـە ناوونیـشانی((میتافوسـیکا))هێنـاوە، نوسینەکانی نیکۆلاس بە سوریانی و عەرەبی وەرگێردراون، بەو شێوەیەی کە(ابن ندیم)، بـەناوی( کورتەیـەك لـەبارەی فەلـسەفەی ئەرسـتۆتالیس) نـاو ئـەبات،(لا٢٥٤)کـە (ابـن زرعـە(د٣٩٨ق/١٠٠٨.ز) لـە سـریانیەوە بـۆ عـەرەبی وەڕێگێڕانـدوە(سـە:هـەمان،٢٦٤)، وەرگێڕانە ئینگلیزیەکانی ئەم نووسراوە لە سریانیەوە لە(سارت لولفس) بەناونیشانی(( نیکـۆلاس دمـشقی لـەبارەی فەلـسەفەی ئەرسـتۆ) بـە پێـشەکی و لێکدانەوەیەکـەوە لـە (لیـدن)(١٩٦٩.ز) بـڵاوی کردۆتـەوە، (ابـن رشـد)یـش لـە لێکدانـەوە گەورەکـەی خۆیـدا لەسـەر(میتافیزیـك)ی ئەرسـتۆ، لـە چـەند شـوێنێکدا لـە نوسینەکانی نیکۆلائۆس، چەند بەشـێکی گواسـتۆتەوە (لـەبارەی ناونـانی میتافیزیك،سـە:ڕاینـز،٢٢٧-٢١٠، لـەبارەی نیکۆلائۆس دمشقی، سە، ٤٨٧-I/٤٦٥).

## پێکهاتەو بونیادی میتافیزیك:

پـێش هـەموو شـتێك ئـەبێت ئـەوە بـەیاد بهێنینـەوە کـە کۆمەڵـە نوسـراوی میتافیزیك)یش وەك هەندێ لە بەرهەمەکانی ئەرستۆ، بەتایبەتی لەلایەن خودی خۆیەوە و لەشێوەی کتێبێکی سەربەخۆو ڕێکخراو ،نەنوسراوە، ئەرستۆناسی گەورە (یگر) لە کتێبە بنەماییەکەی خۆیدا((چەند خوێندنەوەیەك لەبارەی مێژوو..)) کە پێشتر ئاماژەی پێ کرا، توێژینەوەیەکی هەمەلایەنەی لەبارەی ئەم نوسراوانە ئەنجام داوە، و بە ئەنجام گـەلێکی وا گەیـشتووە کـە زۆربـەی ئەرستۆناسـەکان قبوڵیـان کـردوون، ئـەو ئەنووسێت:((ئەرستۆ هەرگیز مەبەستی نەبوو وە نەی ئەویست کە بەرهەمێکی ئەدەبی بـەناوی(میتافیزیـك) بنوسـێت، بـەو ناونیـشانەی کـە لـە هـیچ یـەك لە نوسراوەکانی دا ئامـاژەی پـێ نـەکراوە، ئەمـەش دروسـت نیـە کـە ئانـدرنیکس کۆمەڵـە نووسـینێکی

لەبارەی((فەلسەی یەکەمین))ەوە نووسیبێت، لە گوزەری رێکخستنی بەرهەمەکانی ئەرستۆدا، لەدوای نوسینە((فیزیکی))یەکانی، ئەو بەناوونیشانی(میتافوسیکا) جێگیری کردوون، بەڵکو بە ئەگەرێکی زۆر پێش لەئەو لەماوەی دەوروبەری سەدەی ٢پ.ز کۆمەڵەیەك لە نوسینەکان بە ناونیشانی میتافوسیکا لە ١٠ کتێبدا لە قوتابخانەی(مشط ) و لە ئەسکەندەریە بونی هەبووە،(لا ١٨٠)،شێوازی تێڕوانینی ئازاراوی ئەم نووسینانەش، پیشاندەری ئەوەیە کە ئەوانە بۆ هەموو خەڵکی و خەڵکە ئاساییەکە نەنوسراون(هەمان،دێرەکانی ١٣٧-١٣٦). ناپەیوەستیە ئەدەبیەکەیان ئەو گریمانەیە دائەنێت کە مەبەست لەوانە بەرهەمێکی ئەدەبی نەبووە، یان ئەرستۆ مەبەستی بووە کە ئەوانە وەك بەشگەلێکی سەربەخۆ لەبەشەکانی تر، و تەنانەت بە ناونیشانی(فەلسەفەی یەکەمین))یان((خوداناسی=تیۆلۆژیا)) کۆکردۆتەوە، لەکاتێك کە لە روانگەی ئەرستۆوە ئەم دوو ناونیشانە، بابەتگەلی زانستێك پێك ئەهێنن کە لەم نووسراوانەدا خراونەتە ڕوو(هەمان، دێرەکانی ١٧٤-١٦٤)، هاوکات ناتوانرێت ئەم نوسراوانە هەروەك ڕەگ وریشەی ئەو گووتارانە بزانین کە بتوانرێت کۆیان بکەینەوە و لە شێوەیەکی تاك و تەنیادا بلاۆبکرێنەوە، ئەوانە یادداشتیش نین کە بە مەبەستی گوتاربێژی یان وەك نەریتی یۆنانیەکان بۆ یارمەتی دانی(یادگە)بەرهەم بهێنرێن، چونکە گەرانەوە تێکهەڵکێشەکانی ناو ئەم نووسراوانە، گۆڕانی شێوەی تێڕوانین بەمەبەستی پڕاوپڕی و سەرنجی زۆر ورد لە تەواوی دەربڕین و زمانەکەیدا، هەموو گریمانەکان ڕەت ئەکاتەوە( هەمان، دێرەکانی ١٣٨-١٢٥).

توێژینەوەکانی تر پیشانی ئەدەن کە ئەم نوسراوانە جۆرێکن لە ئیش و چالاکی ئەدەبی تایبەت بە سەردەمە کۆنەکان، واتە ئەوەی یۆنانیەکان بە ((راپۆرتەکان=زانیاریەکان))ی مامۆستا ناویان نەنان، کە لە لایەن فێرخوازەکانیەوە یان بیسەرەکانیەوە، بە یادگە و بیرمان ئەسپێردران، یان بە وشە ئەنوسرانەوە،و یادیان ئەکرایەوە، نمونەی ئەوانە لە هەندێ لە بەرهەمەکانی ئەفلاتووندا دەر ئەکەوێت، ئەم جۆرە یادداشتانە لەدوای خوێندنەوەی بابەتی قسەکردنەوە جێگیر ئەبوون، بەم شێوەیە ئەو((راپۆرت=زانیاریان))ە بە ئیشی بنچینەیی چالاکی قوتابخانەکان ئەژمار کراون(هەمان، دێرەکانی ١٤٨-١٣٨) و هاوکات بەردەوام خراونەتە بەر ڕوون کردنەوە و گۆڕان وخستنە سەر، کاتێك کە سەرەنجام ئەو نووسراوانە لە ئەرستۆ بە جێ مان، دواتر لە لایەن ئەوانی ترەوە لە شێوەی جیاکردنەوەو دەستەبەندیە گەورە وهەمەلایەنەکانەوە بەمەبەستی ووتنەوە و فێرکاری ئامادە کران، باقی بەشەکانیش لەماوەی ٣ سەدە

لەدوای مەرگی ئەرستۆ خراوەتە سەریان، ئەم زیادکراویانە بۆ سەر نوسینەکانی ئەرستۆ لەو نوسراوانە وەرگیراون کە واهاتۆتە بەرچاو هی خودی ئەرستۆ بن کە لەبارەی مەسەلە میتافیزیکیەکانەوە نووسیوونی (هەمان، دێرەکان ١٨٤-١٧٤) سەرەنجام ئەم نوسراوانە لە ماوەی سەدەی ١پ.ز ڕێکخران و لە شێوەی تاقە کتێبێك خرانە بەردەم تەواوی مرۆڤایەتی و خەڵکی، لەکاتێکدا کە لە شێوە سەرەتاییەکەی خۆیاندا، تەنیا بۆ سود وەرگرتنی ئەندامانی قوتابخانەکەی ئەرستۆ، و پێش بردنی زانستی فەلسەفی ئەوانەوە بوون ( هەمان، دێرەکانی ١٨٧-١٧٤،١٤٧-١٤٤).

لەبەر ئەمە ئەتوانین بڵێین کە ئەوەی ئەمرۆکە بەناونیشانی (میتافیزیك)ی ئەرستۆ لەبەردەستماندایە، نابێت هەروەك کتێبێکی ناوەرۆکدار، یان زنجیرەیەك گوتار، یان کۆمەڵەیەك لە یادداشتەکان بۆ قسەکردن ناوزەد بکرێت، بەڵکو ئەبێت وەك شێوازێك لە خۆخەریك کردن بە بابەتێکی دیاری کراو لەبەر چاوی بگرین، کە لە ژینگە فەلسەفیەکەی ئاتن و لە سەدەی ٤پ.ز هاتۆتە ئارا، بەم شێوەیە باشترین شێوە بۆ ناسینی (میتافیزیك)ی ئەرستۆ لەبەر چاوگرتنی هاوکاتی شێوەو ناوەرۆکەکەیەتی، ئەبێت هەوڵ بدەین کە ئەرستۆ بە هۆی خودی ئەرستۆ- لەرێگای بەراورد کردنی نوسینەکەی- بناسین، سەرنجدانی شێوازی دەربڕین و بەیانکردنی ئەرستۆ بە تایبەتی زۆر گرنگترە، تا نوسینە میتافیزیکیەکانی، وە هەوڵ نەدەین کە ئەولەبوار و چواردیواری چەمکەکان و خوازراویە تازەو هەنوکەییە فەلسەفیەکان بگونجێنین،و بەتایبەتی ئەبێت سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەرستۆ پێکهێنەری ((سیستەمێکی فەلسەفی)) نەبووە، ئەو پێش هەموو شتێك فەیلەسوفێکی((بیر لەمەسەلەکەرەوە- مەسەلە ئەندێش))ە، ئەو هاوکات((تیۆردارێژ))ێك نیە بەمانا هەنوکەییەکەی، ئەوەی ئەرستۆ((تیۆر))ی پێ ئەڵێت، بڕوایەکی پەتی یان تێڕامانێك نیە، بەڵکو هێنانە ئارایی((زانست))و((ناسین و مەعریفەیە))، چێژێك کە کە لە تێڕوانین و((تێ بینین))ەوە بەدەست دێت، و((تێ بینین))و فێرکاری بەرفراوان ئەکات (ئەخلاقی نیکۆماخۆس،کتێبی VII، وەرزی ١٢، گ١١٥٣a، دێرەکانی ٢٣-٢٢).

بەو شێوەیەی کە بینیمان، ئەرستۆ ژیانی تێکهەڵکێشکراو بە تێبینی و(تێ بینین)ی ئەقڵی-کە جۆرێکە لە چالاکی ئەقڵی-بە باشترین شێوازی ژیان ئەژمار ئەکات.

ئێستاکە سەیرێکی سەرپێی ناوەرۆکە ١٤ کتێبیەکەی ئەرستۆ ئەکەین کە ((میتافزیك)) پێکی هێناوە.

کتێبی یەکەم( ئەلفای گەورە) لێرەدا قسە لەسەر ئەوەیە کە فەلسەفە یان دانایی، زانست و ناسینی بنەماو هۆکارە یەکەمینەکانە، ناوەرۆکی قسەکان، بنەما و رەگەزەکان، هۆکارەکان و سەرەتاکان و بەتایبەتی هۆکارە چوارینەکانە، پاشان قسە لەبارەی بڕوای فەیلەسوفەکانی پێشوو ئەکات و رەخنەیان لێ ئەگرێت.

کتێبی دووەم(ئەلفای بچووك)،نامەیەکە لە روانگەی زمان و ناوەرۆکەوە بەتەواوی ئەرستۆییە، بەلاّم لە بەشێك زیاتر نیە، بابەتی سەرەکیەکەی هەوڵێکە بۆ فێرکاری مەبەستە فەلسەفیەکان، قسەی سەرەکی ئەوەیە کە لە هۆکارەکان و سەرچاوەی بونەوەرەکان و پەیدا بونیان ناتوانین بگەینە زنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك وبەردەوام ئەبێت لە زنجیرەی هۆکارەکانەوە بگەینەوە بە خاڵیکی سەرەتایی تر،واتە گەیشتنەوە بە سەرچاوەیەك یان بنەمایەکی تر، ئەم نامەیە بەوەشەوە کە کورتە، بەلاّم چەندین ئەندێشەی بەرجەستەی ئەرستۆ لەبارەی زانست و ناسینەوە لەخۆئەگرێت.

کتێبی سێهەم(بتا):ئەرستۆ لەم نوسراوەی دا خەریکی رون کردنەوەی مەسەلە بنەماییەکانی((فەلسەفەی یەکەمین))ە لە قاڵبی(( ١٤ دژواری))دا،ئەندێشە سەنتەریەکەی، بە دەربڕینی ئەرستۆ ئەوەیە کە تا ئێستاکە لە چەند روانگەیەکەوە دەستمان داوەتە مەسەلە بنەماییەکان و ئەو هۆکارانەی کە بوونیان هەیە،بەلاّم دیسانەوە ئەتوانین بپرسین کە ئایا لەپاڵ زانستی( ئوسیا)ناوەرۆکەکان، زانستێکی تر دەست ئەکەوێت کە توێژینەوە لەسەر دیاردایەتی ناوەرۆکەکان بکات؟ وەلاّمی ئەم پرسیارە((زۆر قورسە)) ئەرستۆ لە سەرەتای کتێبی چوارەم بەولاوە ئەداتەوە.

کتێبی چوارەم(گاما): بابەتی سەرەکی لەبارەی سروشت یان ناوەرۆکەوەیە، ئەرستۆ لێرەدا تیۆریە بونیادی و داهێنەرانەییەکەی خۆی لەبارەی((بوونەوەری چون بوونەوەر- بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))دائەرێژێت، پاشان توێژینەوەیەکی گرنگ لەبارەی رەگەز و بنەمای ((نەبوونی ناهاوتایی)) وئەو گرفتاری و دژوارییانەی کە رووبەروی نکوڵی لێکەرەکانیان ئەبنەوە ،ئەکات.

کتێبی پێنجەم(دلتا):ئەم نامەیە پێش هەمو شتێك فەرهەنگۆکێکی دەستەواژە فەلسەفیەکانە، بابەتی سەرەکی لێرەدا مانا جیاوازەکانی واژەو ناوەکانە، واتە ئەو واژانەی کە(هاوناو)ن و بە هۆی چەمك و مانا جیاوازەکانەوە لێك ئەدرێنەوە، ئەرستۆ چەندین جار لەم نامەیەدا بە سەرنجەکانی خۆیدا چووەتەوە، و هەندێ جار بەشێك لە نووسینەکانی پێشووی خۆی و هەندێ جار بەشێك لە نووسینەکانی دواتری خۆی تیایاندا گوونجاندووە.

کتێبی شەشەم(ئیپسیلن): لەم نامەیەدا چەندین مەسەلەی جۆراوجۆر لەبارەی((بوونەوەر هەوەرك بوونەوەر-بوونەوەر چوون بوونەوەر)) خستۆتە روو، پێكهاتەكەشی بە خستنە پاڵیەكی شتە پەرتەوازە كراوەكان و بە یارمەتی رێكخەرێك(بە ئەگەرێكی زۆر ئەندرنیكس رۆدسی) رێكخراوە.

كتێبەكانی حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم:(زێتا،ئێتا،سێتا): ئەم ٣ كتێبە كە پێكەوە كۆمەڵەیەكی پێكەوە بەستراویان دروست كردووە، گرنگترین ئەونامانەن كە بەنامەكانی میتافیزیك ئەژمار ئەكرێن، توێژینەوەی سەرەكی لەبارەی (ئوسیا) وبەتایبەتی(ناوەرۆكی لەناو نەچوو)(فەنا نەبوو)ە كە بوونایەتی راستەقینەی تاكە ناوەرۆك لەناوچوەكانە، مەسەلە بونیادیەكان لە بارەی ((بونایەتی)) یان ((بوون)) لەم ٣ كتێبەدا بەرچاو ئەكەون.

كتیچبی دەیەم(یوتا): ئەم نامەیە چەندین فێركاری لە خۆ ئەگرێت، لەبارەی چەمكە تاك و پەیوەست بەوەكانە، وەك( وەك هەمان بوون)،(وەك هەمان نەبوون) (وەكیەكی)و (ناوەكیەكی).

كتێبی یانزەیەم(كاپا):لەكۆنەوە لە نێوان ئەرستۆناسەكاندا لەبارەی رەسەنایەتی ئەم نامەیە، بڕوای جیاواز لەیەك هەیە، هەندێ ئەوە بە نوسراوێكی خودی ئەرستۆ ئەزانن، و هەندێكی تر لەسەر ئەو بڕوایەن كە مەبەستەكانی ناوی بە یارمەتی یەكێك لە فێرخوازەكانیەوە یان یەكێك لە پەیڕەوكارەكانی خۆیەوە كۆكراونەتەوە، ولەوەدا لە لایەكەوە، مەبەستەكانی ناو نامەكانی تری ئەم كۆمەڵەیە(بتا،گاما،ئیپسیلن) و لە لایەكی ترەوە، ئەو مەبەستانەی كە لە كتێبەكانی ٣ و ٥ی فیزیكی ئەرستۆدا خراونەتە سەر یەك، بەجۆرێك كە نوسراوێكی فێركاری لەبارەی مەسەلە بونیادیەكانی((فەلسەفەی یەكەمین)) پێك هێنراوە، بەڵام ئەرستۆناس گەلێكی وەك (یگر) و(راس) وەرزەكانی یەكەم تا هەشتەم،بە نوسینە رەسەنەكەی ئەرستۆ ئەزانن، بواری ئەو توێژینەوەیە لە بارەی چەمكە بنەماییەكانی فەلسەفەی سروشت و بەتایبەتی((هێز))و((كردار))ەوەیە.

كتێبی دوانزەیەم(لا مبدا): ئەم نامەیە كە لە چەند لایەنێكەوە بە گرنگترین نووسین لە كۆمەڵەی میتافیزیكی ئەرستۆ ئەژمار ئەكرێت، بەتایبەتی لەو روانگەیەوە گرنگە كە ئەندێشەكان و تیۆرەكانی ئەرستۆ لە بارەی ((خوداناسی و ئیلاهیات)) لە خۆئەگرێت و بەمانایەكی تایبەت تر(( دونیاناسی فیزیكی))ش لەخۆ ئەگرێت.

بابەتە سەرەكیەكەی لەبارەی(ئوسیا)یەو بەتایبەتی(( ناوەرۆكە نەجوولاو وجاویدانەكان)) واتە بنەماكانی جووڵە. ئەم نامەیە یەكێكە لەیەكەمین نوسینەكانی ئەرستۆ، و نامەیەكی سەربەخۆیە كە ئەو لەو ماوەیەدا نوسیوویەتی كە لە قوتابخانەكەی

ئەفلاتوندا بووەو ئەتوانرێت ئەوە بە نووسینی وانەیەك یان بە راپۆرتێكی سەربەخۆ و تێرو تەسەل لەبارەی فەلسەفەی بنەماكان یان بنچینە یەكەمیەكان بزانین، ئەم كتێبە پەیوەندیەكی ئاشكرای لەگەڵ كتێبی یەكەمی(فیزیكی) ئەرستۆ هەیە، و تارادەیەك لە روانگەی كاتیشەوە لە پێش ئەویشەوەیە، و هاوكات لە پێش كتێبی هەشتەمی فیزیكیشەوەیە.

كتێبی سیانزەیەم: لەم نامەیەدا قسە لەسەر ئەوەیە كە لە پاڵ هەست پێكراوەكاندا، جۆرێكی تر لە((بوون)) دەست ئەكەوێت كە ((لەناو نەچوو و فەنا نەبوو)) و جاویدانە، بواری سەرەكیەكەی رەخنەگرتنە لە تیۆریەی ((ئایدیەكان))ی ئەفلاتوون و تیۆركەشی لەبارەی ((ژمارەكان)).

كتێبی چواردەیەم: ئەرستۆ لەم بەشەدا رەخنە لە تیۆریەی بنەمایی و بە تایبەتی تیۆریەی ئەفلاتوونی((تاك))و((گەورە وبچووك))كە وەك هۆكاری بوونەوەرەكان ئەخاتە روو وپاشان پێداچوونەوە لەسەر تیۆریەك ئەكات كە((ئایدیەكان)) بە ((ژمارەكان))ئەزانێت، و زۆر بە توندی رەخنەی لێ ئەگرێت.

لە روانگەی دابەشكاری كاتەوە نامەكانی (میتافیزیك)،واتە دیاری كردنی پێشكەوت یان پاشكەوتییان، هەرچەند ناتوانرێت ئەنجامێكی یەكلاكەرەوە بەدەست بهێنرێت، بەلأم لەسەر بنەمای روون بوەوەكان، بەو شێوەیەی كە ئامارژە كرا، نامەی دوانزەیەم لەم كۆمەڵەیەدا لە پێش هەموو نامەكانی ترەوەیە، وەرزی نۆیەم b، لە كتێبی((مو)) وكتێبی((نو)) و وەرزی یەكەم تا نۆیەم a، لەكتێبی((مو)) و كتێبەكانی((ئالفای گەورە))،((بتا)) و((یوتا)) لەدوای ئەو، و لە هەمان قۆناغی مانەوەی ئەرستۆ لە ئەكادیمیایی ئەفلاتوندا هاتونەتە ئاراوە، لە قۆناغی دواتردا، ئەرستۆ لەدوای كۆتایی هێنان بە مەسەلە ژیان ناسیەكان، نامەكانی((گاما)) و كۆمەڵەی((زێتا،ئێتا،سێتا))ی تۆمار كردووە، كتێبی((ئپسیلن))یش پەیوەستە هەر بەم قۆناغەوە.

## میتافیزكی ئەرستۆ چیە؟

وەك چۆن دەستمان پێ كرد، كۆمەڵە نوسراوەكان یان تۆماركراوەكانی ئەرستۆ، كە هەنوكە ئەوانە بەناونیشانی ((میتافیزیك)) ئەناسین، لە دێر زەمانەوە تا هەنوكە پاڵنەری زۆرێك لە سەرهەڵگرتنەكان و سەر لێتێكدانەكانە، تێكەیشتنە جۆراوجۆرەكان و زۆرجار دژەكان لێی، بەشێكی لەبەرچاوی مێژووی ئەندێشەی فەلسەفەی خۆرئاوایان پێك

هێناوه، و زیاد له دوو هەزار ساڵه ئەندێشەی فەلسەفەی خۆرئاوای بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووه، هیچ سەیر نیە کە تارادەیەك پاش مەرگی ئەرستۆ تا هەنووکە، گەلێك لێکدانەوەو رونکردنەوەی زۆر هاتونەتە بوون کە هەموویان بە هەوڵ گەلێك بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی میتافیزیك ئەژمار ئەکرێن،بەم شێوەیە باشتر وایە کەلەم بابەتەشدا هەوڵ بدرێت کە دیاردەناسانە وبە یارمەتی خودی ئەرستۆ ئەوە بناسین کە بە میتافیزیك ئەژمار ئەکرێت.

وەك چۆن گوترا، ئەرستۆ خۆی، ئەو بابەتانەی کە لە کۆمەڵەی ((میتافیزیك))ی ئەودا بەدی ئەکرێن، ناوناوە ((فەلسەفەی یەکەمین))، ئەو لە هەندێ لە نوسینەکانی تریشیدا ئامارژە بەو ناونانە ئەکات، لە شوێنێکدا ئەڵێت: دیاری کردنی وورد و تێروتەسەل لەسەر بنەمای((شێوە))، و ئەوەی کە یەکێکە یان زۆرێکە،و ئەوەی کە چیە یا چین، ئیشی فەلسەفەی یەکەمینە، لەبەر ئەوە بۆ ئەو فرسەتەی هەڵئەگرین(فیزیك،کتێبی I، وەرزی۹ ، گ١٩٢b، دێری ٢)لە شوێنێکی تردا هاتووە کە دیاری کردنی چۆنیەتی ئەوەی جیا لە(مادە)یە، و ئەوەی کە چیە، ئیشی فەلسەفەی یەکەمینە (هەمان ،کتێبII، وەرزی ٢،گ١٩٤b، دێری ١٤).هاوکات لە شوێنێکی تردا، لە دوای توێژینەوە لەبارەی جووڵەی سروشتی تەنە سادەکان، و ئەوەی سەرەنجام جوڵە شوێنیەکان ئەبێت لە شوێنێکدا راوەستێن و ناتوانن ناکۆتایانە بەردەوام بن، ئەوترێت کە دووبارە ئەم خاڵەش لە رێگای فەلسەفەی یەکەمینەوە دەرئەخرێت (لەبارەی ئاسمان،کتێبیI، وەرزی ٨، گ١٧٧b، دێری ١٠) و لە شوێنێکی تردا وتراوە کە چۆنایەتی پاڵنەری جاویدان و ئەوەی کە چۆن پاڵنەری یەکەمین ئەو ئەخاتە جووڵە،هەر لێوارەکانی فەلسەفەی یەکەمینەوە باسی لێوە ئەکرێت و دیاری ئەکرێت (لە بارەی گیانەوەران، گ٧٠٠b،دێرەکانی ٩-٧)،ئەرستۆ لە شوێنێکی تردا، توێژینەوە لەبارەی بوونەوەرە لەناونەچوو جاویدانەکان بە بابەتی ((فەلسەفەی لێواری مەسەلە خوداییەکان)) ناو ئەنێت(ئەناوێنێت)،(لەبارەی بەشەکانی گیانەوەران،کتێبی I، وەرزی ٥، گ٤٦٥a، دێری ٤)و دیسانەوە لە شوێنێکی تردا خۆ سەرقاڵی بەو شتانەی کە بەدەرن لە(مادە) بە ئیشی فەلسەفەی یەکەمینی ئەزانێت (لەبارەی دەروون، کتێبی I، وەرزی ١، گ٤٠٢b، دێری ١٥).

ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە مەبەستی ئەرستۆ لە((یەکەمین)) چیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەلای خودی ئەرستۆ ئەدۆزینەوە، لەشوێنێکدا کە ئەڵێت:((واژەی یەکەمین لەبارەی جووڵە- هاوکات لەبارەی هەموو شتەکانەوە- بە چەندین مانا دێت و بەکار

دێت، یەکەمین یان(لە پێش) واتە شتێك کە بەبێ بوونی ئەو، شتەکانی تر بونیان نابێت، بەڵام ئەوشتە، بە بێ بوونی شتەکانی تریش بوونی هەیە،پاشان (یەکەمینێتی) (لە پێشینێتی)بە پێی کات و (ئوسیا-ناوەرۆك)وەیە(فیزیك،کتێبیVIII،وەرزی ٨، گ٢٦٠b، دێرەکانی ١٨-١٦).

تا ئەو شوێنەی کە ڕوونە((فەلسەفەی یەکەمین))لەلای ئەرستۆ، زانستێکە کە لەگەڵ یەکەمین بنەما و بنچینەو بونەوەرە بەدەر لەمادە و نەجووڵاو جاویدانەکان، یان بە گووتەیەکی تر پەیوەستە بە((مەسەلە خوودابیەکان))ەوە، ئەمە هەمان ئەو ئەنجامەیە کە سەد وچەند ساڵ لەمەبەر((بوونیتس ))لە((پێرستی ئەرستۆیی))دا پێی گەیشت، فەلسەفەی یەکەمین واتە فەلسەفەیەك لەبارەی((یەکەمینەکان))، مەسەلە خوداییەکان، بوونەوەرە نەجولاو بوونەوەرە جیا لە مادەکان(گ٦٥٣a،دێری ٢٣).

ئەرستۆ فەلسەفەی تیۆریەکانی بۆ ٣ گروپ دابەش کردوە، زانستی سروشتی، بیرکاری و خوداناسی، زانستی سروشتی،زانستێکی تیۆریە، چونکە لەگەڵ ئەو شتانەدا پەیوەندی هەیە کە لە لایەکەوە سەرچاوەی جووڵەیان لە ناوخۆیاندا هەیە و لەلایەکی تریشەوە جیا نین لەمادە، بیرکاریش زانستێکی تیۆریە کە هەندێ لە لقەکانی پەیوەست و تێکهەڵکێشی شتە نەجولاوەکانن، بابەتی هەر دوو زانستی ئوسیا یان ناوەرۆکە مادیەکانن، بەڵام لە پاڵ ناوەرۆکە مادیەکان، ناوەرۆکێکی جاویدان و نەجووڵاو، واتە لەنانەچوو و جیا لەمادە دەست ئەکەوێت کە ناسینەکەی ئیشی زانستی تیۆریە، بەڵام ئەمە زانستە نەك فیزیك، نە بیرکاری، بەڵکو زانستێکە کە لەسەرووی هەردووکیانەوەیە، ئەرستۆ ناوی ئەنێت((زانستی یەکەمین)) یان((زانستی یەکەم))بەرێزترین زانست ئەبێت لە بارەی بەرێزترین بونەوەرەکان و ڕەگەزەکانەوە بێت، کەواتە زانستە تیۆریەکان ئەبێت لەسەرووی زانستەکانی ترو زانستی خوداناسیش لەسەرووی باقی زانستە تیۆرەکانەوە بێت، ئایا فەلسەفەی یەکەمین گشتیە، یان ئەوەی لەبارەی رەگەزێکی دیاری کراو یان شێوە سروشتێکی دیاری کراوەوەیە؟ ئەگەر ئوسیایەکی تر لەپاڵ ئوسیاکانی ترەوە کە بەسروشتی بەدەوری یەکدا کۆبوونەتەوە،بەدی نەکرایە، لەو شێوەیەدا زانستی سروشتی ئەیتوانی زانستی یەکەمین بوایە،بەڵام لەوێوە کە ناوەرۆکێکی نەجووڵا بوونی هەیە، کەواتە ئەو ناوەرۆکە لە پێشەوەیە،و زانستەکەی ئەو زانستی یەکەمینە، کە فەلسەفەی گشتیە، چونکە ئەو یەکەمینە.(میتافیزیك، کتێبی VI، وەرزی ١، گ١٠٢٦a).

لە لایەکی ترەوە، ئەرستۆ دانایی بە بەرێزترین زانست ئەزانێت، چونکە خودایی ترین زانست، بەرێزترینیانە، زانستێك کە بۆ هەبوونێتیەکەی،خودا شایستەترینە،

زانستی خودا یان زانستێکە کە بەدەوری مەسەلە خوداییەکانەوە (هەمان، کتێبیI، وەرزی٢، گ٩٨٣a، دێری ٥) کەواتە فەلسەفەی یەکەمین، ناونیشانەکەشی دەست بەدامانی بەرێز بونی بابەتەکانیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا سەروتری ئەم زانستە بە هیچ شێوەیەك لە بەهای زانستەکانی تر و بەتایبەتی زانستە سروشتیەکان کەم ناکاتەوە، لەواقعدا هەموو زانستەکانی تر لەم زانستە پێویست ترن، بەڵام لەم باشتر نین(هەمان گ،دێری، دێری ١٠)لێرەوەیە کە ئەرستۆ،فەلسەفەی سروشتی، بە((فەلسەفەی دووەمی)) ناو ئەبات ( هەمان،کتێبیVII،وەرزی ١١، گ١٠٢٧a، دێری ١٥) لە لایەکی ترەوە، ئەگەر ئوسیایەکی جیا لە مادەو نەجولاً و لە دونیای بینراودا بوونی هەبێت، کەواتە بوونی خوداش لەم دوونیایەدا و لە شوێنێکدا ئەبێت دەست بکەوێت و ئەوە کە ئەبێت یەکەمین و تەنیاترین سەرچاوە بێت(هەمان، کتێبیXI، وەرزی٧، گ ١٠٦٤b، دێرەکانی ٣٨-٣١) ئەرستۆ لە کتێبی دوانزەیەم،وەرزەکانی شەشەم و حەوتەم، هەوڵ ئەدات کە بوونی ئەو بسەلمێنێت.

بنەماییترین مەسەلەی میتافیزیك،مەسەلەی ((بوونایەتی))ە، ئەم مەسەلەیە بە شێوەیە کی نەریتی و مێژوویش هاوکات پاڵنەری گەلێك ململانێ و چەلەحانێ و بڕوای جیاوازە لە نێوان زۆربەی توێژەرەکاندا، ئایا ئەرستۆ بونیادنەری ((بوون ناسی))یە؟ ئایا لەم نوسراوانەی ئەودا میتافیزیکی((گشتی)) و میتافیزیکی((تایبەت)) بەدی ئەکرێت، بە هەر جۆرێك بێت، ئەم خاڵە گرنگە کە ئەویش ئەوەیە ،مەسەلەی بوون یان هەبوون، لە هەموو قۆناغەکانی بەرفراوانی فەلسەفە، بۆ ئەرستۆ-هەرچەند نەك بە یەك شێوە- گرنگ بووەو بونی هەبووە، ئەم مەسەلەیە لە میتافیزیکدا بە شێوەیەکی بەرفراوان ودیاری کراو دەربڕاوە، دیارترین شکڵی لە شوێنێکدایە کە ئەوترێت: ((لەواقعدا ئەوەی لە دێر زەمان وهەنوکەش وهەمیشە بەدوایدا گەڕاون، ئەوەیە کە ((بوونەوەر-ببوو)) چیە؟ و ئەوە بەو مانایەیە کە ئوسیا(ناوەرۆك) چیە؟ (هەمان، کتێبی VII، وەرزی ١،گ١٠٢٨b، دێرەکانی ٤-١).

ئەرستۆ زانستێکی تایبەت بۆ ئەم توێژینەوەیە دابین ئەکات و ئەڵێت:((زانستێك هەیە کە سەرنجی _بوونەوەری هەروەك بوونەوەر) و مەسەلە پەیوەست بەوەکان لە خودی خۆیاندا، ئەدات، بەڵام هیچ یەك لەوانە(ئەو زانستانە) نین کە بە بەشێك لە زانست ناوئەنرێن، چونکە هیچ یەك لە زانستەکانی تر پێداچوونەوە لەسەر (بونەوەری هەروەك بوونەوەر) لە گشتێتیەکەیدا ناکەنەوە ، بەڵکو بەشێك لە بوونەوەریان جیا کردۆتەوە، و

خۆیان سەرقاڵی (ڕووکەش یان دیاردەیەتیەکەی) کردووە( هەمان،کتێبی IV، وەرزی ١، گ١٠٠٣،دێرەکانی ٢٥-٢٠).

هەموو ئەو زانستانە(( فلان بوونەوەر)) یان((فلان رەگەز)) دیاری ئەکەن، و خۆیان بەوە سەرقاڵ ئەکەن،بەلام نە((بوونەوەر)) بە شێوەیەکی ڕەها، وە نە((بوونەوەری چوون بوونەوەر))(هەمان، کتێبی VI، وەرزی ١، گ١٠٢٥b، دێرەکانی ١٠-٧).

کەواتە ئیدی پرسیار ئەوە نیە کە هەبوون یان بوونایەتی چیە؟ لە لایەکی ترەوە،بوون یان هەبوون، مەسەلەیەکی ڕوون و ئاسانە،بەلام لەبارەی ئەم پرسیارە کە بۆچی شتێك خۆیەتی، هیچ جۆرە گەڕانێك پێویست ناکات،چونکە ئەم((کێیە)) یان((کێیت)) و بوونە، هەروەك بونەوەر ئەبێت سادە بن، کەواتە ئەبێت ((بوونایەتی)) بە شتێك بزانین کە ((بونەوەرە-ببوو))و هەمانە و ئەتوانین هەمان بێت(هەمان،کتێبی VII،وەرزی ١٧، گ١٠٤١a، دێرەکانی ١٥-گ١٠٤١b، دێری ٥).

لەلایەکی ترەوە ئەرستۆ ئەڵێت، کە واژەی بونەوەر یان((ببوو)) بە گەلێك مانا بەکار دێت، بەلام هەموو ئەمانە بۆ مانایەکی سەرەکی و بنچینەیی و سەرچاوەیی ئەگەڕێنەوە،چونکە هەندێ لە شتەکان، بە بوونەوەر ناوئەنرێن، چوونکە (ئوسیا)ن یان ناوەرۆکن، و هەندێك لەبەر ئەوەی دیاردەی ناوەرۆکن و هەندێك لەبەر ئەوەی بە ئاراستەی ناوەرۆکن، یان((چۆنایەتیەکان))ن، یان پێکهێنەری و بەدیهێنەری ناوەرۆك یان شت گەلێکن کە لە حاڵەتی پەیوەست بوون بە ناوەرۆکدان (هەمان،کتێبیIV،وەرزی ٢، گ١٠٠٣a، دێری ٣٣-گ،١٠٠٣b، دێری ٣٩).

ئەوکات ئەرستۆ لە رونکردنەوەی ماناکانی((بوون))، بەکارهێنانەکانی لە ٤جۆری گشتیدا چڕ ئەکاتەوە، ١ -بوون لەلایەکەوە بەمانای نەسەب و دانە پاڵ و لایەکی ترەوە بەمانای(خودێتی)، بوونی لەپاڵ دراو یان نەسەبی، وەك ئەوەی بڵێین کە عادل مۆسیقارە، یان مرۆڤ مۆسیقارە٢ -بوونی(خودێتی)انە، رێك لەسەر بنەمای ژمارەی ئەوشتانەیە کە قسەکان بەڵگەن لەسەریان٣ - ((بەم شێوەیە بوون)) یان((هەبوو)) بەڵگە لەسەر ئەوەیە کە شتێکی ڕاستەقینە یان ڕاستە:٤- ((بە شێوەیەکی تر بوون)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شتێك((هێز))ەکی یان((کردار))ەکیە(هەمان،کتێبیV،وەرزی ٧، گ١٠١٧a، دێرەکانی ٥-١).

لە لایەکی ترەوە،پەیوەستی نێوان(( بوونەوەر)) و((یەك)) ، یەکێك لە مەسەلە بنەماییەکانی فەلسەفەی ئەرستۆیە، ئەو لە یەکێك لە نووسراوەکانی خۆیدا، بونەوەرو"یەك" لەسەر بنەمای بەلگەی گووتاری بە یەکێك ئەزانێت، چونکە بوونەوەر و

(یەك)[1]شتێکە کە ئەخرێتە سەر هەموو بونەوەرەکان و لەبەر ئەوەش ماناکەی بەم شێوەیە (توپیکا،کتێبی IV، وەرزی ١، گـ١٢٧a، دێری ١٧) و((بوونەوەر و"یەك"ێتی)) سیفەت گەلێکی هاوڕای هەمو شتەکانن (هەمان کتێب، وەرزی ٦، گـ١٢٧a، دێری ٢٧)، لە((میتافیزیك))یشدا ئەوترێت کە بونەوەر و"یەك"ێتی، یەك شت و یەك سروشتن، بەو مانایەی کە وەك(( سەرچاوە))و((هۆکار)) هاوڕێی یەکترن(کتێبی IV، وەرزی ١، گـ١٠٠٢b، دێری ٢٥).

## بەشی چوارەم_خوداناسی ئەرستۆ

خودا لە فەلسەفەی ئەرستۆدا شوێن و گرنگیەکی تایبەتی هەیە، مەسەلە پەیوەستەکان بە خوداناسی، لەهەمان سەردەمی لاوێتی ئەوەوە و کاتێك کە هێشتا پەیوەست بە ئەکادیمیاکەی ئەفلاتوون بوو، ئەندێشەو هزری ئەوی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، ئەو لەیەکەمین نووسینە دەرەکیەکانی خۆیدا، لە سەلماندنی بوونی((سەرچاوەی یەکەمین)) و بونی خودادا هەوڵی داوە، باشترین نموونەی ئەم جۆرە نوسینانە لە بەش گەلێکی بەجێماوی دیالۆگەکانی ئەوە بە ناوونیشانی((لەبارەی فەلسەفە))، ئەو لە یەکێك لە بەشەکانیدا، لە دوای رونکردنەوەیەك لە بارەی واژەی ((سوفیا)) کە لەڕەگ و ریشەکەیەدا بەمانای (رووناکی)یان (ڕۆشنایی) وەرگیراوە، ئەڵێن کە مرۆڤەکان بە درێژایی چەند سەردەمێك،٤ جۆر هونەریان بەدەست هێناوە و(تێروتەسەل) هەریەکەیان ناو ناوە((سوفیا))،لە قۆناغی پێنجەم، مرۆڤەکان سوفیایان بە پەیوەستی لەگەڵ ئوسیاکان و ناوەرۆکە خوداییەکان و لەناوونەچووەکان بەکارهێنا وناسینی ئەم شتانەیان بە باشترین دانایی ئەژمار ئەکرد (سە:راس،لەتی ٨،هاوکات لەبارەی سەلماندنی بوونی خودا،سە:لەتەکانی ٢١و ١٩cو ١٨ و١٣ و ١٢bو ١٢a).

تێڕوانینێکی گشتی بە دونیابینی فەلسەفیانەی ئەرستۆ پیشانی ئەدات کە ئەو فەلسەفەکەی خۆی لە دونیای((ناسوت-ژێرترین)) دەست پێ ئەکات و بەدونیای((لاهوت-بەرزترین))کۆتایی پێ ئەهێنێت، بە شێوەیەك لە فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆدا بینیمان، ئەو جووڵەی بە بنەمای سروشت و دیاردە سروشتیەکان ئەزانی و بوونەوەرانی لەسەر بنەمای جووڵە بۆ سێ گروپ دابەش ئەکرد، ئەوەی کە

---

[1] لێرەدا وەك ژمارە، یان((تاق ))واتە شتێك هەر خۆی بێت و بەس.

جوولاوە،بەلام جولێنەر نیە، ئەوەی کە جوولاوەو جولێنەرە، و ئەوەی کە جوولێنەرە بەلام خۆی جوولاو نیە،لەلایەکی ترەوە ئەو جوولە بە جاویدان وبە بیّ سەرەتاو بێکۆتایی ئەزانێت،هەرشتێك کە ئەجولێت ، ئەبێت شتێکی تر بهێنێتە جوولە و ئەوشتەش بە نۆبەی خۆی، ئەبێت شتێکی تری هەبێت کە بیجولێنیت وبەم شێوەیە، ئەبێت تاناکۆتا دوای ئەوە بکەوین و ورووژێنەرکان وپالنەرەکان بۆ دواوە بگەرێنینەوە، ئەبێت بە دلنیاییەوە بگەین بە شتێك کە جوولێنەری شتەکانی ترە، بەلام خۆی جولاو نیە، لێرەدا پێویستە ئەوە بەیاد بهێنینەوە کە مەسەلە وقسەلەسەر کراوە فیزیکیەکانی ئەرستۆ، بەوەوە کە ناویان لیّ ناون((خوداناسی-تیۆلۆگیا))خاوەنی پەیوەندیەکی پتەوە، بە شێوەیەك کە خۆی ئەوە ئەلێت کە ئەبێت لەم بارەیەوە توێژینەوە بکەین (واتە لەبارەی سەرەتای جولە) کە چۆنە، چونکە ئەم ئیشە نە تەنیا بۆ تێبینیەکی راستەقینە لەبارەی مەسەلە سروشتیەکانەوە بەسوودە، بەلکو هاوکات بۆ گەیشتن بە تێبینیەك لەبارەی((سەرچاوە-رەسەن))ی یەکەمینیشەوە بەسوودە (فیزیك،کتێبی VIII، وەرزی١،گ٢٥١a، دێری ٧).

ئامارژەی ئەرستۆ لێرەدا بۆ((فەلسەفەی یەکەمینە)) واتە گەیشتن بە((سەرچاوەی یەکەمینی جوولەکان))و ئەوەی کە ئەو لە کتێبی دوانزەیەمی میتافیزیکدا دوای ئەکەوێت، ئەرستۆ لە کتێبی هەشتەمی (فیزیك)، لەدوای کێشمەکێشی مەسەلەی جوولە ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە لەبەر ئەوەی جوولە ئەبێت هەمیشەیی و نەپچراو بێت، کەواتە بێگوکان ئەبێت شتێك بوونی هەبێت کە((پالنەرە)) و خۆی((پالنراو)) نیە، و ئەویش(( یەکەمین جوولێنەری نەجوولاوە=یەکەمین پالنەری پال نەنراوە))(هەمان کتێب، وەرزی ٦، گ٢٥٨b، دێرەکانی ١٥-١٠).

هەر ئەم تیۆرە لە((میتافیزیك))ی ئەرستۆشدا رەنگی ئەداتەوە و دێتەوە ریّ، ئەو لە کتێبی دوانزەیەمدا لەدوای ئامارژە بۆ جۆرە((سێینەکانی ناوەرۆکەکان))(واتە ناوەرۆکی هەست پێکراوی جاویدان، ناوەرۆکی هەستپێکراوی لەناچوو، و ناوەرۆکی نەجوولاو))ئەلێت:((بونی (یەك ئوسیا)ی جاویدان و نەجولاو پێویستە، ئەو ناورۆکە، ئەمرەو جیایە لە هەست پێکراوەکان، ومەرجیش نیە کە گەورەو پتەو بێت، بەلکو بی بەش و لەت نەبوو، دابەش نەبووەو، هاوکات کاریشی تێناکرێت و لەناوناچێت،

لەلایەکی ترەوە جووڵە بەهەمان شێوە لەوانە نیە کە دروست ببێت، یان لەناوبچێت، چونکە هەمیشە بووە، وەك کات، کەواتە جووڵە بەهەمان شێوە پەیوەستە (لکێنراوە) کە کات، وەك کات یاخود جووڵە، یان کارتێکراوییەك لە جووڵەیە، لەلایەکی ترەوە، پاڵنەری یەکەمین ئەبێت لە خۆیدا(کردار)ێتی هەبێت و (چالاك)بێت، چونکە ئەگەر پاڵنەرێك یان بکەرێك بوونی هەبێت، بەلام لەواقیعیتدا چالاکی ئەنجام نەدات، هیچ جوڵەیەکیشی نابێت، چونکە لەوانەیە ئەوەی بەتوانابێت،هیچ ئیشێك ئەنجام نەدات، ئەوەش کە(خۆهێز)یشە ناتوانێت سەرچاوەی جووڵە بێت، کەواتە ئەبێت سەرچاوەیەك بوونی هەبێت، کە ناوەرۆکەکەی (کردارێتی)یە(میتافیزیك، کتێبیXII،وەرزی ٦، گ1071b،دێرەکانی ٢١-٦) بەم شێوەیە پاڵنەری یەکەمین ئەبێت "کردارێتیەکی پەتی" بێت.

ئێستاکە ئەتوانین بپرسین کە پاڵنەری یەکەمین چۆن بۆ((جوڵە))پاڵی پێوە ئەنرێت؟ و ئەگەر کردارێتیە، کردارێتیەکەی ئەو چیە؟ ئەرستۆ لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا ئەڵێت:((یەکەمین پاڵنەر وەك هۆکارێکی ئامانجی ئەبێتە ورووژێنەری جووڵە، ئەو وەك ((مەئشوق))،دەهێنێتە جووڵە، ئەو ئامانج ،یان بابەتی گەشانەوەو ئەقلاندنە،و (شتە بیرپێ کەرەوەکە یان بابەتی گەشانەوەو خوازیاریەکە) ئەبێتە هۆی جوڵە، بەلام خۆیان جوڵاو نین، چونکە بابەتی گەشانەوە، دیاردەیەکی جوانە و یەکەمین(خوازراویش)بوو ەوەری جوانە، ئەندێشە(بیر)یش سەرچاوەی جووڵەیە، چونکە ئەقڵ بە یارمەتی(ئەقڵێنراو)ئەکەوێتە جووڵە، لەوێوە کە جووڵێنەرێك هەیە کەخۆی جووڵاو نیە، و((کردارێتیانە بوونی هەیە))، ئەبێتە هۆی جوڵە، چونکە پێویستیانە(وەك پێویست) بونەوەرە و هاوکات بوونەوەری پێویستێنراو،چاکەو جوانیە، و بەم شێوەیەیە کە سەرچاوەیە، ئاسمان و سروشت بە سەرچاوەیەکی لەم شێوەیەوە پەیوەستن، گوزەرانی ژیانی ئەو لەو باشترین جۆرەیە کە ئێمە تەنیا کاتێکی کەم هەمانە، ئەو ئەبێت هەمیشە بەو شێوەیەیە بێت، چونکە هاوکات کردارێتیەکەشی چێژە، ئەو بیر لەخۆی ئەکاتەوە، بیرێك کە خۆبەخۆیە، پەیوەست نیە بەوشتەوەی کە خۆبەخۆ باشترینە، لە لایەکی ترەوە، جۆرێکە لە چالاکی کە بەردەوام و هاوکات کردارێتیە، و ئەویش چالاکی ئەقڵی یان ئەندێشەییە، ئەقڵ یان ئەندێشە لە رێگای یەکێتی یان هاوبەشی

لەگەڵ((ئەقڵێنراو=ئەندێشێنراو)) بیر لە خۆی ئەكاتەوە و خۆشی لە پەیوەندی و ئەقلاندنی ئەودا، دەئەقڵێنرێت،وەك چۆن ئەقڵ و ئەقڵێنراو یەكێكن و وەك یەكن، لەبەر ئەوە قبوڵكەری ئەقڵێنراو ناوەرۆكی ئەقڵە، ئەقڵ كاتێك چالاكی ئەنجام ئەدات كە خاوەنی ئەقڵێنراوە، لەبەر ئەوە، چالاكیەكی لەم شێوەیە زیاتر هی ئەقڵی خوداییە، تیبینی ئەقلانیش بەچێژترین و باشترین شتە، ئێستاكە گەر خودا هەمیشە لەو حاڵەتە خۆشەدایە كە ئێمە هەندێ جار تێیداین، شتێكی زۆر سەیرە، بەلام هەنوكە خودا بەم شێوەیەیە، ژیانیش هەر لەوەوەیە، چونكە كردارێتی یان چالاكێتی ئەقڵ، ژیانە، ئەو زیندوو،جاویدان و باشترینە، بەشێوەیەك كە ژیانی جاویدانانە وهەمیشە بوونی و بوونی جاویدانانە،لەو خودایەوەیە(هەمان كتێب، وەرزی ۷، گ1072b، دێرەكانی ۳۰-۱۰).

ئێستاكە ئەگەر بپرسین كە بابەتی ئەقڵی خوودایی یان بیركردنەوەی ئەو چیە؟ وەلامی ئەرستۆ ئەمەیە كە ئەو بیر لە خودایی ترین شت ئەكاتەوە، ئەقڵی خودایی لەبەر ئەوەی بەرزترین شتە، بیر لە خۆی ئەكاتەوە و بیركردنەوەكەی ئەو،((بیركردنەوە لە بیركردنەوە))یە، ئەو لە سەرتاپای رۆژگارەكاندا، ئەندێشەیە بۆ خودێتی خۆی(هەمان كتێب،وەرزی ۹، گ1074b، دێرەكانی ۳۵-۲۵).

لەكۆتاییدا ئەتوانین بپرسین كە كۆتا ئامانجی میتافیزكی ئەرستۆ چیە؟ لەوانەیە لە نێوان هەمو ئەو ئەرستۆناسانەی كە وەلامی ئەم پرسیارەیان داوەتەوە، داوەری فەیلەسوف و ئەرستۆناسی ئەڵمانی((شوێگلر ۱۸۱۹-۱۸۵۷.ز) لە راستیەوە نزیك بێت، كە ئەڵێت: {تەنها ئوسیای راستەقینە، یەكەمین و خاوەن بوونی ڕەها،((خوادیەتی))یە، خودا ئوسیایە لەبەرزترین پلەدا، ئەو(بونەوەری هەروەك بونەوەری)راستەقینەیە، كە میتافیزیك بەدوایدا ئەگەڕێت، چەمك و مانای خودا بابەت، و ئامانج و پاڵنەری تەواوی میتافیزیكی ئەرستۆییە، ((میتافیزیك)) بۆ ئەرستۆ هەمان((خوداناسی))یە(IV/۳۵).}

## بەشی پێنجەم _ ئەرستۆ لە دونیای ئیسلامدا:

لە دونیای ئیسلامدا ئەرستۆ ناسراوترین فەیلەسوفی یۆنانی کۆنە، لە کاتێکەوە کە جوولانەوەی وەرگێڕانی عەرەبی زانست و فەلسەفەی یۆنانی لە بازنەی کەلتووری ئیسلامیدا دەستی پێکرد(سەدەکانی ٣-٤.ز.) وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ گرنگی و بایەخێکی بێ ئەژماری هەبوو، لەم نێوانەدا تا رادەیەك هەموو نوسراوە بنچینەییەکانی ئەرستۆ لەپاڵ زۆرێك لەو نوسراوانەی کە خرابوونە پاڵی وەرگێڕانە سەر زمانی عەرەبی، وەرگێڕە قورسە مەسیحیە نەستوری و یەعقوبیەکان هەندێ جار راستەوخۆ لە یۆنانیەوە وەریان ئەگێڕان، بەلام لە زۆربەی بوارەکاندا بە یارمەتی وەرگێرانە سریانیەکانیان، وەریان ئەگێڕانە سەر زمانی عەرەبی، کەش وهەوای زانستی وکەلتووری دونیای ئیسلامیش بە کۆتایی هاتنی سەردەمی جێنشینایەتی ئەمەویەکان تا سەردەمی درەوشانەوەی جێنشینایەتی عەباسیەکان بواری بۆ وەرگرتنی فەلسەفەی یۆنانی و بەتایبەتی فەلسەفەی ئەرستۆ کردەوە، ئەرستۆی بە عەرەبی کراو، هەرچەند نە وێنایەکی ورد و تێروتەسەل لە ئەرستۆی راستەقینە، بەلام بەلایەنی کەمەوە هەولێك بوو بۆ گواستنەوەی چەمك وتێگەیشتن وئەندێشەکانی لە زمانی یۆنانیەوە بۆ زمانێکی تر کە پێکهاتەکەی لە زۆرێك لە بوارەکانەوە گەلێك جیاوازی گەورەی هەیە، بە بوونی ئەمەش، ئەبێت بە ویژدانەوە قسە بکەین کە لە زۆر لایەنەوە وەرگێڕە عەرەبەکان، وەفاداریەکی زۆرتریان لە بەرامبەر نوسینەکانی ئەرستۆ دەربڕیووە تا هەندێ لە وەرگێڕە ئەورووپییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا وەرگێرانە عەرەبیەکانیش لە روانگەی وردبینی لەگواستنەوەی ئەندێشەکانیەوە، هەموویان یەکسان نین، و لەوانەیە یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوەبێت, وەرگێرانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ بەیارمەتی وەرگێرانە سریانیەکەی بووە، وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە مەنتیقدا(ئۆرگانن) لە پەیدا بوونی بیری فەلسەفی لە دونیای ئیسلامدا و رۆلێکی زۆر گەورەیان هەبووە، و تەنانەت چوونەتە ناو زمان و دەربرینی ئیسلامیەوە، بەدەر لە وەرگێڕانی بەرهەمە بنچینەییەکانی ئەرستۆ، وەرگێرانی کەڵەکەیەك لە نوسینەکان و گووتە دراوەپاڵەکانی ئەو کاریگەریەکی باشیان خستۆتە سەر بیرو شکلاندنی بیری ئیسلامی-هەرچەندە کە کەمێك گومراکەرە-.

هەوڵی سەرەکی و ستایشکەری وەرگێڕە عەرەبەکانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ بە زۆری ئەوە بووە کە لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی تا ئەوکاتە ئامادەییەکی وای نەبووە لە

گواستنەوەی ئەندێشەکان و مەبەست و چەمکە فەلسەفیەکاندا، تا ئەو ئاستەی کە توانایان هەبووە هەوڵی خۆیان خستۆتە گەڕو لەمەشدا تا ئەندازەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوون.

لە بارەی کاریگەری گشتی فەلسەفەکەی ئەرستۆ لەسەر دونیای ئیسلامی، نابێتە لاف وگەزاف لێ بڵێین کە-لە رابردودا بەهۆی کاریگەری مەنتیقی ئەرستۆیی کە فاکتەرێکی سەرەکی لە شێوازی بیرکردنەوەدا بوو-زیاد لە نێوەی ئەوەی کە بە فەلسەفەی ئیسلامی ناوزەد کراوە، بەرهەمی بەجێماوی فەلسەفەکەی ئەرستۆیە، تەنانەت رەگەزەکانی فەلسەفەی ((ئەفلاتوونی تازە)) کە پشکێکی گەورە و گرنگی لە فەلسەفەی ئیسلامیدا هەبووە، بەناوی فەلسەفەی ئەرستۆیی گواستراوەتەوە بۆ ناو فەلسەفەی ئیسلامی، بەمەشەوە، ئەگەر ئەو وەرگێڕانە عەرەبیانەی بەرهەمەکانی ئەرستۆ نەبونایە فەیلەسوف و بیرمەندگەلێکی وەك(ابن سینا)(فارابی)(کندی)(ابن باجە)(ابن طفیل)(ابن رشد)و باقی فەیلەسوفەکانی تری سەردەمەکانی دواتر نەدەهاتنە ئاراوە، بەهەمان شێوە کە کەسانێکی زۆر گەورە لە خۆرئاواشدا وەك(ئالبێرتی گەورە و تۆماس ئەکویناس)[1]یش لە رێگەی وەرگێرانی بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە عەرەبیەوە بۆ لاتینی، نەدەهاتنە ئاراوە.

لەلایەکی ترەوە،وەرگێرانی عەرەبی نوسینەکانی ئەرستۆ و پاشان لە سەردەمەکانی تر، وەرگێرانی (لاتینی)یان لە عەرەبیەوە،لە سەدەکانی ناوەراستی ئەوروپادا کەڵەکەیەك لە دەستەواژەی هونەری و فەلسەفی هێنایە ئاراوە کە بوونە بنەماو بنچینەی دەستەواژە فەلسەفیەکان لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکان لەسەردەمەکانی تردا تا هەنووکە، وەرگێرە عەرەبیەکان بەدەر لە وەرگێرانی ناوەرۆکی نوسینی بەرهەمەکانی ئەرستۆ، هاوکات زۆرێك لە بەرهەمە رونکەرەوەکانی لێکۆڵەرەوە یۆنانیەکانیشیان وەرئەگێرایە سەر زمانی عەرەبی کە لە سەردەمی (هێلینیزم)ەوە هاتبونە ئارا، ئەم ئیشەش پاڵنەرێکی تر بوو بۆ بەرفراوانیە لەبەر چاوەکەی (ئەرستۆ گەرایی)لە دونیایی ئیسلامدا، هەندێ لە فەیلەسوفە موسوڵمانەکان، ئەم ئەرستۆگەراییەیان تا سنوری ئاشق بوون بە فەلسەفەکی

---

[1] لە قوتابخانە فەلسەفیەکاندا باس لە فەلسەفەکەی ((ئالبێرتی گەورە))و((تۆماس ئەکویناس))کراوە.کە لە نووسینی:میهرداد میهرین و وەرگێرانی خۆمە.(سیدز داوود.ع)

ئەرستۆ راکێشا، (ابن رشد) فەیلەسوف و ڕوون کەرەوەی گەورەی نوسینەکانی ئەرستۆ یەکێکە لە بەرجەستەترین نموونەکان،لەشوێنێکدا ئەڵێت:

(( سوپاس بۆ خودایەك کە ئەم پیاوە((واتە ئەرستۆ))ی لە نێوان ئەوانی تر، لە تێروتەسەلیدا نایاب کردووە، و ئەوی لە بەرزترین پلەی گەورەیی مرۆڤدا جێ کردۆتەوە، کە هیچ مرۆڤێك لە هیچ سەردەمێکدا نەیتوانیوە بگاتە ئەو پلەیە)).

ابن رشد لە شوێنێکی تردا ئەڵێت:

(( من لەو باوەڕەدام کە ئەم پیاوە نمونەیەك بووە، کە سروشت هێناویەتیە ئارا، تا ئەوپەڕی نهێنیەکانی مرۆڤ بوون لەمەسەلە مادیەکاندا پشان بدات، ئەو،ئەوکەسەیە کە ((راستێتی=حەقیقەت)) لەودا ئەگاتە لوتکە((تێروتەسەلی))(سە:هـ د،٣/٥٦٥))، ئەم جۆرە ستایش وَ پیاهەڵدانانە بۆ ئەرستۆ، کەم تازۆر لەلای فەیلەسوف و بیرمەندە ئیسلامیەکان ئەبینرێت، پێرستی نووسینە سەرەکیەکانی ئەرستۆ و نوسینە خراوەپاڵەکانی لە پێرستی ابن ندیم،تاریخ الحکماء قفطی و عیون النباء،ابن ابی اصیبعة، دەست ئەکەون، ئەم وەرگێڕانانە تا سەدوچەند ساڵ لەمەوبەر، بە شێوەیەکی دەست نووس لە کتێبخانەکانی دونیادا پەرتەوازە بوو بوون، ومابونەوە، لەوکاتەوە تا هەنووکە، زۆربەی ئەم نووسینانە بە یارمەتی توێژەر و خۆرهەلاتناسانەوە وردە وردە دۆزرانەوە، وبەشێوەیەکی زانستی و رێکخراو و رەخنەگرانە، بلاوبوونەوە، بەلام هەندێك لەوانە هێشتاکە بەدەست نەهاتوون، و ئۆمێد هەیە کە رۆژێك لە گۆشەو کەناری کتێبخانەکانی ئەورووپا یان ئاسیادا بدۆزرێنەوە، لە نوسینە رەسەنەکانی ئەرستۆ،بە رووکەش تەنیا کتێبی((سیاسەت))ی وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی کە ئەویش لەوانەیە پەیوەندی بە بارودۆخ وکەش وهەوای سیاسی و کەلتووری و کۆمەلایەتی سەدەکانی جێنشینایەتی عەباسیەوە بووبێت.

ئەوانەی تا ئێستاکە لە ناوەرۆك ونوسراوە عەرەبیەکاندا بلاوکراوەتەوە، ئەمانەن١. کۆمەڵە نوسینە مەنتیقیەکانی ئەو بەناوی((مەنتیق))ی ئەرستۆ، بە هەوڵی عبدالرحمان بدوی،٣ ب، قاهیرە، ١٩٤٨،١٩٤٩،١٩٥٢.ز.،٢. فیزیك (الطبیعة،سروست)، بەیارمەتی هەر ئەو،٢ب، قاهیرە، ١٩٦٤،١٩٦٥، (نووسینی عەرەبی)، لە گەڵ پێشەکی و توێژینەوەی زۆر پڕ بایەخ، بە یارمەتی تکاچ،٢ب، ڤیەن١٩٢٨،١٩٣٣ .ز.((فی السمع

والاثار العلوية)) بە یارمەتی عبدالرحمان بدوی، قاهیرە،١٩٦٠.ز.٥.فی النفس، لەگەڵ چەند پاشکۆیەکی پێویست لە پلوتارك ((الحس والمحسوس))ابن رشد و((فی النبات)) دراوەتە پاڵ ئەرستۆ، بە یارمەتی هەمان، کوەیت/بەیروت، ١٩٧٩.ز.،٦. ((سروشتی گیانەوەران)) لە ((مێژووی گیانەوەران))بە یارمەتی هەمان، کوەیت،١٩٧٧.ز.٧.((گووتار)) بەیارمەتی هەمان،کوەیت،١٩٧٩.ز.، ٨.((بەشەکانی گیانەوەران)) بە یارمەتی هەمان،کوەیت١٩٧٨.ز.((فی کون الحیوان))بە یارمەتی ی.بروگمان و لە(سارت لولفس)،لیدن،١٩٧١.ز.١٠.((تفسیر ما بعدالطبیعة)) لە (ابن رشد)ەوە کە نوسینە عەرەبیەکەی((میتافیزیك))ی ئەرستۆشی تێدایە، بەیارمەتی((مۆریس بویژ))،٣ب،بەیروت،١٩٣٨-١٩٥٢و١٩٦٧.ز.، ١١.الاخلاق ((اخلاق نیکوماخس)) بەیارمەتی عبدالرحمان بدوی، کوەیت،١٩٧٩.ز.

لەلایەکی ترەوە ئەو نووسینانەش کە دراونەتە پاڵ ئەرستۆ،و ئەوانەی کە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی،لە گرنگترینیان ئەمانەن:

١. اثولوجیا(سە: ﻫ د٦/٥٧٩-٥٨٥).

٢. کتاب الایضاح فی الخیر المحض, کە لە سەدەکانی ناوەراستی زایینی بە ناوی((کتاب العلل))ناوبانگی دەرکردبوو، ئەم نوسینە وەرگێرانی لەتێکە لە کتێبی فەیلەسوفی بەناوبانگ((ئەفلاتونی نوێ))ی ((پرکلس))(٤١١-٤٨٥.ز.) بەناوی((عناصر الهیات)) نوسینە عەرەبیە نوسراوەکەی بۆ دوەمین جار بەهەوڵی((عبدالرحمان بدوی)) لە کتێبی((الافلاطونیة المحدثة عند العرب))(قاهرە،١٩٥٥.ز. کوەیت،١٩٧٧.ز) بلاوکرایەوە.

٣. کتاب التفاحە، لەسەدەکانی ناوەراستی زاییندا، بەناونیشانی((سیۆنامە)) ناوبانگی دەرکردبوو، لە ((رسائل اخوان الصفا)) بە شانازی((جورجولوی دلا ویدا(٥٠٦-٤٨٤/I) لە رۆم بلاوکراوەتەوە، (١٩٥٦.ز) نووسینە فارسیەکەی لەگەڵ نوسینە عەرەبیەکەی جیاوازە،یەکەمیان بە یارمەتی((مارگولیوت)) لە رۆژنامەی ((انجمن سلطنتی اسیایی)،(١٩٨٢.ز.)بلاو کراوەتەوە،(لا ٢٢٩-٢٢٠) و لە((مصنفات))ی ((بابا ئەفزەڵی کاشانی)) بە یارمەتی((موجتەبا مەینەوی و یەحیا مەهدەوی(ب ١٣٦٦،٢ هەتاوی) بەناونیشانی((رسالە تفاحە)) دەست ئەکەوێت (لا ١١٢-١٤٤).

٤. سرالاسرار (یان السیاسه فی تدبیر الرئاسه) كه له سهدهكانی ناوهراستدا خاوهنی گرنگی و نابانگێكی زۆر بووه، نوسینه عهرهبییهكهی به ههوڵی عبدالرحمان بدوی، له((الاصول الیونانیة للنظریة السیاسیة فی السلام))(قاهیره،١٠٥٤.ز.) بلآوكراوهتهوه(١/٦٧-١٧١).

٥. چهند نامهیهكی هرمسی كه له سهرچاوه عهرهبییهكاندا دراونهته پاڵ ئهرستۆ به ناوهكانی((ملاطیس،اسطماخس،سلماطیس))،(سه:ابن نديم،٢٥٣)بهشێك لهم نووسینانه له وێنهی نوسینی، ژماره٢٥٧٧، له كتێبخانهی نهتهوهیی پاریس بهناونیشانی((كتاب الاستوطاس لهرمس الحكیم))دا هاتووه،له ((رسائل اخوان الصفا)) لهم نوسینهدا به كهمێك لادانهوه له شێوهی كتێبدا، ناو براوه، و چهند برگهیهك لێی ئهگوازرێتهوه(٤/٤٢٩-٤٤٣).

٦. شروح علی ارسطو فی الیونانیة ورسائل اخری،له عبدالرحمان بدوی،بهیروت،١٩٧١.ز.فارابیش له یهكێك لهم نوسینانهدا، كورتهیهكی لهسهر فهلسهفهكهی ئهرستۆ بهو شێوهیهی كه له وهرگێرانهكانیهوه دهستی كهوتووه،خستۆته ڕوو، كه ((محسن مهدی)) بهناوی ((الفارابي،فلسفة ارسطوطالیس)) له ((گۆڤاری مجله الشعر))(بهیروت،١٩٦١.ز.) بلآوكردۆتهوه.

له كۆتایدا،ناونیشانی بژاردهیهك له گرنگترین نووسینهكانی ئهرستۆناسان لهبارهی ئهرستۆ و فهلسهفهكهی ((جگه لهوانهی كه له ناوهرۆكهكهدا))هاتوون، ئهخهینه ڕوو:


*ALLAN,d,j,the philisophy of aristotle,oxford,oxford,١٩٢٥:berntano,f. Aristoteles und seine weltanschauung, Leipzig, ١٩١١, id, VIN der mannhgfaltigen bedeutung des seinden nsch aristoteles, fribourg, ١٨٦٢, Cherniss,h,arustotle s criticism of persocratic philosophy,baltimore, ١٩٢٥,id,aristotle s criticism of plato and academy,baltimore, ١٩٤٤ during ,I,"arustoteles" paul,supplement, ١٩٦٨,XI/١٥٩-٢٣٦,grene,M.A..Aportrait of arustotle,london, ١٩٦٣,Llod,G.E.R.,aristotle, the growth and structuer of his thought, ١٩٦٨,randall,J.H.,arustotle .New York, ١٩٤٤,Ross,D,aristotle,london, ١٩٢٣,Robin,L,aristotle,paris, ١٩٤٤,Zeller,E,. "aristotles und die altan peripatetiker",philosophy der griechen in inhrer geschichtlicgen Entwick;ung,leipzig, ١٩٢١,vol.II(٢),Zuricher,J,aristotle werk und geist,padeborn, ١٩٥٢*

## سەرچاوەکان:

ابن ابي اصيبعة((عيون الانباء)) به يارمەتي ((ئوگوست مولەر)) قاهيره((١٨٨٢.ز.)

ابـن فاتك،مبـشر،مختار الحكـيم و محاسـن الكلـم، بـه يارمـەتي عبـدالرحمان بـدوي، بەيروت،١٩٨٠.ز.

ابن نديم الفهرست، به يارمەتي گوتاڤ فلوگل،لايپزيگ،١٨٧١.ز.

ئەرستۆ،ميتافيزيك وەرگێراني(شرف الدين خۆراساني(شرف)..) تاران،١٣٦٣ ش.

مەنتيق،بەيارمەتي عبدالرحمان بدوي،قاهره ١٩٤٨.ز.

بطليموس غريب،((وصية ارسطوطاليس و فهرست كتبة و شيء من اخبارة)) هاوڕێ لـــە گـــەڵ ((فلـــسفة افلاطـــن و...وێنەيـــەكي نوســـراو كتێبخانـــەی ســـليمانيەی ئستانبول،ژ٤٨٣٣، .

رسائل اخوان الصفا،بەيروت،١٩٥٧.ز.قفگي.علي.

تاريخ الحكماء بەيارمەتي.ی.ليبرت لايپزيگ،١٩٠٣.ز.

## و لەگەڵ

*Aristotle, analytica posteriora ,id,analytica priora,id,catagoriae,id, DE anima,id,De caelo,id,De generatione animalium,id,De generatione et corruputione ,id, De motu animalium,id,De partibus animalium ,id, Ethic Eudemia,id, Ethica nicomachea ,id, historia animalium,id, metaphysica id,peri hermenias,id,physica,id, politica,id,Rhetorica,id, topica,Bonitz, Index aristotlicus,Berlin, ١٨٧٠,Britannica , ١٩١١,chrust, A.H.aristotle,New light on his life and some of his lost works, london, ١٩٧٣,vol,I,diogenes laertios,bion hai gnomon en philosophia eudikimesanton,during.I.,Aristotle in the Ancient biographical tradition, goteberg, ١٩٥٧,jaeger,W , aristotle grundlegung einer geschichte seiner Entwicklung,berlin, ١٩٢٣,moraux.p.Der Aridtote;ismus bei den gviechenmberlin,/New York, ١٩٧٣,Owens J,the Doctrine of beimg in the Arstotelian metaphysics,tornto, ١٩٧٨,pauly,plato Timaios,id,sophistes,pletarch,Lives,london,etc.. ١٩٧١,reiner,H,"Die Entstehung und uperungliche Bedeutung des Numens Metaphysik",zeitschrify fur philosophsche forschung, ١٩٥٤,vol,VIII,Ross,D,W,Aristotles,Metaphysica, ١٨٤٧-١٨٤٨,starbo, the geography ,london, ١٩٦٦.*

((ئـــەقڵ،لـــە كردارێتی خـــۆیـدا،ژیانە))
((کتێبی دوانزەیەم،وەرزی حەوتەم ١٠٧٢b٢٧))

## "وەرزی یەکەم"

# ( پەی بردنی هەستەکی، ئەزموون،هوونەر ،زانست ودانایی )[١]

٩٨٠a٢٢

هەموو مرۆڤەکان،لە سروشتی خۆیاندا،گەریدەی زانستن، نیشانەی ئەم گەریدەییە، سـۆز پیـشەیی ئێمـە بـۆ پـەی بردنـە هەستەکیەکانمانە،چـونکە ئەمانـە-و لەهـەمویان سەرتر،هەسـتی بیـنین-بـەدەر لـە سـودمەندیەکانیان،لەبەر خـودی خۆیـان،خۆش ئەوێنرێن،چونکە ئێمە نەتەنیا لەبەر ئەنجامدانی ئیشێك،بەڵکو تەنانەت لەکاتێکیشدا کە خوازیـاری ئیـشێکیش نـین، هەسـتی بیـنین ئەخەینـە سـەرووی هـەموو {هەسـتەکانی تـرەوە}(٢٥)،هۆکارەکەش ئەوەیە کە هەستی بینین زیاد لـە هـەموو هەستەکانی ترمان یارمـەتیمان ئـەدات، تـا((شـتەکان))بناسـین، و زۆرێـك لـە جیاوازیـەکانمان بـۆ روون ئەکاتـەوە، گیانـەوەران بەسروشـت، بـە ووزەیـەکی هەسـتەکیەوە لـەدایك ئـەبن، بـەڵام هەندێکیان، لە پەی بردنە هەستەکیەکەیانەوە،((یادگە))دروست نابێت و (لەهەندێکیاندا) دروست ئەبێت،و بەم هۆیەشەوە ئەم گروپە لە گیانەوەران کە خاوەنی یادگە لەوانەی کە خاوەنی یادگە نین شایستەترن بۆ فێر بوون.

٩٨٠b٢٢

ئەوانە بەبێ فێر بوون ژیرن کە ناتوانن دەنگەگان ببیستن، وەك هەنگەکان، یان هەر رەگەزێکی تری لەم جۆرە کە ئەگەری بونیان هەبێت، بەڵام ئەو گیانەوەرانەش کە لە پاڵ یادگەدا هەستی بیستنیان هەیە(٢٥)، ئەتوانن فێربن.

[١] ناو نیشانی هەموو سەر وەرزەکان،لە تەواوی کتێبەکەدا لەلایەن((Schwarz))ەوە دانراون و پەیرەوی لەو کراوە.

لەبەر ئەوە باقی گیانەوەرەکان، {بەدەر لە مرۆڤ}، بە خەیالاندن و وێناندنی یادەوەریەکانەوە ئەژین، بەلاّم لە تۆزقالێك ئەزمونیش((empeiria)) بەهرەمەندن، بەلاّم نەژادی مرۆڤ، هاوکات خاوەنی هوونەر((یان پیشەگەری)) و ژمێریاریەکانە ، لەلای مرۆڤ لە((بەیادهێنانەوە=یادگە))وە ئەزموون دروست ئەبێت، چونکە((یادکرنەوە-بەیادهێنانەوەی)) زۆر لەیەك شت ، ئەبێنە ووزەیەکی ئەزموونی.

٩٨١a

و وادەر ئەکەوێت کە ئەزموون، راستەوخۆ شتێکی وەك((زانست)) وهونەر بێت، بەلاّم زانست و هونەر،بۆ مرۆڤەکان، لەرێگای ئەزموونەوە بەدەست دێن، چونکە بەو شێوەیەی کە پۆلس[1] ئەلێت:(( ئەزموون هونەر بەدی ئەهێنێت، و بێئەزموونیش بەخت و رێکەوت))(٥) ئێستاکە هوونەر، کاتێك دێتە ئاراوە کە لە رێگای تێکەیشتێنراوە راستەوخۆ لە ئەزموونەکانەوە، پەی بردنێکی گشتی لەبارەی مەسەلە وەك یەکەکان، بێتە ئاراوە، چونکە بوونی ئەم پەی بردنە کە لەبەر ئەوەی((کالیاس)) و((سوقرات))یش، و زۆرێك تاکی تری وەك ئەوان، دووچاری ئەو نەخۆشیە بوون، ئەم یان ئەو شتەی کە فریایان کەوت، و سودمەند بوو بۆیان ،بابەتی ئەزموونە (١٠)بەلاّم ئەوەی کە ئەو شتەی کە بۆ بارودۆخی هەموو ئەوانەی کەلە جۆرێکی دیاری کراون بەسوودە، و دووچاری ئەم یان ئەو نەخۆشیەن ((وەك نەخۆشی بەلْغەم یان زەردۆیی یان دووچاری تای سوتێنەر)) بابەتی ((هونەر))ە.

هەنوکە لەوەیدا کە پەیوەستە بە ئیشەوە، وادەر ئەکەوێت کە ئەزموون لەگەلّ هوونەردا جیاوازی نیە، بەلْکو زیاتر ئەبینین کە تاکە بە ئەزموونەکان، لەکەسانێك کە خاوەن بڕوا بەلاّم بێ ئەزمونن ،سەرکەوتووترن(١٥) هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەزموون(( ناسینی بەشەکانە))، بەلاّم هونەر پەیوستە بە مەسەلە گشتیەکانەوە، لەکاتێکدا کە پەرچدانەوەکان ودروستکردنەکان، پەیوەستن بە مەسەلە بەشەکیەکان یان تاکیەکانەوە، چونکە پزیشك((مرۆڤ))چارەسەر ناکات(مەگەر لەرکەوتانە)،بەلْکو((کالیاس)) یان((سوقرات)) یان کەسێکی تر کە((مرۆڤ))ناو نراوە یان بەوەشەوە کە دیارە هەر مرۆڤە، چارەسەر ئەکات(٢٠) کەواتە ئەگەر کەسێك بێ ئەزموون بەلاّم خاوەن بڕوا بێت، و((گشت))ێك بناسێت، بەلاّم((بەش))ە گونجێنراوەکەی ناوی نەزانێت، لە چارەسەریدا

---

[1] یەکێك لە پەیرە سوفستاییەکانی ((گۆرگیاس))ە، و نوسەری بەرهەمێکە لەهوونەری گووتاربێژی دا کە ((ئەفلاتوون)) سەرەتاکەی لە تەوەرەکەی خۆی بەناوی گۆرگیاسدا ٤٤٨C و٤٦٢C دا هێناوە گێراوەتەوە.

شکست ئەخوات، چونکە زیاتر((تاك))یان((بەش))ێکە کە ئەبێت چارەسەر بکرێت،بەبوونی ئەمەیە کە ئێمە وێنا ئەکەین کە((زانین و تێگەیشتن))(٢٥) زیاتر پەیوەستە بە هونەرەوە، تائەزمونەوە، و هوونەرمەندان لە((ئەزموونداران)) بە داناتر ئەزانین، بەمەوەیە کە هەرجۆرە((دانایی))ەك، زیاتر بە کاریگەری((زانین)) ئەژمار ئەکەین، و ئەمەش لەوەوەیە کە ئەوان ((هوونەرمەندان)) هۆکار ئەناسن، و ئەمان نا,چونکە بەئەزموونەکان((کێی)) یان(( کێیە to hoti)) ئەناسن، بەلام((بۆچییێتی to dioti)) ناناسن، بەلام ئەوان ((هوونەرمەندان)) ((بۆچییێتی)) و((هۆکار)) ئەناسن.(٣٠).

٩٨١b

لێرەوەیە کە ئێمە مامۆستا پیشەکان لە هەمو روویەکەوە بە بەرێزتر ئەژمار ئەکەین و قبوڵ ئەکەین کە ئەمان زیاتر ئەزانن و لە((دەستگێڕەکان))[1] داناترن، چونکە ئەمانە هۆکاری شتە دروستکراوەکان ئەزانن،( بەلام دەستگێڕەکان وەك شت گەلێکی بێگیانن، کە ئیش ئەکەن، بەلام نازانن کە چی ئەکەن–وەك ئاگر کە ئەسوتێنێت– کەواتە بەهەمان شێوە کە شتە بێگیانەکان، لەسەر بنەمای سروشتی دیاریکراوی هەریەك لەمانەوانە، ئیشێك ئەکەن، دەستگێڕەکانیش ،لەسەر بنەمای ((عادەت =خوو))ئیش ئەکەن)(٥) بەم شێوەیە مامۆستا پیشەکان نەك وەك ئیشکەرەکان، بەڵکو لەم روانگەیەوە کە خاوەن بڕوان و هۆکارەکان ئەناسن،داناترن.

بە شێوەیەکی گشتی نیشانەی پیاوی دانا لەبەرامبەر پیاوی نەزان، ئەمەیە کە ئەوی تر توانای((فێر کردن))ی هەیە، و بەم شێوەیە باوەڕمان وایە کە((هوونەر)) لە پێش((ئەزموون))ەوە خاوەنی خەسڵەتی((زانست))ە، چونکە هونەرمەندەکان ئەتوانن (١٠) فێر بکەن، بەلام بەئەزمونەکان(ئەم تواناییەیان نیە). هاوکات ئێمە هیچ یەك لە هەستەوەرەکانمان بە ((دانایی-sophia)) ئەژمار ناکەین، هەرچەند ئەمانە گرنگترین ئامێرەکانی ناسینی(( تاك شتەکان)) یان ((بەشەکان kath he kastha )) ن، بەلام ئەوان{هەستەوەرەکان}((بە چ هۆیەك to dia ti))[2]ی هیچ یەك لە شتەکانمان پێ

---

[1] ئەوانەی لەبازار بەدەست شت ئەفرۆشن یان شتەکان لە باوەشیاندایە و ئەگەڕێن.

[2] ئەتوانم ئەوە بڵێم ئە(ژان پیاجە) لەدوای نزیکەی لە دووهەزار ساڵ، سودی لەم قسەیەی ئەرستۆ وەرگرت، و دواتر((پێوانەی گەشەی مەعریفی ))پێداهێنا چونکە گرنگترین بنەمای پەی بردن بە ئاستی مەعریفەی منداڵ و تاکەکان ئەوەیە کە((بەردەوام لەدوای وەڵامی هەر پرسیارێك)) بەدوای ((بە چ هۆیەك))ەکەکان بکەوین و بێگوومان ئەگەر بەردەوام بین لەسەر ئەوە،لەوانەیە بە پێی بڕواکانی فەلسەفەی ئەرستۆ بگەینە((یەکەمین پاڵنەری نەجووڵاو)).سیدۆ داوود.ع.

ناڵێن،((بە چ هۆیەك))ی ئاگرمان پێ ناڵێن کە(بۆچ گەرمە) بەڵکو تەنیا ئەڵێن((ئاگر گەرمە)).

لەبەر ئەمە کەسێك کە بە ئەگەرێکی زۆر (بۆ) یەکەمین جار،هونەرێکی، لە هەر جۆرێك،-کە لە سەرووی پەی بردنە هەستەکیەکانی هەموانە-دۆزیەوە، لەلایەن مرۆڤەکانەوە ستایشی کرا(١٥) نەك تەنها بە هۆی ئەوەی کە لە دۆزینەوەکانی ئەودا شتێکی بەسود دەست ئەکەوێت، بەڵکو بەو هۆیەی کە((ئەو دانا و لەوانی تر نایابتر)) بوو، ئەوکات-هاوڕێ لەگەڵ هوونەرە دۆزراوە زۆرترەکان-بەشێك پەیوەست بە پێویستیەکانی ژیان و هەندێك پەیوەست بە سەرقاڵیەکان-دۆزەرەوانی ئەم گروپی دووەمە لە هوونەرەکان، بەردەوام بە داناتر ئەژمار ئەکران(ئەکرێن). چونکە زانست یان دانایییەکەی ئەمان(٢٠) پەیوەست نیە ( بە ئامانجێکی سودمەندانەوە)، ئەوکات هەموو ئەم جۆرە هوونەرانە،لە جاران، کەمێك فراوانتر بوون، زانست گەلێك دۆزرانەوە کە پەیوەست نەبوون بە پێداویستی و چێژەکانی ژیانەوە، ئەویش یەکەم جار لەو شوێنانەی کە مرۆڤەکان لە(بێ ئیشی)دا ژیان بەسەر ئەبەن، بەم هۆیە هوونەرە بیرکاریەکان، یەکەمجار، لە سەرزەمینی((میسر)) سەریان دەرهێنا، چونکە چینی((کاهینەکان))، لەوێندەر،خەریکی ((بێ ئیشی)) و((بێکاری)) بوون(٢٥).

لە بابەتی ئەخلاقدا[1] وتراوە، کە لە نێوان هوونەر،زانست و بابەتە وەك یەکەکانیان، چ جیاوازی گەلێك بەدی ئەکرێت، هەنوکە بەو هۆیەوە قسە لەسەر ئەوە ئەکەین کە هەموان وا ((وێنا)) ئەکەن کە ئەوەی ناوی نراوە((دانایی)) لە لێواری(( هۆکارە یەکەمی و سەرچاوەییەکانەوەیە (ta prota aitia tas arkhas)، لەبەر ئەوە وەك چۆن پێشتر وتمان(٣٠) پیاوی بەئەزموون نایابتر و داناتر لەو کەسە ئەژمار ئەکرێت کە تەنیا خاوەنی ((پەر بردنی هەستەکی))یە، و پیاوی هوونەرمەند داناترە لە پیاوی بەئەزموون، و مامۆستاپیشەکان داناترن لە دەستگێڕەکان، و زانستە تیۆریەکان لە زانستە پێکهێنەرەکان، پڕ بایەختر.

٩٨٢a

کەواتە ڕوونە کە((دانایی)) زانستێکە لە بارەی هەندێك لە((بنەما و هۆکارەکان)).

---

[1] بگەڕێنەوە بۆ کتێبی((ئەرستۆ)):((ئەخلاقی نیکۆماخۆس))،کتێبی شەشەم، وەرزی یەکەم تا شەشەم ١١٣٩b١٤ تا ١١٤١b٨.

"وەرزی دووەم"

# ( دیاریکەرەکانی دانایی یان ژیریتی )

لەوێوە کە ئێمە گەریدەی ئەم زانستەین(٥)ئەبێت تێبینی بکەین ئەم زانستە کە دانایییە، لەگەڵ کام لە(بنەما و هۆکارەکان)دا لە پەیوەندی دایە، هەنووکە ئەگەر بڕوایەکمان لەبارەی پیاوی((ژیر یان دانا)) لەبەر چاو گرتبێت, ئەوکات لەوانەیە مەسەلەکە ڕونتر بێتەوە، یەکەمجار واگریمانە ئەکەین کە دانا،هەموشتەکان-تائەوشوێنەی کە ئەگەری هەیە-ئەزانێت، بیٚ ئەوەی زانستی لەسەر هەریەك لەوانە هەبێت(١٠)،پاشان ئەڵێین کە دانا کەسێکە کە ئەتوانێت لەشتە قورسەکان تیٚ بگات،ئەو شتانەی کە مرۆڤ بە ئاسانی نایانناسێت، دیسانەوە ئەڵێین کە ئەو کەسەی لە هەریەك لە ڕەگ و ڕیشەکانی زانستدا داناترە، کە وردترەو بۆ فێربونی هۆکارەکان شایستەترە، و هاوکات ئەڵێین کە ئەو زانستەی کە لەبەر خۆی،و لەبەر خودی زانست،بەدەست ئەهێنرێت(١٥)زیاتر دانایییە تا ئەو زانستەی کە لەبەر ئەنجامەکانی،هەڵئەبژێرێت، و زانستی زاڵ زیاتر دانایییە تا زانستی شوێنکەوت، چونکە نابێت فرمان بە پیاوی دانا بدرێت، بەڵکو ئەبێت فرمانی لیٚ وەربگیرێت،و ئەو نابێت لەیەکێکی تر فەرمان وەربگرێت، بەڵکو ئەو کەسەی کە کەمتر دانایە، ئەبێت بە جێبەجێکەری فرمانەکانی ئەو بێت.

بەم شێوەیە و لەم ئەژمارکەریانەن، ئەو بڕوایانەی کە(٢٠) ئێمە لەبارەی((دانایی)) و((دانا)) هەمانن، هەنووکە، لەنێوان ئەم دیاری کەرانەدا، زانینی هەمو شتێك، وەك پێویست، نسیبی کەسێك ئەبێت کە زیاترین زانستی گشتی هەبێت،چونکە ئەو هەموو ئەو شتەی کەلە گشتدا گونجێنراوە ئەناسێت، بەلاٚم،ڕێك هەمو ئەو شتەی کە گشتی

ترینـه، قورسـترین فێربونیـشه بـۆ مرۆڤـەکان، چونکه دورتـرین شـتێکه لـه پـەی بردنـی هەسـتەکی(٢٥) و لەگـەڵ ئەوەشـدا وردتـرین زانـستەکان، ئەوانـەن کـە زیـاتر لـەوانی تـر خۆیان خەریکی((رەچەڵەکە)) یەکەمینەکان ئەکەن، چونکە ئەوانەی کە رەچەڵەکی کەمتر لـەخۆ ئـەگرن، وردتـرن لەوانـەی کـە خـاوەنی چـەندین رەچـەڵەکی زۆرتـرن، بـەم شێوەیە،زانستی ژمارەکان(زانستی ژمێریاری) لە ئەندازیاری وردترە، بەڵام زانستێك کە هۆکارەکـان ئەپـەروەرێنێت لـە پلەیـەکی بـەرزتردا شایـستەی فێربوونە،چـونکە کەسانێ(شتێك)ێکمان فێر ئەکەن کە هۆکارەکانی ئەو شتەمان پێ بدەن،(٣٠) زانین و زانستێك کە لەبەر خودی خۆیان دارێژراین، زیاتر لە هەمووان لە زانستێکدا دەست ئەکەون کە بۆ زانست شایستەترینە، چونکە کەسێك کە لەبەر خودی ئەو، زانستخوازە ،لە پێش هەمووانەوە گەریدەی بەرزترین زانستە.

٩٨٢b

و ئەم(زانستە بەرزترین)ەش،هەمان، شایستەترین(شتە)بۆ فێر بوون، و شایستەترین شتە زانستیەکانیش (هەم،هەمان) بنەما ورەچەڵەکە یەکەمین وهۆکارەکانن، چونکە بە هـۆی ئەمانـە و لەسـەر بنـەمای ئەمانەوەیـە کـە ئـەتوانین هـەموو شـتەکان بناسـین، نـەك ئـەوە(بـەو شـێوەیە بێـت) کـە ئەمانـە،(ئـەم هۆکـار و رەچەڵەکە یەکەمینانـە) لـە شـتە شـوێنکەوتەکانیانەوە بناسـرێن، بـەڵام، زانـستێك کـە ئـەزانێت هـەر شـتێك لەبـەر(مەبەسـت)ێـك روو ئـەدات، (٥) پرپایـەخترین زانـستەکانە ولەسـەرووی شوێنکەوتەکانیانەوەیە،و ئـەم(ئامـانج)ە لـەبارەی هـەموو شـتێکی بـاش (tagathon) و بەشێوەیەکی گشتی چاکە یان بەرزترین باشەیە لە هەموو سروشتدا.

بەم شێوەیە لە هەمو ئەوەی کە تا هەنوکە توێژینەوەمان لەسەر کردووە، ناوێك کە بەداویـدا گـەڕاوین، پەیوەست ئەبێتـەوە بەهـەمان زانـستەوە، و ئـەوەش زانـستێکە کـە لـەبارەی رەچـەڵەکەکان و هۆکـارە یەکەمینەکانـەوە توێژینـەوە ئـەکات (١٠) چـونکە چـاکەو((ئامـانج)) یەکێکـە لـە هۆکارەکـان، بـەڵام ئـەوەی کـە(زانـست)،زانـستێکی دروستکەر(بەدیهێنـەر)نیـە لـە روانگـەی یەکەمین فەلسەفە پیشەکانەوە ئەشکرا ئەبێت، چونکە مرۆڤەکان، و هاوکات، لەسەرەتاوە، لە رێگای((سەیروسەمەرەیی-تامەزرۆیی thaumazein)فەلسەفاندنیان دەست پێ کرد و ئەکەن، یەکەم جار تامەزرۆی مەسەلە قورسـە گەورەکانـەوە بـوون(واتـە سـەریان سـوڕ مـا.و.ك)، پاشـان وردە وردە پـێش ئەکـەوتن(١٥) و پرسـیاریان لـە لێـواری مەسـەلە گـەورەکان ئـەکرد، بـۆ نموونـە لـەبارەی

گۆرانـەکانی مـانگ، و لـەبارەی خـۆر وئەسـتێرەکان و پاشـان لـە بـارەی دروسـت بـونی تـەواوی دونیـا، کەسـێك کـە دووچـاری دەستەپاچـەیی و تامـەزرۆیی و سـەر سـورمان ئەبێت، خـۆی بـە نـەزان ئـەزانێت (لێرەوەیـە کـە خوازیـاری ئەفسانەکانیش بە مانایـەك، فەیلەسووفە، چونکە ئەفسانەش لەشتە تامەزرۆ و سەرسورهێنەرە کەڵەکە کراوەکان پێك هـاتووە) بـەم شـێوەیە، لەبـەر ئـەوەی مرۆڤـەکان بـۆ هـەڵهاتن لـە نـەزانی ئەفەلـسەفێنن، دیارە(۲۰)، گووزەری ڕوداوەکان، خۆی، شایەتی ئەوە ئەدات،چونکە، مرۆڤەکان، لەدوای ئـەوەی هـەموو پێداویستیەکانی ژیـان وئـەو شـتانەی کـە مایـەی ئـارامی و ئاسـایش و سـەرقاڵین، پێـشتر فەراهـەمیان هێنابوو،دەسـتیان بـە (تـێ بینینێکـی[1]-تێـڕوانین) لـەم شێوەیە کرد، کەواتە دیارە کە ئێمە لەبەر هیچ جۆرە سودێکی تر گەریدەی ئەم(زانست)ە نین(۲۵)، بەڵکو هەمان شێوە کە ئەڵێین ئازاد ئەو مرۆڤەیـە کە لەبـەر خـۆی و نـەك لەبـەر ئـەوانی تـر ئـەژیت، بەهـەمان شـێوەش ئـەم(زانـستە)ش بـە (تاقـە زانـستێك) نـاو ئـەنێین، چونکە تەنیا ئەم(زانست)ەیە کەلەبەر خودی خۆی بوونی هەیە.

لەبـەر ئـەوە بـە دروسـتی ئـەتوانین گریمانـەی ئـەوە بکـەین کـە بەدەسـت هێنـان و خاوەنداریێتی ئەم زانستە لە توانای ئەم مرۆڤە بەدەرە، چونکە سروشـتی مـرۆڤ لـە زۆرێـك لـە لایەنەکانـەوە لـە کۆیلایـەتی دایە(و لەبـەر ئـەوە نەگەیشتن بە ،بەدەسـت هێنـانی ئـەم زانستە) بەو شێوەیەی کە-لەسـەربنەمای گوتەکـەی سیمونیدێس[2]-(۳۰)(( تـەنیا خـودا خاوەنی ئەم پشکەیە)) و شایستە نیە کە مرۆڤ لە گەڕان بەدوای زانستێکەوە بێـت کـە لـە توانای بەدەسـت هێنـانی ئـەودا نیـە، کەواتـە ئەگـەر ئـەوەی شاعیرەکان ئـەیڵێن راسـتێتی تێدا بێت،و خوایەتی لە سروشتی خۆیدا (چاوچنۆك- بەخیل)،

983a

و لەم بارەیەوە ئەبێت زیاد لە هەموو(بوارەکان) راست بێت و هەموو ئەو کەسانەی کە لـــەم زانـــستەدا بەرجەســـتەن، پیـــاوانێکی بـــەد بـــەختن، بـــەڵام خودایـــەتی ناتوانێت((چاوچنۆك))بێت و پەندێك هەیە کە ئەڵێت:

(( گۆرانیبێژەکان درۆی زۆر ئەکەن))

و هیچ زانستێکی تـر نابێـت بەرێزتر لـەم (زانـست)ە ئـەژمار بکرێـت، چونکە خـودایی ترین (زانست)، بەرێزترینیانە، و ئەمە تەنیا بە دوو شێواز ئـەتوانێت بـەو شـێوەیە بێـت،

[1] مەبەست لە هەمان تێبینی نیە و ئەم ووشەیە هاوبەرامبەر ووشەی insight

[2] پارچەی سێهەم لەلای(hiller) بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەفلاتوون لە ((پرۆتاگۆراس٣٤١E,٣٤٤C)simonides) لە keosشاعیری خاوەن شیعری گۆرانی یۆنان(٥٥٦-٤٦٧پ.ن)

چونکە زانستێك بۆ خاوەندارێتیەکەی، خودا شایستەترینە، زانستێکی خوداییە، یان زانستێکە کە سەرقاڵی مەسەلە خوداییەکانە، و تەنها ئەم زانستەیە کە هەردوو(شێوان)ەکە لەخۆ ئەگرێت، چونکە یەکەم، هەمووان باوەڕیان وایە کە خودا یەکێك لە هۆکاری هەموو شتەکان و سەرچاوەیەکە، و دووەم، خودا ،بەتەنیایی، یان زیاتر لە هەمووان، خاوەنی ئەم زانستەیە(١٠)، لە واقعدا هەموو زانستەکانی تر، لەم(زانستە )پێویست ترن، بەڵام هیچ یەك لەمەیان، باشتر نین.

بە بونی ئەمەش،خاوەنداریتی ئەم زانستە، ئەبێت، بەمانایەك، هاوبەرامبەر یان پێچەوانەی ئەو شتە بێت کە ئێمە، لەسەرەتاوە، توێژینەوەیمان ئەکرد، چونکە، بەو شێوەیەی کە ووتمان، هەموو مرۆڤەکان لەوەیدا شتگەلێکی لەوشێوەیەن کە هەن، دەست بە سەرسوڕماوی ئەکەن، بۆ نموونە(١٥) لەوەی کە لەبارەی بوکەشووشە سەماکەرەکانی[1] خۆیان ئیش ،یان لەبارەی شۆرشەکانی خۆر، یان نیسبەت بە ((نەبوونی گونجاوی ئەندازەی تیرەی چوارگۆشە بە لاکانی))،تووشی سەرسوڕمان ئەبن، (چونکە بە بڕوای هەمو ئەو کەسانەی کە هێشتا لە هۆکار تێنەگەیشتون، سەیرە کە شتێك هەبێت کە نەتوانرێت تەنانەت بە بچوکترین یەکە بپێوین)بەم هەمووەوە، لەسەر بنەمای پەندە باوەکە:[2]ئێمە ئەبێت بە کۆتاییەکی پێچەوانەو باشتر بگەین، بەو شێوەیەی دێتە پێشەوە، کە مرۆڤ هۆکارەکەی ناسیوەو تێی گەیشتووە، چونکە هیچ شتێکی ئەندازیارێك لەمە سەرسوڕماوتر ناکات کە (٢٠) ڕوون بێتەوە، تیرەی چوارگۆشە، شایەنی پێوانە کردنە.(یان لەگەڵ لاکانی شایەنی گوونجاویی)ە.

بەم شێوەیە رونمان کردەوە کە سروشتی ئەو زانستەی کە ئێمە بەدوایدا ئەگەڕێین، چیە، و ئامانجێك کە ئەبێت توێژینەوەکەی ئێمە، و هەموو شێوازی گەڕانەکەی ئێمە، پێی بگات، کامەیە.

---

[1] خۆی لە راستیدا مەبەست لەو بوکەشووشانەیە کە لەو دیوو پەردەوە بە هۆی ئەو تەلانەی کە بەدەست و قاچیانەوە بەستراون،ئەجوولێنرێن و سەمایان پێ ئەکرد و شێوە نمایشێکیان لێ ئەر ئەهێنرێت(سیدۆ.د.م)

[2] ئاماژەیە بۆ ئەو پەندە یۆنانیە کە ئەڵێت(( تێڕامانی دووبارە ،باشترە)).

## "وەرزی سێهەم"

# ( بڕوای فەیلەسووفە کۆنەکان سەبارەت بە بنەماکان و هۆکارەکان )

لەبەر ئەمە ڕوونە کە ئەبێت زانستێك یان ناسینێك لە هۆکارە سەرەتاییەکان بەدەست بهێنرێت، و لەبەر ئەوە(٢٥) تەنها کاتێك لە زانینی هەر شتێك قسە ئەکەین کە وێنا ئەکەین و وائەزانین کە هۆکارە یەکەمینەکانی ئەناسین، لە هۆکارەکانی تریش بە چوار جۆر قسان ئەکرێت[1]، کە لە جۆرێکیاندا ئەڵێین هۆکار،((ناوەرۆك ousia)) و((چییەتی،ماهیەت to ti en einai))[2]ە، {چونکە((بە چ هۆیەك)) سەرەنجام ئەگەڕێنرێتەوە بۆ مانای شتێك و یەکەمین((بە چ شێوەیەك)) هەمان هۆکار و بنەمای یەکەمینە} ئەوی تر(٣٠) ((مادە ،هیولی)) و((بابەت hupokeimenon))ە ، سێهەم((لە کوێوە hethon-یان مامنە الحرکە)) یان بنەمای جوڵەیە، چوارەم هاوبەرامبەر و بەرامبەرکێی ئەم هۆکارەی سێهەمە، واتە((لەبەر ئەو))((هۆکاری ئامانجی to hou heneka)) و ((چاکە))یە، (چونکە ئەم ئامانجە، یان ئامانجی هەر جۆرە پەیدا بوون و جوڵەیەکە، یان لەناوچوونە)، ئێمە لەبارەی ئەمانە، بە ئەندازەیەکی پێویست لە((لێوارەکانی سروشت))[3]دا قسەمان لەسەریان کردووە.

٩٨٣b

بە بونی ئەمە، قسەی کەسانێك وەك بەڵگە ئەهێنینەوە کە پێش ئێمە لەبارەی ((بوونەوەرەکان))ەوە توێژینەوەیان کردووەو لەبارە((ڕاستی))یەوە فەلسەفاندوویانە،

---

[1] ب.ب.ڕوونکردنەوەکان،لە پێشکەوتاری وەرگێڕ.

[2] لەبارەی ئەم واژەیەوە سەیری ژێر نووسی وەرزی دووەم، کتێبی دووەم بکەن.

[3] سەیری ((لەبارەی سروشت))ی ئەرستۆ بکەن،کتێبی دووەم، وەرزی دووەم و حەوتەم.

لەبەر ئەوە ڕوونە کە ئەمانەش لە هەندێ لە بنەماو هۆکارەکاندا قسە ئەکەن، کەواتە، خۆسەرقاڵی بە تیۆرو بڕواکانی ئەمانە، بۆ پێداچونەوە هەنوکەییەکەی ئێمە، شتێکی بەسود ئەبێت(٥)، لەبەر ئەوە ئێمە یان ڕەگەزێکی تر لە((هۆکار)) ئەدۆزینەوە، یان زیاتر لەوەی کە ئێستا ئەیلێین دڵنیا ئەبینەوە، زۆربەی فەلسەفێنەکان یەکەم جار لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە تەنها بنەمای لە جۆری مادە، بنەمای هەموو شتەکانە، ئەوەی کە هەموو بونەوەرەکان لەون و بۆ ئەون، و یەکەمجار لەوەوە دروست ئەبن و سەرەنجام تیایدا لەناو ئەچن (لە کاتێکدا کە ناوەرۆك ئەمێنێتەوە، بەڵام (١٠)حاڵەت یان ((دەرکەوت- وادیاری))ەکەی لەناو ئەچێت)ئەم شتە بە گووتەی ئەمان((توخم stoikheion)) و ڕەچەڵەك(بنەما)ی بونەوەرانە،و بەم هۆیەوە، ئەمان لەو باوەڕەدان کە هیچ شتێك دروست نابێت و لەناو ناچێت (یان پەرتەوازە نابێت)چونکە ئەم جۆرە بونایەتیە(یان سروشت) هەمیشە ئەپارێزرێت، بەو شێوەیەی کە ئێمە لەبارەی ((سوقرات))ەوە ناڵێین کە ئەو، کاتێك کە جوان یان ئەبێت بە مۆسیقار، بە ڕەهایی دێتە بوون، یان ئەوەی کە لەبەر ئەوەی ئەم سیفاتە لەدەست بدات، لە ناوئەچێت(١٥)،چونکە بابەت، واتە خودی سوقرات، ئەمێنێتەوە،هەر بەم شێوەیە هیچ شتێکی تر نایەتە بوون و لەناو ناچێت، چونکە هەمیشە بوونێك (یان سروشت)ێك هەیە-یان یەکێك یان زیاتر لە یەکێك- کە شتەکانی تر لەوەوە دێنە بوون، لەکاتێکدا کە خودی ئەو((بوونەوەرە)) (لەناو نەچووە- واتە "بمێن"ە).

بەڵام ئەمان لەبارەی ژمارەو شکڵ یان(سروشت)ی ئەم بنەمایانە،هاوڕا نین(٢٠) ((تالیس)) کە بونیادنەری ئەم جۆرە فەلسەفەیەیە، ئەڵێت کە ((ئاو))بنەمایە (و بەم هۆیەوە ئەڵێت کە زەوی لەناو ئاودا مەلەکەرە).لەوانەیە ئەو لە تێبینی ئەوەی کە خۆراکی هەموو شتەکان شێدارە، و گەرماش لە( شێ)ەوە دێتە بوون، و ژیانی خۆی لێیەوە وەرئەگرێت، گەیشتبێتە ئەو گریمانەیە(و ئەوەی کە هەمو شتێك لێیەوە دێتە بوون،(ئەو) بنەمای هەموو شتەکانە)(٢٥) کەواتە ئەو لێرەدا ئەگات بە گریمانەکەی خۆی، و ئاویش بنەمای سروشتی شتە شێدارەکانە.

هەندێکیش،هەروا دائەنێن کە تەنانەت لە سەردەمە زۆر کۆنەکاندا[1]، ماوەیەك بەر لە(دروست بوون)ی ڕەچەڵەکی (مرۆڤی)هەنووکەیی،کەسانێك کە بۆ یەکەمین جار لەبارەی خوداکان بیریان کردەوە، هەر،ئەم بڕوایەیان لەبارەی سروشتەوە

[1] ب.بۆ:ئەفلاتوون((دیالۆگی کراتولوس)) ٤٠٢b،سنایتێتوس١٥٢E،١٨٠C.D

هەبووە(٣٠)چونکە ئەمانە((ئوکئاتوس))و((تئوس))یان بە ئەفرێنەرەکانی(دایك وباوك)ی گەردوون ئەژمار ئەکرد، و سوێندی خودایانیان بە ئاو- کە ناویان نابوو((ئستوکس))- ئەزانی، چونکە کۆنترین و بەرێزترینە، وبەرێزترینیش ئەو شتەیە کە ئێمە سوێندی پێ ئەخۆین، ئەوەی کە ئایا بڕوای سەرەتایی و کۆن لە بارەی سروشت ئەمەیە، لەوانەیە راست بێت.

٩٨٤a

بەهەر حاڵ،ئەوترێت کە ((تالیس)) بڕوایەکی لەم شێوەیەی لەبارەی ((هۆکاری یەکەمین))خستۆتە ڕوو.(بەلآم((هیپۆن))[1] بە هۆی بێ بەهای ئەندیشەکەی ناتوانین لە ریزی ئەم بیرمەندانەدا ئەژماری بکەین).

بەلآم((ئاناکسیمێنێس)) و((دیۆگێنس)) ((هەوا))یان لە سەروی ئاو و بە سەرەتاییترین بنەمای تەنە سادەکان ئەژمار ئەکرد،لە کاتێکدا کە((هیپاسوس))[2]ی خەڵکی((متاپونتۆس))و((هراکلایتوس))[3]ی خەڵکی((ئێفسوس)) ئەم بنەمایەیان بە((ئاگر)) ئەزانی، و((ئێمپدۆکێلس))-کە خاکی(یان زەوی) بە ناونیشانی چوارەمین یان بەوەی کە ناوبرا، خستە سەر-هەر چوار توخمەکەی قبوڵ کرد، ئەو ئەڵێت کە ئەم(چوار توخمە) هەمیشە ئەمێننەوەو پەیدا بونیان نیە، بەڵکو زیاتر یان کەمتر ئەبن(١٠) لەکاتێکدا کە لە یەکەیەکدا تێکهەڵکێش، و لە یەکەیەکی(تردا) لێك جودا ئەبنەوە[4]،((ئاناکساگۆراس))[5]ی خەڵکی((کلازومێنای))-کە هەرچەندە لە روی تەریتەوە لە پێش ئەوەوە بوو، (بەلآم) لە روانگەی چالاکیە زانستیەکانەوە لەدوایەوە بوو-ئەڵێت کە بنەماکان لە ژمارەدا بێسنورن (apeiron)ن، چونکە بە گوتەی ئەو هەموو ئەو شتانەی کە((متشابهە الاجزا ))ن وەك ئاو وئاگر، تەنیا لەم روانگەیەوە دێنە ئارا ولەناو ئەچن، کە تێکهەڵدەکێشرێن یان لێکجودا ئەبنەوە(١٥) ئەگەرنا بە هیچ مانایەکی تر نایەنەبوون و لەناو ناچن،بەڵکو جاویدان و هەمیشەیین.

---

[1] Hippon خەڵکیsamos لە ماوەی ساڵی ٤٧٠ تا ٤٠٠پ.ز، یەکێك لە سروشتناسان و خوازیارانی تیۆریەی تالیس،ئەرستۆ لە ((لەبارەی دەروون))٤٠٥b٢ شدا هەربەم شێوەیە لەبارەیەوە ئەدوێت.

[2] Hippasos لە ماوەی ساڵی ٥٠٠ پ.ز

[3] herakleitos

[4] سەیری بەرهەمی وەرگێری((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))،لا٣٤٦،، پەرەگرافی ١٧.

[5] Anaxagoras بۆ ئاشنایی زیاتر بە تیۆرەکەی ئەو،ب.بۆ((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))،لا ٢٩٧،پەرەگرافی ٤ و لا ٤٠٢ بە دواوە

لەسەر بنەمای ئەو تیۆر و بڕوایانە ئەتوانین بڵێین کە تەنها هۆکار،هەمان هۆکاری بە دەستەواژە (مادە))یە، بەڵام هاوکات کە مرۆڤەکان بەرەو پێش ئەچن، خودی شت(یان بابەت) ڕێگا بە ڕووی ئەماندا ئەکاتەوە و ئەوان ناچار بە گەڕانی زیاتر ئەکات، چونکە هەرچەند کە بتوانێت دروست بێن کە(٢٠) هەر شێوە دروست بوون و لەناوچوونێك(genesis kai fthora) لەیەك یان زیاتر لە یەك شت روو بدات، بەڵام بۆ چی بەم شێوە رو ئەدات و هۆکارەکەی چیە؟ چونکە خودی ( بابەت) نابێتە پاڵنەری لەناوچوونی خۆی، مەبەستم ئەوەیە کە، بۆ نمونە (تەختە یان برۆنز) کاتێك کە هەریەکە لەوانە لەناو ئەچێت، هیچ کامیان هۆکاری ئەوە نیە، نە تەختە، تەختەخەو دروست ئەکات، وە نە برۆنز پەیکەرێك، بەڵکو شتێکی(٢٥) تر هۆکاری لەناوچونەکەیە، و گەڕانی ئەم، گەڕانی بنەمایەکی ترە، کە ئێمە بە شێوەیەك دەری ئەبڕین، شتێکە کە(( سەرچاوەی جووڵەیە))،هەنووکە کەسانێك کە یەکەم جار سەرقاڵی ئەم شێوازە بوون، و وتیان کە بابەت((یەك))ێکە، بە هیچ شێوەیەك لە خۆیان بێ ئاگانەبوون، بەڵام هەندێ لەو کەسانەی کە ئەڵێن ئەو((بابەتە))یەکێکە،[1]-(٣٠)بە جۆرێکە کە بڵێی لەم گەڕانەدا شکستیان خواردووە-ئەڵێن کە ئەو یەکێکەو هاوکات هەموو سروشت ،و نەجووڵاوە،ئ ژیش نەتەنیا لە روانگەی دروست بوون و لەناوچوون،(چونکە ئەمە بڕوایەکی کۆنەو هەموان لەوەدا هاوڕان) بەڵکو لە روانگەی هەر لەناوچونێکی تر، و ئەم بڕوایە تایبەتە بەمانە،

٩٨٤b

لە ریزی ئەو کەسانەی کە ئەیانووت کە((جیهانی گشت))(to pan) ((یەك))ێکە، هیچ کەس لە دۆزینەوەی ئەم هۆکارە((تاك))ەدا سەرنەکەوت، جگە لە(پارمێنیدس))[2] کە ئەویش تەنیا تا ئەو شوێنە کە نە تەنیا یەك، بەڵکو بەمانایەك تر،دوو هۆکار ئەگریمێنێت،(٥) بەڵام کەسانێك کە چەند توخمێك،وەك گەرما وسەرما، یان ئاگر و ئاو و خاك یان گریماندووە[3]، باشتر ئەتوانن ((هۆکاری دووەم)) ڕوون بکەنەوە، چونکە ئەمانە ئاگر بەخاوەنی سروشتێکی جوڵێنەر ئەزانن، بەڵام خاك وئاو بە پێچەوانەی ئەو.

---

[1] مەبەست لە فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی ((ئیلێئا))یە.

[2] بوونیادنەری قوتابخانەی ئیلێئا لەبارەی ئەو،ب.بۆ هەمان کتێب،لا ٢٧٢ بە دواوە و بەتایبەتی بەشی ٨،لا٢٨١.

[3] بەوەی کەر دەرنەکەوێت ئاماژەیە بۆ ئیمپیدوکلێس.

لەدوای ئەم کەسانەو دۆزینەوەی ئەم جۆرە بنەمایانە، و لەوێوە کە ئەمانە بە سروشت شتگەلێکی بەس نەبون،(١٠) مرۆڤەکان،بەو شێوەیەی کە ووترا[1]، بە یارمەتی خودی ((راستی،هەقیقەت)) ناچار بوون کە بەدوای بنەمایەکی تردا بگەڕێن، چونکە ئەوەی کە ئاگر یان خاك(زەوی) یان هەر توخمێکی تری لەم جۆرە، هۆکاری جوانی یان باش بوو–و بوونی– شتەکان بن، نە ئەگەری هەیەو نە ئەو زانایانە توانیویانە باوەڕیان بەوە هەبێت، و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت دروست بێت کە بابەتێکی گرنگی لەم شێوەیە((خۆ بەخۆ)) وبە((بەخت)) یان((رێکەوت)) بزانن. لەبەر ئەوە،کاتێك ((کەسێك))[2] وتی کە ((ئەقڵ)) بەهەمان شێوەی گیانەوەران، لە سەرتاسەری سروشت،هۆکاری رێکخستن وریزبەندییە، لە بەرامبەر گوتە بە ئامانجەکانی پێشینان، پیاوێکی زیرەك وهۆشیار دەهاتە بەرچاو، ئێمە بە دڵنیاییەوە ئەزانین کە ((ئاناکساگۆراس)) ئەم بڕوایەی هەبووە،بە بوونی ئەمەش، بڕوا لەسەر ئەوەیە کە((هێرموتیموس))[3]ی خەڵکی((کلازومنای)) پێش ئەو ئەم بڕوایەی هەبووە،(٢٠)،هەموو ئەو کەسانەی کە بەم شێوەیە بیر ئەکەنەوە، بنەمایەکیان لە بوونەوەرەکاندا وێنا ئەکرد کە هۆکاری جوانیە، ئەویش ئەو جۆرە هۆکارەی کە جوڵە ئەدات بە(شت)ەکان.

[1] سەیری ١٨ a٩٨٤ بکەن.

[2] مەبەستی ((ئاناکساگۆراس))ە.

[3] Hermotimos ئەم و چاوێکی ئەفسانەییە کە ئەوترێت کە ئەرخەری جەستەیی پێشینی رۆحی پێتاگۆراس(فیساگۆرس)بووە.

"ورمزی چوارەم"

# ( پاشکۆی بڕوای فەیلەسوفە کۆنەکان )

ئەتوانین مەزەندە لێدەین کە(هێسودوس)[1](هریود)یەکەمین کەس بووە کە بەدوای شتێکی لەم شێوەیە گەڕاوە، یان کەسێکی تر کە ئەشق(ئێروس) یان(مەیل)ی بە بنەمای شتەکان زانیوە، بەهەمان شێوە کە (پارێمنیدێس)یش گوتی(٢٥) چونکە ئەو لە بارەی دروست بوونی دوونیاوە ئەڵێت:

((ئەو((واتە خودا)[2] پێش هەمو خوداکان، ئەشقی ئەفراند))[3]

و ((هێسیودوس)) ئەڵێت:

(( لە پێش هەمووانەوە((خائوس)) دروست بوو، پاشان((گایا))(زەوی) ....و ئەشق(ئێروس)، ئەو بەرجەستەترین، لەنێوان خودا نەمرەکان..))[4].

ئەمە بەو مانایەیە کە لە نێوان بونەوەران، ئەبێت((هۆکار))ێك بوونی هەبێت کە شتەکان ئەهێنێتە جوڵە و پێکەوەیان ئەلکێنێت، لەم مەسەلەیەدا، کە ئەم زانایانە بە پێی لە پێشی، ریزبەندی ئەکەین،((بهێڵن دواتر بڕیار بدەین))[5]،بەلآم لەوێوە کە لە سروشتدا،

---

[1] Hesiodos،شاعیری گەورەو کۆنی یۆنانی کۆن، کە تارادەیەك دیارە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی پێش زایین ژیاوە،بەرهەمە گرنگەکانی ئەو((تئوگۆنیا))((دروست بوونی خوداکان)) و ((رۆژەکان و ئیشەکان))ە، لەبارەی ئەو،ب.بۆ((یەکەمین فەیلەسوفەکانی یۆنان))لا١٠٢ بەدواوە.

[2] لە عەرەبیدا الاهە و بە مێ ناوی براوە.و.ك.

[3] بەشی ١٣،هەمان کتێب،لا٢٨٣،وادیارە مەبەستی ئەو لە((ئەفرۆدێتە))یە و خودای-مێ-ئەشقە لەلای یۆنانیەکان.

[4] ((تئوگۆنیا))نیوە دێڕەکانی ١٢٠-١١٦ بۆ تەواوی شیعرەکە،ب.بۆ هەمان کتێب،لا١٠٣.

[5] وەك بڵێی ئەرستۆ دوایی مەسەلەکەی لەبیر کردووە، ئەگین هیچ نیشانەیەکی لێ دیار نیە لە بەشەکان و کتێبەکانی دواتردا.

دژەکانی چاکە، خۆیان دەرئەخەن،-واتە نەتەنیا رێکخستن و جوانی،بەڵکو نارێك وپێکی و ناشیرینیش دەست ئەکەوێت و خراپییەکان لە باشییەکان زۆرترن-

۹۸٥a

بەم شێوەیە زانایەکی تر((ئەشق ونەبەردی))ئەهێنێتە ئاراوە کە هەریەك لەو دوو هۆکارە یەکێکن لەو شتانە[١]، هەنووکە ئەگەر بڕوای ((ئێمپێدوکلێس) درێژە پێبدەین و بە پێی ماناکەی و نە(بە پشت بەستن بەزمانە قورسەکەی) قبوڵ بکەین (٥)تێئەگەین کە ((خۆشەویستی))((filia)) هۆکاری ((چاکە)) و ((شەڕ=نەبەردی)) هۆکاری خراپەیە، کەواتە لەوانەیە قسەیەکی دروست بێت ،ئەگەر بڵێین کە ((ئێمپێدوکلێس)، بەمانایەك، خۆشەویستی بە هۆکاری (چاکە)و (نەبەردی)بە هۆکاری خراپە زانیوە، ویەکەمین کەسێك بووە کە بڕوایەکی(لەم شێوەیە)ی هەبووە، چونکە هۆکاری هەموو چاکەکان خودی چاکەکانن.

(١٠) تا ئێرە، بەو شێوەیەی کە ووترا، وادێتە بەرچاو کە ئەم زانایانە، دوو هۆکاریان-بەڵام لە واقعدا، بەشێوەیەکی زۆر تاریك و لێڵ-پەی پێ بردووە، کە ئێمە ((هەردوو))کیمان لە کتێبی((لەبارەی سروشت))[٢] دیاری کردووە:(هۆکاری)مادی وسەرچاوەی جووڵە، ئەم زانایانە،هەروەك شەڕکەری نەدۆڕاو لە نەبەردەکاندان، کە بۆ هەر لایەك ئەڕۆن، گورزی توندی خۆیان ئەوەشێنن،(١٥)بەڵام بێ هیچ جۆرە زانستێکی شەڕکردن، وادێتە بەرچاو کە ئەم زانایانەش، نازانن کە چی ئەڵێن، چون، زۆر بە ڕوونی، جگە لە برێکی کەم لەم بنەمایانە بەکار ناهێنن، چونکە ((ئاناکساگۆراس)) ئەقڵ-وەك ئامێرێکی میکانیکی- لە پێکهێنانی جیهاندا بەکار ئەهێنێت و هەر کاتێك لە ڕوون کردنەوەی هۆکاری بوونایەتیەکی پێویستانەی شتێك، بێ توانا ئەبێت(٢٠) قاچی ئەقڵ ئەهێنێتە ناو مەسەلەکە، بەڵام لە بوارەکانی تردا،هەر شتێکی(تر)-بیجگە لە ئەقڵ- بە هۆکاری ڕوداوەکان ئەژمار ئەکات، (ئێمپێدوکلێس) یش،هەرچەند کە زیاد لەوە هۆکارەکانی خۆی بەکارهێناوە، بەڵام (لەبەکارهێنان)یاندا، نەبە ئەندازەیەکی پێویست گرنگی ئەدات وەنە لەم مەسەلەیەدا پەیوستیەك پیشان ئەدات، بەهەر حاڵ، لە زۆرێك لە بوارەکاندا، لای ئەو، ((ئەشق)) ئەبێتە هۆکاری جیا بوونەوە و((نەبەرد))یش ئەبێتە هۆکاری پێکەوە بەستن،(٢٥) چونکە جیهانی گشت، هەر کاتێك کە-بە پاڵنەر نەبەردی-

[١] ئاماژەیە بۆ بڕواکەی((ئێمپێدوکلێس))، سەیری((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))بکەن،لا ٢٤٦ و بەشی ١٥.

[٢] کتێبی((فیزیك))ی ئەرستۆ، کتێبی دووەم، وەرزی سێهەم و حەوتەم.

بۆ توخمەکانی خۆی جیابێتەوە، ئەوکات ئاگر، و هەریەك لە توخمەکانی تر، لە ((یەکێتیەك))دا تێکهەڵکێش ئەبن، و هەر کات ئەوانە، جارێکی تر، بە پاڵنەر خۆشەویستی((ئەشق))، لە((یەکێتیەك))دا پێکەوە کۆببنەوە، بەشەکانی هەر توخمێك، ئەبێت لێك جیا ببنەوە.

((ئیمپدوکلس))یەکەمین کەس بوو کە(٣٠)، بە پێچەوانەی پێشینەکانی خۆی، لە کاتێکدا کە نەتەنیا یەك سەرچاوەی جوولە، بەڵکو بنەما جۆراوجۆر و دژەکانیشی قبوڵ ئەکرد، و دابەش بوونی ئەم هۆکارەی هێنایە ئارا، هاوکات ئەو یەکەمین کەسێك بوو کە لە چوار توخمی مادی قسە ئەکات، بەلاّم ئەو ئەم توخمانەی نەك چوارینانە، بەڵکو بەتەواوی، ((دوانەیی))انە، بەکار ئەهێنا.

٩٨٥b

ئاگر-لە ناوخۆیدا-لەلایەکەوە، و دژەکانی-زەوی و ئاو هەوا- لە لایەکی ترەوە،هەروەك سروشتێك بە((تەنیا-تاقانە)) ئەزانی، لە خوێندنەوەی شیعرەکانی ئەو ئەم خاڵە(بە جوانی) دەرئەکەوێت[1]، بەو شێوەیەی کە ووتمان، ئەم فەیلەسوفە، لە بنەماکان و ژمارەیان ،بەم شێوەیە قسەی کردووە.

بەلاّم((لوکیپوس)) و شاگردەکەی((دموکریتوس))[2] ئەڵێن کە((پڕێتی))و((خاڵیێتی)) بنەمان، و یەکێك لەم دوانەیان بە((ببو)) وە ئەوی تریان بە ((نەبوو)) ئەژمار ئەکرد، لەم دوانە،((ببو-بونەوەر))پڕ و پتەوە، و ((نەبوو-نەبوونەوەر))خاڵی و سستە.

بەم هۆیەوە ئەمان ئەڵێن کە((ببو)) لە((نەبوو)) زیاتر بوونی نیە، چونکە ((تەن)) بونێکی واقعی زیاتر لە((خاڵیێتی)) نیە، ئەمان(١٠) ئەمانەیان وەك هۆکارە مادیەکان ئەژمار ئەکرد، و رێك وەك کەسانێك کە ناوەرۆکی بنەمایی بە (یەك)ێك ئەزانن، و شتەکانی تر لە((لەناو چوونی)) ئەوانەوە دێنە ئارا، و ((سستی)) و((زل و نەرمی))بە سەرچاوەی ئەم لەناوچوونانە ئەزانن، بەم شێوەیە، ئەم زانایانەش، ئەڵێن جیاوازی (ئەتۆمەکان) هۆکاری شتەکانی ترە، بە گوتەی ئەمانە ئەم جیاوازیانە لە سێ شتدایە: شکڵ، ریزبەندی، بارودۆخ ،(١٥) و ئەڵێن کە بونەوەران تەنیا لە((شێوە)) و((پەیوەندی لەگەڵ یەك)) و((مەیل))(سوڕانەوە)دا،جیاوازیان لەگەڵ یەکتری دا هەیە، و لەم نیوانەدا((شێوە)) شکڵە، و((پەیوەندی پێکەوە)) ریزبەندیە، و((مەیل))(سوڕانەوە)

---

[1] لە بەشی ٦٢مەوە، لە((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))،ل٢٥٦.

[2] Demokritos-Leukippos لەبارەی ئەوانەوە سەیری هەمان کتێب بکەن،ل ٤٢٨ بە دواوە.

بارودۆخـه، وەك چۆن Aلەگەڵ N لـە شـکڵ و،AN وNA لـە ریزبەنـدی وZ لـە گـەڵ N لەبارودۆخدا، جیاوازن، بـەڵام ئـەمانیش،-سـاویلکانە-لـە مەسـەلەی جووڵـە، و ئـەوەی کە(جووڵە) لە کوێ وچۆن لە شتەکانەوە دروست ئەبێت،خۆ گێلیان نوواندووە، بەهـەمان شێوەی ئەوانی تر(٢٠).

کەواتە، بەو شێوەیەی کە ووترا، زانایانی پێشوو تا ئەم ئەندازەیە، لەبارەی دوو جۆر هۆکار، توێژینەوەیان کردووە.

"وەرزی پێنجەم"

# پاشکۆی بڕوای فەیلەسوفە کۆنەکان
# - پیتاگۆرییەکان وفەیلەسوفەکانی قوتابخانەی ئیلیئا )

هاوکاتی ئەم فەیلەسوفانە، و تەنانەت پێش ئەمانیش، وەك دەستەواژەیەك (پیتاگۆرییەکان)[1]((فیساگۆرسیەکان)) یەکەمین کەسانێك بوون کە سەرقاڵی بیرکاری بوون و نە تەنیا پێشیان برد، بەڵکو لەبەر ئەوەی توێژینەوەیان لەناودا کردبوو(٢٥) گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ((بنەما بیرکاری))یەکان، بنەمای هەموو بونەوەرانن، و لەبەر ئەوە لەم بنەمایانەدا،((ژمارەکان))،سروشتانە، شتە یەکەمینەکانن، وایان داناوە کە لەواندا (ژمارەکان) زۆر زیاتر(لەوەی کە لە)ئاگر و خاك و ئاو، لەگەڵ ئەو شتانەی کە هەن،ئەهێنرێنە بوون، وەکیەکی ئەبینرێت؛(...(بۆ نمونە) حاڵەتێکی لەم شێوەیە لە ژمارەکاندا (هەر وەك) دادپەروەری، حاڵەتێکی وەك ڕۆح و ئەقڵ و حاڵەتێکیش(لە بڕیاری) فرسەتی گونجاودا(٣٠)،ئەتوانێت هەبێت، و شتەکانی تریش هەر لەسەر ئەم جۆرە پێوانەیە)[2]،و لەگەڵ ئەوەشدا کە بینییان،تایبەتمەندی و پەیوەندی هەنگاوە مۆسیقیەکان لە ژمارەکاندا بەیان ئەکرێن، ولەوێوە کە هەموو شتەکانی تر(هەم)وا ئەهاتنە بەرچاو کە لە سروشت(یان ماهیەت)ی گشتییان هەروەك ژمارەکانن و ژمارەکان

---

[1] ئەرستۆ وادیارە کە خودی((پیتاگۆراس))((فیساگۆرسی)) ی بە کەسایەتیەکی ئەفسانەیی زانیووە.

[2] ئاماژەیە بەوەی کە ((پێتاگۆریەکان)) ئەم شتانەیان هەروەك ژمارەکان ئەزانی و بۆنموونە ((دادپەروەری -٤)) واتە یەکەمین ژمارەی چوارگۆشە ، و ((ڕۆح و ئەقڵ-١)) و ((فرسەتی-هەلی گونجاو-٧)) و ئەوان بەم شێوەیە وێنایان کردووە، بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنای ئەم بڕوایانەی ئەمان بیت،ب.بۆ هەمان کتێب،لا١٧٢ بە دواوە و بەتایبەتی ١٨٥ بە دواوە.

لە هەموو سروشتدا شتە یەکەمینەکانن، ئەمانە وایان وێنا ئەکرد، کە توخمی ژمارەکان، توخمی هەمو شتەکانن،

986a

و هەموو بۆشایی وئاسمانەکان، هەماهەنگیەکی مۆسیقی،((هارمۆنی)) و ژمارەن، و هەرجۆرە وەکیەکی گەلێك کە ئەیانتوانی لە نێوان ژمارەکاندا و هەماهەنگیە مۆسیقیەکان لەگەڵ تایبەتمەندیەکان و بەشەکانی ئاسمان و هەموو سیستەمی جیهانی پیشان بدەن، هەموویان کۆکردەوەو خستیانە سەر یەك، ئەگەر لە شوێنێکیشدا،کەم و کوڕیەك ببێت، بەپەلە شتێکیان ئەخستە سەر تاشێوەی ئیشی خۆیان تێروتەسەل و یەکپارچە لێ بکەن، بۆ نموونە، لەبەر ئەوەی وا وێنا ئەکرێت کە ژمار دە(ژمارەیەکی) تێروتەسەل و کامڵە، و هەموو ژمارەکانی تر لەخۆ ئەگرێت، ئەڵێن(١٠) ئەو تەنانەش کە لە ئاسماندا ئەسورێنەوە (لەژمارەدا)((دە))ن، بەڵام لەبەر ئەوە، ئەوەی کە ئەبینرێت،((نۆ)) دانەیە[1]، تەنێکی دەیی،واتە( هەمان) ((دژی زەوی)){پشیان} داهێنا، من ئەم بابەتە، لە شوێنێکی تر، بە درێژی باس کردووە،[2] بەڵام مەبەستی خوێندنەوە هەنووکەییەکەی من ئەوەیە کە ئەوە بدۆزینەوە لە لای ئەو فەیلەسووفانە چ بنەما گەلێك((قبوڵ کراوبوون)) و لەگەڵ ئەوەشدا (روونی بکەینەوە) کە ئەم(بنەما)یانە، چۆن ئەچنە ریزی ئەو هۆکارانەوە کە ناومان بردوون (١٥)،کەواتە، دیارە کە ئەمانە ژمارەیان بە بنەمای یان ((سەرچاوە)) ئەژمار کردووە،هەم وەك ناوی ((مادە،هیولی))ی شتەکان، هەم بەمانای تایبەتمەندی و بارودۆخیان، لەبەر ئەوە، بە بڕوی ئەوان، یەکەمین توخمی ژمارە، تاك و جووتە، و لەم رووەوە، یەکەمینیان((سنووردار)) و ئەوی تر((بێسنوور))، و یەك(یەکی) لەخۆگری هەردووکیانە،(٢٠)(چونکە هەم جوتە وەهەم تاك)[3]،هەر ژمارەیەك لە((یەك))دروست ئەبێت و هەموو جیهان، وەك چۆن وترا((هۆکارێنراوی))ژمارەکانە.

باقی ئەوانی تری هەرئەم بوارە((واتە پیتاگۆریەکان)) لەسەر ئەو بڕوایەن کە ((دە بنەما))ی یەکەمین بونیان هەیە، و ئەوانەیان لە ریزێکی بەرامبەرکێدا ژماردووە:

---

[1] واتە، زەوی،خۆر، پێنج هەسارەکە(زوهرە،مووشتەری، مەریخ، عەتارد و زووحەل،) و ئەستێرە وەستاوەکان.

[2] ئەرستۆ لێرەدا ئاماژە بۆ نووسراوە وون بووەکەی خۆی ئەکات لە ژێر ناوی ((لەبارەی پیتاگۆریەکان))،کەشتێکی لێ لەبەردەستدا نیە، هەربەم شێوەیە،ب.ب:((لەبارەی ئاسمان))،کتێبی دووەم،وەرزی ١٣.

[3] یان بەو هۆیەی کە بە زیاد کردنی یەك، هەر ژمارەیەکی تاك ئەبێن بە جووت و هەر جووتێك ئەبێت بەتاك (بە پێی ئەم لێکدانەوەی ئەسکەندەر ئەفرۆدیسی) یان بەو هۆیەی کە((پیتاگۆریەکان)) –یەك ١–یان بە بنەمای ژمارە تاك و جوتەکان،زانیووە.

سنووردار–بێسنوور

تاك–جووت

یەك–گشت

راست–چەپ

مێ–نێر

جوولاو–وەستاو

(٢٥)راست–لار

رۆشنایی–تاریکی

چاك–خراپ

چوارگۆشە–لاکێشە

وادێتە بەرچاو کە ((ئالکمایوون))[١]ی خەڵکی((کروتوون)) یش هەربەم شێوەیە لە بابەتەکە تێگەیشتووە، و ئەم ئەندێشەیە،یان ئەو لەوانەوە وەری گرتووە یان ئەوان لە ئەو(٣٠) وەریانگرتووە، چونکە ئەویش تیۆ رگەلێکی زۆر هاوشێوەی ئەوانی خستۆتە ڕوو،و دەبڕیووە، چونکە بە بڕوای ئەو زۆربەی مەسەلە مرۆییەکان ((دوانەیین))، بەلام ئەو وەك ((پیتاگۆریەکان)) دژەکان بەتەواوی دیاری ناکات، بەڵکو بە ڕێکەوت ئەژماریان ئەکات، وەك سپی–رەش، تاڵ–شیرین، چاك–خراپ،گەورە–بچووك.بەم شێوەیە ئەو ئامارژەگەلێکی تارێك و نادیار لەبارەی دژەکان ئەهێنێتە سەر زمان، لەکاتێکدا کە((پیتاگۆریەکان)) روونیان کردۆتەوە، کە دژەکان((چەندن و کامانەن))، ئێمە، لەم دو قوتابخانەیە، ئەم ئەندازەیە ئەتوانین بهەڵهێنجێنین کە دژەکان(tanantia) بنەمای بونەوەرەکانن، بەلام ئەوەی کە ئەو دژانە چەند دانەن وکامانەن، تەنیا لە لای یەکێك لەو دوو قوتابخانەیە ئەبینرێت،(واتە پیتاگۆریەکان)،و لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو مانایەی کە ئەم بنەمایانە، چۆن ئەتوانن بگەرێنرێنەوە بۆ هۆکارە باسکراوەکان، بە شێوەیەکی ڕوون و دیاری کراو، لە لایەن ئەمانەوە باس نەکراوە، بەلام وا دێتە بەرچاو کە ئەم گروپە، توخمەکان بە ((مادی)) ئەزانن، چونکە ئەڵێن، کە ((ناوەرۆك)) لەم توخمانەوە،هەروەك بەشێکی خودەکی(خۆییانە)،تێکەڵ بووەو شکڵێنراوە.

[١] لەبارەی ئەو،ب.ب: ((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))،لا٢٢٦ بە دواوە.

لـەم تێبینیانــەوە، شـێوازی ئەندێـشەی فەیلەسـووفە کۆنــەکان کـە لـە زۆربــەی توخمەکانی سروشت قسە ئەکەن، ئەتوانین تێبگەین.(١٠) بەڵام ،هاوکات کەسانێك بوون کە لەبارەی جیهانەوە قسەیان کردووە کە وەك بڵێی تەنیا((یەك)) سروشتی تاقانە بوونی هەیە، هەرچەندە هەموو ئەوانە، نە لە روانگەی دروستی بۆچوونیانەوە و نە لە روانگەی هەماهـەنگی و وێکـچوون لەگـەڵ مەسـەلە واقعیـەکانی سروشـت، یەکسان و(وەك یـەك) نەبوون،بـەڵام خۆسـەرقاڵ کـردن بـەم زانایانـەوە، بـەهیچ شـێوەیەك، پەیوەنـدی نیـە بـە توێژینەوە هەنووکەییەکەی ئێمەوە لە بارەی هۆکارەکان، چونکە ئەمانە، وەك هەندێك لـە سروشـت ناسـەکان، بونـەوەر بـە(( تاقانـە)) نـازانن(١٥) هەرچەنـدە ئـەو لـە((یەکێکـەوە))- هـەروەك مـادە-دروسـت ئەکـەن(ئەهێننـە بـوون)، بـەڵکو بـە شـێوەیەکی تـر قسە ئەکـەن، چونکە ئەوان(سروشت ناسان)، کاتێك کە بە دەست بە(تیۆریەی) دروسـت بوونی جیهـان ئەکەن، جوڵە(بۆ ئەو تیۆرە) زیاد ئەکەن، بەڵام ئەمان ئەڵێن کە(جیهان) نەجووڵاوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا، (بـە سـەرنجدانی ئـەم زانایانـە) بـە توێژینـەوە هەنوکەییەکـەی ئێمـە، تـا ئـەم ئەندازەیـــە پەیوەســـت ئـــەبێت (کـــە بخرێتـــە ژێـــر ئامـــاژەی ئێمەوە،بـــەم درێژیەشـەوە):((پارمێنیـدێس)) کـە وادێتـە بەرچـاو ((یـەك henos)) لەسـەر بنـەمای ماناکەی پەی پێ ئەبات، بەڵام (پـەی بردنـی)((مێلـسوس))[1](٢٠)(هـەر لـەم یەکـە) لەسـەر بنـەمای مادەیـە، بـەو هۆیـەوە ئـەو ئـەڵێت یـەك، کـە سنووردارە و ئـەم ئـەڵێت یـەك، لەبەر ئـەوەی کـە بێسنوورە[2]، لە کاتێکدا کـە((کێـسنوفانێس))[3] کـە لـە نێـوان لایـەنگرانی ئـەم (تیۆرەی) یەکە، یەکەمین کەس بوو(چونکە ئەڵێن کە پارمنیدس شاگردی ئەو بووە) لـەم بارەیەوە بۆچوونێکی ڕوونی نەخستۆتە ڕوو، و(لەگەڵ ئەوەشدا) وا نایەتە بەرچاو کە پـەی بـە سروشـتی((یـەك)) بردبێـت لـە هـیچ یـەك لـە ماناکانـدا، ئـەو، تـەنیا، بەسـەرنجدانی ((تـەواوی ئاسمـان وبۆشـایی))(٢٥) ئـەڵێت کـە ((تـاك=تاقانـە=تـەنیا))(to hen) خـودای، وەك چۆن کە گووترا، لە توێژینەوە هەنووکەییەکەی ئێمەدا، لەم زانایانە-بەتایبـەتی ئـەو دوونەفـەرە-((کێـسنوفانێس و ملیـسوس)) کـە لـە بۆچوونیانـدا بەتـەواوی نـەکووڵاون- ئـەتوانین چاوپۆشـی بکـەین، چـونکە لـە کاتێکـدا کـە لـەو باوەڕەدایـە کـە((نـەبوو)) لـە بەرامبەر((ببوو)) هیچ بەهایـەکی نیـە، ئـەڵێت کـە((بوونـەوەر پێویـستیانە ((یـەك))ێکـە)) و

---

[1] Melissos: خەڵکی ((ساموس)) لەبارەی ئەو.ب.،بۆ هەمان کتێب،لا ٣٢٩ بە دواوە.

[2] بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەرستۆ: ((لەبارەی سروشت))،کتێبی یەکەم،وەرزی دووەم،٣٢ a١٨٥ تا٣ b١٨٥،و کتێبی سێهەم،وەرزی شەشەم٧-a١٥ ٢١٠.

[3] لەبارەی ئەو،ب.ب. بۆ هەمان کتێب،لا١٥٤ بە دواوە.

هیچ شتێکی (تر نیە)(٣٠)، (ئێمە لەم بارەیەوە، لەبەرهەمەکەی خۆماندا((لەبارەی سروشت)) روونتر قسەمان کردووە)[1] بەڵام لەوێوە کە ناچار بوو لەگەڵ دیاردەکاندا هەماهەنگی بکات،و لەگەڵ ئەوەشدا وای ئەگریماند کە((یەك)) لەسەر بنەمای مانا بونی هەیە بەڵام لەسەر بنەما وبەپێی پەی بردنە هەستەکیەکانمان زۆرە(گشت)ە، جارێکی تر دوهۆکار و دووبنەمای هێنایەوە ئارا، گەرم و سارد، یان بەدەربڕینێکی تر،((ئاگر و خاك))(زەوی)، و لەم نێوانەدا گەرم بە((ببوو-بونەوەی)) و سارد(ی) بە ((نەبوو-نابونەوەی))ئەژمار ئەکرد.

لە (کۆمەڵەی) ئەوەی کە گووترا، و لەگەڵ ئەوەشدا لە بیرکردنەوەی ئەو دانایانەی کە لەگەڵماندا کەوتنە راوێژ، ئەم ئەندازەیەمان دەست کەوت: لە یەکەمین فەیلەسوفەکانەوە فێر بووین کە بنەمای یەکەم و پێشین،جەستەیی(تەنی)یە،(چونکە ئاو ئاگر و نموونەی ئەوانە هەموی تەنن)(٥) و لەنێوان ئەم فەیلەسووفانەدا هەندێك تەنیا(بە) یەك بنەمای جەستەیی و ئەوانی تر(بە) چەندین بنەمای جەستەیی رازی بوون، بەڵام هەردوو گروپ، ئەم بنەمایانەیان بە مادی ئەژمار ئەکرد،ئەوانەی تریش کە هۆکارێکی لەم شێوەیەیان قبوڵ ئەکرد، سەرچاوەی جووڵەشیان ئەخستە سەر،- کە بە بڕوای هەندێ یەکێك و بەبڕوای هەندێکی تر دودانەن- بەم شێوەیە تا ((قوتابخانەی ئیتالیا))[2] و(قوتابخانە) سەربەخۆکانی،قسەی فەیلەسووفەکان لەم بارەیەوە(١٠) نادیارە، بەدەر لەوە، بەهەمان شێوە کە ووتمان، ئەمانە دوو هۆکاریان بەکار هێنا،و یەکێك لەمانە-واتە سەرچاوەی جووڵە-هەندێك بە یەکێك و ئەوانی تر بە دوو دانەیان ئەزانی، بەڵام((پیتاگۆریەکان)) کە هەر بەم شێوەیە، قسەیان لەسەر دوو بنەما ئەکرد، ئەمەشیان- کە تایبەتە بەخۆیان- خستۆتە سەری،(١٥) کە ((سنووردار))و((بێ سنوور))دوو سروشتی جودا لەیەك نین(بۆ نموونە ،وەك ئاگر و خاك، یان شتێکی تری لەم شێوەیە)، بەڵکو خودی((سنووردار))و خودی ((یەك-تاك-تەنیا)) ناوەرۆکی ئەوشتانەن کە بەسەر ئەوانەوە هەڵئەگیرێن. و لێرەوەیە کە ((ژمارە))یان بەناوەرۆکی هەموو شتەکان ئەزانی، و بەم شێوەیە دەربڕینی ئەوان لەم بارەیەوە،(٢٠) ئەمان هاوکات توێژینەوەو پێناسەی((چییەتی ،چیی یی ti estin) یان دەست پێکرد، بەڵام زۆر بە سادەیی دەستیان دایە، پێناسەکانی ئەوان زۆر رووکەشانە بوون، و وایان وێنا ئەکرد ئەوەی کە پێناسە لەبەر چاوەکەی لەسەر

---

[1] کتێبی((فیزیك))،کتێبی یەکەم، وەرزی سێهەم.

[2] مەبەستی لە((پیتاگۆریەکان))ە ،چونکە((پیتاگۆراس-فیساگۆراس)) قوتابخانەکەی لە شاری((کروتون))لە((ئیتالیا)) بوونیاد نابوو.

**هەڵنـەگرێت، نـاوەرۆك یـان ماهیـەتی ئەوشـتەیە، بـەو شـێوەیەی کـە کەسـێك بڵێـت ((دووبەرابەر و دوو وەکیەك))چونکە(٢٥) (دوو یەکەمین)) شتێکە کە ((دووبەرامبەر))ی لەسەر هەڵنەگیرێت، بەڵام ((دووبەرامبەر بوون)) و((دوو بوون)) بە دروستی یـەکێك نین، ئەگەر بەم شێوەیە بێت،((یەك))، زۆر نەبێت، و ئەمە لەواقعدا هەمان ئەو ئەنجامەیە کە ئەمان گرتبوویان.**

**لە فەیلەسوفەکانی پێشتر و ئەوانی تر، تا ئەم ئەندازەیە،ئەتوانی فێر بیت.**

"وەرزی شەشەم"

# ( تیۆریەی ئەفلاتوون لەبارەی بنەماکانەوە )

لەدوای ئەو فەلسەفانەی کە ناویان برا،فەلسەفەکەی((ئەفلاتوون)هات(٣٠)،کە لە زۆر ڕووەوە پەیڕەوی لەو زانایانە ئەکرد،بەڵام هاوکات چەند تایبەتمەندیەکی لە بەرامبەر فەلسەفەی((ئیتالیا))پیشان ئەدا، ئەو لە لاوێتی دا،یەکەمجار ئاشنای((کراتولوس))[١] و بڕواکانی((هراکلاتیوس)) بوو، کە ئەیانووت هەمو شتەکان((هەست پێکراون))، هەمیشە، لەحاڵەتی گوزەردان و هیچ جۆرە زانستێك (یان مەعریفەیەك) پەیوەست نابێت پێیانەوە، ئەو لەساڵەکانی دواتریشدا، هەر ئەم بڕوایەی هەبوو، بەڵام((سوقرات)) سەرقاڵی مەسەلە ئەخلاقیەکان بوو، خۆی سەرقاڵی سروشت-لە گشتایەتیەکەیدا- نەدەکرد،
٩٨٧b

بەڵکو لە گەڕانێکی گشتی (to katholou) دا بوو لەو بوارەدا،و یەکەمین کەسێك بوو کە ئەندێشەی خستە ناوچەقی پێناسەکانەوە،((ئەفلاتوون)) پەیڕەوی لەو ئەکرد(٥) و گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پێناسە پەیوەستە بە شتەکانی تر و بەدەرە لە هەست پێکراوەکان، چونکە پێناسەیەکی گشتی وهاوبەش لە هەست پێکراوەکان، کە هاوکات لە لەناوچوون و گۆڕاندان، ناتوانین بدەین بەدەستەوە، هەنووکە ئەو ئەم شتانەی کە لە جۆرێکی ترن ناو ئەنێت ((ئایدیا idea) کان، و ووتی کە هەموو شتە هەست پێکراوەکان بەدوایانەوە، وبە هۆی پەیوەندبوونیان بەوانەوە، ناو ئەنرێن،(١٠) چونکە زۆربەی بونەوەرەکان، وەك بەشداریەك (methexis) لەو (ئایدیە)یانەی کە هاوناوی ئەوانن، بونیان هەیە، لەم نێوانەدا، تەنیا دەستەواژەی یان ناوی((بەشداری-هاوبەشی))

---

[١] Kratylos،یەکێك لە پەیڕەوانی ((هراکلایتۆس))،((ئەفلاتوون)) بەناوی ئەوەوە دیالۆگێکی ڕێك خستووە.

تازەبوو، چونکە ((پیتاگۆریەکان)) ئەیانووت کە بونەوەران (ta onta) لە لاسایی کردنەوەی ژمارەکانـدا بونیان هەیە، و((ئەفلاتوون)) ئەیووت لە ((بەشداری-هاوبەشی))،(و) ئەمەش تەنیا گۆرانێکە لەناودا، بەلام ئەمان ئەم پرسیارە کە((بەشداری)) یان((لاسایی)) چیە ، بە بیٚ وەلام ڕەها کرد، بەدەر لەمەش، ((ئەفلاتوون)) ئەلێت کە لە پال هەست پیٚکراوەکان (١٥) و((ئایدیەکان)) چەند شتێکی بیرکاریانە بوونیان هەیە، کە خاوەنی باروذۆخی نێوەنجین، وەهەم لەگەل هەست پیٚکراوەکانیشدا جیاوازن، چونکە جاویدان و نەجوولاون، و لەگەل ئەوەشدا لەگەل((ئایدیەکاندا))جیاوازن، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە شتە بیرکاریەکان وەك یەك دەست ئەکەون، هەنووکە هەر ئایدیەیەك بۆ خۆی یەکێکە و(هاوشێوەیەکی نیە).

هەنووکە، لەوێوە کە ((ئایدیە))کان هۆکاری شتەکانی ترن، ئەو وای وێنا ئەکرد کە توخمەکانی ئەوان، توخمی هەموو بونەوەرەکانن،(٢٠)هەروەك مادە((گەورە و بچووك))، وهەروەك ناوەرۆك(یان ماهیەت) (یەکی=تاکی=تەنیایی)یە و ئەمانە بە بنەما ئەژمار ئەکران، چونکە ژمارەکان بە هۆی((بەشداری)) لە((یەك))دا،لە ((گەورەو بچووکی)) پێکدێن، لەوەی کە((یەك)) ناوەرۆکە، نەك هەلگیراوی بوونەوەرێکی تر، و لەگەل ئەوەشدا لەوەیدا کە ژمارەکان هۆکارەکانی بونی هەر یەك لە شتەکانی ترن، تیۆریەکەی ئەو هاوشێوەی بڕوای ((پیتاگۆریەکان))ە،(٢٥) بەلام لەوەیدا کە ئەو لە جیاتی((بێسنووری))تاقانە،((دوانێتی)) دائەنێت، و((بێسنور)) لە((گەورەو بچووکی)) ئەهێنێتە بون، ئەمە تایبەتمەندیەکی ئەوە، تایبەتمەندیەکی تری ئەو ئەمەیە کە ئەلێت((ژمارەکان)) لە پال، و سەربەخۆ لە هەستپێکراوەکان، بونیان هەیە، لە کاتێکدا کە ((پیتاگۆریەکان)) ئەلێن کە خودی شتەکان، هەمان، ژمارەکانن، و شتە بیرکاریەکان لە شوێنە نێوەندیەکەی ئایدیەکان و هەست پیٚکراوەکاندا دانانێن (٣٠)بەلام ئەوەی کە ئەو- نەك وەك پیتاگۆریەکان-((یەك))و((ژمارەکان)) جیا لەیەك و لەپال شتەکاندا دائەنێت، و لەگەل ئەوەشدا((ئایدیەکان)) ئەهێنێتە ناو مەسەلەکە، هەموویان بەدەر لە توێژینەوەی ئەو لەبارەی پێناسەکان یان ماناکان بووە(چونکە فەیلەسوفەکانی پێشوو خۆیان سەرقالی ((دیالێکتیك))نەکردووە) وئەوەی کە ئەو، ئەو سروشتەی تری (لەپال "یەك" بوون) بە((دوانێتی))جیگیر کرد، بەم هۆیەوە ژمارەکان لە یەك قالب-جگە لەوانەی کە بنەمایین- ئەتوانین لە((دوانێتی)) بهێنینە بوون، بەلام ئەوەی کە لە واقعدا ڕوو ئەدات پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە ئەم تیۆرە مەنتیقی و ئەقلانی نیە، ((ئەفلاتوونیەکان)) زۆرێك لە شتەکان لە مادە ئەهێننە بوون، لەکاتێکدا کە ((ئایدیە))

تەنیا یەكجار ئەمێنێتە بوون، بەلاَم ئێمە تێبینی ئەكەین كە لە ((تەختەیەك))(مادەیەك) تەنیا یەك مێز دروست ئەكرێت،هەرچەندە پیاوێك كە ((شێوەیەك to eidos)ی ئەخاتە سەر-لەگەلْ ئەوەشدا كە خۆی یەكێكە-(٥) چەندین مێز دروست ئەكات، پەیوەندی ((نێر))بە((مێ))ش هەر بەم شێوەیەیە، چونكە ئەمیان بەهۆی كاریگەری جووتبوونێكەوە-یەك جووت بوونەوە- ئاوس ئەبێت، بەلاَم ((نێر))ێك ئەتوانێ چەندین((مێ)) ئاوس بكات، لەگەلْ ئەوەشدا ئەم پەیوەندیانە هاوشێوەی ئەو بنەمایانەن، بڕواكانی ئەفلاتوون لەبارەی توێژینەوەكەی ئێمە بەم شێوەیەن، لەوەی كە گووترا، دەرئەكەوێت كە ئەو تەنیا دوو هۆكاری بەكار هێناوە[1]،((چیەتی ti esti)) و ((هۆكاری مادی kata ten hulen).(١٠) چونكە ((شێوەكان)) هۆكاری چیەتی شتەكانی ترن، بەلاَم((یەك)) هۆكاری چیەتی شێوەكانە، هاوكات لەبارەی مادە وەك بابەت- كە لەلایەكەوە شێوەكان لە هەست پێكراوەكاندا، تێیدا هەلْئەگیرێن، لە لایەكی ترەوە((یەك)) لە پەیوەستی لەگەلْ شێوەكان- ئەو ئەلْێت كە ئەو(مادە)((دوانەییە))، ((گەورەو بچووك))،زیاد لەمەش، ئەو هۆكاری چاكەو هۆكاری خراپە ئەداتە پالْ توخمەكانەوە، بەو شێوەیەی كە ووتمان، ئەمە هەمان ئەو ئیشەیە كە هەندێك لە فەیلەسووفەكانی پێشتر- وەك ئێمپیدۆكلێس و ئاكساگوراس- كردبوویان.[2]

[1] ((ئەفلاتوون)) لە نووسینەكانی خۆیدا چەندین جار ئاماژەی بە((هۆكاری بكەری))-لە سوفیستێس،٢٦٥B-D، تیمایۆس،٢٨C بەدواوە- و هەروەها ((هۆكاری ئامانجی))( لەفیلێبوس ٢٠D و٥٣E، و تیمایۆس،٢٩D بە دواوە) كردووە، بەلاَم وادیارە كە ئەرستۆ ئەم ئاماژە كردنەی ئەو بە شتێكی گرنگی نازانێت.

[2] بەراورد بكرێت لەگەلْ ١٩-١٥ ٩٨٤b و ٩٨٥a٣.

## "وەرزی حەوتەم"

# ( فەیلەسووفەکانی پێشووتر و هۆکارە چوارینەکان-علل اربعە )

ئێمە، لەواقعدا، تەنیا قسەیەکی کورت و گووشێنراو وگشتیمان لەبارەی زاناکانەوە کردووە، کە باسیان لە لێواری ((بنەما یەکەمینەکان)) و((راستێتی)) (بوون) کردووە، بەم هەمووەشەوە، تا ئەم ئەندازەیە لەوانەوە فێر بووین، (٢٠) کە لەو کەسانەی کە لەبارەی ((بنەما))و((هۆکار))ەوە ئاخافتوویانە، هیچ یەکێکیان خۆی سەرقاڵی جۆرێکی تر بەدەر لەوەی کە ئێمە لە کتێبی((لەبارەی سروشت)) دیاریمان کردووە[١]، نەکردووە،بەڵام هەموویان، بە روکەش، ئاماژەیەکیان بۆی کردووە، هەرچەندە زۆر لێڵ و نادیارە، چونکە هەندێکیان بە شێوە((هەروەك بنەما-شێوەی بنەما)) باس لە((مادە)) ئەکەن، کە یەك یان چەند بنەمایەك-جەستەیی یان ناجەستەیی-یان هێناوەتە ئارا، بە شێوەیەك کە بۆ نموونە،((ئەفلاتوون)) قسە لەسەر((گەورە و بچووك)) ئەمێنێتە ناوەوەو، و فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی ((ئیتالیا)) لە((بێ سنوور))(قسە ئەکەن) و ((ئیمپیدوکلیس)) لە((ئاگر و خاو و ئاو هەوا)) و ((ئاناکساگۆراس)) لە(( ناکۆتایی مادە(هومویومێرێە) (هاو-بەشەکان)...))ئەکات، هەموو ئەمانە ئەم جۆرە هۆکارەیان پەی پێ بردووە، وهەر لەبەر ئەمەشە هەموو ئەو کەسانەی کە لە هەوا(٣٠) ،ئاگر وئاو یان شتێکی تر کە رەقتر لە ئاگر و ناسکتر لە ئاوە ، قسەیان کردووە، چونکە هەندێکیش وتویانە کە ((توخمی یەکەمین ))چیە، بەم شێوەیە ئەمانە تەنها لەم تاقە هۆکارە تێگەیشتوون، بەڵام هەندێکی تر(سەرچاوە)بنەمای جوڵەشیان خستۆتە ڕوو، بۆ نموونە،

---

[١] سەیری کتێبی((سروشت))،کتێبی سێیەم، وەرزی ٣و٧ بکەن.

هەموو ئەو کەسانەی کە((هاورێیەتی))و((دوژمنی)) یان ((ئەقڵ)) و ((ئیشق)) یان بە بنەما داناووە، بەڵام هیچ کامیان ((چیەتی)) یان ((ناوەرۆك))یان بە شێوەیەکی دیاری کراو دیاری نەکردووە،(٣٠) زیاد لە هەموو ئەمانە، کەسانێك ئاماژە بۆ (بابەتی چیەتی و ناوەرۆك) ئەکەن کە باوەڕیان بە ((ئایدیە)) هەیە.

٩٨٨b

چونکە ئەمانە نە((ئایدیە)) بە مادەیەکی هەست پێکراو وەنە ((یەك)) بە مادەی((ئایدیە)) ئەزانن،( چون ئەڵێن کە ئەمانە هۆکار گەلێکی نەجووڵاو و ئارام و وەستاون) بەڵکو((ئایدیە)) بە چیەتی هەموو شتەکانی تر و ((یەك)) بە چیەتی (یان ماهیەتی)((ئایدیەکان)) ئەژمار ئەکەن.

ئەمانە ئەڵێن کە((ئەوەی لەبەر ئەو))(یان ئامانجی کۆتایی، to hou hebeka) کردار و گۆڕانەکان ڕوو ئەدەن، بە مانایەکی تر،هۆکارە، بەڵام نەك بەو مانایەی کە سروشتی ئەو بەو شێوەیەیە کە هۆکار بێت، چونکە کەسانێك کە لە ئەقڵ یان هاورێیەتی قسە ئەکەن، ئەم هۆکارانە هەروەك(یان بە هەروەکی) شتێکی باش ئەژمار ئەکەن، بە بوونی ئەمەش ناڵێن کە هەر بوونەوەرێك کە هەیە یان دێتە بوون،((لەبەر ئەوانە))(١٠) بەڵکو بەو شێوەیەیە کە وەك بڵێی جوڵەکان لەمانەوە دێنە بوون، هەرلەبەر ئەمە، کەسانێك کە ئەڵێن((یەك)) یان بوونەوەری سروشتی لەم جۆرەیە ( واتە چاکە)، ئەڵێن کە ئەمی هۆکاری ناوەرۆکە، بەڵام ناڵێن کە بونایەتی یان دروست بوونی ناوەرۆك ((لەبەر ئەوە))، کەواتە ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە ئەمانیش هەم ئەڵێن و هەم ناڵێن کە ((چاکە)) هۆکارە (١٥)،لەبەر ئەوە، نەك بە شێوەیەکی ڕەها، بەڵکو بە((وەرکەوتانە))بە هۆکار ئەژمار ئەکەن.

لەبەر ئەمە، وادێتە بەرچاو کە ئەم زانایانە، لەبەر ئەوەی نەیانتوانیوە دەستیان بە هۆکارێکی تر بگات، شایەتی ئەوە ئەدەن کە ئێمە، هۆکارەکان، چ لە ڕوانگەی ژمارەوە و چ لە ڕوانگەی جۆرەوە، بە دروستی دیاریمان کردوون، زیاد لەمەش، ڕوونە کە هەموو بنەماکان یان(هۆکارەکان) یان بەم شێوەیە، یان بە شێوەیەکی هاوشێوەی ئەوە، ئەبێت بە دوایاندا بگەڕێین، بەڵام ئێستاکە (٢٠) با خۆمان سەرقاڵی،دژوارییەکان،(مەسەلە قورسەکان،tas aporias) بکەین کە لە چۆنایەتی گووتاری هەریەك لەم زانایانە، لە بارەی بنەماکان، و شوێنگەی ئەو لە بەرامبەریان،بەدەر نابێت.

## "وەرزی هەشتەم"

# ( رەخنە لە بڕوای فەیلەسووفە پێشینەکان- پێش ئەفلاتوون )

هەموو ئەوانەی کە جیهانی گشت بە((یەك)) ئەزانن و مادە بە سروشتێك (یان شتێك)ی دیاری کراو جێگیر ئەکەن ، کە جەستەییە و خاوەنی قەبارەیە، بە ڕوونی، لە چەند روانگەیەکەوە، دووچاری گومڕایی بوون، چونك ئەمانە تەنیا توخمەکانی شتە جەستەییەکان، ئەژمار ئەکەن، نەك شتە ناجەستەییەکان(٢٥) وەهەروەکە لەگەڵ ئەوەشدا شتە ناجەستەییەکانیش بونیان نیە، ولەکاتێکدا کە هەوڵ ئەدەن هۆکارەکانی ((بونیادنان و لەناوچوون)) بخەنە روو، و هەموو شتەکان سروشتناسانە روون ئەکەنەوە، هۆکاری((جووڵە)) ئەخەنە لاوەو و هەڵەی تری ئەمانە لەوەدایە کە ناوەرۆك یان چیەتی(to ti esti) ناکەنە هۆکاری شتێك، و لەگەڵ و لەوەشدا کە بەئاسانی هەریەك لە تەنە سادەکان-جگە لە خاك- بە بنەمای یەکەمین ئەژمار ئەکەن، کە پەیدا بونیان، لە یەکتری ،چۆن روو ئەدات، مەبەستم ئاگر و ئاو خاك و هەوایە، لەمانە، هەندێکیان، بەهۆی کاریگەری تێکهەڵکێشی، و هەندێکی تر بە کاریگەری لێك جودا بوونەوە، دروست ئەبن، و ئەمە گەورەترین جیاوازی پێشکەوت و دواکەوتی ئەوانە(٣٠)

٩٨٩a

چونکە لە روانگەیەکەوە ،جەستەیەك ئەتوانین بە بنەماترین (یان سەرەتایترین) بزانین، کە هەموو شتە یەکەمینەکانی تر لەوەوە دروست ببن، و ئەمەش ، ئەو جۆرە تەنەیە(جەستەیە) کە ناسکترین و بچوکترین و بەشەکی ترین تەنە (mikromerestaton) لەبەر ئەمە ئەو کەسانەی کە ئاگر بە یەکەمین بنەما ئەژمار ئەکەن، زۆرترین هەماهەنگیان بەم تیۆرە داوە، بەڵام هەریەکە لە زاناکانی تریش رازیە

(٥) بەوەی کە توخمی تەنەکان(جەستەکان) لەم جۆرەیە، بەلایەنی کەمەوە هیچ یەك لەو کەسانەی کە ناوی توخمێکیان بردووە، خاکیان، لەوانەیە بە هۆی گەورەیی و قەبەیی بەشەکانی، بە توخمێك ئەژمار نەکردووە، بەلاّم هەریەکە لە سێ ڕەگەزەکەی تر پاڵنەرێکیان هەبووە، هەندێ ئاگر، هەندێك ئاو هەندێکی تر هەوایان وەك توخمێك ئەژمار کردووە، بەلاّم بۆ چی وەکو زۆربەی مرۆڤەکان، ناوی خاك(زەوی)یان نابەن؟ (١٠) چونکە ئەو (گروپە مرۆڤە) ئەڵێن کە هەموو شتێك(لە) خاکە.((هسیودوس))(هریود)یش ئەڵێت کە زەوی یەکەمین تەنێکە کە هاتە ئارا[1]، ئەم تیۆرە، زۆر کۆنەو لەنێوان تەواوی خەڵکی دا باوە، لەسەر بنەمای ئەم تیۆرە، ڕاستی لای هیچ کەسێك نیە، کە یان ئەڵێت هەریەك لە باقی توخمەکانی تر–جگە لە ئاگر– بنەماییە، یان گریمانەی شتێك ئەکات کە ڕەقتر لە هەوا و نەرمترە لە ئاو،(١٥) لەلایەکی ترەوە ئەگەر ئەوەی لەسەر بنەمای(پەیدا بون) لە دواوەیە، لەسەر بنەمای سروشت لە پێشتر ئەبێت، و ئەوەی گووشێنراوو تێکهەڵکێشە،لەسەر بنەمای پەیدا بوون لە دواوەیە، لەو شێوەیەدا بە پێچەوانەی ئەوەی کە ووتمان ئەبێت دروست بێت، واتە ئاو ئەبێت لە پێش هەواو خاك لە پێش ئاوەوە بێت، ئەمەش لە بارەی ئەو کەسانەی کە بەو شێوەیەی کە ووترا، یەك هۆکاریان دیاری کردووە،

ئەمەش ڕاستە، ئەگەر کەسێك چەندین (هۆکار) بە (بنەما) بزانێت، بۆ نموونە وەك((ئیمپیدۆکلیس)) کە ئەڵێت(٢٠) هەر چوار تەنی مادە، شتەکان دروست ئەکەن، چونکە ئەویش، پێویستانە ڕووبەڕوی ئەنجامەکان ئەبێتەوە کە هەندێك(لە) هەمان جۆرن، کە ئێمە ئاماژەمان کرد، وهەندێکی تر تایبەت بە خودی ئەو، چون ئێمە ئەبینین کە شتەکان لە یەکتریەوە دروست ئەبن، و ئاگر و خاکیش، هەمیشە، هەمان بەو((تەنی،جەستەییە))ی کە بوون، نامێننەوە،(من لەبەرهەمەکەی خۆمدا لەبارەی سروشت، لەم بارەیەوە، توێژینەوەم کردووە)[2](٢٥) بەلاّم لە ڕوانگەی هۆکاری شتە جووڵاوەکان و ئەوەی کە ئایا ئەبێت قایل بین بە((یەك یان دوو))(لەو هۆکارانە)، نابێت وادابنێین کە بڕواکەی ئیمپیدۆکلیس بە دروست یان بە ئەقلاّنی بزانین، بە شێوەیەکی گشتی، لە ڕوانگەی کەسانێك کە بەم شێوەیە قسە ئەکەن،((گۆڕانی چۆنێتی)) پێویستانە لەناو ئەچێت، چونکە، لەسەر بنەمای ئەم بڕوایە، سارد لە گەرم و گەرم لە سارد نایەتە

---

[1] ((تئۆگۆنیا))،١١٦،بەراوردی بکەن لەگەڵ ٢٨ ٩٨٤b.

[2] ب.ب،((لەبارەی ئاسمان)){De Caelo} ،کتێبی سێهەم،وەرزی ٧، و بۆ((لە لێوارەکان دروست بوون و لەناوچوون))کتێبی دووەم،وەرزی ٦.

بوون، چون ئەگەر بەم شێوەیە بووایە، ئەبێت شتێك بە دەست بهاتایە، كە ئەم شتە دژانە لە خۆیدا قبوڵ بكات، و لەو شێوەیەدا سروشتێك بوونی ئەبوو كە هەم ئاگر و هەم ئاو- هەردوكیان-بەدەر ئەبوون لێی، بەلاَم ((ئێمپیدۆكلیس)) شتێكی لەم شێوەیە ناڵێت.

(٣٠)بەو شێوەیەی كە كەسێك قبوڵ بكات((ئاناكساگۆراس)) باسی لە دوو توخم[1] كردووە،ئەم گریمانەیە ئەتوانێت، بەوەی كە ئەو رازی نەبوە پێی، بەلاَم لە درێژەی رێنوێنیەكانی ئەوانی تر،قبوڵی كردووە،بەتەواوی هەماهەنگ بێت، چونكە ئەوەی كە بڵێین هەمو شتێك لە سەرەتاوە تێكهەڵكێش بووە، بە چەند بەڵگەیەك ، بێمانایە، بەتایبەتی ئەوەی كە لە ئەنجامی ئەوەدا ئەبێت بڵێین كە لە پێش ئەوە، شتەكان لە حاڵەتی تێكهەڵكێشیدا(amikta) بوونیان هەبووە، و لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی ئەوەی كە تێكهەڵكێشی شتێكی رێكەوت لەگەڵ رێكەوتێكی تر، پێچەوانەی سروشتە، و دیسانەوە لەبەر ئەو هۆیەی كە رووداو روداوەكان، لە ناوەرۆكەكان، جیا بوون( چونكە لەوەیدا كە تێكهەڵكێشی هەیە، وەك پێویستیەك، جیابونەوەش بوونی هەیە) لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر كەسێك دوای تیۆرەكەی ئەو بكەوێت، ومەبەستی قسەكەی ئەو(٥) رون بكاتەوە لەوانەیە بڕواكانی ئەوی بە(تازەتر ونوێتر) دەست كەوێت،چونكە تا كاتێك كە هیچ شتێك جیا بووەوە نیە، روونە كە لەبارەی ئەو ناوەرۆكەشەوە ناتوانین هیچ بڵێین، بۆ نموونە( ناتوانین بڵێین كە ئەو ناوەرۆكە) ئایا سپی یان رەش یان قاوەیی یان بە رەنگێكی تر بووە، بەڵكو وەك پێویستیەك (بڕوا لەسەر) بێرەنگیەكەی جێگیر ئەبێت، ئەگەرنا (بە ناچاری) یەكێك لەم رەنگانەی هەبوو.(١٠) و بەم هۆیەوە، لەسەر بنەمای ئەم بەڵگەیە، ئەو ناوەرۆكە بێ تامیش دەبوو، و لەگەڵ ئەوەشەدا هیچ یەك لە چۆنایەتیەكانی وەك ئەوی نەدەبوو، چونكە نە چۆنایەتیەكی هەبوو وە نە چەندایەتیەك، و نە شوناسێك( یان بە دەربڕینێكی وردتر: نە چیەتیەك (ti esti)...)،و بەدەر لەم بارودۆخە، یەكێك لە شێوە تایبەتە لە بیركراوەكان(لە دێرەكانی پێشەوە) پەیوەست ئەبوو بەوەوە، و ئەمەش بۆخۆی ئەگەری نەدەبوو، چونكە هەموو شتەكان تێكهەڵكێش بوون، ئەگەرنا شێوە تایبەتەكە پێشتر جودا بوو، بەلاَم ئەو ئەڵێت كە(١٥)((هەموو شتەكان تێك هەڵكێش بوون جگە لە ئەقڵ، تەنیا ئەقڵ تێكهەڵ نەكێشراو و پەتی بوو))[2]هەنووكە ئەنجام ئەوەیە كە ئەو ئەڵێت ((بنەماكان))((تاك))(چونكە ئەم سادەو تێكهەڵنەكێشراوە) و ((ئەوی تری

---

[1] واتە: ئەقڵ و تێكهەڵكێشێك لە((متشابهە الجزء )){هومویومیریە كان}

[2] سەیری ((یەكەمین فەیلەسووفەكانی یۆنان)) بكەن ،لا ٢٩٩،لەتی ١٢.

thateron))ن، کە (ئەمە خۆی) بە شێوەیەکە کە بڵێین((دیاری نەکراوی aoriston))
پێش((دیاری کراوی)) بوونی هەیە و هاوڕێیە لە یەك شێوەدا،لەبەر ئەمە، گووتەکەی ئەو نەدروستەو نەڕوونە، بەڵام مەبەستەکەی ئەو شتێکە هاوشێوەو نزیك بە گووتەی ئەوانەی دوایی(٢٠)، وئەوەیە کە هەنوکە تەندروستیەکەی بۆ ئێمە ڕوونە و ئاشکرایە.

بەڵام ئەم فەیلەسووفانە تەنیا، بە بەڵگە پەیوەستەکانی((دروست بون و لەناوچوون)) و جووڵە، ئاشناییان هەیە، چونکە تەنیا بەدوای بنەماکان و هۆکارەکانی ناوەرۆکێکی لەم شێوەیەدا ئەگەڕێن، بەڵام ئەوانەی کە هەموو بونەوەرەکان لەبەر چاو ئەگرن(٢٥) و بونەوەرەکان بۆ((هەستپێکراوەکان و هەستپێ نەکراوەکان)) دابەش کردووە، و سەرنجی توێژینەوەکەی خۆیان بە ڕونی بۆ هەر دوو جۆرەکە ڕائەکێشن، کەواتە، شایستەیە کە دەستبدەینە درێژ دادڕیەکی زۆرتر، کەلەبارەی ئەو توێژینەوەی کە لەبەردەمی ئێمەدایە،چ قسەیەکی دروست یان نادروستیان ووتووە.

ئەوانەی کە ناوی پیتاگۆریەکانیان لێ نراوە، بنەماو توخم گەلێکی سەیرو سەمەرەتر لە سروشتناسەکان بەکار ئەهێنن، (٣٠)و ئەمەش بەو هۆیەوەیە کە ئەوان(بنەماکان)یان لە هەست پێکراوەکانەوە هەڵنەهێنجاندوە، چونکە بابەتەکانی بیرکاری، جگە لەوەی کە بە ئەستێرەناسیەوە پەیوستە، بی جووڵەن، بە بونی ئەمەش، هەموو قسەکان و توێژینەوەکانی ئەمان لەبارەی سروشتە، ئەوان دروست بوونی ئاسمان(واتە دونیای گەورە) ڕوون ئەکەنەوە

٩٩٠a

و لەبارەی بەشەکان و ڕوداوەکان و کردارەکانیان ،دەست ئەدەنە تێبینی کردنی دیاردەکان، و لە ڕوونکردنەوەی ئەوانەدا، بنەماو هۆکار گەلێك بەکار ئەهێنن، وەك بڵێی کە لەم بوارەدا، لەگەڵ ئەوانی تردا- واتە سروشتناسەکان- هاوڕان، کە ((بوونەوەر) بەهەمان ئەندازە((هەیە))(٥) کە هەستپێکراوەو و((سنووردار)) بەوە ئەوترێت کە پێی ئەڵێن ئاسمان(یان دوونیای گەورە)، بەڵام ئەو هۆکار و بنەمایانەی کە ئەمان ناویان بردوون، بەو شێوەیەی کە ووتمان، بەسە کە بۆ پلەیەکی بەرزتر لە بونەوەرەکان سەرکەون، و لە واقعیشدا، بۆ ئەم مەبەستەش شایستەترینن تا بۆ بۆچوونەکانی ئەوان لەبارەی سروشت،بەڵام لەم بارەیەوە، کە ئەگەر((سنووردار)) و((بێسنور)) و((تاك))و((جووت)) تەنیا(١٠) شت گەلێکن کەبە بێ جووڵە و سەرنگوومی، کە بە بنەما ئەزانرێن، یان لە(بارنەی) ئەوەدا کە چۆن لەوانەیە بە بێ جووڵە و گۆڕان ، دروست بوون

و لەناوچوونێك لەئارادا بێت، یان لەبارەی کرداری ئەو تەنانەی کە لە ئاسماندا،لە گەڕاندان، (هیچ جۆرە) ڕونکردنەویەك نادەن.

زیاد لەمەش، با بڵێین کە لەمانەوەقبوڵ بکەین قەبارە، یان گەورەیی،لەم توخمانە پێك هاتووە، و ئەم(مانایە) تەنانەتیش بگاتە پلە جێگیری، دیسانەوە ئەم پرسیارە ئەمێنێتەوە کە: چۆنە کە هەندێ جار،چەند تەنێکی سووك و هەندێکی تر،خاوەنی کێشن؟ چونکە لەسەر بنەمای گریمانەو گوتەکانیان،(١٥) ئەوان لەبارەی تەنە بیرکاریەکان زیاتر لە تەنە هەست پێکراوەکان قسە ناکەن، لێرەوەیە کە ئەمان هیچ شتێکیان لەبارەی ئاگر یان خاك یان تەنە هاوشێوەکانی ترەوە، نەووتووە، چونکە بە بڕوای من، ئەمانە، هیچ مەبەستێکی گوتراو تایبەتیان لەبارەی هەست پێکراوەکانەوە پێ نیە، تا بیڵێن.

بەدەر لەمەش، چۆن ئەتوانین قبوڵ بکەین کە دەرکەوتەی ژمارەو خودی ژمارە، لەسەرتاوە-و هەنوکەش- هۆکاری شت گەلێکن کە لە(٢٠) ئاسماندا بونیان هەیە و دروست ئەبن، لەکاتێکدا کە جگە لەو ژمارەیەی کە جیهان لەودا تێکهەڵکیش کراوە، ژمارەیەکی تر بوونی نیە[1]؟ چونکە کاتێك کە ئەمان لە ناوچەیەکی لەم شێوەیە یان لەو شێوەیە ((گومان))(بڕوا) و ((فرسەتی گونجاو-kairos)) جێ ئەکەنەوە، و کەمێك لە سەرتر یان خوارتر لەوانەوە ((ستەم و بێدادوەری adika)) و ((داوەری -یان بڕیار krisis،)) یان((لێك ئالان-mixis)) دائەنێن، و وەك بەڵگەیەك بۆ ئەو ئەڵێن کە هەر یەك لەمانە(٢٥) ژمارەیەکە، بەڵام لەهەمان کاتدا، تێئەگەین کە لەهەمان ناوچە کەڵەکەیەك لە قەبارە تێکەڵەکانی ئەم ژمارانە دەست ئەکەوێت، چونکە ئەو دەرکەوتەی ژمارانە، پەیوەستە بەهەریەك لە ناوچە جیاوازەکانەوە،ئەوکات ئەتوانین بپرسین کە : ئایا ژمارەیەك کە ئەبێت گریمانەی بکەین کەهەریەك لەو شتە تەنیایانەیە[2]، هەمان ئەو ژمارەیە کە لە ئاسمان،واتە دوونیای گەورەی هەست پێکراودا بوونی هەیە، یان لە پاڵ ئەودا ژمارەیەکی تریش هەیە؟ ((ئەفلاتوون))(٣٠) ئەڵێت ژمارە شتێکی ترە، ئەگەرچی ئەویش باوەری وایە کە ئەم شتانە و هۆکارەکانیان، ژمارەکانن، بەڵام ئەو هۆکارەکان بە ژمارە ئەقڵێنراو(ئەقڵانیەکان) و ئەوانی تر بە{ژمارە} هەستپێکراوەکان ئەزانێت.

[1] واتە ژمارە چۆن ئەتوانێت هەم بوونەوەرێکی واقعی بێت و هەم هۆکاری بوون؟

[2] لێرەدا بەمانای (مجرد)هاتووە، لە فارسی وعەرەبییەکەدا.

"وەرزی نۆیەم"

# ( رەخنە لە بڕواو تیۆرەکانی ئەفلاتوون )

٩٩٠b

با واز لە پیتاگۆریەکان بهێنین،چونکە هەر ئەم هێندەی کە خۆمان سەرقاڵی ئەوان کرد بەسە، بەڵاَم کەسانێك کە ((ئایدیەکان- tas idea)) وە ناونیشانی هۆکارەکان دیاری ئەکەن،لە یەکەمین گەڕانیاندا بۆ بەدەست هێنانی بونەوەرەکانی دونیای هەست پێکراو، بونەوەر گەلێکی تر ئەهێننە ئاراوە، بەشێوەیەك کە بڵێی کەسێك کە ئەیەوێت شتانێك بژمێرێت، وا وێنا بکات کە لەبەر ئەوەی ئەوان(ژمێردراون) ناتوانێت ئەم ئیشە بکات، و هەوڵ بدات کە لەدوای خستنە سەر ژمارەکەیان، ئەوسان بیانژمێرێت[1]، چونکە ((ئایدیەکان)) ڕێك یەکسانن بەو شتانەی کە ئەم زانایانە لە گەڕان بە دوای هۆکارەکەیاندا، ڕێیان چووەتە سەر((ئایدیەکان))،چونکە بۆ هەر شتێکی تاك، شتێکی هاوناوی ئەو، و جیا لە ناوەرۆکەکان، بوونی هەیە، و هاوکات لە بارەی هەموو شتەکانی تر،((یەکێك)) لەسەرووی((زۆر))ێکەوە دەست ئەکەوێت،[2] چ لە جیهانی ئێمەو چ لە جیهانی بوونەوەرە جاویدانەکانەوە.[3]

زیاد لەمەش، هیچ یەك لەو بەڵگانەی کە ئێمە بۆ سەلماندنی خودی ((ئایدیەکان)) بیانهێنینەوە، ڕۆشن نین، لە هەندێکیانەوە هیچ ئەنجامێکی پێویست بەدەست نایەت، و لە هەندێکی تریانەوە(١٠) ئەم ئەنجامە بەدەست دێت، کە((ئایدیەی))شتانێك بونیان

---

[1] ئەم بەشە بەراورد بکەن لەگەڵ ئەوەی ئەرستۆ((لە کتێبی ١٢(موو)..)١٠٧٨b٣٢ تا١٠٧٩b٣ لەم بارەیەوە ئەدوێت.

[2] واتە یەك(ئایدیە) کە پیشەنگی هاوبەشی هەموویانە.

[3] مەبەست لە تەنە ئاسمانیەکانە.

هەیە کە بە گومانی ئێمە بە هیچ شێوەیەك خاوەنی((ئایدیە))نین، چونکە ، بەپێی بەڵگە هەڵهێنجراوەکان لە زانستەکانەوە،بۆ هەموو ئەوەی کە زانستێك لێیەوە بەدەست دێت ئەبێت((ئایدیە))یەك بوونی هەبێت، و بەپێی بەڵگەی((یەك لە بەرامبەر زۆر)) سلبیاتەکانیش ئەبێت خاوەنی((ئایدیە)) بن، و لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی ئەم بەڵگەیە کە((ئێمە بیر لە شتەکان، تەنانەت پاش لەناوچونیش ئەکەینەوە))، ئەبێت لە شتە لەناوچووەکانیش((ئایدیە))یەك بونی هەبێت، چونکە ئێمە لێیانەوە وێنایەکمان هەیە وبەدەر لەمەش، هەر چەند ئێمە ئەڵێین کە رەگەزێکی سەربەخۆ لە زیادکراوەکان بوونی نیە[1] ، و ئەوانی تر لە((مرۆڤی سیهەم)) قسە ئەکەن[2]، بەگشتی،بەڵگاندنەکان لەبارەی ئایدیە، رێك شتانێك کە ئێمە بونیان لە سەرووی بونی((ئایدیە))وە ئەزانین، لە ناو ئەبەن، چونکە ئەنجامی ئەوانە ئەمەیە کە نە ((دوانێتی)) ،بەڵکو ((ژمارە)) ((یەکەمین))ە[3]، و((نیسبەت=خستنە لا)) لە پێش(( بوون لە خۆ kath hauto)) و لەگەڵ ئەوەشدا هەموو خاڵەکانی تر کە هەندێك لەو کەسانەی کە لە بڕوا پەیوەستەکان بە ((ئایدیە))وە پەیڕەوی ئەکەن، بە پاڵدانەوە بەوانەوە(بە پشت بەستن بەوانەوە)، دژایەتی بنەماکانی ئەم تیۆریەیان کردووە.

زیاد لەمەش، بە پێی ئەو گریمانەیەی کە ئێمە لەسەر بنەمای ئەوان((بە بونی ئایدیە)) باوەڕمان هەیە، نە تەنیا((ئایدیە))ی ناوەرۆکەکان، بەڵکو ((ئایدیە))ی زۆرێك لە شتەکانی تریش بوونی هەیە،(لەبەر ئەوە ئەندێشە، نەتەنیا لە بارەی ناوەرۆکەکان، بەڵکو هاوکات(لەبارەی) هەموو شتەکانی تریش یەکێکە، و نە تەنیا ئەو زانستانەی کە پەیوەستن بە ناوەرۆکەکانەوە، بەڵکو(ئەو زانستانەش) پەیوەستن بە هەموو شتەکانی ترەوە کە بونیان هەیە، وهەزار جۆرە دژواری تریش کە لە ئەنجامی ئەم گریمانەیەوە

---

[1] لەلای ئەفلاتوون لە((فایدۆن)) ٧٤a-٧٧a، و لە کۆمار دا٤٨٠a-٤٧٩a.

[2] لە ژێر ئەم ناونیشانەدا چەندین بەڵگاندن بوونیان هەیە،کە ئەگەر ((فرمێسك) مرۆڤێکە،لەبەر ئەوەی هەروەك((مرۆڤە) واتە مرۆڤێکی ناقڵە، ئەبێت مرۆڤێکی سێهەمیانەش بوونی هەبێت، کە مرۆڤایەتی ئەم دووانە لەودا یەك ئەگرن،واتە بۆ ئەو،بەراورد بکرێت لەگەڵ کتێبی ((زێتا)) ١٠٩٣a٢ و((رەخنە لە سۆفیستەکان))(کتێبی تێکەڵەکان)١٧٨b٣٦ تا ١٧٩a١٠ و هەروەها لای ئەفلاتوون لە دیالۆگی پارمنیدس ١٣٢A٢AB:D تا ١٣٣A،هەربەم شێوەیە لێکدانەوەی ئەسکەندەر ئەفرۆدیسی لەسەر((میتافیزیك))بە گرنگی دان بە NICHAEL HAYDUCK لە ژێر ناونیشانی alexandri aphrodisiensis :in aristotelis metaphysica commentaria چاپی بەرلین ١٨٩١ ،بەشەکانی ٨٢،٣٤ تا ٩،٨٥.

[3] دووانێتی بۆ ئەرستۆ((دوویەکی بەرز و گەورەیە)) کە لە ژێر ئایدیەی ژمارەکانەوە جێگیر ئەبێت، و بەم هۆیەوە لە پێشەوەیە.

دروست ئەبن) بەلاّم بە پێی پێویستی و لەسەر بنەمای بڕوا پەیوەست(( ئایدیە))کان، ئەگەر ئایدیەکان بتوانن هاوبەش بن، تەنیا((ئایدیە گەلێك)) لە ناوەڕۆکەکانەوە ئەبێت بوونیان هەبێت(٣٠) ،لەبەر ئەوە شتەکان لەواندا((بینەکیانە)) بەشدار نین، بەڵکو هەر شتێك ئەبێت لە(( ئایدیە))ی خۆیدا بەشێوەیەك بەشدار بێت کە نەبێتە هەڵگیراوی بابەتێك،(مەبەست لە((بەشداری بینەکیانە)) ئەوەیە کە بۆ نموونە ئەگەر شتێك لە((دووبەرامبەر))دا ڕەها و لەخۆیدا هاوبەش بێت، لە((جاوێدان))یشدا هەر هاوبەشە، (بەلاّم بینەکیانە).[1]

٩٩١a

چونکە جاویدانی بۆ لاواز بوونی بینەکی بوونە، بەم شێوەیە ((ئایدیەکان)) ناوەڕۆکن، بەلاّم ناوەڕۆکێش هەم لێرەدا( لە جیهانی هەست پێکراو) و هەم لەوێدا(جیهانی ئایدیەکان) بە یەك مانایە، ئەگەر نا چ مانایەکی ئەبێت کە بڵێین شتێك لە پاڵ وجیا لە لایەنە بەشەکیەکان، بوونی هەیە، بۆنموونە، تاك لە پاڵ زۆر؟ و ئەگەر ئایدیەکان و ئەوشتانەی کە لەواندا بەشدارن، یەك شێوەیان هەبێت، لەنێوان ئەواندا چ شتێك هاوبەش ئەبێت، چونکە بۆ ئەبێت ((٢)) لە((٢))ە لەناوچووەکان(واتە جووتە هەست پێکراوەکان) و ئەوانەیی کە زۆر بەلاّم جاویدانن[2]، یەکێك و هەمان بن، بەلاّم((٢ لە خۆیدا))یان((٢))ە بەشەکیەکان یەکێك و هەمان نەبن؟.بەلاّم ئەگەر شێوە هەمان نەبێت (واتە بۆ ئایدیەکان و شتە هاوبەشەکانیان)، ئەوکات تەنیا ((هاوناو)) بوونی ئەبێت، ڕێك بەو شێوەیەی کە کەسێك((کالیاس)) و شێوە تەختەییەکەی ئەو-هەردوکیان-بە ((مرۆڤ))ێك بزانێت، بیّ ئەوەی تێبینی لایەنە هاوبەشەکانی نێوان بکات.[3]

هەنووکە ئەبێت ئەم پرسیارە کە لە هەمووان گرنگترە، لەم بارەیەوە،دابڕێژین، کە ((ئایدیەکان))(یان شێوەکان) لە هەستپێکراوەکاندا چ پشکێکیان هەیە؟ چ ئەوانەی کە جاویدانن و چ ئەوانەی کە لە ئەگەری دروست بوون و لەناوچووندانداn، چونکە ئەوانە،

---

[1] مەبەستی ئەرستۆ ئەمەیە کە هەستپ ێکراوەکان دووهێند((دووبەرامبەر)) جاویدان نین، کەواتە ناتوانێت بە مانای ڕاستە قینەی ووشە لە ئایدیەدا دووبەرامبەر هاوبەش بن،لەکاتێکدا کە نەرکەوتانە خاوەنی سیفەتی جاویدانن، لەبەر ئەمە ئایدیەکان کە بابەتی هاوبەشین، نەرکەوت نین، بەڵکو ناوەڕۆکن.

[2] واتە((٢))ەکانی بیرکاری.

[3] مەبەست لە بەڵگەکانی ئەرستۆ لەسەرەوە ئەوەیە کە:ئایدیەکان ناوەڕۆکن، ناوێکی هاوبەش کە یەکێك ئایدیە لە گەڵ لایەنە لاوەکیەکانیدا لەودا هاوبەشە، ئەبێت بۆ هەردووکیان یەك مانا بێت،ئەگەر نا((بەشداری یان هاوبەشی)) تەنیا یەك هاوبەشی یان هاوناوییەك ئەبێت، بەلاّم ئەگەر ئەوە هەروەك ئایدیە بەکار بهێنین،بەمانای ناوەڕۆکە،لەبەر ئەمە ((لاوەکیەکان-بەشەکیەکان)) ئەبێت ناوەڕۆکەکان بن.

لەماندا ،نە هۆکاری جوولەن و نە(هۆکاری) لەناوچوون، لەلایەکی ترەوە، نە بۆ ناسینی شتەکانی تر سودمەندن (چونکە ئەوانە تەنانەت ناوەڕۆکی ئەمانە نین، ئەگەرنا لەناو ئەماندا دەبوون)نە بۆ ((بوون to einai))ی ئەوان، چونکە لەو شتانەی کە لەواندا((واتە ئایدیەکان)) بەشدارن، ئامادە نین (١٥)،چونکە ئەگەر وا بووایە، ئەیانتوانی وەك ئاونیشانی هۆکارەکان لەبەر چاو بگیرێن، بەشێوەیەك کە سپێتی، لە تێکهەڵکێشی لەگەڵ شتێك ئەبێتە هۆی سپی بوون، بەڵام ئەم بەڵگەیە- کە یەکەمجار ((ئاناکساگۆراس))[1] و پاشان((یودوکسوس))[2] و ئەوانی تر هێنایانە ئارا-بە جوانی ئەتوانرێت لەنگی بکەیت، چونکە بە ئاسانی، ئەتوانیت گەلێك نارەزایی لەم بارەیەوە، لەدژی ئەم بڕوایانە کۆبکەیتەوە.

زیاد لەمەش، لە واقعدا شت گەلێکی تر بە هیچ مانایەکی ئاسایێتی ناتواندرێت، لە((ئایدیەکان))ەوە دروست بکرێت (لێ دروست بکرێت). ئەم قسەیەش کە ئەوان((پێشەنگەکان))(نمونەکان paradeigmata)ن و شتەکانی تر لەواندا بەشدارن، گوتەیەکی بۆش و بێمانا و خەیاڵاتی وشاعیرانەیە، چونکە چ شتێکە کە بە تێڕامان لە((ئایدیەکان)) دەست بە پێکهێنانی شتەکان ئەکات؟ بەدەر لەمەش هەر شتێك ئەتوانێت وەك شتێکی تر بێت یان (ببێت)، بێ ئەوەی هاوشێوە یان لاساییەك لەو(شتە) بێت، بە شێوەیەك سوقرات چ بوونەوەر بێت و چ بونەوەر نەبێت[3](٢٥)مرۆڤێکە لە شێوەی ئەو((سوقرات))ەی لەوانەیە بێتە بوون، تەنانەت لە کاتێکدا کە((سوقرات))جاویدانیش بووایە، دیسانەوە مەسەلەکە هەر ئەمە بوو، هەر بەم شێوەیە زۆرێك لە پێشەنگەکان، (نمونەکان) و لە ئەنجامی زۆرێك لە ئایدیەکانەوە، لەهەمان شتەوە بوونیان ئەبێت، بۆ نموونە ((ئاژەڵ))و ((دووپێ)) بۆ مرۆڤ و هاوکات((مرۆڤ لە خۆیدا))( یان خودی مرۆڤ autoanthrop )،جگە لەمە ((ئایدیەکان)) نە تەنیا ئەبێت پێشەنگی هەستپێکراوەکان،(٣٠) بەڵکو ئەبێت پێشەنگی خۆشیان بن، وەك ڕەگەز بەمانای ڕەگەزی جۆرە جیاوازەکان، و بەم شێوەیە پێشەنگ و وێنە، هەردوکیان یەك

---

[1] لە لەتی چوارەم،سەیری((یەکەمین فەیلەسوفەکانی یۆنان)) بکەن،لا ٢٩٩.

[2] Eudoxos، خەڵکی کنیدۆس، لە ماوەی ساڵەکانی ٣٥٥-٤٠٨ پ.ز. قوتابی ئەفلاتوون بوو، و بیرکاری زانێکی بەرجەستە بوو،بەروکەش لەو باوەڕەدایە کە ئایدیەکان،خودی یان لەناودا بوون.

[3] لەبیرمان نەچێت کە ئەفلاتوون ووتبووی ئەم((دروستکەرە))(Demiourgos)ە:سەیری((دیالۆگی تیمایوس)) بکەن،٢٨c،٢٩a.

شتن[1]، بەدەر لەمەش مەحاڵە کە ناوەرۆك و شتێك کە ئەم ناوەرۆکیەتی، بتوانن جیا لەیەك بن، کەواتە، ((ئایدیەکان)) کە ناوەرۆکی شتەکانن، چۆن ئەتوانن جیا لە بوونەوەرەکان بن؟ لە((فایدۆن))[2]دا ئەوترێت کە((ئایدیەکان)) هەم هۆکارەکانی بوونن وهەم(هۆکاری) پەیدا بوون. بەڵام ئەگەریش((ئایدیەکان)) بوونەوەر بن، شتانێك کە لەواندا بەشدان(٥) دروست نابن، مەگەر ئەوەی کە شتێك ببێتە پاڵنەری جووڵە، و زۆرێك شتی تر دێنە بوون(بۆ نموونە خانوویەك یان ئەنگوستیلەیەك) کە ئێمە ((ئایدیە))یان بۆ ناگریمێنین، بەم شێوەیە روونە کە شتەکانی تریش، بەهۆی ئەو کاریگەریانەی کە هەنووکە باس کران[3]، هەم بونیان هەیە وهەم دێنە بوون.

جگە لەمە، ئەگەر ((ئایدیەکان))ژمارەکانن، هۆکارەکان چۆن بونیان ئەبێت؟(١٠)ئایا بەو هۆیەی کە بوونەوەران ژمارەگەلێکی ترن، بۆ نموونە ژمارەیەکی لەم شێوەیە مرۆڤ و ژمارەیەکی لەو شێوەیە((سوقرات)) و ئەوی تر((کالیاس))ە؟ لەو شێوەیەدا، ئەو ژمارانە(لە چ ڕوویەکەوە) بۆ چی هۆکاری ئەمانەن؟ تەنانەت ئەگەریش گروپێك لەوانە جاویدان و گروپێکی تر بەم شێوەیە نین،(دیسانەوە) جیاوازیەك دروست نابێت، و ئەگەریش بەم هۆیەوەیە کە شتە هەستپێکراوەکانی ئەم جیهانە((نیسبەتی-خستنە لای))ژمارەکانن، کەواتە روونە کە گروپێك لەو شتانەن کە ئەوانە((نیسبەتەکانی)) ئەمانن. هەنووکە ئەگەر شتێکی لەم شێوەیە-واتە مادە-هەیە(١٥)ڕوونە کە خودی ژمارەکانیش نیسبەتی شتانێکی ترن لەگەڵ شتێکی تردا، بۆ نمونە ئەگەر((کالیاس)) نیسبەتێکی ژمارەیی نێوان ئاگر وهەواو خاکە،((ئایدیە))ی ئەویش ژمارەیەك لە شتە دیاری کراوەکانی ترە، کە بنەماییە، مرۆڤ ((لە خۆیدا)) چ بە مانایەك ژمارە بێت یان نەبێت، ئەبێت پەیوەندی ژمارەیی شتانێکی دیاری کراو بێت، نەك ژمارەیەکی پەتی، و بەم هۆیەشەوە(٢٠) هیچ ئایدیەیەك ژمارە نابێت.[4]

بەدەر لەمەش، لە زۆرێك لە ژمارەکان، ((یەك)) ژمارە دروست ئەبێت، بەڵام چۆن لە ((ئایدیە))ی جیاواز، ((یەك ئایدیە)) دەهێنرێتە بوون؟ و ئەگەر یەك ژمارە نە لەخودی

---

[1] مەبەست ئەمەیە کە جۆر پێشەنگی تاکەکان و رەگەز و پێشەنگی جۆرەکان نەبێت.

[2] گفتگۆی فایدۆن:بەرهەمی ئەفلاتوون:D١٠٠.

[3] سەیری ١a٩٩١ b٩، بکەن و بەراوردی بکەن لەگەڵ کتێبی سیانزەیەم((موو)) ١٠٧٩b١٢ ١٠٨٠a٨.

[4] ئەم خاڵە هەرچەندە بە ڕوونی بەیان نەکراوە، بەڵام مەبەست ئەو ئەمەیە کە((ئایدیەکان)) ناتوانن دەربڕین یان پەیوەست گەلێکی ژمارەیی پەتی ئەبن، بەڵکو خاوەنی بوونیاد یان بابەتێکن، هەمان جۆر کە لە لای بەشەکیەکان بەم شێوەیەیە.

ژمارەکانی تر، بەڵکو لە تاکایەتیەکەیانەوە دێتە بوون(بۆ نموونە تاکایەتی ژمارە ١٠,٠٠٠) پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئەم تاکایەتیە چیە؟ چونکە ئەگەر ئەوانە هاوجۆر بن (homoeides)، زۆرێک ئەنجامی پوچ دروست ئەبن، و ئەگەریش هاوجۆر نەبن،(دیسانەوە بەم شێوەیە)(چ تاکایەتیەکان لە ژمارەیەکی دیاری کراوی خۆیاندا هاوجۆر نەبن و چ تاکایەتیەکەیان لە هەر ژمارەیەکدا لەگەڵ تاکایەتی هەر ژمارەیەکی تردا بەم شێوەیە نەبێت) چونکە لە چ شتێکدا جیاوازیان هەیە، لە کاتێکدا کە خاوەنی چۆنایەتی نین؟ ئەم تیۆرە نە ئەقڵانیە(ئەقڵێنراوە)، وە نە هەماهەنگ لە گەڵ ئەندێشەی ئێمە لەبارەی بابەت.

لەلایەکی ترەوە پێویستە، کە رەگەزێکی تر لە ژمارەکان دروست بکرێت( کە زانستی ژمێریاری پەیوەندی لە گەڵیاندا هەیە) وهەموو ئەو شتانەی کە هەندێ لە فەیلەسوفەکان((ناوەراست-نێوەنجی=نێوان)) پێ ئەڵێن[1]، بەڵام چۆنن؟ و لێ دروست کراوی چ بنەما گەلێکن؟ یا بە چ هۆیەک ئەبێت((ناوەراستی-نێوەندی)) نێوان شتانەی ئەم، دونیایی و شت گەلێك بن لە خۆدا؟زیاد لەمەش، ئەو یەکانەی کە لە ((٢))دا هەن هەر یەکەیان ئەبێت لە((٢))یەکی پێشترەوە دروست بکرێن، بەڵام ئەمە مەحاڵە، و دیسانەوە بۆچی یەك ژمارە(کە کەڵەکەی چەند یەکەیەکی زۆرە) هاوکات هەر یەك ژمارەیە؟

٩٩٢a

بەدەر لەوی کە وتمان، ئەگەر یەکەکەکان جیاوازن، ئەمان(واتە پەیرەوانی ئەفلاتوون) ئەبێت لەبارەی ئەوانەوە بەم شێوەیە قسە بکەن، کە کەسانێك باوەڕیان بە دو یان بەچوار توخم هەیە،چونکە لەمانەوە هیچ کامیان, ئەوەی کە تیایدا بەشدار و هاوبەشە، بۆ نمونە جەستە،(تەن)، بە توخم ناو نانێت و ناونابات(٥)، بەڵکو ئاگر و خاك، بە(توخم) ناو ئەبات، ئیدی شتێکی هاوبەش-وەك تەن،جەستە- بوونی هەبێت یان نا[2]،بەڵام هەنووکە ئەفلاتوونیەکان لەبارەی (یەك=تاك=یەکە) بە شێوەیەك قسە ئەکەن کە وەك بڵێی وەك ئاگر یان ئاو لە(هاو-بەشەکان) پێك هاتوون، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە

[1] سەیری وەرزی هەشتەم بکەن،٤،((نێوانییەکان))، کە پێشینەکان ئەوە بە((ناوەراستینەکان))یان((نێوەنجییەکان)) و هەروەها((ئایدیە نێوانیەکان)) ناوئەنێن، ئایدیەیەکن کە لە نێوان((ئایدیەکان)) و ((هەست پێکراوەکان)) هوە جێگیرن و بریتین لە بابەت یان شتە بیرکارییەکان،ژمارەو..هتد،سەیری ٩٨٧b١٥ بکەن.

[2] لە کتێبی((لە لێوارەکانی دروست بوون و لەناوچوون))٢٣٠ ٢٢٠b، ئەرستۆ ئەڵێت کە شتێکی هاوشێوەی لەم شێوەیە بوونی هەیە.

بێت، ژمارەکان ئیدی ناوەڕۆك نین،[1] بەڵکو ئەگەر یەك((یەك لە خۆیدا hen auto) هەیە کە بنەمای یەکەمینە، ڕوونە، کە واژەی (( یەك)) بەچەند مانا بەکار هێنراوە، و ئەگەرنا قسەیەکی مەحاڵ ئەبێت[2].

(١٠) ئەگەر بمانەوێت ناوەڕۆکەکان بۆ بنەماکان ((ڕەچەڵەکەکان))بگەڕێنینەوە، ئەوکات هێڵەکان بە لێ دروست کراوی ((کورتی و درێژی))(واتە جۆرێکی گەورەو بچووك) و ئاست لە((پانی و باریکی)) و تەن لە((چاڵی و ناچاڵی- قۆقزی)) جێگیر بکەین، بەڵام قسە لێرەدایە کە چۆن((ئاست)) ئەتوانێت ((هێلێك)) یان((تەن))، ((هێلێك)) یان((ئاست))ێك لە خۆ بگرێت؟

چونکە((پان و باریك))ڕەگەزێکی تری بەدەر لە((چاڵی و قۆقزییە))(١٥).هەنووکە، بەهەمان جۆر کە لەماندا ژمارەیەك بوونی نیە(وەك زۆر و کەم،لەگەڵ ئەماندا جیاوازن)، ڕوونە کە هیچ یەك لە باقی ڕەگەزە بەرزەکان ناتوانێت لە ڕەگەزە نزمەکاندا بگونجێت، لە لایەکی ترەوە، ((پانی)) ڕەگەزێك نیە کە خاوەنی((چاڵی))بێت، چونکە لەم شێوەیەدا جەستە(تەن) جۆرێك لە((ئاست)) ئەبوو[3]. بەدەر لەمەش،لەسەر بنەمای چ((ڕەچەڵەکێك)) ئەتوانرێت پەی بە بوون یان ئامادیی ((خاڵەکان لە ئاست))دا ببرێت؟[4] ((ئەفلاتوون))لەگەڵ ئەوەشدا، بەم ڕەگەزە لە شتەکان، وەك چەمکێکی ئەندازیاری، ڕازی نەبوو، بەڵام(٢٠) ئەو لە بنەمای (یان ڕەچەڵەکی)هێڵی قبوڵ کرد،(و زۆر جاریش پشتی پێ ئەبەست)،و ناوی نابوو[5]((هێڵە دابەش نەبووەکان))بەڵام ئەمانەش ئەبێت سنوورێکیان هەبێت، کەواتە لەسەر بنەمای هەمان بەڵگە کە بوونی هێڵی ئەسەلماند،((خاڵیش)) ئەبێت بونی هەبێت.[6]

---

[1] بەراودی بکەن لەگەڵ ئەوەی کە لە کتێبی سیانزەیەم((موو))١٢-١٠٨١a٥ دا ئەگووترێت.

[2] بەم شێوەیە سود لەم دەربڕینە ئەبینرێت کە مەبەستی ئەرستۆ لەوەی کە لە سەرەوەدا ئەیڵێت ئەوەیە کە لە ڕوانگەی ئەومەوە((یەکی ئەفلاتوونی)) یەك((یەکی))یە، و ئەگەر بەم شێوەیە بێت ناوەڕۆك ناتوانێت تێکەڵەیەك بێت لەوانە،بەڵام ئەگەر((یەك))ی شتێکی بەدەر لە یەك((یەکی))یە، ئەبێت ئەم خاڵە ڕوون بکرێتەوە و هەنووکە بەم شێوەیەشیان نەکردووە.

[3] بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەوەی کە لە کتێبی سیانزەیەمدا((موو))١٠/١٠٨٥a٩ دا گووترا.

[4] مەبەست لەمەیە کە هێڵەکان، ئاستەکان، و تەنەکان لە پەیوەستیە جۆراوجۆرە گەورو بچووکەکانەوە دێنە بوون، بەڵام خاڵەکان بەم شێوەیە نین،چونکە ((گەورەیی))یەك بوونی نیە، لەبەر ئەمە چۆن لەواندا بوونیان ئەبێت؟

[5] ئەم خاڵە کە ئەفلاتوو نکۆڵی کەری بوون، خاڵە،لە شوێنێکی تردا بە ڕوونی بەیان نەکراوە،بەڵام نیسبەت بە بڕواکانی((کسێنۆکراتێس))(٣١٤-٣٩٦)پ.ز، کە لە ٣٣٩دا سەرپەرشتی ئەکادیمیا بوو.

[6] ئەگەر خاڵ، سنوور بێت.

بە گشتی ، هەرچەندە ((دانایی-سوفیا)) لە گەڕان بەدوای شتە بینراوەکانەوەیە، ((ئێمە))[1] لەم مەسەلەیە چاوپۆشیمان کردووە (چونکە ئێمە لەبارەی هۆکارێك کە سەرەتای گۆڕان لەوەوە، شتێك نالْێین)،بەلاّم لە کاتێکدا کە وێنا ئەکەین لەبارەی ناوەرۆکیانەوە(شتە بینراوەکان) قسە ئەکەین، بوونایەتی ناوەرۆکەکانی تر دەرئەبڕین، بەلاّم دەربڕینەکەی ئێمە لەوەی کە ئەمانە، چۆن ناوەرۆکەکانی ئەو شتە بینراوانەن، لە واقعدا قسەیەکی بۆش و بێ مانایە، چونکە، وەك چۆن پێشتریش ووتمان، واژەی((بەشداری =هاوبەشی)) مانایەکی نیە[2]، و لەگەلْ ئەوەشدا ((ئایدیەکان)) بەوەی کە ئێمە لە زانستەکاندا وەك هۆکارێك ئەیبینین- و هەموو ئەقلْی مرۆڤ و تەواوی سروشت لەبەر ئەو لە ئیش دان(ئەم هۆکارەی کە ئێمە ئەیلْێین یەکێك لە رەچەلْەکەکانە،هۆکاری ئامانجی)- هیچ جۆرە پەیوەندیەکی نیە، بەلاّم بیرکاری لەلای زاناکانی ئەمرۆکە[3]، بە((خودی فەلسەفە)) ئەژمار ئەکرێت.

٩٩٢b

هەرچەندە ئەلْێن کە لەبەر چەند مەبەستێکی تر ئەبێت سەرقالْی بین.[4]

لەلایەکی ترەوە، ئەتوانین تێبگەین کە ناوەرۆکێك کە ئەوان، هەروەك مادە ئەکەنە (بابەت)، بەجۆرێك زیاترە لە بیرکاری، و لە واقعدا، زیاتر هەلْگیراو بەشێکە لە ناوەرۆك، واتە لە مادەیە، تا خودی مادە، وەك((گەورەو بچووك)) کە هەروەك((رەقی و نەرمی))وایە، کە سروشتناسەکان قسەی لێوە ئەکەن، و لەو باوەڕەدان کە(٥) ئەمانە یەکەمین بەشەکانی بابەتن، چونکە ئەمانە جۆرێك لە((زیادەڕەوی و کەم ڕەوی-کەم و کوڕی))ن، بەلاّم لە بارەی جوولْە، ئەگەر وا بگریمێنین کە ((گەورە و بچووك)) جوولْە بن، روونە کە((ئایدیە))ش ئەجوولْێت، بەلاّم ئەگەر بەم شێوەیە نیە،(کەواتە) جوولْە لە کوێوە هاتووە؟ بە پێی ئەم بنەمایە، هەموو ئەو توێژینەوانەی کە لە بارەی سروشتەوە کراون، رەت ئەکرێنەوە.

---

[1] مەبەستی ئەرستۆ لە((ئێمە)) واتە پەیڕەوانی ئەفلاتوو، چونکە ئەو لەو قۆناغەدا هێشتا، خۆی بە ئەفلاتوونی ئەزانی.

[2] لە ٢٢-٩٩١a٢٠.

[3] وەك((ئیسپۆسیپۆس)) خوشکەزای ئەفلاتوون و جێگری ئەو وەك سەرپەرشتی ئەکادیمی، بەم بارەیەوە سەیری: کتێبی حەوتەم((زێتا))،وەرزی نووەم،٢٥-١٠٢٨b٢٠ بکەن.

[4] گووتەیەکی ئەفلاتوون لە کۆمار ٥٣٢-٥٣١C.D(حەوتەم)

بەڵام ئەوەی کە ئەگریمێنن، سەلماندنی ئەوە ناسانە- واتە هەموو شتەکان ((یەك))ێکن،-ناگاتە ئەنجامێك، چونکە لە خستنە رووی چەند مەسەلەیەك، ئەم ئەنجامە بەدەست نایەت، کە هەموو شتێك((یەك))ێکە[1]،بەڵکو (ئەم مانایە بەدەست دێت) کە یەك((یەك لە خۆیدا))(یان رەها) بونی هەیە، ئەویش ئەگەر هەموو گریمانەکان قبوڵ بکەین، بەڵام ئەگەر قبوڵ نەکەین کە (گشت)، رەگەزێکە(genos)،ئەمەش ناگاتە ئەنجام،بەڵام ئەمەش، لە هەندێ بواردا، ئەگەری نیە، و لەگەڵ ئەوەشدا، لەم بارەیەوە کە هێڵەکان، ناستەکان و ئەو تەنانەی کە(لە دوای ژمارەکانەوە) دێن، بە چ ریزبەندیەك بوونیان هەیە یان ئەتوانن بوونیان هەبێت، یان چ بەهاو توانایەکیان هەیە، روون کردنەوەیەك بەدەست نایەت، چونکە ئەمانە نە((شێوە-نایدیە))ن،(چون ژمارە نین) و نە((نێوەندیەکان-نێوەنجیەکان))(کە بابەتی بیرکارین) و نە شت گەلێکی لەناوچوو، بەڵکو وا دێتە بەرچاو کە رەگەزێکی چوارەمی جیاواز بن[2].

بە گشتی، ئەگەر بتوانین بەدوای توخمی بوونەوەرەکاندا بگەڕێین، بێ ئەوەی ماناکانی واژەی ((بوونەوەر-ببوو)) دیاری بکەین، ناتوانین ئەو توخمانە بدۆزینەوە، بەتایبەتی ئەگەر بەم شێوەیە بەدوای ئەو توخمانەی کە شتەکان لەوانەوە پێك هاتوون، بگەڕێین، چونکە بێ گومان ناتوانین ئەوە بدۆزینەوە کە ((کردار)) یان ((کردلراندن)) یان((رێك)) لە چ توخم گەلێك دروست بوون، بەڵام ئەگەریش ئەم ئیشە هەر، ئەگەری هەبێت، تەنیا لەبارەی ناوەرۆکەکانەوەیە، لەبەرئەمە گەڕان بەدوای توخمی هەموو بوونەوەرەکان، یان وێنای ئەوەی کە (ئەم توخمانە ئەتوانین بدۆزینەو) دروست نیە.

٩٩٢a

لەلایەکی ترەوە، چۆن ئەتوانین ناشنای توخمی هەمووشتەکان ببین؟ رونە کە لە ناسینی زانستەکەی پێشوو ناتوانین شتێك دەست پێ بکەین،چونکە بەهەمان جۆر کە کەسێك لە ئیشی فێرکردنی ئەندازیاریدا، لەوانەیە شتەکانی تر بە لەپێشتر بزانێت، بەڵام لەبارەی ئەو شتانەی کە ئەم زانستە خۆی سەرقاڵیان ئەکات،- و ئەو خەریکی فێرکردنیانە-هیچ شتێك بە لەپێشتر نازانێت، لە بوارەکانی تریشدا بەم شێوەیەیە،،

---

[1] لەبارەی شێوازی ئەفلاتوو سەیری:کتێبی حەوتەم ١٠٢١b٢١، و کتێبی سیانزەیەم((موو)) ١٠٨٦b٩، و کتێبی چواردەیەم((نوو)) ١٠٩٠a١٧، و وەرگێڕان و لێکدانەوەی((میتافیزیك)) ئەرستۆ، بەرهەمیROSS، بەرگی یەکەم، لا ٢٠٨ بە دواوە.

[2] بەراوردی بکەن لە گەڵ کتێبی سیانزەیەم((موو))١٠٨٠B٢٢-٣٠ و ٩-١٠٨٥A٧ (وەرزی ٦ و٩).

کەواتە-بەو شێوەیەی کە هەندێك بانگەشەی بۆ ئەکەن- ئەگەر زانستێك لەبارەی هەموو شتەکانەوە بوونی هەیە[1]، کەسێك کە خەڵکی پێ فێر ئەکات(لەو زانستە)هیچ شتێك، بە لەپێشتر، نازانێت(٣٠)، بە بوونی ئەمەش، هەمو جۆرەکانی فێرکردن- یان هەمو یان هەندێکیان-چ لە رێگای سەلماندن و چ لەرێگای پێناسەوە، لەسەر بنەمای((پێشتر زانراوەکان)) ەوەیە، چونکە بەشەکانی پێناسە ئەبێت پێشترزانراو، و ناسێنراو بن،ناسین لە رێگای ئیندەکشنەوە هەر بەم جۆرەیە، بەلام ئەگەر ئەم زانستە(یان ناسینە)هاوسروشتی(sumfutos) ئێمە بوایە[2]، (دیسانەوە) مایەی سەرسوڕمان ئەبووین کە لە زانینی باشترین زانستەکان بێئاگاین.

لە لایەکی ترەوە، چۆن ئەتوانین بزانین کە شتەکان لە چ توخمێك پێك هاتوون، و(سیمبولە تێکەڵەکانی) چۆن ئەبێت ئاشکرا بکەین؟ چونکە ئەمیش(بۆخۆی) دژواری گەلێکی هەیە، چونکە لەم بارەشەوە،هەروەك چۆن لەبارەی هەندێك لە ئاوازەکانیشەوە هەر بەم شێوەیەیە، بڕواکان نارازی و دژن(٥) هەندێ ئەڵێن ZA لە تێکەڵەی S وD وA پێك هاتووە، لەکاتێکدا کە ئەوانی تر ئەڵێن کە ئەو(یەکەمیە) ئاوازێکی جیاواز لەمانەی(دواییە) و هیچ کامیان لەو(هەڵهێنجانانەی کە هەمانن و) ئەوەی کە بۆ ئێمە ئاشنایە، نیە.

زیاد لەمەش، ئێمە چۆن ئەمانتوانی بابەتەکانی هەستێك، بە بێ بونی ئەو هەستە، بناسین؟ بەلام دەبوو توانای ئەم ناسینەمان هەبووایە، ئەگەر توخمە پێکهێنەرەکانی هەموو شتەکان، وەك ئاوازە تێکەڵ بە توخمە تایبەتەکانیان بوونایە، هەمویان یەکێك دەبوون.[3]

---

[1] بۆ نموونە وەك دیالێکتیك لە لای ئەفلاتوون.

[2] ئاماژەیە بۆ مانای(( بەیاد هێنانەوە،ئانامێنسیس)) لە دیالۆگی فایدرۆس،72E، بە دواوە، و دیالۆگی ((منوون)) 82B بەدواوە، هەریەم شێوەیە ب.بۆ کتێبی وەگێڕ((لە سوقراتەوە تا ئەرستۆ)) چاپی دووەم، لا ٩٩ و ١٣٠.

[3] شایستەی بەیاد هێنانەوەیە کە واژەی((stoikheion)) لە یۆنانی دا بە مانای((توخم یان((روکن)) ..) دێت، و هەم بە مانای((یەکێك لە پیتەکانی ئەلف بێ)) لێرەوەیە کە زۆر جار پیتەکانی ئەلف بێ هاوشێوەی شتە مادییەکان بەکار دێن.

"وەرزی دەیەم"

# ( دەرەنجامێ لە توێژینەوەکانی کتێبی یەکەم )

لەوەی کە پێشتر ووترا، ئەوە ئاشکرا ئەبێت کە هەموو زانایانی رابردوو، بە روکەش، لە گەڕان بەدوای ئەو هۆکارانەوە بوون کە ئێمە ئەوانمان لە نامەکەی خۆمان بەناوی ((لە لێوارەکانی سروشت))[1] ناو هێناوە، و جگە لەوانە، ناتوانین ناوی هۆکار گەلێکی تر ببەین، بەلاّم توێژینەوەی ئەوانە، لەم بارەیەوە، نادیار بووە، و هەرچەند لە روانگەیەکەوە، قسە لەسەر هەموویان کراووە،بەلاّم لە روانگەیەکی ترەوە، بە هیچ شێوەیەك قسەیان لەسەر نەکراوە(١٥) چونکە فەلسەفەی پێشین، وادێتە بەرچاو کەلە بارەی هەموو شتێکەوە، وەك بلّێی بە (تری)[2] قسەی کردووە، لەبەر ئەوە هێشتا لاو وتازە ئیش بووە، تەنانەت ((ئێمپێدوکلێس))[3] ئەلّێت کە((ئێسقان)) بە هۆی پەیوەندی بەشەکانیەوە بوونی هەیە، هەنوکە ئەمە هەمان ئەو ناوەرۆك و چیەتی شتەیە، بەلاّم هەرلەبەر ئەم هۆیە و هەر بەو شێوەیە گۆشت وهەر شتێکی تر ئەبێت((نیسبەت-پەیوەند))بێت، و ئەگەرنا هیچ نابێت(٢٠)،چونکە تەنها بەم هۆیەوە گۆشت و ئێسقان وهەر شتێکی تر بوونیان ئەبێت، نەك بەهۆی مادەکەیان کە ئەو ئاگر و خاك و ئاو هەوای ناو ئەنێت، لەگەلّ ئەوەشدا، ئەگەر کەسێکی تر ئەم( قسانەی) بووتایە ئەوا بێگومان قبولّی ئەکرد، بەلاّم خۆی ئەوەی بە ڕوونی دەرنەبڕیووە.

---

[1] کتێبی دووەم، وەرزی سێهەم و حەوتەم.

[2] مەبەستمان لەوەیە کە وەك چۆن کەسێك بە زمان تری قسە ئەکات و ناتوانێت مەبەستەکەی خۆی بگەیەنێت.

[3] لەتەکانی ٩٦ و ٩٨((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))، لا ٣٥٨.

لە بارەی ئەم خالأنەوە،پێشتر ڕوون کردنەوە دراوە،(٢٥) هەنووکە ئەبێت خۆمان سەرقاڵی ئەو((دژواری))[1]یانە بکەین کە لەوانەیە لەبارەی ئەم مەسەلانەوە بێنە پێشەوە، چونکە لەوانەیە بەم هۆیەوە، بۆ خۆخەرێك کردن بە دژواریەکانی دواتر، بتوانین یارمەتیەك وەربگرین.

[1] دژوارییەکان-aporias، ئەم واژەیە بە((گومانۆکەش)) وەر ئەگێردرێت، بەو شێوەیە کە((ئیسحاق بن حنین)) وای کردووە، سەیری ڕوونکردنەوەکانی کتێبی سێهەم بکەن.

## "وەرزی یەکەم"

# ( فەلسەفە وەك زانست یان ناسینی راستی )

٩٩٣b

سەرنجدانی راستی لە لایەکەوە قورس و لە لایەکی ترەوە ئاسانە، هۆکەشی ئەوەیە کە هیچ کەس ناتوانێت، بەو شێوەیەی کە شایستەیە دەستی پێ بگات، بەلاّم هەموو مرۆڤەکانیش لەم هەوڵدانەدا هەڵە ناکەن، بەڵکو هەریەکە لەبارەی سروشت شتێك ئەڵێت، وهەرچەند، بە تەنیایی، یان شتێك لە راستی تێ ناگەن یان برێکی کەمی لێ تێ ئەگەن، بەلاّم لە کۆکراوەیی هەموویانەوە برێکی بایەخدار دروست ئەبێت[1]، بەم شێوەیە لەم ئاراستەیەوە لەسەر بنەمای ئەم((ئایدیە)) بەناوبانگە ئەڵێین:(( چ کەسێك لە دۆزینەوەی دەرگای ماڵەوەدا بە هەڵەدا ئەچێت؟)) ،ئیشێکی ئاسانە، بەلاّم ئەم مەسەلەیە کە ئێمە ئەتوانین لەهەموو راستی، ونەك بەشێك لێی، تێبگەین، نیشانەی دژوارییەتی، بەلاّم لەوێوە کە دژواری لە دوو ئاراستەوە بەتوانایە، لەوانەیە هۆکاری دژواریە هەنوکەییەکەی نەك لە خودی مەسەلەکان، بەڵکو لە ئێمەدا بێت، چونکە هەنووکە ئەقڵ لە دەروونی ئێمەدا، لە بەرامبەر ئەو شتانەی کە لە سروشتدا و لە هەموویان ئاشکراترن، وەك چاوەکانی شەمشەمە کوێرەیە لە بەرامبەر رووناکی رۆژدا.

کەواتە دادپەروەرانەیە کە ئێمە نە تەنیا لە گەڵ ئەو کەسانەی کە لە بیروباوەڕدا هاوڕایین، بەڵکو هاوکات لەو کەسانەش کە بڕواگەلێکی روکەشیان دەربڕیووە، سوپاسگوزاری بکەین، چونکە ئەمانیش لەم بارەیەوە پشکێکیان هەبووە، و توانایی

---

[1] بەراورد بکرێت لەگەڵ وەرگێڕانی ئازادی کە((یعقوب بن اسحق الکندی)) لەم بارەیەوە، لە ((رسائل الکندی الفلسفیە))،قاهرە،١٩٥٠ ،لا ١٢٩، ئەیگێڕێتەوە، و هەروەها دێرەکانی یەکەم،لا ١٠٣.

بیری (هزری) ئێمەیان لە پێشترەوە پەروەردە کردووە(١٥) چونکە ئەگەر((تیموسێئۆس)) [1] نەبووایـە، ئێمـە زۆرێـك لـە شـیعرەکان و ئاهەنگـە چـڕینەرەکانمان نـەدەبوو، و ئەگەر((فرونیس) ) [2] نەبووایە،((تیموسێئوس )) یش بوونی نەدەبوو، هەر بەم شێوەیەش لەبارەی ئەو کەسانەی کە لەبارەی راستیەوە قسەیان کردووە، چونکە ئێمە هەندێك لە بڕواکانمان لەمانەوە گرتووە، لە کاتێکدا کە ئەوانی تریش هۆکاری بوونی ئەوان بوون.

ئەمـە دروسـتە، کـە فەلـسەفە بەناسـینی راسـتی ئـەزانرێت، چـونکە ئامانجی(٢٠)((ناسینی تیۆری)) راستی و ئامانجی((ناسینی کرداری)) ،کردارە، چونکە پیاوانی ئیش هەرچەندە سەیری چۆنایەتی شتەکان ئەکەن، بەڵام مەبەستیان گەڕان بە دوای خـودی هۆکـار نیـە، بـەڵکو پەیوەسـت کردنیـەتی بـە بەکارهێنانـە رێـژەیی و هەنوکەییەکەیەوە، بەڵام ئێمە ئەوەی کە راستیە، بە بێ((ناسینی)) هۆکارەکـەی ناناسین، هـەر شتێك کـە چۆنایەتیەك بۆ شتە هاوناوەکانی تری بگوێزێتـەوە، خۆشی پشکی لـە ئامـانجێتی ئـەو چۆنایەتیەدا هەیـە(٢٥)، بۆ نموونـە، ئـاگر گەرمترینـە، چونکە هۆکـاری گـەرمی لـە هـەموو شتەکانی تـردا هەیـە، لەبـەر ئەمـە ئـەو شتە((راستترین))ە کـە ئەبێتـە هۆکاری ((راستێتی)) شتەکانی دواتر، کەواتە((بنەماکان)) یـان((رەچەڵەکەکان) بوونـەوەر گـەلێکن کـە هەمیـشە و وەك پێویـست، ((راسـتەقینەترینن))،چـونکە ئەمانـە تـەنیا جـار ناجـار ((راسـتەقینە)) نـین، و هـیچ شـتێك هۆکـاری بوونیـان نیـە، بەڵکو ئـەوان هۆکـاری شتانێکی تـرن،(٣٠) بـە شـێوەیەك کـە {هـەر شتێك بـەو ئەندازەیـە خـاوەنی راسـتیە کـە خاوەنی بوونە}.

[1] Timotheos، خـەڵکی شـاری میلیتـۆس،(مـاوەی ساڵەکانی ٣٦٠-٤٥-پ.ن) و ماویـەکیش دانیـشتووی شـاری ئاتن بووە، و و لـە هاورێکـانی((یۆریپیـدێس)) ئـەژمار کراوە،لەوەوە لـە نزیکـەی ٢٠٠ دێـڕە شیعر لە پەخشانێکی بەناو((ئێرانیەکان)) بە جێماوەتەوە.

[2] Phrynis خەڵکی شاری((موتیلێنە)) کە لە نێوەی سەدەی پێنجەمی پ.ز ژیاوەو ژەنیار و ئاوازدانەری گیتار و مامۆستای ((تیمۆسێنۆس))یشە.

## "وەرزی دووەم"

# ( زنجیرەی هۆکارەکان، ناتوانێت ناکۆتا بێت )

کەواتە روونە کە ((بنەما)) بوونی هەیە،و هۆکارەکان لە رێکیەکی رێکدا، ناکۆتان، نەك لە جۆردا، چونکە هیچ شتێك ناتوانێت، هەورەوەك مادە(هیولی)[1]لەشتەکانی تردا ناکۆتا بێتە بوون، (بۆ نموونە، گۆشت لە زەوی، زەوی لە هەوا، هەوا لە ئاگر، و ...بە بێ وەستان)،(٥) و نە سەرچاوەی جوولە نەتوانێت ناکۆتا بێت،(بۆ نموونە مرۆڤ لە هەوادا بجوولێت، هەوا لە خۆر، خۆر لە((نەبەردی)) و هتد..تا ناکۆتا).هەر لەبەر ئەمە ئەوەی کە شتێك لەبەر ئەوە (واتە هۆکاری ئامانجی(نادیار =دوور) to hou heneka)یش ،ناتوانێت ناکۆتا بێت، وەك بەرێگاداچوون لەبەر تەندروستی، ئەم(دانەیە) لەبەر خۆشبەختی، و خۆشبەختی لەبەر شتێکی تر، و ..هتد، و هەمیشە شتێك لەبەر شتێکی تر ئەبێت (١٠) ،لە بارەی ((چیەتی))(ماهیەت) یش هەر بەم شێوەیەیە، چونکە ((نێوەندیەکان))(شتەکانی ناوەراست) کە خاوەنی پێشکەوت و دواکەوتن، ((پێشکەوت)) وەك پێویستی هۆکاری ئەو شتانەیە کە لە دوایەوەن، چونکە ئەگەر بکرێت بڵێین کە کام یەك لەم سێ هۆکارەیە، ئەبێت بڵێین یەکەمی، (چونکە) کۆتاترینیان، بە هیچ شێوەیەك نیە، چونکە ((دواکەوت=کۆتاترین))هۆکاری هیچ شتێك نیە،(١٥) و((نێوەندی))((ناوەراستینەش)) هۆکار نیە، چون هۆکار تەنیا یەکێکە، و جیاوازی ناکات کە یەك((نێوان)) یان زیاتر بێت، یان خاوەن کۆتایی یان ناکۆتا، بەڵام لەو بەشانەی کە بەم شێوەیە ناکۆتان، و لە ناکۆتادا، هەموو بەشەکان، تابگاتە چرکەی

---

[1] ئاماژەیە بۆ بڕواکەی ئیمپیدۆکلیس.

هەنووکـــەیی، بـــە شـــێوەیەکی یەکـــسان نێوەنـــدین(نێـــوان–ن)، بـــە شـــێوەیەك ئەگەر((یەکەمین))ێك بوونی نەبێت، هۆکارێکیش((لەم نێوەندەدا) بوونی نیە.

بەڵام هاوکات لەوانە نیە کە ئەوەی لە سەرەوە سەرەتایەکی هەیە، بەرەو خوارەوە تا ناکۆتا بڕواتە پێشەوە، وەك چۆن، بۆ نموونە ئاو لە ئاگر بێت و لە ئاو و خاك، و بەو شێوەیە هەمیشە رەگـەزێك یـان شتێکی تـر دێتـە بـوون، چـونکە شتێك لـە شـتیك، بە دوومانا، دێتە بوون(نەك بەو مانایەی کە ((لە)) بەمانای((لە دوای)) دێت، بە شێوەیەك کە بڵێین یاریەکانی ئۆلۆمپیك لە یاریەکانی ئیستمی یەوە دێن) یان بەم مانایەی کە لە منداڵەوە لەبەر ئـەوەی کـە لـەناو ئەچێت، پیـاو دروسـت ئـەبێت و دێتـە بوون،هـەر بـەو مانایـەی دروسـت بـوونی هـەوا لـە ئـاو،(٢٥)ئەگـەر بڵێین کە لـە منداڵێکەوە پیاوێك دێتـە بوون،مەبەسـت ئـەوەیـە کـە لـە((بووێنراو )) (( ببـوو)) یـان لـە ناتـەواوێك، تـەواوێك دێتـە بـوون، چـونکە بەشێوەیەك کـە((بـوون))(genesis) هەمیـشە لـە نێـوان(( بوونایـەتی))و و((نـــەبوون))دایـــە، بـــە هـــەمان شـــێوە کـــە((بـــووێنراو)) نێوەندایـــەتی بوونـــەوەر و نابوونـەوەر((نـەبوو))ە،فێرکـەر، زانایـەکی ((ببـوو))ە، و گوتەکـەی ئێمـە بـەو مانایـەیـە کـە زانا((لە))فێرکارەوە دێت(٣٠).

٩٩٤b

لە لایەکی ترەوە، ئەوەی کە((لـە))شـتێکی ترەوە دێتـە بـوون، بە شێوەیەك کە بڵێین ئاو لە هەوا، بەمانای ئەوەیە کە ئەم دانەیەیان(واتە هـەوا) لێك ئەپچرێت و لەناوئەچێت، بـەم هۆیـەوە لـەم شێوە باروخانـەدا، شتەکان ناگەرێنـەوە بۆ یـەکتری و((لـە)) پیـاوەوە دووبـارە منـداڵ نایەتـەوە بوون،چـونکە لـە((ببـوو)) هـیچ((بـووێنراو))ێك نایـەت، بـەڵکو ئـەوەی کـە لـەدوای( (ببـوون))ەوە هەیە،هـەمان شـێوەیە کـە ڕۆژ((لـە)) سـەحەرگاوە دێت، کەواتە لەدوای سـەحەرگاوەیە، و لەبەرئەمـە، سـەحەرگا لـە ڕۆژەوە نایـەت، بـەڵام لـە باقی شـتەکاندا، شـتەکان بـۆ یـەکتری ئەگەرێنـەوە، لـە هـەر شێوەیەکدا ئەگـەری ئـەوە نیـە کـە شتەکان تا ناکۆتا پێش بچن، چونکە لە شێوەی یەکەمدا شتەکانی ناوەراست، بێگومان کۆتاییـەکیان هەیـە(٥) و لـە شێوەی دووەمـدا شـتەکان بـۆ یـەکتری ئەگەرێنـەوە، چـونکە لەناوچـوونی یـەکێك، دروسـت بـوونی ئـەوی تـرە، لـە هـەمان کاتـدا ئەگـەری نیـە، کە((یەکـەمین)) کـە جاویـدان یـان هەمیشەییە، لـەناو بچێت، چونکە لەبەر ئـەوەی پەیدا

بوون لە گووزەری بەرزبونەوەدا، ناکۆتا نیە، کەواتە ئەوەی کە ((یەکەمین))ە، و لە(( لەناوچوونی)) ئەو شتێکی تر نایەتە بوون، ناتوانێت جاویدان بێت[1].

لە لایەکی ترەوە، ئەوەی کە لەبەر ئەو شتەیە، دیسانەوە ئامانجێکە(telos)، بەلاّم بەو شێوەیەیە، کە لەبەر شتێکی تر(١٠) بوونی نیە، بەڵکو بوونی شتەکانی تر لەبەر ئەوە، کەواتە ئەگەر((کۆتاترین to eskhaton)) ئامانجێك کە لەم جۆرەیە، ناتوانێت، ناکۆتا بێت، بەلاّم ئەگەر بوونی نیە، هۆکاری ئامانجی(یان ئەوەی لەبەر ئەو شتەیە)[2]یش بوونی نەدەبوو، وکەسانێك کە ناکۆتایی ئەهێننە ئارا بێ ئەوەی بزانن، سروشتی((چاکە)) لەناو ئەبەن،( چونکە هیچ کەس دەست بە ئەنجامی ئیشێك ناکات، و ئەگەر بزانێت ناگات بە کۆتاییەك) و هاوکات لەسەر بنەمای گووتەکەی ئەمان، ئەقڵیش لە جیهاندا بوونی نیە(١٥)، چونکە هەر کەسێك کە خاوەنی ئەقڵە، هەمیشە ئیشێك لەبەر شتێك ئەنجام ئەدات، وئەم شتە هەمان سنور و کۆتاییە،چونکە (ئامانج) هەمان کۆتاییە.

بەلاّك هاوکات((چیەتی)) ناتوانێت بۆ سنورێك (واتە پێناسەیەك)[3] بگەرێنرێتەوە، کە لە روانگەی ماناوە بەرفراوانترە، چونکە ((ئاستی-سنوری))پێشتر هەمیشە((ئاست=سنور))ێکی بەرفراوانترە، و((ئاست-سنوور))ی ((دواکەوت-کۆتایی)) بەم شێوەیە نیە، ئەوەی کە لە یەکەمیەوە بوونی نیە، لەدوای ئەویشەوە بوونی نیە،(٢٠) و کەسانێك کە ئەم قسەیە ئەکەن، زانست ، لەناو ئەبەن و بە لەناوبەری ئەزانن،چونکە پێش ئەوەی بگەین بە ((ئاستێك=سنوور))ێکی جیا نەبووەوە، تێگەیشتن مەحاڵە، و لە سەر بنەمای ئەو پێوانەیە، ناسینیش(مەعریفەش) بوونی نیە، چونکە ئەندێشە چۆن ئەتوانێت شت گەلێکی لەم شێوە ناکۆتاییە، پەی پێ ببات؟ ئەم بابەتەش هەمان بابەتی((هێڵ))نیە، کە هەرچەندە لە روانگەی دابەشخوازیەوە هیچ وەستانێکی نیە .بەلاّم بێ ئەوەی بوەستێت، شایەنی پەی پێ بردن نیە،( و بەم هۆیەوە کەسێك کە هێڵێکی ناکۆتا ئەپێوێت، ناتوانێت بەشەکانی بژمێرێت)(٢٥) بەلاّم مادەش ئەبێت لە جووڵاویەکدا وێنا بکرێت، وهیچ شتێکی ناکۆتا خاوەنی بوون نیە، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، خودی ناکۆتایی،ناکۆتا نیە.

---

[1] لە روون کردنەوەی ئەم دەبرینەدا.ب.بۆ ((میتافیزیك)) Ross، بەرگی یەکەم، ل ٢١٨ و ((میتافیزیك)) j.trico لە بەرگی دووەم، بەرگی یەکەم، ل ١١٤.

[2] خوێنەری بەرێز لێت ئاڵۆز نەبێت((هۆکاری ئامانجی)) ئەرستۆ بە((لەبەر ئەو)) ناوی ئەهێنێت زۆرجار..واتە ئەو پاڵنەرەی کە ((لەبەر شتێك))بوونی هەیە. وەك پیاسە کردن لەبەر تەندروستی.

[3] بەرامبەر ووشەی(( horismos)) کە بە هەردوو مانای((سنوور))و((پێناسە))یە.

بەڵام ئەگەر جۆری هۆکارەکان لە ژمارەدا، ناکۆتا بوونایە، ناسین(زانست) هاوکات ئەگەری نەبوو، چونکە ئێمە تەنیا کاتێك وێنای ئەوە ئەکەین کە گەیشتبووینەتە ناسینی شتێك،و هۆکارەکانیمان ناسیبێت.(٣٠) بەڵام ئەوەی کە ناکۆتایانە ((زیاد-خوازە))، ناتوانێت لە کاتێکی سنورداردا بپێورێت.

## "وەرزی سێهەم"

# (چەند تێبینییەك لە بارەی شێواز)

٩٩٥a

گوێ راگری بۆ فێرکاریەکان، لەسەر بنەمای خووەکانی ئێمە روو ئەدەن، ئێمە چاوەڕێین هەمان قسە بووترێت کە ئێمە خوومان پێیەوە گرتووە، و ئەوی کە بەدەرە لەوە، بەهەمان بەها نایەتە بەرچاو، بەڵکو بەهۆی خوونەگرتووییەکەیەوە بێماناتر و بێگانەتر خۆی ئەنوێنێت، چونکە ئەوەی خووگرتووە، تێگەیشتنییە، ئەم خاڵەی کە خوو تا چ ئەندازە بەهێزە، یاسا گەلێك پیشانی ئەدەن کە لەواندا توخم گەلێکی ئەفسانەیی منداڵانە، و لەسەر بنەمای خوو، لەسەر مەعریفەی ئێمە، زاڵن بەسەریاندا، بەم شێوەیە هەندێك بۆ کەسێك کە بە شێوەی بیرکاریزان، قسە نەکات و هەندێکی تر بۆ کەسێك کە نموونەکان و ئایدیەکان، نەهێنێتەوە، گوێ ناگرن، و هەندێکیش شایەتیەکانی شاعیر ئەخوازن، هاوکات هەندێك ئەیانەوێت کە لە هەموو شتەکاندا وردبینیەکی تەواو بکرێت، و هەندێکیش لەوە دڵگران ئەبن، یان بەو هۆیە کە ناتوانن قسەکان پێکەوە گری بدەن، یان بەو هۆیەی کە ئەوە بە تەسك بینیەکی گێلانە ئەژمار ئەکەن، لەبەرئەوە وردبینی و تەسك بینی،چ لە مامەڵەکان و پێدان و وەرگرتنەکان و چ لە بەڵگە هێنانەوەو گووتار، بە بڕوای هەندێك لە خەڵکی ئیشێکی پەست و نەخوازراوە، لەبەر ئەمە مرۆڤ ئەبێت لە خۆسەرقاڵکردن بە هەر بەڵگەهێنانەوەیەك، پێشتر فێرکراو و ئامادەکراو بێت، چونکە بێ سوودە کە لەهەمان کاتدا هەم بەدوای مەعریفەدا بگەڕێین و هەم شێوە و شێوازی بەدەست هێنانی مەعریفە، بەدەستهێنانی هیچ یەك لەمانە ئاسان نیە، توێژینەوەی بیرکاریانە نەك لەهەموو بوارەکان بەڵکو تەنیا لە بواری ئەو شتانەدا ئەبێت داوای بکەین کە تێکهەڵکێشراوی مادە نین، ،هەر لەبەر ئەمە

شێوازی بیرکاری شێوازی زانستی سروشتی نیه، چونکه هەموو سروشت بە ئەگەرێکی زۆر خاوەنی مادەیە، کەواتە یەکەمجار ئەبێت توێژینەوە لەسەر ئەوە بکەین کە سروشت چیە، چونکە بەم شێوەیە روون ئەبێتەوە کە زانستی سروشتی خەریکی چ شتانێکە؟(و ئایا ئەرکی یەك یان چەند زانستێکە کە توێژینەوە لەسەر هۆکارەکان و بنەماکان بکەن؟)(٢٠)

"وەرزی یەکەم"

## ( مەسەلە دژوارەکان و جۆرەکانیان )

(٢٤)لە زانستێکدا کە ئەپشکنرێت،یەکەم،خۆسەرقاڵکردن بە(گوومانارویەکان) یان دژواریەکان، پێویستە، کە پیش هەموویان دێنە سەر رێمان(٢٥) ئەمانە هەم تیۆر گەلێکی جۆراوجۆر لە خۆ ئەگرن کە ئەوانی تر خستوونیانەتە ڕوو و هەم هەر جۆرە بڕوا گەلێکی تر، کە بەدەرن لەمانە،و((بیناگایی)) لەبەرامبەریان نووێنراوە، و بۆ کەسانێك کە بیانەوێت لەم نێوانەدا رێگایەك بدۆزنەوە، سودمەندە، کە بەجوانی توێژینەوە و پێداچوونەوە لەسەر ئەم دژوارییانە بکەن، چونکە ئاسایشی دواتر، ئەنجامی چارەسەری دژواریەکانی پێشترە، و بە بێ زانست و ناسین، کردنەوەی ئەو گرێیە مەحاڵە،(٣٠)، بەلام ((حەپەسانی ئەندێشە)) گرێی ناو ئەم بابەتە پیشان ئەدات، چونکە ئەندێشە لە حەپەسانی خۆیدا وەك بارودۆخی پیاوێکە لە بەندینحانەدا، چونکە لە هەر دوو بوارەکەدا پێشکەوت، مەحاڵە، لەبەر ئەمەش پیش هەموو شتێك ئەبێت توێژینەوەی دژواریەکان بکەین، لەلایەکەوە لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسمان کردن و لە لایەکی ترەوە بەو هۆیەوە، کەسێك کە دەست ئەکات بە پشکنین، بێ ئەوەی یەکەمجار(٣٥) دژواریەکان لەبەر چاو بگرێت، هەروەك کەسانێکە کە نازانن بەرەو کوێ هەنگاو بنێن، بەدەر لەمەش، کەسێکی لەو شێوەیە تەنانەت نازانێت کە لە هەر چرکەیەکدا بە خواستەکەی خۆی گەیشتوە، یان نا،ئامانج بۆ ئەو روون نیە.

٩٩٥b

لە کاتێکدا کە بۆ ئەو کەسانەی کە پێشتر خۆیان خەریکی دژواریەکان کردووە، ئامانج، ڕوونە.

زیاد لەمەش، کەسێك کە هەموو بەڵگە ڕەتکەرەوەکان ئەبیستێت-وەك بڵێی هەردوولا لە دادگادان-ئەبێت باشتر بتوانێت داوەری بکات.

یەکەمین مەسەلەی دژوار(aporia) پەیوستە بە بابەتێك کە ئێمە لە(٥) تێبینیەکانی خۆمان لە پێشەکی کتێبەکەدا[١]، خستۆتە ڕوو:

١. ئایا توێژینەوەی هۆکارەکان پەیوەستن بە زانستێك یان زیاتر[٢] لەیەك زانست؟

٢. ئایا ئەم زانستە ئەبێت تەنیا پێداچوونەوەی بنەمای ناوەڕۆکەکان بکات، یان هاوکات ئەو بنەمایانەش کە هەموو خەڵکی لە گریمانەو سەلماندنەکانی خۆیاندا، بەکاریان ئەهێنن، بۆ نموونە ئایا ئەکرێت شتێك لەهەمان کاتدا هەم پێویست بێت و هەم پێویست نەبێت؟ (هەم خوازراو بێت و هەم ڕەتکراوە) و هەموو پرسیارەکانی تری لەم شێوەیە(١٠). و ئەگەر ئەم زانستە پەیوەندی بە ناوەڕۆکەوە هەیە،

٣. ئایا ئەمە یەك زانستە کە سەرقاڵی هەموو ناوەڕۆکەکان ئەبێت، یان زیاترە لەیەك زانستە؟ و ئەگەر زیاد لەیەکێکن، ئایا هەموویان هاوڕەگەزن، یان هەندێکیان ئەبێت ناو بنێین ((جۆرەکانی دانایی)) و هەندێکی تریان، بە شتێکی تر؟[٣] و ئەمەش پرسیارێکە کە ئەبێت توێژینەوەو پێداچوونەوەی لەسەر بکرێت کە :

٤. ئایا ئەبێت بووترێت کە تەنیا((ناوەڕۆکە هەستپێکراوەکان)) بونیان هەیە یان(١٥) بەدەر لەمانە، ناوەڕۆك گەلێکی تریش بوونیان هەیە؟ و ئایا لەم هەست پێنەکراوانە تەنیا یەك ڕەگەز لە ناوەڕۆکەکان بەدەست دێت یان خاوەنی ((گەلێك ڕەگەزن))، هەروەك لای ئەو کەسانەی کە (ئایدیەکان)) و بابەتەکانی بیرکاری لە نێوان ئەمان و هەست پێکراوەکان دائەنێن؟ [٤]و لەم بارەیەشەوە بەو شێوەیەی کە ووتمان ، ئەبێت توێژینەوە بکەین و هاوکات:

---

[١] واتە گووتار لەبارەی کتێبی ئالفای گەورە.

[٢] سەیری b٢٦ تا ٩٩٦a١٨

[٣] سەیری ٩٩٨b٢٦تا ٩٩٧a١٥ کە مەسەلەکە لەوێدا دائەڕێژرێت، پاشان لە کتێبی چوارەم((گاما))، وەرزی دووەم، و کتێبی شەشەم،(E) وەرزی یەکەم، وەڵام ئەدرێتەوە.

[٤] سەیری ٩٩٧A٣٤ تا ٩٩٨A١٩، کە لەوێدا مەسەلەکە دارێژراوەو لە کتێبی چواردەیەم، وەرزەکانی شەشەم تا نۆیەم وەڵام ئەدرێنەوە.

٥. ئایا توێژینەوە ئەبێت تەنیا لەبارەی ناوەرۆکەکانەوە بێت یان هاوکات لەبارەی ((هەمان tauton)) و ((ئەوی تر-غیر)) و((وەك یەك))و((ناوەك یەك)) و((دژ))و((پێشکەوت))و((دواکەوت))(پێشتر و دواتر) و هەموو ئەو چەمکانەی تر کە((دیالێکتیەکان)) ئەیانەوێت لەبارەیانەوە توێژینەوە بکەن؟ لەکاتێکدا کە توێژینەوەکەی خۆیان لەسەر بنەمای بڕوا باوە بەناوبانگە گشتیەکان جێگیر ئەکەن، ئیشی چ کەسێکە کە لەبارەی هەموو ئەمانەوە توێژینەوە بکات؟! (٢٥)بەدەر لەمەش ئێمە ئەبێت لەبارەی هەموو ((دەرکەوتە خودیەکانی)) ئەم شتانە توێژینەوە بکەین، و نە تەنیا ئەوەی(تێبگەین) هەریەك لەمانە چیە، بەڵکو هاوکات(ئەبێت تێبگەین) کە ئایا هەریەك خاوەنی(دژێکە enantion)و ئایا:

٦. بنەما یەکەمینەکان و توخمەکان لە ریزی((رەگەزەکان))ن، یان بەش گەلێکن کە لە هەر شتێکدا لەدوای دابەشکاری و جیاکردنەوە بۆ ئەوانە بوونیان هەیە،و ئەگەر:

٧. ئەاونە، ((رەگەز گەلێکن))،ئایا هەر ئەوانەن کە لە لایەن تاکەکانەوە هەڵئەگیرێن، یان((رەگەزە یەکەمینەکان))ن، بۆ نموونە وەك ئەوەی ئایا((ئاژەڵ)) یان ((مرۆڤ)) (٣٠))، بنەمای یەکەمینە و لەبەرامبەر تاکەکانی،یەکەمینەتێکی زیاتری هەیە یان نا؟[1] بەڵام زیاد لە هەموو شتێك ئەبێت لەم بارەیەوە توێژینەوە بکەین کە:

٨. ئایا هۆکارێك ((لە خۆیدا)) بێجگە لە مادە دەست ئەکەوێت، یان نا، و ئەگەر هەیە ئایا جیایە لە مادە یان ،نا، و ئایا لە ژمارەدا یەکێکە یان زیاتر(٣٥) و ئایا جگە لە((گشتێکی دیاری کراو sunolon)) ((شتێك))و، (مەبەستی من لە شتی دیاری کراو، ئەوەیە کە لە پێناسەی مادەدا ئەوترێت) یان ((شتێك)) نیە، یان لەهەندێ حاڵەتدا هەیە و لە هەندێکی تردا نیە، و ئەم حاڵەتانە چین؟[2] وهاوکات ئەبێت بپرسین کە:

٩٩٦a

٩. ئایا بنەماکان لە ژمارە و جۆردا سنووردارن یان بێسنوورن، هەم لە چەمکەکان(پێناسەکان) و هەم لە بابەتەکاندا[3]، و

---

[1] ئەم مەسەلەیە لە وەرزی سێهەم قسەی لەسەر ئەکرێت، و لە کتێبی حەوتەم((زێتا))، وەرزی دەیەم و دوانزەیەم، و سیانزەیەم، وەڵام دراوەتەوە.

[2] لە وەرزی چوارەمدا دارێژراوە و لە کتێبی حەوتەم، وەرزەکانی هەشتەم و سیانزەیەم و چواردەیەم، و کتێبی دوانزەیەم((لا مبدا))،وەرزەکانی شەشەم تا دەیەم و کتێبی سیانزەیەم((موو))، وەرزی دەیەم وەڵام دراوەتەوە.

[3] ئەم پرسیارەش ئەرستۆ لە لای ئەرستۆ لە وەرزی چواردەیەم دای ئەرێژێت و لە کتێبی دوانزەیەم،وەرزەکانی چواردەیەم و پێنجەم و کتێبی سیانزەیەم، وەرزی دەیەم وەڵامی ئەدرێتەوە.

١٠. ئایا بنەمای شتە لەناوچووەکان، هەمان بنەمای شتە لەناو نەچووەکان،یان بنەمای ترن، و ئایا هەموو (بنەماکان) لەناوچوون، یان تەنیا بنەمای شتە لەناوچووەکان، لەناو ئەچن[1]. ئەوکات سەختترین و سەرسوڕهێنەرترین پرسیار دێتە(٥) ناوەوە کە:

١١. ئایا ((یەک-تاک-تەنیا to hen))و((بوونەوەر to on))(بەهەمان شێوە کە ئەفلاتونیەکان و پیتاگۆریەکان ئەڵێن) شتێکی جیاواز نین،،یان ناوەرۆکی شتەکانن، یان بەم شێوەیە نیە، بەڵکوو بوونیاد(بابەت) شتێکی ترە(بۆ نموونە ئەشق،(سۆن) بە گووتەی((ئیمپێدوکلێس)) یان ئاگر بە گووتەی یەکێکی تر،و ئاو هەوا، بە گووتەی ئەوانی تر)[2] و هاوکات:

١٢. ئایا بنەماکان گشتایەتین، یان وەك تاکەکان شتن[3]؟(١٠) و

١٣. ئایا ((خۆهێزی)) یان ((خۆکردارێتی)) بوونی هەیە[4]؟ و لەگەڵ ئەوەشدا ئایا ئەم دووانە پەیوەستن بە شتێکی بەدەر لە جووڵە[5]؟ لەبەر ئەوە ئەم پرسیارانەش گەلێك دژواریی فراوانیان هەیە، بەدەر لەمەش ئەبێت بپرسین کە:

١٤. ئایا ژمارەکان، هێڵەکان، شکڵ وخاڵی جۆرێك لە ناوەرۆکەکانن، یان نا، و ئەگەر ناوەرۆکن(١٥) ئایا جیان لە هەست پێکراوەکان یان لەواندا بونیان هەیە، گەیشتن بە راستی لەبارەی هەموو پرسیارەکان، نە تەنیا دژوارە، بەڵکو تەنانەت دەربڕینی دروستی ئەم دژوارییانەش ئاسان نیە.

[1] لە وەرزی چواردەیەمدا ئەخرێتە ڕوو، بڕواکانی ئەرستۆ لەم بارەیەوە لە کتێبەکانی هەشتەم ، وەرزی حەوتەم تا دەیەم، کتێبی دوانزەیەم وەرزەکانی یەکەم تا حەوتەم،بەدەست دێت.

[2] بە ریز((هراکلایتۆس))و((تالیس))((ئاناکسیمێنێس)).

[3] ب.بۆ: ١٧-١٠٠٢<a٥

[4] مەسەلەکە لە بارەی وەرزی هەشتەمەوە ئەخرێتە ڕوو، وەڵامەکەی ئەبێت لە کتێبی هەوتەم، وەرزەکانی سیانزەیەم، و چواردەیەم، و کتێبی سیانزەیەم،وەرزی دەیەم بەدەست دێت.

[5] باسەکەی لە وەرزی شەشەمدایە، پەیوەستی نێوان ((هێزەکی بوون))و((کردارەکی بوون))، لە کتێبی نۆیەم((سێتا))،وەرزەکانی یەکەم تا نۆیەم ئەخرێنە بەر توێژینەوە، و پەیوەندی نێوان((کردارەکی بوون ))و جووڵە لەکتێبی دوانزەیەم، وەرزەکانی شەشەم و حەوتەم ئەخرێتە ڕوو.

"ورزی دووەم"

# {( دژوارییەکانی:( ١ )،( ٢ )،( ٣ )،( ٥ )،( ٤ )}

(١) یەکەمجار ئەبێت بپەرژێینە سەر مەسەلەیەك کە لەسەرەتاوە قسەمان لێی کرد،(ئەم مەسەلەیە) کە ئایا بیرکردنەوە لە هەموو رەگەزەکانی هۆکارەکان، ئیشی یەك زانستە یان(ئیشی) زیاد لە یەك(زانست)؟(٢٠)چونکە چۆن یەك زانست ئەتوانێت بنەماکان، ئەگەر دژ نەبن، بناسێت؟ بەدەر لەمەش هەموو بنەماکان لە زۆرێك لە بوونەوەرەکاندا ئامادە نین، چونکە چۆن بنەمای جووڵە یان سروشتی چاکە بۆ شتە نەجووڵاوەکان ئەتوانێت بوونی هەبێت، ئەگەر لە واقعدا هەر شتێك لە خۆیدا و لەسەر بنەمای سروشتی خۆی چاکە، ئەوە ئامانجێکە، و ئەمەش(٢٥) هۆیەکە کە شتەکانی تر لەبەر ئەو،هەن و دێنە بوون، و لەگەڵ ئەوەشدا ئامانج و((لەبەر شتێك))،لە واقعدا (ئامانجی))جۆرێکە لە کردار، و هەموو کردارەکان جووڵەیان هەیە؟ کەواتە لەوانە نیە کە ئەم بنەمایە(واتە جووڵە) لە شتە نەجووڵاوەکاندا بوونی هەبێت، یان ((چاکەیەك لە خۆیدا autoagathon)) بوونی هەبێت، لێرەوەیە کە لە بیرکاریدا شتێك بەیارمەتی ئەم هۆکارە روون ناکرێتەوە،و(٣٠) لەوێدا گرمانەیەکی لەم شێوەیەش دەست ناکەوێت، کە بڵێت(( لەبەر ئەم هۆیە باشتر یان خراپترە))، لە واقعدا، لەبیرکاریدا، هیچ کەس ئاماژە بە شتێکی لەم شێوەیە ناکات، هەر بەم هۆیەوەیە کە هەندێك لە ((سۆفیستەکان))(سۆفستاییەکان) بۆ نموونە(کەسانێکی) وەك((ئاریستیپۆس))[١]،

---

[١] Aristippos خەڵکی شاری ((کورنیە))(سیرن) قوتابی سوقرات، و دانەری قوتابخانەی((کورنائیەکان))، لە ماوەی ساڵەکانی ٤٣٥ تا ٣٥٠ی پێش لەدایك بوونی مەسیح، ژیاوە، لەبارەی ئەو،ب.بۆ بگەرێنەوە بۆ بەرهەمەکەی تری وەرگێر(( لە سووقراتەوە تا سوقرات))، چاپی یەکەم، لا ٤١، یان چاپی دووەم، ١٣٥٦، لا ٧٩، و هەربەم

گاڵتەیان بە بیرکاری ئەهات، چونکە( بە بڕوای ئەو وهاوبیرەکانی) لە هوونەرەکانی تردا، تەنانەت لە ئاسایی ترین ئیشە دەستیەکانی وەك دارتاشی ،هەمیشە ئەم بەڵگەیە ئەهێنرێتەوە کە((چونکە باشتر،یان خراپترە))(٣٥) لە کاتێکدا کە لە بیرکاریدا بە هیچ شێوەیەك قسە لە((باش و خراپ)) ناکرێت[1].

٩٩٦b

بەڵام ئەگەر زانست گەلێکی زۆر لەبارەی هۆکارەکانەوە بەدەست بێن، و بۆ هەر بنەمایەك، زانستێکی دیاری کراو هەبێت، کام یەکیان ئەتوانین بەو زانستە ناوببەین کە ئێمە بە داویدا وێڵین، ولە سەرقاڵیەکانی ئەم زانستە، ئەتوانین چ کەسێك لە بابەتی ژێر پشکنینەکەی خۆماندا، بە لێوەشاوەترین و بەئاگاترین(کەس) بزانین، چونکە لەوانەیە کە بۆ یەك شت هەموو جۆری هۆکارەکان بوونیان هەبێت، بۆ نموونە لە بارەی خانوو،بنەمای جووڵە لەلایەکەوە، ((هوونەر)) لەلایەکی ترەوە، و لەلایەکی تریشەوە((بیناسان)) واتە((هۆکاری بکەری))ە، و((لەبەر ئەو)( واتە هۆکاری ئامانجی) هەمان دروست کردنی خانووە، و مادە(واتە هۆکاری مادی) خاك و بەرد، و شێوە (واتە هۆکاری شێوەیی) پێناسە یان ئاست و سنورەکەیەتی، لەسەر بنەمای ئەوەی کە پێشتر دیاریمان کرد[2]،(ووتمان) کە کام یەك لە زانستەکان ئەتوانین بە ((دانایی))ناو ببەین، بەڵگەیەك لەبەردەستدایە کە هەریەك لەوانە بەم شێوەیە ناو بنێین(١٠) چونکە تا ئەوشوێنە کە(دانایی) بەرزترین و ڕێنوێنی ترینە و زانستەکانی تر بەراستی وەك (کەنیزەکەکانن))و ناتوانن دژایەتی بکەن، کەواتە ((ئامانج))و((چاکە)) هەمان((دانایی))ە، {چونکە باقی هۆکارەکانی تر لەبەرئەون}(واتە هۆکاری ئامانجی،بەڵام تا ئەوشوێنەی کە ئەومان وەك زانستی هۆکارە (یەکەمینەکان و ناسێنراوترین شتەکان پێناسە کرد[3] ئەتوانین زانستی ناوەڕۆك بە دانایی بزانین، چونکە لە کاتێکدا کە یەك و هەمان شت بتوانین بە چەند شێوەیەکی جیاواز بناسین(١٥) ئێمە ئەڵێین کەسێك کە شتێك لە ڕوانگەی بوونایەتیەکەیەوە ئەناسێت، زیاتر لە کەسێك

---

شێوەیە بگەڕێنەوە بۆ کتێبی توێژینەوەکییانەی((مانە باخ))((ئاریست و لەتە پاشماوەکانی کورنائیکیەکان)) لایدن کلن، ١٩٦١، پەیرەو کاری ئەم قوتابخانەیە باوەڕی بە بێ سوودی مەنتیق و بیرکاری هەبوو.

[1] بەڵام سوورقرات لە شوێن گەلێکدا بەرگری لە بیرکاری ئەکات، ب.بۆ: کتێبی سیانزەیەم، وەرزی سێیەم- ١٠٧٨a ١٠٧٧a.

[2] ب.بۆ: ١٩-١٩٨٢a٨.

[3] لە ٩٨٢a٣٠ تا ٩٨٢b٢.

ئەزانێت کە ئەو لەسەر بنەمای ((نەبوون)) ئەیناسێت، لە بارەی یەکەمیشەوە یەکێکیان زیاتر لەوی تریان ئەزانێت، و زۆرترین((دانایی)) کەسێك هەیەتی کە ((چیەتی to ti estin)) یەکەی ئەناسێت، نەك کەسێك کە((چۆنیەتی و چەندێتی یان کردار و کرداراندن))ەکەی لەسەر بنەمای سروشت ، هاوکات لەبارەی هەموو شتەکانی تریشەوە، تەنانەت ئەو شتانەی کە گریمانەخوازیشن، ئێمە کاتێك وێنا ئەکەین کە ناسینێك( یان زانستێك )بوونی هەیە کە بزانین ئەو شتە چیە(٢٠)(وەك ئەوەی بپرسین کە چوارگۆشێیەتی لاکێشەیەك چیە؟ و بڵێین کە ئەوە بەدەست هێنانی ناوەراستینەیەکی گوونجاوە لەگەڵ لاکانی، و بەم پێوانەیەشەوە لە بوارەکانی تردا)، بەلآم لە بارەی دروست بوونەکان و کردارو هەموو جۆرە لەناوچوونەکان، کاتێك کە سەرچاوە یان بنەمای جووڵە بناسین(ئەتوانین وێنا بکەین کە ئەوانمان ناسیوە)، و ئەمەش بەدەرە لە ئامانج و ،پێچەوانەشیەتی، لەبەر ئەمە دەر ئەکەوێت کە ناسینی هەریەك لەم هۆکارانە(٢٥) پەیوەستە بە زانستێکی سەربەخۆوە.[١]

(٢) بەلآم هاوکات لەبارەی((بنەما گریمانییەکان))یشەوە، ئەم مەسەلەیە شایەنی توێژینەوەیە کە ئایا بە یەك یان چەند زانستێکەوە پەیوەستن، مەبەستی من لە((بنەما گریمانەییەکان))((باوەرە هەمەکیەکانن))(بڕوا گشتیەکان))ە، کە هەمو کەسێك گریمانەکانی خۆی لەسەر بنەمای ئەوان دائەرێژێت، وەك ئەوەی کە هەر پێشەکیەك، پێویستانە یان ئیجابیە یان سلبی، و ئەوەش ئەگەری نیە کە شتێك لەهەمان کاتدا بوونی هەبێت و بونیشی نەبێت، هەموو پێشەکیەکانی تریش، وەك ئەمن(٣٠) کەواتە پرسیار ئەمەیە کە ئایا زانستی ئەم بنەمایانە و زانستی ناوەرۆك، یەکێکە، یان زانستێکی ترە(جیایە)؟ و ئەگەر یەك زانستیش نیە، کام یەك لەو دووانە ئەتوانین بە زانستێك ناوبنێین کە ئێمە هەنووکە بەداوایدا وێڵین؟

بەلآم پەیوەستی هەموو ئەمانە بە زانستێکەوە، ئەقڵانی نیە، چونکە بۆچی ئەبێت تێگەیشتنی ئەم بابەتانە زیاتر تایبەت بە ئەندازیاری بێت تا هەر زانستێکی تر؟(٣٥)

٩٩٧a

کەواتە، ئەگەر بە شێوەیەکی یەکسان پەیوەستە بە هەر زانستێکەوە، و ئەگەریشی نیە پەیوەست بێت بە هەموویانەوە، زانستێك کە سەرقاڵی ناسینی ناوەرۆکە، لە

---

[١] ب.بۆ: کتێبی چوارەم، وەرزی یەکەم.

بەرامبەر زانستەکانی تردا، لە ناسینی ئەم بابەتانەدا، بە هیچ شێوەیەك تایبەتمەندی نیە، و لەهەمان کاتدا زانستێك لەم بنەمایانە چۆن ئەتوانێت بوونی هەبێت؟ چونکە ئێمەش هەنووکە ئاشنای بوونی هەریەکەیانین، بەهەر حاڵ باقی زانستەکانی تر ئەوان هەروەك شتە ناسراوەکان بەکار ئەهێنن(٥) ، بەڵام ئەگەر زانستێکی گریمانەیی بوونی هەیە کە بیپەرژێتە سەریان، دەبوو رەگەزێکی بونیادیش بوونی هەبووایە، و هەندێك لەوانە ئەبێت روداوی گریمانەخواز، و ئەوانی تر(( یەکەمیەکان)) بوونایە،(چونکە ئەگەری ئەوە نیە کە بۆ هەموو شتێك گریمانەیەك بوونی هەبێت) چونکە گریمانە وەك پێویستیەك لە شتێك و لەبارەی شتێك و بۆ سەلماندنی شتێکە، و کەواتە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەموو شتەکان گریمانخوازەکان پەیوەستن بە رەگەزێکی تاق و تەنیاوە(١٠) چونکە هەموو زانستە گریمانەییەکان(یان جۆرەکانی گریمانەکان)،ئاسانکاریەکان (شتە ڕوونەکان)بەکار ئەهێنن.

بەڵام ئەگەر زانستی ناوەرۆك بەدەرە لە زانستی بنەمای گریمانەکان، کام یەك لەم دووانە بە سروشت لە پێشترە؟ چونکە سەرەتاییەکان(مەسەلە ڕوونەکان)، گشتی ترین وبە بنەمای هەموو(زانستەکان) ئەژمار ئەکرێن، و ئەگەر فەیلەسوف نەبووایە، (دەی) ئیشی کێیە کە لەبارەی راستی و درۆییان(یان راست و هەڵەیان) توێژینەوە بکات[1]؟

(٣) بەگشتی: ئایا بۆ هەمو ناوەرۆکەکان، یەك زانست،یان چەندین زانست بەدەست دێن، بەلا ّم ئەگەر((یەك)) زانست نەبێت، ئەم زانستە(بابەتی توێژینەوەکەی ئێمە) ئەبێت بپەرژێتە سەر چ جۆرە ناوەرۆك گەلێك؟ ئەوەی کە بڵێین یەك زانست ئەیپەرژێتە سەر هەموو ناوەرۆکەکان، ئەقڵانی و وەرگیراو نیە، چونکە لەو شێوەیەدا بۆ هەموو روداوەکان تەنیا یەك زانستی گریمانەیی بوونی دەبوو، ئەگەر لەهەر حاڵەتێکدا قبوڵ بکەین کە هەر زانستێکی گریمانەیی ئەیپەرژێتەی سەر بنەمای باوەڕە گشتیەکان(٢٠) و توێژینەوەی دەرکەوتە خودیەکان لە یەك بابەتدا ئەکات، لەسەر بنەمای ئەمە پێداچوونەوەی دەرکەوتە خودیەکەی رەگەزێك، لەسەر بنەمای هەمان باوەر، ئەرکی یەك زانستە، چونکە هەم بابەت بە((یەك))(زانست) وهەم پێشەکیەکان بە ((یەك)) زانستەوە پەیوەستن، چ هەمان ئەو زانستە (گریمانەییە) بێت چ زانستێکی تر، لەبارەی دەرکەوتەکانیشەوە بەم

بەراوردی بکەن لەگەڵ ٩٩٦b٢٣ تا ٩٩٧a١٥ لەگەڵ ١٠-٩٩٥b٦ و ٢٦-١٠٥٩a٢٣، وەڵامی ئەم پرسیارە لەکتێبی چوارەم،((گاما))، وەرزی سێهەم، ئەتوانرێت بەدەست بێت.[1]

شێوەیەیە، چ ئەم زانستانە توێژینەوەو پێداچوونەوەیان لەسەر بکەن، وەچ زانسێکی لەوان دروستکراو[1].

(٥) هاوکات ئەبێت بپرسین کە ئایا، توێژینەوەکەی ئێمە تەنیا پەیوەندی بە ناوەرۆکەکانەوە هەیە یان هاوکات لە گەڵ دەرکەوتەکانیشیانەوە(رووداوەکانیانەوە)؟وەك ئەوەی کە بڵێین کە ئەگەر((تەن))جۆرێکە لە ناوەرۆك و(لەگەڵ ئەوەشدا) هێڵەکان و ناستەکانیش هەر بەم شێوەیەن، ئایا ناسینی ئەمانەو دەرکەوتەی هەر یەکە لەو رەگەزانەی کە بیرکاری لەبارەیانەوە رون کردنەوە ئەدات، هەر ئەرکی ئەم زانستەیە، یان(ناسینی دەرکەوتەکان) ئەرکی زانستێکی ترە؟ ئەگەر(٣٠) ئەرکی هەر ئەم زانستەیە، لەو شێوەیەدا زانستی ناوەرۆکەکانیش، ئەبێت زانستێکی گریمانەیی بێت، بەلام وا گوومان ئەکرێت، کە بۆ ناسینی((چیەتی- یان ماهو،ti estin) گریمانەیەك بوونی نیە، بەلام لە شێوەیەکدا {ناسینی دەرکەوتەکان،روداوەکان}ئەرکی (زانستێکی) ترە،(لەو شێوەیەدا) چ زانستێکە کە پێداچونەوەو توێژینەوە لەسەر ناوەرۆکەکان ئەکات، روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە زۆر قورسە[2].

٩٩٧B

(٤) بەدەر لەمەش،ئایا ئەتوانین بڵێین کە تەنیا ناوەرۆکە هەست پێکراوەکان بوونیان هەیە، یان ناوەرۆك گەلێکی بەدەر لەمانەش هەن؟(٣٥)و ئایا رەگەزی ناوەرۆکەکان یەکیکە یان زیاترە لە یەکێك؟(وەك کەسانێك کە لە ئایدیە و((نێوەندیەکان-نێوانەکان)){واتە ئەوانەی کە لە نێوان ئایدیە و هەستپێکراوەکاندا} کە بە گووتەی ئەمان بابەتی زانستە بیرکاریەکانن، قسە ئەکەن)، لە بارەی ئەوە کە ئێمە[3] بە چ مانایەك ئەڵێین کە((ئایدیەکان))یش هۆکارن و((ناوەرۆکە لەخۆدا -کان kath heautas)) لە یەکەمین ئەو توێژینەوانەی کە لە دەورووبەی ئەم بابەتە هەمان بوون، قسە کراوە[4](٥) لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ئەندێشانە دژواری گەلێکی فراوان لە خۆ ئەگرن، بەلام هیچ یەك

---

[1] ئەم پاراگرافە بەراورد بکەن لەگەڵ ١٣-٩٩٥b١٠ و٢٩-١٠٥٩a٢٦، وەلامی ئەویش لە کتێبی چوارەم، وەرزی دووەم، ٩-١٠٠٤a٢، و کتێبی شەشەم،(E ئێپسیلۆن) وەرزی یەکەم ،بەدەست دێت.

[2] وەلامی ئەو مەسەلەیە، و ئەوەی پەیوەستە بەوەوە،لە وەرزی یەکەمدا گوتراوە، لە کتێبی چوارەم،((گاما))، وەرزی یەکەم، ١٠٠٣B٢٢ تا ١٠٠٥A١٨، بەدەست دێت.

[3] واتە ئێمە ئەفلاتوونیەکان.

[4] سەیری کتێبی یەکەم بکەن، وەرزی شەشەم و نۆیەم.

بێ ماناتر لەم قسەیە نیە کە((سروشت گەلێکی))دیاری کراوتر بەدەر لەوانەی کە لە دوونیای هەست پێکراو(ئاسمان)دا بەدەست دێن، بوونیان هەیە، و ئەوانیش هەروەك ئەم هەست پێکراوانەن، بەدەر لەوەی کە ئەمانە جاویدانن و ئەمانیش لەناوچوو، ئەمان ئەڵێن کە یەك((مرۆڤ لە خۆیدا))(یان ڕەها) و یەك((ئەسپ لە خۆیدا)) و یەك((تەندروستی لەخۆیدا)) بونیان هەیە، و ئیدی هیچ رونکردنەوەیەك نادەن، ئەمان رێك وەك کەسانێکن کە باوەڕیان بە خوداکان هەیە،(١٠) بەلاّم ئەڵێن کە (خوداکان) مرۆڤ شێوەن، چونکە ئەمانە ئیشێك ناکەن، جگە لەوەی مرۆڤ گەلێکی هەمیشەییان دروست ئەکرد، ئەوان(واتە پەیڕەوانی ئەفلاتوون)یش ئیشێکیان نەدەکرد جگە لەوەی کە لە((ئایدیە))کان، هەست پێکراوی جاویدانیان دروست ئەکرد.

هاوکات ئەگەر کەسێك بێجگە لە ئایدیە و هەست پێکراوەکان،((نێوان گەلێك))یش بگریمێنێت، دژواری گەلێکی زۆرتر بوونیان ئەبوو، چوونکە ڕوونە کە لەو شێوەیەدا جگە لە ((هێڵەکان لە خۆدا))(واتە هێڵە ئایدیاڵیەکان) و هێڵە هەست پێکراوەکان، هاوکات،چەند هێڵێك بونیان ئەبێت، و هەر بەم شێوەشە لەبارەی هەر یەك لە ڕەگەزەکانی تر[1](١٥)بەم شێوەیە، لەوێوە کە ئەستێرەناسیش یەکێکە لەم (زانستە بیرکارییانە)، کەواتە ئاسمانێکی تر بەدەر لەم ئاسمانە هەست پێکراوە، و هاوکات خۆر و مانگ و تەنەکانی ئاسمانێکی تر،(یش ئەبێت) بوونی هەبێت، بەلاّم بەهەمو ئەمانەوە چۆن ئەتوانین باوەڕ بەوە بکەین؟

چونکە نائەقلاّنیە کە ئاسمان نەجوولاّو بێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوی مەحاڵە کە(ئاسمانێکی لەم شێوەیە) جوولاّو بێت[2]، ئەو شتانەی کە ((زانستی ئوپتیك)) و ((زانستی هارمونیك)) خۆیان سەرقاڵیان ئەکەن، هەربەم جۆرەن ،چونکە ئەمانەش، لەبەر هەمان ئەو بەڵگانەی کە ووتمان، جیا لە هەست پێکراوەکان ناتوانن بوونیان هەبێت، چونکە لە شێوەیەکدا کە هەستپێکراوەکان و هەستە((نێوەندییەکان-نێوانیەکان)) بوونیان هەبێت، رونە کە ئەم شێوە بوونەوەرە((نێوەندی))یانە لە نێوان گیانەوەرە ئایدیاڵیەکان و گیانەوەرە لەناو چووەکاندا، بونیان ئەبێت.

---

[1] واتە ڕەگەزەکانی تر کە لە ریزی بابەتە بیرکارییەکاندان.

[2] ئاماژەیە بۆ ئاسمانە گریمانەییە((نێوانیەکە))واتە ئەو ئاسمانەی کە لە نێوان ئاسمانی هەست پێکراو ئاسمانی ئایدیاڵیدا جێگیرە، چونك ئاسمان و تەنەکانی بە بێ جووڵە وێنا ناکرێن، لە کاتێکدا کە یەك ئاسمان هەست پێنەکراو، و لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی ئاسایی، جوولاّویش ناتوانێت بوونی هەبێت.

(٢٥) ئەم مەسەلە دژوارەش ئەتوانین بهێنینە ئارا کە بە لەبەرچاو گرتنی چۆنیەتی ئەو بوونەوەرانە، ئەبێت لەگەڕاندا بین بەدوای ئەم زانستانە[1]، چونکە ئەگەر جیاوازی نێوان ئەندازیاری و زانستی ((زەوی پێوی ، ژێئودێزی)) لەمەدا بێت کە یەکێکیان سەرقاڵی شتانێك ئەبێت کە ئێمە پەی بردنی هەستەکی یان بۆ ئەکەین، وئەوی تریان بەو شتانەی کە سەرقاڵی پەی بردنی هەستەکی نین، روونە کە لە پاڵ پزیشکی دا ، ئەبێت زانستێکی تر بەدەست بێت،(و هەر لەبەر ئەمەش لە پاڵ هەر زانستێکی تردا) کە((نێوەندێك)) بێت لە نێوان((زانستی پزیشکی لە خۆیدا، یان زانستی پزیشکی ئایدیاڵی))و ئەم(زانستە) پزیشکیە هەست پێکراوەی خۆمان(٣٠)، بەلاَم شتێکی لەم شێوەیە چۆن روو ئەدات؟ چونکە ئەوکات ئەبێت لەپاڵ یەك تەندروستی هەست پێکراو و(یەك) تەندروستی ئایدیاڵیدا، دیسانەوە یەك تەندروستی لە جۆرێکی تر بوونی هەبێت، بەلاَم لە هەمان کاتدا دروست نیە کە زانستی زەوی پێوی تەنیا ئەپەرژێتە سەر تەنەکان و مادەکان و هەست پێکراوەکان و لەناوچووەکان، چونکە ئەوکات خودی ئەو(زانستە)ش بە لەناوچوونی ئەو(تەن و ماوانە) لەناو ئەچێت، هاوکات زانستی ئەستێرەناسیش، تەنها ناپەرژێتە سەر تەنە هەستپێکراوەکان و ئەم ئاسمانەی ئێمە(٣٥)

998a

چونکە هێلە هەست پێکراوەکان، بەو جۆرە نین کە ئەندازیارەکان ئەڵێن،(چونکە بەم مانایە، هیچ شتێکی رێك یان چەماوە بوونی نیە، هەروەك بەهەمان شێوە کە((پروتاگۆراس))[2] لە رەت کردنەوەی ئەندازیاریدا ئەیووت، بازنە بە هێڵکێش، نەك لە یەك خاڵدا، بەڵکو لە( یەك هێڵ)دا،پەیوەست ئەبێت)لەگەل ئەوەشدا، نە جووڵەکان، و رێرەوە پێچاوپێچەکانی ئاسمان بەو شێوەیەن(٥) کە ئەستێرەناس لە داوەریەکانی خۆیدا ئەیپەرژێتە سەریان، نە نیشانەکان یان خاڵەکانی ئەندازیاری، خاوەنی هەمان سروشتی ئەستێرە(واقعی)ەکانن.

---

[1] واتە زانستی پەیوەست بە شتەکانی نێوان هەست پێکراوەکان و ئایدیاڵیەکان.

[2] فەیلەسوفی سۆفستایی، کە لە ماوەی ساڵەکانی ٤٨٠ تا ٤١٠ پ.ز ژیاوە، لێرەدا، لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ نووسراوێکی ئەو کە بەناوی((لەبارەی بیرکاری زانەوە))یە، سەیری بەرهەمەیکەی تری وەرگێر بکەن((لە سوقراتەوە تا ئەرستۆ)) چاپی دووەم، لا ٣٢ بە دواوە.

کەســانێکیش هــەن[1] کــە ئــەڵێن ئــەم بــە دەســتەواژە((نێوانیــان))ە لــە نێــوان شێوەکان(ئایدیەکان) و هەستپێکراوەکاندا بونیان هەیە، بەڵام جیا لە هەست پێکراوەکان نین، بەڵکو لەواندان، پێداچونەوەی هەموو ئەنجامە مەحاڵەکانی ئەم تیۆریە درێژە ئەکێشێت، ئەقڵێنراو( ئەقلانی)نیە کە تەنیا لەبارەی((نێوانەکان))ەوە بەم شێوەیە بێت، بەڵکو ئاشکرایە کە((ئایدیەکان))یش ئەتوانن لە هەست پێکراوەکاندا بونیان هەبێت، چونکە بەڵگەمێنانەوە لەبارەی هەردووکیان، یەکێکە، بەڵام ئەوکات ئەبێت دوو تەن، وەك پێویستیەك لە یەك شوێندا بن،و ئەو((نێوانی))انەی کە لە شتە هەست پێکراوەکان و جووڵاوەکاندا شوێنیان هەیە، ناتوانن نەجووڵاو بن(١٥)، بەگشتی، بەچ هۆیەك ئەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە ئەمانە(نێوانەکان) بوونیان هەیە، بەڵام لە هەست پێکراوەکاندا بوونیان هەیە؟ لەم تیۆرەشدا هەمان ئەو بێ ماناییانەش دێنەوە رێ کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن، واتە ئاسمانێکی تر لەپاڵ ئەم ئاسمانە،بەڵام نەك جودا لێی، بەڵکو لەهەمان شوێندا، بوونی دەبێت، شتێك کە دیسانەوە مەحاڵترە[2].

---

[1] مەبەستی لەو فەیلەسووفانەیە کە لە ئەندێشەکانی((پیتاگۆرییەکان)) و ئەفلاتوونیەکان، پەیڕەوی ئەکەن، بەراورد بکرێت لەگەڵ کتێبی سیانزەیەم((موو))٣٨-١٠٧٦a٣٢ تا ١٠٧٦b١١( وەرزە یەکەم و سەرەتای وەرزی دووەم).

[2] ئەم مەسەلەیە لە کتێبی دووانزەیەم((لا مبدا))وەرزی شەشەم تا دەیەم، لەبارەی بنەماکانی جووڵێنراوی جاویدان ئەخرێتە ڕوو، و هەروەها لە کتێبەکانی سیانزەیەم و چواردەیەم کە لەدژی تیۆریەکەی ئەفلاتوون و ناوەڕۆکە هەست پێنەکراوەکانەوە بەڵگێنراون.

"ورمزی سێهەم"

## {( دژوارییەکانی :( ٦ )و( ٧ )}

(٢٠) (٦)بەم شێوەیە لە مەسەلەکانی رابردودا دژواری گەلێکی زۆر، بۆ دیاری کردنی راستی،بوونیان هەیە، هەنووکە لەبارەی بنەماکانیش ئەتوانین بپرسین کە ئایا، ئەبێت رەگەزەکان بە پێکهێنەری هەریەکە لە بەشە لاوەکیەکانی توخمەکان وبنەماکان وێنا بکەین؟ بەو شێوەیەی کە وێنا ئەکرێت، کە توخمەکان و رەچەڵەکەکانی ئاواز(دەنگ) هەمان ئەو بەشانەن کە هەمو دەنگەکان لێیانەوە تێکەڵ ئەبن، نەك مانا(٢٥) هاوبەشەکەی ئەوان: ئاواز، لە(نێوان) شێوە ئەندازەییەکانیشدا، ئێمە ئەوانە بە ((توخم)) ناوئەبەین کە گریمانەی ئەوانە لە گریمانەی هەموو یان زۆرینەی شێوەکانی تریشەوە بەدەست دێت، هاوکات، لەبارەی تەنەکان،هەم ئەو کەسانەی کە توخمەکانی ئەوانیان بە جۆراوجۆر و هەم ئەو کەسانەی کە بە((یەك))یێکیان ئەزانن، ئەڵێن کە بنەماکان هەمان ئەو شتانەن کە تەنەکان لێیانەوە تێکەڵ بوون و شکڵێنراون(٣٠)،وەك ((ئێمپیدۆکلێس)) کە ئاگر و ئاو و شتەکانی تریشی بەو توخمانە ئەژمار ئەکرد کە لە شتەکاندا بونیان هەیەو ئامادەن، و بوونەوەرەکان لەوانەوە هاتونەتە بوون، بەڵام ئەو ناڵێت کە ئەوان رەگەزی بونەوەرەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا، لەبارەی شتەکانی ترەوە، ئەگەر کەسێك بیەوێت پەی بە سروشتیان، بۆنموونە(پەی بە سروشتی) تەختەخەوێك ببات، توێژینەوە ئەکات لەوەی کە لە چ چەند پارچە دروست بووەو پێك هاتووە، و بەم شێوەیە سروشتی ئەو ئەناسن، لەبەر ئەمە بنەماکان ناتوانن، رەگەزی بوونەوەرەکان بن.

(٥)، و بەڵام لەوێوە کە ئێمە هەریەکە لە شتەکان لە رێڕەوی پێناسەکانەوە ئەناسین، و رەگەزی بنەماکان ،پێناسەکانن، کەواتە پێویستانە(وەك پێویست)، رەگەزەکان،

بنەمای شتە پێناسە کراوەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەدەست هێنانی زانست و ناسین، بە بوونەوەران، لە ڕێگای((جۆرەکان)) ەوەیە، کە بوونەوەرەکان لە پێناو ئەواندا ناو ئەنرێن، کەواتە رەگەزەکان، بنەما یان رەچەڵەکی جۆرەکانن، و هەندێ لەو کەسانەش کە توخمی بوونەوەرەکان بە((یەکی-تاکی to hen )) یان((بوونەوەر-ببو to on)) یان((گەورە))و((بچووك)) ناو ئەبەن،(١٠) بە رووکەش ئەوانە لەجیاتی رەگەزەکان بەکار ئەهێنن. بەڵام بەم دوو شێوەیەش، ناتوانین قسە لە بنەماکان بکەین، چونکە پێناسە یان مانای ناوەرۆك، یەکێکە، بەڵام پێناسە بە یارمەتی رەگەزی بەدەر لە (پێناسە)وەیە کە بەیانکەری بەشە پێکهێنەرەکانی شتە.[1]

(٧) زیاد لەمەش، ئەگەریش رەگەزەکان، بە بەرزترین شێوە بنەما بن،(١٥) ئایا رەگەزەکان یەکەمین[2] بنەماکان یان (( کۆتاترینیانن ta skhata)) کە ئەخرێنە سەر تاکەکان یان کەسەکان؟[3] چونکە ئەمەش هەر پێچەوانەیە، چونکە ئەگەر گشتایەتیەکان هەمیشە بنەمایەتیەکی زیاتریان هەیە، ئاشکرایە کە بەرزترین رەگەزەکان، رەچەڵەك یان بنەمان، چونکە ئەو رەگەزانە لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە(کە لە ژێریانەوەیە)هەڵئەگیرێن، ئەوکات ژمارەی بنەماکان، هەمان ژمارەی رەگەزە یەکەمینەکان ئەبێت،(٢٠) بە شێوەیەك کە(( بوونەوەر)) و(( تاك))-هەردووك-لە بنەماو ناوەرۆکەکان ئەبن، چونکە ئەمانە زیاتر لە هەموویان، لە سەر بوونەوەرەکانەوە هەڵئەگیرێن، بەڵام ئەگەری ئەوە نیە کە ((تاك))یان((بوونەوەر))، تاقە رەگەزی بوونەوەرەکان بن،چونکە هەر لە جیاوازیەکانی(tas diaforas) هەر رەگەزێك ئەبێت هەم خاوەنی(( بوونایەتی)) و هەم((یەکی))بێت، بەڵام ئەگەری ئەوە نیە کە نە جۆرەکانی رەگەزێك لەسەر بەشە تایبەتەکانی ئەوانەوە هەڵبگیرێن وە نە(٢٥) رەگەز بە بێ جۆرەکانی ئەوان هەڵبگیرێت،[4] کەواتە ئەگەر((یەك))یان((بوونەوەر)) رەگەز بن، هیچ بەشێك یان جیا بونەوەیەك ((بوونەوەر)) یان ((تاك-یەك)) نیە،بەڵاك ئەگەر ئەو دووانە، رەگەز نەبن، بنەمایەکیش بوونی نابێت، لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە کە رەگەزەکان بنەما یان رەچەڵەکانن، لەگەڵ

[1] ٩٩٨a٢٠ تا ٩٩b١٤ بەراورد بکەن لەگەڵ ٢٩-٩٩٥٢٧، وەڵامی ئەم مەسەلەیە لە کتێبی حەوتەم((زێتا))،وەرزی نەیەم و سیانزەیەم بەدەست دێت.

[2] واتە گشتی ترین و هەمەکی ترین رەگەزەکان.

[3] واتە جۆرەکانی تر.

[4] بەڵگەکانی ئەم مەسەلەیە لە کتێبی ئەرستۆ((تۆپیکا))، ١٤٤a٣٦تا ١٤٤b١١، کتێبی شەشەم، وەرزی شەشەم، بەدەست دێت.

ئەمەشدا، لەسەر بنەمای ئەم تیۆرە، شتە نێوەنجیەکان(واتە نێوان رەگەز بەرز و کەسەکان.و.ف) کە چەندین جیاوازی لە خۆ ئەگرن، و جۆرە دابەش نەبووەکان، هەموو رەگەزکان ئەبن، بەڵام لە واقعدا وا گوومان ئەکرێت کە هەندێکیان بەم شێوەیە بن وهەندێکی تریان بەم شێوەیە نەبن،(٣٠) بەدەر لەمەش، بەشەکان(جیا بوونەوەکان) زیاتر بنەمان تا رەگەزەکان، و ئەگەر جیا بوونەوەکانیش بنەما بن، لەو کاتەدا ژمارەیەکی ناکۆتا لە رەچەڵەکەکان یان بنەماکان دێنە بوون، بەتایبەتی ئەگەر رەگەزی یەکەمین یان (رەگەزی بەرز) بە بنەمایەك یان رەچەڵەکێك ئەژمار بکەین.

بەڵام لەمەش زیاتر، ئەگەر((یەك))زیاتر((بنەما شێوەیە arkhoeides))ە و دابەش نەبووە، ئەوا((یەکە))، و هەر دابەش نەخوازیەك یان لەسەر بنەمای چەندێتی، یان لەسەر بنەمای جۆر بەم شێوەیەیە، و ئەوەی لەسەر بنەمای جۆر(بەم شێوەیە بێت) لە پێشترە، و رەگەزەکان لە جۆرەکاندا دابەش ئەبن، کەواتە کۆتا((یەك))ی هەڵگری ((یەك))ایەتیەکی زیاتر ئەبێت،(٥)،چونکە((مرۆڤ)) رەگەزی جۆری مرۆڤەکان نیە،[1] هاوکات لەو شتانەی کە خاوەنی پێشکەوت وپاشکەوت(دواکەوت)ن، ئەوەی کە ئەبێتە هەڵگیراوی ئەم شتانە، ناتوانێت شتێکی جیا لەوان بێت،(بۆ نموونە، ئەگەر دوو لە نێوان ژمارەکاندا یەکەمینە، ژمارەیەك لەپاڵ و جیا لە جۆری ژمارەکان بوونی نابێت، و هەرلەبەر ئەمەش شێوەیەکی جیا لە جۆری شکڵەکان بوونی نابێت(١٠)،هەنووکە ئەگەر لەم بارەیەوە بەم شێوەیە نیە، لە بوارەکانی تردا رەگەزە جیا لە جۆرەکان،بە دژواری ئەتوانن بوونیان هەبێت،چونکە لەم بارەیەوەیە، کە زیاتر لە هەمووان وا گومان ئەچێت کە رەگەزەکان بوونیان هەیە، بەڵام لە تاکەکان یان کەسەکاندا پێشکەوت و دواکەوتێك بوونی نیە، هاوکان لە شوێنێکدا کە باشتر و خراپتر دەست ئەکەوێت، باشتر هەمیشە لە پێشترە، بە شێوەیەك کە لەم بوارەشدا، رەگەز ناتوانێت بوونی هەبێت.

لەسەر بنەمای ئەم تێبینیانە دەرئەکەوێت کە هەڵگیراوەکانی سەر کەسەکان(١٥) (یان تاکەکان) زیاتر بنەماکانن تا رەگەزەکان، بەڵام بەم شێوەیەش ئاسان نیە کەبڵێین چۆن ئەتوانین ئەمانە بە بنەماکان یان رەچەڵەکەکان بگریمێنین، چونکە بنەما یان هۆکار ئەبێت جیاو بەدەر لە شتانێك بێت کە رەچەڵەکی ئەوانە، و ئەبێت بتوانێت کە جیا لەوانیش بوونی هەبێت،بەڵام بە چ هۆیەك،جگە لەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی و لەسەر هەموو شتەکان هەڵبگیرێت، ئەبێت گریمانەی ئەوە بکەین کە جیا لە تاکەکان شتێکی لەم

[1] واتە ((مرۆڤ))دابەشخوازە بەسەر تاك تاکی مرۆڤەکان نە لەسەر جۆرە جیاوازەکان.

شێویە بوونی هەیە؟(٢٠)بەڵام ئەگەر هۆکاری ئەوە ئەمەیە،{لەو شێوەیەدا} شتانێك کە زیاتر گشتین، ئەبێت زیاتر وەك بنەما یان رەچەڵەك ئەژمار بکرێن، بەم شێوەیە رەگەزە یەکەمینەکان (یان بەرزەکان) بنەما ئەبن[١].

[١] پێداچوونەوە و وەڵامی ئەم مەسەلەیە لە کتێبی حەوتەم((زێتا)) ،وەرزەکانی دوانزەیەم، سیانزەیەم بەدەست دێت، ١٠٣٨a١٩ ، و هەربەم شێوەیە ١٠٥٩b٢١ تا ١٠٦٠a١.

## "وەرزی چوارەم"

# {دژوارییەکانی: ( ٨ )، ( ٩ )، ( ١٠ )، ( ١١ )}

(٨) بەدوای ئەم دژوارییانە،مەسەلەیەکی دژواتر دێتە ئارا، کە(٢٥) لە هەموویان سەختتر و توێژینەوەو پێداچوونەوەی لە هەموویان پێویستترە، و قسەکردن لەبارەیەوە هەنوکە مەبەستی ئێمەیە، چونکە ئەگەر هیچ شتێك لە پاڵ وجیا لە شتە لاوەکیەکان بوونی نەبێت، و شتە لاوەکیەکان (یان تاك شتەکان kath hekasta) هەموویان کۆتاییان هەیە، کەواتە چۆن ئەکرێت بگەین بە ناسینی شتە ناکۆتاکان؟ چونکە هەموو شتەکان تا ئەو شوێنە ئەناسین کە لەواندا شتێکی ((یەکی)) و ((گشتی)) و((شوناسانە))بوونی هەیە، بەلاّم ئەگەر ئەمە پێویستەو، و شتێکی جیا لە شتە لاوەکیەکان ئەبێت بوونی هەبێت، لەو شێوەیەدا پێویستانە(وەك پێویست) ئەوە رەگەزەکانن کە جیاو لە پاڵ شتە لاوەکیەکاندا بوونیان هەیە،(٣٠)چ رەگەزە کۆتاکان(نزمەکان) و چ رەگەزە یەکەمینەکان (بەرزەکان)، بەلاّم ئێمە هەنووکە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە شتێکی لەم شێوەیە مەحاڵە[١].

هاوکات ئەگەریش بە زۆرترین ئەگەر، شتێکی جیا لە شتی دیاری کراو(یان گشتی دیاری کراو concrete) {واتە هەر کات شتێك هەڵگیراوی مادە(هیولی) بێت} بوونی هەیە، ئایا، گریمان شتێکی لەو شێوەیە هەیە،ئەبێت جیا لە هەمو شتە لاوەکیە دیاری کراوەکانەوە بوونی هەبێت، یان جیا لە هەندێکیان، نەك هەندێکی تریان، یان جیا لە هیچ کامیان؟ بەلاّم ، هەنووکە ئەگەر شتێکی جیا لە شتە لاوەکیەکان بوونی نەبوایە، هیچ شتێکی ئەقلاّنی و(ئەقلێنراو) بوونی نەدەبوو، بەڵکو هەموو شتەکان هەست پێکراو

---

[١] ب.بۆ وەرزی سێهەم.

ئەبوون و ناسینی هیچ شتێك بوونی نەدەبوو، مەگەر ئەوەی کە بووترێت کە پەی بردنی هەستەکی زانست یان ناسینە، [1] لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ شتێکی جاویدان و نەجووڵاو بوونی نیە، چونکە هەموو هەست پێکراوەکان لەناوچوو، و هەمیشە لە جووڵەدان، بەلآم لە شێوەیەکدا کە(٥)هیچ شتێك جاویدان نیە، هیچ جۆرە (هاتنە ئارایی) پەیدا بوونێکیش، ئەگەری نیە، چونکە ((بوون)) شتێکی دروستکەرە، وشتێك کە دروست بوون لەوەوە دروست ئەبێت، پێویستە، و لەم نێوانەدا کۆتا شت ئەبێت ((دروست نەکراو))بێت، ئەگەر چی بە راستی زنجیرەی دروست بوون ئەبێت لە شوێنێکدا بووەستێت، و لە ((نەبوو))ش(me ontos) هیچ شتێك دروست نابێت و ئەگەریشی نیە(مەحاڵە)،هاوکات لە شێوەیەکدا کە دروست بوون و جووڵە بونیان هەبێت،(١٠)پێویستانە(وەك پێویستیەك)،ناستێکیش بوونی هەیە، چونکە هیچ جووڵەیەك ناکۆتا نیە، بەڵکو هەر جووڵەیەك ئامانجێکی هەیە، وشتێك کە ئەگەری دروست بوون و هاتنە ئارایی نیە، ناتوانێت بێتە بوون، و ئەوەشی کە دروست بووە، لە سەرەتای پەیدا بوونەوە وەك پێویستیەك، بوونی هەیە، هەر بەم شێوەیە، ئەگەر چی کە مادە بەراستی ((هەیە))، بەم هۆیە کە نەهاتۆتە بوون، کەمێك زیاتر ئەگەری هەیە وەك ئەوەی کە ناوەڕۆك- کە مادە هەر کاتێك لەودا بێتە بوون-{لەگەڵ ئەوەشدا} بوونی هەبێت، چونکە بەو شێوەیەی کە نە ئەو نە ئەم(مادەو ناوەڕۆك) بوونیان هەیە، (ئیدی) بە هیچ شێوەیەك، هیچ شتێك بوونی نابێت(١٥) بەلآم ئەگەر ئەمە ئەگەری نیە، کەواتە لە پاڵ شتێکی دیاری کراودا، ئەبێت شتێك بوونی هەبێت، واتە شکڵ و شێوە.

بەلآم ئەگەر شتێکی لەم شێوەیە قبوڵ بکەین (دیسانەوە) دژوارییەکی تازە دێتە سەر ڕێمان، کە لە لای چ شتانێکەوە ئەوانە قبوڵ بکەین و لە لای کامیانەوە قبوڵی نەکەین، چونکە ڕوونە کە لە ناتوانین لە لای هەموو شتەکانەوە قبوڵی بکەین، چون ناتوانین وێنای ئەوە بکەین کەماڵێك لە پاڵ وجیا لە (باقی)ماڵەکانی تر بوونی هەیە (٢٠)لەگەڵ ئەوەشدا، ئایا ناوەڕۆکی هەموو شتەکان، بۆ هەموو مرۆڤەکان، بۆنموونە، یەکێك ئەبێت یان،نا؟ بەلآم ئەم گووتەیە بێمانایە، چونکە ئەو شتانەی کە ناوەڕۆکەکەیان یەکیکە، یەکێکن، بەلآم ئایا(ناوەڕۆکەکان) زۆر و جیاوازن؟ ئەم قسەیەش نائەقڵانیە، لە هەمان

[1] ئامـاژەی ئەرستۆیە بـۆ پرۆتـاگۆراس و تیۆریەکـەی،ب.بـۆ دیـالۆگی ئـەفلاتوون بـەناوی ((سنایتێتۆس))(theaitetos) ١٥١e-١٥٢a هەربەم شێوەیە بەراورد بکرێت لەگەڵ کتێبی دوانزەیەم((لا مبدا)) وەرزی پێنجەم و شەشەم،

- کاتدا ئەتوانین بپرسین کە چۆن مادە(بە شێوەی) هەر یەك لەم شتە لاوەکیانە دەر دێت، و چۆن ((شتی دیاریکراوی)) ئەم داونەیە(واتە مادە و شێوە)؟

(٩) هاوکات لەبارەی بنەماکان یان رەچەڵەکەکانەوەش ئەم مەسەلە دژوارە دێتە ئارا کە(٢٥) ئەگەر ئەوانە لەسەر بنەمای ((جۆر))یەکێك بن،هیچ شتێك لەسەر بنەمای ژمار یەکێك نابێت، تەنانەت نە خودی((یەك)) و نە خودی((بوونەوەر)) ،و لەشێوەیەکدا کە شتێکی((یەك))ی بوونی نەبێت کە ببێتە هەڵگری هەموو شتەلاوەکیەکان ، ناسین،چۆن ئەتوانێت بوونی هەبێت؟ بەڵام بەو شێوەیەی کە بنەماکان لە روانگی ژمارەوە یەکێکن، و هەریەکە لە بنەماکانیش((یەك))ن و نە بەو جۆرەی کە لە بارەی هەستپێکراوەکان(راست ئەبێت) و ئەبینرێت- کە لە هەر بوارێکی جیاوازدا،جیاوازن و ئەوی ترن- بۆنموونە لەبارەی پیتێك، دەربڕینێکی دیاری کراو کە هەمیشە لە روانگەی جۆرەوە هەمانە، و بنەماکانیشی لەهەمان جۆرن، بەڵام تەنیا لە جۆردا وەك یەکن، چونکە لە روانگەی ژمارەوە لە بوارە(٣٠) جیاوازەکاندا،جیاوازیان هەیە)،بەڵی، ئەگەر بەم شێوەیە نیە، بەڵکو بنەمای بوونەوەرەکان یەکێکن، شتێکی تر بەدەر لە توخمەکان بوونی نابێت، چونکە لە نێوان ئەوەی کە بڵێین((یەکی لە روانگەی ژمارە)) یان((هەر تاکێك))جیاوازیەك بوونی نیە، چونکە مەبەستی ئێمە لە((بەشەکی=لاوەکی))هەر ئەمەیە کە، لە روانگەی ژمارەوە یەکێکە، و مەبەستمان لە((گشتی))ئەوەیە کە:

١٠٠٠a

ئەبێتە هەڵگیراوی تاکەکان یان لاوەکیەکان(بەشەکیەکان)، ئەگەر توخمەکانی ئاواز(دەنگ) لە ژمارەدا سنوردار بوونایە، ئەوکات هەموو پیتەکانی ئەلف بێ، ئەبێت بە هەمان ژمارەی توخمەکان بونایە، چونکە نە دوو پیت و نە زیاتر لەهەمان جۆر ناتوانن بونیان هەبێت[1].

(١٠) مەسەلەیەکی دژوارتر کە بە هیچ شێوەیەك کەم(بەها)تر لەوانی تر نیە،-و هەم فەیلەسوفە هەنوکەییەکان و هەم پێشینان بێ ئاگا بوون لێی- ئەمەیە کە: ئایا بنەما یان رەچەڵەکی، شتانێکی لەناوچوو و لەناونەچوون، وەك یەکن یان جیاوازن؟ ئەگەر وەك یەکن، چۆنە کە هەندێکیان لەناوچوو هەندێکیان لەناونەچوون، و هۆکاری ئەوەی چیە؟

---

[1] بۆ وەڵامی ئەم مەسەلەیە ب.بۆ کتێبی حەوتەم، وەرزی چواردەیەم، و کتێبی دوانزەیەم، وەرزەکانی چوارەم و پێنجەم، و کتێبی سیانزەیەم ،وەرزی دەیەم.

پـەیڕەوانی((هـسیودوس)) و هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە پەرژاویانەتـە سـەر ناسـینی خووداکان (theologi) تەنیا بیریان لەو شتانە کردۆتەوە کە خۆیانیان گەیاندۆتە باوەڕ، هیچ گرنگی و سەرنجێکی(١٠) ئێمـەیان نـەداووە، چونکە-ئـەمان لـەوێوە کـە بنـەماکان و ڕەچەڵەکەکان، یا(خودی) خووداکان، یان لەوان دروستکراوەکان، ئەناسێنن-و ئـەڵێن کـە هەرکە لە((نکتار))یان((ئامبروسیا))[١]ی نەچەشتووە، مرەر(بمر) و لەناوچووە، ڕوونـە کـە ئـەم ووشـانە بـۆ خـودی ئـەو کەسـانە، مانـادار بـوون، بـەڵام ئـەوەی کـە لـە ڕوانگـەی بـەکارهێنانی ئـەم هۆکارانـەوە ووتویانـە، بـەدەرە لـە تێگەیـشتنی ئێمـە، چـونکە(١٥) خوداکان ئەگەر بۆ ((نکتار))و((ئامبروسیا)) لەبەر چێژ دەست ئەبەن ، ئەم شتانە هۆکاری بوونایەتی ئەوان نین، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە بێت کە ئەم (خۆراك و خواردنەوەیە) لەبەر مانەوەی بونایـەتی خۆیـان بچێژن، لەو شێوەیەدا ئـەو بوونەوەرانـەی کـە پێویـستیان بـە خۆراکە، چۆن ئەتوانن هەمیشەیی وجاویدان بن؟

بەڵام فەلسەفاندنە ئەفسانەییەکان بەهای پشکنینێکی گرنگیـان نیـە، ئێمـە ئـەبێت بـە پرسیاری ورد لـەو کەسـانەی کـە قسەکانیان بـە گریمانـە تـەنراوە(٢٠) دیـاری بکـەین کـە ئەوشتانەی کە لەهەمان ئـەو توخمانـە وەرگیراون و دروسـت کـراون، بـەچ هۆیـەك-لەسـەر بنـەمای سروشـتەکەیان- هەنـدێکیان جاویـدان و هەنـدێکی تریـان لـەناو ئەچـن، بـەڵام لەوێوە کە ئەمانە هۆکارێك نادەن بەدەستەوە و ئەمەش نائەقڵانیە کە شتەکان بەو شێویە بن کـە ئـەوان ئـەیڵێن، ڕوون ئەبێتـەوە کـە هـەمو شتەکان ناتوانن خـاوەنی هـەمان بنـەماو هـەمان هۆکارەکـان بـن، تەنانـەت پیاوێـك کـە وا مەزنـدە ئـەکرێت بـە شایـستەترین جـۆر ئەتوانێت قسە بکات، واتە((ئێمپێدوکلێس))(٢٥)یش دووچاری ئەم هەڵەیە بووە، چونکە ئەو ڕەچەڵەکی(نەبـەردی-یـان شـەڕی)) [٢] بـە هۆکـاری لـەناوبردن و لەناوچوون دائـەنا، بـە بوونی ئەمەش وا دێتە بەرچاو کە((نەبەرد)) هەمیشە، بەدەر لە((یەك)) ئەهێنێتە بوون.

چونکە هەموو شتەکان لەوەوە دێنە بوون،جگە لە خودا، ئەو بەم شێوەیە ئەدوێت:

((لەوەوە ڕواوە ،ئەوی هەبوو،هەیەو لەدوای ئەمەش
ئەبێت، درەختەکان،پیاوان وژنان،
دڕندەکان و باڵندەکان و ماسیە بەخێوکراوەکانی ناو ئاو
و خودا دوورەکان....)).[٣]

---

[١] بە بڕوای یۆنانیەکانی کۆن((nektar)) خواردنەوەیی ((ambrosia)) خۆراکی خودایان بوون.

[٢] یەکەمین وەرگێرەکانی عەرەب زمان، ئەم واژەیەیان بە((سەرکەوتن)) وەرگێراوە.

[٣] لەتێکە لە شیعری (ئێمپێدوکلێس)) ب.بۆ ((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))، لا ٢٤٨.

1000b

مەسەلەکەکە بەدەر لەم قسانەش هەر روونە، چونکە بە گووتەی ئەو،ئەگەر نەبەرد و ململانێ لەناو شتەکاندا نەبووایە، هەمو شتەکان یەکێك دەبوون، چونکە کاتێك کە ئەوان پێکەوە کۆ بونەوە:((شەڕ(نەبەرد-ململانێ) لە دەرەکی ترین سنورەوە وەستا))[1].لەم قسەیەی ئەوەوە دەر ئەکەوێت کە خودای بەختەوەرتر لەوانی تر،((تێگەیشتن)) و((تێ بینینی)) کەمتری هەیە، چونکە هەموو توخمەکان ناناسێت، چونکە((شەڕ-نەبەرد))ی لە خۆدا نیە،(5) و ناسین لە(( وەکیەك))ەوە بۆ(( وەك یەکە))،و ئەو ئەڵێت:

((چونکە ئێمە خاك،بە یارمەتی خاك ئەبینین، و ئاو بە یارمەتی ئاو،
هەوا بەیارمەتی هەوای خودایی، ئاگر بە یارمەتی ئاگری وێرانکەر،
سۆز بە یارمەتی سۆز، و نەبەرد بە یارمەتی نەبەردی پڕنەهامەتی..[2]))

بەڵام لە قسەکەی پێشووەوە ئەم خاڵە روون ئەبێتەوە کە ئەنجامی تیۆریەکەی ئەو ئەمەیە کە نەبەرد زیاتر لە هۆکاری ((بوونایەتی))،(هۆکاری لەناو بردن و لەناوچوون نیە، (10)، هەرلەبەر ئەمەش، ((سۆز-خۆشەویستی-ئەشق)) هۆکاری ((بونایەتی)) نیە، چونکە کاتێك کە هەموو شتێك لە((یەك))ێکدا کۆ ئەکەینەوە، شتەکانی تر لەناو ئەبات، لەلایەکی ترەوە ئەو هۆکاری خودی ئەم دوڕان یان لەناوچوونە بەیان ناکات، جگە لەوەی کە (بانگەشەی ئەوە ئەکات کە)سروشتی شتەکان بەم شێوەیەیە،و ئەڵێت:

((بەڵام لەبەر ئەوەی((شەڕ))ی گەورە لە ئەندامەکانی ئەو((ئاسفایروس)) دا ڕووا،
و گەورە بوو و بە هەوای شانازی سەری هەڵبڕی، چونکە ئەو کات سەری دەر هێناکە،
لەسەر بنەمای سوێندێکی پەرتەوازە بوو بە هەموو شوێنێکدا ، بۆ ئەوان
((سۆز و شەڕ-نەبەردی)) بە نۆبە، دیاری(15) کراوە...))[3].

لەم گوتەیە ئەوە بەدەست دێت کە لەناوچوون پێویستیە، بەڵام ئەو هۆکاری ئەم پێویستیە روون ناکاتەوە، بە بوونی ئەمەش، قسەکەی ئەو لەم روانگەیەوە هەماهەنگە کە هەندێ لە بوونەوەرەکان بە لەناوچوو وهەندێکی تریان بە لەناو نەچوو نازانێت،

---

[1] لەتی ٣٦، هەمان شوێن،ل٢٥٢.

[2] لەتی ١٠٩،هەمان شوێن،ل ٣٦٠.

[3] لەتی ٣٠، هەمان شوێن، ل ٢٥١.

بەڵكو-جگەلە توخمەكان- هەمو شتەكان بەلەناوچوو ئەژمار ئەكات،(٢٠) بەلاَم مەسەلە قورسە هەنووكەییەكەی ئێمە ئەوەیە كە: ئەگەر بنماكان شت گەلێكی یەك و وەك یەكن، بە چ هۆیەك هەندێ لە شتەكان لەناوچوو هەندێكی تریان لەناونەچوون؟

لەم بارەیەوە كە بنەماكان یەكێك و وەكیەك نین، ئەوەی(تا ئێستاكە)ووتراوە، بەسە، بەلاَم لە شێوەیەكدا كە بنەماكان جیاوازن، مەسەلەیەكی دژوارتر دێتە پێشەوە كە،ئایا خودی ئەم بنەمایانە لەناوچوو یان لەناونەچوون؟ چونكە ئەگەر لەناووچوو بن، روونە كە ئەبێت لە شتێكی ترەوە دروست بووبن(٢٥)،(چونكە هەمو ئەو شتانەی كە لەناو ئەچن ئەگەرێنەوە بۆ ئەو شتەی كە لێیانەوە دروست بوون)،و بەم شێوەیە ئەنجام ئەوە ئەبێت كە بنەماكانیش خاوەنی بنەمانی پێشترن، ئەمەش كە مەحاڵە، ئیدی ئەم زنجیرەیە لە شوێنێكدا بووەستێت یان تاناكۆتایی بەردەوام بێت، هاوكات، ئەگەر ئەو بنەمایانە لەناووچوو بن، شتە لەناوچووەكان چۆن ئەتوانن بوونیان هەبێت، بەلاَم ئەگەر بنەماكان لەناونەچوو بن، هۆكار چیە كە لە هەندێ لەم بنەما لەناونەچووانە شت گەلێكی لەناوچوو، و لەهەندێكی تریان بنەمای لەناونەچوو بێنە بوون؟(٣٠)ئەم{قسە}یەش ئەقلاَنی نیە، بەڵكو یان مەحاڵە، یان سەلماندنەكەی پێویستی بە گووتار و(بەڵگەی ) زۆر ئەبێت، بەلاَم كەسێكیش هەوڵی نەداوە، تا بنەما جیاوازەكان بهێنێتە پێشەوە، بەڵكو بۆ هەموو شتەكان رازی بە بنەمای ((تاك-تەنیا)) بوون، بەلاَم لە{پاڵ}ئەو مەسەلە قورسانەی كە ئێمە لەسەرەتای توێژینەوەكانمانەوە دەستمان پێ كردن، وا ئەنوێنن كە مەسەلەیەكی بچووك و بێ مانایە.[1]

(١١) لە هەمووی قورستر- و بۆ ناسینی راستی-پێویست ترین توێژینەوەی تیۆری ئەمەیە كە:((بوونەوەر و یەك))ئایا ناوەرۆكەكانی بوونەوەرەكانن و هەریەكە لەوانە شتێكی تر نین جگە لە بوونەوەر و یەكی، یان ئەوەی كە- بەم گریمانەیە كە سروشتێكی تر بابەتی ئەوانە-ئەبێت بەدوای ئەوەدا بگەڕێین كە بوونەوەر و ((یەك))ی چین؟ چونكە لە بارەی سروشتی ئەوانە، لەسەر بڕوای یەكەمن و گروپێكی تر لەسەر بڕوای دووەمن، ((ئەفلاتوون)) و((پیتاگۆریەكان)) باوەڕیان وایە كە((بوونەوەر و یەك))(١٠)شتێكی تر

[1] وەلاَمی ئەم مەسەلەیە لە كتێبی حەوتەم((زیتا))، وەرزەكانی حەوتەم تا دەیەم،بەدەست دێت.

نـین، بـەڵکو ئەمـە سروشـت و ناوەرۆکیانـە، بەتـەواوی((یـەك–بـوون heni))و ((ببوون-بوونەوەر بوون onti))ە.

بەلام سروشتناسەکان،وەك ((ئیمپێدوکلێس)) بڕوایەکی تریان هەبوو، بۆ نموونـە، ئەو،وەك ئەڵێن ((راستی )) بۆ شتێکی ناسراوتر و ئاشناتر ئەگەڕاندەوە، چونکە وا دێتە بەرچاو کە ئەوی بە هەمان ((سۆز-خۆشەویستی))ئەزانی، بەهەر حاڵ،(بە گومانی ئەو) ((سـۆز-خۆشەویـستی))هۆکـاری یەکـەمی هـەموو شـتەکانە، (١٥) ئـەوانی تـر ئـاگر و هەندێکی تری هەوا یان بەم ((یەك))و((بوونـەوەر))ە ئەزانی، و (قایل بوون) بەوەی کە بوونایەتی بوونەوەرەکان لەوانەوەیە، و لەوانەوە پێك هاتووە، و ئەوانەش کە باوەڕیان بە زۆری توخمـەکان هەیـە هـەر لەسـەر ئـەم بڕوایەن،چـونکە ئـەمانیش دڵنیـان لـەوەی کـە بڵێن((یەکی))و((بوونەوەری)) ڕێك هێندەی ژمارەی هەمان ئەو ((بنـەما))یانـەن کە خۆدی خۆیـان ئـەیڵێن، ئەگـەریش کەسـێك قبـوڵ نـەکات کـە ((یـەك))و((بوونـەوەر)) جۆرێکن لـە ناوەرۆکـەکان، ئـەم ئەنجامـە دێتـە دەسـت کـە(٢٠) هـیچ یـەك لـە گشتایەتیەکانی تـریش بوونیـان نیـە، چـونکە ئـەو دووانـە((بوونـەوەر و یـەك)) گـشترینی (گـشتیەتیەکانن)، ئەگەریش یەك لەخۆیدا و بوونەوەر لە خۆیدا بوونی نەبێت، دژواریەکی تر-بەدەر لـەوەی کە پێی ئەوترێت بەشەکیەکان- بوونی ئەبێت، و لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر((یەك)) نـاوەرۆك نـەبێت، روونـە کـە(٢٥)ژمـارەش- وەك سروشـتێکی جیـا لـە بوونـەوەرەکان- ناتوانێـت بـوونی هـەبێت، چـونکە ژمـارە لـە((یەکایەتیـەکان))گـشتگیرترە، بـەلام((یـەك)) شتێکی((تاقانە))یە (تاك لە خۆیدا monas).

بەلام شتێك، ئەگەر ((یەك لـە خۆیـدا)) و ((بوونـەوەر لـە خۆیـدا))یـە، یـەك و بوونـەوەر بێگوومـان نـاوەرۆکی ئـەو ئـەبن، چونکە هـیچ شتێکی گشتی تر،ناخرێتـە سـەر(( یـەك و بوونـەوەر))،بـەڵکو ئـەوان (خۆیـان) لەسـەر خۆیـان هـەڵگیراون، و لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەگـەر ((یـەك لـە خۆیـدا)) و(( بوونـەوەر لـە خۆیـدا))یـە، چـەندین دژواری لـەم روانگەیـەوە دێنـە ئاراوە، کە(٣٠) چۆن لە پاڵ و جیا لەوان، شتێکی تر{ لە نێوان}دا بوونی ئەبێت، و بەم

شێوەیە، بە پێی بڕواکەی ((پامرمنیدێس))[1] ئەنجامەکە وەك پێویستیەك ئەبێتە ئەوەی کە هەموو بوونەوەرەکان ((یەکێك)) ن و ئەم((یەك))ەش ،هەمان((بوونەوەر))ە.

ئەتوانیت خۆت لە قەرەی هەریەکە لەم دوولایەنە دژوارە بدەیت، چونکەچ ((یەك))ناوەرۆك بێت، و چ((یەك لە خۆیدا)) بوونی هەبێت، بەناوەرۆك بوونی ژمارە،مەحاڵە، پێشتر وترا کە[2]، ئەگەر ((یەك)) ناوەرۆك نەبێت، ئەنجامەکە بەم شێوەیەیە، بەلاّم ئەگەریش ((یەك)) ناوەرۆك بێت، دیسانەوە دژواریەکەی لەبارەی بوونەوەر، لێرەشدا هەر دێتەوە پێش[3]، چونکە لە پاڵ و جیا لە((یەك لە خۆیدا)) ((یەك))ێکی تر لە کوێدا بوونی دەبێت؟ (٥)بێگومان ئەبێت ئەمە(( نا-یەك-لا - واحد))بێت، بەلاّم هەموو بوونەوەرەکان یان((یەك))ەکانن یان((زۆر))ن کە هەریەکە لەمانەش ((یەك))ە.

هاوکات ئەگەر ((یەك لەخۆیدا)) دابەشنەکراوە، لەسەر بنەمای یاساکەی ((زێنوون))[4] هیچ ئەبێت، چونکە شتێك کە بخرێتە سەری و زیاد نەبێت ولێی کەم بکرێتەوەو کەم نەکات، بەگوتەی ئەو، لە ریزی بوونەوەرەکاندا نیە، لەسەر بنەمای ئەم گریمانە ئاشکرایە کە بوونەوەر ئەو شتەیە کە خاوەنی((گەورەیی))ە،(١٠) و ئەگەر خاوەنی ((گەورەیی))ە، کەواتە((تەن))یشە، چونکە تەنێك لە هەموو شێوەکاندا بوونەوەرە، و بوونی هەیە، لەکاتێکدا کە شتەکانی تر(واتە، رێژە بیرکارییەکان)،وەك هێڵەکان و ئاستەکان، لە کاتێکدا کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بخرێتە سەریان، زیاد ئەکەن، بەلاّم بە شێوەیەی تر واناکات، بەلاّم ((خاڵ و یەك))بە هیچ شێوەیەك زیاد ناکات، بەلاّم لەبەر ئەوەی تیۆرەکەی ئەو گشتیانەیە، و لەوانەشە کە شتێکی دابەش نەبوو بێت،{ بە بوونی ئەمەش} بە جۆرێك(بێت) کە(١٥) تەنانەت لەدژی ئەو((زێنون)) بتوانرێت بەرگری لێ بکرێت(چونکە شتێکی دابەشنەبووی لەو شێوەیە، ئەگەر زیاتر بکرێت، شتێك گەورەتر

---

[1] ئاماژەیە بۆ ناوەرۆکی تیۆریەکەی ((پارمنێدس)) لە لەتی ٧، بگەڕێنەوە بۆ((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان))لا ٢٨٧.

[2] سەیری :٢٧-١٠٠١a٢٤

[3] سەیری: ١٠٠١a٣٠تا١٠٠١b١.

[4] بڕوانە ((قووتابخانە فەلسەفیەکان)) داناني:میهرداد میهرین،و:سیدۆ داوود.ع

ناکات، بەڵام زۆرتری ئەکات) بەڵام ئەتوانین بپرسین کە لە یەك یان لە زیاد لەو شێوە((یەك))ە دابەش نەبووانە چۆن((گەورەییەك))دێتە بوون؟ ئەمە وەك ئەوەیە کە کەسێك بڵێت کە هێڵ، تێکەڵەیەکە لە خاڵەکان.

(٢٠)بەڵام ئەگەر کەسێکیش گوومان لەوە بکات[1](وەك چۆن هەندێ گوومان ئەکەن) کە ژمارە لە((یەك لە خۆیدا)) و شتێکی تر کە ((یەك))نیە ،پێك هاتووە، بە بوونی ئەمەش، ئەبێت بەدوای ئەوەدا گەڕان بکرێت کە چۆن شتێکی دروست بوو، هەندێ جار ((ژمارە))یە و هەندێ جار((گەورەیی))، لە کاتێکدا کە((نا-یەك، لا-واحد))((نابەرامبەری))یەو لەهەر دوو لایەنەکەدا خاوەنی هەمان سروشتە، چونکە ڕوون نیە کە لە((یەك))و شتەکەی تر( کە یەك نیە)، یان لە ژمارە و ئەم شتەی تر(٢٥)،چۆن((گەورەییەکان)) ئەتوانن بێننە بوون[2].

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئەفلاتون و پەیڕەوکارەکانی، ب.بۆ کتێبی سیانزەیەم((موو))، وەرزی یەکەم، ١٠٨١٣٢٤ و وەرزی دووەم، ٣٠-١٠٨١٣٢٠.

[2] وەڵامی ئەم مەسەلەیە لە کتێبی حەوتەم، وەرزی شانزەیەم ٢٤-١٠٤٠b١٦ و کتێبی نەیەم، وەرزی دووەم، بەدەست دێت.

## "وەرزی پێنجەم"

## {(دژواری:(١٤)}

(١٤) مەسـەلەیەکی تری،دژوار،پەیوەسـتە بـەو بـوارەوە کـە ئایـا ژمارەکـان، تەنەکان،ئاسـتەکان، و هێڵـەکان جۆرێـك لـە ناوەرۆکـەکانن یـان نـا، ئەگـەر نـاوەرۆك نەبن،(ناسینی) ئەوەی کە((بوونەوەر چیە))(ti to on) و(( ناوەرۆکی بوونەوەرەکان چین)) لـە چـنگی ئێمـە هەڵـدێت، چـونکە(٢٠) رووداوەکـان، جووڵـەکان، و جۆرەکـانی زیادکردن و حاڵەتەکان و نیسبەتەکان، واگومان ئەکرێت کە بەڵگە لەسەر ناوەرۆکی هیچ شتێك نەبن، چونکە هەموو ئەوانە ئەخرێنە سەر بابەتێك و هیچ یەك لەوانە ((ئەم شتە tode ti)) نین، بەڵام ئەوەی کە لـە ئاو خـاك وئـاگر و هـەوا، و لەگـەڵ ئەوەشـدا گـەرما وسەرماو دەرکەوتە هاوشێوەکانیان، کە زیاتر لە هەموویان گومـان لـەوە ئـەکرێت کـە بەڵگـە بـن لـە سـەر نـاوەرۆك، نـاوەرۆك نـین، و تـەنها ((تـەن))،کـە ئەکەوێتـە بـەر ئـەو دەرکەوتانـە، وەك بوونـەوەرێك و ناوەرۆکێـك بـوونی هەیـە، بـەڵام ((تـەن))ی، کـەمتر لـە((ئاسـت))، ناوەرۆکـە، و ئـەم(دواییـنـە) کـەمتر لـە((هێـڵ)) و هێـڵ کـەمتر لـە ((خـاڵ)) و((یـەك))، چـونکە ((تـەن)) بـە هـۆی ئەمانـەوە سنووردار –پێناسـە–ئـەکرێت، و وادێتـە بەرچاو کە بوونی ئەمانە بە بێ تەن ئەگەری هەیە، بەڵام تەن بە بێ ئەوانە(وێنا) و بوونی نیە و ئەگەریشی نیە، کەواتە لەبەر ئەمە، زۆرینـە وبە تایبـەتی فەیلەسووفەکانی پێشتر، گوومانیان هەبوو کە ناوەرۆك و بوونـەوەر، هـەمان((تـەن))ە، و شـتەکانی تـر دەرکەوتـەی ئەون،(١٠) بە شێوەیەك کە(( بنـەماکانی تەن))یـش ((بنـەمای بوونـەوەرەکان))یـشن، بـەڵام فەیلەسووفەکانی دواتر، کە داناتر ئەهاتنە بەر چاو، و ئـەژمار ئـەکرێن، گومانیان هـەبوو کە ناوەرۆك و بوونەوەر هەمان ژمارەکـان بن، کەواتـە، بـەو شێوەیەی کـە ووتمـان، ئەگـەر

ئەم شتانە(ژمارەکان،تەنەکان،ئاستەکان، و خاڵەکان) ناوەرۆك نین، ئەوا،هیچ شێوە ناوەرۆك و هیچ شێوە بوونەوەرێك، بوونی نیە،چونکە((دیاردە))کانی ئەوان شایستەی ئەوە نین کە بە((بوونەوەر)) ناویان برێت.

(١٥) بەڵام ئەگەر رازی بین بەو تیۆرە کە هێڵەکان و خاڵەکان زیاتر لە تەن، ناوەرۆکن، بەڵام نەبینین کە ئەمانە بە جۆرێك لە تەنەسانەوە پەیوەستن،(چونکە ناتوانن پەیوەست بن بە تەنە هەست پێکراوەکانەوە){لەو شێوەیەدا} هیچ جۆرە ناوەرۆکێك ناتوانێت بوونی هەبێت، هاوکات ئاشکرایە کە هەمو ئەمانە،(واتە هێڵەکان و ئاستەکان و خاڵەکان) دابەشکاریەکانی تەنەکانن، یان لە پانی یان لە قووڵی، یان لە درێژی(٢٠) بەدەر لەمەش، هەر جۆرە شکڵێك بە شێوەیەکی یەکسان لە تەنەکاندا دەست ئەکەون، بە شێوەیەك کە ئەگەر((هەرمس[1] لە پەیکەرە بەردینەکەی))دا بەدەست نەیەت، نیوەی خشتەکیش لە خشتەك-وەك شکڵێکی دیاری کراو-دا بەدەست نایەت، ئاستێکیش کە نیوەی خشتەك سنوردار ئەکات، لەودا بوونی نەبوو، هەر ئەم ئاماژەیە لەبارەی ((خاڵ)) و((هێڵ)) و((یەك))یشەوە راستە(٢٥) کەواتە ئەگەر تەن بە زۆرترین شێوە، ناوەرۆکە، ولە لایەکی ترەوە ، ئەگەر ئەمانە (خاڵ و هێل و ئاست) دیسانەوە زیاتر لە تەن ناوەرۆکن، لە کاتێکدا کە نە بوونیان هەیە و نە بە هیچ جۆرێك ناوەرۆکن، لەو شێوەیەدا(ناسین)ی ئەوەی کە(( بوونەوەر چیە)) و(( ناوەرۆکی بوونەوەر چیە)) لە چنگمان دەر ئەچێت، زیاد لەوەش کە ووترا، لە بارەی ((دروست بوون و فەنا بوون))یش ئەنجام گەلێکی نائەقڵانی بەدەست دێن،(٣٠) چونکە وا گوومان ئەکرێت کە ناوەرۆك، لەبەر ئەوەی پێشتر نەبووە، و ئەنوکە هەیە، یان پێشتر هەبووەو ئەنوکە نیە، بە یارمەتی ((دروست بوون و لەناوچوون))ی ئەم ((کردارانەدنانە)) لەودا روو ئەدەن، بەڵام ((دروست بوون و لەناوچوون)) بۆ خاڵ و هێڵ و ئاست ڕوو نادات و مەحاڵە، هەرچەندە هەندێ جار هەبن و هەندێ جار نەبن، چونکە ((تەنەکان))،هەر کاتێك کە پەیوەست یان جیا ببنەوە، لەکاتی پەیوەستیدا ،یەك ئاست و لەکاتی لێك ترازاندا، دوو ئاست، دێتە بوون، بەم شێوەیە کاتێك کە تەنەکان پێکەوە ئەبەسترێن، ئیدی سنوور یان ئاستێك بوونی نابێت و لە ناوئەچێت، و کاتێك کە (هەر ئەم تەنانە) لێك جیا ئەبنەوە، سنوور یان ئاست گەلێك

---

[1] لە ئەفسانەکانی یۆنانی کۆندا کوڕی ((زیۆس ))و(( مایا))، خودای بەردەکان، کە لەواندا ستونە بەردێك لە شێوەی دەم و چاوی((هێرمس)) لەسەرەوەی ستونەکەدا بەدەت دێت، ئەو خودای شەوەکان و جۆرە خودای پەروەردەکەری ئەحشامەکان و هەروەها و جۆرە خودای رێگاکان و پارێزەری مووسافیرەکان و سەرەنجام خودای بازرگانی و بازار و پەیامهێنەرێکی خێرای خوداکانیش ئەژمار ئەکرا.

دروست ئەبن کە پێشتر نەبوون، (و بەڵام خاڵ- کە دابەش نەبووە،-ناتوانێت دابەش بێت بۆ دوخاڵ)، ئەگەر ئەمانە دروست بوو و لەناو چوون، لە چ شتانێکەوە دروست بوون؟(٥) لەبارەی((هەنووکە))-لەوکاتدا-دیسانەوە، رێك(حالەتێکی) هەروەك ئەمە، دروستە، چونکە بۆ((هەنووکە))ش پەیدا بوون و لەناو چوون بوونی نیە، بەڵام وادێتە بەرچاو کە هاوکات ((ئەوی تر))ە، واتە ئەویش ناوەرۆك نیە، خۆی دیارە کە مەسەلەی خاڵەکان، هێڵەکان و ئاستەکانیش هەر بەم شێوەیە ئەبێت، لەبەر لەم بارەیەشەوە بەڵگەهێنانەوەکە هەر بەهەمان شێوەیە، هەموو ئەوانە یان یەکسان، یان سنوور، یان دابەش بوون.(بەشەکان).

## "وەرزی شەشەم"

# {(دژوارییەكانی: (١٣)، (١٢)}

بەتـەواوی ئـەتوانین ئـەم مەسـەلە دژوارە راكێشینە ناوەوە كـە بـە چ هۆیـەك ئێمـە لـە گەڕانداین بـە دوی شـتەكانی تـردا-بـەدەر لـە هەسـت پێكـراوەان و ((نێوانیـەكان))- ،بۆ نموونە،(توێژینەوەی) ئایدیەمان هێنایە ناوەوە؟[1] ئەمە ئەگەر بەومانایەیە كە شتەكانی بیركاری، لەگـەڵ شـتەكانی تـری ئـەم دوونیایە،لـە روانگەیەكەوە،جیاوازن(١٥)، بەڵام لـەم روانگەیـەوە كـە گـشتایەتیەكی وەك یـەكن، جیاوازیـان نیـە، بـە شـێوەیەك كـە بنـەماكانی ئەوان لـە روانگەی ژمارەشـەوە ناتوانن سـنودار بن، (بە هـەمان جۆر كە بنـەمای هـەموو پیتـەكان، لـەم جیهانـەی ئێمـەدا، نـەك لەروانگـەی ژمـارە، بـەڵكو لـە روانگـەی جـۆەوە، سنووردارن)-مەگەر ئـەوەی كە توخمـەكانی دەربڕینێكـی تـاك یـان ئـاوازێكی تـاك، لەبەر چاو بگیرێت(٢٠)، كە لەو شێوەیەدا توخمەكانی ئەوان لە روانگەی ژمارەشـەوە سنوودار ئەبن-((نێوان))یەكانیش بەهـەمان جۆرن، كەواتـە ئەگـەر بـەدەر لـە هەسـت پێكراوەكـان و شتەكانی بیركاری، شتانێكی تر بونیان نیە- كەواتە ئەم بانگەشەیەش كە هەندێ رازین بە بوونی ئایدیەكان- لەو شێوەیەدا ناوەرۆكێك كە لە روانگەی ژمارەوە-نـەك لەروانگـەی جۆرەوە-یـەكێك بێـت، بوونی نابێـت، وبنـەمای بوونـەوەرەكانیش (٢٥) نـەك لەروانگـەی ژمارەوە-بەڵكو لەروانگەی جۆرەوە-سنووردار و دیاری كراو ئـەبن، بـەم شێوەیە ئەگـەر وەك پێویستیەك بـەم شـێوەیەیە، بوونی ئایدیـەش ئـەبێت قبـوڵ بكرێـت، چـونكە ئەگـەر

[1] مەبەست لە راناوی((ئێمە))پەیڕەوكارانی ئەفلاتوونە، چونكە ئەرستۆ لەو قوناغەدا هێشتا خۆی بە پەیڕەو كاری ئەفلاتوون زانیووە.

رازی بووانی ئەم بڕوایە ئەوە بە شێوەیەکی شایستە و کامڵ پێناسە ناکەن، هەندێ جار ئەمە هەمان(ئەو مەبەستەیە) کە ئەوان ئەیانەوێت بەیانی بکەن، و بۆ ئەمانیش پێویستایەتی قسە لەسەر ئایدیە بەو هۆیەوەیە کە هەر یەك لە ئایدیەکان ،ناوەرۆکێکە، و هیچ یەك لەوانە، بینراویانە، بوونی نیە(٣٠) بەڵام ،ئەگەر قبوڵ بکەین کە شێوەکان بوونیان هەیە و بنەماکان لە روانگەی ژمارەوە نەك لەروانگەی جۆرەوە، یەکێکن، پێش ئەمە ووتمان کە لێیانەوە ئەگەینە چ ئەنجامێك.

(١٣) زۆر نزیکتر لەم مەسەلانە، مەسەلەیەکی دژوارتر ئەوەیە کە ئایا(( توخمی خۆ هێن)) بوونیان هەیە، یان بە شێوەیەکی تر؟ ئەگەر بە شێوەیەکی تر بوونیان هەیە ،شتێکی تر-لە پێش بنەماکانەوە- بوونی هەیە، چونکە((هێن)) لە پێش ئەو هۆکارەی ترەوەیە، و پێویست ناکات ئەوەی((خۆهێزە-هێزەکییە)) بکرێتە((خۆ کردار-کردارەکی))، لە لایەکی ترەوە، ئەگەر تووخمە خۆ هێزەکان بوونیان هەیە،(ئەم مانایە)ئەبێتە هۆی ئەوەی کە بوونەوەرەکان بوونیان نەبێت، چونکە((خۆ هێن)) ئەوەیە کە هیچ شتێك، کە توانایی(هێزی) بوونایەتی نیە، نایەتە بوون.

(١٢) لە پاڵ دژواریە پەیوەست بە بنەماکان، پێویستە کە ئەم مەسەلە دژوارەش بخرێتە ڕوو کە ئایا ئەوان (بنەماکان) گشتین یان لە(ریزی) ئەو شتانەن کە ئێمە شتە لاوەکی(بەشەکیەکانیان)پێ ئەڵێین؟ چونکە ئەگەر گشتی بن لە(ریزی) ناوەرۆکەکانەوە نابن، چونکە شتە هاوبەشەکان هیچ کامیان بەڵگەیان لەسەر((ئەم شتە)) نیە، بەڵکو لەسەر((بەم شێوەیی)) هەیانە، بەڵام ناوەرۆك ((ئەم شت))ێکە(tode ti)، و ئەگەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی هاوبەش، ئەبێتە هەڵگیراوی شتەکان، یەك((ئەم شتە)) بێت و بە شتێکی ((یەکی=تاك)) ئەژمار بکرێت،(١٠)، لەو شێوەیەدا((سوقرات)) چەندین گیاندار ئەبێت، واتە خۆی و مرۆڤ و گیاندار، بە پشت بەستن بەم گریمانەیە، کە هەریەك لەمانە، لە واقعدا، لەسەر یەك((ئەم شتە)) و یەك((یەك))ی بەڵگە بن، کەواتە ئەگەر بنەماکان گشتی بن، ئەم ئەنجامانە بەدەست دێن، بەڵام ئەگەر بنەماکان گشتی نەبن، بەڵکو لە جۆری شتە بەشەکیەکان بن، بابەتەکان (نابنە زانست)،چونکە ناسینی(زانستی) هەموو شتەکان،((گشتیە))،(١٥) کەواتە، ئەگەر بڕیار وایە کە لەم بنەمایانەدا ناسینێك(زانست)ێك بوونی هەبێت، ئەبێت بنەمای تر-لە پێش ئەوانەوە- بوونیان هەبێت کە بە شێوەیەکی گشتی ببنە هەڵگیراوی ئەوان.

"وەرزی یەکەم"

# ( زانست یان ناسینی بوونەوەر هەروەك بوونەوەر )

١٠٠٣a

زانستێك هەیە كە سەرنجی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر to on hei on))و شتە پەیوەستەكان و پەراوێزەكانی ئەدات لەخودی خۆیدا، بەلاًم ئەمە هیچ یەك لەو(زانستانە) نیە كە ناونراون((بەشە زانست))،چونكەهیچ یەك لە زانستەكانی تر گشتایەتیانە توێژینەوە لەسەر(( بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) ناكەن، بەڵكو ئەوان بەشێك لە بوونەوەر جیا ئەكەنەوەو دەست ئەكەن بە توێژینەوەی(٢٥) لایەنەكان و دەركەوتەكان، وەك ئەو ئیشەی كە زانستەكانی بیركاری ئەیكەن، بەلاًم لەوێوە كە ئێمە بەدوای بنەماكان (یان رەچەڵەكەكان) و بەرزترین هۆكارەكاندا ئەگەڕێین، ڕوونە كە ئەمانە ئەبێت پەیوەست بە سروشتێكەوە بن كە خاوەنی((بوون لە خۆیدا))یە، هەنووكە ئەگەر كەسانێك كە بەدوای توخمی بونەوەرەكاندا گەڕاون، ڕێك هەر بەدوای ئەم بنەمایانە كەوتوون، كەواتە لەبەر پێویستایەتیەكەیان(٣٠)، ئەمانە توخمی بونەوەر نین، بەڵكو دەركەوتانە، توخمی((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))ن لەبەر ئەمە ئێمە ئەبێت یەكەمجار بەدوای هۆكارەكانی((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))ەوە بین(تێبگەین).

## "وەرزی دووەم"

# ( بوونەوەر و مانا جۆراوجۆرەکانی )

واژەی ((بوونـەوەر)) بـە زۆر جـۆر ئـەگووترێت[1]، بـەڵام سـەبارەت بـە یـەك مانـاو یـەك سروشـتی دیـاری کـراوە، و لەگـەڵ ئەوەشـدا بـە جۆرێکی هاونـاو بـەکار ناهێنرێت،بـەڵکو بەهـەمان جـۆر کـە هـەر شـتێکی تەندروسـت ئەگەڕێتـەوە بـۆ ((تەندروسـتی)): شـتێك بـۆ پاراستنی، شتێکی تر بۆ دروست کردنی، و دیسانەوە شتێکی سێهەمی وەك بەڵگەیەك لەسەر تەندروستی یان قبوڵکردنی، لەگەڵ ئەوەشدا بە هەمان شێوە بەکار دێت کە هەر شتێکی پزیشکی، ئەگەڕێتەوە بۆ زانستی پزشیکی و پەیوەستە بەو، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین واژەی تر بەدەست دێن کە هە بەم جۆرە بەکار دێن(٥). بەم شێوەیە واژەی(( بوونەوەر)) بە چەندین مانای جیاواز بەکاردێت، بەڵام هەموو ئەو مانایانە بۆ یەك بنەما ئەگەڕێنـەوە، چـونکە هەنـدێ لـە شـتەکان بـە بوونـەوەر ئـەژمار ئـەکرێن کـە وەك ناوەرۆکـەکانن، و هەنـدێك وەك((دەرکەوتـەکانن))یـان(کیفیـات انفعالیـە)، و هەنـدێکی تـر وەك(( ڕێگـا بـەرەو نـاوەرۆك) یـان وەك لەناوچـوونێك یـان((نـەبوون))ێکـن، یـان وەك چۆنایەتیەکانن یان پێکهێنەرو بەدی هێنەری ناوەرۆکەکان یان ئەوشتانەن کە لە پەیوەند لەگەڵ ناوەرۆکەکاندا ناو ئەنرێن، یان ڕووت بوونەوی شتانێکی لەم جۆرە دەرکەوتانە یان ناوەرۆکانە(١٠) و بەم هۆیەوەیە کە هاوکات ئەڵێین کە((نەبوو=نابونەوەر)) بوونی ((نیـە))، کەواتـە ڕێـك هـەروەك چـۆن کـە زانسـتێك بـوونی هەیـە کـە ئەیپەرژێتـە

---

[1] ئەرستۆ ئەم دەربڕینەی لە دوو شوێنی تردا لە ((میتافیزیك)) هێناوەتەوە،ب.بۆ کتێبی شەشەم، وەرزی دووەم، ١٠٢٦ ٨٣٣ و کتێبی حەوتەم ، وەرزی یەکەم ١٠٢٨ ١٠.

سەر((تەندروستیەکان))، هەر بەم جۆرەشە لەبارەی هەموو شتەکانی تر،چونکە نە تەنیا لیٚ وردبوونەوە یان سەرنجدانی شتانێك -کەخاوەنی یەك مانای هاوبەشن- ئیشی یەك زانستە، بەڵکو تێڕوانین لەو شتانەی کە خاوەنی یەك سروشتی تاکن، هەربەو شێوەیەیە، چونکە ئەمانەش بە جۆرێك لە جۆرەکان بەیانکەری یەك مانان.(١٥) کەواتە ڕوونە کە تێڕوانین لە بوونەوەرەکان ( ta onta) وەك بونەوەرەکانیش ئیشی((یەك)) زانستە، بەلاّم لە هەموو مەسەلەکاندا، زانست، بەراستی ئەیپەرژێتە سەر ئەو شتەی کە لە پێشتر و یەکەمینە، و شتەکانی تر پەیوەستن بەوەوە و بەهۆی ئەوەوە ناو ئەنرێن. هەنوکە ئەگەر ئەم شتە((یەکەمین و لە پێشترە) ناوەرۆکە، کەواتە هەوڵی فەیلەسووف ئەبێت وەگرتن و ناسینی بنەماکان (ڕەچەڵەکەکان) و هۆکارەکان بێت.

هەنووکە بۆ هەر ڕەگەزێك(لە شتەکان) پەی بردنێکی هەستەکی، و بەم شێوەیە((یەك))زانست یان ناسین بوونی هەیە(٢٠)، بۆ نموونە وەك زانستی(صرف)کە زانستێکە بۆخۆی و هاوکات،بەلاّم ئەیپەرژێتە سەر هەموو ((دەنگدارەکانیش))، بەم هۆیەوەیە کە پێداچوونەوەو توێژینەوەی هەموو جۆرەکانی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) ئیشی زانستێکە کە لە ڕووی ڕەگەزایەتیەوە ((یەکێکە))،بەلاّم توێژینەوەی جۆرەکانی (بوونەوەر....) ئیشی جۆرەکانی (ئەم زانستە)یە.

کەواتە ئەگەر((بوونەوەر و یەك)) شتێك و سروشتێکن، بەو مانایە کە هەروەك بنەماو هۆکار،هاوڕێی یەکترن، بەلاّم نەك بەو مانایەی کە یەك پێناسە بەڵگە بێت لەسەر هەردووکیان، (هەرچەندە ئەگەر بەم شێوەیە بێت، جیاوازی نیە، بەڵکو ئەگەر هەردوکیان(٢٥) بە یەك مانا لەبەر چاو بگرین بۆ ئیشەکەی ئێمە باشترە) چونکە (ئەگەر بڵێین)((یەك مرۆڤ))و((مرۆڤ)) هەردووکیان یەکێکن، و بەم شێوەیە((مرۆڤی هەبوو)) و((مرۆڤ)) و دووبارەکردنەوەی ئەم گووتەیە،((یەك مرۆڤ)) و((یەك مرۆڤی هەبوو)) شتێکی تر پیشان نادات(ڕوونە کە هەردوکیان، چ لە پەیدا بوون و چ لە لەناوچووندا، لێك جودا نین)،(٣٠) و لەبارەی((یەك))یش هەر بەم شێوەیەشە، وەك چۆن ڕوونە، کە زیادکردنی ئەوە لەم دەربڕینەدا(واتە لە: مرۆڤی هەبوو)هەموو شتێك پیشان نەدات، و((یەك))لێرەدا شتێکی تر بەدەر لە((هەبوو-بوونەوەر))نیە، هاوکات ئەڵێین کە ناوەرۆکی هەر(( تاك شتێك))، نا دەرکەوتانە، یەکێکە، و هەر بەم شێوەیەش ئەڵێین کە ناوەرۆك ئەو شتەیە کە بوونەوەرە(هەبوو)وە، لەبەر ئەمە ژمارەی جۆرەکانی ناوەرۆك ،هەمان ژمارە جۆرەکانی بوونەوەرە، و تێڕوانین و توێژینەوەی((چیەتی to ti esti)) ئەمانە ئیشی زانستێکە کە ((ڕەگەزیانە)) یەکێکە،(٣٥) مەبەستم توێژینەوە لەبارەی ((هەمان tauta))

و ((هەروەك)) و چەمكەكانی تری لەم شێوەیەیە، تا ئەندازەیەك هەموو ((دژەكان tanantia)) لەم زانستە بنەماییەدا رێ ئەدۆزنەوە، بە شێوەیەك كە ئێمە بە ئەندازەیەكی دیاری كراو، لەم بارەیەوە، لە نامەی ((هەڵبژاردەی دژەكان))[1]دا، توێژینەوەمان بۆی كردووە.

١٠٠٤a

ژمارەی بەشەكانی فەلسەفە، بە ئەندازەی ژمارەی ناوەرۆكەكانیەتی، كەواتە ئەبێت لە نێوان ئەوانەدا یەكێك، وەك پێویستیەك، فەلسەفەی یەكەمین(سەرەتا)بێت، و یەكێكی تر كە لەدوای ئەمەوە دێت، چوونكە بوونەوەر(و یەك) راستەوخۆ لەخۆگری رەگەزەكانن(٥) و بەم هۆیەوە زانستەكانیش هاوشێوەی ئەم رەگەزانەن، چونكە تا رادەیەك فەیلەسووف وەك بیركاری زان وەهایە، چونكە بیركاری زانیش خاوەنی چەندین بەشە، و لەم بەشانە یەكێكیان (یەكەمینە)) و یەكێكیان((دووەمین)) و پاشان ئەوانی تر بە ریزبەندی یەك لە دوای یەكەوە دێن.

كەواتە لەبەر ئەوەی ئیشی زانستێك تێڕوانین و توێژینەوەی هاوبەرامبەریەكانە (tantikeimena) و (١٠) ((یەك لەگەڵ گشت))هاوبەرامبەری هەیە، و لەوێوە كە توێژینەوەی ((رەتكردنەوە)) و(( نەبوون))، ئەركی(هەمان) زانستە، چونكە پێداچوونەوە لەهەردوكیاندا لە بارەی((یەك))ە كە((رەتكردنەوە))و((نەبوون)) ئەگەرێنەوە بۆی، و ئێمە،یان زۆر بە دڵنیاییەوە ئەڵێین كە ئەو شتە بوونی نیە یان(ئەوەی كە بەلایەنی كەمەوە ئەڵێین) بۆ رەگەزێكی دیاری كراو بوونی نیە، لەم بارەیەوە لە نێوان((یەك)) و((رەتكردنەوە))دا،جیاوازیەك هەیە،(چونكە(١٥)رەت كردنەوەی ئەو((یەك))ایەتیەیە)، بەڵام ((نەبوون)) خاوەنی سروشتێكی بابەتیانەیە، كە نەبوون لەبارەی ئەوەوە ئەووترێت،-كەواتە هاوبەرامبەری ((یەك))،((گشتە))، و ئەركی زانستی ناوبراو ناسینی هاوبەرامبەری ئەو شتانەیە كە لە سەرەوە ووتران، وەك((یەكێكی تر، ئەوی تر))و((نا-وەك یەك))و((نابەرامبەر))، و هەمو ئەو شتانەی تر كە یان لەمانەوە یان لە زۆرینەو یەكەوە، دروست ئەكرێن، هەنووكە یەكێك لەم شتانە، دژە،(٢٠) چونكە دژایەتی جۆرێك لە جیاوازیەیە، و جیاوازی جۆرێكە لە((ئەوی تر بوون)) كەواتە لەبەر ئەوەی((یەك)) لە چەندین مانای زۆردا دەرئەبڕێت، ئەمانە، (ئەم دژانە)ش لەچەندین مانای جیاوازدا بەكار

---

[1] ئاماژەیە بۆ نووسراوێكی وون بوو، بەناونیشانی((لەبارەی دژەكان))، بەراوردی بكەن لەگەڵ كتێبی دەیەم،١٠٥٤a٣٠.

ئەهێنرێن، بە بوونی ئەم ناسینە هەموو ئەوانە ئیشی یەك زانستن، چونكە ئەمانە نەك بەو هۆیەی كە لە چەندین مانادا بەكار ئەهێنرێن، ناسینیان ئەركی زانستە جیاوازەكانە، بەڵكو تەنیا لە شێوەیەكدا بەم شێوەیەیە كە چەمك و ماناكانیان، نە یەكێك بن و نە بتوانرێت بۆ یەك مانا بگەڕێنرێنەوە.(٢٥) و لەبەرئەوەی هەموو شتەكان بۆ ئەو شتە ئەگەڕێنەوە كە((یەكەمین))ە،-هاوكات هەموو ئەو شتانەی كە بە ((یەك))ناونراون، ئەگەڕێنەوە بۆ ((یەكەمین یەك))-ئەبێت بڵێین كە هەر ئەم مەسەلەیە لەبارەی ((هەمان))و((ئەوی تر))و((دژەكان))یش راستە، بەم شێوەیە ئەبێت دیاری بكەین كە هەریەك لەمانە لە چەندین مانادا بەكار دێن، و هاوكات، لە هەریەك لە گووتەكاندا، ئەبێت ئەوانە بگەڕێنینەوە بۆ((یەكەمین)) ودیاری بكەین كە چۆن لە گەڵ ئەواندا پێكەوە بەستراون[1]، چونكە هەندێك(٣٠) لەوانە كردارێكن لە كردارەكان، و هەندێكی تر بەچەند هۆیەكی تری لەم شێوەیە.

١٠٠٤b

هەنوكە روونە كە یەك زانست ئەركی ئەوەی هەیە كە لە بارەی ئەم شتانە، و لەگەڵ ئەوەشدا لەبارەی ناوەڕۆكەوە، توێژینەوە بكات،(ئەمە یەكێك لە مەسەلە دژوارەكان بوو كە پەرژابوومانە سەری) و لەگەڵ ئەوەشدا، ((شایستەی فەیلەسووفە كە بتوانێت لە بارەی هەموو شتەكانەوە بڕوایەك بخاتە ڕوو)) ئەگەر ئەمە ئیشی فەیلەسووف نیە، كەواتە چ كەسێك ئەبێت توێژینەوە بكات كە ئایا((سوقرات)) و((سوقراتی دانیشتوو)) هەردوكیان یەكێكن، یان ئایا ((یەك=تاك))خاوەنی دژێكە، یان (بنەماییانە)دژ چیە، یان بە چەند مانا بەكار دێت؟ و هەر بەم شێوەیەشە لەبارەی مەسەلەكانی تر ،(٥)هەنوكە لەوێوە كە ئەم شتانە روداو یان هەڵچوونەكانی ((یەك هەروەك یەك و بوونەور هەروەك بوونەوەر))ن، نەك((دەركەوتە یەكی و بونەكیەكان)) هەروەك ژمارە یان هێڵ یان ئاگر، روونە كە ئەركی ئەم زانستەیە تا هەم ((چیەتی)) وهەم ((دەركەوتەكانی))ئەو شتانە بناسێت، هەڵەی توێژەرەوان لەبارەی ئەم شتانە، لەمەدا نیە كە ئەوان بە نا-فەلسەفی

---

[1] ئەم بەرنامەیە خودی ئەرستۆ لە كتێبی پێنجەم((دلتا)) دا ئەنجامی ئەدات، و لەوێدا دەست ئەكات بە ژماردن و ڕوون كردنەوە بابەتەكان و ئەو چەمكانەی كە لە ((میتافیزیك)) دا خراونەتە بەر قسە لەسەر كردن، مەبەستی ئەو لە((هەریەك لە گووتراوەكان)) ئەوەیە كە هەریەك لەو شتانە لە پێش هەر گووتراوێكەوە بەدەست دێن، بۆ نموونە وەك((یەك)) كە لە گووتراوەكانی((چەند و چۆن و ناوەرۆك)) هەرسێكیاندا دەست ئەكەوێت، مەبەستی لە پیشاندانی((یەكەمین)) لە هەریەك لە گووتراوەكان و هەروەها یەكەمین گووتراوە، كە هۆكاری شتەكان پەیوەستە بە هەریەك لە گووتراوەكانەوە، واتە، ناوەڕۆك.

ئەژمار ئەکەن، بەڵکو(هەڵەکانیان) لێرەدایە کە بێناگان لەوەی کە ئەو ناوەرۆکەی، کە هیچ پەی بردنێکیان لێیەوە نیە، لە پێش شتەکانی ترەوەیە (١٠)،چونکە بە هەمان شێوە کە ژمارە هەروەك ژمارە خاوەنی دەرکەوتەیەکی تایبەتە، وەك(( تاکایەتی، جوتایەتی، پەیوەندی، زۆری ، کەمی))و ئەمانەش هەم لە خودی ژمارەکان و هەم لە پەیوەندیاندا لەگەڵ یەکتریدا دەست ئەکەون، و لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەبەر ئەوە، لە جەستەی رەق(تەن)(Stereos) و جولاو نەجوولاو، و بێ کێش و قورس، و چەند دەرکەوتەیەکی تایبەت تر بوونیان هەیە(١٥)، هەر لەبەر ئەمەش بوونەوەری هەروەك بوونەوەریش، خاوەنی چەند دەرکەوتەیەکی تایبەتە کە فەیلەسووف ئەبێت بە دوای راستایەتیەکەیاندا بگەڕێت، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە کە (دیالێکتیەکان dialektikoi) و( سۆفستاییەکان sofistai) لە شێوەی فەیلەسووفێکدا ئەبینرێن، چونکە((سەفسەتە)) تەنیا، جۆرێك لە وێنەی دانایی، و دیالێکتیەکانیش لەبارەی هەموو شتێکەوە قسە ئەکەن،(٢٠) بەلام بوونەوەر، بابەتی هاوبەشی هەموو ئەمانەیە، سادەیە کە ئەوان، لەوێوە کە ئەم شتە تایبەتانە، فەلسەفەن، لەبارەیانەوە قسە ئەکەن، چونکە سەفسەتەو هونەری دیالێکتیك، هەردووکیان کۆبوونەوەی هەمان رەگەزی مەسەلە فەلسەفیەکانن، بەلام جیاوازی نێوان فەلسەفە و هونەری دیالێکتیك لە جۆری تواناییەکەیان، و جیاوازی نێوان فەلسەفەو سەفسەتە لە هەڵبژاردنی ((پێوراوی ژیاندایە proauresis))(٢٥) هوونەری دیالێکتیك، راهێنانێکە لەبارەی ئەو شتانەی کە فەلسەفە بەدوای ناسینیانەوەیە، و سەفسەتە روویەکی فەلسەفەیە( بەلام بە هیچ شێوەیەك) ئەو نیە.

لە ریزێکی تری(دژەکان)دا،((نەبوون)) جێگیر بووە، وهەموو شتێك بە بوونەوەر و نابوونەوەر، و بۆ((یەك وگشت)) ئەگەڕێتەوە، بە شێوەیەك کە بۆ نموونە((جێگیری- وەستان- بۆ یەك=تاك)) و((جوولە بۆ گشت)) و تا ئەندازەیەك، هەمووان لەم بارەیەوە هاوڕان، کە بوونەوەرەکان و ناوەرۆك، تێکەڵەیەکن لە دژەکان.(٣٠)، بە لایەنی کەمەوە، هەموان ئەڵێن کە بنەماکان، دژەکانن،- هەندێك لەوان بە((تاك))و((جووت))[1] وهەندێ ((گەرم)) و ((سارد))[2] وهەندێکی تر((سنوور))و((بێ سنوور))[3] و هەندێکی تر((سۆز)) و((ئەبەرد))[4]یان (شەڕ) ئەزانن، و وا دێتە بەر چاو کە هەموو شتەکانی تر ئەگەڕێنەوە

---

[1] وەك پیتاگۆرییەکان.

[2] تیۆریەی پارمنیدێس، لە شیعرە فەلسەفیەکەیدا: رێگای گومان، ب.بۆ : ((یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان)).

[3] تیۆریەی پەیرەوکارەکانی ئەفلاتوون.

[4] تیۆریەی ئێمپێدۆکلێس.

بۆ((یەك=تاك و گشت))،(ئێمە ئەبێت ئەم گەڕانەوەیە قبوول بکەین) بنەماکانی تر کە جگە لەمانەن، لە ژێر ئەمانەوەو لە شێوەی ڕەگەزەکاندا جێگیر ئەبن، لەبەر ئەمە، لێرەوە دەر ئەکەوێــت کــە ((تێــڕوانین)) و((توێژینــەوەی بوونــەوەر هــەروەك بوونــەوەر)) ئەرکی((یەك)) زانستە، چونکە هەموو شتەکان یان((دژن)) یان((لە دژەکانن))، و بنەمای دژەکانیش هەم((یەك-تاك))ن و هەم((گشت))ە(٥)، ئەمانەش، یان هەر لە ((یەك)) مانادا بووترێن یان نە، پەیوەستن بە یەك زانستەوە،(ئەگەر چی) وەك ئەڵێن راستی لەمەدایە کە (لە یەك مانادا نەووترێن)، بەڵام هەرچەند کە((یەك)) لە چەندین مانادا ئەوترێت، هەمووان بۆ((یەکەمین یەك)) ئەگەڕێنەوە، لەبارەی دژەکانیشەوە هەر بەم شێوەیەیە، ئەگەرچی ((بوونەوەر و یەك، یان گشتێکی هەڵگیراو)) لەسەر هەموو شتەکان(١٠)-و لەگەڵ ئەوەشدا جیا لە بەشە لاوەکیەکان نین-(هەرچەندە بەم شێوەش نین) بەڵکو هەندێ لە شتەکان پەیوەستن بە((یەك))ەوە و هەندێکی تر بەوەی کە بە زنجیرەییانە، لەدوای ((یــەك))ەوە دێــت، هــەر لەبــەر ئــەم هۆیەیــە کــە توێژینــەوەی ئــەوەی کــە((دژ)) یان((تێروتەسەل)) یان ((یەك)) یان ((بوونەوەر)) یان ((هەمان)) یان ((ئەوی تر))، ئەرکی ئەندازیارێك نیە، بەڵکو ئەو(ئەندازیارە) لەوانەوە دەست پێ ئەکات، کەواتە ڕوونە کە تێڕامان و توێژینەوەی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر و دەرکەوتە پەیوەست بەوەکانی ئەو((هەروەك بوونەوەرە))، ئەرکی زانستێکە، و ئەم زانستە نە تەنیا ناوەرۆکەکان بەڵکو توێژینەوەی شتە((پەیوەست بەوەکان))یش ئەکات:- هەم ئەوانەی کە پێشتر وتران و هــەم ((پێــشکەوت)) و((دواکــەوت-پاشــکەوت)) ،((ڕەگــەز)) و((جــۆر)) ،((گــشت)) و ((بەش))، و شت گەلێکی لەم بارەیەوە[1].

---

[1] هەموو ناوەرۆکەکانی ئەم وەرزە بەراورد بکەن لەگەڵ کتێبی یانزەیەم، وەرزی سێیەم.

"وەرزی سێهەم"

# (بنەما ساکارەکان یان((ئاکسیۆمەکان)) و بنەمای نەبوونی ناهاوتایی)

هەنوکە ئەبێت بڵێین کە ئایا ئەرکی یەك زانست- یان زانستە جیاوازەکان- کە لە بارەی ئەوەی لە بیرکاری ((بنەما ساکارەکان))(یان ئاکسیۆمەکان) ناونراوئەنرێت(٢٠) ، و لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی ناوەرۆکەوە، توێژینەوەی بکات؟ ڕوونە کە توێژینەوە لەبارەی ئەم بنەما ساکارانە ئیشی یەك زانستە- (ئەویش زانستی فەیلەسووف)، چونکە ئەوان(ئەو بنەما ساکارانە) بۆ هەموو بونەوەرەکان بەهایان هەیە، نە تەنیا بۆ یەك ڕەگەزی دیاری کراوی تایبەتی جیا لە باقی ڕەگەزەکانی تر،هەموو(زانستەکان) ئەو بنەما ساکارانە بەکار ئەهێنن(٢٥) چونکە پەیوەستن بە(( بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))ەوە، و هەر ڕەگەزێکیش، هەم، بوونەوەرێکە، بەڵام هەر زانستێك ئەوانە بە ئەندازەی پێویستی خۆی بەکار ئەهێنێت،واتە بە ئەندازەی بەربڵاوی ڕەگەزی کە لە بارەیەوە گریمانە ئەهێننەوە، لەبەر ئەوە، لەوێوە کە ئەم بنەما ساکارانە(ئاکسیۆمەکان) بۆ هەموو شتێك لە شێوەی بونەوەر، بەهادارن، چونکە ئەمە بنەمای هاوبەشی نێوان هەموویانن) توێژینەوەی ئەوانەش ئەرکی ئەو کەسەیە کە بەدوای ناسینی(( بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))دایە، لەبەر (٣٠) ئەم هۆیە کەسێك کە توێژینەوە لەسەر بەشێك لە زانستەکان ئەکات، بەدەر لە ئەندازیار و ژمێریار، شتێك لەبارەی دروستی و نادروستی ئەو{بنەما ساکارانە} ناڵێن، تەنیا هەندێك لە سروشت زانەکان ئەمەیان کردووە، چونکە ئەمان لەسەر ئەو گومانە بوون کە لەبارەی تەواوی سروشت و لەگەڵ

ئەوەشدا(لەبارەی) بوونەوەر توێژینەوە ئەکەن، بەلاّم لەوێوە کە زانستێك ((هەیە)) کە لە سەروو(( بەرزتر لە زانستی سروشتیە))تێروانین لەبارەی ئەم بنەما ساکارانە(٣٥)ش ئەرکی زانستێکە کە توێژینەوەی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) ئەکات،

١٠٠٥b

لەگەڵ ئەوەشدا زانستی سروشتیش جۆرێکە لە دانایی(Sofia)، بەلاّم((یەکەمین دانایی)) نیە، بەلاّم هەندێ لە کەسەکان هەوڵ ئەدەن کە لەبارەی چۆنایەتی بەدەست هێنانی راستیەوە قسان بکەن،و بەبێ زانینی((شیتەڵکارییەکان))(واتە مەنتیق) خۆیان بپەرژێننە سەر ئەم ئیشە، چونکە ئەبێت پێشتر لەم مەسەلەیە تێگەیشتبن ولە کاتێکدا کە خەریکی فێرکارین، خۆیان سەرقاڵی توێژینەوە نەکەن[1].

(٥) کەواتە هەنوکە ڕوون ئەبێتەوە کە فەیلەسووف واتە ((کەسێك کە لە بارەی سروشت یان کونیەی هەر ناوەڕۆکێك، تێروانینی هەیە))هاوکات، بەرپرسیارە کە لەبارەی بنەماکان یان بنەماکانی پێوانە کردنیش توێژینەوە بکات و، هەم شایستەیە، کەسێك کە لە بارەی هەر ڕەگەزێك باشترین زانست و ناسینی هەبێت، بتوانێت بنچینەیی ترین بنەما یان ڕەچەڵەکی ئەو شتە بەیان بکات(١٠)،بە شێوەیەك ئەو کەسەی کە ناسینێکی لەبارەی (( بوونەوەران هەروە بوونەوەران))ەوە هەیە، ئەبێت بتوانێت بنچینەیی ترین بنەماکانی هەموو شتەکان دیاری بکات، کەسێکی لەو شێوەیە،هەمان فەیلەسووفە، و بنچینەیی ترینی هەمو ئەو بنەمایانە ئەوەیە کە ((فێڵ لێکران)) لەوەدا بوونی نیە،چونکە بنەمایەکی لەم شێوەیەش ئەبێت ناسراوترینیان بێت-(چونکە فێڵ لێکران، هەمیشە لەبارەی نەناسراوەوە ڕوو ئەدات)-، و هەم ئەبێت کە لەسەر بنەمای گریمانە نەبێت،(١٥) چونکە ئەو بنەمایەی کە هەر کەسێك بیەوێت شتێك لەبارەی بوونەوەرکانەوە تێ بگات ئەبێت هەیبێت، ((گریمانە))نیە، و ئەوەی کە هەر کەسێك کە بەدوای ناسینی شتێکەوەیە کە ئەبێت زانراو بێت، ئەوەیە کە کاتی توێژینەوە، ئەبێت بابەتێکی لەبەردەمدا بێت.

لەبەر ئەمە ڕوونە کە بنەمایەکی لەو شێوەیە،بنچینەیی ترینی بنەماکانە، ئەوەیە کە ئەڵێین کە ئەم بنەمایە چیە:(( بوون و نەبوونی شتێك-هەردووك-لەیەك(٢٠) کات و لەهەمان شت و لەهەمان ئاراستەوە ئەگەری نیە)) (پێناسەیەکی تریش، بەدەر لەمە، بۆ

[1] بە گوومانێکی زۆر ئاماژەیەکە بۆ((ئانتیس سینیس)) فەیلەسووفی سینیك یان((سەگ))(کە لە نێوان ساڵەکانی ٤٤٠ و ٣٣٦ پ.ن) دا ژیاوە، سەیری((میتافیزیك)) بکەن، بەرگی یەکەم، لا ٢٦٣.

پێشگرتن لە گلەیە قورسە مەنتیقیەکان، زیاد ئەکەین) ئەمە((بنچینەیی ترینی هەموو بنەماکانە)) چونکە پێناسەیەك لە خۆی ئەگرێت کە پێشتر خرایە ڕوو، چون هیچ کەس ناتوانێت هەم((بوون))و هەم((نەبوونی)هەمان شت قوبڵ بکات، بە شێوەیەك کە هەندێك گومان لەوە ئەکەن کە((هراکلایتوس)) بەم شێوەیەی(٢٥) ووتووە،((بەلأم پێویست ناکات کە کەسێك بەوەی کە ئە یڵێت،باوەڕی هەبێت)) کەواتە ئەگەر بوونی دژەکان لەیەك و هەمان شتدا ئەگەری نیە،و دژی بڕوایەك، بڕوا ناهاوتاکەیەتی، بە ڕوونی دیارە کە ئەگەری نیە هەمان کەس(٣٠) لەیەك کاتدا، هەم ((بوون)) و هەم ((نەبوون))ی هەمان شت قبوڵ بکات،چونکە ئەو کەسەی کە دوچاری ئەم هەڵەیە ئەبێت لە یەك کاتدا خاوەنی دوو بڕوای جیاوازە، بەم هۆیەوە هەموو ئەو کەسانەی کە گریمانە ئەهێننەوە، ئەگەرێنەوە بۆ ئەم بڕوایەی دواوە، چونکە ئەم بنەمایە سەرەتای هەموو بنەما ساکارەکانی (ئاکسیۆمەکان)ی ترە.

"وەرزی چوارەم"

## ( تیۆرە و مەسەلەکانی دەربارەی یاساى ناهاوتایی )

١٠٠٦a

بەلاّم، بەو شێوەیەی کە ووتمان، هەن کەسانێك کە لەو باروەڕەدان ((بوون))و((نەبوون))ی هەمان شت، ئەگەری هەیە و ئەتوانین قبولْ بکەین کە بەم شێوەیە[1]، زۆرێك لە سروشتناسەکان لەسەر ئەو بڕوایەن، بەلاّم ئێمە هەنوکە تێگەیشتین کە ((بوون))و((نەبوون))ی شتێك لەیەك کاتدا، ئەگەری نیە، و پیشانمان دا کە ئەمە((بنچینەیی ترینی(٥) هەموو بنەماکانە))، لەگەلْ ئەوەشدا هەن کەسانێك کە بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە ئەم((بنەما))یەش ئەبێت، بگریمێنرێت و بسەلمێت، چونکە (( نەزانینی ئەوەی کە بۆ چ شتانێك ئەبێت، بەدوای گریمانەدا بگەڕێین، و بۆ چ شتانێك نابێت بگەڕێین، نیشانەی نەبوونی فێرکارییە چونکە بە شێوەیەکی گشتی ئەگەری نیە کە بۆ هەموو شتەکان گریمانەیەك بەدەست بێت))، ئەگەرنا گووزەرەکە تا ناکۆتا رائەکێشرێت،(( بە شێوەیەك کە(ئیدی) بەم شێوە، بە هیچ جۆرێك گریمانە بوونی نابێت،)) بەلاّم ئەگەر هەن شتانێك کە(١٠) نابێت بەدوای گریمانە بکەوین بۆیان، ئەم کەسانە ناتوانن بلّێن کە کام بنەما بە ((بنەمایی تر)) لەمە ئەزانن.

بەلاّم بە شێوەیەکی رەت کردنەوە ،ناتوانین گریمانەی ئەوە بکەین کە تەنانەت ئەم بنەمایەش ئەگەری نیە، تەنیا بەم مەرجە کە کەسە دژەکەی ئێمە شتێك بلّێت، ئەگەر شتێك نەلّێت، پێکەنیناوییە کە لە بەرامبەر کەسێك کە-لەبارەی هیچ شتێکەوە ناتوانێت

---

[1] لەوانەیە ئاماژەیەك بێت بۆ قووتابخانەی((مەگارییەکان)) لە قوتابخانە سوقراتیەکان، سەیری((میتافیزیك)) Ross، بەرگی یەکەم، لا ٢٦٨ و((میتافیزیك))، پاریس، ١٩٦٤، بەگی دووەم، لا ٢٨٨.

قسه بکات، لـه گەڕانـدا بـێن بـەدوای قسەیەکدا، چـونکە کەسـێکی لـەم شـێوەیە، لـە حاڵـەتێکی لەم شێوەیەدا هـەروەك گیایـەك وەهایـە،(١٥) بەلاّم من ئەڵێم کە گریمانـە، بـە شێوەی ((رەتکردنەوە)) لەگەڵ ((گریمانەی راستەوخۆ)) جیاوازی هەیە، چونکە لەوانەیـە کـە گومـانی ئـەوە بکرێـت کـە هێنـەرەوەی گریمانەکـە ((کـۆنترۆڵی مەبەسـتی یەکـەم)) بکات( aiteisthai to en arkhe) بـەلاّم ئەگـەر کەسێکی تر پاڵنـەری ئەو بێت، لـەو شێوەیەدا ((رەت کردنەوەیەکە))، نـەك ((گریمانەیـەك apodeixis)) بـەلاّم لـە سـەرەتای هـەموو ئـەم جـۆرە توێژینەوانـەوە چاوەڕێی ئـەوە ناکرێـت کـە نەیارەکـە بڵێـت شـتێك ((هەیە)) یان ((نیە))،(٢٠)(چونکە لەوانەیە کە ئەمە بە کۆنترۆڵ کردنی مەبەستی یەکەم ناو بنرێت) بـەڵکو ئەوەیـە کە گوتەکەی ئـەو(نەیارەکە) بۆ خۆی و ئـەوانی تـر، بەڵگەیـە لەسەر شتێك، چونکە ئەگەر بڕیار بێت کە ئەو شتێك بڵێت، ئەم(بەڵگەیە) پێویستە، بـەلاّم ئەگـەر بـەم شـێوەیە نـەکات، لـەو شـێوەیەدا نـە لەگـەڵ خۆیـدا و نـە لەگـەڵ ئـەوانی تـردا ئـەتوانێت قسەیەك بکـات، بـەلاّم ئەگـەر لەسـەر ئـەم خاڵـە جێگیر بێـت، ئەگـەری گریمانـە دەبێت، چونکە پێشتر شتێکی دیاری کراو سنووردارمان ئـەبێت، (٢٥) بـەلاّم هۆکـاری ئـەم گفتگۆیـە، کەسـی هێنـەرەوەی گریمانەکە نیە، ئەو کەسەیە کە خۆراگرانـە خـۆی ئەداتـە دەسـت قسەکانی ئـەو، چـونکە هەرچـەندە ئـەو قسەیە رەت بکاتـەوە، (لەگـەڵ ئەوەشـدا) خۆراگرانـە گـوێی بـۆ رادەدێرێـت، بەدەرلەمـەش، کەسـێك کـە خـۆی ئەداتـە دەسـت ئـەم مەسەلەیە، راستێتی شتێکی، تەنانـەت بە بێ گریمانـە، قبوڵ کردووە،(بە شێوەیەك کە هەموو شتێك((بەم شێوەیە و بەم شێوەیە نا)) نابێت)).

لێرەدایە،کە یەکـەم جـار ڕوون ئەبێتـەوە کە ئـەم خاڵـە راستە، کـە نـاوی((بـوون to einai)) و ((نـەبوون to me einai)) بەڵگەیـە لەسـەر مەسـەلەیەکی دیـاری کـراو، بـە شێوەیەك کـە هـەموو شـتێك لـە هـەمان کاتـدا ناتوانێـت(( بـەم شـێوەیە و بـەم شـێوەیە نـا))بێـت، هاوکـات( ڕوون ئەبێتـەوە کـە) ئەگـەر ووشـەی ((مـرۆڤ)) بەڵگەیـە لەسـەر شتێك،(ئـەتوانین بڵـێین کـە) ئـەم شتە((ئاژەڵی دوو پـێ))بێـت، مەبەسـتی مـن لـە((بەڵگـە لەسـەر یـەك شـت)) ئەمەیـە کـە: ئەگـەر مـرۆڤ ئـەم شـتەیە(واتـە ئـاژەڵی دوو پـێ)، لـەو شێوەیەدا ئـەم شتە(ئاژەڵی دوو پێ) تـا ئـەو شوێنەی کە شتێکی مرۆڤە، مـرۆڤ بـوونی ئـەوی لـە خـۆدا، دەبێـت، جیاوازیـەکیش بونی نیـە گـەر بوترێـت کـە یـەك ووشـە بەڵگەیـە لەسەر شتەکانی تر، تەنیا بەم مەرجەی کە ژمارەیەکی دیاری کراو بێت.

١٠٠٦b

چونکە لەو شێوەیەدا لەسەر هەر شتێك ناوێکی تر(جیاوان) ئەتوانین بنێین(کە گونجاو لەگەڵ پێناسەکەیدا بێت) نمونەی ئەم حاڵەتە بەم شێوەیەیە کە بڵێین: لەوانەیە بووترێت کە ناوی ((مرۆڤ)) نەك لەسەر یەك شت، بەڵکو لەسەر شتەکانی تریش بەڵگەیە، و یەکێك لەوانە پێناسەی ((ئاژەڵی دوو پێ)) یە، و لەگەڵ ئەوەشدا، لەپاڵ ئەم پێناسەیەدا ئەتوانین پێناسەی ترمان دەست بکەوێت، بەو مەرجەی کە لەژمارەدا سنوردار بن،چونکە لەو شێوەیەدا کە بۆ هەر پێناسەیەك(٥) ئەتوانین ناوێکی تایبەت دابنێین،بەلاًم ئەگەر لە لایەکی ترەوە بووترێت کە ووشە-یان ناوێك-بەڵگەیە لەسەر(زنجیرەیەك)ی ناکۆتایی لەشتەکان، ئەوکات ئیدی روونە کە هیچ پێناسەیەك بوونی نابێت، چونکە بەڵگە نەبوون لەسەر یەك شت بەمانای بەڵگە نەبوونە لەسەر هیچ شتێك،و ئەگەر ناوەکان بەڵگە لەسەر شتەکان نەبن، نە تەنیا گفتگۆیەك لەگەڵ یەکتری، بەڵکو( ئەگەری گفتگۆکردن)لەگەڵ خۆشمان نابێت،(١٠) چونکە بیرکردنەوە،بێ ئەوەی بیر لە شتێك بکرێتەوە، ئەگەری نیە(مەحاڵە)، بەلاًم ئەگەر ئەم (واتە بیرکردنەوە لە شتێك) ئەگەری هەیە، لەوشێوەیەدا لەسەر ئەو شتە بیر لێکراوە، ئەبێت بتوانین ((ناو))ێك بنێین.

بەهەمان شێوە کە لە سەرەتاوە ووتمان، هەنوکە گەر بەم شێوەیە بێت کە هەرناوێك بەڵگە بێت لەسەر شتێك، ئەویش(تەنیا) لەسەر یەك((شت))، لەو شێوەیەدا ئیدی ئەگەری ئەوە نیە کە دەربڕینی((مرۆڤ بوون)) رێك بەڵگە بێت لەسەر((مرۆڤ نەبوون))، ئەگەر ووشەی ((مرۆڤ)) نە تەنیا لەسەر یەك مانا(١٥) بەڵکو هاوکات لەسەر یەك ((شت))بەڵگە بێت،چونکە خواستی ئێمە لە((بەڵگە بوون لەسەر یەك شت)) ئەمە نیە کە((بەڵگەیە لەسەر یەك، بۆ یەك شتی تر))(واتە هەڵگیراوەکە لەسەر بابەتێکی ترەوەیە) چونکە لەو شێوەیەدا(و) و بەم جۆرە، ناوگەلێکی وەك((مۆسیقاپ))[1]،((سپی))،((مرۆڤ)) بەڵگە بوون لەسەر یەك شت، و بەم شێوەیە هەموو شتەکان یەکێك دەبوون، چونکە هەموویان یەك مانایان دەبوو،(واتە هاومانا دەبوون) و لەگەڵ ئەوەشدا((بوون))و((نەبوون)) ناتوانن یەکێك و هەمان بن، وەك ئەوەی کە ئێمە بەوە ئەڵێین((مرۆڤ)) و ئەوانی تر((نا مرۆڤ))ی پێ ئەڵێن، مەگەر بە جۆرێکی هاوناویی یان((ناو-هاوبەشی))(٢٠) (حاڵەتێکی لەم شێوەیە روو بدات) بەلاًم مەسەلە ئەمە نیە کە ئایا ئەکرێت کە هەمان شت لە روانگەی ناو لەیەك کاتدا هەم((مرۆڤ)) بێت و هەم نەبێت، بەڵکو(مەبەست) لەروانگەیی بوونی((مەسەلەیەکی واقعی))یە، ئەگەر((مرۆڤ)) و((نامرۆڤ)) بەڵگە نەبن لە سەر شتە

[1] لێرەدا تەنیا مەبەست لە مۆسیقار نیە بەڵکو کەسێکیس کە هونەر و ئەدەب دۆستە ئەگرێتەوە.

جیاوازەکان، ڕونە کە ((مرۆڤ نەبوون)) لەگەڵ ((مرۆڤ بوون)) جیاوازیەکی نابێت، و هەر لەبەر ئەمە((مرۆڤ نەبوون))(هەمان)((مرۆڤ بوون))دەبێت(٢٥)، چونکە هەردوکیان یەکێکن، لەبەر ئەوەی ، ئەوشتەی کە بەڵگەیە لەسەر((یەك-بوون))-وەك ڕووپۆش- کە مانا یان پێناسەکەی((یەك))ێك بێت، ئەگەر((مرۆڤ بوون)) و((مرۆڤ نەبوون)) یەکێك بن، ئەوکات هەردولا بەڵگەن لەسەر یەك شت، بەڵام ئێمە سەلماندمان کە ئەوانە بەڵگەن لەسەر شتانێکی جیاواز، کەواتە ئەگەر بتوانین بڵێین کە شتێك بە راستی((مرۆڤ))ە، ئەو شتە، پێویستیانە،((ئاژەڵی دوو پێ))شە،(چونکە ئەمە هەمان((شتێك)) بوو کە وشەی((مرۆڤ)) بەڵگە بوو لەسەری)(٣٠) و ئەگەر وەك پێویستیەك بەم شێوەیە بێت، ئیدی ئەگەری نیە کە هەمان شت لەو کاتەدا((ئاژەڵی دوو پێ)) نەبێت، چونکە((پێویست بوون)) بەم مانایەیە کە: نەبوونی ئەو شتە ئەگەری نیە، بەم شێوەیە بە راستی ئەگەری نیە کە بووترێت، کە هەمان شت لەهەمان کاتدا مرۆڤە، ومرۆڤیش نیە، هەر ئەم قسەیە لەبارەی((مرۆڤ نەبوون))یشەوە راست ئەبێت، چونکە ((مرۆڤ نەبوون)) و((مرۆڤ بوون)) ماناگەلێکی جیاوازیان هەیە، بە شێوەیەك کە((سپی بوون)) بەڵگەیە لەسەر شتێك کە بەدەرە لە ((مرۆڤ بوون)) بەڵام لەو بارەدا(واتە مرۆڤ بوون و مرۆڤ نەبوون) دژایەتیەکی زۆر زیاتر بوونی هەیە، چونکە بەڵگەیە لەسەر شتانێکی زۆر جیاواز، و ئەگەر بووترێت کە((سپی)) (و مرۆڤ) بەڵگەن لەسەر یەك شت،(٥) جارێکی تر هەمان شت ئەڵێینەوە کە پێشتر وترا، واتە، ئەوەی کە لەو شێوەیەدا هەموو شتەکان، و نە تەنیا دژەکان، یەك شت ئەبن، بەڵام ئەگەر شتێکی لەم شێوەیە ئەگەری نیە، ئەنجامەکە هەمان ئەبێت کە ووترا، ئەگەر،بەشێوەیەك، کە قسەکەر وەڵامی پرسیارەکەی ئێمە بداتەوەو،بەڵام لە شێوەیەکدا کە ئەو لەسەر ئەوەی کە بە سادەیی خراوەتە بەر پرسیار لەسەر کردن،((سلبییاتەکان))زیاتر بکات،(١٠) ئەوکات وەڵامی پرسێنراوەکەی ئێمە ناداتەوە، چونکە هیچ بەربەستێك نیە کە یەکێك و هەمان شت((مرۆڤ))،((سپی)) و ژمارەیەکی ناکۆتایی شتەکانی تر بێت، بە بوونی ئەمەش، گەر بە شێوەیەك پرسیار بکرێت کە ئایا راستە کە ئەم شتە مرۆڤە یان شتێکی تر؟ قسەکەر ئەبێت وەڵامێك بداتەوە کە بەڵگە بێت لەسەر یەك شت، و نابێت ئەوەی بخاتە سەر کە:((سپی وگەورە))شە، چونکە ژماراندنی دەرکەوتەکان-کە بێ ئەژمارن- ئەگەری نیە(مەحاڵە)، کەواتە ئەبێت بهێڵین کە یان هەمویان بژمێرێت یان هیچ کامیان، هەرلەبەر ئەمە، لە شێوەیەکدا کە شتێك دەهەزار جار((مرۆڤ)) و((نامرۆڤ))ە، ئەو لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە((ئایا ئەم شتە مرۆڤە؟)) نابێت(ئەم مانایە زیاد بکات) کە ئەم{شتە} -لەهەمان کاتدا-((نامرۆڤ))یشە، مەگەر

ئەوەی کە ناچار بێت کە هەموو دەرکەوتەکانی تر، بەدەر لەوانەی کە هەن و ئەوانەی کە نین،-هەمو پێکەوە، لە وەڵامەکەدا زیاد بکات، ئەگەر بەم شێوەیە بکات، ئیدی گفتگۆیەك لە نێواندا نابێت.

(٢٠) بە شێوەیەکی گشتی کەسانێك کە بەم شێوەیە قسە ئەکەن، ناوەرۆك و چیەتی(ماهیەت) لەناو ئەبەن، چونکە ناچارن کە بڵێن هەمو شتەکان، دەرکەوتەن، و((مرۆڤ بوون))لە خۆیدا یان((ئاژەڵ بوون)) لەخۆیدا بوونی نیە، بەڵام ئەگەر شتێك هەروەك ((مرۆڤ بوون)) لە خۆیدا بێت، ئەو{شتە}نە ((نامرۆڤ بوون)) یان((مرۆڤ نەبون)) نابێت، (٢٥)، چونکە شتێك بوو کە ئەم لەسەر ئەو ((شتە)) بەڵگە بوو، و ئەو ناوەرۆکی شتێك بوو، بەڵام((بەڵگە)) بوون لەسەر ناوەرۆك، بەو مانایەیە کە(( بوونایەتی to einai))ەکەی ئەو هیچ شتێکی تر(جگە لە ناوەرۆك)نیە.

بەڵام ئەگەر((خودی مرۆڤ بوون)) ئەو یان هەمان((خودی مرۆڤ نەبوون))یان((خودی نامرۆڤ بوون)) بێت، ئەوکات بونایەتیەکەی ئەو شتێکی تر ئەبێت، بە شێوەیەك کە ئەمان ناچارانە ئەبێت بڵێن کە(٣٠) هیچ شتێك خاوەنی مانا یان پێناسەیەکی لەم شێوەیە نیە، بەڵکو هەموو شتێك، تەنیا،دەرکەوتەیە(دیاردەیە)، چونکە لەم رێگایەوەیە کە ناوەرۆك و دەرکەوت، لێك جیائەبنەوە،((سپێتی)) بۆ مرۆڤ((دەرکەوت))ە، بەم هۆیەوە کە مرۆڤ سپیە، نەك بەو هۆیەی کە ئەو((خودی سپێتی))یە، بەڵام ئەگەر هەموو شتێك وەك((دەرکەوت)) بێت، لەوێوە کە((دەرکەوت)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەمیشە ((هەڵگیراوی بابەتێکی ))دیاری کراوە، لەو شێوەیەدا، هیچ(( شتێکی یەکەمی)){ (یان سەرەتایی) لەسەر بنەمای نوسخەیەکی تری ناوەرۆکە یۆنانیەکە.و.فارسی}کە شایەنی گووتن بێت، بوونی نیە،(٣٥)لە ئەنجامی هەڵگرتنەکەدا، بە ناچاری، تا ناکۆتا درێژەی پێ ئەدرێت، بەڵام ئەگەری ئەمەش نیە، چونکە((لە هەڵگرتندا زیاتر لە دوو دەرکەوت ناتوانن پەیوەست بن بەیەکەوە)) چونکە،((دەرکەوت))، ناتوانێت((دەرکەوتی دەرکەوت)) بێت، وەك ئەوەی کە، بۆنموونە ،بڵێین کە((سپی))((مۆسیقاپ))و ((مۆسیقاپ))((سپی))ە، چونکە هەردووکیان ((دەرکەوتەیەکن)) بۆ مرۆڤ(٥)، بەڵام ((سوقرات)) بەدەر لەم مانایە ((مۆسیقارە))، کە هەردوو دەرکەوتەکە شتێکی ترن، چونکە لەوێوە کە هەندێ لە دەرکەوتەکان بەم مانایەو هەندێك بەو مانایە هەڵئەگیرێن،-وەك ئەوە بڵێین ((سپی)) بۆ سوقرات دەرکەوتەیە- ئەگەری نیە کە خاوەنی زنجیرەیەکی ناکۆتا بەرەو سەرەوە بن، بۆ نموونە((سوقراتی سپی)) ناتوانێت خاوەنی دەرکەوتەیەکی تر بێت،(١٠)چونکە لە کۆمەڵەی هەموو ئەمانەدا، شتێکی تاك(یەك) دروست ناکرێت، بەڵام((سپی))یش

ناتوانێت خاوەنی دەرکەوتەیەکی تر بێت، بۆ نموونە ((مۆسیقاڕ))بێت، چونکە ئەم بە نیسبەت ئەوەوە، زیاتر لەو بە نیسبەت ئەمەوە، دەرکەوت نیە، و لەهەمان کاتدا ئەم جیاوازیە ڕوی داوە کە هەندێکیان بەم مانایە دەرکەوتن و هەندێکی تریان (بە مانایەکی تر)وەك((مۆسیقار)) بۆ سوقرات، بەلام دەرکەوتێك بۆ دەرکەوتێکی تر،نەك بەمانای کۆتاترین، بەڵکو بەمانای یەکەم، دەرکەوتە، لەبەر ئەمە هەموو هەڵگرتنەکان، دەرکەوت نین، کەواتە ئەبێت شتێك هەبێت کە (( بەڵگە بێت لەسەر ناوەڕۆك))، ئەگەر بەم شێوەیەیە، ئەسەلمێت کە((هەڵگرتنی ناهاوتاییەکان)) لە یەك کاتدا،(لەسەر یەك شت) ئەگەری نیە. هاوکات ئەگەر(هەلگرتنی) هەموو ناهاوتاییەکان لەیەك کات ولەسەر هەمان شت، راست بن، لەو شێوەیەدا ڕوونە کە هەموو شتەکان یەکێك ئەبن.چونکە بە شێوەیەك کە سەلماندن و رەتکردنەوەی شتێك-هەردووکیان-بۆ هەموو شتێك ئەگەری هەبێت، لەو شێوەیەدا بەلەمێکی خاوەن سێ ریز سەوڵ، و مرۆڤ، یەکێك دەبوون، و ئەمە ڕێك ئەنجامی ناچارانەی کەسانێکە کە قسەکەی ((پرۆتاگۆراس))[1] ئەڵێنەوە: چونکە ئەگەر کەسێك بیربکاتەوە کە مرۆڤ((بەلەمێك لەگەڵ سێ ریز سەوڵ))نیە، ڕوونە کە مرۆڤ، بەلەمێکی لەم شێوەیە نیە، بەلام ئەگەر دژەکەی ئەو(بیرە) راست بێت، مرۆڤ بەلەمێکی لەو شێوەیەیە، لە ئەنجامدا بەم قسەیەی((ئاناکساگۆراس)) ئەگەین کە:(( هەموو شتەکان لەناویەکدان (تێکهەڵکێشکراون)..))، واتە لە راستی دا هیچ شتێك بوونی نیە، ئەم کەسانە وادێتە بەرچاو کە قسە لەسەر((دیاری نەکراو aoriston)) ئەکەن، و لەکاتێکدا کە وا ئەزانن لەبارەی(( بوون))ەوە قسان ئەکەن، لەواقعدا،لە((نەبوو)) قسە ئەکەن، چونکە ئەوی کە((خۆهێزانە))-نەك خۆکرادارانە- بوونی هەیە ((دیاری نەکراوە))، بەلام ئەم کەسانە ئەبێت، لەبارەی هەموو شتێك- یان وەك سەلماندن یان وەك رەتکردنەوە- قسە بکەن، چونکە بێ مانابیە کە ئەگەر بۆ هەر شتێك، دژەکەشی(رەتکەرەوەکەشی) بە راست بزانێت، بەلام رەتکردنەوەی شتێکی تر،بە راست نەزانێت، مەبەستم ئەوەیە کە بۆ نموونە ئەگەر راستە کە بلێین مرۆڤ، مرۆڤ نیە، هاوکات بە ڕوونی راستە کە بلێین(( ئەم مرۆڤە ، بەلەمێکە کە سێ ریز سەوڵی هەیە)) یان ئەم بەلەمە {خاوەنی سێ ریز سەوڵ نیە}، کەواتە ئەگەر((سەلماندن)) راستە، وەك پێویستیەکیش، ((رەت کردنەوەش)) ئەبێت راست بێت، ئەگەر (( سەلماندن)) راست

[1] مەبەست لە ڕێژەگەراییەکەی ئەوە کە بە پێی ئەوە هەموو دەربڕینەکانی تر و بڕواکانی تریش و دیاردەکان، بە پێی بانگەشەکەی ئەو:(( مرۆڤ پێوانەی هەموو شتەکانە)) سەیری بەرهەمەکەی تری وەرگێر بکەن((لە سوقراتەوە تا ئەرستۆ)) ،چاپی دووەم، ١٣٥٦، ل٢٢٧ بە دواوە.

نەبێت (٣٥)کەواتە((رەت کردنەوەی)) ئەو ئەبێت تەنانەت زۆر زیاتر لە رەت کردنەوەی خودی خۆی راستتر بێت.

١٠٠٨a

لەبەر ئەمە ئەگەر ئەو((رەت کردنەوەیە)) راست بێت، رەتکردنەوەی ((کەشتیەك کە خاوەنی سێ ریز سەوڵە)) ش هەر راستە، و ئەگەر ئەمیش راست بێت، ((سەلماندن))ەکەشی هەر راستە.

کەواتە کەسانێك کە ئەو قسەیە ئەکەن، ئەگەنە ئەو ئەنجامەو لەگەڵ ئەوەشدا(بەم ئەنجامە) کە یان سەلماندن یان رەتکردنەوە پێویست نیە،چونکە ئەگەر راست بێت کە(٥) شتێك ، هەم مرۆڤە و هەم نا-مرۆڤ، روونە کە ئەو نە ((مرۆڤ)) ئەبێت و نە(( نا-مرۆڤ)).

چونکە هەر دوو گووتەکە خاوەنی دوو رەتکردنەوەن، بەڵام ئەگەر ئەو گووتەیە(واتە شتێك هەم مرۆڤ و هەم نا-مرۆڤە)بە ((لەتە مەسەلەیەك لە هەردوکیان)) ئەژمار بکەین، ئەوکات ئەم گووتەیە(( ئەو نە مرۆڤە و نە نامرۆڤ))یش ئەبێتە(( لەتە مەسەلەیەك)) کە ((دژی)) ئەوە.

هاوکات، یان لە هەموو بوارەکاندا بەم شێوەیەیە و شتێك هەم سپیەو هەم سپی نیە، و هەم بوونی هەیەو هەم بوونی نیە،(هەم بوونەوەرە و هەم بوونەوەر نیە) و نیسبەت بە(هەموو)سەلماندنەکان و رەت کردنەوەکانی تریش، هەر بەم جۆرەیە،(١٠) یان لە هەندێ بواردا بەم شێوەیەیە و لە هەندێ بواری تردا بەم شێوەیەیە نیە، ئەگەر لە هەموو بوارەکاندا بەم شێوەیە نیە، لەبارەی ئەو حاڵەتە بەدەریانە، رێککەوتنێك بەدەست دێت، بەڵام ئەگەر لە هەموو بوارەکاندا بەم شێوەیە بێت، لەو شێوەیەدا ئیدی لە هەر شوێنێکدا کە ((سەلماندن)) هەبێت ((رەت کردنەوە))ش ئەبێت، و هەر شوێنێك کە ((رەتکردنەوە))هەیە ((سەلماندیش)) دەبێت، یان لە هەر شوێنێك کە سەلماندن هەیە رەتکردنەوەش دەبێت، بەڵام لەهەر شوێنێك کە رەتکردنەوە هەیە-لە هەموو بوارەکاندا- سەلماندن بوونی نابێت، و ئەگەر ئەمە(١٥) بەم شێوەیە بێت، لەو شێوەیەدا شتێك بەدەست دێت کە بە شێوەیەکی جێگیر((نا-بوونەوەر))ە،و ئەمەش مەسەلەیەکی یەکلاکەرەوە ئەبێت، و ئەگەر(( نەبوونی)) شتێك، پڕاوپڕ و دروست بێت، گووتەی بەرامبەرەکەی یان دژەکەی ((ناسراوتر)) ئەبێت، بەڵام ئەگەر ئەوەی رەت ئەکرێتەوە، بتوانێت بە هەمان شێوەش بسەلمێت، لەو حاڵەتەدا (دوو حاڵەت دێنە پێشەوە،) و پێویستانەش، گوتەی ئەو کەسەی کە دوو مەسەلە لێك جیا ئەکاتەوەو- بۆ نموونە

جارێك ئەڵێت شتێك سپی یەو جارێکی تر ئەڵێت سپی نیە-یان ڕاست ئەبێت یان ڕاست نابێت.(٢٠) بەڵام ئەگەر ئەم جیا گووتنە (سەلماندن و ڕەتکردنەوە) ڕاست نیە، لەو شێوەیەدا ئەوەی کە قسەکەر نییەتی وتنی بووە بە هیچ شێوەیەك نەیووتووەو هیچ شتێك (تەنانەت خودی قسەکەرەکەش) بوونی نیە.(بەڵام شتێك کە بوونی نیە،چۆن ئەتوانێت شتێك بهێنێتە سەر زمان یان بە ڕێگادا بڕوات؟) لەگەڵ ئەوەشدا، وەك چۆن لەسەرەتاوە ووتمان، هەموو شتەکان یەکێك ئەبن و هەمان شت((مرۆڤ))، ((خودا))، ((بەلەمی خاوەن سێ ریز سەوڵ)) و لەگەڵ ئەوەشدا، ناهاوتاکان (دژەکانیشیان) ئەبێت، چونکە ئەگەر بکرێت کە هەر شتێك بۆ هەر شتێك، بەیەکسانی ((بسەلمێت و ڕەت بکرێتەوە)) بە هیچ شێوەیەك شتێك یان شتێکی تر جیاوازی نابێت، ئەگەریش بەراستی((سەلماندن وڕەت کردنەوە) لێك جیان، ئەنجامەکە بە هەمان شێوەیە کە گووترا، بەڵام ئەمەش بخرێتە سەری کە هەموان ڕاست ئەڵێن و هەمووان درۆ ئەکەن، و خودی قسەکەرەکەش دان بەوەدا ئەنێت کە درۆ ئەکات،(٣٠) و لەهەمان کاتدا دەرئەکەوێت کە گفتگۆ کردن لە گەڵ ئەودا لەبارەی هیچەوەیە، چونکە ئەو لە واقعدا هیچ شتێك ناڵێت، چونکە نە ئەڵێت(( بەم شێوەیەیە)) و نە ئەڵێت((بەم شێوەیە نیە))، بەڵکە(ئەڵێت)(( بەم شێوەیەیە و بەم شێوەیە نیە)) و جارێکی تر هەردووکیان ڕەت ئەکاتەوە، کە((نە بەم شێوەیەیە و نە بەم شێوەیە نیە))، ئەگەر نا بەم شێوەیە بووایە، پێشتر شتێکی دیاری کراوو سنوردارمان ئەبوو.

زیاد لەمەش، ئەگەر هەر کاتێك کە ((سەلماندن)) ڕاست و((ڕەت کردنەوە)) درۆ بێت، و هەر کاتێك کە ئەم دانەیەیان ڕاستە، سەلماندن درۆ بێت،(٣٥) لەو شێوەیەدا، ئیدی ناتوانین هەمان شت، لەیەك کات و بە ڕاستی بسەلمێنین و ڕەت بکەینەوە، بەڵام لەوانەیە بوترێت کە ئەمە هەمان ئەو مەسەلەی پێشووە کە لە سەرەتاوە خرایە ڕوو.

هاوکات ئایا کەسێك کە وێنا ئەکات، کە شتێك لەم شێوەیەیە، یان لەم شێوەیە نیە، دوچاری درۆ بووە، و کەسێك کە هەردووکیان وێنا ئەکات، ڕاست ئەڵێت؟ ئەگەر ئەم دانەیەیان ڕاستی ئەڵێت، ئیدی ئەم گوتەیە چ مانایەکی ئەبێت کە((سروشتی بوونەوەرەکان بەم شێوەیە یان بەو شێوەیەیە؟))(٥) بەڵام ئەگەر ڕاستی ناڵێت(یان ڕاست ناکات)، بەڵکو( بە نیسبەت) ئەو کەسەی کە ئەو یەك دانەیە وێنا ئەکات زیاتر ((ڕاستی))لایەو و ئەیڵێت، کەواتە بونەوەرەکان خاوەنی چۆنایەتیەکی دیاری کراون، و ئەمە ڕاستە، نەك ئەوەی کە لە هەمان کاتدا، هەم، ڕاست نیە، بەڵام ئەگەر هەمو کەسەکان، بەیەکسانی ،هەم ناڕاستی و هەم ڕاستی ئەڵێن، خاوەنی ئەم بڕوایە نە

ئەتوانێت شتێك بهێنێتە سەر زمان و نە قسەیەك بكات، چونكە ئەو لە هەمان كاتدا ئەڵێت هەم ((ئەمە))و هەم((ئەم نیە)).(١٠) وئەگەر بڕیارێك قبوڵ نەكات، بەڵكو بە شێوەیەكی یەكسان ((باوەڕ بكات)) و((باوەڕ نەكات))،{ لەو شێوەیەدا} لە نێوان ئەو گیاكان چ جیاوازیەك ئەبینرێت؟

لێرەوە بە باشترین جۆر ڕوون ئەبێتەوە كە نە ڕازی بووانی ئەم بڕوایە ، و نە كەسانێكی تر،جیگرەوەیەكی لەم شێوەیەیان هەیە، چونكە كەسێك بە چ هۆیەك، لە كاتێكدا كە وێنا ئەكات پێویستی بە پێوانی ڕێگایەكی درێژە، بەرەو ((مەگارا)) بەرێوەیە، وله ماڵەكەیدا بە ئارامی دانانیشێت؟ (١٥)لەگەڵ ئەوەشدا بۆچی لە كۆتایی یەكێك لە ڕۆژەكاندا بەرەو چاڵ یان لێوارێك،- كە لە ڕێگدا و بەرێكەوت دێتە سەر ڕێگەی- هەنگاو نانێت، و بە خۆپارێزیەوە سەیری ئەكات، بەم شێوەیە پێشانی ئەدات كە بە بڕوای ئەو((كەوتنە خوارەوە)) لەهەمان كاتدا هەم خوازراو و هەم نەخوازراو نیە، چونكە ساویلكانەیە كە یەكێكیان بەباشتر و ئەوی تریان نا، ئەگەر بەم شێوەیەیە، ئەو بەناچاری ئەبێت قبوڵ بكات كە هەندێ لە شتەكان شیرینن و هەندێكیان شیرین نین، چونكە ئەو بەیەكسانی بە دوای هەموو شتەكاندا ناگەڕێت، و سەیریان ناكات، كاتێك كە لەو بیرەدایە كە خواردنەوەی ئاو یان دیداری مرۆڤێك كامیان باشترە، و دەست ئەكات بە گەڕان بە داویاندا،{ لە وێنای یەكسان بوونیان تێپەڕیوەو لەگەڕاندایە بەدوای بەزترینەكەیانەوە} ،هەرچەندە، ( كەماوشێوەی بانگەشەكە) ئەگەر یەك شت بە یەكسانی ((مرۆڤ)) بووایەو((نامرۆڤ))، دەبوو وای بكردایە،{ كەهەموان بە یەكسانی ئەژمار بكات و سەیر بكات} ، بەڵام، بەهەمان شێوە كە ووترا، هیچ كەس نیە كە بە ڕوونی لە هەندێ لە شتەكان و نەك لە هەندێكی تریان، خۆ نەپارێزێت،(٢٥) لەبەر ئەمە، بەو شێوەیەی كە تایبەتە بەو، هەموو مرۆڤەكان خاوەنی داوەری گەلێكی گشتین، ئەگەریش نەك لەبارەی هەموو شتێك، بەلایەنی كەمەوە لەبارەی ئەوەی((باشتر))یان ((خراپتر))ە، ئەگەرچی داوەرییەكەیان نەك لەسەر بنەمای ناسینێكی ئاگایانە، بەڵكو لەسەر بنەمای گومانە، ئەبێت زۆر زیاتر شەیدایی ((ڕاستی))یان تێدا بێت، ڕێك وەك نەخۆش كە ئەبێت زیاتر لە تەندروست، پەرۆای تەندروستی بێت (٣٠)، چونكە ،لە بەراورد بە ((ئاگا-دار)) و((گوومان-بەر)) لە پەیوەستێكی ساغ لەگەڵ ((ڕاستی))دا، جێگیر نیە.

بەدەر لەمەش، هەرچەندە زیاتریش هەموو شتەكان((بەم شێوەیە))و((بەو شێوەیە)) بن، دیسانەوە ((زیاتر)) و((كەمتر)) لە دەروونی سروشتی بونەوەرەكاندا دەست

ئەکەوێت، چونکە ئێمە ناڵێین کە ((دوو)) لەبەر ئەوە کە((جووتە)) و ((سێ)) ،کە، وایە، و هەڵەی کەسێك کە ((چوار)) بە((پێنج)) ئەزانێت لەگەڵ هەڵەی کەسێك کە ئەو بە((هەزار)) ئەزانێت، وەك یەك نیە(٢٥)، کەواتە ئەگەر هەڵەی هەردوکیان یەکسان نیە، ڕوونە کە یەکێك لەودووانە کەمتر هەڵە ئەکەن، و لەسەر بنەمای ئەمە زیاتر دەرخەر و دیاری کەری ڕاستیە، هەنوکە ئەگەر((ئەوەی زۆرترە))((نزیکترە)).

١٠٠٩a

کەواتە ئەبێت ڕاست بێت کە((ڕاست تر)) لێیەوە نزێکترە، تەنانەت ئەگەر شتێکی لەم شێوەیەش نەبێت، دیسانەوە شتێك هەیە کە دڵنیاتر و ڕاستترە، و لەبەر ئەمە ئێمە لەم تیۆرە لغاو پچڕاوە کە ئەقڵ و ئەندێشە، لە دیاری کردن وسنورداری شتێکدا ئەهێڵێتەوە، دەربازمان بووە.

"وەرزی پێنجەم"

# ( پاشكۆی بنەمای نەبوونی ناهاوتایی و رەخنەی تیۆرەكەی پرۆتاگۆراس )

بڕواكەی ((پرۆتاگۆراس))یش هەر لەم بڕوایەیە، و هەردوو بڕواكە یان بە شێوەیەكی یەكسان راستن، یان راست هەنین[1]، چونكە ئەگەر هەموو بڕواكان و دیاردەكان( ta fainomena) راستن، وەك پێویستیەك، هەمووان، لە هەمان كاتدا راستن و راست نین، چونكە زۆرێك لە مرۆڤەكان خاوەنی داوەری و تێگەیشتنی دژبەیەكن و گومانیان هەیە(١٠) كەسانێك كە لە (هاوشێوەی) هەمان داوەرییەكەی ئەوان قبولْ ناكەن بەهەڵەدا چوون، بە شێوەیەك كە، ناچارانە، لەسەر بنەمای ئەمە،یەك شت هەم هەیە، و هەم نیە، و ئەگەر بەم شێوەیە بێت، وەك پێویستیەك، هەموو بڕواكان راستن، چونكە هەم ئەو كەسانەی كە هەڵە ئەكەن وهەم ئەوانەش كە راست ئەكەن، باوەڕگەلێكی دژ بەیەكن، كەواتە ئەگەر بونەوەرەكان ئەمە حاڵیانە، هەمووان لە باوەڕی خۆیانەوە لەسەر هەقن.(١٥)

كەواتە روون بویەوە كە هەر دوو تیۆرەكەی(یان گوتەكە) لە یەك تێگەیشتنی ئەندێشەییەوە سەرچاوە ئەگرن، بەلاّم شێوەی رووبەڕووبونەوە و گفتگۆ كردن لەگەڵ هەموویاندا بە شێوەیەك نیە، چونكە هەندێكیان پێویستیان بە باوەڕ هێنانە و هەندێكی تریان بە بەسەردا سەپاندن، كەسانێك كە بە هۆی گومانەوە گەیشتوونەتە باوەڕێكی

[1] سەیری ((میتافیزیك tricot)) بكەن، رێكخستنە تازەكەی، هاوریْ لەگەڵ لێكدانەوەكەی، لە دوو بەرگدا، پاریس، ١٩٦٤. بەرگی یەكم، لا ٢١٢، ژێرنووسی١.

لەو شێوەیە، ئەتوانرێت نەزانیەکەیان چارەسەر بکرێت، چونکە رووبەڕووبوونەوەکە نەك بە گووتار، بەڵکو لە گەڵ ئەندێشەیاندایە،(٢٠)بەڵام کەسانێك کە قسە لەبەر قسە ئەکەن، لەرێگای رەت کردنەوەی گووتەکانیان-کە ئاخێنراوە لە بەڵگە لەسەر ئاوازەکان(دەنگەکان) و نامەکان و دەربڕینەکان-ئەکرێت چارەسەر بکرێن، کەسانێك کە دووچاری گوومان و سەرگەردانی بوون لە رێگای تێبینی کردنی هەست پێکراوەکانەوە گەیشتونەتە ئەم باوەڕە، لە گووزەری ئەم تێبینیەوە گەیشتوونەتە ئەم باوەڕە کە ناهاوتاییەکان و دژەکان ، هاوکات بوونیان هەیە، کە هەر لە یەکێك و هەمان شتە(٢٥) دژەکان پێك دێن، ئەگەر ئەوەی کە ((نابوونەوەر=نەبوو))ە ناتوانێت هاتبێتە بوون، کەواتە ((شت) ئەبێت پێشتر، بە یەکسانی، هەروەك هەردووکیان(واتە ئەو دو دژە) بوو بێت ((بووێنرابێت))، بە شێوەیەك کە ((ئاناکساگۆراس)) ووتوویەتی کە: ((هەموو شتێك لەگەڵ هەموو شتێکدا تێکهەڵکێشکراوە)) و ((دمۆکریتۆس))یش{بڕوایەکی هەر لەم شێوەیەی هەبوو} چونکە ئەویش ئەیووت کە((خاڵییەتی)) و((پڕییەتی)) بەیەکسانی لە هەر دوو لەتەکەدا بوونیان هەیە، هەرچەندە کە ئەم یەك ((بوونەوەر ))ە و ئەویشیان یەك ((نابوونەوەر))(٣٠) هەنوکە بە کەسانێك کەلەسەر ئەم بنەمایە داوری ئەکەن، ئەڵێین کە لەروانگەیەکەوە قسەکەیان دروستە و لە روانگەیەکی ترەوە نادروستە، چونکە بوونەوەر (to on) بە دوو شێواز ئەوترێت، بە جۆرێك کە بە شێوەیەکیان لەوانەیە کە شتێك لە ((نابوونەوەر=نەبوو)) پێك بێت، بەڵام بە شێوەیەکی تر نا، و لەگەڵ ئەوەشدا یەك شت هاوکات بونەوەر بێت و بوونەوەریش نەبێت (واتە هەبێت و نەبێت)، بەڵام نەك لەهەمان روانگەیەوە، چونکە لەوانەیە کە یەك شت ((خۆهێزانە dunamei))(٣٥)، بەڵام نەك((خۆکردارانە entelekheia)) لەهەمان کاتدا دژ بێت (ta enantia) هاوکات لێیانمان ئەوێت کە قبوڵ بکەن لە نێوان بوونەوەرەکاندا، ناوەرۆکێکی تریش هەیە کە لەودا بە رەهاییانە نە ((جووڵە)) بوونی هەیە و نە ((لەناوچوون))و((نە دروست بوون)).

هەرلەبەر ئەمە هەندێ لە کەسەکان لە((رێگای تێبینی کردنی هەست پێکراوەکانەوە بەم باوەڕە گەیشتوون کە راستی لە دیاردەکاندایە)) چونکە ئەمان وا ئەزانن کە((لەبارەی راستی نابێت لەسەر بنەمای((کەم و زۆری لایەنگرەکانیەوە داوەری بکرێت)) چونکە شتێك لەکاتی تام کردندا بۆ هەندێك شیرین و بۆ هەندێکی تر تاڵ ئەبێت، بە شێوەیەك کە ئەگەر هەموو مرۆڤەکان نەخۆش یان دێوانە(٥) بوونایە، و تەنها دوو یان سێ نەفەری تەندروست، خاوەن ئەقڵ بوونیان هەبووایە،ئەوان(گروپی دێوانەکان) ئەمانیان بە دێوانە(شێت) ئەزانی و ئەژمار ئەکرد، هاوکات ئەڵێن کە شتەکان لە لای هەندێك لە

گیانەوەرەکانی تر، دژی ئەوشتەی کە لەلای ئێمە هەن، دەر ئەکەون، و تەنانەت لەلای خودی هەر تاکێکیش، لەسەر بنەمای پەی بردنی هەستەکی ئەو،شتەکان بەو شێوەیەی کە لە خۆیاندان، (١٠) هەرگیز دەرناکەون، و بەم شێوەیە ڕوون نیە کە کام یەك لەوانە ڕاستەو کامیان درۆیە، چونکە((ئەمەیان)) ڕاستتر لە((ئەویان)) نیە، بەڵکو هەردووکیان وەك یەکن و یەکسانن، بەم هۆیەوەیە کە((دێموکریتۆس)) ئەڵێت کە:(( هیچ شتێکی ڕاستی بوونی نیە، یان شاراوەیە لێمانەوە)).

بەگشتی، ئەمان بەم هۆیەوە کە ئەندێشە یان ((ئەقڵاندن)) بە پەی بردنی هەستەکی ئەزانن، و ئەمەش لە لەناوچوندایە، ئەڵێن کە ئەوەی لە پەی بردنی هەستەکیدا دەر ئەکەوێت، وەك پێویستیەك،((ڕاستی))یە،(١٥) لێرەویە کە((ئێمپێدۆکلێس)) و((دێموکریتۆس)) و کورتەی قسەی هەریەکە لە بیرمەندەکانی تر، دیلی بڕوا گەلێکی لەم شێوەیەن، چونکە((ئێمپێدوکلێس)) ئەڵێت کە بە گۆڕانی حاڵەتی جەستەیی ((ئەقڵاندن)) یان((بیرکردنەوە))ش ئەگۆڕێت: ((تێگەیشتنی مرۆڤ هاوشێوەی بارودۆخی هەنووکەیی کەسەکە ، ڕوو لەزیاد بوون ئەکات)) و لە شوێنێکی تردا ئەڵێت کە:(( بە هەمان ئەندازە کە سروشتی مرۆڤ لەناو ئەچێت، هەمیشە، ئەندێشەیەکی تر ڕوو لە مرۆڤەکە ئەکات))، ((پارمێنیدیس))یش بڕواکەی خۆی بەم شێوەیە دەرئەبڕێت: ((چونکە هاوشێوەی ئەو تێکهەڵکێشیەی کە مرۆڤەکە و هەرکەسێك لە ئەندامە لار و وێرەکانی خۆیدا هەیەتی، ئەندێشەو تێگەیشتنیش هەر بەهەمان شێوەیە لە لای مرۆڤەکان، چونکە ئەو شتەی کە بیر ئەکاتەوە، هەمان ((سروشت))ی ئەندامەکانی مرۆڤە، لەهەر یەکێك و لە هەمووان، ئەندێشە لەوەوە دێت کە زیاترە))(٢٥) گوتەیەکی تریش کە ((ئاناکساگۆراس)) بە هەندێ لە هاوڕێکانی ئەڵێت کە: (( بوونەوەرەکان لە ڕوانگەی ئەوانەوە(مرۆڤەکانەوە) بە هەمان شێوەن کە ئەمان ئەوان ئەبینن)) و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوترێت کە ((هۆمر))یش بە ڕونی لەسەر ئەم بڕوایە بووە، چونکە ئەو((هێکتۆر))، کە بە کاریگەری ئەو لێدانەی کە بێهۆش کەوت ،(٣٠)((لەگەڵ ئەندێشەکانی تردا)) لەسەر زەوی بە ئارامی پیشان ئەدات[1]، کە(خۆی) بەدەرە لەوە یکە تەنانەت ((هەست و سۆز تێکچووەکانیش))یش بیر ئەکەنەوە، بەڵام خاوەنی هەمان ئەندێشەی تەندروستی (کەسە تەندروستەکان) نین، کەواتە ڕوونە کە ئەگەر لە هەردوو

[1] ئامازەیە بۆ ((ئیلیادە))ی هۆمەر، وەرەزی ٣٢، دێری ٦٩٨ن بەڵام لەوێدا قسەلەسەر ((یورونالوس))ە نەك لە هێکتور.

حاڵەتدا ئەندێشە هەیە، بوونەوەرانیش لە هەمان کاتدا هەم((بەم شێوەیەن))و هەم(( بەم شێوەیە نین))، بەلأم قورسترین مەسەلە هەر لێرەدایە، چونکە ئەگەر کەسانێك کە تا زۆرترین ئاست سەیری ((راستی))یان کردووە،( و ئەمانە کەسانێکن کە زیاتر لەهەموان گەریدەی و خوازیاری ئەون)(٣٥) خاوەنی بڕوا گەلێکی بەم شێوەیەن، و بەم جۆرە لەبارەی راستیەوە پێشنیار ئەکەن، چۆن ئەبێت دەست پێکەرانی فەلسەفاندن دڵ و غیرەتی خۆیان بدۆڕێنن؟ چونکە ئەوکات ((گەڕان بەدوای راستی))هەروەك((گەڕان بە دوای باڵندەی لێ دێت لە هەوادا)).

١٠١٠a

بەلأم هۆکاری ئەم بڕوایەی ئەمان ، ئەوەیە کە هەرچەندە راستێتی بوونەوەرەکانیان توێژینەوە کردووە، بەلأم وایان داناوە کە بوونەوەران تەنیا((هەست پێکراوەکان))ن، و لەمانیشدا سروشتێکی نادیاری کراو زۆر جیاواز، واتە سروشتی(( بوونەوەر)) بەهەمان مانا کە ئێمە لەسەرەوە لێیەوە قسەمان کرد، شاردراوەتەوە(٥) لەبەر ئەمە ئەوان بە ((راستی)) قسەیەك ئەکەن، بەلأم((راستی)) ناڵێن_ئەم شێوە رەحنەیەی ئەمان، کەمێك گوونجاوترە، لەو شێوە قسە کردنەی((ئێپیخارموس))[1] لە دژی((کسنوفانێس))_لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی ئەیانبینی کە هەموو ئەم سروشتە لە جووڵەدایە– و لەبارەی ئەوەی کە گۆڕاوە، هیچ قسەیەکی راست ناتوانرێت بوترێت–وایان دانا کە گووتنی قسەیەکی راستی، لە لێوارەکانی ئەوەی کە بە گشتی لەناو ئەچێت، ئەگەری نیە(١٠) چونکە لەم تێگەیشتنەوەیە کە بڕوای ئەوانەی کە ناویانمان برد، واتە بانگەشە کەرانی((هراکلایتوس))ـ تێك شکاوە،{کەسانێك} ی وە ((کراتولوس)) کە سەرئەنجام گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بە هیچ شێوەیەك پێویستی بە قسە کردن نیە، بەڵکو تەنیا ئەبێت پەنجەی(خۆی)بتەکێنێت، و((هراکلایتوس))یشی بە یارمەتی ئەم گووتەیە کە: ((ناتوانیت دووجار، قاچ بخەیتە ناو رووبارێکەوە))،سەرزەنشت ئەکرد، چونکە بە بڕوای خودی ئەو، تەنانەت یەکجاریش هەر ناتوانین(١٥) بەلأم ئێمە لە وەلأمی ئەم قسەیە ئەڵێین کە ئەوەی کە گۆڕاوە، کاتێك کە ئەگۆڕێت، بەڵگەیەکی تا ئەندازەیەك دروست بەو کەسانە ئەدات کە تا، وێنا بکەن کە ئەو شتە(( بوونی نیە))، بەلأم ئەم بەڵگەیە خۆشی

[1] شاعیری کۆمیدی سەرای یۆنان، کە لە شاری سیراکۆس ژیاوە،(لە نێوان ساڵەکانی ٤٦٠–٥٥٠ پ.ن) لە ژمارەی ئەو بەرهانەی کە خراونەتە پاڵی نزیکەی چل دانە ماونەتەوە، سەیری ئەمە بکەن((G.kaibel)) لەکتێبی ((پارچەکانی کۆمیدی نوسە یۆنانیەکان))،((commicorum graecorum fragmenta))، بەشی یەکەم، بەرگی یەکەم،١٨٩٩، ل ١٤٧–٨٨، لەتی ٢٥٢.

پێویستی بە بەڵگەیە، چونکە ئەوەی کە چۆنایەتیەك وون ئەکات، شتێك لەوەی کە وون ئەبێت لەخۆیدا هەیە، و هەر لەوەش کە پێك دێت، بەناچاری، پێشتر شتێك هەیە، بەگشتی(٢٠) کاتێك کە شتێك لەناو ئەچێت،(نیشانەی ئەوەیە) کە(( بوونەوەر))ێك بوونی هەیە، و کاتێك کە شتێك دێتە بوون، ئەو شتەی کە ئەم شتە لێیەوە و بە یارمەتی ئەو((ئەزێنرێت))وەك شتێکی پێویست، بوونی هەیە، و ئەم گووزەرەش ناتوانێت ناکۆتا بێت، بەلآم ئێمە، بە رەهـا کردنـی ئـەم قسەیە، ئەڵێین کە گۆڕان لەسەر بنەمای ((چەنێدتی)) لەگەڵ گۆڕان لەسەر بنەمای ((چۆنیەتی)) یەکێك نیە، باوا دابنێین کە شتێك لەسەر بنەمای ((چەندایەتی)) پایەدار نەبێت، بەلآم ئێمە هەموو شتێك لە سەر بنەمای شێوە (kata to eodos) ئەناسین،(٢٥).

هاوکات کەسانێك کە بەم شێوە وێنا ئەکەن، بەتەواوی سەرزەنشت ئەکرێن، چونکە لەبەر ئەوەی ئەبینن کە تەنانەت ژمارەیەکی زۆر کەم لە هەست پێکراوەکان حاڵەتێکی لەم شێوەیەیان هەیە، بە هەمان شێوە لە بارەی تەواوی جیهانی مادی(=ئاسمان لە دەشتەواژەی ئەرستۆییدا) بڕیار ئەدەن، چونکە تەنیا لە شوێنێکی هەست پێکراودا کە ئێمەی لەخۆ گرتووە،((دروست بوون))و((لەناو چوون)) ڕوو ئەدات،(٣٠) بەلآم ئەتوانین بڵێین کە ئەمە تەنانەت لەتێکی بچووکیش لە تەواوی جیهان نیە، بە شێوەیەك کە بەویژدانانەتر دەبوو کە ئەو(بەشە بچووکە)لەبەر ئەم(هەموو جیهانە) پاك بکەنەوە تا ئەوەی کە لەبەر ئەو، ئەم تاوانبار بکەن، هاوکات ڕوونە کە ئێمە لە بەرامبەر ئەمانیش هەمان وەلآم ئەدەینەوە کە کەمێك پێش ئیستاکە ووتمان، ئەبێت بەمانە پیشان بدەین و وەلآمیان بدەینەوە کە سروشتێکی نەجوولآویش بونی هەیە(٣٥) لەواقعدا کەسانێك کە ئەڵێن شتەکان لەهەمان کاتدا هەن و نین، لە ئەنجامدا ئەبێت بڵێن کە هەموو شتەکان زیاتر((وەستاو))ن تا ((جولآو))، چونکە شتێك نیە کە ئەوان (شتەکان) بگۆڕێنن بۆ ئەو، چونکە هەمو شتێك لە هەمو شتێکدا بوونی هەیە.

١٠١٠b

بەلآم لەبارەی((راستی))، ئەبێت بەم شێوەیە بووترێت کە ئەوەی کە دیارە وەك دیاردەیەك ( to fainomenon)،((راستەقینە)) نیە، یەکەمجار بەو هۆیەوە کە پەی بردنی هەستەکی لە بابەتی تایبەتی هەر هەستێك درۆیینە نیە، بەلآم((خەیاڵ)) یان(( وێنا کردن)) و پەی بردنی هەستەکی یەکێك و هەمان نین، پاشان شایستەیە سەرمان لە کەسانێك سوڕبمێنێت کە لەم بارەیەوە دووچاری سەرگەردانین کە ئایا قەبارەکان(٥) بەهەمان گەورەیی و ڕەنگەکان بەهەمان جۆرن، بۆ کەسانێك لە دوورەوە یان بۆ

کەسانێك لە نزیکەوە، دەر ئەکەون؟ و لەگەڵ ئەوەشدا ئایا بەهەمان جۆر لەلای تەندروستەکان و نەخۆشەکان ئەبینرێن؟ و ئایا شتە قورسەکان بەهەمان جۆرن کە لە لای بێتواناکان بوونیان هەیە؟ و ئایا راستەقینە ئەو شتەیە کە بە ڕووی ((خەوتووەکان))دا ئەکرێتەوە یان ((بێدارەکان))؟ ڕوونە کە خودی ئەمانیش باوەڕێکی لەم شێوەیەیان نیە(١٠)، چونکە هیچ کەس نیە کە کاتێك لە واقعدا کەسێك لە((لیبی))دایە، دەمەو ئێوارە خۆی لە ((ئاتن)) وێنا بکات، و بە ئاراستەی ((ئودایون-تەلاری کۆنسێرت)) هەنگاو بنێت، هاوکات لەبارەی ئەوەی کە لە داهاتودا ڕوو ئەدات، وەك چۆن ((ئەفلاتون))ئەڵێت، بێگومان بڕوای پزیشکێك و پیاوێکی ئاسایی بە شێوەیەکی یەکسان یەکلاکەرەوە نیە، بۆ نموونە لەم بارەیەوە کە فلانە کەس لە داهاتودا تەندروست(و ساغ) ئەبێت یان نابێت، لەبارەی خودی هەستەوەرەکانیشەوە(١٥) هەست کردن بە شتێکی بێگانە و ئەوەی کە تایبەتە بە یەك هەست، یان هەست کردنی ئەوەی کە نزیکە بە بابەتی هەست کردنەوە و خودی بابەتی تایبەت بە هەست کردنەکە، هەموویان بە شێوەیەکی یەکسان بایەخیان نیە، بەڵکو لەبارەی ڕەنگ، بینین،نەك تام کردن، و لە بارەی تامەوە،تامکردنەکە، نەك بینین، بایەخی هەیە، بەڵام هیچ یەك لە هەستەوەرەکان لەهەمان کاتدا و لەبارەی هەمان شت ،هەرگیز نالێن کە لەهەمان کاتدا((بەم شێوەیە))و((بەم شێوەیە نیە))، بەڵکو تەنانەت لەکاتێکی تریشدا جیاوازییەکی لەبارەی چۆنایەتیەوە (کرداراندن) نیە،(٢٠)جیاوازییەك ئەگەر هەیە لەبارەی ئەو ئەبێت کە دەرکەوتی ئەو چۆنایەتیەیە ، وەك ئەوەی بڵێین هەمان شەراب-لەکاتێکدا شیرین و لەکاتێکی تردا تاڵ دێتە بەرچاو، بەڵام خودی شیرینی -بەو جۆرە کە هەیەو هەرکاتێك کە هەیە- هیچ کاتێك نەگۆڕاوە، بەڵکو مرۆڤ هەمیشە لەبارەی ئەوەوە (راستی)) ئەڵێت(٢٥) و ئەوەی کە شیرین ئەبێت ،وەك پێویستیەك بەو شێوەیەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو بڕوایانە، ئەم پێویستیە رەت ئەکەنەوە، و ڕێك بەهەمان شێوە کە لەلای ئەمان بۆ هیچ شتێك ناوەرۆکێك بوونی نیە، هەربەو شێوەیەش هیچ شتێك خاوەنی پێویستایەتی نیە، چونکە((پێویستایەتی=جبری)) ئەگەری نیە کە هەم(( بەم جۆرە)) وهەم((بەو جۆرە)) بێت، لەبەر ئەمە ئەگەر شتێك((پێویستایەتیانەیە)) ئیدی (( بەم جۆرەو و بەو جۆرە)) نابێت.

(٣٠) بەگشتی ئەگەر بەراستی تەنیا ((هەست پێکراو)) بوونی هەیە، لەو شێوەیەدا بە بێ بوونی گیاندارانیش هیچ شتێك بوونی نەدەبوو، چونکە پەی بردنی هەستەکی بوونی نەدەبوو، هەنووکە ئەوە کە نە پەی بردنە هەستەکییەکان بوونیان هەیە وە شتە

**هەست پێکراوەکان، تارادەیەك دروستە (چونکە ئەمانە دەرکەوتە بەدەست هاتووەکانن لە بوونەوەر هەست کەردا)، بەلاّم ئەوەی کە(( بابەتەکان ta hupokeimena))پالّنەری پەی بردنی هەستەکین، تەنانەت بە بێ بوونی پەی بردنی هەستەکیەکان، بونیان نەبێت، ئەگەری نیە، چونکە(٢٥) پەی بردنی هەستەکی، پەی بردنی خۆی نیە، بەلّکو شتێکە کە جیا وبەدەرە لە پەی بردنی هەستەکی، و وەك پێویستیەکیش لە پێش پەی بردنی هەستەکیەوە بوونی هەیە، چون پالّنەر بەسروشتی لە پێش پالّنراوەوەیە.**

١٠١١a

**و ئەگەر ئەمەش لە هاوپەیوەندی ئەوانەوە بوترێت، شتێك لە راستایەتی مەسەلەکە کەم ناکاتەوە.**

## "وەرزی شەشەم"

# ( درێژەی رەخنە لە تیۆریەی پرۆتاگۆراس )

بەڵام،چ لە نێوان ئەوانەی کە باوەڕیان بەم مەسەلانە هەیە و چ لەنێوان ئەوانەی کە تەنیا لە گوتەکانیاندا ئەوە دەرئەخەن، هەن کەسانێك کە لەم بارەیەوە سەرگەدان ئەبن و بەداودا ئەگەڕێن کە(٥) چ کەسێك ئەبێت لە بارەی (تەندروستی)پیاوی تەندروستەوە داوەری بکات، یان بە شێوەیەکی گشتی چ کەسێك ئەتوانێت لەبارەی هەریەکە لە مەسەلەکان، بە دروستی، داوەری بکات؟ بەڵام ئەم جۆرە گومانانە( یان ئەم مەسەلە سەرسوڕهێنەرانە) هەروەك ئەم ((سورسوڕماویەیە)) کە هەنوکە ئێمە خەوتووین یان نەخەوتووین! هەموو ئەم جۆرە مەسەلە دژوارانە( hai aporiai) بەها و بایەخێکی یەکسانیان هەیە، ئەم کەسانە وا ئەزانن کە هەر شتێك بەڵگەیەکی هەیە، ئەمان خوازیار و گەریدەی ((یەك بنەما))ن و ئەیانەوێت کە ئەوە بە هۆی گریمانەکانیان بەدەست(١٠) بهێنن، هەنووکە لە کردارەکانیان ڕوونە، کە باوەڕێکیان نیە، بەڵام بەو شێوەیەی کە پێشتر ووتمان، رەنج و کەسەری ئەمان لێرەدایە کە بۆ هەر شتێك، بە دوای بەڵگەیەکدا ئەگەڕێن، کە ئەو شتە بەڵگەی نیە، چونکە ((بنەمای گریمانە)) گریمانە نیە.

هەنووکە بڕوای ئەم کەسانە ئاسانە، چونکە پەی بردنی ئەم مەسەلەیە دژوار نیە.(١٥) بەڵام ئەو کەسانەی کە لە قسەدا تەنیا خوازیاری سەپاندن و ناچارین، بەدوای ((مەحاڵ))دا ئەگەڕێن، چونکە مافی ((ناهاوتاگۆیی)) بە خۆیان ئەدەن، ولەهەمان کاتدا قسەی ناهاوتا ئەکەن، بەڵام ئەگەر هەموو شتێك ڕێژەیی نیە، بەڵکو هەندێ لە شتەکان((لەخۆیاندا))بەدەتت دێن، لەو شێوەیەدا هەر دیاردەیەك ناتوانێت راستیەك

بێت، چونکە هەر دیاردەیەك لە لایەن کەسێکەوە ئەبینرێت، کەواتە ئەو کەسەی کە ئەڵێت ((هەموو دیاردەکان راستین))،(٢٠) ،هەمو بوونەوەرەکان بە رێژەیی دائەنێت، لەبەر ئەمە کەسانێك کە لە گووتار و بەڵگەکاندا بە دوای((پێویستایەتی))دا ئەگەڕێن، و لەهەمان کاتدا بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە خۆیان روبەرووی پرسیار و وەڵام بکرێنەوە، ئەبێت لەو قسەیە دوور بکەونەوە کە ((دیاردەیەك)) بە هیچ شێوەیەك بوونی نیە، بەڵکو ئەبێت بڵێین کە دیاردە بۆ ((ئەو کەسە))ی کە لێیەوە دیار ئەبێت، و لەگەڵ ئەوەشدا لەو((کاتەدا)) و بۆ ئەو((هەستە)) و بەو((شێوەیە)) کە دەر ئەکەوێت، بوونی هەیە، ئەگەر پرسیار و وەڵامێك جێگیر بکات، بەڵام نەك بەم شێوەیە(٢٥)، ئەنجام ئەوەیە کە بە زوویی دووچاری ((ناهاوتاگۆیی)) ئەبێت، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە کە هەمان شت لە ڕوانگەی بینینەوە هەروەك((هەنگووین)) دەرکەوێت، بەڵام تامەکەی بەم شێوەیە نەبێت، و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ بینینی هەر یەك لە چاوەکان بەم شێوەیە نەبێت، و شتێکی نا وەکیەك دەر بکەوێت، کەواتە بە کەسانێك کە- بەو هۆیەی کە لە سەرەوە باس کرا- ئەڵێن کە ((دیاردە)) راستەقینەیە،(٣٠) و بەم هۆیەوە هەموو شتەکان بە شێوەیەکی یەکسان ((درۆن و راستن))، چونکە ئەوان نەك لەسەر هەموو کەسێك بەهەمان جۆر و نە تەنانەت بە شێوەیەکی یەکسان هەمیشە بە هەمان شێوە دەرئەکەون، بەڵکو زۆرجار لەهەمان کاتدا دژی ئەویش دەرئەکەون،(چونکە ئەگەر پەنجەکانمان بخەینە سەر یەك، هەستی ((لەمس کردن)) پێمان ئەڵێت کە دووشتە، بەڵام بینین ئەڵێت یەك شتە) بەڵام لە وەڵامدا ئەڵێین کە:(( بەڵام نە بۆ هەمان هەست(٣٥) و نیسبەت بە هەمان شت و بەهەمان شێوەو لەهەمان کاتدا))(شتێك بە جۆرێکی تر دەر ئەکەوێت)، بەشێوەیەك کە لە هەل ومەرجێکی لەم شێوەیەدا دیاردەیەکی راستەقینەیە، بەڵام لەوانەیە هەر بەم هۆیەوە بێت کە کەسانێك نەك لە رووی سەرسوڕمانەوە، بەڵکو تەنیا لەبەر قسە کردن، ناچارین بڵێین کە ئەم((دیاردایەتیە)) لەخۆیدا راستی نیە، بەڵکو بۆ((ئەم تاکە)) راستیە، و هەمان شێوە کە پێشتر ووترا،

١٠١١b

((پەیڕەوانی ئەو تیۆریە ناچارن کە هەموو شتەکان بە رێژەیی( pros ti) و پەیوەست بە بڕوا و پەی بردنی هەستەکی بناسێنن،(٥) بە شێوەیەك کە بڵێی نە شتێك هاتۆتە ئارا و نەبونیشی ئەبێت، مەگەر ئەوەی کە کەسێك پێشتر بیری لێ کردبێتەوە، بەڵام ئەگەر شتەکان دروست بوون (هاتنە ئارا)یان بوونیان هەبێت، ڕوونە کە هەموویان ((شت گەلێکی رێژەیی)) و پەیوەست بە ((بڕوا)) نین..)).

بەدەر لەمەش، ئەگەر شتێك((یەكێكە))، یان پەیوەستە بە ((یەك شت)) یان بە ((شتێكی سنوردار))و ((دیاری كراو))، و ئەگەر ((یەك))و((هەمان)) شت، هەم ((نێوە))یە و هەم ((بەرامبەر))،بەڵام بەرامبەر لە روانگەی دو بەرامبەر بەم شێوەیە نیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە روانگەی(-گومانكەر-خەیاڵكەر-خاوەن بڕوا to doxazon-)) مرۆڤ و((گومان بۆ كراو-خەیاڵ بۆ كراو –to doxazomenon)) هەردووكیان یەكێك بن، ئەوكات((مرۆڤ)) نەك((خەیاڵكەر))، كە((خەیاڵ بۆ كراو)) ئەبێت (١٠) و ئەگەر هەریەك لە شتەكان تەنیا لە روانگەی((خەیالكەر-گومانكەر)) بونیان هەبووایە، لەو شێوەیەدا گوومانكەر رێژەیەك ئەبێت لە كۆتایی هێنانی ئەوشتانەی كە جۆراوجۆرن.

كەواتە بە ئەندازەی پێویست قسە كرا كە: بنچینەییترین و دڵنیاترینی هەموو بڕواكان ئەمەیە كە ((گووتە ناهاوتاكان لە یەك وهەمان كاتدا راست نین)) و كەسانێك كە بەو شێوەیە ئەدوێن بەو ئەنجامە ئەگەن، و بۆ چی وائەڵێن(١٥) هەنووكە لەبەر راستایەتی ناهاوتا بوونی گوتەیەك ((لەبارەی هەمان شت و لەهەمان كاتدا، ئەگەری نیە)) چونكە((لە دوو دژەكە، یەكێكیان((نەبوونە))كە كەمتر لە ((دژ))نیە..)) واتە نەبوونی ناوەرۆك، و نەبوونی ((رەت كردنەوە)) ناوەرۆكێكی دیاری كراو سنووردارە،(٢٠) كەواتە ئەگەر((سەلماندن و رەت كردنەوە)) شتێك نیە هاوكات ئەگەری هەبێت،(( بوونی دژەكانیش ،هاوكات مەحاڵە)) مەگەر ئەوەی كە یان لەودا بوونی هەردووكیان بە شێویەك یان بە شێوەیەكی تر بێت، یان یەكێك لەوان بە شێوەیەكی دیاری كراو وئەوی تر بە شێوەیەكی ڕەها بێت.

"وەرزی حەوتەم"

# (بنەمای مەنتیقی :سێهەمی لابراو-لابردنی باڵی سێهەم )

بەلام لەواقعدا بونی هیچ شتێکی((نێوانی)) لەنێوان دوو ناهاوتادا ئەگەری نیە، بەڵکو لەبارەی یەك شت، ئەبێت شتێکی تر-هەرچی بێت- یان بسەلمێنین یان رەت بکەینەوە،(٢٥) ئەمەش کاتێك روون ئەبێتەوە کە ئێمە ئەوە پێناسە بکەین کە ((راست و درۆیی)) چیە، چونکە گووتنی ئەوەی کە(( بوونەوەر))نیە یان ((نابوونەوەرە=نەبووە))، درۆیە، بەلاّم (گوتەی یەکەم) ئەوەی کە ((بوونەوەرە-هەیە)) یان((بوونەوەر نیە=نیە))،((راست))ە، بە شێوەیەك کە کەسێك بڵێت، شتێك هەیە یان نیە، یان راست ئەڵێت یان درۆ، بەلاّم نەك لەبارەی(( بوونەوەر)) ئەوترێت کە نیەو نە لە بارەی ((نابوونەوەر)) ئەوترێت کە هەیە(٣٠)، هاوکات شتێکی ((نێوانی)) لە نێوان دو ناهاوتا یان وەك خۆڵەمێشیٚ لە نێوان و رەش و سپیدا ئەبێت، یان وەك ئەوەی کە ((نە مرۆڤ و نە ئەسپ))ە، لەنێوان مرۆڤ و ئەسپ، ئەگەر(نێوانێك) بەمانای دووەم هەبێت، ناتوانرێت گۆڕانی تێدا ئەنجام بدرێت،( چونکە ئەوەی کە نەباشە بۆ باش و یان ئەوەی کە باشە بۆ ناباش ئەگۆڕێت) هەنوکە هەر (نێوانێك) بە ئاشکرا لەگۆڕاندایە،(٣٥) بەلاّم ئەگەر(لەسەر بنەمای تێگەیشتنی یەکەم) یەك((نێوانی)) بە راستی بوونی دەبوو، لە حاڵەتێکی لەم شێوەیەدا، ئەبێت گۆڕان بۆ سپێتی لە شتێکەوە بووایە کە((نە-سپی))نەبووایە[1]، بەلاّم شتێکی لەم شێوەیە هەرگیز نابینرێت،هاوکات هەر ئەندێشەیەك، و هەر((ئەقڵێنراوێك)

[1] واتە کاتێك کە بۆ نموونە خۆڵەمێشی بۆ سپی ئەگۆرێت،(لەبەر ئەوەی خۆڵەمێشی لەنێوان سپی و رەشدایە) هەروەك خۆڵەمێشی نیە کە ئەگۆرێت، بەڵکو هەروەك_(نە-سپیس)یە، واتە شتێك کە بەهرەیەکی لە رەش هەیە.

یـان ئەکاتـە کـرداری بیرکردنـەوە یـان ئەیـسەلمێنێت یـان ڕەتـی ئەکاتەوە،هـەرکاتێك کـە دروست بێت یان نادروست، هـەرکاتێك کە(بیرکردنـەوە) بەیـەك شێوە پەیوەست بێت بە سەلماندن و ڕەت کردنەوەوە، ڕاست ئەڵێت، و هەر کاتێك کە بە شێوەیەکی تر وا بکات، ڕاسـت ناکـات، و لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەگـەر قسە تـەنیا لەبـەر قسەکردن نـەبێت، ئـەبێت لـە هەموو ناهاوتاییەکاندا(یەك نێوانی-نێوەنجیەك) بوونی هەبێت، بە شێوەیەك کەسـەکە نە شتێك ئەڵێت کە ڕاستە وەنە شتێك کـە ناڕاستە، هـەر بەم شێوەیە لـە نێوان بوونـەوەر و نابوونەوەریـشدا((یـەك نێوانی)) بـوونی ئـەبێت، هاوکـات کـە بـەدەر لـە دروسـت بـوون و لەناوچوون، لەگەڵ ئەوەشدا شکڵێکی تر لـە ((گۆڕان)) بـوونی هەیە، هاوکـات بـە هـەموو ئەو ڕەگەزانەی کە ڕەتکردنەوەی دژێك ئەهێننـە نـاوەوە(یـەك نێوەن-نێـوانی- بـە دەسـت دێـت)(١٠) بـۆ نموونـە، لـە نێـوان ژمارەکانـدا، ژمارەیـەك بـوونی هەیـە کـە نـە تاکـە وە نـەجووت، بـەڵام شـتێکی لـەم شێوەیە لەسـەر بنـەمای پێناسـەی (ژمـارە) ئەگـەری نیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم گـووزەرە تـا ناکۆتـا ئـەڕوات و ژمارەی بوونـەوەرەکان نـە تـەنیا یـەك بەرامبەر و نێو، بەڵکو هاوکات زیاتر ئەبێت، چونکە جارێکی تر ئـەتوانرێت((نێوانیـەك)) لـــە ڕێگـــای ســـەلماندن و ڕەت کردنـــەوەی ،ڕەت بکەینـــەوە، بـــەڵام ئـــەوکات ئـەو((نێـوانی))ەش((شـتێکی دیـاری کـراو)) ئـەبێت، چـونکە ناوەڕۆکەکـەی شـتێکی ترە.(١٥)هاوکـات هـەرکاتێك لـە کەسێك بپرسرێت کـە ئایا شتێك سپیە,{ لـە وەڵامـدا} بڵێت((نا))،شتێکی تری جگە لە((بوونایەتی)) ڕەت نەکردۆتـەوە، چونکە ((ڕەت کردنـەوە )) واتە((نەبوون)).

هەنوکـە هەنـدێ کـەس، بەهـەمان جـۆر گەیـشتوونەتە ئـەم بـاوەڕە هـەروەك گەیـشتنە بـاوەڕی ئەندێـشە نەناسـراوەکان(paradoxos)ی تـر، چـونکە هـەرکاتێك کـە نـاتوانن بەڵگـەی شـەڕئامێزەکان[١] چارەسـەبکەن-یـان ڕەتیـان بکەنـەوە- بەڵگەکـەی ئـەوان قبـوڵ ئەکـەن و بـە دروسـت بـوونی ئەنجامەکـەی ئـەوان ڕازی ئـەبن،(٢٠) کەواتـە هەنـدێك بـەم هۆیـەوە ئـەو قسانە ئەکەن، و هەندێکی تر بەم هۆیـەوە کە بۆ هـەموو شتێك بەڵگەیـەك ئەهێننـــەوە، هەنوکـــە ســـەرەتای ڕووبـــەڕوو بوونـــەوە لەگـــەڵ هـــەموو ئـــەم قـــسانە، ((پێناسـە))یـە(ئاسـت –horismos) ، ((پێناسـە)) یـش کاتێـك دروسـت ئـەبێت کـە پێویستانە بەڵگە بێت لەسەر شتێك، چونکە ووشە((ho logos) کە ناو، نیشانەکەیەتی،

---

[١] وەرگێڕە عەرەبە کۆنەکان((مشاغبون)) یان بۆ ئەم وازەیە داناوە، لەکاتێکدا کە لە یۆنانی کۆندا زیاتر مەبەست لە((شەڕ –نەبەرد و ململانێ بووە))( مەنتیقی ئەرستۆ،بدوی، بەشی سێهەم،(( ل ٤٤٩-٨٤٨))

ئەبێتە پێناسە، بەم شێوەیە وا دێتە بەرچاو کە قسەکەی ((هراکلایتوس)) کە ئەڵێت (٢٥)،((هەموو شتەکان هەم هەن و هەم نین)) و قسەکەی ((ئاناکساگۆراس)):(( گێرانەوەی ئەوەی کە لە نێوان دو ناهاوتادا، نێوانێك بوونی هەیە، بەو شێوەیەیە کە وەك بڵێی هەموو شتێك بە ناراست و درۆ ئەزانێت، چونکە کاتێك کە هەمو شتێك تێکهەڵکێش کراوە، ئەم تێکهەڵکێشیە نە باشە وە نەخراپ، بە شێوەیەك کە هیچ راستیەك ناتوانرێت لەبارەیەوە بوترێت)).

"وەرزی هەشتەم"

## ( نادروستی قسە یەکلایەنەکان )

لەم درێژەدانەدا، رون ئەبێتەوە کە قسە یەکلایەنەکان(٣٠) ئەویش لە بارەی هەموو شتێك، ناتوانن بایەخیان هەبێت، وەك ئەوە کە هەندێك ئەڵێن کە هیچ شتێك راست نیە،(چونکە ئەڵێن هیچ شتێك نابێتە بەربەست لەوەی کە گووتەکان هەروەك ئەمانە بن کە: تیرەی چوارگۆشەیەك،بە ئەندازەی لایەکیەتی) و هەندێکیش ئەڵێن کە هەموو شتێك راستە، ئەم قسانە، تا ئەندازەیەك هەمان قسەکانی((هراکلایتوس))ن، چونکە کەسێك کە ئەڵێت:((هەمو شتێك راست و هەموو شتێك درۆیە))، هەریەك لەم دوو رستەیە بە جیاجیا ئەڵێنەوە،

٠١٢B

بە شێوەیەك کە ئەگەر کۆکردنەوەیان مەحاڵ بێت، هەریەکە لەوانیش مەحاڵن، هاوکات روونن ئەو ((ناهاوتاییانەی)) کە ئەگەری نیە ،هاوکات راست بن، بەڵام هەموشیان کە نابێت ،درۆ بن، هەرچەندە لەسەر بنەمای ئەوەی کە ووترا، ئەگەری ئەمە زیاتر دێتە بەرچاو، بەڵام لە بەرامبەر(٥) هەموو ئەو جۆرە قسە و بڕوایانە، لە خواستی ئێمەدا-وەك چۆن لە قسەکانی سەرەوەدا ووتمان-نابێت ئەمە بێت کە ئایا شتێك هەیە یان نیە، بەڵکو قسە ئەبێت بەڵگە لەسەر شتێکی تر بێت، بەم شێوەیە ئەبێت قسەکردنەکەمان لە ((پێناسە))وە دەست پێ بکەین، لەکاتێکدا کە یەکەمجار(ئەبێت ئەم مانایە) تێبگەین کە ((درۆ و راست)) خاوەنی چ مانایەکن، بەڵام ئەگەر ئەوەی کە راستە ،شتێکی تر نەبێت ،جگە رەتکردنەوەی ئەوەی کە درۆیە(١٠)، لەو شێوەیەدا ئەگەری

ئەوە نیە کە هەمووی درۆ بێت، چونکە یەکێك لە دوو لەتە ناهاوتاکە ،بێگومان ئەبێت راست بێت، هاوکات ئەگەر هەمو شتێك بەناچاری ئەبێت یان بسەلمێت یان رەت بکرێتەوە، ئەگەری نیە کە هەردوکیان (هەردوو لەتە ناهاوتاکە)درۆ بن، چونکە تەنیا یەکێك لە دوو بەشە،ناهاوتاکە، درۆیە، هەنوکە هەمو ئەم جۆرە بڕوایانە ئەگەنە ئەو ئەنجامە بەناوبانگ و بەربلاوە کە خۆیان، خۆیان لەناو ئەبەن،(١٥) چونکە کەسێك کە ئەڵێت هەمو شتێك راستە، دژەی قسەکەی خۆیشی دروست ئەکات، و لەبەر ئەمە خۆی قسەکەی خۆی بە درۆ ئەخاتەوە،(چونکە قسە دژەکە ئەڵێت کە قسەکەی ئەو راست نیە) و ئەو کەسەش کە ئەڵێت هەموو شتێك درۆیە، خۆی قسەکەی خۆی بە درۆ ئەخاتەوە، بەلأم ئەگەر کەسێك قسە دژەکەکە هەلبژێرێت و بلێت تەنیا ئەو(( راست نیە))، (٢٠) و ئەوی تر بلێت کە تەنیا قسەکەی خۆی درۆ نیە، بە بوونی ئەمە، ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە ئەبێت ژمارەیەکی ناکۆتا لە قسە راست و درۆکان بخوازێت، چونکە ئەو کەسەش کە ئەڵێت گوتەی(( راست)) راستە، راست ئەکات، و ئەم زنجیرەیە(سەرێکی درێژی هەیە) و تاناکۆتا درێژ ئەبێتەوە.

هاوکات روونە کە نە کەسانێك کە ئەڵێن هەموو شتێك جێگیرە، راست ئەڵێن وە نە کەسانێك کە هەموو شتێك بە جولأو ئەزانن، چونکە ئەگەر هەموو شتێك((وەستاو)) بێت، لەو شێوەیەدا هەمیشە هەمان شت، هەم راست و هەم درۆ ئەبێت(٢٥)، هەنوکە ئەگەر ئەو شتە ئاشکرایە لە گۆڕاندایە، (چونەك خودی قسەکەر سەردەمێك نەبووەو جارێکی تریش نابێت) بەلأم ئەگەر هەموو شتێك لە جوولەدا بێت، هیچ شتێك راست نابێت، کەواتە هەمو شتێك درۆیە، بەلأم سەلمێنراوە کە ئەمە ئەگەری نیە، و لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگۆڕێت، بەناچارانە بوونی هەیە، چونکە ((گۆڕان لە شتێکەوە بۆ شتێکی ترە)) بەلأم هاوکات ناکرێت هەموو شتێك ((جار بەجار) وەستاو یان جوولأو بێت، و هیچ شتێك ((هەمیشە)) بەو شێوەیە نەبێت(٣٠) چونکە شتێك هەیە، کە بەردەوام، (پاڵنراوەکە)) ئەمێنێتە جوولە، و(( و پاڵسنەری یەکەم، خۆی نەجوولأوە))(جوولێنەری یەکەم، خۆی نەجوولأوە).

"وەرزی یەکەم"

# (سەرچاوە یان ڕەچەڵەك)

*سەرچاوە(سەرەتا) بەو بەشە لە شتێك ئەوترێت، کە:*

١. ((شتی یەکەم)) لەوێوە ئەکەوێتە جووڵە، وەك، هێڵێك یان ڕێگایەك، کە سەرەتای یەکێکیان((لێرە))و ئەوی تر(( لەوێ)) لە لا بەرامبەرکەوەیە.

٢. (سەرچاوە) ئەوەیە کە لەوێوە هەر شتێك، بە جوانترین شێوە، ئەتوانێت بێتە ((بوون))، وەك،((فێر کردن)) کەهەندێ جار نە لە سەرەتاوە، بەڵکو لە شوێنێکەوە ئەبێت دەست پێ بکات کە بە ئاسانترین شێوە ئەتوانرێت فێر بکرێت.

٣. شتێك کە بەهۆی ئامادەیی ئەو،شتێکی (تری) یەکەم دروست ئەبێت، وەك ستوونی ژێرەوەی کەشتیەك.(٥) یان بوونیادێك لە پێکهاتەی خانوویەکدا، یان لەلای گیانەوەران، بە بڕوای هەندێك دڵ[1] و بە بڕوای هەندێکی تر مێشك و بە بڕوای کەسانێکی تر شتێکی ((ڕێکەوت)) و لەم جۆرانە کە گومانیان لێ ئەکرێت.

١٠١٣a

٤. ئەوەی کە تەنانەت بە بێ ئامادەیی ئەو لە خودی شتەکەدا، شتێکی یەکەمین لەودا دروست ئەبێت، و ((جوڵە))و(( گۆڕان))یش بەسروشتی یەکەمجار لەوەوە دروست ئەبن، وەك ((منداڵ)) کە لە دایك و باوك، و ((ململانێ)) بەهۆی ((جنێودان))ەوە، دروست ئەبێت.

---

[1] ئەمە بڕوای خودی ئەرستۆ بووە، سەیری(( لەبارەی دروست بوونی گیانەوەران))،٧٢٨b١٦.

٥. (١٠) ئەوەی کە بە پێی هەڵبژاردنە پێوراویەکەی، جوڵێنراو دەست ئەکات بە جووڵەو گۆڕاو دەست بە گۆڕان ئەکات، وەك،سەرکردەکان لە شارەکان و سەرکردەکان وپادشاکان و خۆویستەکان، کە هەموویان بە((سەرەتاکان یان سەرچاوەکان)) ناو ئەنرێن، و هاوکات لە هونەرەکانیشدا بەم شێوەیەیە، و لە نێوان ئەواندا بە تایبەتی ئەوانەی کە ((هوونەری بنەمایین)).

٦. ئەوەی کە((شتی یەکەم)) بە هۆی ئەوەوە ئەناسرێت.(١٥) ئەمەش ناو ئەنرێت بە((سەرەتا)) یان((سەرچاوە))، وەك((گریمانەکان hupotheseis))، و هۆکارەکانیش هەر بەم مانا جۆراوجۆرانە ناو ئەنرێن، چونکە هەموو هۆکارەکان ((خۆ دەسپێکن))، کەواتە شتی هاوبەشی نێوان هەموو سەرەتاکان یان سەرچاوەکان،(( یەکەمین))بوونیانە، کە لەوێوە یان شتێك هەیە، یان دێتە بوون) و یان ئەناسرێت، هەندێ لەوانە لە خودی شتەکاندا ئامادەن، و هەندێکی تریان لە دەرەوەی ئەوانن،(٢٠) لەبەر ئەمە((سروشت)) سەرچاوەیە و لەگەڵ ئەوەشدا((توخم)) و هاوکات((بیرکردنەوە)) و((هەڵبژاردنی پێوراو)) و(( ناوەرۆك))و((لەبەر ئەو-هۆکاری ئامانجی))،چونکە((باش))و((جوان))یش لە زۆرێك لە شتەکان، سەرەتا یان سەرچاوەی ناسین وجووڵەن.

"وەرزی دووەم"

# (هۆكار)

*هۆكار(aition)[1] بە جۆرێك لە جۆرەكان،بە شتێك ئەوترێت كە:*

١. لە كاریگەری ئامادەبوونی ئەودا(enuparkhontos) شتێك لێیەوە دروست ئەبێت(٢٥)وەك ((برۆنز)) بۆ دروست كردنی پەیكەری مرۆڤ و شووشە بۆ پیاڵە و چەند شتێكی لەم شێوەیە.

٢. بە جۆرێكی تر هۆكار بە((شێوە=ئایدیە)) و((پێشەنگ-to paradeigm )) ئەوترێت و ئەمەش مانایەكە بەڵگەیە لەسەر((چیەتی))(ماهیەت) و ئەو رەگەزانەی كە ئەم لە خۆیان ئەگرێت و ئەو بەشانەی كە لەناو ئەودا گونجێنراون.

٣. هاوكات بە جۆرێكی تر(٣٠) بەو شتە ئەوترێت كە یەكەمین((سەرچاوە-دەست پێكردن))ی ((جووڵە)) یان ((وەستان)) لەوێوەیە، وەك راوێژكار كە هۆكاری((كردارێكە=ئیشێكە)) و باوك كە هۆكاری ((منداڵە))، و بە شێوەیەكی گشتی ((كردار)) بۆ((كردارێنراو)) و ((لەناو بەر)) بۆ((لەناو چوو-لەناوبراو)).

٤. هاوكات هەروەك ئامانج، كە بریتیە لە(( لەبەر ئەو، to hou heneka)) بۆ نموونە وەك تەندروستی كە ئامانجی بە رێگادا چوونە، چونكە(لەبەرامبەر ئەم

---

[1] لەبارەی هۆكاری لای ئەرستۆ ب.بۆ(( لەبارەی سروشت))(فیزیك)، كتێبی دووەم، وەرزی سێیەم، ١٩٤b٣٢ تا ١٩٥b٢١، كە لێرەدا تائەندازەیەك هەروەك هەمان ئەم رستانە نوسراوەتەوە ، هەربەم شێوەیە ب.بۆ ((شی كردنەوە پاشینەكان))كتێبی دووەم، وەرزی ١١.

پرسیارەوە): کە بە چ هۆیەکەوە کەسەکە بە ڕێگادا ئەڕوات؟ ئەڵێین:بۆ ئەوەی تەندروست بێت، و بەم جۆرە قسە کردنە،(٢٥) مەبەستمانە کە هۆکارەکە بخەینە ڕوو.

٥. و بەم شێوەیەوە هەموو ئەوەی کە بە هۆی جوولێنەرێکی ترەوە هۆکار و واسیتەی گەیشتنە بە ئامانج، وەك لاوازی یان پاك کردنەوەی میزاج بە دەرمانەکان یان ئامێرە پزیشکیەکان کە هەموویان هۆکارەکانی تەندروستین، چونکە هەموو ئەمانە لەبەر ئامانجن، بەڵام جیاوازی نێوان ئەوانە لێرەدایە کە هەندێك(یان) ئامێر وهەندێکی تریان کردارن.

١٠١٣b

هۆکارەکان تارادەیەك بەم شێوەیە ناوئەنرێن، بەڵام لەبەر ئەوەی هۆکارەکان بە چەند جۆرێك ناو ئەنرێن، ئەنجامەکە ئەوەیە کە(٥)یەك و هەمان شت خاوەنی چەندین هۆکارە، بەڵام نەك دەرکەوتانە، بە شێوەیەك کە هوونەر پەیکەرسازی و برۆنز هۆکارن، بەڵام نەك بە هۆیەکی تر، بەڵکو لەبەر پەیکەرەکە، بەڵام ئەو دووانە بەیەك جۆر، هۆکار نین، بەڵکو یەکێکیان هەروەك ((دە)) و ئەوی تریان هەروەك ((سەرچاوەی جووڵە)) ئەژمار ئەکرێن. هەندێك(لە شتەکان)یش هۆکاری یەکترن، وەك ئیش کردن کە هۆکاری((چاکسازی euexia)) و ئەمەش(بە نۆبەی خۆی) هۆکاری ئیش کردنە، بەڵام نەك بەیەك جۆر، بەڵکو یەکێکیان هەروەك ئامانج و ئەوی تریان هەروەك سەرچاوەی جووڵە، هەندێ کاتیش یەك و هەمان شت هۆکاری دژەکانە، چونکە ئەوەی کە لەبەر ئەوەی ئامادەیە، ئەبێتە هۆکاری شتێکی دیاری کراو، کاتێك کە ئامادە نیە، ئێمە هەندێ جار ئەو بە هۆکاری دژ تاوانبار ئەکەین، بە شێوەیەك کە نائامادەیی سکاندارەکە بە هۆکاری وەرگەڕانی بەلەمەکە ئەزانین، لەکاتێکدا کە ئامادەیی ئەو هۆکاری ڕزگار بوونی بەلەمەکە دەبوو،(١٥) و ئەم دووانە، واتە ئامادەیی و نەبوونی ئامادەیی،هەروەك هۆکارە جووڵاوەکانن.

هەموو ئەو هۆکارانەی کە تا ئێستاکە ناویان بران، لە چوار جۆردا جێگیر ئەبن کە بەناوبانگترینیانن، چونکە پیتەکان بۆ((دەربڕینەکان=ئاوازەکان)) مادە بۆ((پیشەگەری و ئامێرەکان)) و ئاگر و خاك و هەموو ئەومادانەی کە لەم جۆرەن، بۆ تەنەکان، و بەشەکان بۆ گشت، و پیشەکیەکان بۆ ئەنجامی پێوانەکان،(٢٠) هەمووان لە ژێر ناوی سەرچاوە(to ex hou)ی ئەوشتانە، ناویان ئەبرێت، هەندێ لەمانە هەروەك ((بابەتی)) هۆکارن، وەك بەشەکان، هەندێکی تر هەروەك((چیەتی)) وەك((گشت و تێکەڵکاری و شێوە)) بەڵام((سپێرم sperma)) و پزیشك و ڕاوێژکار ،بەگشتی ئەوەی کە ((بکەرە))،هەمووان، هەروەك(( ئەوێ–ئەوشوێنە)) کە سەرچاوەی دروست بون و لەناوچوونە، لە ڕیزی

هۆکارەکانن.(٢٥) هۆکارەکانی تر هەروەك ئامانج و چاکە، شتەکانی ترن، چونکە ((لەبەر ئەو)) ئەیەوێت کە((باشترین)) و بۆ شتەکانی تر((ئامانج)) بێت، ونابێت جیاوازی بکات لەوەی کە ئەو بە ((چاکەی واقعی)) یان ((چاکەی رووکەش)) ناو بنێین. کەواتە ئەمانە جۆری هۆکارەکانن، بەلاّم ژمارەی جۆرەکانی هۆکارەکان زۆرە،(٣٠)هەرچەندە ئەتوانین بۆ ژمارەیەکی کەمتر کورتتریان بکەینەوە، چونکە بە چەند جۆرێکی فراوان ئەتوانرێت قسە لەسەر هۆکارەکان بکرێت، تەنانەت ئەوانەش کە هاوجۆرن، هەندێکیان(هۆکاری) یەکەمین((پێشین))ن و هەندێکی تر(هۆکاری) کۆتایین((دوایین))ن، وەك پزیشك و پیشەگەری لێزان،(یان فێرکاری پزیشکی) کە هەردووکیان هۆکاری تەندروستین، و دوو بەرامبەر (یان نیسبەتی ٢:١) و ژمارە کە هۆکاری ئۆکتاون، و ئەوەی کە هەمیشە لە خۆگری شتە بەشەکیەکانن، هەربەم شێوەیە هۆکارە دەرکەوتیەکان و رەگەزەکانیان دەرئەکەون،(٣٥) وەك چۆن کە بۆ نموونە بە مانایەك((پولوکلایتوس)) و بە مانایەکی تر((پەیکەر ساز هۆکاری پەیکەرەکەیە)) و ئەوەی کە پەیکەرساز،((پولوکلایتوس))ە، مەسەلەیەکی دەرکەوتانەیە، و ئەوشتانەش کە دەرکەوتەکان لەخۆئەگرن، لەریزی هۆکارەکانن،

١٠١٤a

وەك چۆن مرۆڤ- و بە شێوەیەکی گشتی گیاندار- هۆکاری پەیکەرە، چونکە((پولوکلایتوس))[١] مرۆڤە، و مرۆڤیش((گیاندارە))، بەلاّم هۆکارە دەرکەوتیەکانیش هەندێکیان دوورتر و هەندێکی تریان نزیکتر لەوانی ترن،(٥)وەك چۆن ئەتوانین بلّێین کە ((پیاوی سپی)) و((مۆسیقاژ)) هۆکاری پەیکەرن، نەك تەنیا((پولوکلایتوس)) یان ((مرۆڤ)).

بەدەر لە هەموو ئەوهۆکارانەی کە بە جۆرێکی تایبەت(واتە لە خۆدا) و بە جۆرێکی دەرکەوتانە(بینراوانە) ناو ئەنرێن، هەندێکیش خۆهێزانە و هەندێکیش خۆکردارییانە، ناو ئەنرێن، بە شێوەیەك کە لە بیناسازی دا((بیناسازێك)) هۆکار بێت،یان بیناسازێك کە خەریکی بینا دروست کردنە(١٠) هەروەك ئەوەی کە پێشتر وترا، ئەتوانرێت لە بارەی هۆکارێنراوی هۆکارەکانی تریش بوترێت، وەك، هۆکاری((ئەم پەیکەرە)) یان((یەك پەیکەر)) یان بە شێوەیەکی گشتی یەك پەیکەر،یان هۆکاری (( ئەم برۆنزە)) یان(( یەك

---

[١] پەیکەرتاشی بەناوبانگی یۆنان، کە لە نیوەی دووەمی‌سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا، ژیاوە، و لە شێوە پەرجەستەکانی سەردەمی بووژانەوەی هونەری یۆنانی کۆندا ئەژمار ئەکرێت.

برۆنن)) یان بە شێوەیەکی گشتی یەك((مادە)) و بەم شێوەیەش ئەم و ئەو( واتە هۆکار بە مانای لەخۆیدا و بە مانای دەرکەوتانە) ،ئەتوانن لە تێکەڵەی ئەواندا( یان بە دەربڕینە وردە یۆنانیەکەی:پێکەوە چنراوی sumplekomena))یان پێ بووترێت،بە شێوەیەك کە نەڵێین((پولوکلایتوس)) و((پەیکەر سان))(١٥) بەڵکو بڵێین((پولوکلایتوسی پەیکەر سان)).

بەڵام هەموو ئەم هۆکارانە لە چەندایەتیدا((کمیت))دا شەش دانەن، و هەریەك لەوانە بە دووجۆر ئەوترێن، یان هەروەك تاك و جووت، یان هەروەك رەگەز، یان هەروەك بینراوی ((دەرکەوتەیی))، یان هەروەك رەگەزی دەرکەتانە، یان هەروەك پێکەوەچنراوی یان تێکەڵەی ئەوانە، یان هەر یەك بە تەنیایی ئەوترێت، هەموو ئەم (هۆکارانە) یان ((خۆکردار))ن یان ((خۆ هێزن))(٢٠) بەڵام جیاوازی ئەمانە لەمەدایە کە ((هۆکارە بکەرییەکان)) و ((شتە بەشەکیەکان)) یان ئەو شتانەی کە هۆکاری ئەوانن، یان هاوکات بونیان هەیە یان بوونیان نیە، وەك((ئەم)) دەرمانکەرە دیاری کراوە لەگەڵ((ئەم))چاکەوەبووە دیاری کراوە ،و((ئەم)) بیناسازە دیاری کراوە لەگەڵ((ئەم)) خانووە لە حاڵەتی دروست بووندا، لەکاتێکدا کە هۆکارە خۆهێزەکان هەمیشە بەم شێوەیە نین، چونکە ((خانوو)) و((بیناسان)) هاوکات لەناو ناچن.(٢٥).

## "وەرزی سێهەم"

# ( توخم )

توخم (stoikheion) یەکەمین شتە لەناوەڕۆکی شتدا، کە لە ڕوانگەی جۆرەوە دابەش بوو، بۆ جۆرێکی تر نیە و سەرچاوەی تێکەڵ بوونی شتێکە، وەك ئەوەی کە ((توخمەکانی ئاوان)) شتانێکن کە ئاوازەکان لەوانەوە تێکەڵ ئەبن، و سەرەنجام دابەشیش ئەبن بۆیان، لەکاتێکدا کە ئەو شتانە ئیدی ناتوانرێت بۆ ئاوازەکان لەڕوانگەی جۆرەوە، جیا لەخۆیان دابەش بکرێن،(۳۰) بەڵکو کاتێك کە دابەش بوون، بەشەکانیان هاوجۆر ئەبن، وەك ئاو کە هەر بەشێك لێی ئاوە، بەڵام لە بارەی ئاوازەکانەوە بەم شێوەیە نیە،(واتە بەشێك لە دەنگەکان[1]،دەنگ نیە) هەر بەم شێوەیە کەسانێك کە لە توخمە تەنەکان قسە ئەکەن، مەبەستیان لەو شتانەیە کە تەنەکان سەرەنجام دابەش ئەبن بۆ ئەوانە، بەڵام ناتوانرێت ئەوشتە بۆ شتە جیاوازەکان دابەش بکرێت، ئەم شتانە چ یەکێك و چ زیاتر لەیەکێك بن،(٥) ئەوانە هەموویان بە توخم دائەنرێن، بە شێوەیەکی وەکیەك، شکڵە ئەندازەییەکان وبەشێوەیەکی گشتی توخمەکانی گریمانەش هەر بە توخم ناو ئەنرێن، چونکە گریمانە یەکەمینەکان، کە لە زۆرێك لە گریمانەکاندا گوونجێنراون، ناوئەنرێن بە توخمەکانی گریمانە، یەکەمین پێوانەکانیش هەربەم شێوەیەن، کە لە سێ ئاست، بە یارمەتی یەك ئاستی نێوەندی (ئاستی ناوەڕاست) پێك دێن.

لەم نێوانەدا کەسانێکیش کە واژەی((توخم)) بۆ مانایەکی تر ئەگوازنەوە و ئەوە بە شتێك ناو ئەنێن کە-لەبەر ئەوەی یەکێك و بچووکە-لە زۆرێك لە بوارەکاندا چالاکە،(٥)

---

[1] ئەم دەنگە لێرەدا بە مانای ((حونجە کردن)دێت، واتە پیتە پێك هێنەرەکانی ووشەیەك یەك لە دوای یەك بووترێن.

بەم هۆیەوە ئەوەی کە بچووک و سادە و دابەش نەبووە، بە((توخم))ناوی ئەبەن، لێرەدا هاتووە کە گشتی ترین شتەکانیش لە ریزی توخمەکانن، چونکە هەریەک لەوانە، لەبەر ئەوەی ((یەکێك))ەو(( سادە))یە، لە زۆرێك لە شتەکاندا ئامادەیە، یان لە هەموویاندا یان لە زۆرینەیاندا، لەبەر ئەوە هەندێك وایان داناوە کە ((یەك))و((خاڵی یەکەمین))ن، هەنووکە لەوێوە، ئەوەی ناوئەنرێت((رەگەزەکان))، گشتی و دابەش نەبووە،(١٠)(چونکە مانا یان پێناسەیەك بۆ ئەوانە نیە) هەندێك ئەڵێن کە رەگەزەکان، توخمن، تەنانەت زیاتر لە((جیاوازیەکان))،چونکە رەگەزەکان گشتگیرترن، چونکە لەوێدا کە رەگەز بوونی هەیە،((جیاوازی)) لەهەموو بوارەکاندا دەست ناکەوێت، بەم شێوەیە مانای هاوبەشی نێوان هەموو ئەمانە، ئەمەیە کە توخمی هەر شتێك،(١٥) یەکەمین شتێکە، کە لە ناوەرۆکی هەر شتێکدا هەیە.

## "وەرزی چوارەم"

# (ســــــروشت)

***((سروشت)) بەجۆرێك لە جۆرەکان:***

١. بەپەیـدا بـوونی (genesis) شـتە ڕوێنـەرەکان(fuomenon) ئـەوترێت، بەشێوەیەك ئەگەر(u) لە واژەی(fusis) بە درێژی بخوێنرێتەوە، ئەم مانایە بەدەست دێت.

٢. و بە جۆرێکی تر، ئەوەی کە ((دەروونی))یانەیە و ((یەکەمین شتی ڕوێنەر)) لەوەوە دروست ئەبێت.

٣. هاوکات ئەوەی کە یەکەمین جووڵە لە هەر یەك لە بوونەوەرە سروشتیەکان، بەو جـۆرەی کـە لـە خۆیـدا هـەروەك خۆیـەتی، لـەوەوە دروسـت ئـەبێت.(٢٠)..((ڕووان fuesthai))لەبارەی ئەو شتەوە ئەوترێت کە بە هۆی شتێکی ترەوە و پەیوەندبوون و ئاوێزان بوون ((لەگەڵدا ڕووان sumpefukenai))،وەك جنینـەکان زیاد ئەبێت، ((هاو- ڕووان sumfusis))لەگـەڵ ((پەیوەنـدی=لکـان))دا جیـاوازە، لـە دووەمیانـدا جگـە لە((پەیوەندی)) شتێکی تر پێویست نیە، شتێك هەیە کە لە هەردووکیاندا، ((هەمان)) و((یەکێك))ە و ئەبێتە هۆی ئەوەی کە شتەکان لەجیاتی((پێکەوە لکان=و پەیوەندی)))، پێکـەوە((بـڕوێن)) و لـە ڕوانگـەی ((لکـان و چـەندایەتیەوە)) بـەڵام نـەك لـە ڕوانگـەی چۆنایەتیەوە،یەکێك بن.

٤. هاوکات سروشت بە شتێك ئەوترێت کە شتێك لە بوونەوەرە سروشتیەکان، یەکـەمجار لەوەوەیـە، یـان لـەوەوە دروسـت ئـەبێت، و ئـەو شـێوەی ناگۆڕێـت و لـە تواناداریيەکـەی خۆیـدا، ناگۆڕێـت،وەك چۆن برۆنز بـە سروشـتی پەیکـەر یـان ئـامێرە

برۆنزییەکان و تەختە(٣٠) بە سروشتی شتە ((دارینەکان)) ناو ئەنرێت، هەربەم شێوەیەشە لەبارەی شتەکانی تر، چونکە هەر یەك لە شتەکان، لەمانەوە((دبوونرێن))لەکاتێکدا کە مادەی یەکەمین(پێشین)لە سەرتاسەری ئەوانددا، ئەپارێزرێت، هەربەم شێوەیەیە کە ئەڵێن ((توخمەکانیش)) سروشتی بوونەوەرە سروشتیەکانن، کە هەندێك ئەوان بە ئاگر و هەندێ بە خاکن و هەندێك هەواو هەندێکی تر بە شتانێکی تری لەم جۆرە ئەیان ناوێنن[1].هەندێکی تر برێك لەمانەو و هەندێکی تر گروپێك لەمانە قبولْ ئەکەن،

٥. — هاوکات بە جۆرێکی تر، ((سروشت)) بەناوەرۆکی بوونەوەرەکان ئەوترێت، وەك کەسانێك کە ئەڵێن سروشت، ((تێکەڵەی یەکەمینە)) یان بەو شێوەیەی کە((ئیمپێدوکلێس)) ئەڵێت:

((هیچ یەك لە بوونەوەرەکان، سروشتێك نین،

بەڵکو تەنیا((پێکەوە بون))و جیا بوونەوەی((پێکەوە بوونەکانە))

سروشت ناوێکە کە مرۆڤەکان لێیان ناوە.[2]

بەم هۆیەوە لەبارەی هەر شتانێك کە ((سروشتانە)) هەن یان دێنە بوون، هەرچەند ئەوەی کە لەوەوە سروشتانە هەن یان دێنە بوون، پێشتر ئامادەییان هەیە، هێشتا ناڵێین کە خاوەنی سروشتن، مەگەر ئەوەی کە ((شێوە))و(( پەیکەر))یان هەبێت، کەواتە (٥) ئەوەی کە خاوەنی هەردووکیانە،(واتە مادە و شێوە.)سروشتانە بوونی هەیە، وەك گیانەوەران، و بەشەکانیان، سروشت لە لایەکەوە (مادەی یەکەمین))ە،(ئەویش بە دوو مانا،یان بە خستنە سەر خودی شتە، یان بە شێوەیەکی گشتی،((یەکەمین))ە،بۆ نموونە، لە لێدروستکراوەکانی برۆنزدا، بە سختن سەر خودی ئەوانە، مادەی یەکەمین،((برۆنز))ە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لەوانەیە ئاو بێت[3](١٠) (بەمەرجێك ئەوەی کە شل بکرێتەوە، ئاو بێت) ولە لایەکی ترەوە (سروشت) شێوەو ناوەرۆکە.

٦.لەگەڵ ئەوەشدا بە گواستنەوەی مانا،بەهەر ((ناوەرۆکێك)) ئەوترێت((سروشت)) بەم هۆیەوە کە ((سروشت))ی شت جۆرێکیشە لە ((ناوەرۆك)).

---

[1] مەبەست لەوەیە کە ناویان ئەنێن.

[2] ئیمپێدوکلێس، لەتی ٨،(ب.بۆ یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان) ،لا ٢٤٥، لەوێدا لە شێوەیەکی کامڵتردا گوازتراوەتەوە.

[3] بەراورد بکرێت لەگەڵ وەرزی بیست و چوار، ١٠٢٣ئ٢٨، ((تیمایۆس)) بەرهەمی ئەفلاتوون،٥٨D.

ئەنجامی ئەوەی کە وترا، ئەمەیە کە: یەکەمین سروشت و بەمانای راستەقینەی واژە، ناوەرۆکی ئەو شتانەیە کە سەرچاوەی جووڵەیان لە خۆیاندا هەروەك خۆیان هەیە.(١٥)چونکە بەمادە ئەوترێت سروشت، چونکە قبوڵکەری ئەوە، و دروست بوون و ڕووانیش هاوکات، وەك جووڵە گەلێك،هەر هی ئەون(سروشت)، و سەرچاوەی جووڵەکانی بوونەوەری سروشتی خۆی بۆ خۆی سروشتە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان، ج ((هێزەکێتی))وج((کردارێتی))((یان ئەوپەڕی هاتنە ئارایی entelekheia)) ئەوانە.

## "وەرزی پێنجەم"

# ( پێـــــویستایەتـــــی )

*((پێویست anankaion)) بە شتێك ئەوترێت كە:*

١. بەبێ ئەو-هەروەك هۆكارێكی هاوڕێ((sunaitios)) ژیان مەحاڵە، وەك چۆن هەناسەدان و خۆراك بۆ گیاندارێك پێویستە، لەبەر ئەوە مانەوەبە بێ ئەم دوو (فاكتەرە) مەحاڵـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا شـتێك كـە بـە بـێ ئـەو بوونایـەتی یـان((دروسـت بـوونی چاكە))یان((لابردنی خراپە)) یان خۆپارێزی لێی مەحاڵە، هاوكات وەك بەكارهێنانی دەرمان بۆ ئەوەی بە نەخۆشی نەمێننـەوە، یان دەریا بڕین بە ئاراستەی((ئیگینا)) بۆ بەدەست هێنانی پارە، پێویستیە.

٢. پێویستی هاوكات بە((سەپێنراوی))و((سەپاندن))یش ئەوترێت، واتە ئەوەی كە بـوونی پاڵنـەر و سەرپـشكییەكی ئازادانـە، ئێمـە ئەهێلێتـەوەو بەربەسـتیمان ئـەكات، چـونكە((سـەپاندن))یـش بـە((پیویـستی)) ناوئـەنرێت، و بـەم هۆیەشـەوە ترسـناكە بـەو شێوەیەی كە((یوئێنوس)) ئەڵێت:((هەر شتێكی پێویست، سروشتانە ترسناكە))(٣٠) و((ســەپاندن یــان زۆر))یــش جۆرێكــە لــە ((پیویــستایەتی)) بــەو شــێوەیەی كـە((سـوفوكلێس)) ئـەڵێت: (( بـەلام سـەپاندن....مـن ناچـار بـەم ئیـشە ئـەكات...))، پیویستی هاوكات بەم شێوەیە وێنا ئەكرێت كە شتێكی باوەڕ نەهێنە، و بە دروستی بەم شێوەیەیە، چونكە دژی جوڵەیەكە كە بە پێی هەڵبژاردن یان سەرپشكی و بەڵگەداریـەوە ڕووئەدات.

٣. هاوكات بەوەی كە بە جۆرێكی تر ئەگەری نیە ئەڵێن،((پێویستانە))(٣٥) بەم جۆرەیە،[1] بە پێی ئەم مانا((پیویستە))یە كە بە شێوەیەك لە هەموو((پێویستایەتیەكانی)) تر قسان ئەكرێت، چونكە كردار یان كردارێنراوی پێویستانە، كاتێك ناو ئەنرێت((سەپێنراوی))، كە ئیش كردن بە پێی پاڵنەر ومەیل، بەهۆی فاكتەرێكی سەپێنراوەوە ئەگەری نیە، و ئەمە بەو مانایەیە كە((پێویستایەتی)) ئەوەیە كە بە هۆی ئەوەوە كە شتێك بە جۆرێكی تر بێت، ولەبارەی هۆكارە هاورێكانی ژیان و چاكە، هەر بەم شێوەیەیە، چونكە كاتێك كە لە بوارێكدا ((چاكە))(٥) و لە بوارەكەی تردا((ژیان))و((بوون)) بە بێ شتەكانی تر ئەگەری نیە، ئەم شتانە پێویستن و خودی هۆكارەكەش جۆرێكە لە پێویستایەتی.

هاوكات گریمانەش لە ریزی ((پێویستایەتیەكانە))، چونكە ئەگەر شتێك بە شێوەیەكی رەها گریمێنرابێت، ئەگەری ئەوەی نیە كە بە جۆرێكی تر بێت، و هۆكاری ئەمەش،((پێشەكیە یەكەمینەكانن))،هەروەك ئەو مەسەلانەی كە پێوانەكان لەوانەوە ئەشكلێن و ناتوانن بە جۆرێكی تر بن.

بەم شێوەیە هەندێ لە شتەكان(١٠) هۆكاری(( بە پێویست بوون))ەكەیان لە شتێكی بەدەر لە خۆیاندا هەیە، و هەندێكیان نا، بەڵام بە یارمەتی ئەوانەوەیە كە شتگەلێكی تر((پێویستانە)) بوونیان هەیە، لەبەر ئەمە((پێویستی)) بەمانا یەكەمین و راستەقینەكەی، ((بوونەوەری سادەیە to haploun)) چونكە لەوانە نیە كە بە چەند جۆرێك بێت، بە شێوەیەك كە هەم بە جۆرێك بێت و هەم بە جۆرێكی تر، چونكە ئەوكات بە چەند جۆرێكی زۆر ئەبێت، كەواتە ئەگەر شت گەلێكی جاویدان و نەجووڵاو(١٥) بەدەست بێن، لەواندا هیچ شتێكی سەپێنراو، و هیچ شتێكی پێچەوانەی سروشتی ئەوان بوونی نیە.

[1] ئەمە هەمان پێناسەیە كە لەفەلسەفەی ئسكۆلاستیا ناونراوە(( ئەوەی كە ناتوانێت،نەبێت)).

## "وەرزی شەشەم"

## ( یەك )

(یەك) هەم بە ((دەرکەوتانە)) و هەم(( لە خۆیدا kath hauto)) ئەوترێت.

١. دەرکەوتانە وەك((کوریسکوس)) و((مۆسیقاپ)) و((کوریسکوسی مۆسیقاپ))(چونکە کوریسکوس))و((مۆسیقاپ)) و((کوریسکوسی مۆسیقاپ)) بە یەك مانا ئەوترێن، یان ((مۆسیقاپ)) و((دادپەروەر)) و((مۆسیقاڕی دادپەروەر)).(٢٠) هەموو ئەمانە پێیان ئەوترێت ((یەك–ی– دەرکەوتانە))،((دادپەروەر و مۆسیقاپ))، لەبەر ئەوە دەرکەوتەی یەك ناوەڕۆکن، ((مۆسیقاڕ و کوریسکوس))، چونکە یەکێکیان دەرکەوتەی ئەوی تریانە، و هەربەم شێوەیە((کوریسکوسی مۆسیقاپ)) لەگەڵ ((کوریسکوس)) بە جۆرێك لە جۆرەکان یەکێکە، چونکە یەکێك لە بەشەکانی دەربڕینەکە بۆ ئەوی تریان دەرکەوتێکە، (٢٥)،وەك مۆسیقار بۆ کوریسکوس، و((کوریسکوسی مۆسیقاپ))یش لەگەڵ ((کوریسکوسی دادپەروەر)) یەکێکە، چونکە هەر بەشێك لە هەر یەکێك لەو دوانە، دەرکەوتێکە بۆ یەکتر و هەمان شت، هەر ئەم مەسەلەیە تەنانەت کاتێك بایەخدارە کە((دەرکەوت)) لەبارەی هەر یەك لە ناوەڕۆکەکان یان شتێك لە ناوە گشتیەکان بووترێت، وەك ئەوەی کە((مرۆڤ)) و(( مرۆڤی مۆسیقاپ)) یەکێکن و هەمان شتن، (٣٠) و ئەمە یان بەو مانایەیە کە مۆسیقاڕ دەرکەوتەی مرۆڤە کە ناوەڕۆکێکی یەکی یان(تاکە)، یان بەو هۆیەوەیە کە هەردووکیان دەرکەوتەی شتێکی (تاك)یان(بەشەکین)، وەك ((کوریسکوس)) جگە لەوەی کە هەردووکیان بەیەك جۆر پەیوەندیان بەوەوە نیە، بەڵکو یەکێکیان تا ئەندازەیەك هەروەك ((ڕەگەز))و ((بوونەوەر)) لە((ناوەڕۆك)) و ئەوی تریان

هەروەك((حاڵەت)) یان ((خەسلەتێكی پایەدار hexis)) و((كرداراندن pathos))ی ناوەرۆك ( پەیوەست بەون). بەم شێوەیە هەموو ئەوشتانەی كە ((دەركەوتانە)) پێیان ئەوترێت((یەك)(٣٥) بەم جۆرە ئەوترێن.

٢. بەڵام ئەوشتانەی كە پێیان ئەوترێت ((یەك –لەخۆدا))(واتە لە خۆیاندا یەكن – تاكن)، هەندێك لە روانگەی.

١٠١٦a

(پێكەوە لكان) ( بەم تایبەتمەندیە رێن) ئەبن، وەك ((دەستە)) یان((بەستە)) كە بە هۆی((بەند)) و پارچە تەختەكان بەهۆی چەسپەوە (پێكەوە ئەلكێن)، هەروەها هێڵێكی پێكەوەلكێنیش، هەرچەندە لار بێت، بەڵام هەر پێی ئەوترێت((هێڵ))، هەروەها وەك هەریەك لە بەشەكانی جەستە، بۆ نموونە ((ساقی پێ)) یان ((بازوو))، لە نێوان خودی ئەم شتانەشدا، ئەوانەی كە بەسروشت((لكێنراون)) زیاتر((یەك))ن لەوانەی كە ((دواتر لكێنراون))(واتە بە زۆر لكێنراون.و.ك)((لكێنەر)) هاوكات بە شتێك ئەوترێت كە جووڵەكەی ئەو لەخۆیدا ((یەك))جۆرە وبەجۆرێكی تر نیە، جووڵەش كاتێك ((یەك))ە كە دابەش نەخواز بێت، واتەلەسەر بنەمای كات دابەش نەخواز بێت،((لكاو لە خۆیاندا)) ئەو شتانەن كە نە تەنیا لە ((لەمس كردن))دا یەكێكن، بۆ نموونە ئەگەر پارچە تەختەكان، خرابنە پاڵ یەك، ناوترێت كە ئەوانە یەكێكن، واتە نە یەك پارچە تەختەن، و نە یەك تەن، و نە شتێكی لكاوی تر، بەڵام ئەو شتانەی كە بە تەواوی ((لكاو))ن، با((لار))یش بن، هەر پێیان ئەوترێت ((یەك))، بەڵام(١٠) ئەگەر((لار))نەبن، زیاتر((یەك))ن، وەك بەشی سەرەوەی ((ڕان)) كە زیاتر لە ژێر ئەژنۆ، ((یەك))ترە، چونكە لەوانەیە جوڵەی ساقی قاچ، لە ژێر ئەژنۆوە یەكێك نەبێت، و هێڵی راستیش زیاتر لە هێڵی لار ((یەك)) ترە، بەڵام ئەو هێڵە لارەی كە خاوەنی دوو گۆشەیە، پێی ئەڵێن هەم((یەك))ێكە و هەم((یەك))ێك نیە، چونكە جووڵەی ئەو لەوانەیە هەم هاوكات و هەم ناهاوكات ڕوو بدات، بەڵام جووڵەی هێڵی راست ،هەمیشە (١٥) هاوكات ڕوودەدات، وهیچ بەشێك لە ئەندازەكەی، لە ساتەوەختی جووڵەی بەشەكەی تریدا، ناتوانێت وەستاو بێت، بەو جۆرەی كە لە هێڵی لاردا ئەبینرێت،

((یەك–تاك)) هەمیشە بە جۆرێكی تریش ئەوترێت، كاتێك كە بابەتەكەی لە روانگەی جۆرەوە ناجیاوازە، ((ناجیاواز adiaforon)) ئەوەیە كە شێوەكەی لە روانگەی پەی بردنی هەستەكیەوە جیا ناكرێتەوە، ((بابەت)) یش ئەوەیە كە((لەروانگەی كۆتایی (یان ئامانج) یان یەكەمین یان كۆتاترین))چونكە هەم بە شەراب و هەم بە ئاو ئەڵێن((یەك))

لەو ڕووەوە کە هەردووکیان لە ڕوانگەی جۆرەوە جیا ناکرێنەوە، لەلایەکی ترەوە هەموو ((ئاو شێوەکان)) پێیان ئەوترێت ((یەک))(وەك ڕۆنی زەیتوون، شەراب) و هەروەها هەموو((تواوەکان))یش، چونکە پاشکەوتی بابەتی هەموویان، هەمانە، چونکە هەموو ئەمانە ((ئاو))یان((هەوا))(هەڵم)ن.

(٢٥)یەك، بەو شتانەش ئەوترێت کە ڕەگەزەکەیان ((یەك))ە، هەرچەند لە جیاوازیە هاوبەرامبەرییەکانیاندا جیاوازن، ئەمانەش هەمویان پێیان ئەوترێت((یەك))، چونکە ڕەگەز کە بابەتی جیاوازیەکانە، لەواندا(یەك))ە، وەك (ئەسپ، مرۆڤ و سەگ کە یەکن، چونکە هەموویان ئاژەڵن) و لە واقعدا هەر بەو جۆرەی کە(ئەوترێت) مادەکەیان یەکێکە، ئەم شتانە هەندێ جار بەم جۆرە پێیان ئەوترێت،((یەك))، و هەندێ جاریش ((ناوەرۆکی بەرزتر-عالی))یش هەر بەوە ناوئەنرێت، (٣٠)-ئەگەر ئەوان (جۆرە کۆتاکانی) ڕەگەزەکەی خۆیان بن-واتە ڕەگەزێك لەسەرووی ڕەگەزە نزیکەکانەوە، وەك،((سێگۆشەی دووساق یەکسان -متساوی الساقین))(هەمبر) و سێگۆشەی دوگۆشە یەکسان، کە هەردوکیان هەمان شێوەن، چونکە هەردوکیان سێ گۆشن، بەڵام هەمان سێگۆشە نین.

هاوکات ((یەك)) بەوشتانە ئەوترێت کە پێناسە (یان مانا)کەیان کە بەڵگەیە لەسەر ((چیەتی))(ماهیەت))، لە پێناسەیەکی تر کە بەڵگەیە لەسەر شتێکی تر، جیا نەبووەوەیە، هەرچەند لە ڕاستیدا هەر پێناسەیەك لەخۆیدا،جیابووەوەیە،(٣٥)بەم جۆرە هەرشتێکی ((لەسەرخراو لێ براو))((یەك))ە،چونکە پێناسەکەی ئەوان یەکێکە، ڕێك بەهەمان شێوە کە لەبارەی ((ئاستەکان))دا بەو شێوەیەیە، پێناسەی شێوەکانیان یەکێکە،

١٠١٦b

بە شێوەیەکی گشتی ئەو جۆرە شتانەی کە ئەندێشەیەك تیایاندا بیر لە چیەتی ئەکاتەوە، جیانەبووەوەیە، و نەبەپێی کات و نە بە پێی شوێن و نە بە پێی پێناسە، ناتوانێت ئەو جیا بکاتەوە، بە زۆرترین شێوە((یەك))ن، و و لەمانەش بە تایبەتی( ئەوانەی کەلەم جۆرەن) ئەوانەی کە ناوەرۆکەکانن(چونکە زیاتر ((یەك))ایەتیان هەیە.و.ف)،چونکە بە شێوەیەکی گشتی ئەو شتانەی کە دابەش نەخوازن، لەو ڕوانگەیەوە کە ((ناخوازن))، پێیان ئەوترێت((یەك))ی، (٥) بە شێوەیەك کە مرۆڤ هەروەك مرۆڤ، دابەش نەخواز بێت،مرۆڤێکی((یەك))ە، و ئەگەر(هەر ئەم مرۆڤە) هەروەك ئاژەڵ ( دابەش نەخواز بێت)، ئاژەڵێکی((یەك))یە، ولەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هەروەك گەورە بێت، گەورەیەکی((یەك))یە.

کەواتە زۆربەی شتەکان پێیان ئەوترێت((یەك))، چونکە شتێکی((یەك))تر، یان ئەهێننە کردارانەدن، یان لەوەوە (( ئەکردارێنەدرێن))، یان رێژەییانە لەون، بەلآم ئەو شتانەی کە بە یەکەمین جۆر بە ((یەك)) ناوئەنرێن، ئەوانەن کە رەگەزەکەیان ((یەك))ە، یان لەسەر بنەمای پەیوەندی (پێکەوە لکان)، یان جۆر(شێوە)،یان((پێناسە))(١٠) چونکە ئێمە شتانێك لە شێوەیەکی زیاتر لە "یەك" ئەژمار ئەکەین، کە یان((نەلکێنراون)) یان((جۆرەکەیان)) یان ((پێناسەکەیان))،((یەك))نیە.

هاوکات، بە مانایەکی تر، ئێمە هەر شتێك کە-بەمەرجێك خاوەنی چەندایەتی و چۆنایەتی بێت- پێی ئەڵێین ((یەك))، بەلآم بە مانایەکی تر واناڵێین، مەگەر ئەوەی کە یەك((گشت)) بێت، واتە مەگەر ئەوەی کە خاوەنی شێوەیەکی((یەك))ی بێت، بەم شێوەیە ، بۆ نموونە ئەگەر ببینین کە بەشەکانی پێلاوێك بە شێوەیەك خراونەتە سەر یەك، نابێت بڵێین کە ئەوان ((یەك))ن،(١٥)(مەگەر لەبەر پێکەوە لکانەکەیان)، بەڵکو تەنیا کاتێك کە بە شێوەیەك خرابنە سەر یەك کە((یەك)) پێلاو و خاوەنی شێوەیەکی((یەك))ی بن،{بەوانە ئەڵێین ((یەك))} بەم هۆیەوەیە کە ((بازنە)) لە نێوان هێڵەکاندا، بە زۆرترین(میزان وباشترین) شێوە((یەك))ێکە، چونکە((گشت))ەو ((تێرو تەسەلە-کامڵە)).

٣. بوونایەتیەکی((یەك))، جۆرێکە لە سەرچاوە بۆ ((بوونایەتی ژمارە))، چونکە ((یەکەمین ئەندازە))سەرچاوەیە، ئەوەی کە بە هۆیەوە، ئێمە یەکەمجار(شتێك) ئەناسین،((یەکەمین ئەندازە))(٢٠)ی هەر رەگەزێکە لە شتەکان، کەواتە سەرچاوە یان((سەرەتا)) لە هەریەك لە شتە ناسراوەکاندا ((یەك))ە، بەلآم لە هەموو رەگەزە ((یەك))یەکاندا وەك یەك نیە، لێرەدا یەك لەسەر چواری ناهەنگێك بوونی هەیە، لەوێدا کە پێتەکان دەنگدار یان بێدەنگن، لە بارەی قورسایی شتێکی تر، و لەبارەی جوولەوە دیسانەوە شتێکی(یەك) ترە، بەلآم لە هەموو بوارەکاندا ((یەکایەتی)) لە روانگەی چۆنایەتیەوە یان ل روانگەی جۆرەوە جیانەبووەوەیە، (٢٥) بەم شێوەیە ئەوەی کە بە پێی چەندێتی یان هەروەك چەندێتی، بە تەواوی ((جیانەبووەوە و بێ شێوازە atheton))ە، ناوی ئەنرێت((یەك monas))، و ئەوەی کە بە تەواوی ((جیانەبووەوەیەو خاوەنی شێوازە))خاڵێکە، ئەوەی کە لە دوو((ماوە))دا دابەشخوازە،((ئاست))ە، و ئەوەی لە روانگەی چەندایەتیەوە لە هەر سێ((ماوەکەدا_دوورو نزیکی)) دابەشخوازە، ((تەنە))، بە پێچەوانەی ئەم ریزبەندیە، ئەوەی لە دوو ماوەدا دابەشخوازە، ئاستە، و ئەوەی لە یەك ماوەدا،هێڵ، و ئەوەی لە هیچ ماوەیەکدا-لە روانگەی چەندایەتیەوە-

دابەشخواز نیە، خاڵ، و((یەك))ە (٣٠) واتە ئەگەر بیٚ شێواز بێت، یەك دانە((یەك))یە، و ئەگەر خاوەنی شێواز بێت، (خاڵ)ە.

هاوکات هەندێ لە شتەکان لەروانگەی ژمارەوە جیاوازن، و هەندێ لە روانگەی جۆرەوە، و هەندێك لە روانگەی رەگەز و هەندێك لەروانگەی رەگەز و هەندێکیش لە روانگەی نیسبەت و(پەیوەندی)یەوە، لەروانگەی ژمارەوە ئەوانەن کە مادەکەیان یەکێکە، لەروانگەی جۆر ئەوانەن کە پێناسەیان یەکێکە، لەروانگەی رەگەزەوە ئەوانەن کە بەهەمان شکڵ لە گوتراو یان(هەڵگیراوە)وە پەیوەستن، و لەروانگەی نیسبەت(پەیوەندی)ەوە ئەوانەن کە خاوەنی هەمان نیسبەتی شتێکن لەگەڵ شتێکی تردا، (٣٥) بەڵام هەمیشە ((دواترینەکان-پاشکەوتەکان)) بەدوای ((پێشینەکان))ەوە دێن، بەو شێوەیەی کە هەموو ئەو شتانەی کە ژمارەیین، لە رووی جۆریشەوە یەکێکن، بەڵام هەر ئەوانەی کە لە ڕووی جۆرەوە یەکێکن، لە ڕووی ژمارەشەوە یەکێکن، بەڵام ئەوانەی کە لە ڕووی جۆرەوە یەکێك نین، لە ڕووی رەگەزیشەوە یەکێکن، بەڵام ئەوانەی کە لە ڕووی رەگەزەوە یەکێکن، هەموویان لە ڕووی جۆریشەوە یەکێك نین، بەڵکو لە ڕوانگەی نیسبەت و(پەیوەندیشەوە) یەکێکن، بەڵام ئەوانەی کە لەروانگەی نیسبەتەوە یەکێکن، لەروانگەی رەگەزەوە یەکێك نین.

ئەمەش روونە کە((زۆرینەکان))هاوبەرامبەری ((یەك))یەکان ناو ئەنرێن، هەندێك بەو هۆیەوە کە پێکەوە نەلکاون، هەندێك وەك(٥) مادەکەیان (چ پێشکەوتەکەیان و چ دواکەوتەکەیان) لە روانگەی جۆرەوە دابەشخوازە، و هەندێکیش بەو هۆیەوە کە پێناسەیان کەرەکانی((چیەتی))یان لە یەکێك زیاترن.

"وەرزی حەوتەم"

# (بوونەوەر- هەبوو)

بوونەوەر(یان کائن، ببوو،هەبوو to on) لەلایەکەوە بە((دەرکەوتانە))و لە لایەکی ترەوە بە((لە خۆیدا kath hauto)) ناوئەنرێت، دەرکەوتانە وەك ئەوەی کە بڵێین، عادل مۆسیقارە، یان مرۆڤ مۆسیقارە، یان مۆسیقاڕ مرۆڤێکە، (١٠) رێك هەروەك ئەوەی کە بڵێین مۆسیقاڕ خانوو دروست ئەکات، چونکە بۆ بیناساز ، مۆسیقاڕ بوون، یان بۆ مۆسیقاڕی،بیناساز بوون، دەرکەوتەیەکە، چونکە((ئەمە ئەمەیە))بەو مانایەیە کە((ئەمە بۆ ئەمە)) دەرکەوتەیەکە، و لەبارەی نموونەکانی سەرەوەش هەربەم شێوەیەیە، چونکە هەر کاتێك ئەڵێین کە مرۆڤ مۆسیقاڕ ومۆسیقاڕ مرۆڤە،(١٥) یان ئەوەی کە سپی مۆسیقارە، یان ئەم مۆسیقارە سپییە، لە دوو مەسەلەکەی کۆتاییدا بەو هۆیەوەیە کە هەر دووك دەرکەوتەی یەك شتن، و لە مەسەلەکەی یەکەمدا هۆکە ئەوەیە کە بۆ یەك بوونەوەر دەرکەوتەیە، و لەوەیدا کە مۆسیقاڕ مرۆڤە، هۆکارەکە ئەوەیە کە مۆسیقاڕ دەرکەوتەیەکە بۆ مرۆڤەکە، (هەر بەم شێوەیە ئەوترێت کە ((نە- سپی))(هەیە) چونکە ئەوەی کە ئەم دەرکەتەی ئەوە ((هەیە)).) کەواتە ئەوەی کەو ئەوترێت دەرکەوتانە((هەیە))،(٢٠) لەبەر ئەوە بەم جۆرە ناو ئەنرێت کە: یان هەردووکیان ((پەیوەستن)) بەهەمان بوونەوەرەوە، یان بەو هۆیەوەیە کە ئەم(دەرکەوتە) ((پەیوەستە))بەوەوە کە ((بوونەوەرە))، یان بەو هۆیەوە، بابەتێك کە خۆی ئەبێتە هەڵگیراوی،خۆی((هەیە)).

((بوونایەتی بە خودی خۆی))(kayh hauta einai )) رێك بە ژمارەی ئەو شتانە ئەوترێت کە ((شکڵە گووتارییەکان)) بەڵگەن لەسەریان، چونکە بەو ژمارەیەی کە ئەمان ئەوترێن، بەهەمان ژمارە بەڵگەن لەسەر ((بوونایەتی))(٢٥) هەنوکە لەبەر ئەوەی هەندێك لە گووتەکان بەڵگەن لەسەر((چیەتی ti esti))، و هەندێکی تر بەڵگەن لەسەر((چۆنایەتی poion)) و هەندێکی تریش لەسەر((چەندایەتی poson)) و هەندێك لەسەر ((خستنە سەر pros ti)) و هەندێکیش لەسەر (کردار و کرداراندنpoiein e paskhein ))و هەندێك لەسەر((کوێ=شوێن pou )) و هەندێك لەسەر((کەی=کات))، کەواتە بوونایەتی هەر ئەوەیە کە هەریەك لەمانە بەڵگەن لەسەری،چونکە هیچ جیاوازییەکی نیە کە بڵێین مرۆڤ لە حاڵەتی تەندروستیدایە، یان مرۆڤ تەندروستە، یان بڵێین لە حاڵەتی بە رێگادا چوون یان لەحاڵەتی پێواندایە، یان مرۆڤ بە رێگادا ئەچێت یان ئەپێوێت، و لەبارەی مەسەلەکانی تریشەوە(٣٠) هەربەم شێوەیەیە.

هاوکات ((بوونایەتی)) (بوون) و((هەیە))بەڵگە لەسەر ئەوەن کە شتێك راستەقینەیە (یان راستە)، و((نەبوون)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شتێك راست یان راستەقینە نیە، بەڵکو ((درۆیە pseudos)) و لە بارەی ((سەلماندن و رەت کردنەوە))ش هەر بەم شێوەیەیە ، بۆ نموونە((سوقرات سپی نیە)) ،ئەڵێت کە ئەم مەسەلەیە راستە، یان ئەوەی کە(( سوقرات سپی نیە)) ، ئەڵێت کە ئەمیش هەر راستە،(٣٥) بەڵام ئەمە مەسەلەیە کە((هێڵی تیرە، لە چوارگۆشەدا، بە ئەندازەی ((لا)) نیە)) ئەڵێت کە ئەمە درۆیە.

١٠١٧b

دیسانەوە (( بوون to einai)) و ((بوونەوەر)) بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هەندێك لەو شتانەی کە ناویان برا،((خۆهێزن))و هەندێکی تریان((خۆکردار))((یان ئەوپەری هاتنە ئارایی entelekheia))ن، چونکە ئێمە لەبارەی ئەوەی کە ((خۆهێزانە یان خۆکردارانە))ئەبینێت، ئەڵێین کە((بینەر))ە، و لەبارەی ((ناسین))یشەوە هەر بەم شێوەیەیە، هەم لەبارەی کەسێکەوە قسە ئەکەین کە لەبەرکار هێنانی زانست (و ناسین)دا بە توانایە و هەم لە بارەی کەسێکەوە کە بەکارهێنەرییەتی،(٥) و هەروەها ئەوەی کە ((وەستان)) پێشتر لەودا ((ئامادەیە)) و ئەوەش کە ((خۆهێزانە)) وەستاوە، هەردوکیان ناو ئەنێین ((وەستاو))، و هەر بەم شێوەیەشە کە لە بارەی ناوەرۆکەکانیشەوە، چونکە ئەڵێین کە((هێرمێس)) لە بەردایە[1] و نیوەی هێڵ، هەر لە هێڵدایە، و ئەوەی هێشتا بە تەواوەتی نەڕواوە، ئەڵێین ((تۆو))ە، بەڵام ئەوەی کە لە چ کاتێکدا شتێك((خۆ هێن))(یان ئەگەری ) هەیە، و چ کاتێك هێشتا نیە، ئەبێت لە شوێنێکی تردا دیاری بکرێت.

---

[1] لەوانەیە لێرەدا مەبەستی لە پەیکەرەکەی بێت.و.کوردی

"وەرزی هەشتەم"

# ( نـــــاوەرۆك )

((نـاوەرۆك ousia)) بـەجۆرێك لـە تەنـەكان ئـەوترێت، وەك خاك،ئـاگر، و ئـاو و وەك ئەمانـە، و بـە شـێوەیەكی گـشتی تەنـەكان وئەوانـەی كـە لـە تێكەڵـەی ئەوانـەوە دروسـت بـوون، لەگیانـەوەران و بوونـەوەرە بەهەشـتیەكان (daimonia) و بەشـەكانیان، هـەموو ئەمانە پێیان ئەوترێت((ناوەرۆك)). چونكە ئەوانە لە بابەتێكەوە ناویان ناهێنرێت، بەڵكو شتەكانی ترلەوانەوە ئەوترێن[1]، بە جۆرێكی تر ناوەرۆك بەوە ئەوترێت(١٥) كـە((هۆكـاری خودی enuparkhon)) بوونایەتی شتانێكە كە لە بابەتێكەوە نـاوترێن، وەك دەروون لـە گیانەوەراندا، و هـەروەها بەشـە دەروونیـەكان و ئـەوجۆرە شـتانەی كـە ئەوانـە سـنووردار ئەكەن و بەڵگەن لەسەر((ئەم شتانە لەم شوێنەدا)) و بـە لابردنـی ئەمانـە، ((گـشت)) لـەناو ئەچێت، وەك چۆن بە قسەی هەندێك، بە لەناوچوونی ئاست، (یان لابردنـی لـە كایەكـەدا) و تەن و لابردنی هێڵ، ئاسـت لـەناو ئەچێت و لائـەبردرێت،(٢٠) بەگشتی هەنـدێك ژمـارە بـەم شـێوەیە ئـەزانن (لەبـەر ئـەوە ئەگـەر ئـەو ل ببردرێـت، هـیچ شـتێك بـوونی نیـە، و ئەمە(ژمارەیە) كە هەموو شتەكان سنوردار و دیاری ئەكات)، ((هاوكات چیەتی(ماهیـەت) كە دەربڕینێكە لەو پێناسەیە، بەناوەرۆكی هەریەك لە شتەكان ناو ئەنرێت)) لـە ئەنجامـدا ناوەرۆك بە دوو جۆر ئەوترێت:١_ هەروەك پاشكەوتی بابەت كە بەدەر لەو بە شتێكی تـر ناوترێـت و٢_ ئـەوەی((ئـەم شـتە لێـرەدا)) و جیایـە،(٢٥) و شـێوەكان و پەیكـەرەكان هەریەكەیان بەم شێوەیەن.

---

[1] واتە ناوەرۆك خۆی نابێتە هەڵگیاوی بابەتێك، بەڵ:و شتەكانی تر ئەبنە هەڵگیراوی ئەو.

"وەرزی نۆیەم"

# ( هەمان، ئەوی تر، جیاوازی، وەکیەك، ناوەکیەك )

هـــــەمان(tauta) لەلایەکــــەوە، دەرکەوتانـــەش ئـــەوترێت، بـــە شــــێوەیەك کە((سپی))و((مۆسیقاڕ)) هەمانن، چونکە دەرکەوتەی هەمان شتن، و مرۆڤ و مۆسیقاڕ، لەبەر ئەوەی ئەمیان دەرکەوتەی ئەوی تریانە، و مۆسیقاڕ(هەمان) مرۆڤە، چونکە دەرکەوتەی مرۆڤە،(٣٠)، هەریەك لەو دووانە بەمە و ئەمیش بەهەریەك لەو دووانە ئەوترێت، چونکە بە مرۆڤی مۆسیقاڕ هەمان ئەوترێت کە بە((مرۆڤ))و((مۆسیقاڕ)) و بە پێچەوانەوە، بەم هۆیەوە هەموو ئەمانەش بە شێوەیەکی گشتی ناووترێن، چونکە راست نیە کە بڵێین(٣٥) هەر مرۆڤێك هەمانە کە مۆسیقاڕە، چونکە((گشتەکان)) لە خۆیاندا،پەیوەستن بە شتەکانەوە،

٠١٨a

بەڵام دەرکەوتەکان((پەیوەستن نین بە خودێتی شتەکانەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای شتە تاکەکان، بە سادەیی ئەخرێنە سەر شتێك، وا وێنا ئەکرێت کە ((سوقرات))و((سوقراتی مۆسیقاڕ)) هەمانن، بەڵام((سوقرات))، زۆرێك لە خۆ ناگرێت، بەم هۆیەوەیە کە ناڵێن((هەر سوقراتێك)) بەو جۆرەی کە ئەڵێین(( هەر مرۆڤێك)).

کەواتە بە هەندێ لە شتەکان بەم جۆرە ئەوترێت((هەمان))، و بە هەندێکی تریش(٥)((لە خۆدا))(هەر ئەوە ئەوترێت) و ژمارەی جۆرەکانیشی هەمانە کە لە بارەی ((یەك))ەوە بینیمان، چونکە ئەوشتانەی کە مادەکەیان، چ لە روانگەی جۆرەوەو چ لەروانگەی ژمارەوە((یەك))ە ،ناو ئەنرێن بە((هەمان)) و هەروەها ئەو شتانەش کە

ناوەرۆکەکەیان ((یەك))ێکە، لەبەر ئەمە ڕوونە کە((هەمان بوون)) جۆرێك لە((یەکتایی یان یەکێتی)) بوونە، چ لە شتە جیاوازەکان و چ لە یەك شتدا، کاتێك ئەمە هەروەك زیاتر لە یەکێك ناوزەد ئەکەین، وەك کاتێك کە بڵێین یەك شت لەگەڵ خۆیدا هەمانە، چونکە لەوشێوەیەدا ئەومان بە دوو شت زانیووە،(١٠)((ئەوی تر=غیر)) بەوشتانە ئەوترێت کە یان جۆرەکان یان مادە، یان مانای ناوەرۆکەکەیان جیاوازە، بە شێوەیەکی گشتی((ئەوی تر)) بە مانای بەرامبەر و دژی((هەمان)) ئەوترێت و دێت.

((جیاوان)) (diafora) بەو شتانە ئەوترێت کە هەرچەندە لەروانگە یەکەوە((هەمان))ن بەلأم((ئەوی تر))یشن، و نە تەنیا لە روانگەی ژمارەوە، بەڵکو لە روانگەی جۆر یان رەگەز یان نیسبەت و(پەیوەندی)یەوە، هاوکات شتانێك کە رەگەزەکەیان((ئەوی تر))ە و هەروەها دژەکان و هەموو ئەو شتانەی کە((ئەوی تری heteroteta))یان لە ناوەرۆکی خۆیاندا هەیە.

(١٥) ((وەك یەك-هەروەك homoia)) بەو شتانە ئەوترێت کە کرداراندنەکانیان ((tapeponthota)) لە هەر روانگەیەکەوە هەمانە، و هەروەها ئەو شتانەی کە زۆرترین خاوەنی هەمان (کرداراندن)ن تا ((کرداراندن))ی تر، و شتانێك کە((چۆنایەتی))یەکەیان یەکێکە، سەرەنجام شتێك هەروەك شتێك ناو ئەنرێت کە لەگەڵ ئەودا لە زۆرترین و گرنگترین ئەو دژانەی کە ئەتوانێت لەگەڵیاندا بگۆرێت، هاوبەشە،((ناوەك یەك anomoia)) بە مانای هاوبەرامبەر و دژی ((وەکیەك)) دێت.

"وەرزی دەیەم"

# ( بەرامبەرێتی یان بەرامبەر )

(٢٠)((بەرامبەرێتی یان بەرامبەر antikeimena)) بەمانە ئەوترێت:(( ناهاوتایی antifasis))،((دژەکان tanantia))،((زیاد کراوەکان،سەر خراوەکان ta prosti))، ((نەبوون))،((خەسڵەتی پایەدار))،((پاشکەوتەکان eskhata))،کە پەیدابوون و لەناوچوونەکان لەوانەوە و لەناو ئەوانەوە ڕوو ئەدەن، هەروەها ئەوشتانەش کە لەوانە نیە هاوکات لە شتێکدا ئامادە بن کە قبوڵکەری هەردوکیانە، ناویان ئەنرێت بە((بەرامبەرییەکان))، چ خودی خۆیان وچ ئەوەی کە بوونایەتیەکەیان لەوەوەیە، (بەشە پێك هێنەرەکانیان.و.ف) خۆڵەمێشی و سپی هەرگیز هاوکات لە هەمان شتدا بوونیان نیە، (٢٥) لەبەر ئەمە ئەوەی کە ئەمان لەون(واتە لەوانەوە پێك هاتوون) بەرامبەرن.

((دژەکان enantia)) بەو جۆرە شتانە ئەوترێن کە: ناتوانن هاوکات لەهەمان شتدا ئامادەییان هەبێت، و لەڕوانگەی ڕەگەزەوە جیاوازن، هەروەها بەو جیاوازترین شتانەی کە پەیوەستن بە هەمان شتەوە و بەو جیاوازترین شتانەی کە پەیوەستن بە هەمان بابەتی قبوڵکەرەوەو بەو جیاوازترین شتانەی کە پەیوەستن بە هەمان هێزەوە،(٣٠) و هەروەها بەو جۆرە شتانەی کە خاوەنی گەورەترین جیاوازین، چ ڕەهاییانە،و چ لەڕوانگەی ڕەگەزەوەو چ لە ڕوانگەی جۆرەوە، و شتەکانی تریش، ئەوترێت((دژەکان))، یان لەو ڕوەوە کە بە خاوەنی تایبەتمەندی دژ، ئەژمار ئەکرێن، یان لەو رووەوە کە قبوڵکەری ئەوانن، یان ((بکەری))یان یان ((کارتێکراون)) لە لایەن ئەوانەوە، یان لەو رووەوە کە لەو جۆرە تایبەتمەندیانەوە کارتێکەرتن یان کاریان تێ ئەکرێن، یان لەو رووەوە کە لە

دەست دانەکان یان بەدەست هێنانەکان، یان خاوەندارێتیەکان یان لەناوچوونەکانی ئەوجۆرە تایبەتمەندیانەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە((یەك))ی و((بوونەوەر)) بە چەند جۆرێك ئەوترێن، کەواتە هەموو ئەو چەمکانەی تریش کە لە دوای ئەوانەوە دێن، ئەبێت لە ماناگەلێکی جیاوازدا ناوبنرێن، وەك((هەمان))و((ئەوی تر))و((دژ))، بە شێوەیەك کە لەسەر بنەمای هەر یەکەیان،مانایەکی تر هەیە.

١٠١٨b

((جیاواز بە پێی جۆر))بەو شتانە ئەوترێت کە پەیوەستن بە هەمان رەگەزەوە، بەڵام شوێنکەوتی یەکتر نین، و ئەوشتانەی کە لە هەمان رەگەزن، بەڵام جیاوازن، و هەروەها ئەوشتانەی کە لە ناوەرۆکیاندا دژایەتیەکیان هەیە، هاوکات دژایەتیەکانیش لەسەر بنەمای جۆر، لێك جیاوازن، یان هەموویان، یان ئەوانەی کە بە ((مانای یەکەمین)) بەو جۆرە ناونراون، هەروەها شتانێك کە پێناسەکانیان لە پاشکەوتی جۆری رەگەزدا(٥) جیاوازن، (بە شێوەیەك کە مرۆڤ و ئەسپ، لەسەر بنەمای رەگەز دابەشنەخوازن، بەڵام پێناسەکانیان جیاوازە) سەرەنجام ئەو جۆرە شتانەی کە پەیوەستن بە هەمان ناوەرۆکەوە، بەڵام خاوەنی جیاوازین،،((هەمان یان (وەك) بە پێی جۆر))لە مانا بەرامبەرەکەی ئەمانەوە دێت.

"وەرزی پانزەیەم"

# ( پێشکەوت و پاشکەوت، یان پێش و دوا )

((پێشکەوت protera)) بە هەندێك لە شتەكان ئەوترێت كە (لەوێوە كە(١٠) لە هەر ڕەگەزێكدا شتێكی سەرەتایی یان سەرەتایەك بوونی هەیە)، كە نزیكترن لە سەرچاوەیەكەوە، كەچ بە ڕەهایی و سروشتیانە، یان بەشێوەیەكی ڕێژەیی، یان بە هۆی كەسانێكەوە سنووردار و دیاری كراوە، بەو شێوەیەی كە شتەكان لەڕوانگەی شوێن، لەو ڕووەوە لە((پێشتر))ن، كە یا بە شوێنێكی سروشتانە دیار كراو(وەك ناوەڕاست یان كۆتایی)، یان بە شوێنێكی لەناكاو نزیكترن، ئەوی كە دوورتر و لە دواترە، هەندێ لە شتەكانیش بە پێی كات ((لە پێشن))و ((لە دوان))، هەندێك(١٥) لەو ڕووەوە كە لە ((هەنووكە))دوورترن، وەكو شتەكانی ڕابردوو،(چونكە شەڕەكانی ((تروا)) لە پێش ئەو شەڕانەن كە لە گەڵ ئێرانیەكاندا كران) چونكە ئەوان لە(( هەنووكە)) گەلێك دووترن، و هەندێك لەو ڕووەوە كە لە((هەنووكە)) نزیكترن، وەك شتەكانی داهاتوو، وەك ((جەژنەكان و یارییەكانی (نێمێئا) لە پێشتر لە جەژنەكان و یارییەكانی(پیسیا)[1]یە، چونكە ئەمانە لە ((هەنووكە))(ئەگەر هەنووكە وەك یەكەمین و سەرەتا لەبەر چاو بگرین) نزیكترن، هەندێ لە شتەكانیش لە ڕوانگەی ((جووڵە))وە لە پێشترن،(٢٠) چونكە ئەوەی لە ((یەكەمین پاڵنەرەوە)) نزیكە، لە پێشترە، بەوشێوەیەی كە ((كوڕ)) لە پێشترە لە ((پیاو))،

---

[1] جەژنەكانی NEMEA و PYTHEA، لە دوای جەژنەكانی ئۆلۆمپیاد، گرنگترین جەژنەكانی یۆنانی كۆن وئەژمار ئەكرێن، یەكەمینیان لە ساڵی چوارەم، ئۆلۆمپیاد و دووەمیان و دووەمی لە هە سێهەمین ساڵێكی ئۆلۆمپیاددا ئەنجام ئەدرێت. و بەرێ ئەكرێت.

ئەم(یەکەمین پاڵنەرە)ش بە مانایەکی ڕەها جۆرێکە لە سەرەتا، هەندێ لە شتەکانیش لە روانگەی((خۆهێزی یان تواناداری kata dunamin))یەوە لە پێشترن،چونکە ئەوەی کە لە ((تواناداری))دا سەرووترە، و ئەوەی ((بەهێزترە))، لە پێشترە، و ئەمە ئەو شتەیە کە بە هاوشێوەی ئیرادە یان هەڵبژاردنی ئەو، شتێکی تر کە لە دواوەیە، پێویستانە لە دواوە دێت، بە شێوەیەك کە ئەگەر ئەو نەیهێنێتە جووڵە(٢٥) ئەم ناجووڵێت، و ئەگەر ئەویش بجووڵێت، ئەمیش ئەجووڵێت، لەم بارەیەوە هەڵبژاردن یان(مەبەست)، سەرەتا(یان سەرچاوەیە)، هەندێ لە شتەکانیش لەروانگەی ڕیزبەندییەوە لە پێش یان لە داوەن، ئەمانە ئەو جۆرە شتانەن کە لەچەندین دووری(یان نێوانی)یەکی نیسبەت بەیەك شتی دیاری کراو، بە پێی یاسایەك جێگیرن، بۆ نموونە لە گروپی خوێنەراندا، خوێنەری دووەم لە پێش خوێنەری یەکەمەوەیە، و لە چەنگدا، تاری حەوتەم لە پێش تاری هەشتەمەوەیە، چونکە لە بارەی یەکەمیانەوە رابەری هەر گروپێك و لە بارەی دووەمیانەوە تاری ناوەراست، سەرەتا یان سەرچاوەیە، کەواتە ئەم شتانە بەم گووتەیە بە ((لە پێشتر یان لە دواتر)) ناو ئەنرێن،٢_ بەڵام بە جۆرێکی تر ئەوەی کە لەروانگەی ناسینەوە لە دواوەیە، (پاشکەوتە) بە شێوەیەکی رەها هەروەك((پێشین=پێشکەوت)) ئەژمار ئەکرێت، و لەمانە ئەوەی کە بە پێی پێناسە (مانا kata ton ;ogon)یە، لە جۆرێکی بەدەر لەوەیە کە بە پێی((پەی بردنی هەستەکی))یە، ((لەسەر بنەمای مانا و تێگەیشتن((گشتایەتیەکان ta katholou)) لە پێشترن و لەسەر بنەمای پەی بردنی هەستەکی ((شتە لاوەکی-بەشەکیەکان)) یان((تاك شتەکان))، بەڵام لەسەر بنەمای ماناش ((دەرکەوت)) لە پێش((ناوەرۆك))ەوەیە، بە شێوەیەك کە((مۆسیقاڕ))(٣٥) لە پێش((مرۆڤی مۆسیقاڕ))ەوەیە، چونکە مانا، بە بێ بەش، ناتوانێت ((گشت holos))ێك بێت، و بەم هەمووەشەوە ((مۆسیقاڕ بوون)) بە بێ بوونی کەسی مۆسیقاڕ ئەگەری نیە.

٣_ هاوکات (( رووداوەکان)) بە شتانێکی((لە پێش و لەدوا)) ناو ئەنرێن، بە شێوەیەك کە((ڕێك بوون)) لە پێش((بە ئاست)) بوونەوەیە، چونکە ئەویان کرداراندێکە لە((هێڵ لە خۆیدا))و ئەمیان کرداراندنێکە ((لە ئاست))ە.کەواتە شتانێکی لەم شێوەیە((پێشکەوت=لە پێش))و((پاشکەوت= لەدوا)) ناو ئەنرێن.

٤_ بەڵام شتانێکیش کە بە پێی سروشت و ناوەرۆك وەك یەکن، واتە ئەوشتانەی کە بوونیان بە بێ شتانێکی تر ئەگەری هەیە، بەڵام بوونی ئەمان بە بێ ئەوان ئەگەری نیە، ئەمە دابەشکاری و جیاکارییەکە کە (( ئەفلاتوون)) بەکاری هێناوە، بەڵام لەوێوە کە(( بوونایەتی یان بوون)) بە چەند جۆرێك ئەوترێت،(٥)یەکەم بابەت و لەبەر ئەمەش

ناوەرۆك، ((پێشکەوتە-لە پێشترە))، و پاشان بە جۆرێکی تر، شتانێك کە ((خۆهێزانە)) یان((کرداریانە)) بوونیان نیە، هەندێك لە شتەکان((خۆ هێزانە)) لە پێشن و هەندێکی تر((خۆ کردارانە)) یان(( بەو پەری هاتنە ئارایی))، وەك چۆن بۆ نموونە ((خۆهێزانە)) وەك: نیوەی (هێڵ) پێش هەمووان هێڵە، و ((بەش)) لە پێش ((گشت))ەوەیە، و ((مادە)) لە پێش(( ناوەرۆك))ەوەیە، بەلأم((خۆکردارییانە)) ((پاشکەوتن-لە دواوەن))(١٠)، چونکە لە دوای چارەسەر کردنی ((گشت))ەوەیە کە ئەمانە ئەتوانن((کردارەکیانە)) بوونیان هەبێت، کەواتە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە هەموو ئەوشتانەی کە ناو ئەنرێن بە((پێشکەوت))یان((پاشکەوت))، لەسەر بنەمای ئەم مانایەی کۆتایی ئەوترێن، چونکە هەندێك لە شتەکان لەوانەیە لەروانگەی پەیدا بوونەوە بە بێ شتەکانی تر هەبن، وەك((گشت)) لە بەرامبەر((بەشەکان))، و هەندێکیش لەروانگەی ((لەناوچوون))ەوە وەك((بەش بە بێ گشت)) و شتەکانی تریش هەربەم شێوەیە.

## "وەرزی دوانزەیەم"

# ( تواناداری یان هێز، ئیمکان )

(١٥) ((هێز یان تواناداری dunamis)) بە مانایەك:١_ سەچاوە(سەرەتا)ی جووڵە یان گۆڕان لە شتێکی تر یان لە هەمان شت، بە مەبەستی شتێکی تر، بۆ نموونە ((هونەری بیناسازی)) ((تواناداری یان هێزێکە)) کە لە خانووە دروست بووەکەدا بوونی نیە، بەڵام هونەری پزیشکی کە ((تواناداریيەکە)) ئەتوانێت لە کەسە چارەسەر کراوەکەدا بوونی هەبێت، بەڵام نەك لەو روانگەیەوە کە چارەسەر بووە، کەواتە بە شێوەیەکی گشتی سەرچاوەی جووڵەو لەناوچوون لە شتێکی تر یان لەهەمان شت بە مەبەستی شتێکی تر،((هێز یان تواناداری)) ناو ئەنرێت (٢٠)،٢_ و شتێکی تر، چونکە لە سەر بنەمای ئەو سەرچاوەیەی کە بە پێی ئەو شتێکی((کارتێکراو))بە شێوەیەك لە شێوەکان((ئەکردارێندرێت)) ئەڵێین ئەوشتە توانای((کرداراندن))ی هەیە، بەڵکو تەنیا ئەگەر ئەم ((کرداراندن))ە گۆڕانێك بە ئاراستەی شتێکی باشتردا بێت،٣_ و هاوکات تواناداری، ئامادەیی بۆ ئەنجامدانی شتێك بە باشی و بە پێی هەڵبژاردن پێوراوە، چونکە هەندێ کات لەبارەی ئەو کەسانەی کە تەنیا بە رێگادا ئەچن، و قسە ئەکەن(٢٥)، بەڵام نەك بە باشی یان لەسەر بنەمای هەڵبژاردن و مەبەستەکەی پێشتر، ئەڵێین کە توانای بە رێگادا چوون یان قسەکردنیان نیە،٤_و لەبارەی ((کارتێکەری))ش یان ((کرداراندن))یش هەربەم شێوەیەیە،٥_ هاوکات تواناداریيەکان، بە هەموو ئەو خەسڵەتە پایەدارانە ئەوترێن، کە بە پێی ئەوان شتەکان بە شێوەیەکی گشتی((کارتێ نەکراو))و((نەگۆڕن))، یان بەئاسانی بۆ شتێکی خراپتر ناگۆڕێن و ناجووڵێن، چونکە شتەکان لەو روەوەی کە شکاو ولار و بە شێوەیەکی گشتی لەناو ناچن کە تواناداڕن، بەڵکو لەو رووەوە کە بەتوانا نین یان شتێکیان کەمە، لە نێوان ئەم شتانەدا ،ئەوانە

((کارتێ نەکراون)) کە بە هۆی تواناداری و بە هۆی توانای خۆیان و بونی شێوازێکی دیاری کراو، بەسەختی و بە ئەستەمی((کاریان تێ ئەکرێت)).

هەنووکە لەوێوە کە (تواناداری)) بەم جۆرە زۆرانە ناوئەنرێت، کەواتە ((توانا)) یان((بەتوانا to duaton)) بەجۆرێك لە جۆرەکان بەو شتە ئەوترێت کە:١_ خاوەنی سەرەتا((سەرچاوە)) و گۆڕان و لەناوچوونە لە شتێکی تر،(٣٥) یان لە هەمان شت، بەمەبەستی شتێکی ترە،٢_ بە جۆرێکی تریش ((بەتوانا)) ئەوەیە کە ئەوشتەی کە لە سەرووی ئەوەوەیە خاوەنی ئەو جۆرە توانایە بێت، ٣_ هەروەها ئەگەر خاوەنی توانای لەناوچوون بۆ شتەکانی تریش بێت، چ بۆ شتێکی باشتر یان خراپتر،(چونکە لەناوچووش وا دێتە بەرچاو کە توانای لەناوچوونە، چونکە ئەگەر توانای ئەمەی نەبوایە لەناو نەدەچوو، بەڵام هەنوکە خاوەنی حاڵەتێکی دیاری کرا و(٥) هۆکارێك و سەرچاوەیەکە بۆ ئەم((کرداراندنە))، هەندێ جار وادێتە بەرچاو کە بەم شێوەیەیە، (واتە بەتواناییە.م.ف) ....)لەو ڕووەوە کە((شتێکی))هەیە، هەندێ کات لەو ڕووەوە کە خاوەنی ئەم شتە نیەو بێ بەشە لێی، بەڵام ئەگەر ((نەبوون)) جۆرێکە لە((هەبوونێتی،خاوەندارێتی(خەسڵەتی پایەدار hexis))، لەو شێوەیەدا هەمو شتێك لەو ڕووەوە کە((خاوەنداری)) شتێکە، بەتواناییە، بەڵام ئەگەر ((نەبوون))، ((هەبوونێتی-خاوەنداری)) نیە، لە هەردووکیان ئەتوانین بە شێوەیەك((هاوبەشی-لەناو)) ناو ببەین، بە جۆرێك کە شتێك بە شێوەیەکی((هاوناوی)) لەو ڕووەوە بە توانایە کە جۆرێك لە((هەبوونێتی)) وسەرچاوەی هەیە، و هەروەها خاوەنی((نەبوونی)) ئەم((هەبوونێتی=خاوەندارێتی))یەیە، بەمەرجێك ئەگەر بوونی ((نەبوون)) ئەگەری هەبێت..!(١٠)، ٤_ دیسانەوە بە جۆرێکی تر،بە شتێك ئەوترێت((بەتوانا)) کە نە شتێکی تر و نەخۆی هەروەك شتێکی تر، خاوەنی تواناداری یان سەرچاوەی لەناوبەری ئەو نەبێت،٥_ هاوکات هەموو ئەم شتانە لەو ڕووەوە بە توانان کە تەنیا بە ڕێکەوت یان دێنە بوون یان نایەنە بوون، یان بە باشی دێنە بوون،چونکە بەدەر لە گیاندارانیش ((بەتوانا))ییەکی لەم شێوەیەش دەست ئەکەوێت، بۆ نموونە لە ئامرازەکاندا، وەك ئەڵێین کە (١٥) هەندێ لە ((چەنگەکان)) توانای ئاواز دروست کردنیان هەیە و هەندێکی تریان نیانە، لە شێوەیەکدا کە((خۆش ئاوان)) نەبن.

((بێ توانایی adunamia)) ((نەبوون))ی تواناداری یان ئەوجۆرە سەرچاوەیەیە کە قسەی لەسەر کرا، یان بە شێوەیەکی گشتی و یان بۆ شتێك کە بە پێی سروشت ئەبێت خاوەنی ((بەتوانایی)) بوو بێت، یان لەکاتێکدا کە سروشتانە ئەبێت خاوەنی بێت،

چونکە بەیەکسانی لەبارەی کورێك وپیاوێك و کچێك، نالْێین کە توانای هێشتنەوەی جۆریان کەمە، هەربەم شێوەیە بە پێی هەر ((بەتواناییەك))((بێ تواناییەك)) لە بەرامبەریەوەیە، هەم بۆ( ئەو تواناداریە) کە بە تەواوی ((پالْنەرە)) وهەم بۆ ئەوەی کە بە باشی((پالْنەر))ە.

هەندێك لە شتەکان لە لایەکەوە بەم مانایەی ((بێتوانایی)) بە بێتوانا ناو ئەبرێن، بەلاْم لە لایەکی ترەوە بە مانایەکی تر، وەك((مومکین dunaton)) و((ناممومکین adunaton)) ئەوترێت، لە چوارگۆشەدا هاوئەندازەیی ((تیرە لەگەلْ لا)) ئەگەری نیە، چونکە شتێکی لەم شێوەیە درۆیە، و دژەکەشی نەتەنیا راست بەلْکو((وەك پێویستیەك)) راستە، کەواتە لەو شێوەیەدا ئەگەر بلْێین کە هاوئەندازەیە، نەتەنیا درۆیە، بەلْکو ((پێویستانە=وەك پێویستیەك)) درۆیە، دژی ئەمەش واتە((مومکین)) کاتێکە کە((دژ)) پێویستانە درۆ نیە، وەك، دانیشتن بۆ مرۆڤێك ئەگەری هەیە،((مومکینە))، بەلاْم ئەوەی کە((دانەنیشتووە)) پێویستانە(وەك پێویستیەك) درۆ نیە، کەواتە، بەو شێوەیەی کە ووترا،((مومکین)) بەلْگەیە لەسەر جۆرێك ومانایەك کە پێویستانە(وەك پێویستیەك) درۆ نیە، و بە مانایەکی تر لەسەر شتێك کە راستە، هەروەها بە مانایەکی تر لەسەر شتێك کە راست بوونەکەی ((رێ پێدراوە))، و لە ئەندازیاریشدا بە شێوەیەکی((خەیالْی و نادیار)) باس لە((توانا)) ئەکرێت.

بەلاْم ئەم مانایەی((مومکین)) لەگەلْ مانای (تواناداریدا)) هاوشێوە نیە،(٣٥) ئەوەی بە پێی ((بەتوانایی)) ناو ئەنرێت، هەمووی بە نیسبەت بەتوانایی یەکەم، لە یەکەمین ماناکەیدا ئەوترێت[1]،

١٠٢٠a

و ئەمە هەمان ((بنەمای)) گۆڕان لە شتێك، یان لە هەمان شت لە جیاتی شتێکی ترە، چونکە شتەکانی تر لەو ڕووەوە ناو ئەنرێن((بەتوانا)) کە شتێکی تر خاوەنی((بەتوانای))یە بەسەر یانەوە، و هەندێك لەو ڕووەوە کە ئەو شتەی تر بە شێوەیەکی دیاری کراو خاوەنی ئەو تواناداریەیە، و هەر بەم شێوەیەیە لە بارەی ((بێتواناییەکانیشەوە taadunata))،کەواتە پێناسەی و باوی ((یەکەمین بەتوانایی- تواناداریێتی)) بەم شێوەیەیە:(٥) بنەمای گۆڕان لە شتێکی تردا، یان لە هەمان شتدا، یان هەروەك شتێکی تر.

---

[1] واتە بنەمای جوولەو گۆڕان، وەك چۆن لە دواییشەوە دێت.

"وەرزی سیانزەیەم"

# ( چەندێتی یان چەند )

((چەندایەتی=چەندێتی))یان((چەند poson))بەو شتە ئەوترێت کە دابەشخوازە بۆ ئەو بەشە بچووکانەی کە لەناویدایە (anuparkhonta)کە هەریەکەیان یان هەر کامیان بە تەنیایی سروشتانە((یەك))ەو یەك((ئەم شتە لێرەدا))یە، بەم شێوەیە((گشتایەتی))ئەگەر شایەنی ژماراندن بێت، چەندایەتیە، و گەورەیش ئەگەر بپێورێت(هەربەم شێوەیە).(١٠)،((گشتایەتی))بە شتێك ئەوترێت کە((خۆهێزانە-هێزەکیانە))دابەش ئەبێت بۆ چەند بەشێکی پێکەوە نەلکاو، و گەورەیی بە شتێك ئەوترێت کە هەر بەو جۆرە(megethos)) لە بەشی پێکەوە لکاوی دابەش بوو پێك دێت، ئەوەی کە لە یەك لاوە لکاوە، درێژەو و ئەوی کە لە هەردوولاوە لکاوە، پانە، و ئەوەی کە لە هەر سێ لاوە لکاوە، پێی ئەوترێت((چاڵی-قوڵی))، و لەمانەش ،واتە، گشتایەتی سنوردار، ژمارەو درێژی سنوردار ، هێڵ و پانی سنوردار ، ئاست و قووڵی سنوردار، تەن دروست ئەبێت.

(١٥) هەربەم شێوەیە چەندایەتیەکان هەندێکیان،((خودیانە-لەخۆیاندا)) پێیان ئەوترێت ((دەرکەوتانە))، بۆ نموونە، هێڵ چەندایەتیەکە لە خۆیدا، بەلاّم ((مۆسیقاپ))دەرکەوتەیە، لە نێوان چەندایەتیە لە خۆکاندا هەندێکیان لەسەر بنەمای چۆنایەتی بەو شێوەیەن، وەك هێڵ کە چەندایەتیەکی هەیە،( چونکە لەو پێناسەیەی کە باس لە چیەتی هێڵ ئەکات، چەندایەتیەکی دیاری کراو بوونی هەیە) و شتەکانی تر،((کرداراندن)) و خەسڵەتەکان یان حاڵەتە پایەدارەکانی ئەو جۆرە ناوەرۆکانەن، (٢٠)

وەك زۆر و كەم، درێژ و كورت، پان و باریك، قوڵ و قۆقز، قورس و سوك وشتگەلێكی تری لەم جۆرە، بەلاّم هەربەم شێوەیە گەورەتر و بچووكتر، هەم كاتێك كە ((لە خۆدا))ن و هەم كاتێك كەلە پەیوەندی یان لە كاتی خرانە سەر یەكدا ئەوترێن، ((كرداراندن))ەكان لەخۆیاندا، چەندایەتین، (٢٥) لە راستیدا ئەم ناوانەش ئەگوازرێنەوە بۆ شتانێكی تر. بەلاّم لەو شتانەی كە((دەركەتانە)) بە چەندێتی ناو ئەنرێن، هەندێك بەو جۆرە مانایە ئەوترێن كە لە بارەی ((مۆسیقاپ)) و((سپی))ەوە گووترا، واتە ئەو شتانەی كە ئەمانە پەیوەستن پێیانەوە،چەندایەتین، هەندێكیش بەم مانایە كە جووڵە و كاتی چەندایەتین، چونكە ئەمانەش هەر بەم چەندایەتی ،و ئەویش چەندایەتی پێكەوە لكاو ناو ئەبرێن، (٣٠) چونكە ئەو شتانەی كە ئەمانە ((كرداراندن))یانن، دابەشخوازن، مەبەستمان لە شتی جوولاّو نیە، بەڵكو ئەوەی كە لەودا و بەهۆی ئەوەوە هاتۆتە جووڵە، چونكە لەوێوە كە ئەو یەك((چەندایەتیە))، جووڵەش یەك ((چەندایەتیە))، و كاتیش لەم ڕووەوە، هەر بەم شێوەیە.(واتە چەندایەتیەكە).

"وەرزی چواردەیەم"

# ( چۆنایەتی_چۆنێتی )

((چۆنایەتی poion)) یە جۆرێك لە جۆرەكان:١_ بە جیاوازی ناوەرۆكۆ ئەوترێت، وەك مرۆڤ كە چۆنایەتیە لە گیانەوەر، لەو رووەوە كە دووپێیە، یان ئەسپ، لەو رووەوە كە چوار پێیە،(٣٥) بازنە چۆنایەتیەكە لە شكڵ، لەو ڕووەوە كە بێ گۆشەیە،بەو شێوەیەی كە لێرەدا، جیاوازی لەروانگەی ناوەرۆكەوە، چۆنایەتیە، كەواتە بە مانایەك،چۆنایەتی بە جیاوازی ناوەرۆك ناو ئەنرێت.٢_ و بە مانایەكی تر، بە شتە نەجووڵاوەكان و بابەتەكانی بیركاری ئەوترێت، بەو شێوەیەی كە ژمارەكان چۆنایەتیەكی دیاری كراون، وەك ژمارە ئاوێتەكان كە نە تەنیا لە یەك ریزدان،(٥) بەڵكو دەرخەرەكەی ئەوان ((ئاست ))و ((تەن))ە،(ئەمانە دەستكەوتی لیكدانەكانن بە توانی دوو ،سێی چۆنایەتیەكانن))بە شێوەیەكی گشتی، چۆنایەتی ئەوەیە كە،لە پاڵ چەندایەتیدا، لە ناوەرۆكدا بوونی هەیە،چونكە ناوەرۆكی هەر ژمارەیەك((یەكجارێتی)) یە، وەك ناوەرۆكی ٦، كە ئەوەی كە دوجار یان سێ جارە، نیە، بەڵكو ئەوەیە كە (یەكجار)ە، چونكە(( ٦)) یەكجار(( ٦))ە،٣_ هەربەم شێوەیە هەمو كرداراندنەكانی ناوەرۆكە جووڵاوەكان، وەك،گەرما و سەرما،(١٠) رەش و سپی،قورس و سوكی و هەموو ئەو شتانەی كە بەم شێوەیەن،كەلە سەر بنەمای لەناوچوونەكانیان ئەڵێین كە((تەنە گۆڕاوەكان))ن. هەربەم شێوەیە ٤_چۆنایەتیەكان لە روانگەی ((باشتری و خراپتری)) و بە شێوەیەكی گشتی لەروانگەی((باش و خراپ))ەوە ناو ئەنرێن.

بەم شێوەیە تارادەیەك بە دوو شێوە ئەتوانرێت قسە لەسەر چەندایەتی بکرێت، کە یەکێکیان ((وردتر))و((راستتره))،یەکەمجار چۆنایەتی ،جیاوازی ناوەرۆکە،(١٥) بەشێك لەو چۆنایەتیە لە ژمارەکاندایە، چونکە ئەمەش جۆرێکە لە جیاوازی ناوەرۆکەکان، بەلاّم یان لەوانەوە کە نەجوولاّون، یان نا، لەو ڕووەوە کە جولاّون، لە لایەکی ترەوە(چۆنایەتیەکان) کردارانـدنی شتە جوولاّوەکانن، لەو رووەوە کە جوولاّون، و هەروەها(لە روانگەی) جیاوازی جوولەکانەوە،((باشتری و خراپتری))یش بەشێکن لە کرداراندنەکان، چونکە پیشاندەری جیاوازییەکانی جولەو چالاکیەکانن،(٢٠) کە بە پێی ئەوان بوونەوەرەکان لە جوولەدا بە شێوەیەکی جوان و بە شێوەیەکی ناشیرین کار تێکەریان(کردار)یان ئەبێت، چونکە ئەوەی کە ئەتوانێت بە شێوەیەکی دیاری کراو بێتە جوولە یان چالاك بێت، باشە، بەلاّم ئەوەی کە بە شێوەیەکی تر و دژ، رەفتار بکات،(واتە ببێتە سەرچاوەی جوولەیەك) بێزراو ناشیرین لە قەلەم ئەدرێت،چاك و خراپ،چۆنایەتی،زیاد لە هەموان لەلای بوونەوەرە خاوەن دەروونەکان پیشان ئەدەن، و لە نێوان ئەم((دەروونداران))ەدا، پێش هەموان لەلای ئەوانەی کە خاوەنی ((سەرپشکین)).

"وەرزی پانزەیەم"

# ( خستنە سەر،یان نیسبەت و پەیوەندی )

((خستنە سەر pros ti))،١_ لە لایەکەوە بەو شتانە ئەوترێت کە وەك پەیوەند، دووبەرامبەر لەگەڵ ((نیوە))و سێ بەرامبەر لەگەڵ ((یەك لە سێ)) و بە شێوەیەکی گشتی چەند بەرامبەر گەورەتر لەگەڵ چەند بەرامبەر بچووکتر، وسەرخەری لەگەڵ سەرخرێنراوی،٢_ لە لایەکی ترەوە شتانێکی وەك گەرم کەرەوە لەگەڵ گەرم بووەوە، ((بڕەر)) لەگەڵ ((بڕاو))(٣٠) و بەگشتی ((بکەر)) لەگەڵ((بکەرێنراو)).٣_ هەروەها پەیوەندی شتانێکی وەك((ئەندازە خوان)) لەگەڵ ((ئەندازە)) و((ناسینەکی لەگەڵ ناسین)) و((هەست پێکراو)) لەگەڵ(( هەست)).

لە بارەی یەکەمینەوە،((خستنە سەر یان پەیوەند)) لە روانگەی ژمارەوە ئەوترێت، ئەویش یان((بە ڕەهایی)) یان لە پەیوەندیەکی سنووردار لەگەڵیدا یان پەیوەست لەگەڵ((یەك)){١} وەك دووبەرامبەر کە لە پەیوەند بوون لەگەڵ ((یەك))دا ژمارەیەکی دیاری کراوە،((چەند بەرامبەر))یش لە روانگەی ژمارەوە لە پەیوەند(پەیوەست)یان ((خستنە سەر ))لەگەڵ ((یەك))دایە، بەڵام سنووردار کردن وەك پەیوەند نیە لەگەڵ ئەم یان ئەو(ژمارە).

پەیوەندی یەك و نیو بەرامبەر لەگەڵ یەك بەرامبەر(٣/٢) لە پەیوەندی لەگەڵ یەك بەرامبەر و یەك و نیو بەرامبەر($2/3=1½$ ) پەیوەندیەکی ژمارەیی سنووردارە لەگەڵ یەك ژمارەدا، بەڵام یەك((گشت)) لەگەڵ یەك((کەرت))دا( کە شێوەیی کەرتەکەی یەکە(١) ، واتە ١+١/x) لە پەیوەندی لەگەڵ هەمان کەرت و ئەوەی کەمترە لەو{ واتە ١+n/n یان

{n/(n+۱} پەیوەندیـەکی(پەیوەسـتیەکی) ژمـارەیی ناسـنووداره(بێسنوره)، وەك چـەند بەرامبـەر نیسبەت بـە یـەك، و پەیوەنـدی((سـەرخەر لەگـەڵ سـەرخرێنراو)) لەروانگـەی ژمـارەوە بـە تـەواوی بـیٚ سـنووره، (٥) چـونکە ژمـاره((نیـسبەت خـوازه)) و ئـەوەی کـە ((نیـسبەت خـواز ))نیـە، پێـی ناوترێـت ژمـاره، لەکاتێکـدا کـە((سـەرخراو)) نیـسبەت بە((سەرخرێنراو)) (بەم ئەندازەیە لە گەڵ شتێکی زیاترە، و((ئەم شتە زیادەیە)) بیٚ سنووره، چونکە هـەرکامیان لـە دوحاڵەتدا بە ڕێکـەوت ئـەتوانن ببن: یـان یەکسان یـان نایەکسان، بەم شێوەیە هـەموو ئـەم(( خستنەسەرانە-پەیوەندیانە)) لەروانگەی ژمارەوە ناو ئەنرێن و کرداراندنی ژمارەن، و هەربەم شێوەیە((یەکسان))و ((هـەروەك -وەکیەك))و ((هەمان)) و هەرکامیان بە جۆرێکی تر(١٠)،چونکە هـەموو ئەمانە لـە پەیوەسـتی لەگـەڵ یەکـدا ئـەوترێن، ((هـەمان-ەکـان tauta)) شـتانێکن کـە ناوەرۆکەکـەیان ((یـەك))ێکـە، ((هەروەکـەکان)) ئەوانـەن کـە چـۆنایەتیەکەیان((یـەك))ێکـە، بـەڵام((یـەك)) سەرچـاوە و پێوەری ژمارەیە، بەو شێوەیەی کە هەموو ئەم پەیوەندانە، لەروانگەی ژمـارەوە ئـەوترێن، هەرچەندە هەموویان بەو جۆرە نا(١٥) بەڵام بکەرەکان بکەرێنراوەکان بە پێـی تواناداری بکـەری یـان بکـەرێنراوی و لەسـەر بنـەمای ((کردارێتیـەکانی ئـەم تواناداریتیانـە)) ناوئەنرێن، وەك شتی گەرم کەرەوە کە پەیوەنـدە بە گەرم بووەوە، و بڕەر پەیوەنـدە بە بڕاوەوە، هـەموان بـەو مانایـەی کە کردارێنـراون، بـەڵام پەیوەنـدە ژمارەییەکان خـاوەنی کرادرێتـی نین، مەگـەر بـەو جۆرەی کـە لـە شـوێنی یەکتریـدا ئەربردرێن، بـۆ ئـەوان(٢٠) کردارێتیەکان لەسەر بنەمای جووڵە بوونیان نیە، لەوشتانەی کە بە پێی ((توانا)) ناویـان پەیوەندە، هەندێك هەربەم شێوەیە لەروانگەی پلـەی دیـاری کـراوەوە بـەو شێوەیەن، وەك پەیوەنـدی ئـەوەی کـە دروسـتی کـردووە لەگـەڵ ئـەوەی کـە دروسـت کـراوە، و پەیوەنـدی ئەوەی کە دروست ئەکات لە گەڵ ئەوەی کە دروست ئەکرێت، هەربەم جۆرەیە کە باوکێك هاوکات بەباوکی کوڕێك ناو ئەبرێت، چونکە یەکێکیان ئەوەیە کە دروست کـراوە وئـەوی تریـان ئەوەیـە کـە بـە شێوەیەکی دیـاری کـراو دروسـت کـراوە ،(٢٥)، هـەر بـەم شـێوەیە هەنـدێك لـە شـتەکان لـە روانگـەی نـەبوونی توانـای پەیوەسـتیەوە وەك((بـیٚ توانـا))و شتانێك کە بەم جۆرە ناو ئەنرێن، وەك ((نەبینراو))،

هەربەم شێوەیە شتانێك کە بە پێی ژمـاره یـان (لەسـەر بنـەمای)) بەتاوانایی پێیان ئەوترێت ((پەیوەندەکان))، هەموویان لەو ڕووەوە پەیوەندن کە((خۆ-بوونی auto ho estin))یەکـەیان ڕێـك لـەجیاتی ئـەم بوونایەتیـە لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ شـتێکی تـردا ناوئـەنرێت، و نـەك لـەو ڕووەوەی کـە شـتێکی تـر لـە پەیوەنـدی دایـە لەگەڵیـدا،

بەلأم((ئەندازە خوان))و((ناسینەکی)) و((بیر لیٚ کەرەوەیی))(۳۰) لەو ڕووەوە پێیان ئەوترێت((پەیوەند)) کە شتێکی تر لەپەیوەندی (پەیوەستی) لەگەڵ خودی ئەواندا ئەوترێت، چونکە((بیر لیٚ کەرەوەیی)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ((بیرێك))هەیە، (کە بیر لەو ئەکاتەوە) ،بەلأم ئەندێشە((بیر)) پەیوەند نیە بەو شتەی کە ئەندێشەی ئەوە، ئەگەرنا لەو شێوەیەدا هەمان شت ئەبێت دووبارە بوترایەتەوە، بەم شێوەیە((بینین)) بینینی شتێکە، و نە تەنیا بینینی ئەوەی کە خاوەنی بینینە،(هەرچەندە ئەم قسەیەش دروستە) بەڵکو لە پەیوەندی یان خستنەسەر ڕەنگێك یان بە شتی تری لەم شێوەیە ئەوترێت، بەلأم بەو شێوەی تر، هەمان شت دووبارە ئەوترایەوە، بینینی ئەوەی کە بینین هی ئەوە!

کەواتە شتانێك کە ((خۆیان لەخۆیاندا kath heauta)) پێیان ئەوترێت (( پەیوەند)) هەندێك بەم جۆرە و هەندێك کاتێك کە ڕەگەزەکەیان لەم جۆرانە بێت، ئەوترێت.(۵) بۆ نموونە پزیشکی لەو ڕووەوە پەیوەندە، ڕەگەزەکەی، واتە زانست، بە ((پەیوەند)) ئەژمار بکرێت، وهەروەها شتانێك هەموویان پەیوەندن، کە خاوەنەکانیان لەسەر بنەمای ئەوان بە پەیوەند ناو بنرێن، بۆ نموونە((بەرامبەر یان یەکسان)) لەو ڕوەوە پەیوەندە کە((بەرامبەر))پەیوەندە، یان((وەکیەکی)) لەو ڕووەوە کە ((وەك یەکی))پەیوەندە.

بەلأم شتەکانی تر دەرکەوتانە پێیان ئەوترێت پەیوەند، وەك مرۆڤێك، کە لەو ڕووەوە پێی ئەوترێت ((پەیوەند)) کە دەرکەوتانە دووبەرامبەری شتێکە،(۱۰) چونکە دووبەرامبەر((پەیوەندە))، یان ((سپی))پەیوەندە، ئەگەر هەمان شت دەرکەوتانە دووبەرامبەر و سپی بێت.

"وەرزی شانزەیەم"

# (کـــــامڵ)

((کامڵ teleion)) بە مانایەك، بەشتێك ئەوترێت کە تەنانەت ((یـەك))بەش لێی، لـە دەرەوەیـەوە بەدەست نایـەت، بـۆ نمونـە کـاتی کامـڵ، ئەوەیـە کـە لەدەرەوەیـەوە کاتێـك بەدەست نایەت کە بەشێك لەم کاتە بێت،(١٥) و هەروەها بە شتێك ئەوترێت کامڵ، کە لـە چاکەو چـاکەکاریدا، لەروانگـەی رەگـەزەوە، هـیچ شـتێك لـە سـەرووێەوە نـەبێت، وەك پزیـشکێکی کامـڵ یـان فلـوت ژەنێکـی کامـڵ، کاتێـك لـە روانگـەی شـێوە زەبردەستەییە(فەزیلەتە) تایبەتەکەی خۆیانەوە، هیچ جۆرە کەم و کورپەکیان نەبێت، بەم شێوەیە لە گوازتنەوەی واژەیەك بۆ مانا خراپەکەی، ئەڵێین((درۆزنێکی کامڵ یان دزێکی کامڵ))،(٢٠) لـەم ڕوانگەیەشـەوە کە ئێمـە ئـەوان بە((بـاش ))ئـەزانین، وەك دزێکی بـاش، یان درۆزنێکی باش.

فەزیلـەت جۆرێکـە لـە ((کـەماڵ))، کاتێـك هـەر یـەکێك شـتێکی کامڵـە، و کاتێـك هـەر ناوەرۆکێك کامڵە، کە لەروانگەی شێوە(جۆر) فەزیلەتە تایبەتەکەی بەشێك لە گەورەییە سروشتیەکەی کەم نەبێت، هەربەم شێوەیە شتانێك کە دەستیان گەیشتۆتە ئامـانجێکی بـەرز و خـوازراو، ناویـان ئـەنرێت ((کامـڵ))، چـونکە شـتەکان لەسـەر بنـەمای بەدەسـت هێنـانی ئامانجێکـەوە کـامڵن، لەبـەر ئەمـە، لـەوێوە کـە ئامـانج، لـە کۆتـایی شـتەکانەوەیە،(٢٥)ئێمـە بـەکار هێنـانی ئـەو واژەیـە بـۆ شـتە بێـزراوو خراپـەکان ئەگوازینەوە، وئەڵێین شتێك بەتەواوی وێران بووە یان بەتەواوەتی لەناوچووە، هەرکاتێك کـە هـیچ کـەم و کورپیـەك لـە لەناوچـوون و ناشـیرینیدا نـەبێت، بـەڵکو لـە کۆتاییـەکانی

سنوری خۆیدا هەیبێت، بەم هۆیەوەیە کە بە شێویەکی نادیارو خەیاڵی کۆتایی ژیان(مەرگ))یش وەك ئامانجێك ناوی ئەهێنرێت، چونکە هەردووکیان شتانێکی ((پاشکەوتین-کۆتایین)بەلام((پاشکەوت))(٢٠)((لەبەر ئەوە to hou heneka))یش ئامانجێکە.

کەواتە شتانێك کە لەخۆیاندا بە کامڵ ناویان ئەبرێت، بەم جۆرە جیاوازانە ئەوترێن، هەندێك لەو ڕووەوە کە لە چاکەدا هیچیان کەم نیە، چونکە نە شتێك لە سەروویانەوە هەیە و نە لە دەرەوەیانەوە شتێك بەدەست دێت، هەندێکی تر لەو ڕووەوە کە بە شێوەیەکی گشتی لەهەریەك لە ڕەگەزەکانی خۆیانەوە((سەرخرێنراو))نین و هیچ شتێك لە دەرەوەیانەوە نیە، بەلام جۆرەکانی تر لەسەر بنەمای ئەمانە ناویان ئەنرێت((کامڵ)).چونکە یان شتێکی لەم شێوەیە دروست ئەکەن یان خاوەنی شتێکی لەو شێوەیەن، یان هەماهەنگن لەگەڵیدا ،یان لەگەڵ ئەو شتانەی کە بە جۆرێکی سەرەتایی پێیان ئەوترێت کامڵ، بە شێوەیەك لە شێوەکان، پەیوەندن.

"وەرزی حەڤدەیەم"

# (كـــــۆتایی، سنـــــوور)

((كۆتـایی peras)) یـان سنوور، بە كۆتـایی لێوارەكـانی هـەر شـتێك ئـەوترێت، واتـە هەم(٥) ((سەرەتایەك))ە كە لـە دەرەوەیـەوە هـیچ بەشێك لێیـەوە بەدەسـت نایـەت، و هـەم ((ســـەرەتایەك))ە كـــە لەناویـــدا هـــەموو بەشـــەكانی بوونیـــان هەیـــە(جێیـــان هەیـە)،هـەروەها(كۆتـایی بـەو شـتە ئـەوترێت) كـە یـان ((شـێوەی-ئایدیـەی eidos)) گەورەیی یان شتێكە كە خاوەنی گەورەییە، هاوكات بە ئامانجی هـەر شتێك ((ئـەوترێت گـەورەیی))،(بـەڵام ئەمـە ئـەو جـۆرە ئامانجەیـە كـە جووڵانـەوەكان و پەرچـدانەوەكان (praxis) بـە((ئاراسـتەی))ئـەون[1]،نـەك لـە ((ئاراسـتەی))ئـەوەوە، بـەڵام هەنـدێ جـار هەردووكیان، واتە هەم بەئاراستەی ئەو هەم لەئاراستەی ئەوەوەن، و هـەم((لەبەر ئەو))، هاوكات ناوەرۆكی((هەر شتێك)) و((چیەتی)) هەر شتێكە، چونكە ئەمە سنووری كۆتایی ((ناسـینێكە-زانـستێكە))،(١٠) و ئەگـەر (سـنوری كۆتـایی) ناسـینە، كەواتـە (سـنوری كۆتـایی) ((شـت))یشە، لەبەر ئەمـە ڕوونـە كـە ڕێك بـە ژمـارەی هـەمان ئەوجۆرانـەی كـە ناویـان ئـەنرێت((سـەرەتا یـان سەرچاوە)) ، بـە ژمـارەی هـەمان ئـەو جۆرانـە ئـەوترێت ((كۆتـایی سـنوور)) تەنانـەت بـە ژمارەیـەكی زیـاتر، چـونكە ((سـەرەتا))جۆرێكـە لە((سنوور)) ،بەڵام هەر سنورێك، سەرەتا نیە.

[1] واتە ماالیە الحركە، نەك ما منە الحركە.

## "وەرزی هەژدەیەم"

## (بە پێی ئەو یان لەسەر بنەمای ئەو، خۆ لە خۆدا، یان( لە خۆ-دا )..)

((بەپێی ئەو kath ho))بە چەندین جۆر ئەوترێت،جۆرێکی، ئەو شێوەو ناوەرۆکەی هەریەک لەشتەکانە،(١٥)بۆ نموونە ئەوەی((بە پێی ئەو))کەسێکی باشە، خودی چاکەیە، بەمانایەکی تر ئەوەی هەروەک((یەکەمین))ە، و شتێک سروشتانە لەودا دێتە بوون، وەک رەنگ لە ئاستدا، بەم شێوەیە،((بە پێی ئەو)) بە مانای یەکەمینی، شێوەیە، و بەمانای دوەمینی، مادەی هەریەک لە شتەکانە کە یەکەمین بابەتی هەر شتێکە، بەگشتی(( بە پێی ئەو)) بەهەمان ژمارەی جۆرەکانی((هۆکار)) بوونە هەیە،(٢٠) بە شێوەیەک کە ئەڵێین،((ئەو بە پێی چی هاتوە؟)) یان (( لەبەر چی هاتووە؟)) یان(( بە پێی چی ئەنجامێکی نادروست یان ئەنجامێکی دروستی بەدەست هێناوە؟)) یان (( هۆکاری پێوانەی دروست یان ئەنجامگر یان پێوانەی هەڵە چیە؟))((بە پێی ئەو)) هەربەم شێوەیە لەسەر بنەمای شێواز ئەوترێت، بۆ نموونە وەک((لەسەر ئەوەی، کە ئەو وەستاوە؟))یان((لەوەدا کە ئەو بە رێدا ئەروات؟)) چونکە هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر شێوازێک یان شوێنێک.

بەم شێوەیە((خۆ لەخۆ-بەخودی خۆی-لەخودی خۆیدا kath hauto)) ئەبێت بە چەندین جۆر بوترێت،١_ جۆرێک لە((خۆ لەخۆ)) چیەتی(ماهیەتی) ((تاک شتەکانە))، بۆ نموونە((کالیاس)) بە خودی خۆی یان((لەخۆیدا)) کالیاس و چیەتی کالیاسە.٢_بەجۆرێکی تر، ئەوەی کە لە((چیەتی ti estin))دا بوونی هەیە، بۆ نموونە ((کالیاس)) لەخۆیدا یان ((خۆ لەخۆ))دا گیاندارە، چونکە گیاندار لەو پێناسەیەدا کە لەو ئەکرێت، ئامادەیە، چونکە کالیاس شتێکی گیاندارە،(٣٠).٣_هەروەها ئەوەی کە

شتێك ئەوی هەروەك یەكەمین چۆنایەتی لە خۆیدا یان لە یەكێك لە بەشەكانیدا قبوڵكردووە، وەك ئەوەی كە، ئاست خۆی لە خۆیدا سپیە، یان مرۆڤ خۆی لەخۆیدا، زیندووە، چونكە دەروون بەشێكە لە مرۆڤ كە هۆكارێكی تری نیە، مرۆڤ خاوەنی هۆكار گەلێكی زۆرە، گیاندار،دووپێ، و ئەوانی تر، بەڵام بە بوونی ئەمە مرۆڤ خۆی لە خۆیدا (یان بەخودی خۆی) مرۆڤە، (٣٥).٥_ هەروەها هەر ئەوەی كە بە شتێك بە تەنیایی، و وەك شتێك بە تەنیایی، پەیوەستە، بەم هۆیەوەشەوە شت((بە جێماو))ش خۆی لەخۆیدا هەیە.

"وەرزی نۆزدەیەم"

# (حاڵەت،شێواز)

((حاڵەت diathesis))رێکخستن و ریزبەندی(taxis) شتێکە کە خاوەنی بەشە، چ لە روانگەی شوێن و چ لەروانگەی تواناداری یان لەروانگەی شێوازەوە، چونکە ئەبێت جۆرێك لە دانان بێت، وەك چۆن لە ناوی ((حاڵەت-شێواز)) ەوە ڕوونە.

"وەرزی بیستەم"

# (هەبوونێتی، خاوەنێتی یان خەسڵەتی پایەدار)

((خــاوەنێتی))یــان خەســڵەتی پایــەدار، بەمانایــەك، جۆرێکــە لــە چــالاکی کەسیاریانەی(٥)خاوەنــدار و شــتی خاوەنــدار، وەك((کردارێـك یـان جووڵـەیـەك)) چـونکە هــەرکاتێك یــەکێك دروســت ئــەکات و ئــەوی تــر دروســت ئــەکرێت، ((دروســت کــردن poiesis)) نێوانیانە، بەم شێوەیە لە لای کەسێك کە خاوەنی پرووپۆشیکە، و پرووپۆشـە خاوەندارەکـە، خاوەنێتیەکـەی نێوانـە، بـەلآم هەنوکـە پروونـە کـە ((بـوونی خـاوەنێتی)) ئەگـەری نیـە، چونکە ئـەم زنجیرەیـە تـا ناکۆتـا بەردەوامـە، ئەگـەر بوونی خـاوەنێتی ئـەو شـتەی کـە خاوەنـدارە، ئەگـەری هـەبێت،(١٠) مانایـەکی تـری ((خـاوەنێتی)) شـێواز یـان حاڵەتێکە کە بە پێی ئەو خۆی خۆش(باش) یان ناخۆش(نا-باش) ئەبینێتـەوە، ئـەویش لەخودی خۆیدا یان لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکی تردا، بۆ نموونە تەندروستی جۆرێکە لە خاوەنێتی، چونکە حاڵەتێکە لەو جۆرەی کە وتمان.

"وەرزی بیست و یەکەم"

# (کـــــــرداراندن)

((کرداراندن pathos)) بە مانایەک:١_بە چۆنایەتیەک ئەوترێت کە بە پێی ئەو ئەگەری گۆڕان هەیە، وەك رەش و سپی، شیرینی و تاڵی، قورسی و سووکی، و هەموو شت گەلێکی لەم جۆرە،٢_بەمانایەکی تر، کردارێتیەکانی ئەم چۆنایەتیانە و ئەو گۆڕانانەی کە پێش ئەوانە ڕوویان داوە، ٣_ هەربەم شێوەیە گۆڕانەکان و(٢٠) جووڵە گەلێکی زیاندار و زیاد لەهەموویان زیانگەلێکی دەردناك،٤_ بە روداوێکی گەورەی دەردناکی خەمناکیش ئەوترێت ((کرداراندن)).

## "وەرزی بیست و دوو"

# ( نــــــــەبـــوون )

((نـەبوون)) بـەجۆرێك،١_ کاتێـك ئـەوترێت کـە شـتێك، ئـەوەی کـە لەسـەر بنـەمای سروشتی خۆی ئـەتوانێت خاوەنی بێت،نـەیبێت، تەنانـەت ئەگـەریش خـودی ئـەم شتە، سروشـــتیانە نـــەتوانێت خاوەنیـــان بێـــت، وەك ئـــەوەی کـــە بووترێـــت گیایـــەك چاوی((نیە))،٢_بە مانایەکی تر، کاتێك کە هەرچەند لەسەر بنەمای سروشت، چ خۆی و چ رەگەزەکـەی بتوانێـت (٢٥) خـاوەنی شـتێك بێـت، و نەبێت،بـە شـێوەیەك کـە مرۆڤـە کوێرەکە بە مانایـەکی تر خـاوەنی بینـایی نیـە هـەروەك مـشکی کوێر،کەچۆن نابینایـە، ئەمیان بەپێی رەگەز و ئەوی تریـان خۆی لە خۆیدا کوێرە ، ٣_هـەروەها لەکاتێکدا کە لەسـەر بنـەمای سروشـتی خـۆی ئـەتوانێت شـتێکی هـەبێت،و نـەیبێت،(چونکە کـوێری جۆرێکە لە نەبوون، بەڵام کوێر نەك بەدرێژایی ژیان، بەڵکو تـەنیا لەتەمەنێکدا کە لەسـەر بنەمای سروشتی ئەبێت خاوەنی بینـایی بێت، کوێرە)(٣٠) هەربـەم شێوەیە کاتێك کە خۆی لـە خۆیدا، یـان لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ شتێکی تردا، یـان لەسـەر بنـەمای سروشـت ئـەبێت خـاوەنی بێـت و نـەیبێت،٤_ هەربـەم شێوەیە رووتاندنـەوەی زۆرەکیانـەی شتێك پێی ئەوترێت ((نەبوون))، لە راستیدا بەو ژمارە بوارانـەی کە ووشـەی((نە یـان نـا))[١] لـە رەتکردنـەوەکان بـەکار دێـت، بەهـەمان ژمـارەش قسە لـە ((نـەبوون))ەکـان ئـەکرێت، بـۆ نموونـە شـتێك لـەو ڕووەوە پێـی ئـەوترێت((نابەرامبـەر)) کـە خـاوەنی ((بەرامبـەری))نیـە،

---

[١] لە یۆنانی و هـەروەها لـە زۆرێك لـە زمانـە ئەوروپاییـەکان((A)) لـە سـەرەتای ووشـە نیشانەی رەتکردنەوەیە و-a privativum ناوئەنرێ، وەك((لا))و((لیس)) لە عەرەبی و((نە))و((نا)) لە فارسی و((نا)) لە کوردیدا.

(هەرچەندە لەسەر بنەمای سروشتی خۆی ئەتوانێت خاوەنی بێت (هەیبێت),,) یان((نەبینراوی)) لەو ڕووەوە(٣٥) بە شتێك ئەوترێت کە بەگشتی((ڕەنگی)) نەبێت، یان((کەم ڕەنگ))بێت، یان((بێ قاچ))، بە کەسێك ئەڵێن کە بە تەواوی قاچی نیە یان((دوو قاچ))ی بێ توانا و کەم وکوڕی هەیە،

١٠٢٣a

هەروەها شتێك کە لە شتێك سودێکی کەمی هەیە، وەك(میوەی)((بێ کاکڵە))هەر بەو شێوەیە ئەوەی کە شتێکی((بە ئاسانی)) یان ((بە باشی)) نیە، وەك((نەبڕ)) نە تەنیا شتێکە کە((نابڕدرێت))، بەڵکو ئەوەیە کە بە ئاسانی یان بە باشی ((نابڕدرێت))ـ و دیسانەوە لەو ڕووەوە کە شتێکی بە هیچ شێوەیەك نیە، چونکە بۆ نموونە کوێر ، ئەو کەسەیە نیە کە یەك چاوە، بەڵکو کەسێکە کە هەردوو چاوەکەی بیناییان نیە،(٥) و بەم هۆیەوەیە کە هەر کەسێك((باش))،((خراپ)) یان((دادپەروەر))، ((نادادپەروەر)) نیە، بەڵکو لەمانەشدا ئاستێکی ((نێوەندی- ناوەراستینە)) هەیە.

## "وەرزی بیست و سێهەم"

# ( خاوەنێتی، پەیوەست بوون )

((خاوەنێتی to ekhein)) بە چەندین جۆر بەکار دێت وئەوترێت:١_بە جۆرێك،پەرژاندنە سەر شتێك بە پێی سروشتی خۆ، یان بە پێی پاڵنەرایەتی و مەیلی خود، لەم ڕووەوە ئەوترێت کە((تا، خاوەنداری مرۆڤ ئەکات))(١٠٩یان(( پێشەوایان خاوەنێتی شاریان هەیە))یان((جبە پۆشەکان، جبەیان هەیە))٢_(خاوەنێتی یان هەبوون) بەمانایەکی تریش دێت وئەوترێت ،کە هەروەك((قبوڵکەر=وەرگر)) لەودا شتێك بوونی هەیە، وەك،برۆنز کە شێوەی پەیکەرێکی لە خۆدا هەڵگرتووە، و لاشە، کە نەخۆشی لەخۆدا هەڵگرتووە،٣_ هەروەها بە جۆرێکی تر،وەك ((لەخۆگر)) کە((خۆگیراوەکان))ی هەیە، چونکە کاتێك کە شتێك لەخۆگری شتێکی ترە، ئەڵێن ئەم بە هۆی ئەوەوە((پارێزراوە))،(١٥) بەشێوەیەك کە ئەڵێن دەفر شلەی لەخۆگرتووە، شار خاوەنی مرۆڤەکانە، و کەشتی خاوەنی مەلەوانەکانە، هەروەها بەهەمان جۆر کە((گشت)) خاوەنی((بەش))ە،٤_ هەربەم شێوەیە ئەوەی کە ((هێڵەرەوەی)) شتێکە لە جووڵەو پەرچدانەوە بە پێی پاڵنەرایەتی و خواستی خۆی، ئەڵێن ئەوی((هەیە))،بۆ نمونە ئەڵێن ستونەکان ئەو بارانەی کە ئەخرێنە سەریان ئەیانهێڵنەوە، یان وەك چۆن شاعیرەکان((ئەتڵەس))[1]یان بە (هێڵەرەوە=پارێزەری)) ئەزانی ئەگەرنا ئەکەوتە سەر

---

[1] Atlas لە ئەفسانە یۆنانیەکاندا بە ناوی ((دێونیکەوەیە)) کە ئەگوترێت بە هۆی بەشداری کردن لە شەری تیتانەکان یان دێوەکان تاوانبار کرابوو، کە تاقی ئاسمان بگرێتە سەر کۆڵ، سەیری((تئۆگرانیا یان لەدایك بوونی خوداکان))بکەن، بەرهەمی((هسیۆدۆس))، دێری ٥١٧.

ئەرز،( بەو شێوەیەی کە هەندێك لە سروشتناسەکانیش باوەریان بەو شێوەیە بوو))بەم مانایەیە کە ئەوترێت((پێك-هێڵەرەوە sunekhon to))ی شتانێك((پێك-هێڵێنراوەکان))ی هەیە، ئەگەرنا وەك بڵێی هەریەك لەوانە بە پێی پاڵنەرایەتی خۆی جیا ئەبێتەوە، بەڵام لە((لە شتێکدا بوون))یشدا هەربەم شێوەیە قسە لە هاوشێوەیی لەگەڵ مانای((هەبوونێتی-خاوەنێتی)) ئەکرێت.

## "وەرزی بیست و چوار"

# ( لە شتێك بوون، یان دروست بوون، خواستگە )

((خواستگە یا لە شتێك بوون to ek tinos einai)):١_بە جۆرێك، بە شتێك ئەوترێت کە شتێك لەوەوە وەك مادەیەك دروست ئەبێت(یان هەیە) و ئەمەش بە دوو شێوەیە، یان بەپێی یەکەمین رەگەز،یان بە پێی((کۆتا جۆر)) بەو شێوەیەی کە مانایەك هەموو شتە تواوەکان لە ئاون، و بە مانایەکی تر بەو شێوەیەی کە ((پەیکەر)) لە(( برۆنز))ەوەیە،٢_بە جۆرێکی تر(٣٠) ئەوەی کە لەوەوە هەروەك یەکەمین سەرچاوەی بە جووڵە هێنەری شتێك، دێتە بوون، وەك ئەوەی {کە بپرسین} :ئەم تێهەڵدانە لە چیەوە بوو؟،{و لە وەڵامدا بووترێت}(( لە جنێو دانەوە))، چونکە ئەمە سەرچاوەی تێهەڵدانەکە بووە،٣_ هەربەم شێوەیە ،بە جۆرێك ئەوەی کە لە تێکهەڵکێشی (تێکەڵەی) مادەوشێوە دروست ئەبێت، بە شێوەیەك کە بەشەکان لە گشت و دێرە شیعرەکانی لە ((ئیلیاد))و خانوو لە بەردە، چونکە((شێوە))ئامانج یان غایەیە، و ((کامڵ)) ئەوەیە کە گەیشتووە بە ئامانج،(٣٥).

١٠٢٣b

٤_ هەروەها بە مانایەکی تر، وەك چۆن شێوە لەبەشەکانی پێك دێت، وەك ((مرۆڤ)) کە لە((دووپێ)) و دەنگەکان لە پیتەکانی ئەلف و بێ، بەڵام ئەمە بەدەر لەو مانایەیە کە پەیکەر لە برۆنزە، چونکە ناوەرۆکی تێکەڵ، لە مادەی هەست پێکراو دێتە بوون، بەڵام شێوەش لە مادەی شێوە دێتە بوون، کەواتە ئەمانە هەندێك لەو جۆرانەن کە ناو ئەنرێن((لە شتێکەوە بوون))،٥_ بەڵام هەندێکیش بەم شێوەیە ناو ئەنرێن، کاتێك کە

یەکێك لەم جۆرانە پەیوەستە بە بەشێك لەمانەوە،وەك ئەوەی کە منداڵ لە دایك و باوکەوەیە،(٥) و گیا لەزەویەوە، چونکە ئەمانە لە بەشێك لەوانەوە پێك دێن،٦( دیسانەوە بە جۆرێکی تر، هەر ئەوە کە لەروانگەی کاتەوە بەدوایەوە دێت، وەك چۆن شەو((لە)) ڕۆژ و زریان((لە)) هەوای ئارامەوە دروست ئەبێت، چونکە یەك لەدوای یەك دێن، هەندێ بوار بەو شێوەیە ناو ئەنرێن، چونکە خاوەنی توانای لەناو چوون (و گۆڕانن) بۆ یەکتری، وەك،ئەو بوارەی کە ئێستە نموونەمان لەسەری هێنایەوە، هەندێکیش لەم ڕووەوە کە لە روانگەی کاتەوە لەدوای یەکەوە دێن، وەك ئەوەی کە بڵێین ((لە)) یەك ئەندازەی بوونی شەو ورۆژدا سەفەریکی(١٠) دەریایی ڕووی دا، واتە لە دوای ئەو(روداوی سەفەرە) ڕووی دا، وە یان جەژنەکانی سارگێلیا((لە)) جەژنەکانی((دیونیسیا))وە سەریان هەڵدا، واتە لەدوای{سەرهەڵدانی جەژنەکانی کۆتایی، بەرپا بوو}

## "وەرزی بیست و پێنجەم"

# ( بـــــەش )

((بـەش meros)).١_بـە جۆرێـك لـە جۆرەكان،بـە شـتێك ئـەوترێت كـە هەرچـۆنێك بێت،ئەتوانرێت چەندایەتی بۆ دابەش بكرێت، چونكە ئەوەی كە لە چەندایەتی هـەروەك چەندایەتی وەرئەگیرێت، هەمیشە بەبەشێك لێی ناوی ئەنرێت، بەو شێوەیەی كە ((دوو)) بە جۆرێك لە جۆرەكان بەشێكە لە((سێ))،(١٥)بە جۆرێكی تر،تەنها بەو بەشانە ئەوترێت ((جـۆری یەكـەم)) كـە ئەنـدازەی(پێوانـە)ی شـتێك ئەكـەن، لـەم ڕووەوەیـە كـە ((دوو))بـە جۆرێـك، بەشـێكە لـە ((سـێ)) و بـە جـۆرێكی تـر نـا،٢_ هەربـەم شـێوەیە ئـەوەی كـە ئەتوانرێت(جۆر))ی-بە بێ چەندایەتی- بۆ دابەش بكرێت، پێیـان ئـەوترێت بەشـەكان، یان لەوەوە تێكەڵ ئەبن،(٢٠)_((گشت))یان شێوەیە یـان خـاوەنی شـێوە_ بـۆ نموونـە لـە گۆیەكی برۆنزیدا، یان لە خشتەكێكی برۆنزیدا، هەم برۆنزەكە بەشـە،(چونكە مادەیەكە كە ((شێوە))ی تێدایە) و هەم گۆشە،٤_ هەر بـەم شـێوەیە لـە مانـا ناسـراوەكەیدا هەریـەك لـەو شـتانەی كـە بەدەسـت هـاتوون، ناویـان ئـەنرێت((بەشـەكانی گـشت))، لـەم ڕووەوەیـە كە((ڕەگەز)) بەبەشێك لە ((جۆر)) ئەزانن، ئەگەرنا جۆر(٢٥)بەشێكە لە ((ڕەگەز)).

## "وەرزی بیست و شەشەم"

## (گشت)

((گشت holon)): ١_بەشتێك ئەوترێت كە لەودا هیچ بەشێك لەوانەی كە سروشتانە پێیان ئەوترێت ((گشت))، كەم نەبن ٢_و هەم لەخۆگرو لەخۆگیراو، بەو شێوەیە كە هەردووكیان یەكێك بن، بەلاّم ئەمە بە دوو شێوە ڕوو ئەدات، یان بەو شێوەیەی كە هەریەك لەمانە(واتە لەخۆگر و لەخۆگیراو) یەك((یەك)) بن، یان بەو شێوەیە كە ((یەك)) لەوانەوە پێك هاتووە، چونكە((گشت بوون to katholou)) و ئەوەی كە بە گشتی پێی ئەوترێت ((گشتێك))(٣٠) بە مانایە((گشتی))یەكە ((لەخۆگری ))شتەكانە، بەو شێوەیە كە بەسەر هەر یەك لە لایەنە بەشەكیەكانەوە هەڵبگیرێت، وهەربەشێك یەكدانە((یەكی))یە، وەك، مرۆڤ، ئەسپ، خودا، چونكە هەموویان لە زیندووەكانن، ئەوەی كە لكێنراو سنوورداریشە (پێی ئەوترێت گشت)، كاتێك كەلە شتە زۆرەكانی ناوی ((یەك))ێتیەك دروست بێت، بەتایبەتی ئەگەر(٣٥) ئەوانە((خۆهێزانە))-نە خۆكردارییانە- لەناویدا بن، لەم نێوانەدا ئەوشتانەی كە لە سەربنەمای سروشت گشتین، زیاتر لە شتانێكی تر پێیان ئەوترێت گشت، كە بە هۆی هوونەر یان پیشەیەكەوە بوونەتە خاوەنی سیفەتێكی لەم شێوەیە، ڕێك بەهەمان جۆر كە لە بابەتی((یەكی))دا قسەمان كرد، لەو ڕووەوە كە ((گشتایەتی)) جۆرێكە لە((یەكایەتی- یەكی)).

١٠٢٤a

٢_ هەربەم شێوەیە لەو چەندایەتیانەی کە خاوەنی سەرەتاو نێوەراست و کۆتایین، ئەوانەی کە((شێوان)) هیچ جیاوازییەکیان بۆ دروست ناکات، ((هەمووان pan)) و ئەوانەی کە (شێواز جیاوازییەکیان) بۆ ئەهێنێتە بوون، پێیان ئەوترێت((گشت))،بەلاّم ئەوانەی کە هەردو حاڵەتە ئەگەری هەیە بۆیان، هەم((هەموو)) و هەم((گشت))یان پێ ئەوترێت، ئەمانە شتانێکن کە لە کاتی گۆڕانی شێواز(یان جێگۆرکێ)، سروشتەکەیان هەمانە (کە بووەو) و هەیە و لە شوێنی خۆیدا ئەمێنێتەوە، بەلاّم شێوەکەیان بەم شێوەیە نیە،(٥) وەك((موم))و((جبە)) چونکە بەوانە هەم ئەگووترێت((هەموو)) وە هەم ئەگووترێت((گشت))، چونکە خاوەنی هەردوو خەسڵەتەکەن، بەلاّم ((ئاو)) و((ئاوشێوەکان)) و هەروەها ژمارەکانیش، پێیان ئەوترێت((هەموو))، ئێمە ناڵێین((گشت ژمارەکان))یان((گشت ئاوەکان)) مەگەر بە شێوەیەکی خەیاڵی و نادیار، شتانێك کە بەم هۆیەوە کە ((یەك))ن، پێیان ئەووترێت((هەموو))، وەك ئەوەی کە بڵێین((هەموو)) ئەم ژمارەیە، یان((هەموو)) ئەم یەکیانە.

"وەرزی بیست و حەوتەم"

# (کەم کردنەوە، شکاو، کەم وکوڕ)

بە هەر ((چەندایەتیەك)) ناوترێت ڕووداوێکی کەمکردوو، یان کەم و کوڕ(kolobon)، بەڵکو خۆی ئەبێت ((بەشخوان)) و((یەك گشت)) بێت، چونکە نە ژمارەی ٢ ،ئەگەر یەکێك لە دوو ((یەك))ی لێوەربگیرێت، کەم ئەکات و کەم و کوڕ ئەبێت،( لەو ڕووەوە کەمکراو((باقی ماو)) هەرگیز بەرامبەر نین) و نە هیچ ژمارەیەك بە شێوەیەکی گشتی( بە شێوەیەك کە کەم کردنەوەو کەم و کوڕی قبوڵ بکات) چونکە ناوەرۆك(١٥) ئەبێت جیگیر بێت و لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە، ئەگەر پیاڵە بشکێت، هاوکات ئەبێت هەریەك پیاڵە بێت، بەلاّم ژمارە ئیدی هەمان ژمارە نیە، بەدەر لەمەش، تەنانەت شتانێك کە خاوەنی بەش گەلێکی ناهاوتان، هەموویان، پێیان ناوترێت کەمکراو یان کەم وکوڕ، چونکە ژمارەش، بە جۆرێك، خاوەنی بەشگەلێکی ناهەماهەنگە، (وەك دوو،سێ) و هەروەها(بەشە) وەکیەکەکان، بەلاّم بە شێوەیەکی گشتی شتانێك کە شێواز هیچ جیاوازییەکیان بۆ ناهێنێتە بوون، وەك ئاوو ئاگر، هیچکامیان کەم وکوڕ نین، بەڵکو بۆ ئەوەی بەم شێوەیە بن، ئەبێت لەروانگەی ناوەرۆکەوە خاوەنی شێواز بن، هاوکات ئەبێت((پێکەوە لکابن))،(٢٠) چونکە((هەنگاوێکی)) مۆسیقی، هەرچەندە پێکهاتووە لە بەشگەلێکی ناوەکیەك و هەروەها خاوەنی شێوازە، بەلاّم نە ئەشکێت و نە کەم وکوڕ ئەبێت، زیاد لەمەش، تەنانەت شتانێکیش کە گشتن، لە ڕێگای لەناوچوونی هەربەشێك لێیانەوە، کەم وکوڕ نابن، بەلاّم بەشە لەناوچووەکان(ون بووەکان) نە ئەبێت لەوانە بن کە بۆ ناوەرۆك گرنگ و زاڵن، و نە لەو بەشانەی کە لە شێوازێکی

(بارودۆخێکدا) جێگیر بوون، بۆ نموونە ئەگەر پیاڵەیەك کوونێکی تێ بووبێت(٢٥) کەم وکوڕ و شکاو نیە، بەڵکو تەنیا لەکاتێکدا بەم شێوەیەیە کە دەستە یان بەشێکی گەورە لێی جیا بوبێتەوە، مرۆڤێکیش هەربەم شێوەیە ئەگەر پارچەیەك گۆشت یان ماسولکە لەدەست بدات پێی ناووترێت((کەم ئەندام))، بەڵکو کاتێك کە بەشێکی دەرەکی و ئەندامێکی دیاری لەدەست بدات، ئەویش نەك هەر ئەندامێك، بەڵکو ئەندامێکی سەرەکی و بنەمایی، کە ئەگەر هەمووی لەناو بچێت ،ئیدی نەیەتەوە، و بەم هۆیەوەیە کە کەسە سەر تاسەکان، پێیان ناوترێت کەم ئەندام.

"وەرزی بیست و هەشتەم"

# (رەگـــــەز، نــــەژاد)

مانای ((رەگەز،نەژاد genos)) لە لایەکەوە:١_ کاتێك ئەوترێت کە لەدایك بوون و دروست بوون(genesis)ی پێکەوە لکاوی شتانێك کە خاوەنی هەمان شێوەن، بەدەست بێت،(٣٠) بە شێوەیەك کە ئەگووترێت:(( تا کاتێك کە نەژاد یان رەگەزی مرۆڤ بوونی هەیە))،واتە:(( تا کاتێك کە دروست بوونی بەردەوامی ئەو بوونی هەیە))، لە لایەکی ترەوە٢_ ئەوەی کە وەك یەکەمین پاڵنەر، شتەکان ئەهێنێتە بوون، و خواستگەیان((واتە بوونگایانە))، لەو ڕووەوەیە کەهەندێك لە نەژادەکان پێیان ئەوترێت((هێلێنیەکان- یۆنانیەکان)) و هەندێکی تر(ئیونیان))، چونکە یەکەمین بەدی هێنەرەکانی (هەریەك لەم دوو نەژادە) یەکێکیان لە((هێلێن)) و ئەوی تر لە((ئیون)) بووە، نەژاد زیاتر بە پێی بەدی هێنەری ((نێر)) ناو ئەنرێت(٣٥)تا بە پێی((مێ))، وەك چۆن هەندێك، نەژادەکەیان ئەبەنەوە سەر((مێ)) ،بۆ نموونە ئەڵێن((جێگرەکانی پورا)) .

١٠٢٤b

رەگەز هاوکات بەو مانایە بەکار دێت کە،(( ئاستی رەگەزی شکڵە خاوەن ئاسستەکان و تەنی رەگەزی شتە تەندارەکانە)) چونکە هەریەك لە شکڵەکان((ئاستێکی لەم شێوەیە)) یان(( تەنێکی لەم شێوەیە)) یە، و ئەمە بابەتی جیاوازییەکانە ،٤_هەروەها ئەوەی کە یەکەمین بەشە لە پێناسەکاندا، و لەبارەی(٥) ((چیەتی ti esti))یەوە ئەگوترێت، رەگەزە، کە جیاوازییەکانی چۆنایەتییان پێ ئەوترێت، بەم شێوەیە رەگەز بە هەموو ئەم جۆرانە ئەگوترێت: هەندێك لەروانگەی دروست بوون و لەدایك بوونی پێکەوەلکاوی

هەمان جۆر، و هەندێك لە روانگەی یەكەمین جوولێنەر لە هەمان جۆر، و هەندێك لە روانگەی مادەوە، چونكە ئەوەی كە خاوەنی جیاوازی و چۆنایەتیە، ((بابەتە)) كە ئێمە پێی ئەڵێین((مادە)).

شتانێك كە رەگەزانە پێیان ئەوترێت جیاوان، كە(١٠) یەكەمین بابەتیان جیاوازە، و یەكێك لەوی تردا یان هەردووك لە یەك و هەمان شتدا ناتوێنەوە، وەك شێوەو مادە كە رەگەزانە جیاوازن، هەروەها هەموو ئەو شتانەی كە بە پێی شكڵی گووتە جیاوازەكان لە بارەی((بوونەوەر))ەوە ئەگووترێن، چونكە هەندێكیان بەڵگەن لەسەر((چیەتی)) بوونەوەرەكان، و هەندێك لەسەر((چۆنایەتی)) و هەموو ئەوەی كە پێشتریش دیاری كرابوو، چونكە(١٥) ئەوانە نە لەناو یەكتریدا شی ئەبنەوە( ئەتوێنەوە) نەك لە شتێكی تردا.

"وەرزی بیست و نۆیەم"

# ( درۆ یان درۆیینە )

((درۆ یـــان درۆیینـــه to pseudos))بـــه جۆرێـــك لـــه جۆرەكـــان بـــەم شـــێوەیە دەرئەبردرێت:((شتێکی درۆیینـە)) لـەو ڕووەوە کە هەندێك لـە شتەکان ڕێك نەکـەوتوون یان ئەگەری ڕێککەوتنیان نیە، (وەك ئەوەی کە ئەوترێت:(( هێلی تیرە، لـه چوارگۆشـەدا ،گوونجاوە یان هاوئەندازەی لاکەیەتی))(٢٠) یان(( تۆ دانیشتووی.))چونکە ئەو دانەیە هەمیشە درۆیە و ئەمەشیان لە کاتە دیاری کراوەکاندا، چونکە بەم شێوەیە هـەردوکیان ((بوونیان نیە))، شتانیکیش لە(( بوونەوەرەکان))ن، بەلاًم لەسـەر بنـەمای سروشتەکەیان یان ئەوەی کە هەن، بەدیار ناکەون، یان بەو شێوەیەی کە نین دەرئەکەون، وەك سێبەری ڕوناك دیار، یان خەونەکان، چونکە ئەمانە لە ڕاستیدا شتێکن، بـەلاًم نـەك ئەوشتەی کە وێناکردنەکـەی ئـەوان دروسـت ئـەکات، کەواتـە شـتەکان بـەم شـێوەیە پێـان ئـەوترێت ((درۆیینـــە))،(٢٥) یـــان لـــەو ڕووەوە کـــە خۆیـــان بوونیـــان نیـــە، یـــان لـــەو ڕووەوە کـــە وێناکردنەکەیان بەدەرە لەوەو پەیوەستە نیە بو بوونەوەرێکی ڕاستەقینەو واقعیەوە.

گوتەی درۆ ئەوەیە کە، هەرەك درۆ، پەیوەست بێت بەوشـتانەی کـە((نین)),(نـەبوو)، لەبەر ئەمە هەر گوتەیەك کە پەیوەست بێت بە شتێکی ترەوە، بەدەر لەوەی کە پەیوەستە پێیەوە، پێی ئەوترێت ((درۆ))، وەك پێناسەی بازنە کە لـەبارەی سێگۆشـەوە درۆیـە، بەم شێوەیە لە ڕوانگەیەکەوە بۆ هەریەکە لە شتەکان تەنها((یەك))مانا (یان پێناسە) بەدەست دێت، کە ئەویش پەیوەستە بە((چیەتی))یەوە، بەلاًم لە لایـەکی تـرەوە،(پێناسـە )گـەلێکی زۆر و جۆراوجـۆریش ئـەدرێن بەدەسـتەوە(٣٠) چـونکە خـودی شـتەکە و هـەمان شـتی

بکەرێنراو((کردارێنراو) بە جۆرێك لەجۆرەکان یەك شتن، وەك((سوقرات))و((سوقراتی مۆسیقاپ))، بەلاّم مانای درۆیینە بە ڕەهایی مانای هیچ شتێك نیە، لەبەر ئەمە بڕواکەی ((ئانتیس سینێس)) گێلانەیە(کە باوەڕی بەم شێوەیەیە) کە پێناسەی هیچ شتێك شایستە نیە جگە لە ڕێگای ((واژە تایبەتەکەیەوە))،واتە ناوێك بۆ شتێك(یەك ناو بۆ یەك شت) و لەوەوە ئەم ئەنجامە بەدەست دێت کە هیچ ((ناهاوتاگۆیی)) یەك بوونی نیە، و تا ئەندازەیەك هیچ جۆرە ((هەڵە گووتن))ێك ئەگەری نیە، بەلا ّم لە واقعدا هەریەك لە شتەکان ئەتوانرێن، نەتەنها بە یارمەتی ماناکەی خۆیانەوە، بەڵکو لە ڕێگای مانای شتێکی ترەوە بەیان بکرێن، ئەویش بە شێوەیەکی(( تەواو)) درۆییانە، بەلا ّم هاوکات بە شێوەیەکی ڕاستیش، وەك چۆن ئەتوانین هەشت بە هۆی مانا دوو، ناو بنێین یەك ((دووبەرامبەر)).

١٠٢٥a

کەواتە شتەکان بەم جۆرە بە ((درۆ یان درۆیین)) ناویان ئەبرێت، بەلاّم کەسێکی درۆزن، کەسێکە کە بە ئامادەیی و هەڵبژاردنی ئەنقەستانەی، قسەگەلێکی لەو شێوەیە ئەکات، ئەویش نەك بە هۆیەکی تر، بەڵکو تەنیا لەبەر ((درۆ کردن)) و هەروەها کەسێکە کە بەدی هێنەری ئەو شێوە چەمك و مانا درۆیینانەیە لەلای ئەوانی تر، (٥) بە شێوەیەك ئێمە بەو شتانە ئەڵێین ((درۆیینە)) کە وێنایەکی (((درۆیینە)) دروست ئەکەن، لەبەر ئەمە، بەڵگەیەکیش کە لە((هیپیاس))دا هاتووە، کە(( هەمان مرۆڤ هەم درۆیە هەم ڕاستیە)) خەڵەتێنەر و ڕێ وون کەرە، چونکە کەسێك بە درۆزن ئەزانێت کە توانای خەڵەتاندنی هەیە،(واتە دانا و تێگەیشتووە) و هەروەها کەسێك کە بە خواستی خۆی خەراپە ئەنجام ئەدات بە باشتر ئەزانێت( تا کەسێك کە خۆنەخوازانە خەراپە ئەنجام ئەدات)[1] ئەمە بە درۆزانینێکە لە ڕێگای ((ئیستقراوە))، (١٠) چونکە کاتێك کە ئەڵێت کەسێك کە بە خواستی خۆی ئەلەنگێت، بەهێزتر و باشترە لە کەسێك کە خۆنەخوزانە ئەلەنگێت، مەبەستی لە لەنگین، لاسایی کردنەوەیەتی، ئەگەر نا کەسێك کە بە خواستی خۆی لەنگە، لەوانەیە خراپتر بێت، هەمان جۆر لە مەسەلە ئەخلاقیەکانیشدا بەم جۆرەیە[2].

[1] سەیری دیالۆگی هیپیاسی بچووك، بەرهەمی ئەفلاتوون، ٣٦٩-٣٦٥، و بەتایبەتی ٣٦٧c.

[2] سەیری((شیکردنەوە پاشینەکان یان دووەمینەکان)) ٤١ و ٢٢- ٧٥a١٨ و ١٦-٧٦b١١.

"وەرزی سێ"

# (دەرکـــــــەوت)

((دەرکەوت))۱_ بەو شتە ئەڵێن کە پەیوەست ئەبێت بە شتێکەوە و بە راستی لە بارەی ئەوەوە ئەگوترێت،(۱۵) بەڵام نە وەك پێویست ونە بەشێوەیەکی ئاسایی، وەك کەسێك کە لە حاڵەتی هەڵکەندنی چاڵێکە بۆ گیایەك،(و لەناکاو) گەنجینەیەك بدۆزێتەوە، ئەم مەسەلەیە(واتە دۆزینەوەی گەنجینەکە) بۆ ئەوەی کە چاڵێك هەڵئەکەنێت ((دەرکەوتە))، چونکە ئەوە نە پێویستانە ئەنجامی ئەوەیە وە نە بەدوایەوە دێت، و نە ئاساییانە کەسێك کە گیایەك ئەنێژێت، گەنجینەیەك ئەدۆزێتەوە، مۆسیقارێك لەوانەیە سپی بێت،(۲۰) بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە نە وەك پێویستیەك و نە ئاساییانە ڕوو ئەدات، ئێمە پێی ئەڵێین((دەرکەوت))، لەبەر ئەمە لەوێوە کە شتێك هەیەو و لە شتێکدایە، و هەندێك لەو لە شوێنێك و و لەکاتێکدا پەیوەست ئەبێت بە شتێکەوە،(بەڵام نەك بەو هۆیەوە کە((ئەم شتە todi)) بووە، یان ڕێك هەنوکە ولێرەدایە) ئەوشتە دەرکەوتێك ئەبێت،((مەسەلەی دەرکەوتانە))(۲۵) خاوەنی هۆکارێکی دیاری کراو نیە، بەڵکو هۆکارێکی ((لەناکاوی-لەپڕی)) هەیە، ئەمیش دیاری نەکراوە، چوون بۆ((ئایگینا)) بۆ کەسێك کە ئەگاتە ئەویێ مەسەلەیەکی لەناکاوە، (لە پڕە)، ئەگەر نا بەو هۆیەوە کەیشتبێتە ئەویێ کە وویستوویەتی بڕوات بۆ ئەویێ، بەڵکو لەو ڕووەوە(ڕێرەوەکەی چوبێتە سەر ئەویێ)) کە بە هۆی زریانەوە لە کەشتیەوە کەوتبێتە سەر کەنار یان لە لایەن جەردەکانەوە گرفتار بووبێت، ((دەرکەوت)) لەم کاتەدا، هاتۆتە

بوون و((هەیە))، بەڵام نەك بە پێی خۆی، بەڵکو بە پێی شتێکی تر، چونکە زریان هۆکاری ئەوە بووە، کە ئەو بە شتێك بگات کە بەرەو ئەویَ نەچووە، واتە بەرەو((ئایگینا)).

(٣٠) ٢_ دەرکەوت بە جۆرێکی تریش ئەوترێت، وەك هەر ئەوەی کە بە شتێك-لەخۆیدا- پەیوەست ئەبێت، بەڵام لە ناوەرۆکی ئەودا بوونی نیە، وەك بوونی دوو گۆشەی وەستاو بۆ سیَ گۆشە، ئەو جۆرە دەرکەوتانە لەوانەیە هەمیشەیی بن، بەڵام جۆرەکانی تر (بەم شێوەیە نین)، لە شوێنێکی تردا، لەم بارەیەوە ،قسەمان کردووە.

"وەرزی یەکەم"

# ( فەلسەفەی یەکەمین، یان فەلسەفەی سەرەتایی، دانایی )

(٣) ڕوونە کە ئێمە بەدوای ((بنەماکان و هۆکارەکانی بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) کەوتینە گەڕان، چونکە تەندروستی و باش بوون(euexia) هۆکارێکیان هەیە، و شتەکانی بیرکاری(٥) یش خاوەنی بنەما و توخم و هۆکار گەلێکن، و بە شێوەیەکی گشتی هەر زانستێکی ئەندێشەیی و ئەقڵی، و هەرشتێك کە ئەندێشە لەودا بەهرەیەکی هەیە- چ بە شێوەیەکی وورد و تێرو تەسەل تر، چ بە شێوازێکی سادە- لە لێواری بنەماکان و هۆکارەکانەوەیە، بەلاّم هەموو ئەم(زانستانە) فلاّن((بوونەوەر-ببو)) و فلاّن((رەگەن)) on ti, genon ti)) دیاری ئەکەن و سەرقاڵی ئەوە ئەبن، بەلاّم نە((بوونەوەر))بە شێوەیەکی ڕەها یان((هەروەك بوونەوەر hei on))(١٠) و هیچ جۆرە قسەیەك لە بارەی ((چیەتی)) ناهێنێتە ئاراوە، بەڵکو بە دەست پێکردن لەو، هەندێك لە رێگای پەی بردنی هەستەکیەوە ڕوونی ئەکەنەوە(دەری ئەخەن) و هەندێکی تریش((چیەتی)) بە گریمانەیەکی یەکلاکەرەوە ئەژمار ئەکەن، و بەم شێوەیە ئەوشتانەی کە خۆیان لە خۆیاندا پەیوەستن بە رەگەزەوە و سەرقاڵیانن، بە شێوەیەکی((سەپێنراوتر)) یان بە شێوەیەکی نەرمە بڕانە، ئەگریمێنن، لەبەر ئەمە ڕوونە کە لە ئیستقرایەکی لەم شێوەیە، نە لە بارەی ناوەرۆکەوە(١٥) و نە لە بارەی((چیەتی))یەوە هیچ گریمانەیەك بەدەست نایەت، بەڵکو جۆرێکی ترە لە ڕوونکردنەوە، بەم شێوەیە لەم بارەیەشەوە ئەو ناوەرۆکەی کە پەرژاویانەتە سەری ، و

ئایا((هەیە)) یان((نیە)) هیچ شتێك نالێن، چونكە هەر لەم ئەندێشەیەوە دێت كە((چیەتی))و((ئایا هەیە ei estin)) ڕوون بكاتەوە، هاوكات لەوێوە كە زانستی سروشتیش خۆی سەرقاڵی ڕەگەزێك لە ((بوونەوە=بوون)) ئەكات،(چونكە توێژینەوەكەی ئەو لەبارەی ئەو جۆرە ناوەرۆكەیە(٢٠) كە سەرچاوەی جووڵە و وەستان لەناو خۆیدا بەدەست دێت)[1] ڕوونە كە زانستێكە نە كردارییانە و نە پێكهێنەرانە، چونكە سەرچاوەی شتە دروستكراوەكان و خۆدروستكەرەكانە، كە یان ئەقڵە یان هوونەر و یان جۆرێك لە بەتوانایی، و سەرچاوەی ((ئەنجامدراوەكان))ە لە((ئەنجامدەر))دایە، كە هەمان سەرپشكی یان هەڵبژاردنی پێوانە كراوە، چونكە ئەوەی كە ((ئەنجامدراوە)) و ئەوەی كە((هەڵبژێراوە)) یەكێكە،(٢٥) لەبەر ئەمە ئەگەر هەر ئەندێشەیەك(dianoia) یان كرداری یان دروستكەر(پێكهێنەر)، یان تیۆرییە، كەواتە زانستی سروشتی جۆرێكە لە زانستی تیۆری ، بەڵام بڕوا لەبارەی ئەو جۆرە((بوونەوەر))ەی كە ئەتوانێت بجووڵێت، و هەروەها تەنیا لەبارەی ئەو جۆرە ناوەرۆكەی كە بە پێی پێناسە- یان لەسەر بنەمای مانا(واتە لەسەر بنەمای شێوە) بە زۆری لە مادە جیا نیە، بەڵام لێرەدا، نابێت ئەوە لەبەر چاو نەگرین كە((چیەتی)) و پێناسە چۆنە، چونكە بە بێ بوونی ئەمە(٣٠) توێژینەوە ناتوانێت هیچ ئەنجام بدات.

بەڵام لە نێوان پێناسە كراوەكان(ناسێنراوەكان) و شتە پەیوەستەكان بە((چیەتی)) لە مەسەلەگەلێكی وەك((پان بینی)) و ((نێوان لایی))دایە، جیاوازی ئەمانە لەوەدایە كە((پان بینی)) شتێكی كۆبووەوەیە لە گەڵ مادەدا، بەڵام ((نێوان پوكی)) بە بێ مادە هەست پێكراوە، هەنووكە ئەگەر هەموو شتە سروشتیەكان بە هەمان شێوەی ((پان بینی)) ناوبنرێن، وەك لووت،چاو، دەم و چاو، گۆشت، ئێسقان، و بە شێوەیەكی گشتی،گیانداران، و هەروەها گەڵا و ڕەگ، و توێكڵ، و بە گشتی گیا،(چونكە هیچ یەك لەمانە بە بێ جووڵە((پێناسە-مانا)) یان نیە، لەو شێوەیەدا دەرئەكەوێت كە شتە سروشتیەكان چۆن ئەبێت توێژینەوەیان لەسەر بكرێت و بناسێنرێن(٥)، و بە چ هۆیەك سروشتناس لەبارەی ((دەروون))و لەگەڵ ئەوەشدا- تا ئەو شوێنەی كە ئەم دانەیە بە بێ مادە بوونی نیە-ئەبێت تا ئەندازەیەك تێڕوانینی هەبێت.

---

[1] بەراوردی بكەن لەگەڵ ئەوەی كە ئەرستۆ لە شوێنێكی تردا، لە پێناسەی شتە سروشتیەكان، ئەڵێت: ((چونكە هەموو بوونەوەرە سروشتیەكان، وادێتە بەرچاو كە لە ناو خۆیی شتەكاندا خاوەنی بنەمای جووڵەو وەستانن،)) (لە لێوارەكانی سروشت)) ، كتێبی دووەم، وەرزی یەكەم، ١٩٢b٨) و هەروەها ئەوەی كە لە بەرهەمە هەنووكەییەكەدا، هەیە، كتێبی پێنجەم،وەرزی چوارەم، ١٠١٥a٧ ئەگووترێت.

لەبەر ئەمە، لێرەوە ئەتوانین پەی ببەین کە((فیزیا))ش جۆرێکە لە زانستی تیۆری. بەلاّم زانستی بیرکاریش تیۆرییە، بەلاّم ئەوەی کە ئایا لەگەڵ شتە نەجوولاّوەکان و جیا لە مادەکان پەیوەندی هەیە، هەنوکە هێشتا ڕوون نیە، بەلاّم ئەوەی کە هەندێك لە لقەکانی بیرکاری توێژینەوەی شتانێکی نەجوولاّو و جیا لەمادە ئەکەن،(١٠) ڕوونە. ((بەلاّم گەر شتێك هەیە هەمیشەیی بێت، نەجولاّو جیایە لە مادە، ڕوونە کە ناسینی ئەوە، ئیشی زانستێکی نەجولاّوە، بەلاّم بە دڵنیاییەوە نە ئیشی زانستی سروشتیە،(چونکە فیزیا پەیوەندی بە شتە جوولاّوەکانەوە هەیە) و نە ئیشی بیرکاری، بەڵکو ئیشی(زانستێکە) کە لە پێش هەردوکیانەوەیە، چونکە زانستی سروشتی لەگەڵ شتانێکی جیا لە مادە، بەلاّم نەجوولاّو، پەیوەندی هەیە)) هەندێ لە(١٥) لقەکانی زانستی بیرکاریش ئەپەرژێنە سەر شتانێکی نەجوولاّو، بەلاّم شتانێکی(نەجوولاّو) کە تارادەیەکی زۆر جیا نین لە مادە، بەڵکو لەناو مادەدان، بەلاّم((زانستی یەکەمین)) سەرقاڵی شتانێکە کە جیان لەمادەو نەجوولاّون. هەر بەو شێوەیە کە هەموو هۆکارەکان ئەبێت جاویدان بن، بەلاّم لە پێش هەموویانەوە، و بە تایبەتی ئەمانە، چونکە ئەمانە ((هۆکاری شتە ڕوونە خوداییەکانن)).

لەبەر ئەمە((فەلسەفەی تیۆری))بریتیە لە سێ جۆر:(( بیرکاری، و سروشت، و خوداناسی)) چونکە بە دڵنیاییەوە(٢٠) ئەگەر((خودایەتی)) لە شوێنێکدا بوونی هەیە، لە سروشت گەلێکی لەم شێوەیەدایە،{ واتە لە مەسەلە گەلێکی جیا، و جیا لە مادە.و.ف} ((هەروەها بەرێزترین زانست ئەبێت لەبارەی بەرێزترین ڕەگەزەوە بێت)) کەواتە زانستە تیۆرییەکان ئەبێت لە سەروی زانستەکانی ترەوە بن، ئەم زانستە((خوداناسی)) لە سەرووی زانستە تیۆریەکانەوەیە، چونکە ئەتوانین ئەم گومانەمان هەبێت کە ئایا((فەلسەفەی یەکەمین ،گشتیە)) یان ئەوەی کە لە بارەی(( یەك ڕەگەزی دیاری کراو یان یەك جۆر سروشتەوەیە؟))چونکە لە زانستەکانی بیرکاریشدا(٢٥) جۆر و شێوە یەکێك نیە، بەڵکو ((ئەندازیاری و ئەستێرەناسی لە بارەی سروشتێکی دیاری کراوەوەن، و ((بیرکاری گشتی)) لە هەموویاندا هاوبەشە،(( هەنوکە ئەگەر یەك ناوەرۆکی تر لەپاڵ ئەوانەی کە سروشتیانە لە پاڵ یەکدا کۆبونەتەوە، بەدەست نەیەت، لەو شێوەیەدا زانستی سروشت(فیزیا)ئەیتوانی ((زانستی یەکەمین-یەکەم)) بێت..)) بەلاّم ئەگەر یەك ناوەرۆکی نەجولاّو بوونی هەیە، کەواتە(ناوەرۆك) ، لە پێشترەوەیە، و زانستی ئەویش(( فەلسەفەی یەکەمینە))(٣٠) کە((فەلسەفەی گشتیە))، چونکە یەکەمینە، و ئەرکی ئەویش توێژینەوەو پێداچوونەوەیە لەبارەی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر on hei on))، و هەم((چیەتی)) یەکەی و هەم شتە پەیوەست و پەراوێزەکان(ta hupakhonta )ی ئەو(( بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))ە.

## "وەرزی دووەم"

# ( مانای (( بوونەوەر )) ، دەرکەوت )

بەڵام چونکە ئەوەی کە ناوی((بوونەوەر بە شێوەیەکی ڕەها))یە، بە جۆرگەلێکی زۆر بەکار ئەهێنرێت، کە یەکێك لەوانە((دەرکەتانە)) و ئەوی تر بە مانایەکی راستەقینە(یان راست) بوو،(٣٥) و ((نەبوو-نابوونەوەر)) بەمانای درۆیینە یان درۆ بوو، و هەروەها لە پاڵ ئەمانەشدا، شێوەکانی گووتار (وەك ((چی))، ((چۆن))، ((چەند))، ((شوێن))، ((کات))، و هەر شتێکی تر کە بەڵگەیە لەسەر ئەم جۆرە) بوونیان هەیە، و دیسانەوە لە پاڵ ئەمانە، ((خۆهێن)) و ((خۆکردار))یش جێگرن، کەواتە لەوێوە کە(( بوونەوەر) بە چەند جۆرێك بەکار ئەهێنرێت، یەکەمجار لەبارەی (بوونەوەر)((دەرکەوتانە)) ئەبێت بڵێین کە هیچ جۆرە توێژینەوەو تێڕوانینێکی زانستی پەیوەست نابێت پێیەوە، نیشانەو بەڵگەی ئەویش ئەوەیە کە(٥) هیچ زانستێك، چ کرداری،چ پێکهێنەر، و چ تیۆری، سەرنجێکی بۆ ئەو نیە، چونکە پێکهێنەری خانوویەك، هەموو ئەوشتە دەرکەتانەی کە بۆ دروست کردنی خانوو پێویستن، دروست ناکات، چونکە ئەوانە ناکۆتان، بەڵام هیچ شتێك نابێتە بەربەست لەوەی کە خانوی دروست کراو، لای هەندێ لە کەسەکان خوازراوە، و لای هەندێك نەخوازراوە،و بۆ هەندێکیش سودمەند(ئەبێت)، و وا خۆی دەربخات کە وەك بڵێی، لەگەڵ هەموو بوونەوەرەکانی تردا جیاوازە،(١٠) بەڵام هونەری بیناسازی دروستکەری (پێکهێنەری) هیچ یەك لەمانە نیە،بەم شێوەیە،((ئەندازیار))یش توێژینەوە لەسەر دەرکەوتەی شکڵەکانی خۆی ناکات، کە ئایا سێگۆشە بەدەر لە سێ گۆشە، خاوەنی دوو گۆشەی وەستاویشە، و ئەمەش مەسەلەیەکی هەماهەنگە لەگەڵ شێوەیەکی ئەفلاتونیدا، چونکە ((دەرکەوت)) وەك بڵێی جۆرێك لە ((ناوە))،هەر لەبەر ئەم هۆیە((ئەفلاتوون)) لەروانگەیەکەوە خراپی نەکردووە، کە ئیشی((سۆفستاییەکانی))

بە((پەرژانە سەر نەبوو-نابوونەوەر)) دیاری کردبوو،(١٥) چونکە ئەتوانی بڵێیت کە قسەی سۆفستاییەکان لەپێش هەموو شتێکەوە لەبارەی دەرکەوت بوو، وەك ئەوەی کە: ئایا((مۆسیقاپ)) و(( شێواز زان)) و((کوریسکوسی مۆسیقاپ)) و((کوریسکوس)) جیاوازن یان هەمانن، و ئایا ئەوەی کە هەیە-بەلاّم هەمیشە نەبوو-بووە(بوێنراوە) ؟ بەشێوەیەك کە ئەگەر((مۆسیقاپ))، بووە بە((شێواز زان))،(٢٠) هاوکات بە شێوەیەکی(شێواز-زانانە)((بووە بە مۆسیقاپ)) و هەمو بەڵگەکانی تریش هەر لەم جۆرەن، لەراستیدا وا ئایەتە بەر چاو کە((دەرکەوت)) نزیکە لە ((نەبوو-نابوونەوەر))ەوە، بەڵگەکانی ژێرەوە ئەم خاڵە ڕوون ئەکەنەوە، شتانێك کە بەشێوەیەکی تر((بوونەوەرن-هەن))خاوەنی دروست بوون و لەناوچوونن، بەلاّم شتانێك کە دەرکەوتانە((هەن-بوونەوەرن)) بەو شێوەیە نین، بە بوونی ئەمەش، تا ئەو شوێنەی کە ئەگەری هەیە ئەبێت دیسانەوە لەبارەی((دەرکەوتەیی)) قسان بکەین (٢٥) کە: سروشتی ئەو چیە وبە چ ((هۆیەکەوە هەیە)) لەوانەیە لە هەمان کاتدا ڕوون بێتەوە کە بە چ هۆیەك زانستێك نادۆزرێتەوە کە بیپەرژێتە سەری.

کەواتە، لەوێوە کە لە نێوان ئەوشتانەدا کە هەن، هەندێك هەمیشە و پێویستانە بەو شێوەیەن کە هەن،(پێویستی .نەك بە مانای سەپاندن و و زۆر، بەڵکو بەو مانایەی کە ئەگەری ئەوە نیە شتێك بە شێوەیەکی تر بێت) و هەندێك نە پێویستیانە و نە هەمیشە، بەڵکو لە(٣٠) زۆربەی کاتەکاندا بەو شێوەیەن، ئەم((بنەما))یەو ئەم((هۆکار))ی بوون، دەرکەوتە ،چونکە ئەوەی کە نە هەمیشە و نە لە زۆربەی بوارەکان(کاتەکان)دا بوونی هەبێت، ئەڵێین ئەو شتە(دەرکەوتە)، بۆ نموونە ئەگەر لە ڕۆژەکانی هەڵهاتنی ((ئەستێرەکانی سیرۆن)) زریان و سەرما دروست بێت، ئەوە بە ڕوداوێکی لەناکاو ئەژمار ئەکەین، بەلاّم وا ناکەین کە گەرمایەکی سووتێنەر و خنکێنەر دروست ببێت، چونکە ئەمیان هەمیشە و لە زۆربەی ئەو کاتانەدا ڕوو ئەدات،

١٠٢٧a

بەلاّم ئەوی تریان نا،(بەو شێوەیە نیە) (٣٥) بۆ مرۆڤێك ، سپی بوون دەرکەتەیە،(چونکە نە هەمیشە وایە و نە لە زۆربەی کاتەکاندا) بەلاّم ئەو (( بە شێوەیەکی دەرکەتانە)) گیاندار(یان ئاژەڵ) نیە، یان چارەسەر کردن بۆ بیناسازێك مەسەلەیەکی دەرکەتانەیە، چونکە بە شێوەیەکی سروشتی ئەمە ئیشی بیناساز نیە، بەڵکو ئیشی پزیشکە، بەڵکو بە پزیشك بوون بۆ بیناساز مەسەلەیەکی لەناکاو و لەپڕو(دەرکەوتانەیە)، چێشت لێنەرێکی لێزان کە ئامانجی دروست کردنی چێشتێکی

بەتامە، لەوانەیە شتێکی شیفابەخشیش دروست بکات، بەڵام نەك لەسەر بنەمای هوونەری چێشت لێنانەکەی،، لەم ڕووەوەیە کە ئەڵێین ئەوە بۆ ئەو مەسەلەیەکی دەرکەوتانە بووە، ئەو بە شێوەیەکی ڕێژەیی و لە پڕ ئەو ئیشە ئەکات نەك بە شێوەیەکی ڕەها(٥) چونکە هیچ جۆرە هوونەرێك و هیچ جۆرە تواناداریەك دیاری کراو بوونی نیە، چونکە ئەو شتانەی کە دەرکەتانە بوونیان هەیە یان دێنە بوون، هۆکاری ئەوانیش دەرکەوتانەیە، لەبەرئەمە لەو ڕووەوە کە هەموو شتەکان نە پێویستانە هەن و نە هەمیشە بوونەوەرن (یان هەن )یان دینە بوون، بەڵکو(١٠) زۆرترینیان لە زۆربەی کاتەکاندا هەن، کەواتە ((بوونەوەری دەرکەوتانە)) بوونی هەیە، بۆ نموونە مرۆڤی سپی نە هەمیشەو نە لە زۆربەی بوارو(کاتەکاندا) مۆسیقارە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هەندێ جار بەم شێوەیەی لیێ دێت، تەنیا((دەرکەوتانە)) دەبێت، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، لەو شێوەیەدا هەموو شتێك پێویستانە بوونی دەبێت، لەبەر ئەمە مادە، لە پاڵ ئەوجۆرەیدا کە زۆرجار هەیە، بە جۆرێکی تریش لەوانەیە هەبێت، هۆکاری هەرجۆرە دەرکەوتەیەك ئەبێ.(١٥)

ئێمە ئەبێت ئەم خاڵە بکەینە ((بنەما))و بپرسین کە: ئایا هیچ شتێك بەدەست نایەت کە نە هەمیشە هەیە ،و نە لە زۆربەی کاتەکاندا (بوارەکاندا)؟ بەڵام ئەمە ئەگەری نیە، کەواتە لە پاڵ بوارانەدا، شتێك هەیە کە مەسەلەیەکی لەناکاو و دەرکەوتانەیە، بەڵام ئەگەر شتانێك کە لە زۆربەی بوارەکاندا هەن، ئایا هیچ شتێك نیە کە هەمیشە بوونی هەیە، یان(ئایا) هەن شتانێك کە جاویدانن؟ لەم بارەیەوە ئەبێت دواتر دەست بە توێژینەوە بکەین، بەڵام هەنوکە ئەم خاڵە ڕوونە کە زانستێك لەبارەی مەسەلە دەرکەوتەکانەوە بوونی نیە،(٢٠) چونکە هەر زانستێك یان لەبارەی شتێکە کەهەمیشە هەیە، یان لەبارەی شتێك کە لە زۆربەی کاتەکاندا بوونی هەیە،ئەگەرنا چۆن ئەکرێت فێری ببیت، یان فێری یەکێکی تری بکەیت؟ چونکە ئەبێت سنودار بە شتێ بێت کە هەمیشە هەیە یان لە زۆربەی بوارەکاندا هەیە، بۆ نموونە شەربەتی شیر و هەنگوین لە زۆربەی کاتەکاندا بۆ کەسێك کە((تای))هەیە بە سودە، بەڵام زانست لەبارەی ئەوەی کە لە دەرەوەی یاسا بەکارهێنراوەکانەوە، ناتوانێت شتێك بڵێت،(٢٥)بۆ نمونە ئەگەر شەربەت لە تازە بوونەوەی مانگدا، سودمەند نەبێت(زانست ناتوانێت هیچ بڵێت) چونکە ئەوەی کە لە ڕۆژی یەکەمی مانگەوە ڕوونەدات، یان هەمیشە، یان لە زۆربەی کاتەکاندا ڕوونەدات، بەڵام (دەرکەوت)یان (مەسەلەی دەرکەوتانە) بەدەرە لەم یاسایە، بەم شێوەیە ڕوونمان کردەوە کە دەرکەوت چیە، و بە یارمەتی چ هۆکارێکەوە هەیە و ئەوەش کە زانستێك لەبارەیەوە بوونی نیە.

## "وەرزی سێهەم"

# ( هۆکاری دەرکەوتەکان، زنجیرەی هۆکارەکان )

ئەم مەسەلەیە ڕوونە کە بنەماگەلێك و چەندین هۆکار هەن کە دروست بوو، و لەناو چوون، و خۆیان، بەدەر لە حاڵەتی دروست بوون و لەناوچوون،(٣٠) چونکە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، واتە، ئەگەر ئەوەی کە دروست ئەبێت ولەناو ئەچێت، خاوەنی هۆکارێك نەك دەرکەوتوانە، و بەڵکو پێویستانە بێت، هەموو شتێك پێویستانە ئەبێت، بۆ نموونە بپرسین، ئایا(( ئەم شتە)) ئەبێت یان نە؟ و وەڵام ئەدەینەوە، ئەگەر(( ئەوشتە)) ڕوو بدات، بەڵێ، ئەگەرنا، نەخێر، وئەمەش ڕوو ئەدات ئەگەر کە شتێکی تر(ڕوو بدات)، بەم شێوەیە ڕوون ئەبێتەوە کە ئەگەر لە ماوەیەکی کاتی سنورداردا، بەردەوام ،بەشێك لە کات بگرین، ئەگەینە((هەنووکە))، بەو شێوەیەی کە ئەم پیاوە، بە هۆی نەخۆشی یان کردارێکی پەستەوە، ئەمرێت ، ئەگەر کە لە ماڵەوە بڕواتە دەرەوە، و ئەمە (ی تر)یش (بەم شێوەیە)، ئەگەر کە تینوو بێت، و ئەم(سێهەم)یەش ، ئەگەر ڕوداوێکی(تایبەت)تر ڕوو بدات، و بەم شێوەیە ئەگەین بەوەی کە ((هەنووکە)) بوونی هەیە، یان بە مانایەکی تر ئەگەین بە شتێك کە لە ڕابردودا ڕووی داوە، بۆ نموونە((ئەگەر تینوو بێت)) بەو مانایەیە کە((ئەگەر خۆراکێکی قورس بخوا)) (٥)ئەم(مانا)یەش( لە دوو حاڵەت بەدەر نیە) یان ڕاست ئەکات یان نا، کەواتە ئەو پێویستانە یان ئەمرێت یان نامرێت، بەم شێوەیە تەنانەت ئەگەر ڕوو لە ڕووداوەکانی ڕابردووش بکەین، دیسانەوە ئەم قسەیەش ڕاست ئەبێت، چونکە ئەم( واتە ڕووداوەکەی ڕابردوو) هاوکات لە شتێکدا بوونی هەیە، کەواتە ئەوەی کە بوونی هەیە، پێویستانە ئەبێت، بۆ نموونە ئەوەی کە زیندووە ڕۆژێك دێت کە ئەمرێت، چونکە پێشتر شتانێك ڕوویان داوە، بۆ نموونە دژەکان لە لاشەی

ئەودا،(١٠) کۆبوونەتەوە، بەلاّم ئەوەی کە(مردنی ئەو) لە ئەنجامی نەخۆشی یان کردارێکی پەست ئەبێت، هەنووکە دیاری کراو نیە، بەڵکو لە شێوەیەکدایە کە((ئەوشتە)) ڕوو بدات، کەواتە ڕوونە کە ئەم گووزەرە(حاڵەتە) تا سەرچاوەیەکی دیاری کراو ئەرواتە پێشەوە، بەلاّم ئەمەش ئیدی پەیوەست نیە بە شتێکی ترەوە، بەم شێوەیە ئەم(گوزەرە)، سەرچاوەی ئەو ڕوداوە لەناکاوە ئەبێت و هیچ شتێکی تر هۆکاری ئەو دروست بوونە نیە، بەلاّم، (ئەم مانایە کە) دووبارە گەڕاندنەوە بۆ چۆنێتی((بنەما)) و بۆ چۆنایەتی(هۆکار) ئەگۆڕێت، (١٥)- ئایا ئەبێت (ئەگۆڕێت) بە(بۆ) مادە یان ((لەبەر ئەو-واتە هۆکاری ئامانجی))،یان بۆ (( وروژێنەی و پاڵنەر))؟- و ئەبێت لە پێش هەموویانەوە بخرێتە ژێر توێژینەوەی واقع.

"وەرزی چوارەم"

# ( بوونەوەر و نابوونەوەر( ( ببوو، نەبوو ) )، راست و درۆ، راستەقینەو ناراستەقینە )

هەنوکە ئەگەر توێژینەوەی((بوونەوەر وەك دەرکەوت)) بخەینە لاوە، چونکە بە ئەندازەیەکی پێویست، روونمان کردەوە، بەڵام((بوونەوەر)) بە مانای((راستەقینە یان راست)) و((نابوونەوەر)) بەمانای(( ناراستەقینە و درۆ)) چونکە پەیوەستن بە ئاوێتەیی(synthesis) و لێك جیا بوونەوەوە، و هەموویان پێکەوە بەستراون بە دیاری کردنی بەشە ناهاوتاکانەوەن،(٢٠) چونکە راست یان راستەقینە، لەخۆگری ((سەلماندن))ە، لەسەر بنەمای خستنە سەر یەکی(بابەت و هەڵگیراو،و.ف) و((رەت کردنەوە)) لەسەر بنەمای جیا بوونەوەی(ئەوانە)، بەڵام درۆ، یان ((ناراستەقینە))لە خۆگری ناهاوتایی ئەو رێکخستن و دیاری کردنەی بەشەکانن، بەڵام ئەوەی کە چۆن ئەمە ڕوودەدات، کە ئێمە هاوکات و لەگەڵ یەکدا، بیر لە شتانێك ئەکەینەوە، مەسەلەیەکی ترە، مەبەستم لە((پێکەوە یان هاوکات)) و(( بە جیا))(بیر کردنەوە لە شتەکان) ئەمە نیە کە یەکێك لە دوای ئەوی تر بێت، بەڵکو مەبەست بەم شێوەیەیە، کە(٢٥) لەو شتە تاقانەیە دروست نەبێت،{ یان بە پێچەوانەوە، لە جیاتی شتێکی تاقانە، شتەکان یەك لە دوای یەك بێنە ناو ئەندێشەوە، کە ئەمە هەمان بە جیا بیر کردنەوەیە لێیان.و.ف} ((چونکە درۆ و راستی لە شتەکاندا نیە،-بەو شێوەیەی کە بڵێی چاکە را ست و خراپە پڕاوپڕ هەڵەیە،- بەڵکو لە ئەندێشەدان)) بەڵام لە بارەی هەست

پێکراوە سادەکان،(ta halpa) و((چیەتی))یەکان،(ta ti estin )(ڕاست و درۆ) تەنانەت لە ئەندێشەشدا بوونی نیە، بەڵام بەم مانایە، ئەبێت چۆن سەیری((بوونەوەر=ببو)) و((نابوونەوەر=نەبوو)) بکەین، مەسەلەیەکی ترە کە ئەبێت دواتر توێژینەوەی (پێداچوونەوەی) لەسەر بکرێت.

بەڵام لەوێوە کە ئاوێتە بوون یان((پێکەوە چنراوی)) و((جیا کردنەوە)) هەردووکیان لە ئەندێشەدان، نەك لە شتەکاندا، و((بوونەوەر)) بەم مانایە بەدەر لە((بوونەوەر)) بە مانای ((وردی و ڕاستەقینە))ش دێت (چونکە بەم مانایە، ئەندێشە((چیەتی)) یان ((چۆنایەتی)) ،یان((چەندێتی)) ،یان شتێکی تر ئەبەستێت بە شتێکی ترەوە یان لێی جیا ئەکاتەوە) کەواتە ئەبێت(( بوونەوەر)) وەك((دەرکەوت))یان((ڕاستەقینەیی)) یان(ڕاست) بخەینە لاوە، چونکە هۆکاری ئەو(دانەیە) دیاری نەکراوو، و هۆکاری ئەم(دانەیە) جۆرێکە لە هەڵچوونە ئەندێشە، و هەردوکیان پەیوەستن بە((ڕەگەزی کەم و کوڕی loipon genos))ی ((بوونەوەر))ەوە، و سروشتی((بوونەوەر)) لە بوونایەتیە دەرەکیەکەی ئەودا(واتە لە دەرەوەی هزر) پیشان نادەن، بەم هۆیەوە ئەوە بخەینە لاوەو و خۆمان سەرقاڵی توێژینەوەی ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) و بنەماکان و هۆکارەکانی بکەین، (لەوێوە کە باسمان لە فراوانی مانای هەریەك لە چەمکەکان کرد(٥) ڕوون ئەبێتەوە کە((بوونەوەر))یش بەچەندین جۆری جیاواز، بەکار دێت و ئەگوترێت.

## "وەرزی یەکەم"

# ( ناوەرۆك، و مەسەلەیەکی بنەمایی فەلسەفە )

(١٠) بوونەوەر(to on) بە چەند جۆرێك ئەگوترێت، بەو شێوەیەی کە پێشتر، لە گوتارێکی پەیوەست بە مانا بەربڵاوەکانی شتەکان، جیامان کردەوە، چونکە لە لایەکەوە بەڵگەیە لەسەر ((چیەتی)) و((ئەم شتە لێرەدا tode ti))و لە لایەکی ترەوە لەسەر ((چەندێتی و چۆنیەتی))، یان لەسەر هەریەك لە شتەکانی تر کە لەم جۆرە هەڵگیراوانە ئەژمار ئەکرێن، کەواتە لەبەر ئەوەی ((بوونەوەر)) بەم هەموو مانایە بەکار ئەبرێت،((ڕوونە کە یەکەمین جۆری ((بوونەوەر))((چیەتی))یە کە بەڵگەیە لەسەر ناوەرۆك((ousia))...))چونکە هەرکاتێك(١٥) بڵێین(( ئەم شتە)) لە چ چۆنایەتیەکە، ئەڵێین:(( باش)) یان((خراپ))ە، و ناڵێین((مەترو نیوێك درێژە))، یان ناڵێین کە(( مرۆڤێکە))، بەڵام هەرکاتێك بپرسن((چیە؟)) ناڵێین ((سپی)) یان((گەرم))ە، یان ((مەترو نیوێك درێژە))، بەڵکو ئەڵێین ((مرۆڤێکە))، یان((خودایەکە))، و هەموو شتەکانی تر لەو ڕووەوە ناونراون(( بوونەوەران ta onta))، کە هەندێکیان لەو یەکەمین جۆرەی بوونەوەر(واتە ناوەرۆك.و.ف) چەندایەتی گەلێکن و هەندێك چۆنایەتین و هەندێك ((کردارێنراو))یان((دەرکەوت)) گەلێك لەوە یان لە شتێکی تری لەم جۆرە.

(٢٠) لەبەر ئەمە کەسێك ئەیتوانی تەنانەت ئەم پرسیارە بهێنێتە ناوەوە کە: ئایا((بەرێگاداچوون)) و ((تەندروست بوون)) و((دانیشتن))، و هەریەك لەمانە بەڵگەن لەسەر ((بوونەوە)) یان نا؟ و لە بوارگەلێکی لەم جۆرەی تریشدا بەم شێوەیە، چونکە هیچ یەك لەوانە نە لەسەر پێی خۆی وەستاوە pefukos kath hauto)) و نە

ئەتوانێت لە ناوەڕۆك جیابێتەوە، بەڵكو ئەگەریش هەبێت،(دیسانەوە) زیاتر شتی بە ڕێگاداچوو دانیشتو و تەندروستە، كە((بوونەوەر))ە، (٢٥) ئەمانە بەم هۆیەوە زیاتر بە ((بوونەوەر)) دێنە بەرچاو، كە((بابەتەكەیان شتێكی دیاری كراو سنورداره، و ئەمە هەمان ناوەڕۆك و((تاك شتە))(شیء منفرد to kath hekaston)ە، كە لە گوتەیەكی لەم شێوەیەدا پەرچ ئەدرێتەوە، چونكە واژەی (( باش)) یان((دانیشتوو))(بۆ نموونە) بە بێ ئەم(گوتەیە) دەرنابڕدرێت، كەواتە ڕوونە كە هەریەك لەو شتانە بە هۆی ((ناوەڕۆكەوە)) هەیە،(٣٠) و بەم شێوەیە ((یەكەمین بوونەوەر)) ، كە نە((فلان بوونەوەر))ە، بەڵكو((بوونەوەر بە شێوەیەكی ڕەها))یە كە ئەبێت ((ناوەڕۆك)) بێت.

ئەوەی كە((یەكەمین)) بە چەندین مانا دێت، بە بوونی ئەمەش، چ بە پێی پێناسە، یان بە پێی ناسین و چ بە پێی زەمان، و بەو هەموو مانایە،((ناوەڕۆك)) ((یەكەمینە))،چونكە هەریەك لە هەڵگیراوەكانی تر،جیا نیە، و تەنیا ناوەڕۆكە كە بەم شێوەیەیە،(٣٥)((بەپێی پێناسە (یان مانا)ش هەر یەكەمینە،)) چونكە لە پێناسەی هەریەك لە شتەكاندا ((ئامادەیی پێناسەی ناوەڕۆك، بێگومانە)) ئێمە كاتێك وێنا ئەكەین كە هەریەك لە شتەكان بە كامڵترین شێوە بزانین، كە((چیەتی))((مرۆڤ یان ئاگر))مان، لە پێش ناسینی چۆنایەتی یان چەندایەتی یان شوێنەكەی، ناسیبێت، چونكە هەریەك لەمانەش، كاتێك ئەتوانین بناسین كە((چیەتی)) چەندایەتی یان چۆنایەتیمان ناسیبێت.

((لە ڕاستیدا ئەوەی كە لە دێر زەمان و هەنوكە و هەمیشە مرۆڤ بە دوایدا گەڕاوە، (و ئەگەڕێت) و هەمیشە مایەی سەرگەردانییە، ئەمەیە كە، بوونەوەر چیە؟(ti to on) و ئەمەش بەو مانایەیە كە ناوەڕۆك چیە؟))

هەندێك ئەڵێن كە((یەك))ێكە، و هەندێك لەسەر ئەو بڕوایەن كە زیاد لە ((یەك))ێكە[١]،(٥) و هەندێكی تر ئەڵێن ((سنووردارە))[٢] و هەندێك بڕوایان وایە كە((بێ سنوورە))[٣]، لەبەر ئەمە ئێمە لە پێش هەمووانەوە و زیاد لەهەمووانەوە، و تەنیا لەمبارەیەوە، ئەبێت توێژینەوە بكەین كە((بوونەوەر)) بەم جۆرە(واتە بە مانای ناوەڕۆك.و.ف) یانی چی.

---

[١] بەلأم ئاماژەیە بۆ فەیلەسووفەكانی قوتابخانەی میلێتۆس و ئێلیێا و هەروەها پیتاگۆرییەكان و ئیمپێدۆكلێس.

[٢] پیتاگۆرییەكان و ئیمپێدۆكلێس.

[٣] ئاناكساگۆراس و ئەتۆمیستەكان.

## "وەرزی دووەم"

# ( بڕواکان و تیۆرە جیاوازەکان، لە بارەی ناوەرۆك )

وا وێنا ئەکرێت کە ((ناوەرۆك بە ڕوونترین شێوە لە تەنەکاندا بوونی هەیە))، بەم هۆیەوەیە کە ئەڵێین گیانداران، گیاکان و بەشەکانیان، ناوەڕۆکەکانن، و هەربەم شێوەیە تەنە سروشتیەکانی وەك، ئاگر و ئاو خاك و هەریەك لەم جۆرە شتانە، و هەموو ئەوشتانەی کە یان بەشەکانیانن یان لەوانن،-چ لە بەشەکانیان ،و چە لە گشتایەتییان- تێکەڵ بوون، وەك دونیای بۆشایی (ئاسمانی) و بەشەکانی، و ئەستێرەکان و مانگ وخۆر، بەڵام ئێمە ئەبێت توێژینەوە لەسەر ئەوە بکەین کە ئایا تەنیا ئەمانە ناوەڕۆکن یان شتانیکی تریش هەن، یان هەندێك لەمانە(هەن) و هەندێکی تر لە شتەکانی تر، یان لەمانە هیچ کامیان (ناوەرۆك نین) بەڵکو(١٥) ناوەڕۆکەکان شتانێکی ترن، هەندێك لەسەر ئەو بڕوایەن کە سنورەکانی تەن- وەك ئاست، و هێڵ و خاڵ و ((یەك))-زیاد لە خودی کێش و تەنی رەق، ناوەڕۆکن، هەندێك لەسەر ئەو بڕوایەن کە جگە لە هەستپێکراوەکان هیچ شتێکی لەم جۆرە بوونی نیە[1]، لەکاتێکدا کە هەندێکی ترباوەڕیان بە ((بوونەوەر جاویدانەکان onta aidia)) هەیە، کە ژمارەیان زیاتر و واقعی ترە، وەك ((ئەفلاتوون)) کە((ئایدیە)) و شتە بیرکارییەکان بە دوو جۆر لە ناوەڕۆکەکان ئەژمار ئەکات،(٢٠) و سێهەمیان بە ناوەڕۆکی تەنە هەست پێکراوەکان ئەزانێت، ((ئسپیوسیپوس))[2] بە دەست پێکردن لە((یەك))یەوە، ناوەڕۆك گەلێکی زیاتری قبوڵ کرد، و بۆ هەریەك لە

---

[1] ئاماژەیە بۆ فەیلەسووفە سروشتیەکانی قوتابخانەی ئایۆنیا.

[2] خوورشکەزای ئەفلاتوون و جێگری ئەو و سەرپەرشتی ئەکادیمیا.

ناوەرۆکەکان، ((بنەما))گەلێکی هێنایە ئاراوە، یەکێك بۆ ژمارەکان، و ئەوی تر بۆ گەورەییەکان، و دیسانەوە یەکێکی تر بۆ ((دەروون)). ئەو بەم شێوەیە پانتایی ناوەرۆکەکانی بەرفراوانتر کرد، هەندێکی تریش ئەڵێن[1]، کە((ئایدیە))کان و ژمارەکان خاوەنی یەك سروشتن و شتەکانی تر بە داوی ئەوانەوە دێن،–وەك هێڵەکان و ئاستەکان– تا بگات بە ناوەرۆکی(بۆشایی–ئاسمانی) و هەستپێکراوەکان.

هەنووکە ئەبێت لەم بارەیەوە توێژینەوە بکەین کە لە نێوان ئەم گووتانەدا کامیان راستە، و کامیان هەڵەیە، چ شتانێك ناوەرۆکەکانن، و ((ئایا ناوەرۆك گەلێکی تر بەدەر لە ناوەرۆکە هەست پێکراوەکانیش بوونیان هەیە یان بونیان نیە (٣٠) و ئەمانە چۆنن، و ئایا ناوەرۆکە جیاکان(لە مادە) بوونیان هەیە، و بۆچی و چۆن هەیە؟)) یان ئەوەی کە هیچ ناوەرۆکێك بەدەر لە ناوەرۆکە هەست پێکراوەکانی بوونی نیە؟ پێش هەموو شتێك ئەبێت لە دارشتنەکەدا، جۆرێك دیاری بکەین کە: ناوەرۆك چیە؟

[1] ئامارەبیە کسێنۆکراتێس و پەیرەوکارەکانی، ٣١٤–٣٩٦ پ.ز کە جێگری ئیسپیوسیپۆس و سەرپەرەشتی ئەکادیمیا بوو، ئەو ئایدیەکانی بە خودی ژمارەکان ئەزانی و بەم شێوەیە ئەندێشەکانی پیتاگۆری بە تەواوی تێکەڵ بە بڕواکانی ئەفلاتوون کرد.

"وەرزی سێیەم"

# ( چوارینەی ناوەرۆك، بابەت، پێناسەیەك لە مادە )

واژەی ((ناوەرۆك))، ئەگەر بە جۆرگەلێکی زیاتر نا، بەلاّم زیاد لە هەمووی بە چوار جۆر ئەگووترێت، چونکە وا وێنا ئەکرێت کە((چیەتی))و((گشتێتی))(٢٠) و((رەگەز to genos)) نـاوەرۆکی هەریـەك لـە شـتەکانن، و چـوارەمینیان ((بابـەت hupokeimenon))ە، ((بابەت ئەوەیە کە شتەکانی تر بە پێی ئەو ئەوترێ)) (یان ئەبنە هەڵگیراوی ئەو–لەسەر ئەو هەڵئەگیرێن) بەلاّم خودی خۆی هەڵگیراوی هیچ شتێکی تر نیە)).

١٠٢٩a

لەبەر ئەمە سەرەتا ئەبێت ئەوە دیاری بکەین، چونکە وا وێنا ئەکرێت کە ناوەرۆك لە راستەقینەترین مانایدا،((بابەتی یەکەمینە)).

هەنوکـە بەیـەك مانـا،((مـادە)) بەمانایـەکی تـر((شـێوە)) و بـەمانای سـێهەم ((تێکەڵـەیان=تێکـەڵ کردنیـان)) پێـی ئـەوترێت ((بابـەتی یەکـەمین))، مەبەسـتی مـن لـە ((مـادە)) بـۆ نموونـە برۆنـز و لـە ((شـێوە))،(شـێوەی دەرەوەی پەیکەرەکـەو) و لـە ((تێکەڵەیان))(گشتە دیاری کەرەکەیە)،واتە(پەیکەرەکەیە)، کەواتە ئەگەر شێوە لە پێش مادەوەیـە لـەو زیـاتر((بـوونی هەیـە mallon on))، [1]هـەر بـەم هۆیـە ئـەتوانێت لـە پێش((تێکەڵەی ئەو دوانەشەوە)) بێت.

---

[1] ئاماژەیە بۆ بوونی گوومان لە لای ئەرستۆ.

کەواتە هەنوکە بە شێوەیەکی دارێژراو ووترا کە((ناوەرۆك چیە، واتە ئەوەی کە لەسەر شتێکەوە هەڵناگیردرێت ، بەڵکو شتەکانی تر لە سەر ئەو هەڵئەگیرێن)) بەڵام نابێت تەنیا بەم پێناسەیە رازی بین و بەس نیە چونکە خودی ئەم پێناسەیە ڕوون نیە کە و هەروەها بە پێی ئەو((مادە))یە ئەبێت بە ناوەرۆك، چونکە ئەگەر ئەم(مادەیە) ناوەرۆك نەبێت، لەو شێوەیەدا لە چنگمان دەرئەچێت کە بڵێین چ شتێکی ترە، چونکە کاتێك کە هەموو شتەکان لە خۆ بگیرێن، ڕوونە کە هیچ شتێك(ی تر بێجگە لە مادە) نامێنێتەوە، چونکە هەمو شتەکانی تر کرداراندن و کردار و هێزو توانای تەنەکانن، درێژی و پانی و قووڵیش جۆرێکن لە چەندایەتی، بەلا م لە ریزی ناوەرۆکەکاندا نین، چونکە ((چەندایەتی)) ناوەرۆك نیە، بەڵکو ناوەرۆك، زیاتر، ئەوەیە کە(( ئەم شتانە یەکەمجار پەیوەستن ئەبن پێیەوە)) بەلا م ئەگەر ئێمە درێژی و پانی و قوڵی لاببەین، ئەبینین کە هیچ شتێك نامێنێتەوە، مەگەر ئەوەی کە شتێك بێت کە بە یارمەتی ئەو سنوور بێت، بەو شێوەیەی کە بۆ کەسانێك کە بەم جۆرە سەیری ئەم مەسەلەیە ئەکەن. ((مادە تەنیا ئەبێت وەك ناوەرۆك لەبەر چاو بگیرێت، من((مادە)) بەوە ناو ئەنێم کە خۆی لە خۆیدا نە((شتێك ti))ە، وە نە((چەندایەتیەك))، و نە بە شتێك ئەوترێت کە بە یارمەتی ئەو(( بوونەوە)) پێناسە و دیاری ئەکات))، چونکە ((شتێك)) هەیە کە بە پێی ئەو هەریەك لەوانە ئەبن بە هەڵگیراو، بەڵام((خۆی نابێتە هەڵگیراو))، لەبەر ئەمە ئەوەی کە خۆی لەخۆیدا((پاشکەوت=لە دواوەیە))، نە((شتێك))ە، و نە((چەندایەتیەك))و و نە هیچ شتێکی تر، رەتکردنەوەکان(نەفی یەکان))ی ئەمانیش نیە، چونکە رەتکردنەوەکانیش تەنیا دەرکەوتانە بۆیان بوونیان هەیە، یان پەیوەست ئەبن پێیانەوە.

کەواتە ئەنجامی ئەم جۆرە تێڕوانینە ئەمەیە کە((مادە ناوەرۆکە))، بەلا م ئەمەش ئەگەری نیە(مەحاڵە.و.ك). چونکە ((جودا بوون)) و((ئەم شتە بوون to tode ti))وا وێنا ئەکرێت کە پێش هەمو شتێك پەیوەست بێت بە ناوەرۆکەوە، و بەم هۆیەوە وا گومان ئەکرێت کە((شێوە))و((تێکەڵی هەردووکیان)) زیاتر لە مادە، ناوەرۆك بن، کەواتە هەنووکە قسەی ناوەرۆکە تێکەڵەکان لە هەردووك-واتە تێکەڵ لە مادە و شێوە- بخەینە لاوە، چونکە هەم لە دواوەیەو هەم ڕوونە، مادەش بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاشکرایە، کەواتە ئەبێت لە بارەی سێهەمیانەوە توێژینەوە بکەین، چونکە ئەمیان سەرسوڕهێنەرتر و دژوارترینیانە.

١٠٢٩b

ئـەم خاڵـە هـەمووان قبووڵیانـە کـە هەنـدێك لـە هەسـت پێکراوەکـان لـە ریـزی ناوەرۆکەکانن، کەواتە یەکەمجار ئەبێت لەبارەی ئەوانەوە تویژینـەوە بکەین،((چونکە وا سودی زیاترە کە بپەرژێینە سەر ئەوەی کە((زیاتر شایەنی ناسینە))، چونکە فێرکاریش لەبارەی هەموو مەسەلەکانەوە هەربەم شێوەیە دێتە گۆڕێ، کە(( لەوەوە کە لای سروشت کەمتر ناسێنراوترە، بە ئاراستەی ئەوەی کە زیاتر ناسراوترە بەرەو پێش بچین))(٥) لە کردارەکانیشدا هەر بەم شێوەیەیە، رێك بـە هـەمان شێوە کـە لـە کردارەکانـدا، لـەوەوە دەست پێ ئەکەین کە سودی زیاتری بۆ کەسەکە هەیە، و ئەوەی کە بە سودی گشتیش ئەژمار ئەکرێت،[1] بە سودی تاکیشی ئەزانین، بەهەمان جۆر ئەبێت لـەوەی کە بۆ هەریـەك لە تاکەکان ناسراوترە، دەست پێ بکەین تا ئەوەی کە لە لای سروشت ناسراوترە، بە هەریەك لە تاکەکانی بناسێنین))، بەڵام ئەوەی کە بۆ تاکەکان ناسراوتر و لە پێشترە، زۆرجار کەمێك ناسراوە، وسودی ئەو لە((بوونەوەر))ی واقعی کەمترە، یان هیچە(١٠) بەڵام ، بە بوونی ئەمەش، ئەبێت هەوڵ بدەین کە لەوەی کەمتر ناسێنراوە، بەڵام بۆ تاکەکان بناسە، دەست پێ بکەین تا ئەوەی کە بە ((تەواوی ناسراوە))، بناسین، لەکاتێکدا کە، بەهەمان جۆر کە وترا لە رێگەی ئەوەوە ئەگەین بەم((تەواو ناسراوە)).

---

[1] ((جیا)) یان((بەجیا بوون)) بە مانای خاوەندارێتی و بوونێکی سەربەخۆ، واتە شتێك کە لێرەدا و جیا لە شتەکانی تر.

"وەرزی چوارەم"

# ( چیەتی یان ماهیەت )

لەبەر ئەوەی لە سەرەتاوە جیامان کردەوە کە ناوەرۆك بە چەند جۆرێك پێناسە ئەکرێت، و لەبەر ئەوەی یەکێك لەو جۆرانەی وێنا ئەکرا کە((چی بوون)) بێت، کەواتە ئەبێت توێژینەوەی لەسەر بکەین،(١٣) لەم بارەیەوە، چەندخاڵێکی مەنتیقی بەیان ئەکەین، چی بوونی هەر((تاك شتێك)) ئەوەیە کە((خۆی لە خۆیدا)) بگووترێت، چونکە((تۆ بوون))،((مۆسیقاڕ بوون))نیە،(١٥) چونکە تۆ((خۆت لە خۆتدا)) مۆسیقاڕ نیت، ئەوەی کە تۆ((خۆت لە خۆتدا)) هەیت، ((چی بوون یان ماهیەت))ە، بەڵام ئەمەش هەموو مەبەستەکەی ئێمە نیە، چونکە ((خۆ لەخۆدا))بوون، وەك سپێتی بۆ ئاست نیە، چونکە((ئاست بوون))،((سپی بوون)) نیە، بەڵام تەنانەت تێکەڵەی هەردوك لەوانە، واتە((ئاستی سپی بوون))یش، بە ((چیەتی)) ئاژمار ناکرێت، بۆ چی؟ چونکە ئەوەی کە ئەبێت پێناسە بکرێت (واتە ئاست) لەودا گونجێنراوە،(٢٠)((بەم شێوەیە دەربڕینێك کە شتێك پێناسە ئەکات، بەڵام خودی شتەکە لەودا نەگوونجێنراوە، پێناسەی چیەتی هەریەك لە شتەکانە)) بە شێوەیەك کە ئەگەر ((ئاستی،سپی بوون)) هەمان((ئاستی نەرم بوون)) بێت، ئەوکات(( سپی)) و ((نەرم)) یەك وهەمان شتن.

بەڵام لەبەر ئەوەی بە پێی گووتەکانی تریش چەند تێکەڵیەك بەدەست دێن(چونکە هەرگووتەیەك وەك، چۆنایەتی، چەندایەتی،(٢٥) کات، شوێن، و جووڵە، خاوەنی بابەتێکە) کەواتە ئەبێت توێژینەوەی ئەوە بکەین کە ئایا بۆ چیەتی هەریەك لەوانە پێناسەیەك دەست ئەکەوێت؟ و ئایا بۆ ئەم((تێکەڵانە))، بۆ نموونە((مرۆڤی سپی))یش

((چیەتیەك)) بوونی هەیە؟ با وا دابنێین ناوی ئەو((تێکەڵەیە)) ((ڕووپۆشە))، دەی ((ڕووپۆش بوون)) چیە؟

بەڵام ئەگەر بووترێت کە ئەمە لە شتانێك نیە کە ((خۆ لە خۆدا)) ناوئەنرێن، ئەڵێین کە ((نە خۆ لە خۆیی=خۆ لە خۆیی نا)) بە دوو جۆر ئەوترێت(٣٠) هەندێك لە ڕێگای زیادکرن و خستنە سەر، و هەندێك نە، چونکە لە هەندێ حاڵەتدا ئەوەی کە بابەتی پێناسەیە بە پەیوست بوون یان لکان بە شتێکی ترەوە ئەگووترێت،

١٠٣٠a

وەك ئەوەی کە کاتێك پێناسەی ((سپی بوون)) مەبەستی ((مرۆڤی سپی)) بگەیەنێت، لە هەندێ حاڵەتی تردا، پێناسەی هەر شتێك، پەیوەست ئەبێت بەو شتەوە کە بابەتی پێناسەکەیە، وەك کاتێك کە بیانەوێت ((ڕووپۆش)) بکەنە بەڵگەیەك لەسەر( مرۆڤی سپی)) و(( ڕووپۆش))هەروەك و لە جیاتی((سپی)) پێناسە بکەن، بەڵێ:((مرۆڤێکی سپی)) سپییە، بەبوونی ئەمەش چیەتیەکەی ئەو((سپی بوون ))نیە، بەڵام ئایا((ڕووپۆش بوون)) بە شێوەیەکی گشتی وبە تەواوی ((چیەتیە)) یان نا؟ ((چونکە چی بوون جۆرێکە لە ((چیەتی ti esti))، کاتێك کە شتێك لە سەر بنەمای شتێکی تر ئەوترێت، یەك(( ئەم شتە لێرەدا ))نیە، بۆ نمونە(٥)((مرۆڤی سپی)) ڕێك یەك(( ئەم شتە لێرەدا)) نیە، چونکە(( ئەم شتە لێرەدا)) تەنیا لە بارەی ناوەرۆکەکانەوە ڕاستە، لەبەر ئەمە((چی بوون)) پەیوەستە بەو شتانەی کە دەربڕینەکەیان پێناسەکەیانە (horismos)، بەڵام لە هەر شوێنێکدا کە ناوێك و دەربڕینێك، بەڵگە بن لەسەر شتێك، پێناسە نیە( ئەگەر نا هەموو دەربڕینەکان، پێناسە دەبون، چونکە هەر دەربڕینێك خاوەنی ناوێکە، بە جۆرێك کە لەو شێوەیەدا((ئیلیاد)) دەبوویە پێناسەیەك)(١٠) بەڵکو(پێناسە) کاتێکە کە لە شتێکی سەرەتایی((یەکەمین))ەوە بێت، و شتانێکی لەو جۆرەن کە لە ڕێگای هەڵگرتنی شتێکدا لەسەر شتێکی تر نەگووترێن،((کەواتە هیچ یەك لەو شتانەی کە جۆر گەلێك لەیەك ڕەگەز نین، چیەتی پەیوەست نیە پێیانەوە)) بەڵکو(چیەتی) تەنیا پەیوەستە بەم جۆرانەوە، چونکە وا وێنا ئەکرێت کە ئەمان بە پێی هاوبەشی (بەشداری)یان(کرداراندن) و هەروەها، هەروەك دەرکەوت نابنە هەڵگیراو، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ هەریەکە لە(١٥)و شتانەی تر کە خاوەنی ناون، ئەتوانین ووشە یان دەربڕینێك بەدەست بهێنین، کە بەڵگە بێت لەسەر شتێك، بۆ نموونە((ئەمە بەم شتەوە)) پەیوەستە، یان لە جیاتی وشەیەکی سادە، دەربڕینێکی سادە بەکار بهێنرێت، بەڵام نە پێناسەیە و نە ((چی بوون یان ماهیەت)).

یان ئایا لەم نێوانەدا((پێناسە))ش هەروەك ((چیەتی to ti esti)) بە چەند جۆرێك ئەگوترێت؟ چونکە چیەتی بە جۆرێك لە جۆرەکان بەڵگەیە لەسەر ناوەرۆك و(( ئەم شتە لێرەدا)) و بە جۆرێکی تریش بەڵگەیە لەسەر هەریەك لە گووتەکان ی وەك چەندایەتی و چۆنایەتی و هەمووانی تری لەم جۆرە، ڕێك بە هەمان شێوە کە واژەی((هەیە to estin)) لە بارەی هەموو شتێکەوە دروستە، بەڵام نە بە شێوەیەکی یەکسان، بەڵکو لە بارەی هەندێکەوە بە شێوەیەکی سەرەتایی(یەکەمی)و لە بارەی هەندێکی ترەوە بە شێوەیەکی دووەمی، بەم شێوەیە چیەتی بە شێویەکی ڕەها لە بارەی ناوەرۆکەوە دروستە، و بە شێوەیەکی پابەندانەش لە بارەی هەریەك لە شتەکانی تر، چونکە لە بارەی((چۆنایەتی))یشەوە ئەتوانین بپرسین کە ((چیە))چونکە چۆنایەتیش بریتیە لە((چیەتی))یەك، بەڵام نەك بە((شێوەیەکی ڕەها))، بەڵکو بەو شێوەیە کە هەندێك لەبارەی ((نابوونەوەر=نەبوو)) بە شێوەیەکی دیالێکتیکی ئەڵێن کە((نابوونەوەر بوونی هەیە= نەبوو بوونی هەیە.و.ك))- نەك نابوونەوەر (نەبوو) بە شێوەیەکی ڕەها، بەڵکو ئەوەی کە نەبوو((ە))- و لەبارەی چۆنایەتیشەوە هەر بەم شێوەیەیە.

لەبەر ئەمە پەیڕەوی و سەرنجدانی ئەم خاڵە پێویستە کە لە بارەی هەریەك لەو شتانە بە شێوەیەك قسە ئەکرێت کە وا پێویستە، بەڵام نەك زیاتر لەو جۆرە کە هەر شتێك هەیە، بەم هۆیە، بە سەرنجدانی ئەوەی کە گووترا، هەربەم شێوەیە ڕوونە کە ((چی بوون بە شێوەیەکی سەرەتایی( یەکەمی) و بە شێوەیەکی ڕەها هی ((ناوەرۆکە)) و پاشان هی شتەکانی تر، ڕێك بە هەمان جۆر کە ((چیەتی)) بە شێوەیەکی ڕەها((چی بوون)) نیە، بەڵکو((چی بوونی)) چۆنایەتی یان چەندایەتیەکە، چونکە یان ئەبێت بە جۆرێکی((هاوناوی)) بوترێت کە ئەمانە (( بوونەوەر))کانن، یان بە بە هۆی ((خستنەسەر سەر کەم کردنەوە))، بەشێوەیەك کە بڵێین((نە-ناسراو ناسراوە)) لە کاتێکدا کە دروست(تر) ئەوەیە کە واژەکان نە بە جۆرێکی هاوناو و نە بەیەك مانا، بەکار بهێنین، ڕێك بەهەمان جۆر کە واژەی((پزیشکی))لە ((زیادکردن)) بۆ یەك شت و هەمان شت بەکار بهێنین، نەك بە مانای یەك یان هەمان شت، و هەروەها نە بە جۆرێکی هاوناو،

١٠٣٠b

چونکە واژەی((پزیشکی)) لەبارەی یەك کردار و یەك ئامراز، نە بە جۆرێکی ((هاوناوی)) بەکار دێت، و نە بە پێی ((یەك)) شت، بەڵکو لە((زیاد کردن=خستنەسەر)) ی شتێکدا بەکار دێت.

لەم نێوانەدا جیاوازی نیەی کە کەسەکە بە کام یەك لەو دوو شێوەیە بیەوێت لەبارەی ئەمانـەوە قـسە بکـات، بـەلام ئـەم خالـە ڕوونـە کـە(٥)،(( پێناسـە بـە شـێوەیەکی سـەرەتایی((یەکـەمی)) و بە شێوەیەکی ڕەهـا ، و هـەروەها((چـی بـوون)) پەیوەستە بە ناوەرۆکەکانەوە)) لەگەڵ ئەوەشدا هەر پەیوەست ئەبێت بە شتانێکی تریشەوە، بەلام نەك بە شێوەیەکی سەرەتایی، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بگریمێنین، ئەمە پێویستانە بەو مانایە نیە کە هەر دەربڕینێك بەڵگە بێت لەسەر شتێك، هەمان پێناسەیە، بەڵکو ئەبێت ((دەربڕینێکی دیاری کراو)) بێت، و ئەمـەش کاتێکە کە دەربڕین لە((یـەك شت)) بێت، ئەویش نەك لە ئەنجامی پێکەوە لکان، وەك ((کتێبی ئیلیادە)) یان هەموو ئەوشتانەی کە پێکـەوە لکـاون،(١٠) بـەڵکو لـە هـەموو ئـەو مانایانـەی کـە بـە((یـەك یـان واحـد)) ئـەگوترێت،((یـەك))یـش وەك ((بوونـەوەر)) بـە چـەندین مانـا دێـت و ئـەگوترێت، ((بوونەوەر)) لە لایەکەوە بەڵگەیە لەسەر ((ئەم شتە لێرەدا)) و لە لایەکی ترەوە بەڵگەیە لەسـەر چـەندایەتیەك یـان چۆنایەتیەك، بـەم هۆیەوەیـە کـە((مرۆڤـی سـپی)) یـش هـەم خـاوەنی ووشـە (دەربڕینـە) و هـەم پێناسـە، بـەلام بـە جـۆرێکی تـری بـەدەر لـە پێناسەی((سپێتی))و((ناوەرۆك)).

## "وەرزی پێنجەم"

# ( ئایا بۆ شتە کەڵەکە کراوەکان پێناسەیەك هەیە؟ )

لێرەدا دژوارییەك وسەرگەردانییەك هەیە، ئەگەر کەسێك قبوڵ نەکات کە ووشە یان دەربڕینێك کە دەرەنجامی خستنەسەرە (زیادکردنە)پێناسە نیە(١٥) کەواتە بۆ کام شتانە کە سادە نین، بەڵکو پێکەوە لکاون، ئەتوانین پێناسەیەك بەدەست بهێنین؟ چونکە ئەمانە بە خستنە سەری شتێك ئەتوانین ڕوون بکەینەوە، وەك ئەوەی کە بڵێین:((بینین))و((پوکی-ناوبۆشی))و((بینینی پانی)) کە بەسەر خراوەی هەردووکیان ناوئەنرێت، چونکە((ئەم دانەیە لەو دانەیە))دا بوونی هەیە، کاواکی و بینینی پانی نەك کردارندنێکی دەرکەوتانە بەڵکو خودیانەن،(٢٠) و هەروەها بەو شێوەیەش پێیەوە نەبەستراون کە((سپێتی)) بە ((کالیاس)) یان بە ((مرۆڤەوە)) بەستراوە، لەو ڕووەوە کە کالیاس سپیە و دەرکەوتانە مرۆڤە، بەڵکو وەك((نێرینە)) بۆ ئاژەڵ و((یەکسان بوون)) بۆ چەندایەتی، و هەرشتێك کە ئەگووترێت خۆی لە خۆیدا پەیوەست ئەبێت بە شتێکەوە، و هەموو ئەمانە شتانێکن کە یان دەربڕینی ناو یان ناوی شتێك کە دروست کەری ئەم کرداراندنەیە لەواندا بوونی هەیە، و ڕوون کردنەوەی ئەو شتە، جیا لەمانە ئەگەری نیە(٢٥)بەو شێوەیەی کە ڕوونکردنەوەی((سپی)) بە بێ((مرۆڤ))ئەکرێت، بەڵام ڕوونکردنەوەی((مێینە)) بە بێ((ئاژەڵ)) مەحاڵە، لەبەر ئەمە بۆ ئەم شتانە یان بە هیچ شێوەیەك ((چی بوون)) و ((پێناسە)) بوونی نیە، یان ئەگەریش هەیە لە جۆرێکی ترە، بەو شێوەیەی کە ووتمان.

لەم بارەیەوە، دژوارییەکی تریش هەیە، ئەگەر((پان بینی)) هەمان((بینینی نێوان بۆشی))یە، لەو شێوەیەدا ((پانبینی)) هەمان ((نێوان بۆشی)) ئەبێت،(٣٠)بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە نیە، لەوێوە کە قسە کردن لە((پان بینی)) جیا لە شتێك کە ئەمە کرداراندنی لەخۆیدای ئەوە، مەحاڵە،(چونکە پان بینی پوکیەکە لە بینیندا)، لەو شێوەیەدا یان لە پان بینی قسەیەك ناتوانرێت بکرێت یان هەمان شتی دووبارە ئەگووترێتەوە، واتە((بینینی نێوانی بۆش بینی))(چونکە پان بینی بە مانای بینینی نێوان بۆش بینی، ئەبێت) لەبەر ئەمە(٣٥) بێ مانایە کە چی بوون پەیوەست بێت بە شتانێکی لەم شێوەیەوە، و ئەگەر نا( ئەم ریزبەندیە) تا ناکۆتا بەردەوام ئەبێت، چونکە لە((بینینی نێوان بۆش بینی))دا دیسانەوە بینینێکی تر ئەگوونجێنرێت و...

بەم شێوەیە ڕوونە کە((پێناسەکان تەنیا بۆ ناوەرۆکن)) چونکە ئەگەر بۆ باقی گووتەکانی تریش بن، بێگومان لە ڕێگای زیاد کردن و خستنە سەرەوەن، وەك(پێناسەی) چەندایەتی، و((تاك)) کە بێ(پێناسە)ی ژمارە مەحاڵە، یان ((نێرینە)) بە بێ گیانەوەر، مەبەستی من لە((بە یارمەتی خستنە سەر =زیادکردن))(٥)چەند بابەتێك و مەسەلەیەك هەن کە دەرەنجام لەواندا ئەمەیە کە هەمان شت دووبارە ئەگووترێتەوە، وەك ئەو حاڵەتانەی کە ناویان بران، کەواتە ئەگەر راستە، بۆ خستنەسەریەکیەکانیش هیچ پێناسەیەك بوونی نابێت، بۆ نموونە بۆ((ژمارەی تاك)) بەڵام ئەم خاڵە لەو ڕووەوە بە شاراوەیی ئەمێنێتەوە کە واژەکان بە وردی دەرنابڕدرێن، ئەگەریش بۆ شتانێکی لەم شێوەیە پێناسە گەلێك بوونیان هەبووایە، یان بە شێوەیەك و جۆرێکی ترن، یان بەو شێوەیەی کە گووترا،((پێناسە))و((چی بوون)) ئەبێت بە چەندین جۆری جیاواز بگووترێن،(١٠) لەبەر ئەمە، بەجۆرێك، هیچ شتێك خاوەنی پێناسە نیە، و چی بوون پەیوەست نیە بە هیچ شتێکەوە، جگە لە ناوەرۆکەکان، وبەجۆرێکی تر، هەردووکیشیان پەیوەست ئەبن بە گوتەکانی ترەوە.

کەواتە ڕوونە کە((پێناسە))،بەمانای(logos) ((چی بوون))دێت، و چی بوون یان تەنیا بۆ ناوەرۆکەکانە، یان بە تایبەتی و بە شێوەیەکی سەرەتایی و بە شێوەیەکی ڕەها بۆ ئەوانە.

"وەرزی شەشەم"

# ( ئایا چی بوون یان ماهیەت، هەمان (( تاك شت )) یان(( شیء منفرد ))ە ؟بەڵێ! )

(١٥) هەنوكە ئەبێت توێژینەوەی ئەوە بكەین ((چی بوون)) ئایا هەمان((تاك شت))ە یان شتێكی تر، چونكە ئەم توێژینەوەیە(پێداچوونەوەیە) بە جۆرێك لە جۆرەكان، بۆ ((توێژینەوە لە بارەی ناوەرۆكەكان)) بە سودە،(( وا وێنا ئەكرێت كە(( تاك شت)) شتێكی تر نیە، بێجگە لە ناوەرۆكەكەی خۆی، و چی بوونیش وا ئەگووترێت كە ناوەرۆكی تاك شتە)) لە بارەی ئەو شتانەی كە دەركەوتانە ناو ئەنرێن، ئەبێت ئەوانە بە دوو شتی جیاواز ئەژمار بكەین،(٢٠) وەك ئەوەی كە((مرۆڤی سپی)) لەگەڵ(( مرۆڤی سپی -بوون)) جیاوازە، چونكە ئەگەر یەكێك و هەمان بن، لەو شێوەیەدا((مرۆڤ ))و(( مرۆڤی سپی)) هەمانن، و لەبەر ئەمە((مرۆڤی سپی بوون) و((مرۆڤ بوون)) یش یەكێك ئەبن، یان ئەوەی كە پێویست ناكات كە ئەو شتانەی دەركەوتیانە بوونیان هەیە، لە گەڵ ماهیەتیاندا یەكێك بن،(٢٥) چونكە لایەنەكانی مەسەلەكە بەیەك شێوە، نابێت بەیەكێك، بەڵام لەوانەیە وا گومان بكرێت كە لەئەنجامدا لایەنەكانی(مەسەلەكە) دەركەوتانە بن بە یەكێك و هەمان. وەك ((سپی بوون)) و((مۆسیقاڕ بوون)) بەڵام وا گومان ناكرێت.

١٠٣١b

بەڵام لە لای ئەو شتانەی كە((خۆ لەخۆدا-خۆیان لە خۆیاندا)) ناو ئەنرێن، ئایا چی بوون و ((تاك شت)) پێویستانە یەكێكن و هەمانن، بۆ نموونە ئەگەر ناوەرۆك گەلێكی دیاری كراو بن،(٣٠) كە ناوەرۆك گەلێكی تر و سروشت گەلێكی تر لە پێش ئەوانەوە

بوونیان نەبێت، وەك چۆن هەندێك ئەڵێن کە((ئایدیەکان)) بەم شێوەیەن؟ ئەگەر ((خودی باش)) و((باش بوون)) جیاواز بوونایە، و هاوکات(( ئاژەڵ)) و((ئاژەڵ بوون)) و((بوونەوەر بوون to onti)) و((بوونەوەر)) (جیاواز بوونایە)، لەو شێوەیەدا ناوەرۆکەکان و سروشتەکان و ئایدیە گەلێکی تر و بەدەر لەوانەی کە ناویان برا، بوونیان دەبوو، و ئەمانە- ئەگەر "چی بوون" ناوەرۆك بێت- ئەوا ((ناوەرۆکە لە پێشەکان)) دەبوون، هەنوکە ئەگەر ئەمانە(واتە ناوەرۆکە لە پێشەکان و ناوەرۆکە لە دواکان) لە یەکتری جیا بنەوە، ئەوکات هەندێکیان(ئایدیەکان) هەرگیز نەدەناسران و هەندێکی تریان(واتە چی بوون)) هەرگیز بوونیان نەدەبوو، { مەبەستم(٥) لە ((جیا بوونەوە)) ئەمەیە کە نە(( بوونی چاك)) لە ((خودی چاکە)) بوونی ئەبێت و نە((چاك بوون)) لە((بوونی چاك))} چونکە ناسینی هەریەکە لە شتەکان لە کاتێکدایە کە ئێمە چی بوونییان(ماهیەتی)یان بناسین، باقی شتەکانی تر لە شێوازێکدا هەروەك((چاك))ن، بە شێوەیەك کە ئەگەر(( چاك بوون)) چاك نەبێت،(( بوونەوەر بوون-بوون))یش بوونەوەر نیە، و((یەك بوونیش)) یەك نیە،(١٠) چی بوونەکان، یان بە یەکسانی بوونیان هەیە یان هیچ کامیان بوونیان نیە، رێك بەو شێوەیەی کە ئەگەر(( بوونەوەر بوون)) بوونەوەر نەبێت (بوونی نەبێت)، چی بوونی هیچ یەك لە شتەکانی تریش بوونی نابێت، هاوکات ئەوەی((چاك بوون)) پەیوەست نەبێت پێیەوە، چاك نیە، لەبەر ئەمە ((چاك))و((چاك بوون)) پێویستانە یەکێکن و هەربەم شێوەیەشن (( جوانی))و(( جوان بوون)) و هەموو ئەو شتانەی کە بە پێی شتێکی تر ناگوترێن، بەڵکو ((یەکەمین و لەخۆیاندان))[1]،( یان بە خودی خۆیان وبە شێوەیەکی یەکەمینن،) چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بێت بەسە، تەنانەت ئەگەریش((ئایدیە)) بوونیان نەبێت،(١٥) یان لەوانەیە تەنانەت ئەگەریش ((ئایدیەکان))یش بوونیان هەبووایە،( لە هەمان کاتدا، ڕوونە کە ئەگەر ئایدیەکان بەو جۆرەن کە هەندێك ئەڵێن، بابەتەکان، ناوەرۆك نابن، چونکە ئەوان پێویستانە ناوەرۆکن، بەڵام لە پەیوەست بوون بە بابەتێکەوە نین، ئەگەر نا بە پێی هاوبەشی و بەشداری ،بوونیان دەبوو)[2].

---

[1] مەبەست لە((ناوەرۆکە یەکەمینەکان))ە کە پێویستایەتی ئەوان ئەوەیە کە ماهیەتی و ئەوەی کە خاوەنی ئەم ماهیەتەیە یەك شت نەبن.

[2] واتە ئەگەر ئایدیە لە پەیوەندی لە گەڵ بابەتدا بووایە، لەو شێوەیەدا، بە پێی هاوبەشی بابەت لێیاندا، بونیان نەبوو، و باقی ناوەرۆکەکانی تر جیاواز نەدەبوون، بە پێی پێناسەکەی ئەرستۆ، ناوەرۆك نابێت لە بابەتەکاندا بێت.

لەم گوتەیە ڕوون ئەبێتەوە کە((تاك شت)) و((چی بوون)) یەکێك و هەمانن، ئەویش نەك دەرکەوتانە، و هەروەها ئەوەی (٢٠) ناسینی هەر((تاك شت))ێك هەمان ناسینی چی بوونیەتی، بەو شێوەیەی کە خرایە ڕوو، ئەوە پیشان ئەدرێت کە هەردووکیان پێویستانە یەکێکن.

بەڵام لەوەیدا کە دەرکەوتانە ناوئەنرێن، بۆ نموونە وەك ((مۆسیقاپ)) و((سپی))، لەوێوە کە بەڵگەن لەسەر دوو جۆر، ڕێك نیە کە بڵێن چی بوون و((خودی شت))ەکە هەمان یەکترن(٢٥) چونکە((سپی)) هەم بەو شێوەیە کە ئەم دەرکەوتیەتی ئەوترێت و هەم لە خودی دەرکەوتدا، چونکە لەڕوانگەیەکەوە هەمان یەکترن، بەڵام لەڕوانگەیەکی ترەوە چی بوون و خودی شتەکە، لەواندا وەك یەك نین((هەمان نین))، چونکە((مرۆڤ))و((مرۆڤی سپی)) لە ڕوانگەی چی بوونەوە هەمان نین، بەڵام لە ڕوانگەی کرداراندنەوە یان وەسفکردنی(سپی)دا یەکێکن.

هاوکات بێمانا دەبوو ئەگەر کەسێك بۆ هەر یەك لە ((چی بوونەکان)) ناوێکی دابنایە، چونکە لەو شێوەیەدا لە پاڵ ئەو ((چی بوون))ەدا یەکێکی تر دەبوو، بەشێوەیەك(٣٠) بۆ نموونە، بۆ ((چی بوون))ی ئەسپ دیسانەوە((چی بوون))ێکی تر دەبوو[1]، بە بوونی ئەمەش، (ئەتوانین بپرسین) هەنوکە چ بەربەستە کە هەندێك لە شتەکان- ئەگەر چی بوون بە ڕاستی ناوەڕۆکە-لە هەمان سەرەتاوەو بە نۆدەمی،(چی بوون)) بن؟

١٠٣٢a

چونکە نە تەنیا(خودی شت و ماهیەتەکەی) یەکێکە، بەڵکو وشە یان دەربڕینەکەیان یەکێکە، بەو شێوەیەی کە لەوەی کە گوترا ڕوونە، چونکە((یەك بوون))و((یەك)) بە شێوەیەکی دەرکەوتانە یەکێك نین، هەروەها ئەگەر بەدەر بووایە لەمەش، تا ناکۆتا بەردەوام دەبوو، چونکە لەو شێوەیەدا لە لایەکەوە چی بوونی((یەك)) بوونی دەبوو و لە لایەکی ترەوە خودی((یەك))، بەشێوەیەك کە لەم بارەیەشەوە، هەمان بەڵگە هێنانەوەکەی سەرەوە بایەخی دەبوو،

کەواتە هەنووکە ڕون ئەبێتەوە کە لەو شتانەی کە ((یەکەمیانە و لەخۆیانە))(٥) ناو ئەنرێن،((تاك شت بوون))و((تاك شت)) یەکێك و هەمانن، نکۆڵیەکان و ڕەخنەکانی سوفیستاییەکان سەبارەت بەم بابەتەش هەر لەم ڕێگایەوە چارەسەر ئەکرێت، بۆ نموونە

[1] ئەم بێ مانایە کاتێك ڕوو ئەدات کە بە جیا لە ماهیەت سەیری شتەکان بکەین و لەبەرچاویان بگرین.

ئەم پرسیارە کەئایا: ((سوقرات))و((سوقرات بوون)) هەمانن؟ چونکە جیاوازی نیە کە مرۆڤ لە چ بابەتێکەوە مەسەلەیەك ئەخاتە ڕوو، یان بە چ شێوەیەك ڕێگە چارە سەرکەوتووەکەی ئەدۆزێتەوە،(١٠) بەم شێوەیە ڕوونمان کردەوە کە چۆن و تا چ ئەندازەیەك ((چی بوون)) هەمان((تاك شت))ە، و تا چ ئەندازەیەك و چۆن هەمان نیە.

"وەرزی حەوتەم"

# ( پێکهاتن و جۆرەکانی )

لە شتە ((پێك هاتوەکان)) هەندێك لەسەر بنەمای سروشت، و هەندێکی تر بە هۆی هونەر و هەندێك خۆ لەخۆ،پێك دێن، و هەموو پێکهێنەرەکان((بە هۆی)) شتێك و لە شتێکەوە پێك دێن، و ئەبن بە((شتێك))، مەبەستم لە((شتێك)) بە پێی هەریەك لە گووتەکانە،(١٥) واتە یان((ئەم شتە لێرەدا)) یان چەندایەتیەك، و یان چۆنایەتیەك، یان ئەتوانێت شوێنێك بێت.

پێکهاتنە سروشتیەکان ئەوانەن کە پێکهاتنیان لە رێگای سروشتەوەیە، ئەوەی کە شتێك لێیەوە پێك دێت ناوی ئەنێین(( مادە))، و ئەوەی کە ((بە هۆی)) ئەوەوە، شتێك پێك دێت ئەوەیە کە سروشتانە بوونی هەیە، ئەوەی کە ئەبێت بە شتێك، مرۆڤ یان گیا یان شتێکی تری لەم شێوەیەیە کە بە تایبەتی ئەوانە ناوئەنێین ((ناوەرۆکەکان))،(٢٠) هەموو پێکهاتووەکان، بەدەر لەوەی کە سروشتانە یان لە رێگای هوونەرەوە(پێك دێن) خاوەنی مادەن، چونکە هەریەکە لەوانە هەم ئەگەری بوونیان هەیە و هەم ئەگەری نەبوون، و ئەم(ئەگەرە) لە هەریەك لە شتەکاندا مادەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی کە شتێك (( لەوەوە ex hou)) پێك دێت سروشتە، و ئەوەی کە شتێك(( بە پێی ئەو kath ho)) پێکدێت دیسانەوە هەر سروشتە، چونکە هەر پێکهاتوویەك خاوەنی سروشتە، وەك گیا و ئاژەڵ، و ئەوەی ((بە هۆی ئەو))(شتەکان) پێك دێن، ئەوەیە کە((سروشت بە پێی شێوە)) ناو ئەنرێت و((هاو شێوە))ی شتە پێکهاتوەکەیە(هەرچەندیش کە لە شتێکی تردا بێت) چونکە مرۆڤ، مرۆڤی ئەبێت.

کەواتە ئەو پێکهاتوانەی کە لە ڕێگای سروشتەوە پێك دێن بەم شێوەیەن، جۆرەکانی تری پێکهاتن بە یارمەتی هوونەر(هونەر -پیشەگەری) یان بە یارمەتی تواناداریيەك، یان بەیارمەتی ئەندێشە، هەندێك لەمانەش خۆلە خۆ و بەیارمەتی (ڕێکەوت=بەخت) پێك دێن(٣٠) ڕێك بە هەمان جۆر کە لە بارەی ئەو پێکهاتووانەی کە لە ڕێگای سروشتەوە پێك دێن، چونکە لەویشدا هەندێ جار هەمان لە شتەکان لە ڕێگای تۆو وهەندێ جار بە بێ تۆو پێکدێن، بەڵام لەم بارانەوە ئەبێت دواتر توێژینەوە بکەین.

١٠٣٢b

بە یارمەتی هوونەر شتانێك پێکدێن کە ((شێوە))ی ئەوانە لە ڕۆح و دەرووندایە، مەبەستم لە ((شێوە to aidos)) چی بوونی هەر تاك شتێك و ناوەڕۆکی یەکەمین(پێشینە)یە، چونکە ((دژەکان))یش بە شێوەیەك لە شێوەکان خاوەنی شێوەن، چونکە ناوەڕۆکی نەبوونی، ناوەڕۆکی بەرامبەرە، وەك ئەوەی کە تەندروستی ناوەڕۆکی نەخۆشیە، چونکە ((نا ئامادەیی apousia)) تەندروستی، نەخۆشیە،(٥) بەلام تەندروستی مانایەك و ناسینێکە لە دەروونـدا(ڕۆح)، هەنوکە مانای((تەندروست))لە دوای ئەندێشە بەم جۆرە پێك دێت، چونکە تەندروستی((ئەمە))یە، ئەگەر کەسێك تەندروست بێت، ((ئەمە)) پێویستانە پەیوەست ئەبێت بەوەوە، بۆ نموونە، هاوسەنگی میزاج، و ئەگەر ئەبێت بەم جۆرە بێ، ئەبێت گەرما(سروشتیەکەی لاشە بونی هەبێت) و (پزیشك) بەردەوام بەم شێوەیە بیر ئەکاتەوە تا بەو شتە بگات کە خۆی لە کۆتاییدا(١٠) ئەتوانێت هەڵیکەنێت، ئەوکات جوڵەیەك کە بەم هۆیەوە دەست پێکراوە، و بەئاراستەی((تەندروست کردن))دایە، پێی ئەوترێت((دروست کردن))، لەبەر ئەمە بە مانایەك ئەنجام ئەمە ئەبێت کە تەندروستی لە تەندروستی، و خانو لە خانو، پێك دێت، واتە شتێك کە خاوەنی مادەیە لە شتێکەوە پێك دێت کەخاوەنی مادە نیە، چونکە هوونەری پزیشکی و هوونەری بیناسازی ((شێوەی)) تەندروستی و خانوون، مەبەستم لە ناوەڕۆکی بێ مادە،((چی بوون))ە.

(١٥) لە پێکهاتنەکان و جوڵەکان، بەشێك((بیرکردنەوە))و بەشێکی تر((دروست کردن))یان پێ ئەوترێت، ئەو بەشە کە لە لایەنی بنەماو شێوەوە پێش ئەکەوێت، بیرکردنەوەیە و ئەو بەشە کە لە سنوری کۆتای بیرکردنەوەوە دەست پێ ئەکات، دروست کردنە، هەر شتێکی تر لە نێوان ئەمانەشدا ،هەربەم شێوەیە دروست ئەبێت، مەبەستی من ئەوەیە کە: ئەگەر کەسێك بیەوێت تەندروست بێت، ئەبێت میزاجی

هاوسەنگ بێت، بەڵام هاوسەنگ بوونی میزاج چییە؟ ئەڵێین، بەم شێوەیەو و بەو شێوەیەیە، و ئەمەش کاتێک دێت بەدەستەوە کە گەرمای(سروشتی لاشە) بپارێزرێت، بەڵام ئەم(گەرما سروشتیە) چییە؟ دیسانەوە ئەڵێین ، بەم شێوەیەو بەو شێوەیە، هەنوکە((ئەمە)) خۆهێزانە بوونی هەیەو هاتنە ئارایییەکەی پێشتر لە توانای پزیشکدایە.

هەنوکە ئەوەی((پێکهێنەر یان دروستکەر))ە و جووڵەی((تەندروست کردن)) لەوەوە دەست پێ ئەکات، ئەگەر بە یارمەتی هوونەرەوە بێت، هەمان((شێوەیە)) لە دەروونـدا، و ئەگەر خۆ لەخۆیی بێت، ئەو شتەیە کە پێکهێنەر یان دروست کەرە، جووڵەو دروست کردن، وەك دروست کردن بە یارمەتی هوونەر، لەوەوە دەست پێ ئەکات، بە شێوەیەك بۆ نموونە لە دەرمان سازیدا، لەوانەیە سەرچاوە یان سەرەتا ئیشی گەرم کردنەوەی(لاشەی نەخۆش )ەکە بێت، و ئەم ئیشەش (پزیشك)) لە رێگای ماسازەوە ئەنجامی ئەدات، کەواتە بونی گەرمی لە لاشەدا بەشێکە لە تەندروستی، یان شتێکی لەم شێوەیە بێت،(بێ یارمەتی یان چەندین یارمەتی) کە بەشێکە لە تەندروستی، ئەم پاشکەوتەی شت، هەمان دروستکەرە،-کە بەم شێوەیە بە شێکە لە تەندروستی- یان وەك بەردەکانی بەشێك لە خانوو، یان لە شتانێکی ترە. لەبەر ئەمە ، بەو شێوەیەی کە وترا،((ئەگەر شتێك لە پێش بوونەوەرەوە نەبێت، پێکهاتن مەحاڵە))، کەواتە ڕوونە کە بەشێك یان لەتێك،((پێویستانە بوونی هەیە)) چونکە مادە((بەش))ە، چونکە هەم( لەوەیدا کە پێك دێت) ئامادەیە و هەم خۆی(وەك شتێك) پێك دێت، بەڵام ئایا ئەم(مادەیە) لە ماناشدا بوونی هەیە؟ هەنوکە ئێمە لەبارەی بازنە برۆنزییەکانەوە بە هەردوو شێوەکە ئەڵێین کە چین: هەم ئەڵێین کە برۆنز مادەیە و هەم ئەشڵێین کە((شێوە)) شکڵێکی لەم شێوەیەیە، ئەم((شکڵ))ە ڕەگەزی یەکەمینە، کە(بازنەی برۆنزی) لەودا جێگیرە، بەم شێوەیە بازنەی برۆنزی لە دەربڕین ( یان مانا)دا خۆیشی خاوەنی مادەیە.

بەڵام لەوەی کە(( لەوەوە)) هەروەك مادە، شتەکان پێکدێن، هەندێکیان، ئەوکات کە پێکهاتبن، ئیدی نە ((ئەو))واتە مادە، بەڵکو ناویان ئەنرێت ((ئەوی ekeinion))، وەك پەیکەر کە ئیدی ((بەرد))نیە ،بەڵکو ناوی ئەنرێت ((بەردین)) هەروەها وەك چۆن مرۆڤی چارەسەر کراو، بەناوی ئەوشتەی کە((لەوەوە)) چارەسەر کراوە، ناونانرێت، هۆکارەکەی ئەمەیە کە((پێکهاتن)) هەم لە((نەبوون))ە هەم لە ((بابەت)) کە ئێمە پێی ئەڵێین ((مادە))،وەك چۆن هەم مرۆڤ و هەم نەخۆش تەندروست ئەبن، لەگەڵ ئەوەشدا باشتر وایە بڵێین کە(پێکهاتن)) لە نەبوونی (نەبوون))ەوەیە،وەك چۆن کەسی تەندروست

زیاترلە((نەخۆش))ەوە پێك دێت تا لە((مرۆڤ))ەوە، بەم هۆیەوە كەسی نەخۆش پێی ناوترێت تەندروست، بەڵكو مرۆڤ، ئەویش(( مرۆڤی تەندروست)){ە كە ئەم ناوەڵناوەی ئەرواتە لا }بەلاَم لەوێوە كە ((نەبوون)) شاراوەو بیَ ناوە- وەك نەبوونی شكڵێكی دیاری كراو لە برۆنز یان شكڵی خانوو لە خشتەكاندا(١٥)-گوومان لە پێكهاتن ئەكرێت كە لەمانە بێت، چونكە لەو بارەی (پێشوو، پێكهاتنی تەندروستی) لە نەخۆشەوەیە، لەبەر ئەمە رێك بەهەمان جۆر كە لەوێدا، شت بەناوی ئەو شتەوە كە ((لەوەوە)) پێك دێت ناو ئەنرێت، هەنووكە لێرەشدا پەیكەر نەك((تەختە))- بە گۆڕانێكی بچووك لەواژەكەدا- پێی ئەوترێت((تەختین))، و ئەڵێین ((برۆنزی)) نەك((برۆنز))و ((بەردین)) نەك((بەرد))، لەبارەی خانوشەوە ناڵێین((خشت)) بەڵكو ئەڵێین((خشتین))(٢٠) چونكە ئەگەر كەسێك بە وردی رامێنێت، تەنانەت نابێت بە شێوەیەكی رەها بڵێت كە پەیكەرەكە لە تەختە، یان خانووەكە لە خشتەكان، پێك دێن، چونكە ئەوەی كە شتێك((لەوەوە)) پێك دێت، ئەبێت ((گۆڕاو)) بێت نە((جێگیر وبمێن))بەم هۆیەوەیە كە ئەم(پێكهاتن) بەم شێوەیە ناوئەنرێت.

"وەرزی هەشتەم"

# ( ڕەوەندی پێکهاتن )

لەبەر ئەوەی پێکهاتوو،((بە هۆی شتێکەوە hupo tinos)) پێک دێت،(مەبەستم لەوەیە کە سەرەتای پێکهاتن لەوێوەیە) و((لە شتێکەوە ek tinos))(٢٥)( کە نە نەبوون، بەڵکو مادەیە، چونکە پێشتر دیاری کراوە، کە ئێمە بە چی مانای ئەکەین)، و هەروەها((ئەبێت بەشتێك))،(ئەمە گۆیەکە یان بازنەیەك، یان هەر شتێکی تر کە ڕێککەوتانە بوونی هەبێت) ڕێك بەو جۆرە کە کەسێك((بابەت)) واتە برۆنز دروست ناکات،((گۆ))ش دروست ناکات، مەگەر بە شێوەیەکی دەرکەوتانە،(٢٠)، چونکە گۆی برۆنزی، گۆیەکە، کە ئەو دروستی ئەکات، چونکە دروست کردنی یەك((ئەم شتە))بەمانای دروست کردنی((ئەم شتە)) لە بابەتەکە بە شێوەیەکی گشتیە، مەبەستم ئەمەیە کە((خڕ کردنەوەی برۆنز)) نەك بە مانای دروست کردنی((خڕی یان گۆ))،بەڵکو شتێکی ترە، وەك دروست کردنی((شێوە)) لە شتێکی تردا، چونکە ئەگەر((شێوە)) دروست ئەکات، ئەبێت ئەو لە شتێکی تر دروست بکەن ،ئەمەمان کردبویە((بنەما))، بۆ نموونە گۆیەکی برۆنزی دروست ئەکەن، ئەمە بەو شێوەیەیە کە((لەم شتە)) کە برۆنزە، ((ئەو شتە)) کە گۆیە ،دروست بکەن، هەنوکە ئەگەر خودی((شێوە))ی گۆکەش دروست بکەن، ڕوونە کە هەر بەم شێوەیە دروستی ئەکەین، و بەم شێوەیە ((پێکهاتنەکان)) تا ناکۆتا بەردەوام ئەبن(٥).

لەبەر ئەمە ڕوون ئەبێتەوە کە((شێوە))(یان هەر جۆرێکی تر، کە پەیکەر لە شتێکی هەست پێکراودا ناو بنێن)((پێك نایەت، و ئەوە پێکهاتنی پێ ناوترێت و چی بوونیش

پێکهاتنی نیه))چونکه ئەمە، ئەوەیە کە لە شتێکی تردا پێك دێت، چ بە یارمەتی هونەر، چ بە دەستی سروشت، و چ بە یارمەتی تواناداری، بەلأم((بونایەتی)) گۆیە برۆنزیەکە ئێمە دروستی ئەکەین، واتە ئەو لە ((برۆنز و لە گۆ)) دروست ئەکەین.(١٠) لە((ئەم شتە)) (واتە برۆنز)((شێوە))یەك دروست ئەکەین و ئەنجامەکەشی ((گۆیی برۆنزییە))، بەلأم ئەگەر((گۆ-بوون)) بە شێوەیەکی گشتی خاوەنی پێکهاتن بێت، ئەبێت شتێك لە شتێك پێك بێت، چونکە پێك هاتوو،بە ناچاری، هەمیشە دابەشخوازە، و بەشێکە لە((ئەم شتە))و بەشێکە لە((ئەو شتە)). مەبەستم ئەوەیە کە لەلایەکەوە مادەیەو لەلایەکی ترەوە شێوە، هەنووکە ئەگەر ((گۆ)) شکڵێکە کە دوری چێوەکەی تا چەق یەکسانە، (١٥)بەشێك لەم شتەی کە ئەم لێیەوە پێك دێت، لەودا ئەبێت و بەشێك ئەبێت لەو شتە، و گشت هەمان((شتی پێکهاتوو)) ئەبێت، وەك، گۆی برۆنزی، کەواتە لەوەوە کە وترا روونە کە ئەوەی هەروەك((شێوە)) یان ((ناوەرۆك)) ناوئەنرێت پێك نایەت، بەلأم ئەو((گشتە دیاری کراوە to sunolos))- کە بە پێی ئەو ناو نراوە- پێك دێت، و هەر شتێکی پێکهاتوو لە ئەروونی، لەمادەیە، و بەشێکی ئەم(=مادە)یەیە و بەشێکی ئەو(=شێوە)ەیە.

بەلأم هەنووکە ئایا گۆیەك بەدەر لەم گۆیە دیاری کراوانەو خانویەك بەدەر لەم خشتانە بوونی هەیە؟ ئەگەر بەم شێوەیە بێت، هەرگیز یەك((ئەم شتە)) ش پێك نەدەهات، {شێوە، بەڵگەیە لەسەر(بەم جۆرە))یەك} و یەك((ئەمە)) واتە شتێکی دیاری کراو سنودار نیە، بەڵکو مرۆڤ لە((ئەمە))یەك((ئەم جۆرە)) دروست ئەکات و بەرهەم ئەهێنێت، و ئەوکات کە بەرهەم هات، یەك((ئەمە بەم جۆرە))یە، بەلأم تەواوی((ئەمە)) کە ((کالیاس)) یان((سوقرات))ە، هەروەك((ئەم گۆ دیاری کراوە برۆنزییە))یە،(٢٥) بەلأم((مرۆڤ)) و((گیاندار)) هەروەك((گۆی برۆنزی)) بە شێوەیەکی گشتیە(تەواوەتیە).

کەواتە روونە کە هۆکاری((شێوەکان))( کە هەندێك زۆرجار بەو جۆرە قایلن بە بوونی شێوەکان، ئەگەر ئەوانە شتانێکی بەدەر لە تاکی شتەکان بن) لە روانگەی پێکهاتنەکان وناوەرۆکەکانەوە هیچ سودێکیان نیە، و بەم هۆیەوە هۆکارەکان ناتوانن ناوەرۆك گەلێك بن لە خودی خۆیاندا، لە لای هەندێ لە شتەکان روونە کە((بەدی هێنەر)) جۆرێکە لە ((بەدی هاتوو))، ((بە بونی ئەمەش، ئەمە خودی ئەو نیە))، واتە لە روانگەی ژمارەوە یەکێك نیە، ((بەڵکو لەروانگەی شێوەوە لەگەڵیدا یەکیکە))، بە هەمان شێوە کە لە بارەی شتە سروشتیەکانیشەوە ئەبینرێت،((چونکە مرۆڤ ،مرۆڤ بەدی ئەهێنێت))، مەگەر ئەوەی کە شتێك بە پێچەوانەی سروشت پێك بێت، وەك کاتێك کە ئەسپ ،هێستری ئەبێت، بەلأم

لەم بارەیەشەوە شێوازەکە هەربە هەمان شێوەیەیە، چونکە ئەوەی کە لە نێوان ئەسپ و وڵاخدا هاوبەشە، واتە نزیکترین جۆری سەرووی ئەوان، ناوێکی دیاری کراوی نیە، بەڵام لەوانەیە هەردووکیان بێت، رێك وەك هێستر.

لەبەر ئەمە روونە کە ((بە هیچ شێوەیەك پێویست نیە کە شێوە وەك هەروەك ((پێشەنگ یان نموونە)) جێگیر بکەین))، چونکە ئەگەر وابێت، ئەبێت بۆ ئەم جۆرە شتانە، بەدوای((ئایدیە))دا بگەڕێین، چونکە ئەمانە زیاد لە هەموویان، و بە تایبەتی، لە ریزی ناوەرۆکەکانن)، تەنها بەسە کە بەدیهێنەر ،بەدی بهێنێت، و هۆکاری((شێوە)) لە ((مادە))دا بێت،(٥)ئەوکات((گشت to hapan )) واتە ((ئەمە بەم شێوەیە)) لە((ئەم گۆشتە))و((ئەم ئێسقانانە))، کالیاس یان سوقرات هەیە، کە لە ڕوانگەی مادەوە جیاوازن،(چونکە خودی مادە جیاوازە) بەڵام لە روانگەی شێوەوە یەکێکن و هەمانن، چونکە((شێوە دابەشنەخوازە-واتە دابەش نابێت)).

"وەرزی نۆیەم"

# ( پێکهاتن خۆ بەخۆ، و پێکهاتن لەسەر بنەمای گوتە جیاوازەکان )

لێرەدا کەسێك لەوانەیە سەرگەردان بێت و بپرسێت کە بۆچی هەندێ لە شتەکان، هەم بە یارمەتی هوونەر و هەم خۆ لەخۆ، پێك دێن، وەك تەندروستی و هەندێك بەو شێوەیە نا، وەك خانوو؟(١٠)هۆکارەکەی ئەمەیە کە لە هەندێك لە شتەکاندا، مادە کە خاڵی سەرەتای پێکهاتن و پەیدا بوونی گوزەری دروست کردن وپێکهاتنی ئەو شتانەیە کە بەرهەمی هونەرن، و بەشێك لەو شتە لەودا بوونی هەیە، بەشێك، بەو شێوەیەیە کە ئەتوانێت خۆی بجووڵێنێت و بەشێکی تر بەم شێوەیە نیە، لە بەشی یەکەمیشدا هەندێك ئەتوانن بەو شێوەیەی کە پێویستە، بێنە جووڵەو هەندێك بێتوانان،چونکە زۆرێك لە شتەکان ئەتوانن خۆیان بێنە جووڵە، بەلا'م نە بەو جۆرەی کە ئەبێت هەبێت،(١٥) وەك سەماکردن، کەواتە شتانێك کە مادەکەیان لەم جۆرەیە،(وەك بەردەکان)، ناتوانن بەو شێوەی کە پێویستە بێنە جووڵە، مەگەر بە یارمەتی شتێکی تر، و لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی تر جووڵاون، وەك ئاگر کە بەم شێوەیەیە، بەم هۆیەوە هەندێ لە شتەکان بە بێ دەست تێوەردانی کەسێك کە خاوەنی هوونەرە بوونیان نابێت، بەڵام هەندێك بوونیان ئەبێت، چونکە ئەم جۆرە شتانە بە یارمەتی شتانێك دێنە جووڵە کە خاوەنی هونەر نین، بەڵام خۆیان ئەتوانن(٢٠) یان بە هۆی شتانێکی تر کە خاوەنی

هونەر نین بێنە جووڵە، یان بە یارمەتی جووڵەی بەشێك ( لەوەی کە لە شتەکەدا بوونی هەیە).

لەوەیدا کە گووترا، ڕوون ئەبێتەوە کە هەموو شتەکان، بەم شێوەیە، لە شتێکی بێناوەوە پێك دێن،(بۆ نموونە ئەو شتانەی کە خۆسروشتانە پێك دێن) یان لە بەشی شتێك، کە هاوناوی ئەوانەیە،(وەك چۆن خانو لە خانوو، لەو ڕوانگەیەوە کە بە یارمەتی ئەقڵ یان ئەندێشەی(بیناسان) پێك دێت، چونکە هوونەر هەمان((شێوەیە)),یان لە شتێك کە خاوەنی بەشێك لەوانەیە(٢٥) ئەگەرنا بە شێوەیەکی دەرکەوتانە دێتە بوون،چونکە یەکەمین هۆکاری دروست بوون، خۆی لە خۆیدا بەشێکە(لە بەرهەم)، گەرمایەك کە لە جووڵەیەکدا شاردراوەتەوە، لە لاشەدا ((گەرم بوون)) دروست ئەکات، و ئەمەش خۆی بۆخۆی تەندروستی یان بەشێك لە تەندروستییە، یان بەشێك لە تەندروستی بەدوای ئەوەوە دێت یان خودی تەندروستی، بەم هۆیەوەیە کە ئەگووترێت((گەرما)) تەندروستی بەرهەم ئەهێنێت، کە تەندروستی ئەنجامە دەرکەوتانەکەیەتی،(٣٠) ((لەبەر ئەمە بە هەمان جۆر کەلە پێوانەکاندا سەرتای هەر شتێك ناوەرۆکەکەیەتی"چونکە پێوانەکان لە (چیەتی)یەوە سەرچاوە ئەگرن"،پێکهاتنەکانیش لێرەدا بەم شێویەن)).

لەبارەی ((شکڵبەندیە ta sunistamena)) سروشتیەکانیشەوە شێوازەکە هەر بەهەمان شێوەیە((هەروەك لەبارەی شتە دروستکراوەکانەوە)، چونکە تۆو ڕێك هەمان جۆر دروست ئەکا(بەرهەم ئەهێنێ) وەك هاوشێوەی بەرهەمەکانی هوونەر، چونکە خۆهێزانە خاوەنی شێوەیە، و ئەوەی کە تۆو لەوەوە دێت بە شێوەیەکی هاوناو شتێکە کە بەرهەمی تۆوە،(بەڵام نابێت بە دوای ئەوەدا بگەرێین کە هەموو شتەکان بەو شێوەیە بێنە بوون(پێك بێن) کە مرۆڤ لە مرۆڤ، دێتە بوون، چونکە ژنیش لە پیاوەوە دێتە بوون)،مەگەر ئەوەی کە بوونەوەرێکی کەم و کوڕ بێت، بەم هۆیەوەیە کە هێستر لە هێسترەوە نایەتە بوون.

١٠٢٤b

بەڵام شتە خۆبەخۆکان، ڕێك بە هەمان جۆر دێنە بوون کە(هەروەك بەرهەمە هوونەرییەکان)، و ئەمانە(٥) شتانێکن کە مادەکەیان ئەتوانێت خۆی بە هەمان شێوەیە بهێنێتە جووڵە کە تۆو دێتە جووڵە، شتانێك کە تواناییەکی لەم شێوەیەیان نیە، ناتوانن بە جۆرێکی تر پێك بێن(بێنە بوون) جگە لە هاوجۆرەکانیان.

بەڵام بەڵگەدارییەکەی ئێمە لەبارەی ناوەرۆك نەتەنیا ڕوونکەرەوەی ئەوەیە کە((شێوە،پێکهاتن، (دروست بوون) ناخوازێت و قبوڵ ناکات))بەڵکو بەڵگەیەکی

هاوبەشە بۆ(١٠) هەموو شتە یەکەمینەکانی تری وەك((چەندایەتی و چۆنایەتی و باقی گووتراوەکانی تر))، چونکە رێك بە هەمان شێوە کە((گۆی برۆنزی)) دێتە بوون، بەڵام نە((گۆ))و نە((برۆنز))-لە بارەی برۆنزیش ئەگەر پێك بێت هەر بەم شێوەیەیە،(چونکە مادەو شێوە ئەبێت هەمیشە ،پێشتر بوونیان هەبێت)، هەربەم شێوەیەشە لەبارەی((چیەتی))و چۆنایەتی و چەندایەتی و باقی گووتراوەکانی تری لەم جۆرە، چونکە نە چۆنایەتی، بەڵکو(١٥) تەختەی خاوەن چۆنایەتیە کە پێك دێت، نەك چۆنایەتی، بەڵکو تەختە یان گیانداری خاوەن چۆنایەتیە کە(پێك دێت،دێتە بوون)..((بەلاّم لەم نێوانەدا تایبەتمەندی ناوەرۆك لێرەدایە کە: ئەبێت کردارییانە(یان لەوپەڕی هاتنە ئارایی) ناوەرۆکێکی تر ، پێشتر بوونی هەبێت)) کە ئەو بێنێتە بوون، هەروەك ئاژەڵ، کاتێك کە ئاژەڵێك دێتە بوون، بەڵام لەبارەی چۆنایەتی یان چەندایەتی، مەسەلەیەکی لەم شێوەیە پێویست نیە، مەگەر تەنیا خۆهێزانە بێت.

"وەرزی دەیەم"

# ( پێناسەی بەش و پێناسەی گشت )

(۲۰)لەوێوە کە پێناسە (ho horismos)مانایەکە (زانینێکە logos)، و هەر مانایەك خاوەنی بەش گەلێکە، وبەهەمان جۆر کە ((مانا)) لە پەیوەست بوون لە گەڵ ((شت))دایە، ((بەشی مانا))ش پەیوەست ئەبێت لەگەڵ ((بەشی شت to pragma))، جاروبار ئەم گومانە دێتە ئاراوە کە ئایا مانای بەش ئەبێت لە مانای گشتدا، بگونجێنرێت ، یان نا؟ لە هەندێکدا بە ڕوونی ئەوە ئەبینین کە گونجێنراوەو لە هەندێکی تردا نا،(۲۵) چونکە مانای بازنە خاوەنی مانای لەتەکانی(پارچەکانی) نیە، بەلاّم مانای((حونجە-پارچە پیتەکان)) خاوەنی مانای پیتەکانە، بە بوونی ئەمە بازنەش بە هەمان شێوە بۆ پارچەکان دابەش ئەبێت کە پیتەکانی ئەلف بێ دابەش ئەبن بۆ((پارچە پیتەکان)).

هەربەم شێوەیە ئەگەر(( بەشەکان)) لە پێش ((گشت))ەوەن، وگۆشەی داخراو بەشێکە لە گۆشەی وەستاو و پەنجە بەشێکە لە ئاژەڵ، لەو شێوەیەدا گۆشەی داخراو لە پێش گۆشەی وەستاو پەنجە لە پێش ئاژەڵەوە ئەبێت، (۳۰) بەلاّم گومان لەوە ئەکرێت کە ئەمانە پێشین و لە پێشتر بن، چونکە لە ڕوانگەی ماناوە بەشەکان بە پێی ئەوانەوە ئەگوترێن، و لە ڕوانگەی بوونایەتیەوە بە بێ یەکتریش (گشتەکان، واتە گۆشەی وەستاو ئاژەڵ)لە پێشترن، لەم نێوانەدا ((بەش)) بە چەندین جۆر ئەگوترێت، کە یەکێك لە شێوەکانی((ئەندازە بە پێی چەندایەتیە))،بەلاّم هەنووکە با ئەمە بخەینە لاوە، و ئەبێت توێژینەوەی ئەوە بکەین کە {((هەروەك بەشەکان))}، ناوەڕۆکە لە خۆگرەکەی ئەوانە.

١٠٣٥a

كەواتە ئەگەر لە لایەكەوە مادەیە، لە لایەكی ترەوە شێوەو سەرەنجام ئەوەی كە(تێكەڵە)یەكە لە هەردووی ئەوانە، و هەروەها ئەگەر مادەو شێوە و ئەوەی كە لە هەردووكیانە، ناوەرۆكن، كەواتە ئەگەر بە مانایەك ئەتوانین مادە بە((بەشی شتێك))ناوبنێین، و بە مانایەكی تر نا، بەڵكو تەنیا ئەوەی كە مانای شێوە لێیانەوە پێك دێت، وەك ئەوەی كە گۆشت بەشێك لە((پوكی)) نیە،(٥) (چونكە مادەیەكە كە ئەم، لەوەوە پێك دێت)بەڵكو بەشێكە لە((پان بینی))، هەروەها((برۆنز)) بەشێكە لە ((گشتە دیاری كراوەكەی))پەیكەرەكە، بەلام نەك لە پەیكەر، هەروەك ئەوەی كە ناوی بنرێت شێوە، چونكە شێوەو شتێك و ئەوەی كە هەروەك بوونی شێوەیە، ئەبێت ناوی بنرێت((تاك شت)) ێك،

بەلام بەشە مادیەكە هەرگیز نابێت خودیانە ناوی بنێین، بەم هۆیەوەیە مانای بازنە، مانای لەتەكانی (پارچەكانی)(١٠) لەخۆ ناگرێت، بەلام مانای(لەتە پیتەكان=حونجەكان) مانای پیتەكانی ئەلف وبێ لەخۆ ئەگرێت، چونكە پیتەكان، بەشەكانی مانای شێوەن ومادە نین، بەلام (پارچەكانی) بازنە بەم مانایە ((بەشەكان))ن كە بە مادەیەك ئەژمار ئەكرێن كە شێوە بەسەریدا دائەبڕێت، بە بوونی ئەمەش لە شێوەوە نزیكترن تا لە برۆنزەوە، كاتێك كە ((گۆ))بوون لە برۆنزەوە دێتە بوون.

بەلام لە روانگەیەكیشەوە هەموو پیتەكانی ئەلف بێ لە ناوەوەی مانای (حونجەكانەوە) بوونیان نیە،(١٥): بۆ نموونە ئەم پیتانەی سەر تابلۆ مومینەكە، یان (ئاوازگەلێك) لە هەوادا، چونكە ئەمانەش پێشتر هەروەك مادەیەكی هەست پێكراو، لە ریزی حونجەكانن، چونكە ئەگەریش هێڵ بەهۆی دابەشبونەوە بەردەوام نێوە بكرێت، یان مرۆڤ بەهۆی توێكاریەوە بۆ ئێسقان و دەمارەخانەو گۆشتەوە، وون ببێت، نابێت بگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئەوانە( ئەو بەشانە) هەروەك بەشەكانی ناوەرۆكەكەیان بوونیان هەیە، بەڵكو(٢٠) لەوانەوە وەك مادەیەكی خۆی پێك هاتوون، كە لەگەڵ ئەوەشدا بەش گەلێكن لە گشتە دیاری كراوەكان، بەلام بەشگەلێك لە شێوە، و ئەوە نین كە ماناكەیان لەخۆی ئەگرێت، بەم هۆیەوەیە كە لە هەندێ لە شتەكاندا، مانای ئەو جۆرە بەشگەلە بوونی هەیە، بەلام لە هەندێكیشدا پێویست نیە كە بوونی هەبێت ،مەگەر ئەوەی كە مانا لە شتێكی كۆكراوەوە پێك هاتبێت، لەم رووەوە هەندێك لە شتەكان لە بەشگەلێكی لەم جۆرەی هەروەك سەرچاوەكانیان (٢٥) پێك هاتوون،( و بەهۆی جیاكارییەوە) لەواندا لەناو ئەچن و نادیار ئەبن، بەلام هەندێكی تر بەم شێوەیە نین،

هەموو ئەو شتە کۆبووەکان لە شێوەو مادە، هەروەك((پان بینی)) و((بازنەی برۆنزی)) لەم بەشانەی خۆیاندا نادیار ئەبن و لەناوئەچن، و بەشێك لەوانە مادەیە، بەڵام شتانێك کە لە گەڵ مادەدا کۆنەبوونەتەوە بەڵکو بە بێ مادەن، و ماناکانیان تەنیا مانای شێوەیە، لەناو ناچن و لەبەر چاو وون نابن، یان بە شێوەیەکی گشتی، یان بە لایەنی کەمەوە بەم شێوەیە، (لەناوچوون ولەبەر چاو وون بوون لەبەرنامەیاندا نیە).(٣٠)لەبەر ئەمە ئەمانە سەرچاوەو بەشەکانی ئەو شتە(کۆبووەوانەن) بەلاّم نە بەشەکانی شێوەن و نە سەرچاوەکانیان، بەم هۆیەوە پەیکەری گڵین لەگەڵ و بازنەی برۆنزی لە برۆنز و((کالیاس)) لە گۆشت و ئیسقاندا، لەناو ئەچن و لەبەر چاو وون ئەبن، و هەروەها بازنە لە پارچەکانیدا، چونکە ئەوە شتێکی کۆبووەوەیە لە مادە، لەبەر ئەوە بازنەش هەم بە شێوەیەکی ڕەها ناو ئەنرێت و هەم بە پێی بازنە بەشەکیەکانی، ئەویش هەم بە شێوەیەکی هاوناوی، چونکە ناوێکی تایبەت بۆ شتێکی لاوەکی(بەشەکی) بوونی نیە.

هەنوکە بەم شێوەیە ئەوەی کە راستە گووترا، بە بوونی ئەمە با مەسەلەکە دەست پێ بکەینەوەو بە ڕوونتر دەری بڕین، (٥) هەموو ئەو شتانەی کە بەشەکانی مانان، و مانا بۆ ئەوانە دابەشخوازە،((لە پێشن= پێشترینن= پێشکەوتن)) یان هەموویان، یان هەندێکیان، بەلاّم مانای گۆشەی وەستاو دابەشخواز نیە بۆ مانای گۆشە داخراو، بەڵکو مانای ((داخراوی)) لە ((وەستاوی))دا دابەش ئەبێت، چونکە کەسێك کە پێناسەی گۆشەی داخراو ئەکات، وەستاوی بەکار ئەهێنێت، چونکە داخراوی کەمترە لە وەستاوی گۆشەکە، لە بارەی بازنەو نیوە بازنەشەوە هەربەم شێوەیەیە، چونکە(١٠) نیوەبازنە هەر بە پێی بازنە پێناسە ئەکرێت، و پەنجە هەروەك هەموو لاشە، پەنجە یەك((بەم شێوەیە))یە لە لاشەی مرۆڤ، لەبەر ئەمە ئەو بەشانەی کە هەروەك مادەن و شتێك وەك مادە بۆ ئەوانە دابەشخوازە، ((پاشکەوتن-دواییننن)) بەلاّم شتانێك کە هەروەك بەشەکانی مانا و بەشەکانی ناوەرۆك لەسەر بنەمای مانان، ((پێشکەوتن-لەپێشن)) یان هەموو یان هەندێکیان، بەلاّم لەوێوە کە گیانی گیانەوەران (چ ئەمە ناوەرۆکی گیانەوەرە) بە پێی مانا(١٥) ناوەرۆکە، و هەروەها شێوە و ((چی بوون))(ماهیەت) یەك ((بەم شێوەیە))ی لاشەیە،( بەلایەنی کەمەوە هەر بەشێك ئەگەر بە دروستی پێناسە بکرێت، ناتوانێت بە بێ چالاکی ئەو پێناسە کرابێت، و ئەمەش بە بێ پەی بردنی هەستەکی ناتوانێت بێتە بوون) لەبەر ئەمە بەشەکانی(واتە بەشەکانی گیان)، یان هەموویان، یان هەندێکیان، ((لە پێشتر لە گشت گیانەوەرەکانن)) و لە بارەی هەریەك لەگیانەوەرەکانیشەوە هەر بەم شێوەیەیە؛(٢٠) و لاشە و بەشەکانی((پاشکەوت)) یان((دواهاتن)) لە دوای ئەم

ناوەرۆکەوە، و ئەمە نەك ناوەرۆك، بەڵکو ((گشتی دیاری کراوە))کە دابەش ئەبێت بۆ بەشەکانی ئەو هەروەك مادە دابەش ئەبێت، کەواتە بە مانایەك ئەم بەشانە((لە پێش)) گشتەوەن، بەلا م بە مانایەکی تر نا، چونکە بە جیا ناتوانن بوونیان هەبێت، یەك پەنجە ناتوانێت لە هەر شێوازێکدا کە هەبێت، بەشێك بێت لە گیانەوەر، بەڵکو پەنجەی مردوو تەنیا لە روانگەی((هاوناوی)) یەوە بەو شێوەیەیە ،{و بە بەشێك لە لاشە و جەستەی گیانەوەرەکە ئەژمار ئەکرێت}.(٢٥) بەلا م هەندێك لە بەشەکانیش هاوکات و هاوڕان لەگەڵ گشتدا، ئەمانە ئەو بەشە گرنگانەن کە ماناو ناوەرۆك، یەکەمجار لەواندا دەست ئەکەون، هەروەك دڵ و مێشك، و جیاوازی ناکات کە کامیان بەو شێوەیەن، بەلاَم((مرۆڤ)) و ((ئەسپ)) و شتانێکی لەم جۆرە کە بە پێی تاکەکان پێیان ئەگووترێت بەشەکی و بەلاَم گشتین، ((ناوەرۆك)) نین، بەڵکو گشتێکن کە لەخۆگری ((ئەم مانا دیاری کراوەو))و((ئەم مادە دیاری کراوە))ن، کە پێیان ئەوترێت ((هەروەك گشتایەتی)).(٣٠) بەلاَم بە پێی تاکی بەشەکی، بۆ نموونە سوقرات، وەك پاشکەوتی مادە((یان مادەی کۆتای)) بوونی هەیە، و بەم شێوەیەشە لە بارەی شتەکانی تر.

کەواتە بەشیش لە لای شێوەوە دەست ئەکەوێت، (مەبەستم لە شێوە، چی بوونە)،هەم لە لای ((گشتی دیاری کراوی)) پێکهاتوو لە مادە و شێوە، و هەم لە لای خودی مادە، بەلاَم تەنیا بەشەکانی شێوەن کە بە بەشەکانی مانا ئەژمار ئەکرێن، و ماناش بۆ گشتایەتیە

١٠٣٦a

، چونکە((بوونایەتی بازنە))و بازنە ،و((بونایەتی دەروون)) و دەروون، یەك شت و هەمانن، بەلاَم (( بۆ گشت))شتێکی دیاری کراو، وەك((ئەم بازنەیە لێرەدا)) و بۆ تاك شتە بەشەکیەکان، بەدەر لە هەست پێکراو ئەقڵێنراو، (مەبەستم لە ئەقڵێنراو ،وەك شتە بیرکارییەکان، و لە هەست پێکراو وەك، شتە برۆنزی و تەختەییەکان) پێناسەیەك بوونی نیە(٥)، بەڵکو بە یارمەتی ئەندێشە یان پەی بردنی هەستەکی ئەناسرێن، و ئەگەر لە ((ئەوپەڕی هاتنە ئارایی entelekheia)) بچنە دەرەوە، ئیدی ڕوون نیە کە ئایا هەن یان نین، بەڵکو هەمیشە بە پێی مانای گشتی ئەگووترێن و ئەناسرێن، بەلاَم(( مادە خۆی لەخۆیدا،ناناسرێت)) مادە هەندێکی هەست پێکراوە و هەندێکی ئەقڵێنراو،{مادە}ی هەست پێکراو، وەك برۆنز و تەختە و ئەوەی کە مادەی جوولاَوە، و مادەی ئەقڵێنراو- ئەوەیە کە لە هەست پێکراوەکاندا بوونی هەیە، بەلاَم نەك هەروەك هەست پێکراوەکان- وەك شتە بیرکارییەکان. کەواتە لەبارەی چۆنایەتی((گشت))و((بەش)) و هەروەها لە

بارەی ((لە پێشتر- پێشکەوت)) و((دواکەوت=پاشکەوت)) قسە کراوە، بەڵام لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەم پرسیارەدا، هەرکاتێك کەسێك بپرسێت کە : ئایا(١٥) گۆشەی وەستاو و بازنە و گیاندار لە پێشن و پێشکەوتن، یان بەشەکین کە ئەمانە بۆیان دابەش ئەبن و لەوانەوە دێنە بوون؟ بەناچاری ئەبێت بڵێین کە هیچ یەك لەوانە بە شێوەیەکی ڕەها بەو شێوەیە نیە، چونکە ئەگەر گیان یان دەروون هەمان ئاژەڵ و بوونەوەری گیاندار، و گیانی بوونەوەری تاك، هەمان بوونەوەری تاکە، و بازنە هەمان((بوونایەتی بازنە))، و((وەستاو- بوون)) و((ناوەرۆکی گۆشەی وەستاو)) هەمان گۆشەی وەستاوە، لەو شێوەیەدا ئەبێت بڵێین کە گشت بە مانایەك((لە پێش بەشەکانەوەیە))-بەیەك مانا- واتە لەو بەشانەی کە لە مانادا و لە یەك گۆشەی وەستاوی دیاری کراون، (چونکە هەم گۆشەی وەستاوی هەبوو لە مادە، واتە گۆشەی وەستاوی برۆنزی، و هەم گۆشەی وەستاوی پێك هاتوو لە هێڵە تاکەکان، ((لە دوا،پاشکەوت))ی بەشەکانی خۆن))، گۆشەی وەستاو بە بێ مادە پاشکەوتی ئەو بەشانەیە کە لە مانادا بوونیان هەیە، بەڵام ژ بۆ ئەو بەشانەی لە شتە تاکەکاندا بوونیان هەیە، لەپێشترن، کەواتە بە شێوەیەکی ڕەها نابێت بگووترێت، تەنانەت ئەگەر((گیان یان دەروون)) شتێکی تری بەدەر لە ((ئاژەڵ)) بێت، دیسانەوە-بەو شێوەیەی کە گووترا- ئەبێت بڵێین کە هەندێك لە شتەکان(٢٥) پێشکەوت و هەندێکی تر پاشکەوتن.

"وەرزی یانزەیەم"

## ( بەشەکانی شێوەو بەشەکانی شتی پێکەوە کۆبووەوە )

لێرەدا، بەراستی، گومانێك دێتە ئاراوە کە شێوە خاوەنی چ جۆرە بەش گەلێکە و شتی کۆبووەوە خاوەنی چ بەش گەلێکی ترە؟ هەنووکە تا ئەم خاڵە ڕوون نیە. ئەگەری پێناسە کردنی ((تاك شت)) نیە، چونکە(( پێناسە بۆ گشتایەتی و بۆ شێوەیە))، کەواتە ئەگەر ڕوون نەبێتەوە کەچ جۆر گەلێ لە بەشەکانی مادەن، و چ جۆرێك بەم شێوەیە نین، (٣٠) مانای((شت))یش ڕوون نابێتەوە، هەموو ئەوشتانەی کەوا دێنە بەرچاو لە روانگەی شێوەوە لە مادە جیاوازەکان پێك دێن، وەك بازنە لە برۆنز، و بەرد و تەختە، گومانی ئەوە هەیە کە ڕوون بێتەوە کە ئەمانە، واتە برۆنز و بەرد، بەشێك لە ناوەرۆکی بازنە نین، چونکە بازنەیەکی جیا لەمانە بەدەست نایەت، بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە بە جیا نابینرێن.

١٠٣٦b

(٣٥) هیچ بەربەستێك نیە لەوەی کە لەهەمان بارودۆخدا(شێوان)دا بن، ڕێك وەك چۆن بڵێی هەموو ئەو بازنانەی کە هەرگیز نابینرێن، برۆنزی بوون، چونکە بە بوونی ئەمە، ئەوکاتیش، برۆنز ناتوانێت بەشێك لە ((شێوە)) بێت، بەڵام جیاکردنەوەی ئەوە بۆ ئەندێشە قورسە، وەك شێوەی ((مرۆڤ))کە هەمیشە لە گۆشت و ئێسقان و بەشگەلێکی لە شێوەی ئەمانە پێك دێت، (٥) بەڵام ئایا ئەمانە بەشگەلێکن لە شێوەو مانا؟ یان نا، بەڵکو مادەن، بەڵام لەبەر ئەوەی شێوەی مرۆڤ لە مادەگەلێکی تر ڕوو نادات، ئێمە ناتوانین بە

جیا بیدۆزینەوە؟ لەوێوە کە گوومان ئەکرێت شتێکی لەم شێوەیە ئەگەری هەبێت، بەڵام لە چ کاتێکدا ئەوە ڕوون نیە، هەندێ کە لە بارەی بازنە و سێ گۆشە دووچاری گومان بوون، بە شێوەیەك کە پێناسەکەیان، (بازنەو سێ گۆشە) بە یارمەتی هێڵەکان- و لەروانگەی پەیوەندیەوە- بە شایستە نازانن، بەڵکو هەموو ئەمانە وەك بڵێی بە هەمان جۆرن کە گۆشت و ئێسك بۆ مرۆڤ و برۆنز بۆ پەیکەر، ئەمانە هەموو شتێك بۆ ژمارە ئەگەڕێننەوە و ئەڵێن مانای هێڵ، مانای((دوو))ە، هەندێك لە رازی بووان بە((ئایدیە))،((٢)) بە((هێل لەخۆیدا)) و هەندێکی تر بە((شێوەی هێل))ی ئەژمار ئەکەن، (١٥)چونکە لە بارەی هەندێك لە شتەکان شێوەو ئەوانەی کە ئەم شێوەیان(یان پەیوەستە پێیانەوە)، یەکێك و هەمانن، هەروەك((٢))و شێوەی((٢)). بەڵام لە بارەی هێڵەکانی ترەوە بەم شێوەیە نیە، ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە شێوەیەك بۆ چەندین شتی تر بەدەست دێت کە بە ئاشکرا دیارە کە شێوەکەشیان جیاوازە، (هەمان ئەنجامیش بۆ پیتاگۆریەکانیش بەدەست هات) و بەم شێوەیە لەوانەیە کە یەکێك بە شێوەی هەموو شتەکان ئەژمار بکەن، و ئەوانی تر لە ریزی(٢٠) شێوەکان نەزانن، بەڵام لەو شێوەیەدا، بەم شێوەیە، هەموو شتەکان یەکێك ئەبن.

کەواتە گووترا کە لە بارەی(( پێناسەکان)) دژواری و گومانێك بەدی ئەکرێت، و ئەمەش(خۆی) بەچ هۆیەکە، لەبەر ئەمە گەراندنەوەی هەموو شتێك، بەم جۆرە(بۆ شێوە) و لابردنی مادە، ئیشێکی بێمانا و هەوڵێکی بی سودە، چونکە هەندێك لە شتەکان بە یەك ئەندازە(ئەم شێوەیە لەو مادەیە)) یان ((ئەم شتە لەو بارودۆخە (لەو شێوازە))ن، ئایدیەیەکیش(٢٥) کە سوقرات، لەبارەی شتێکی لەم شێوەیە دەری ئەبڕێ دروست نیە،[1] چونکە کەسەکە لە راستی دوور ئەخاتەوە، و ناچار بە قبوڵکردنی ئەم گریمانەیەی ئەکات وەك بڵێی بۆ مرۆڤ ئەگەری ئەوە هەیە کە بە بێ بەشەکانی خۆی بوونەوەر بێت (یان بوونی هەبێت)، وەك چۆن بازنە بە بێ برۆنز و پێناسەکەی بە بێ جوڵە، و لەبەر ئەمە بە بێ بەشگەلێك لە حاڵەتێکی دیاری کراودا(٣٠) ئەگەری نیە، چونکە ((دەست)) لە هەموو حاڵەتەکاندا بەشێك نیە لە مرۆڤ، بەڵکو تەنیا کاتێك کە بتوانێت ئیشێك ئەنجام بدات، واتە خاوەنی گیان بێت، (دەست)ی بێ گیان بەشێك نیە لە (لاشەی مرۆڤ).
١٠٣٧a

[1] ئاماژەیە بۆ یەکێك لە فێرخوازێکی هاوناوی سوقرات کە زۆر بەناوبانگ بووەو لە هەندێك لە دیالۆگەکانی ئەفلاتووندا قسەی کردووە، سەیری ((سێنایتیۆس)) بکەن و((سوفیستێس))و ((پولیتیکۆن)) (سیاسەتمەدار)،C٢٥٧.

بەڵام لە بارەی شتە بیرکارییەکان، لە چ ڕوویەکەوە مانای بەشەکان، بەشەکانی مانا نین، بۆ نموونە، نیوە بازنەکان مانای بازنە نین؟ چونکە ئەمانە هەست پێکراوەکان نین.(٣٥) یان جیاوازیەکی نیە؟ چونکە هەندێك لەو شتانەی کە هەست پێکراو نین خاوەنی مادەن، لە راستیدا هەر شتێك کە((چی بوون و شێوەی خۆی لە خۆیدا(بالذات) نیە، بەڵکو یەك((ئەم شتە لێرەدا))یە، خاوەنی مادە ئەبێت، کەواتە نیوە بازنەکان بەشەکانی بازنەیەکی گشتی نابن، بەڵکو بەشەکانی تاك بازنەیەکی بەشەکی ئەبن، وەك چۆن کە پێشتر گوترا، چونکە مادە هەندێکی هەستپێکراوەو هەندێکی تری ئەقڵێنراوە، هەروەها ڕوونە کە دەروون یان گیان ((ناوەڕۆکی یەکەمینە))، و لاشە مادەیە، و مرۆڤ یان گیاندار، وەك((گشتێك))، پێکهاتوویەك لە هەردووکیانە، ((سوقرات و کوریسکوس)) ئەگەریش دەروون پێی بوترێت سوقرات، دووانەیین(چونکە هەندێك لەوانە هەروەك دەروون ئەژمار ئەکەن، و هەندێك هەروەك گشتی دیاری کراو) .بەڵام ئەگەر ئەوان بە تەواوی ((ئەم دەروونە)) و ((ئەم لاشەیە)) ئەژمار بکەن، ئەوکات(١٠)((گشتایەتی)) هەروەك((بەشەکێتی))ە.

هەنووکە ئەوەی کە ئایا جگە لە مادەی ئەم جۆرە ناوەڕۆکانە، مادەیەکی تر لە جۆرێکی تر هەیە، و ئایا ئەبێت و ئەکرێت بە دوای ناوەڕۆکێکی تری بەدەر لەمانە بگەڕێین، بۆ نموونە وەك ژمارە یان شتێکی لەم جۆرە، مەسەلەیەك هەیە کە ئەبێت دواتر توێژینەوەی لەسەر بکرێت، لەبەر ئەمەیە کە ئێمە لە دیاری کردن و سنووردار کردنی ناوەڕۆکە هەست پێکراوەکان هەوڵ ئەدەین، چونکە لە ڕوانگەیەکەوە تێڕوانین و پێداچوونەوەی ناوەڕۆکە(١٥) هەست پێکراوەکان ئیشی فەلسەفەی سروشتی (فوسیکە فیلوسوفیا) و فەلسەفەی دووەمینە (deutera filosofia) چونکە سروشت ناس نە تەنیا لە بارەی مادە ئەبێت بگاتە پلەی ناسین (بوونی زانیاری لەسەری)، بەڵکو، هاوکات ئەبێت دەستی بگات بە ناسینی (ناوەڕۆك) بە پێی مانا، ولەم بارەیەوە تەنانەت زیاتر.

لە بارەی((پێناسەکان)) وئەوەی کە چۆن بەشە گونجێنراوەکانیان، بەشەکانی (پێناسە)ن، و لە چ ڕوویەکەوە ((پێناسە)) مانایەکە{یەك((مانایە))}( چونکە شت بە ئاشکرایی((یەك))ێکە، بەڵام بە یارمەتی(٢٠) ((چ شتێك)) یەکێکە، لەکاتێکدا کە خاوەنی بەشەکانە؟) هەموویان ئەبێت دواتر توێژینەوەیان لەسەر بکرێت.

کەواتە لە بارەی هەموو شتەکانەوە بە شێوەیەکی گشتی گووترا کە: ((چی بوون)) چیە و چۆن خۆی لە خۆیدا بوونی هەیە، و هەروەها لە چ ڕوویەکەوە مانای چی بوونی هەندێك لە شتەکان خاوەنی بەش گەلێك لە(( شتی ناسراون-یان شتی پێناسە کراو to

horizomenon))ە، بەلأم هەندێك لە شتەكان (خاوەنی ئەو بەشانە نین) هەروەها ئەوەی كە لە ((مانا))ی ناوەرۆكی بەشەكیانەی {هەروەك مادە }بوونیان نیە(٢٥) ، چونكە ئەمانە خاوەنی ئەو ناوەرۆكە نین، بەڵكو بەشەكانی((گشتی دیاری كراو))ن ئەمەش بە جۆرێك خاوەنی مانایە و بەجۆرێكی تر نا، چونكە لەگەڵ مادەدا خاوەنی مانا نیە، (چونكە مادە دیاری نەكراوە) بەلأم بە پێی ناوەرۆكی یەكەمین خاوەنی مانایە، هەروەك مانای دەروون (نفس) لە بارەی مرۆڤەكانەوە، چونكە ناوەرۆك، {شێوەیەكە لە ناو شتدا (شیء )}، كە تێكەڵەیەكە لەو و لە مادە،و ناوی ئەنرێت(( ناوەرۆكی تیروتەسەلی دیاری كراو he sunolos ousia)،(٣٠) وەك((پوكی))،( چونكە لەم و لە((بینین))،((بینینی پان))و((بینینی پانی)) پێك دێت، چونكە ((بینین)) لەودا بە دووجۆر دەست ئەكەوێت،) بەلأم لە ناوەرۆكی تێروتەسەلی دیاری كراو، وەك تاكی (( پان بین)) یان كالیاس، مادەش لەودا بوونی هەیە، هەروەها گوتراوە كە لە هەندێك حاڵەتدا چی بوون و تاك شت هەمان و یەكێكن، چونكە لە بارەی ناوەرۆكە یەكەمینەكان، وەك((لاری)) و ((بوونایەتی لاری)) بۆ نموونە، ئەگەر كە ئەم یەكەمین بێت، ((مەبەستی من لە ((ناوەرۆكی یەكەمین)) ئەوەیە كەبە ((بوونایەتی شتێك لە شتێكی تر، واتە لە بابەتێكی هەروەك مادە)) ناگووترێت،(٥) بەلأم ئەو شتانەی كە هەروەك مادە یان هەروەك((پێكەوە كۆبووەوەكان)) لە مادەن، لەگەڵ((چی بوون))ەكەیان یەكێك وهەمان نین، تەنانەت ئەگەریش دەركەوتانە یەكێك بن، وەك ((سوقرات))و((مۆسیقاپ))، چونە ئەمانە دەركەوتانە وەك یەكن.

"وەرزی دوانزەیەم"

# ( یەکێــــــتی پێناسە )

هەنوکە یەکەمجار لەبارەی پێناسە، تا ئەو شوێنە کە لە کتێبی((شیکردنەوەکان)) نەگوتراوە، قسە ئەکەین، چونکە مەسەلەیەکی دژوار کە لەوێدا(١٠) باس کرابوو، بۆ گوتارەکانی ئیمە لەبارەی ناوەرۆکەوە سودمەندە، مەبەستم ئەم مەسەلە دژوارەیە، ئەوەی کە ئەڵێین ماناکەی، پێناسەیە، بە چ هۆیەك((یەك))ە؟، وەك چۆن، بۆ نموونە، لە بارەی مرۆڤەوە ئەڵێین،((گیانەوەری دووپێ))، با وادابنێین کە ئەمە مانای ئەوە بێت، بەڵام بۆ ئەم((یەك))ێکەو چەندین دانە نیە، واتە((گیانەوەر)) و((دوپێ))؟ چونکە لە بارەی((مرۆڤ)) و((سپی))، (١٥)-هەرکاتێك کە یەکێکیان پەیوەست نەبێت بەوی تریانەوە- ئێمە ڕووبەڕووی چەندین دانەین، بەڵام هەرکاتێك کە یەکێك (کە یەکێك بەوی تر) پەیوەست بێت، و بابەت، واتە مرۆڤ، بکردارێت، لەو شێوەیەدا ڕووبەڕووی ((یەك))ێك ئەبینەوە، چونکە ئەوکات، لەوانەوە((یەك))ێك،، واتە((مرۆڤی سپی)) دێتە بوون، بەڵام لەم بارەیەوە (واتە گیانەوەری دوو پێ.و.ف) یەکێك لەویدا تردا هاوڕی و شەریك نیە، چونکە بەشداری ڕەگەز لەجیاوازییەکاندا وێنا ناکرێت، و ئەگەرنا هەمان(٢٠) شت هاوکات لە دژایەتیەکاندا بەشدار ئەبوو، چونکە ئەو جیاوازییانەی کە بە یارمەتی ئەوانەوە جیاواز ئەبێت، دژن، بەڵام ئەگەر هەم(ڕەگەز لەواندا) بەشدار بێت، دیسانەوە بەڵگەیەکی دروستە، چونکە جیاوازیەکانی(مرۆڤ) جۆراجۆرن، هەروەك((ڕێبوار))،((دووپێ)) و((بێ باڵ))، کەواتە لە چ ڕوویەکەوەیە کە

ئەمانە((یەك))ێكن ، نە چەندین دانە؟ بە دڵنیاییەوە نە بەم هۆیەوە كە لە یەك شتدا بوونیان هەیە، چونكە بەم شێوەیە((یەك))ێك، خاوەنی هەموو شتەكانە، بەڵام هەموو ئەوشتانەی كە لە پێناسەدان، ئەبێت بە((یەك))ێك ئەژمار بكرێن،(٢٥) چونكە پێناسە مانایەكە ((یەكی و بەڵگەیە لەسەر ناوەرۆك))، لەبەر ئەمە ئەبێت مانای((شتێكی تاك-یەكی))بێت، چونكە- بەو جۆرە كە گووترا- ناوەرۆك بەڵگەیە لەسەر ((یەك شت)) و (( ئەم شتە لێرەدا)).

بەڵام یەكەمجار ئەبێت لەبارەی((پێناسە گەلێك)) كە لە رێگای((دابەشكارییەكانەوە)) بەدەست دێن ، توێژینەوە بكەین، چونكە لە پێناسەدا، جگە لە جیاوازییەكان( hai diaforia) و ئەوەی كە ((رەگەزی یەكەمین)) ی ناو ئەنێن، هیچ شتێكی تر نیە، رەگەزەكانی تر بریتین لە رەگەزی یەكەمین و لەگەڵ ئەویشدا، جیاوازی گەلێك كە لەسەر ئەو كەڵەكە كراون، هەروەك یەكەمین كە گیانەوەرە، و كەواتە لەوەوە((گیانەوەری دووپێ)) و جارێكی تر((گیانەوەری دووپێی بێ باڵ))،

١٠٣٨a

و ئەگەر باس لە شتانێكی زیاتریش بكەین هەربەم شێوەیەیە، لەم نێوانەدا هیچ جیاوازیەكی نیە كە گووتەكان زۆر یان كەم بن، و لەبەر ئەمەش هیچ جیاوازییەكی نیە كە گووتەكان كەم و تەنانەت دوو دانەش بن، لەم دووانە، یەكێكیان ((جیاوازی))ەو ئەوی تر ((رەگەزە))، بە شێوەیەك كە لە((گیانەوەری دووپێ)) بۆ نموونە، گیانەوەر، رەگەزە، و دووپێ، جیاوازی،(٥) هەنووكە ئەگەر رەگەزێك لە پاڵ جۆرگەلێكی هەروەك پەیوەست بە رەگەز بە رەهایی بوونی نیە، یان ئەگەریش بوونی هەبووایە، تەنیا هەروەك مادە بوونی دەبوو،(چونكە ئاواز یان دەنگ، رەگەزە و مادە، و ئەمە جیاوازییەكانن كە جۆرەكان، واتە پیتەكان لەوان دروست ئەكەن) كەواتە روونە كە پێناسەكەی ئەوان مانایەكە كە لە جیاوازییەكانەوە پێك دێت.

بەڵام هەربەم شێوەیە ئەبێت جیاوازی بۆ جیاوازییەكان دابەش بكەین،(١٠) بەو شێوەیەی كە بۆ نموونە ((خاوەنی پێ)) جیاوازی گیانەوەرە، بەڵام ئەبێت جارێكی تر جیاوازی ((گیانەوەری خاوەن پێ))لە جیاتی((خاوەن پێ)) بناسرێت، لەبەر ئەمە، ئەگەر بمانەوێت قسەی دروستمان كردبێت، ئەبێت بڵێین هەندێك لە((پێ دارەكان)) باڵدران، و هەندێك بێ باڵن (ئەگەر نا ئەمە پەیوەستە بە بێتواناییەوە) بەڵكو تەنیا ئەبێت بڵێین كە گروپێك((پێ پەرە پێدراو)) و دەستەیەك((پێ پەرەپێ نەدراو))ن، چونكە جیاوازییەكانی ((پێ))ی ئەمانەن، (١٥) و((پێ پەرەپێدانی)) جۆرێك لە((خاوەن پێی)) و بەردەوام بەم

شێوەیە ئەچینە پێشەوە تا ئەگەین بە جۆرێکی((بێ جیاوازی))، ئەوکات جۆرەکانی پێ بە هەمان ژمارە بوونیان ئەبێت کە جیاوازییەکان بەدەست دێن، و گیانەوەرە پێدارەکانیش هاوژمارەی جیاوازییەکان ئەبن، کەواتە ئەگەر شێوازەکە بەم شێوەیە بێت، ڕوونە کە((جیاوازیە پاشکەوتەکە-جیاوازیەکەی کۆتایی he teleutaia diafora) ناوەرۆك و پێناسەی شت ئەبێت (٢٠) لەو ڕووەوە لە پێناسەکاندا نابێت هەمان شت دووبارە بگووترێتەوە، چونکە ئیشێکی بێسودە، بەڵام ئیشێکی لەم شێوەیە، شتێکی لەناکاو لەپڕە، چونکە هەر کاتێك بڵێین((گیانەوەری پێداری دووپێ)) هیچ شتێکی تریان نەووتووە جگە لەوەی کە(( گیانەوەر خاوەنی پێکەلێکە، و خاوەنی دو پێ یە))، و ئەگەر ئەمە بۆ بەشە تایبەتەکانی دابەش بکەن، هەمان شتیان چەندین جار ووتووە،: واتە بە هەمان ژمارە کە جیاوازییەکان بەدی ئەکرێن،(٢٥) . بەم شێوەیە ئەگەر هەربەم شێوەیە جیاوازیەك لە جیاوازیەکی تر بێتە دی، لەو شێوەیەدا(( ئەو یەك جیاوازیەی کۆتایی، شێوەو ناوەرۆك ئەبێت)) بەڵام ئەگەر دابەشکاریەکە بە پێی ڕێکەوت ئەنجام بدرێت، بۆ نموونە ئەگەر((پێ دار))بۆ ((رەش و سپی)) دابەش بکەن، لەو شێوەیەدا بە ژمارەی دابەشکردنەکان، جیاوازییەکان بونیان ئەبێت، لەبەر ئەمە ڕوونە کە((پێناسەکەی ئەو مانایەکە لە جیاوازییەکان- یان بە پێی شێوەیەکی دروست-(٣٠) لە کۆتا جیاوازی پێك دێت، ئەم خاڵە کاتێك ڕوون ئەبێتەوە کە ئێمە ڕیزبەندی ئەم جۆرە پێناسانە بگۆڕین، و بۆ نموونە لە(پێناسەی) مرۆڤدا بڵێین(( گیانەوەری دووپێی پێدار))چونکە کاتێك کە وتمان ((دووپێ)) ئیدی{گووتنی}((پێدار)) زیادەو بێ مانایە، بەڵام لە ناوەرۆکدا ڕیزبەندی بونی نیە، چونکە چۆن ئەتوانرێت بیر لەوەی بکرێتەوە کە تیایدا پارچەیەك لە پێش و پارچەیەك لە پاشەوە بێت؟

کەواتە لە بارەی پێناسەکان بە پێی دابەشکارییەکان، هەروەك یەکەمین هەوڵ دان(٣٥) بۆ گۆڕینی چۆنایەتیەکەیان، چاك وایە قایل بەم ئەندازە قسەلەسەر کردنە بین.

"وەرزی سیانزەیەم"

# ( ناتوانین "گشت"ێك بە ناوەرۆك بزانین )

١٠٢٨b

لــەوێوە کــە توێژینەوەکــەی ئێمــە لــەبارەی ناوەرۆکــە، جــارێکی تــر بــۆی ئەگەڕێینـەوە،((هـەمان جۆر کە بابـەت و چـی بـوون(ماهیـەت) و کۆمەڵـەی ئەوانـە پێیـان ئەوترێت، ناوەرۆك))،((گشت))یش بە هـەمان شێوەیەیە، لەبارەی دوانەکـەی یەکەمیان پێش ئەمە قسە کرا، واتە لە بارەی((چی بوون و بابەت))، هەروەها گووترا کە ئەمە بە دوجـۆر ئەبێتـە بابـەت: یـەکێکیان((ئـەم شـتە(بوونـەوەر) لێـرەدا))،هـەروەك گیانـەوەر کـە ئەبێتە{بابەت}کرداراندنەکان، یان ((هەروەك مادە کە بابەتی ئەوپەڕی هاتنە ئاراییەکی بینەکیە)) هەندێك ((گشت))یان بە تـەواوی مانـا بـە ((هۆکـار و هـەروەها بنـەما)) ئەژمار کردووە، لەم ڕووەوە(شایستەیە) کە قسە لە دەورووبەری ئەو مەسەلەیە بکەین، ((چونکە بە مەحاڵ دێتە بەرچاو کە شتێك لەوە کە بە((گشت)) ناوئـەنرێت، نـاوەرۆك بێـت)) یەکـەم لەو ڕووەوە کە(( ناوەرۆکی هـەر تـاك شـتێك،(١٠) نـاوەرۆکی تایبـەتی هـەر تـاك شـتێکە، کەپەیوەست نیە بە شتێکی ترەوە، بەڵام گشتێکی هاوبەشە(koinon).((گشت)) بۆ ئەو شـتە دێتـە ئـاراوە کـە سروشـتیانە پەیوەسـتە بـە زۆرێـك لـە شـتەکانەوە، کەواتـە ئەمـە ناوەرۆکی چ شتێك ئەبێت؟ چونکە یـان(ناوەرۆك) هـەموو شـتێکە یـان هـیچ شـتێك، بەڵام لەوانەش نیە کە نـاوەرۆك هـەموو شتەکان بێـت، چونکە ئەگـەر نـاوەرۆك یـەك شـت بێـت، ئیـدی شـتەکانی تـریش ئـەم((یەکیـە)) ئـەبن، چونکە(١٥)(( شـتانێك کـە ناوەرۆکەکـەیان ((یەك))ێکە، و چی بوونەکەیان((یەك))، خۆشیان((یەك))ین.))

هەربەم شێوەیە، ناوەرۆك ئەوەیە کە بە پێی بابەت ناگووترێت، بەڵام ((گشت))ایەتی هەمیشە بە پێی بابەتێك ئەگووترێت.

هەرچەندە بە راستی ئەگەری ئەوە نیە کە((گشتایەتی)-بەهەمان شێوەی چی بوون(ماهیەت) ناوەرۆك بێت، بەڵام لەودا ئامادەیە، وەك((گیانەوەر)) کە لە((مرۆڤ)) و((ئەسپ))دا ئامادەیە، لەبەر ئەمە روونە کە((گشتایەتی)) خاوەنی مانایەکە، لەم نێوانەدا هیچ جیاوازییەکیش نیە ئەگەر بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە ناوەرۆکدان،مانایەك بەدەست نەیەت، چونکە(٢٠) بەلایەنی کەمەوە((گشتایەتی)) ناوەرۆکی شتێك ئەبێت،((بەو شێوەیەی کە((مرۆڤ)) ناوەرۆکی تاکی مرۆڤێکە کە لەودا بوونی هەیە)) بەم شێوەیە هەمان شت جارێکی تر روو ئەدات، چونکە((گشتایەتی))، بۆ نموونە((مرۆڤ)) ناوەرۆکی شتێك ئەبێت، کە هەروەك تایبەتمەندیەکانی، لەودا، بوونی هەیە، هەربەم شێوەیە مەحاڵ و بێ مانایە کە((ئەم شتە)) و ناوەرۆك، ئەگەر تێکەڵەیەك لە شتێك بن، نە تێکەڵەیەك لە ناوەرۆك بن و نە لە((ئەم شتە لێرەدا))(٢٥) بەڵکو لە چۆنایەتیەك بن، چونکە لەو شێوەیەدا (( نا-ناوەرۆك)) یان چۆنایەتی لە پێش ناوەرۆك و(لە پێش)((ئەم شتە لێرەدا)) ئەبێت، بەڵام ئەمە بە تەواوەتی مەحاڵە، چونکە نە لەروانگەی ماناوەو نە لەروانگەی کات و نە لەروانگەی پێکهاتن(پەیدابوون))ئەگەری هەیە کە کرداراندنەکانی ناوەرۆك لە پێش(خودی) ناوەرۆکەوە بن، چونکە لەو شێوەیەدا لەو جودا ئەبن، زیاد لەمەش، لەو شێوەیەدا، لە سوقراتدا- کە ناوەرۆکە- ناوەرۆکێك بوونی دەبوو، بە شێوەیەك کە ناوەرۆك(کردارییانە بریتیە) ئەبێت لە دوو شت،(٣٠) بە گشت، ئەنجامەکە ئەمەیە کە: ئەگەر مرۆڤ ناوەرۆکە، و هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە بەم جۆرە ئەگووترێن، کەواتە هیچ شتێك لە ماناکەیاندا، ناوەرۆکی شتێك نیە، هەروەها نە جیا لەو شتەو نە لە شتێکی تردا بوونی هەبێت،((مەبەستم ئەمەیە کە بۆ نموونە نە((گیانەوەرێك)) بەدەر لە تاکە گیانەوەرێك بوونی هەیە و نە شتێکی تر ،وەك ئەوەی کە لە ماناکاندا بەدەست دێت(بە جیا، بونی هەیە).

لە تێبینی کردنی ئەم مەسەلەیەوە روون ئەبێتەوە کە هیچ یەك لەو شتانەی کە((گشتێن)) ،ناوەرۆك نین(٣٥) و هەروەها(روون ئەبێتەوە) کە هیچ یەك لەو شتانەی کە هەڵگیراوە هاوبەشەکانن، نەك لەسەر((ئەم شتە لێرەدا)) بەڵکو لەسەر((شتێکی لەم شێوەیە))بەڵگەیان هەیە، ئەگەرنا ئەنجامەکە ئەبێتە زۆرێك لە شتە(نادروستەکان)ی تر،- و لەوانە ((مرۆڤی سێهەم))-.

هەربەم شێوەیە ئەم خاڵە، بەم شێوەیە، ڕوون ئەبێتەوە کە: ئەگەری ئەوە نیە کە ناوەرۆك لەخۆگری ئەو ناوەرۆکانە بێت کە ((لەوپەڕی هاتنە ئاراییدا=لە کردارێتیەکی تێروتەسەڵدا)) لەودا ئامادەن، چونکە ئەوەی کە لە کردارێتی کامڵ (تێروتەسەل)دا بەم جۆرە دوو شتە، هیچ کات لە کردارێتی کامڵدا((یەك))ێك نیە، بەڵام ئەگەر خۆهێزانە دوو شت بێت، ئەتوانێت ((یەك))ێك بێت، وەك((دووبەرامبەر)) کە لەخۆگری ((دوو))نێوەیە، بەڵام ،((خۆهێزانە))، و ئەگەر نا کردارێتی کامڵ(تێروتەسەل) هەریەك لەو دوو نیوە لە یەکتری جودا ئەکاتەوە، لەبەر ئەمە، ئەگەر ناوەرۆك یەکێکە، ناتوانێت لە خۆگری ئەو ناوەرۆکانە بێت کە تیایدا ئامادەن، و هەروەها نەك بەو جۆرەی کە((دێموکریتوس)) بە ڕاستی ئەڵێت، چونکە ئەو ئەڵێت کە: مەحاڵە کە لە ((دوو))(١٠) ((یەك))و لە((یەك))((دوو)) پێك بێت[1]، چونکە ئەو ئەتۆمەکان بە ناوەرۆکەکان ئەژمار ئەکات، بەم شێوەیە ڕوونە کە بارودۆخەکە (شێوازەکە) لە بارەی ژمارەشەوە بەم شێوەیەشە، لەو ڕووەوە کە- وەك چۆن لەبارەی هەندێ لە کەسەکانەوە ناونراوە- ژمارەش کەڵەکە کراوەی((یەکایەتیەکانە))، چونکە یان((دوو))((یەك))ی نیە یان((یەك))ایەتیەك لەودا، لە کردارێتیەکی کامڵدا، بوونی نیە.

بەڵام ئەم ئەنجامە مەسەلەیەکی قورسی لەگەڵ خۆیدا هەیە،(١٥) چونکە ئەگەر، ئەگەری ئەوە نیە کە هیچ ناوەرۆکێك لە خۆگری((گشتایەتیەکان)) بێت،- چونکە ئەمانە بەڵگەن لەسەر((شتێکی لەم شێوەیە))، نەك لەسەر((ئەم شتە لێرەدا))- و هەروەها ئەگەر، ئەگەری ئەوە نیە کە هیچ ناوەرۆکێك تێکەڵەیەك لە ناوەرۆك گەلێك بێت لە کردارێتی کامڵ(تێرو تەسەلدا)، کەواتە هەر ناوەرۆکێك ئەبێت ((نا-تێکەڵ)) بێت، بەو شێوەیە کە بۆ هیچ ناوەرۆکێك نابێت مانایەك بەدەست بێت، بە بوونی ئەم هەمووە وا دائەنرێت-و لە دێریشەوە وا گێردراوەتەوە- کە پێناسە تەنیا یان لە پێش هەموانەوە بۆ ناوەرۆکە، بەڵام لەم بارەیەوە وەك بڵێی کە ئەمەش ڕاست نیە، و بەم شێوەیە هیچ شتێك خاوەنی پێناسەیەك نابێت،یان بە شێوەیەك(پێناسەیەکی) ئەبێت و بە شێوەیەکی تر(خاوەنی هیچ پێناسەیەك) نابێت، ئەوەی کە گووترا لە توێژینەوەکەی دواتردا ڕوونتر ئەبێتەوە.

---

[1] ئەرستۆ لە نوسراوەکەی خۆیدا((لە لێوارەکانی ئاسمان)) کتێبی سێهەم،وەرزی چوارەم،٣٠٦A٦، ئەم گووتەیە دیموکریتۆس ئەگێڕێتەوە کە((نە لە یەك زۆر پێك دێت و و نە لە زۆر یەك، بەڵکو هەموو شتەکان لە ((پێکەوە چنراوی)) و پێکەوە پێچراوی ئەم ئەتۆمانە دێنە بوون))، هاوشێوەی ئەم بڕوایەش لە((دروستبوون و لەناوچوون))ی ئەرستۆ دەست ئەکەوێت، بە بێ هێنانی دیموکریتۆسن کتێبی یەکەم، وەرزی ٣٢٥A٣٢،٨..

" وەرزی چواردەیەم"

## ( ئایدیەکان، ناتوانن لە ریزی ناوەرۆکەکاندا ئەژمار بکرێن )

لەم (پێراگەیشتن یان توێژینەوانە)دا ڕوون ئەبێتەوە کە لە تیۆریەی کەسانێك کە ئەڵێن((ئایدیەکان)) لە ریزی ناوەرۆکەکانن، و جیان،(٢٥)-و لە هەمان حاڵەتدا((جۆرەکان)) دروست بوو لە(( رەگەز)) و ((جیاوازییەکان)) ئەژمار ئەکەن، چ ئەنجامێك بە دەست دێت، چونکە ئەگەر ئایدیەکان هەن، و بەو شێوەیەی کە((گیانەوەر)) لە مرۆڤ و ئەسپ دا بوونی هەیە، لەو شێوەیەدا بە پێی ژمارە، یان (یەك) یان شتێکی جیاوازە، (بە پێی مانا، ئاساییە کە((یەك))ێکە، چونکە قسەکەر لەهەریەك لەو دوو بوارەدا هەمان مانا دەرئەبڕێت).(٣٠) کەواتە ئەگەر یەك((مرۆڤ لە خودی خۆیدا)) هەیە کە یەك((ئەم شتە لێرەدا))و هەروەها((جیایە)). لەوشێوەیەدا ئەوەی کە ئەم(مرۆڤ)ە لەوانەوە سەرکەوتووە، هەروەك((گیانەوەر))و((دووپێ))، پێویستانە بەڵگەن لەسەریەك((ئەم شتە)) و((جیا))ن، و(لە ریزی) ناوەرۆکەکانن.

١٠٣٩b

لەبەر ئەمە لە بارەی ((ئاژەڵ))یشەوە ئەبێت بەم شێوەیە بن، هەنوکە ئەگەر(گیانەوەر یان ئاژەڵ) لە ئەسپ و مرۆڤ یەکێك و هەمانن- بەو شێوەیەی کە تۆ، بۆ خۆت یەکێك و هەمان شتی- چۆن ئەو((یەك))یە لەو شتانەی کە جیان، ((یەك))ێك ئەبن، و بە چ هۆیەکەوە ئەم((ئاژەڵ))ەش نابێت جیا لە خۆی بوونی هەبێت؟ زیاد لەمەش، ئەگەر((ئاژەڵ)) لە((دووپێ)) و((چەند پێ)) بەشدار بێت، ئەنجامی ئەوە شتێکی مەحاڵە، چونکە لەو شێوەیەدا دژەکان هاوکات پەیوەست ئەبن بە((یەك))ی یان((ئەم شتە

لێرەدا)). بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە نیە کەواتە(٥) کاتێك کە ئەڵێن ئاژەڵ((دووپێ)) یان ((خاوەنی پێ یە))، چ مەبەستێکیان هەیە؟ بەڵام لەوانەیە مەبەست لەوە بێت کە ئەم دووشتە ((تێکەڵکراو))یان ((پێکەوە ترنجاو))ن, بەڵام هەموو ئەم قسانە بەلاش و بێمانان.

بەڵام با وادابنێین کە ((ئاژەڵ)) لەهەر تاکە گیانەوەرێکدا شتێکی ترە ، لەو شێوەیەدا، رێك بەو شێوەیەیە کە بڵێن شت گەلێکی ناکۆتا بوونیان هەیە، چونکە مرۆڤ دەرکەوتانە لێدروستکراوی((ئاژەڵ)) نیە، بەدەر لەمەش، لەو شێوەیەدا، ((خودی ئاژەڵ))یش ((زۆر)) ئەبێت، چونکە((ئاژەڵ)) لەهەر تاك گیانەوەرێکدا ناوەرۆکیەتی،(١٠) و ئەو شتە بەرەگەزی ئەژمار ئەکرا، زیاد لەمەش هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ لێیانەوە سەری دەرهێناوە، ((ئایدیە))ش ئەبن، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ یەك لەوانە((ئایدیە))ی شتێك و ناوەرۆکی شتێکی تر نین،(چونکە شتێکی لەم شێوەیە مەحاڵە) کەواتە ئاژەڵی هەبوو لە هەر تاکە گیانەوەرێك((خودی ئاژەڵی تاقانە))(واتە:ئاژەڵی ئایدیاڵی رەها) ئەبێت.

بەدەر لەمەش، ئەم(تاك گیانەوەرە)لە چ شتێکەوە هاتۆتە بوون و چۆن لە((خودی ئاژەڵ))دروست بووە؟ یان چۆن ئەکرێت(١٥) گیانەوەرێك کە ناوەرۆکەکەی خودی ئەم(گیانەوەرەیە) جیا لە((خودی ئاژەڵ)) بوونی ئەبێت؟ هەربەم شێوەیەیە لە بارەی هەست پێکراوەکانیشەو هەم ئەمانە و هەم بێمانایییەکان زیاتر دێنە بوون، کەواتە ئەگەر بارودۆخێکی لەم شێوەیە مەحاڵە، ((روونە کە ئایدیەکانی شتانێکی هەست پێکراو، بەم شێوەیە کە هەندێك بەوە قایلن، بوونیان نیە))

## "وەرزی پانزەیەم"

# ( تاك شتەكان و ئایدیەكان، پێناسە نەخوازن )

(٢٠) لەوێوە كە ناوەرۆك جیاوازە، واتە:١_((گشتی دیاری كراو to sunolon)) و٢_ مانا(مەبەستم ئەمەیە كە هەندێك لەو ناوەرۆكانە بەم جۆرەن كە مانایەكی كۆكراوەن لەگەڵ مادەدا، و هەندێك مانا بەشێوەیەكی گشتین) هەموو ناوەرۆكەكانی جۆری یەكەم، خاوەنی لەناوچوونن، چونكە خاوەنی دروست بوونن، بەلاّم مانا بەم جۆرە هەرگیز لە ئەگەری لەناوچووندا نیە، چونكە لەئەگەری دروست بووندا نیە، چونكە((خانوو بوون)) هەرگیز نایەتە بوون،بەڵكو (٢٥)(( بوونایەتی ئەم خانووە)) دێتە بوون، ((ماناكان بێ دروست بوون و بێ لەناوچوونن)) و یان((هەن یان نین)) چونكە پێشتر پیشاندرا كە هیچ شتێك ئەمانە نایەنێتە بوون و دروست ناكات،((بەم هۆیەوە بۆ تاك ناوەرۆكە هەست پێكراوەكە پێناسەو گریمانە بوونی نیە)) لەو ڕووەوە كە ئەوان خاوەنی مادەن، كە سروشت بەو شێوەیەیە كە هەم ئەگەری بوون و هەم ئەگەری نەبوونی هەیە،(٣٠) لەبەر ئەمە هەموو تاك ناوەرۆكەكان((- ناوەرۆكە بەشەكیەكان)) لەناوچوو خوازن. كەواتە ئەگەر ((گریمانە))، بەردەوام پەیوەستە بە راستیە پێویستەكان، و پێناسەش ناسینێكی زانستیە، و هەروەها رێك بەو شێوەیە كە ئەگەری نیە كە ((ناسین=زانست)) هەندێ جار ناسین و هەندێ جاری تر نەزانی بێت، بەڵكو تەنیا گومان و مەزەندە كردنە كە بەم شێوەیەیە، و هەروەها بە هەمان شێوە كە نە گریمانە و نە پێناسە، بەڵكو گومان و مەزەندە پەیوەندیان بەو شتانەوە هەیە كە ئەگەری ئەوە هەیە بە جۆرێكی تر بەدەر لەوەی كە هەن، بن، لەبەر ئەمە ڕوونە كە ((بۆ تاك ناوەرۆكە هەست پێكراوەكان ،نە

پێناسە هەیە و نە گریمانە)) چونکە شتە ((لەناوچووخوازەکانta ftheiomena)) بۆ کەسانێك کە زانستێکیان لەسەری هەیە، هەرکات کە لە پانتایی پەی بردنی هەستەکی نادیار بن، بە نادیاری ئەمێننەوە، و هەرچەندە((مانا))ی ئەوان لە رۆحدا پارێزراوە،(٥) بەڵام لەوانەوە ئیدی نە پێناسەیەك ئەبێت وە نە گریمانەیەك، لەبەر ئەمە کەسانێك کە ئەپەرژێنە سەر پێناسە، هەرکاتێك کە بیانەوێت شتێك لە تاك شتەکان (بەشەکیەکان) پێناسە بکەن، نابێت بێئاگا بن لەوەی کە هەمیشە ئەتوانرێت پێناسەکان رەت بکرێنەوە، چونکە پێناسە کردنی ئەم شتانە مەحاڵ نیە.

بەڵام ناتوانین پێناسەی هیچ ئایدیەیەك(idea)یش بکەین، چونکە، بەو شێوەیەی کە لایەنگرەکانی ئەڵێن ((ئایدیە تاك شتەو جیایە)) ماناش بەناچاری لە(ناوەکان) پێك دێت،(١٠) پێناسەکەریش نابێت بەدوای ناودا بگەرێت، چونکە(ناوێك کە ئەو بەدوایدا ئەگەرێت و رێکی ئەخات) نەناسراوە، بەڵام ناوە دانراوەکان هەموویان هاوبەشن لە نێوان هەموو شتەکاندا، کەواتە بە ناچاری لە بارەی شتەکانی تریشەوە هەر راستە، بۆ نموونە کەسێك بیەوێت پێناسەی تۆ بکات، ئەڵێت ((ئاژەڵێکی لاواز یان سپی، یان شتێکی تر)) کە ئەتوانێت لە بارەی شتێکی تریشەوە راست بکات، بەڵام ئەگەر کەسێك بڵێت کە هیچ بەربەستێك نیە لەوەی کە ئەمانە بە جیاو لەسەر زۆرێك لە شتەکانیش راستن، بەڵام هاوکات تەنیا پەیوەست بن بەهەمان شتەوە،(١٥) لەو شێوەیەدا یەکەمجار ئەبێت بڵێین کە: ئەمانە پەیوەستن بەهەردوو شتەکەوە، بۆ نموونە((ئاژەڵی دوو پێ)) هەم پەیوەستە بە ئاژەڵەوە و هەم بە ((دوپێ))،(و لەبارەی شتە جاویدانەکانیشەوە بەناچاری هەربەم شێوەیەیە، چونکە ئەوان ((پێشکەوتن)) لەسەر شتی تێکەڵکراو و بەشەکانی ئەون، و هەروەها بەناچاریش جیاوازن، ئەگەر((مرۆڤ)) جیایە، چونکە یان هیچ یەك یان هەردووکیان جیاوازن، هەنوکە ئەگەر هیچ یەك (جیا)نین (٢٠)، رەگەزێك لە پاڵ جۆرەکانەوە بوونی نابێت، بەڵام ئەگەر بوونیشی هەبێت، جیاوازیش بوونی نابێت، هەروەها ئەبێت بڵێین کە ((ئاژەڵ))و ((دوپێ)) لە روانگەی ((بوونایەتی))ەوە لە پێش(( ئاژەڵی دوو پێ))وەن، ئەوەی (لە روانگەی بوونایەتیەوە لە پێشترە) هاورێ لەگەڵ ئەوی تردا لەناو ناچێت.

زیاد لەمەش، ئەگەر((ئایدیە))کان تێکەڵەیەکن لە(( ئایدیە))کان ( چونکە بەشە تێکەڵەکان تێکەڵ نەبووتر لە خودی تێکەڵ بوونەکەن) دیسانەوە ئەوەی کە ئایدیەکان لەوانەوە تێکەڵ بوون، بۆ نموونە((ئاژەڵ)) و((دوو پێ))، ئەبێت بتوانێت ببێتە هەڵگیراوی(٢٥) شتانێکی زۆر، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، ئایدیە چۆن ئەناسرێت؟

چونکە لەو شێوەیەدا ئایدیەیەك بوونی هەیە کە ناتوانێت ببێتە هەڵگری لە یەك شت زیاتر، بەڵام گومانی شتێکی لەم شێوەیەش ناکرێت، بەڵکو گوومانی ئەوە ئەکرێت کە هەر ئایدیەیەك((بەشداری خوازە)) کەواتە بەو شێوەیەی کە گووترا، ئەم خاڵە لەسەر ئەو کەسانە هەربە نهێنی ئەمێنێتەوە، کە لە بارەی((شتە جاویدانەکان، ئەگەری پێناسە کردن نیە، بە تایبەتی شتانێك کە تاقانەن، هەروەك مانگ و خۆر))(٣٠) چونکە ئەم کەسانە لە پێناسەدا نە تەنیا لە زیادکردنی سیفەتدا بە هەڵەدا ئەچن، کە بە رەتکردنەوەو لابردنیان، خۆر هەر بوونی هەیە، ((بۆ نموونە وەك،(( بە دەوری زەوی دا ئەسوڕێتەوە)) یان((لە شەودا پەنهانە)) چونکە وێنا ئەکەن کە ئەگەر هەمیشە دیار بێت، ئیدی خۆر بوونی نەدەبوو، بەڵام ئەمە قسەیەکی پووچە، چونکە خۆر بەڵگەیە لەسەر ناوەرۆکێکی دیاری کراو)) بەڵکو هاوکات لە زیادکردنی ئەو سیفەتانەی کە ئەگەری سەلماندنی راستییان لەسەر شتێك هەیە، بە هەڵەدا ئەچن، بە شێوەیەك کە ئەگەر شتێکی تر بێتە بوون کە لەو جۆرە بێت،

١٠٤٠b

ڕوونە کە ئەو شتە هەر خۆر ئەبێت، کەواتە ماناکە، ((هاوبەشە koinos))، بەڵام گریمانە ئەمە بوو کە خۆر((تاك شت))ە، وەك ((کلێئون و سوقرات، بەم شێوەیە دەی بۆچی تەنانەت یەك نەفەر(تەنانەت لە لایەنگرانی ئایدیەش) پێناسەیەك لە ئایدیە ناخاتە ڕوو؟ چونکە ئەگەر هەوڵێکی لەم جۆرەیان بدایە، ڕوون ئەبوویەوە کە ئەوەی هەنووکە گووتراوە راست و راستیە.

"وەزی شانزەیەم"

# ( "یەك" و بوونەوەریش ناتوانین بە ناوەرۆك بزانین )

ڕوونە کە زۆربەی ئەو شتانەی کە بە ناوەرۆك ئەژمار ئەکرێن، ((تواناداریيەکانن dunameis))ن وەك بەشەکانی گیانەوەران،(چونك هیچ یەك لەوانە بە جیاجیا بوونیان نیە، و هەرکاتێکیش لێك جودا بن، ئەگەر چی بونیان هەیە، بەلاَم هەموویان تەنیا هەروەك مادە بەدەست دێن)و هەروەها وەك خاك، ئاگرو هەوا، چونکە هیچ یەك لەوانە یەك ((یەك))ی نین،بەڵکو وەك مشتێك دانەوێڵەن کە پێش ئەوەی بکولێنرێن، لێیانەوە شتێکی تاك بێتە دی بە تایبەتی ئەتوانین ئەوە قبولْ بکەین کە بەشەکانی گیانداران و بەشەکانی گیانیان، هێندە لێك نزیکن کە ئەتوانین بڵێین یەکێکن، واتە هەم کرداریيانە(یان لەوپەڕی هاتنە ئارایی) و هەم خۆهێزانە بوونیان هەیە، لەو ڕووەوە کە ئەوان سەرچاوەکانی جووڵەیان بەهۆی شتێکەوە لە جیاوازییەکانی خۆدا هەیە، بەم هۆیەوەیە کە هەندێك لە گیانەوەران بە لەت لەتی ،هێشتاکە زیندوون، بە بوونی ئەم هەمووە ئەوان تەنیا خۆهێزانە(هێزەکیانە) بوونیان هەیە، هەرکاتێك کە بە شێوەیەکی سروشتی بن بە یەکێك و پێکەوە بلکێن، بەلاَم نەك بە زۆر یان بە شێوەیەکی لەسەر یەك کەڵەکەیی،چونکە شتێکی لەم شێوە((پێکهاتنێکی سەیرە)).

بەلاَم لەوێوە کە ((یەك)) بەهەمان شێوەی ((بوونەوەر)) ئەگووترێت، و ناوەرۆك و((یەکی))((یەك))ێکە، و هەروەها ئەوەی کە ناوەرۆکەکەیان ژمارەییانە یەکێکە، خۆشیان ژمارەییانە یەکێکن، ڕوونە کە نە((یەکی))و نە((بوونەوەر))ئەگەری نیە کە ناوەرۆکی شتەکان بن، ڕێك هەروەك((توخم بوون))یان(بنەما بوون)).،بەلاَم هەنووکە

بە دوایيدا ئەگەڕێین( تا تێ بگەین) کە بنەما چیە، تا بگەین بە شتێکی ناسراوتر، هەنووکە لەنێوان ئەمانە،((بوونەوەر))و((یەکی)) زیاتر ناوەرۆکن تا((بنەما))و((توخم))و((هۆکار))، بەلاّم تەنانەت ئەو دوانەش ناوەرۆك نین، چونکە هیچ شتێك کە هاوبەشە ناوەرۆك نیە، چونکە ناوەرۆك بە هیچ شتێکەوە پەیوەست نیە، جگە لە خۆی و بە شتێك کە خاوەنی ئەوە و ئەو ناوەرۆکی ئەو(٢٥) شتەیە، هەربەم شێوەیە((یەك)) ناتوانێت هاوکات لە شتەکان یان شوێنە زۆرەکاندا بێت، لەکاتێکدا ئەوەی کە هاوبەشە هاوکات لە زۆرێك لە شتەکان و شوێنەکاندا هەیە، لەبەر ئەمە ڕوونە کە هیچ ((گشت))ێك لە پال و جیا لە تاك شتەکان(بەشەکیەکان a kath fekasta) بوونی نیە.

بەلاّم پەیڕەوانی تیۆریەی ((ئایدیەکان)) ((لە لایەنێکەوە دروست قسە ئەکەن کە ئەمانە جیا ئەکەنەوە)) ئەگەر ئەمانە بە ڕاستی ناوەرۆکن، بەلاّم لەم ڕوانگەیەوە قسەکەیان دروست نیە کە ئەڵێن (( ناوەرۆك(یان شێوە)،((یەك))ایەتیە لە گشتدا،(٣٠) بەلاّم هۆکاری ئەوە ئەمەیە کە ناتوانن ئەوە ڕوون بکەنەوە کە ئەو ناوەرۆکە لەناونەچووانەی کە لە پالّ تاك شتەکاندا(بەشەکیەکان) هەست پێکراوەکاندا بەدەست دێن، چین، و بەم شێوەیە ئەوانە لە جۆری شتانێکی لەناونەچوو پێك ئەهێنن، (چونکە ئەمانە ئێمە ئەیانناسین) و ئەڵێن ((خودی مرۆڤ)) و((خودی ئەسپ))

١٠١٤a

لەکاتێکدا کە واژەی((خود)) بۆ هەستپێکراوەکان زیاد ئەکەن،)) بە بوونی ئەمەش، تەنانەت ئەگەریش ئێمە ئەستێرەکانمان هەرگیز نەدیبوایە، بە بڕوای من ئەوان هەر ناوەرۆك گەلێکی جاویدان دەبوون لەپالّ ئەوانەی (ناوەرۆکانەی) کە ئێمە ئەمانناسین)) بە شێوەیەك کە هەنووکەش هەرچەندە نازانین(ئەو ناوەرۆکە جاویدانانە) چین، بەلاّم پێویستە کە جۆرێك لەوانە بوونیان هەبێت.

کەواتە ڕوونە کە هیچ یەك لەو شتانەی کە ناویان ئەنرێت((گشتی))، ((ناوەرۆك)) نین، و((هیچ ناوەرۆکێك، تێکەلّ نیە لە ناوەرۆکەکان))(٥).

"وەرزی حەڤدەیەم"

# ( نـــــــاوەرۆك شێوەیە )

هەنووکە لەم بارەیەوە، هەروەك سەرەتایەکی تر ئەڵێین کە چی و چۆن شتێك ناو ئەنێین ناوەرۆك، چونکە لەوانەیە لەم ڕێگایەوە، هەربەم شێوەیە، لەبارەی ئەوجۆرە ناوەرۆکەی کە جیا لە ناوەرۆکە هەستپێکراوەکان بوونی هەیە، ببێتە مەسەلەیەکی ڕۆشن، لەوێوە کە ناوەرۆك((بنەما)) وجۆرێکە لە هۆکار،(١٠) کەواتە لێرەوە با دوای مەسەلەکە بکەوین.

((بۆچی))یەك (to dia ti) کە ئێمە هەمیشە بە دوایدا ئەگەڕێین:(( بۆ چی شتێك بە شتێکی ترەوە پەیوەست ئەبێت؟)) چونکە گەڕانی ئەوەی کە بۆچی مرۆڤ مرۆڤی مۆسیقاڕ، مرۆڤی مۆسیقاڕە، یان گەڕانە بە دوای ئەو شتەی کە گووترا، واتە بۆچی مرۆڤی مۆسیقارە، یان شتێکی تر، هەنوکە ئەم پرسیارە کە: ((بۆچی خودی شتێك ، خۆیەتی؟)) هیچ جۆرە گەڕانێك نیە(١٥) ،چونکە((کێیی)) یان((ئەوەی کە هەیە to hoti)) و((هەبوون to einai)) هەروەك بوونەوەر ئەبێت ڕوون بن، بۆ نموونە ئەڵێین:((مانگ ئەشاردرێتەوە))، بەلام ئەمە ((کە)) خودی شتێك، خۆیەتی، لە هەموو بوارەکاندا تەنیا یەك بەڵگە و هۆکار هەیە، وەك: بۆچی مرۆڤ، مرۆڤە، یان مۆسیقاڕ، مۆسیقاڕە؟ (مەگەر کەسێك بڵێ: چونکە یەك شت لە خۆی جیا نەبووەوەیە، بەلام ئەمە بە هەمان مانای((یەك-بوون))ە، بەلام ئەمەش(٢٠)مەسەلەیەکی هاوبەشە کە بۆ هەموو شتەکانە و وەلامێکی کورتە) بەلام هەربەم شێوەیە ئەتوانین بە دوای ئەوەدا بگەڕێین کە بۆچی مرۆڤ بەم شێوەیە جۆرێکە لە ئاژەڵ، چونکە ئەم خاڵە، ڕوونە کە ئێمە بە دوای ئەوەدا ناگەڕێین کە بۆچی ئەو کەسەی کە مرۆڤە، مرۆڤە، کەواتە((گەڕان لەم بارەیەوەیە

که بۆچی شتێك ئەخرێتە سەر شتێکی تر(ئەکرێتە هەلگیراوی شتێکی تر..))، (بەلاّم ئەوەی که هەڵگیراو بێت، ئەبێت ساکار و(ڕوون) بێت، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ،گەڕانێك لەو نێواندا نیە).

بۆ نموونە، بۆ چی گرمەگرم(هەورە بروسکە) هەیە؟(٢٥) واتە: بۆ چی گرمەیەك لە هەورەکانەوە دێتە دی؟ چونکە لەم شێوازە(ی پرسیاردا) هەڵگرتنی شتێك لە سەر شتێکی تر، مەبەستە، و هەروەها بۆچی((ئەم شتانە))، بۆ نموونە{ئەم} خشت و بەردانە، خانوویەکن؟ لەبەر ئەمە ڕوونە کە بە دوای((هۆکار))دا ئەگەڕێن( و ئەمە بە دەربڕینی مەنتیقی واتە چی بوون) کە لە بارەی هەندێك لە شتەکانەوە، بۆ نموونە لەوانەیە لە بارەی خانوو یان قەرەوێڵە،((لەبەر چی))یە(واتە ئامانج-غایە)، و لە هەندێ بواردا،((وروژێنەری یەکەمین))ە(٣٠)چونکە ئەمە هەر هۆکارە، بەلاّم گەڕان بە دوای هۆکارێکی لەم شێوەیە لە حاڵەتی دروستبوون و لەناوچووندایە، بەلاّم ئەو دانەیەی تر(هۆکاری ئامانجی) لە بارەی ((بوونایەتی))شەوە ئەگەڕێت.

١٠٤١b

مەبەست، زیاد لە هەموو، و بە تایبەتی، کاتێك لە چاو وون ئەبێت و بە شاراوەیی ئەمێنێتەوە کە لە بارەی شتانێك بێت کە بەسەر شتانێکی ترەوە هەڵناگیرێن، وەك ئەوەی بە دوای ئەوەدا بگەڕێین کە:(( مرۆڤ چیە؟)) لەو ڕووەوە کە لێرەدا قسە بە شێوەیەکی ڕەها ئەبێت، بەلاّم دیاری ناکرێت کە((ئەم شتە))((ئەو شتەیە)). گەڕان و پشکنین ئەبێت لە ڕێگای((بەند بەند کردنی بابەتەوە))ئەنجام بدرێت، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، لەو شێوەیەدا لە نێوان گەڕان بە دوای شتێك هیچ شتێك و گەڕان بە دوای شتێکدا، مەسەلەیەکی هاوبەش دروست ئەبێت، کەواتە لەبەر ئەوەی کە ((بوونایەتی))(یان بوون) ئەبێت بە شتێکی هەبوو ئەژمار بکەین(٥) ڕوونە کە گەریدەی ئەوە دەبین کە بۆ چی مادە((شت))ێکە، بۆ نموونە بۆچی((ئەم شتانە لەوێدا خانویەکن؟))چونکە ((خانوو-بوون))لەوێدا بوونی هەیە، یان بۆچی((ئەم شتە)) یان پەیکەرێك کە خاوەنی شکلێکی لەم شێوەیەیە، مرۆڤێکە، لەبەر ئەمە ئێمە لێرەدا بەدوای((هۆکاری)) مادە(کە هەمان شێوەیە)-و ئەم بەهۆیەوە((شتێك))ە-ئەگەڕێین، ئەمە هەمان ناوەڕۆکە، و بەم شێوەیە ڕوون ئەبێتەوە کە لە بارەی مەسەلە ساکارەکان(١٠) نە ئەگەری توێژینەوەیەك هەیە وەنە فێرکارییەك، بەڵکو گەڕان لەبارەی ئەم جۆرە شتانە، بە((شێوەیەکی تر))ە.

لەبەر ئەمە تێکەڵەیەك لە شتێك، بەو جۆرەیە کە تەواوی ئەو(یان گشتێتێەکەی) یەك((یەکی))ە، بەلاّم نەك وەك چینێکی سەریەك نراو(کەڵەکەنراو)، بەڵکو وەك حونجەیەك

وەهایە، بەلاَم حونجەکان خۆیان پیتەکانی ئەلف بیَ نین، و هەروەها((با))هەمان((ب)) یان ((ئەلف)) نیە، گۆشتیش هەمان ئاگر و خاك نیە، چونکە لەدوای توانەوەی هەندیَك لەمانە، وەك(١٥)گۆشت و حونجە ئیدی بوونیان نیە، بەلاَم پیتەکان بوونیان هەیە، ولەبارەی ئاگر و خاکیش هەر بەم شیَوەیەیە، کەواتە حونجە((شتیَك))ە، کە تەنیا پیتەکانی ئەلف بیَ و دەنگدارەکان یان بیَدەنگەکان نیە، بەلَکو((شتیَك))ی ترە، گۆشتیش هەروەها تەنیا ئاگر و خاك یان گەرم و سارد نیە، بەلَکو هاوکات((شتیَك))ی ترە، کەواتە ئەگەر((ئەو شتە)) بەناچاری یان توخم یان تیَکەلَەیەك لە توخمە(٢٠) بە شیَوەیەك ئەگەر توخم بیَت ئیدی هەمان بەلَگەداری راست ئەبیَت، چونکە ئەوکات گۆشت تیَکەلَەیەکە ((لەم)) توخمە و ئاگر و خاك و هەروەها لە شتیَکی تر، بەشیَوەیەك کە تا ناکۆتا بەو شیَوەیە ئەڕواتە پیَشەوە، بەلاَم ئەگەر تیَکەلَەیەك بیَت لە توخم گەلیَکی تر، ڕوونە کە نە لەیەك بەلَکو لە چەندین توخمی تر پیَك هاتووە، (ئەگەر نا خۆیشی هەمان توخم ئەبیَت) بە شیَوەیەك کە لەم بارەیەشەوە دیسانەوە ئەوە ئەلَیَینەوە کە لە بارەی گۆشت یان حونجەکانەوە ووتمان،(٢٥) بەلاَم وا دیَتە بەرچاو کە ئەم(ئەوی ترە)((شتیَك))ە، کە توخم نیە، و ئەبیَتە هۆکاری ئەوەی کە((ئەم شت))ە گۆشت و((ئەم شت))ە حونجە بیَت، و لەبارەی شتەکانی تریشەوە هەربەم شیَوەیەیە، ئەمە(( ناوەڕۆکی)) هەر شتیَکە،((چونکە یەکەمین هۆکاری بوونایەتیە))،بەلاَم لەبەر ئەوەی هەندیَك لە شتەکان لە ریزی ناوەڕۆکەکان نین، بەلَکو ئەوانە ناوەڕۆکەکانن کە بە پیَی سروشت و لەڕووی سروشتەوە پیَك هاتوون و سەریان دەرهیَناوە،(٣٠) کەواتە((خودی ئەم سروشتە)) دەرخەری ناوەڕۆکە کە توخم نیە، بەلَکو بنەمایە، توخم ئەوەیە کە هەروەك مادە لە شتیَکدا بوونی هەیە و ((شت)) بۆ ئەو دابەش ئەبیَت، وەك ((ئەلف)) و((بیَ)) کە توخمی حونجەکانن.

## "وەرزی یەکەم"

# ( مادە هەروەك ناوەرۆك )

(٣)١٠٤٢

هەنوکە ئەبێت لەوەی کە گووترا بگەینە ئەنجامێك و بە کۆ کردنەوەی سەردێری بابەتی مەبەستی قسەکان کۆتا ئەهێنین، ووترا کە گەڕانی ئێمە لەبارەی هۆکارەکان، بنەماکان و ناوەرۆکەکانە،(٥)هەندێك لە ناوەرۆکەکان لەلایەن هەمووانەوە پشتگیریان لێ ئەکرێت، و هەندێ کەسی تر قسە گەلێکی تایبەتیان کردووە، ئەوانەی کە هەمووان کۆکن لەسەریان، وەك ئاگر و خاك و هەواو باقی تەنە سادەکانی تر، و هاوکات گیانەوەران،(١٠) و بەشەکانیان، و سەرەنجام دوونیای بۆشایی و بەشەکانی دوونیای بۆشایی، هەندێك لە کەسەکانیش قسەی تایبەت ئەکەن و ئەڵێن: کە ئایدیەکان و شتە بیرکاریەکان ، ناوەرۆکەکانن، بەڵام لە گووتارەکانی ئێمەدا ئەو ئەنجامە بەدەست هات کە ناورۆك گەلێکی تریش بوونیان هەیە کە((چی بوون و بابەتن))، هاوکات لە روانگەیەکی ترەوە، رەگەز زیاد لە جۆر و گشتایەتییە زیاد لە بەشێتی(تاك شتەکان)(١٥) ناوەرۆکن، وگشتایەتی و رەگەز و ئایدیە، پێکەوە لکاون، و مانای ئەوەش، پێناسەیە، بەم هۆیەوە لەبارەی پێناسەو هەروەها لەبارەی ((خۆی لەخۆیدا)) (یان ئەوەی کە لەخۆیدا هەیە kath hauto)) ڕوون کرایەوە، لەوێوە کە پێناسە، مانایەکە، و ماناش خاوەنی بەشەکانە،(٢٠) کەواتە تیشك خستنەسەر((بەشەکان))یش پێویستیەکە، (تا ڕوون بێتەوە)کە بەشەکانی ناوەرۆك چۆنن و چۆن نین، و(بزانین کە) ئایا ئەمانە بەشەکانی پێناسەشن؟ هەربەم شێوەیە (ئەوە بزانرێت) کە نە گشتێك ناوەرۆکە و نە رەگەز، بەڵام لە

بارەی ئایدیەکان و شتە بیرکاریەکانەوە ئەبێت دواتر بکەوینە توێژینەوەیان،چونکە هەندێ لە کەسەکان ئەڵێن کە ئەمانە ناوەرۆك گەلێکی جیان و((لەپاڵ)) ناوەرۆکە هەست پێکراوەکاندان، هەنووکە(٢٥) لەبارەی ئەو ناوەرۆکانەی کە هەمووان لەسەریان کۆکن، قسان ئەکەین.

ئەمانە ((ناوەرۆکە هەست پێکراوەکان))ن، بەلاَم ناوەرۆکە هەست پێکراوەکان هەموویان خاوەنی مادەن،((بابەتیش ناوەرکە)) و ئەمە(خۆی) بە شێوەیەك مادەیە(مەبەستم لە مادە ئەوەیە کە کرداریيانە یەکدانە ((ئەم شتە)) نەبێت، بەڵکو هێزەکیانە یەك((ئەم شتە)) بێت)، و بە شێوەیەکی تر((مانا و شێوەیە)).(یەك((ئەم شتە)) کە بە پێی مانا جیایە لە مادە)، و سێهەمیش تێکەڵەیەکن لێی،(٣٠) کە دروست بوون (پەیدا بوون) و لەناوچوون تەنیا بۆ ئەوە، و ڕەهاییانە(لە روانگەی ماناو بوونەوە.و.ف) سەربەخۆو جیایە، چونکە بە پێی مانا هەندێك لە ناوەرۆکەکان جیاو هەندێکیش وانین.

بەلاَم ئەوەی کە((مادەش ناوەرۆکە))، ساویلکانەیە، چونکە لە هەموو لەناوچوونە بەرامبەریەکاندا، بابەتێك بۆ لەناوچوونەکان هەیە، بە شێوەیەك کە لە گۆڕانی شوێندا، ئەوەی کە هەنووکە لێرەدایە، جارێکی تر لە شوێنێکی تردایە،(٣٥) و هەروەها لە روانگەی زیادکردنەوەی، ئەوەی کە هەنووکە خاوەنی گەورەییەکی لەم شێوەیەیە، جارێکی تر بچووکتر یان گەورەترە، و لەروانگەی حاڵەتەوە (لەناوچوونی چۆنایەتی) ئەوەی هەنووکە تەندروستە، جارێکی تر نەخۆشە، بەم شێوەیە لەروانگەی ناوەرۆکیشەوە ئەوەی کە هەنووکە لە دروست بووندایە، جارێکی تر لەناوئەچێت،

١٠٤٢b

و ئەوەی کە هەنووکە((بابەت)) هەروەك((ئەم شتە))یە، جارێکی تر هەروەك ((بابەت)) بۆ لەناوچوونە، لەناوچوونەکانی تر لە دوای ئەم لەناوچوونەوە(لە ناوەرۆکدا.و.ف) دێن، بەلاَم ئەمە یەك لە دوای یەك-یەك یان دوو- گۆڕانێکی تر نایەت،(٥) بۆ نموونە گۆڕانی شوێن یان گۆڕانی چۆنایەتی-.و.ف) چونکە پێویست ناکات کە ئەگەر شتێك خاوەنی مادە بێت بۆ گۆڕانی شوێنی، هاوکات خاوەنی مادەشە بۆ دروست بوون و لەناوچوون[1]، هەنووکە ئەوەی کە لە ((دروست بوونی ڕەها-پەیدا بوونی ڕەها)) و((دروست بوونی نا ڕەها-پەیدا بوونی ناڕەها)) چ جیاوازییەك هەیە، لە((سروشتایەتیەکان))دا گوتراوە.

[1] چونکە بۆ نموونە تەنە ئاسمانیە جوڵاوەکان لە شوێندان بەلاَم دروست بوون و لەناوچوونیان نیە، سەیری: کتێبی دوانزەیەم بکەن، وەرزی دوەم.

## "وەرزی دووەم"

# ( ناوەرۆکی شتە هەست پێکراوەکان هەروەك کردارێتی )

کەواتە لەبەر ئەوەی ناوەرۆك هەروەك بابەت، و هەروەك مادە شتێکی قبوڵ کراوە، و ئەمە خۆی ناوەرۆکی هێزەکیە هەنووکە ئەوەش ئەمێنێتەوە کە بڵێین ناوەرۆکی کرداریيانەی(یان هەروەك کردارێتی) هەست پێکراوەکان چیە، وا دێتە بەرچاو کە بە گومانی ((دێموکریتوس)) جیاوازییەکان لە سێ شتدان، بە گووتەی ئەو((تەنی بابەت))- واتە مادە- یەکێك و هەمانە، بەڵام جیاوازیەکەی ئەوان یان لە رێکخستندایە کە شکڵە، یان لە سوڕانەوەدایە، کە هەمان شێوازە، یان لەپەیوەندی لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا، کە هەمان ریزبەندیە، بەڵام ڕوونە کە گەلێك جیاوازی بوونیان هەیە، وەك چۆن هەندێك لە شتەکان بە پێی تێکەڵبوونی مادە ئەوترێنەوە، وەك هەموو ئەوانەی کە لە تێکهەڵکێشیدا دێنە بوون، هەروەك شەربەتی هەنگوین، یان بە هۆی پێکەوە بەستن، وەك بارێك دار، یان بە هۆی پێکەوە لکاندن، وەك کتێبێك، یان بە هۆی بزمار رێژەوە، وەك سندوقێك. یان بە ئامراز گەلێکی بەدەر لەمانە، هەندێك لە شتەکانیش لەروانگەی شێوازەوە(جیاوازن) وەك تیرەی سەردەرگا( کە ئەمانە لە روانگەی جێگیر بوونەوە جیاوازن)، هەندێکیش لە روانگەی کاتەوە، وەك شێو و نانی بەیانی، و هەندێك لە روانگەی شوێنگەوە، وەك ((با))کان، هەندێك لەروانگەی کردارانەدنی هەست پێکراوەکانەوە، هەروەك زبری و نەرمی، و ووشك و تەڕی، هەندێك لە شتەکانیش بە پێی هەندێك لەوانەو هەندێك بە پێی هەموو ئەوانە جیاوازن، بەگشتی ئەم شتانە لە لایەکەوە لە روانگەی زیادی و لە لایەکی ترەوە لە روانگەی کەمیەوە جیاوازن، لەبەر ئەمە

ڕوونــە کــە واژەی((هەیــە to esti)) یــش بــە ژمــارەی ئــەم جۆرانــە ئــەوترێت، بەردەرگا((هەیە)) چونکە لە بارودۆخێکی لەو((شێوەیەدا)) جێگیرە، و((هەبوون))ی ئەو بەڵگەیە لەسەر جێگیر بوون لەو شێوە بارودۆخەدا، و((سەهۆڵ بوون))(بەڵگەیە) لەسەر جۆرێك لە پەستاوتن،((هەبوون))ی هەندێك لە شتەکانیش بەم هەموو جۆرە پێناسە ئەکرێن، هەندێك لەروانگەی تێك هەڵکێشیەوە، هەندێکی تر لەروانگەی(٣٠) تێکەڵ بوونەوە، و هەندێکی تر لەروانگەی پێکەوە بەستنەوە، هەندێکیش لە روانگەی ترنجاندن و هەندێکیش لە ڕوانگەی بەکار هێنانی هەموو جیاوازییەکانی ترەوە، بۆ نموونە وەك دەست و پێ، کەواتە ((رەگەزی جیاوازییەکان ئەبێت بەرفراوان بکرێن)) چونکە ئەمانە بنەماکانی بوونایەتی ئەبن، وەك ئەو شتانەی کە جیاوازییەکەیان لە زیاد و کەمی، یان لە ڕەقی و ناسکی، یان لە شتانێکی تری لەم جۆرە، چونکە هەموو ئەوانە دەرخەری زیاد و کەمین،(٣٥) بەڵام ئەگەر شتێك لە شکڵ یان لە زلی و گونجاویدا جیاوازە، هەمووی لەروانگەی راستی و لاریەوەیە،((هەبوونی)) هەندێك لە شتەکان، تێکهەڵکێشی و ((نەبوونیان)) بارودۆخە بەرامبەرکێکەیەتی.

١٠٤٣a

لێرەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ئەگەر ناوەرۆك هۆکاری بوونی هەرتاك شتێکە، کەواتە ئەبێت بەدوای ئەوەدا بگەڕێین کە هۆکاری بوونی هەریەك لەم تاك شتانە لەم((جیاوازییانەدا)) چیە. هەنوکە ناوەرۆك هیچ یەك لەمانە نیە، تەنانەت تێکەڵەی دووانێك لەوانیش نیە، بە بوونی ئەمە لەهەریەکدا، شتێکی هاوشێوە یان گوونجاو(( to analogon)) بە ناوەرۆك بەدەست دێت(٥) هەمان شێوە کە لە ناوەرۆکەکاندا ئەوەی کە ئەبێتە هەڵگیراوی مادە، خودی((کردارێتیە))، لەبارەی پێناسەکانی تریشەوە بەتایبەتی بەم شێوەیەیە، بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت پێناسەی ((دەرگا)) بکەین،ئەڵێین: تەختەیەك کە بەم شێوەیە یان بەو شێوەیە جێگیر بووە، یان لەبارەی خانویەکەوە ئەڵێین: خشت گەلێك کە بەم شێوەیەو بەو شێوەیە کەوتوون، یان هاوکات لە هەندێ بواردا ((لەبەر ئەو)) (واتە هۆکاری ئامانجی)یش بوونی هەیە،(١٠) و ئەگەر بمانەوێت سەهۆڵ(پێناسە بکەین) ئەڵێین: ناوێك کە بەستویەتی، یان بەم شێوەیەو بەو شێوەیە پەستێنراوە، یان هەماهەنگی چەندین ئاوازی بەرز و نزمە، و لە حاڵەتەکانی تریشدا هەربەم شێوەیەشە.

هەنوکە لەمانەوە ڕوون ئەبێتەوە کە لەبەر ئەوەی مادە شتێکی ترە، کردارێتی و ماناش شتێکی تر ئەبێت، چونکە لە هەندێك لە شتەکاندا(کردارێتی) لە تێکەڵ بووندایە، لەهەندێك لە پێکەوە بەستراویەکاندا، و لە هەندێکی تریشدا یەکێکی ترە لەو

جیاوازییانەی کە لە سەرەوەدا باسمان کردن، (١٥) بەم هۆیەوە هەندێك کەس کە لە پێناسەی((خانوو چییە؟)) ئەڵێن، بەردەکان و خشتەکان و تەختەکانە، ((هێزەکیانە=خۆهێزیانە)) قسە لەسەر خانوو ئەکەن، چونکە ئەو شتانە مادەن، بەلاّم کەسانێك کە ئەو ناو ئەنێن بە روپۆشی مادەکان و تەنەکان، یان شتێکی تری لەم جۆرەی ئەخەنە سەر، و قسە لە((کردارێتیەکەی)) ئەکەن، کە هەمان ناوەرۆکی تێکەڵە لێیان، (واتە لە مادەو شێوە.و.ف) چونکە وا دێتە بەرچاو کە(٢٠) مانا بەڵگەیە لەسەر ئەو جیاوازیانەی کە پەیوەستن بە ((شێوە و کردارێتی))یەوە، و سێهەمین ئەو شتەیە کە((تێکەڵەیەکە))لەم دووانە.

" وەرزی سێهەم"

## ( ئایا ناو بەڵگەیە لەسەر ناوەرۆکی تێکەڵ، یان کردارێتی و شێوە؟ )

نابێت لەم خاڵە بێئاگا بین کە هەندێ جار ئەوە بە نهێنی و شاراوەیی ئەمێنێتەوە کە ئایا یەك ناو(٣٠)بەڵگەیە لەسەر (( ناوەرۆکی تێکەڵ))یان لەسەر((کردارێتی و شێوە))، بۆ نموونە ئایا((خانوو)) نیشانەیەکی هاوبەشە بۆ سەرپەنایەك لە خشتەکان و بەردەکان و بەم شێوەیەو بەو شێوەیە جێگیر بوون، یان بۆ کردارێتی و شێوە کە هەمان سەرپەنایەکەیە، و ئایا((هێڵ))دوانێتیەکە لە درێژدا، یان دوانێتیە، و ئایا((گیاندار)) واتە گیانێك لە لاشەیەکدا یان تەنیا((گیانە))(٣٥)،چونکە ئەمە ناوەرۆك و کردارێتی لاشەیەکە، (تەنێکە)،((گیاندار)) چ بێژراوی هەردوکیان بێت، لەگەڵ ئەوەشدا نە وەك شتێك کە بە پێی مانایەك بگوترێت، بەڵکو بەو شێوەیە کەپەیوەستە و ئەگەرێتەوە بۆ شتێك، بەلاّم ئەمە لە روانگەیەکی ترەوە جیاوازە، بەلاّم بۆ گەڕان بە دوای ((ناوەرۆکێکی هەست پێکراودا)) جیاوازی نیە، چونکە چیەتی پەیوەستە بە(( شێوەو کردارێتی))یەوە، لەبەر ئەوەی((گیان)) و((گیان بوون)) یەکێك و هەمانن، بەلاّم((مرۆڤ بوون)) و((مرۆڤ)) هەمان نین، مەگەر ئەوەی کە((گیان)) ناوی بنرێت ((مرۆڤ))، بەلاّم بە مانایەك بەم شێوەیەیە و بە مانایەکی تر بەم شێوەیە نیە.

١٠٤٢b

بەڵام لە ماوەی گەڕاندا، ڕوون ئەبێتەوە کە((حونجەکان)) لە پیتەکان و تێکەڵ بوونەوە بە دەست نایەن، و خانوویش لە خشتەکان و تێکەڵ بوون پێك نایەت، و ئەمە دروستە، چونکە تێکەڵکردنی ئەو شتانە نیە کە تێکەڵ کردن لەوانەوە، بەم شێوەیە لە حاڵەکانی تریشدا بەم شێوەیە نیە، بۆ نمونە ئەگەر ((بەردەرگا)) لە روانگەی ((شێوان))ەوە ئەو بەردەرگایەیە، بەڵام((شێوان)) لێدروست کراوێك نیە لە بەردەرگا، بەڵکو ئەم زیاتر لێدروست کراوێکە لەو، و هەروەها ((مرۆڤ))((گیاندار)) و((دوو پێ)) نیە، بەڵکو ئەبێت شتێکی بەدەر لەمانە بوونی هەبێت، ئەگەر چی ئەمانە مادەن، بەڵام نە ئەو توخمە و نە لە توخمەوەیە، بەڵکو ناوەڕۆکە، بەڵام کەسانێك کە تەنیا قسە لەسەر مادە ئەکەن، ئەمە لائەبەن، و ئەیقرتێنن، هەنووکە ئەگەر ئەم(شتی ترە) هۆکاری بوونایەتی و ناوەڕۆکی شتە، کەواتە ناتوانرێت ئەو ناو بنرێت بە خودی ناوەڕۆك.

بەڵام ئەمە وەك پێویستیەك(پێویستانە) ئەبێت جاویدان بێت، یان لەناوچوو خواز بە بێ لەناو چوون، یان دروست بوو، بە بێ دروست بوون، چونکە لە شوێنێکی تردا ڕوون کراوەتەوەو سەلمێنراوە کە هیچ((هیچ کەس شێوە دروست ناکات)) و بەرهەمی ناهێنێت، بەڵکو یەك((ئەم شتە)) پێك ئەهێنرێت، و ئەوەی تێکەڵەیەکە لەوان، (واتە لە مادەو شێوە) دروست ئەبێت، بەڵام ئەوەی کە ئایا ناوەڕۆکەکان شتانێکی لەناوچوو یان جیاوازن، هەنووکە بە هیچ شێوەیەك ڕوون نیە، جگە لەم حاڵە کە ڕوونە شتێکی لەم شێوەیە لە هەندێك لەواندا ئەگەری نیە، بۆ نموونە لە هەموو ئەوانەی کە جیا لە شتە لاوەکیەکان ناتوانن بوونیان هەبێت، وەك خانوو یان ئامرازەکان، کەواتە لەوانەیە بۆ خودی ئەم شتانە ناوەڕۆکبن و نە شتێکی تر کە سروشتانە پایەدار نیە، چونکە سروشت تەنیا لە شتە لەناوچووەکاندا، ئەکرێت بە ناوەڕۆك ئەژمار بکرێت، لێرەوەیە مەسەلەیەکی قورس کە پەیڕەوکارەکانی ((ئانتیستێنێس)) و چەندین فێرنەکراوی تر هێنایانە گۆڕێ، کە تا ئەندازەیەك ڕاستە، و ئەو(دژواری)یە ئەوەیە کە ناتوانرێت((چیەتی)) پێناسە بکرێت، (چونکە ئاست یان سنوری پێناسە، گوتارێکی درێژە)) بەڵکو تەنیا((چۆنیەتی)) شتێك ئەکرێت پێناسە بکرێت، و فێر بکرێت، بە شێوەیەك کە لە بارەی خشڵەوە ناتوانرێت بڵێیت چیە، بەلاَم ئەتوانین بڵێین کە وەك قورقوشمە، لەبەر ئەمە پێناسەو مانا بۆ ناوەڕۆکێکی دیاری کراو، ئەگەری هەیە، بۆ نموونە، بۆ ناوەڕۆکی تێکەڵ، (ئاوێتە)ج هەست پێکراو بێت وچ ئەقڵێنراو، بەڵام بۆ یەکەم بەشە ئاوێتە بووەکانی مەحاڵە، چونکە مانای پێناسە

کراو بەڵگەیە لەسەر شتێك بۆ شتێك، و یەکێك ئەبێتە ((هەروەك مادە))و ئەوی تر((هەروەك شێوە)) بێت.

هاوکات ڕوونە کە ئەگەر ژمارەکان، بەجۆرێك(لە ریزی) ناوەڕۆکەکان بن، تەنیا بەم جۆرن و نە بەو جۆرە کە هەندێك ئەیڵێن، لە((یەکیەکانن))چونکە، پێناسە، جۆرێك لە ژمارەیە،(٣٥) چونکە دابەشخوازە، ئەویش بۆ بەشگەلێکی دابەش نەبوو، (چونکە ماناکان بێ سنور نین) و ژمارەش لەم جۆرەیە، ورێك بەو شێوەیە ئەگەر لە ژمارەوە، شتێك لەو بەشانەی کە ژمارە لەوانەوە بونی هەیە، وەربگرن یان زیادبکەن، ئیدی هەمان ژمارە نیە، بەڵکو ژمارەیەکی ترە،هەرچەندە ئەو(شتە یان بەشە) وەرگیراو یان زیادکراوەکە لە کەمترین بێت،

١٠٤٤a

بە هەمان شێوە پێناسە یان چیەتی یش ئیدی هەمان نین، ئەگەر کە شتێك لەوانەوە وەبگرن یان(بۆیان) زیاد بکەن، و ژمارە ئەبێت شتێك بێت کە بە پێی ئەو(شتە) ((یەك))یکە، بەلأم ئەو کەسانە ناتوانن بڵێن کە (ژمارە) لە چ شتێکەوە یە، ئەگەر کە یەکە،(چونکە یان یەك نیە، بەڵکو وەك کەڵەکەیەك وەهایە، یان ئەگەر یەکە، ئەبێت(٥) بڵێن کە چ شتێك لە زۆرینەوە ((یەك)) دروست ئەکات) و پێناسەش((یەك))ە، بەلأم ئەمان بەم شێوەیە ناتوانن بڵێن کە پێناسە بەم شێوەیەیە، ئەمەش مەسەلەیەکی سروشتیە، چونکە بەڵگەکەی هەردووکیان هەمانە، ناوەڕۆکیش((یەك))ە، بەو جۆرەی کە گوتمان، بەلأم نە بەو جۆرەی کە هەندێك ئەڵێن، کە وەك جۆرێکی تاقانەیە یان خاڵێکە، بەڵکو لەو ڕووەوە، کە هەر ناوەڕۆکێك جۆرێك لە(( هاتنە ئاراییەکی تێروتەسەلە) و سروشتیانە تاك و تەنیایە، و هەروەها بەو شێوەیەی کە ژمارە(١٠) خاوەنی زیاد و کەم نیە، ناوەڕۆکیش هەروەك ((شێوە))، بەم جۆرەیە، بەلأم ئەگەریش بەم شێوە بێت، ئەوە ناوەڕۆکی تێك هەڵکێشە لە گەڵ مادەدا.

ئەوە بوو کە لەبارەی دروست بوون و لەناوچوونی ناوەڕۆکەکانەوە قسەمان کرد، و ئەوەی کە چۆن ئەگەری هەیەو چۆن مەحاڵە، و هەروەها لەبارەی گەڕاندنەوەیان بۆ ژمارە، بەم ئەندازەو درێژە پێدانە ئەساچین.

## "وەرزی چوارەم"

# ( مادەی جۆراوجۆر و هۆکارە جیاوازەکانی لە سروشتدا )

(١٥) لە بارەی ((ناوەرۆکی مادیەوە))، نابێت ئەم خاڵە بە شاراوەیی بمێنێتەوە کە تەنانەت ئەگەریش هەموو شتەکان لە هەمان هۆکاری یەکەمینەوە(سەرەتاییەوە)، یان لە هەمان شتانی هەروەك هۆکارە یەکەمینەکانەوە دروست بن، و ئەگەریش هەمان مادە بۆ دروستکەرەکانی هەروەك بنەما ئەژمار بکرێت، بە بوونی ئەوەی کە هەر تاك شتێك خاوەنی مادەیەکی تایبەتە، وەك شیرین و چەور کە(مادەی نزیکن بۆ بەڵخەم)[1] و تاڵ یان شتێکی تری لەم جۆرە بۆ((زەرداو)).(٢٠) هەرچەندە لەوانەیە هەموو ئەمانە لە هەمان مادەوە بن، هەمان شت خاوەنی چەندین مادە ئەبێت، هەرکاتێك کە مادەیەك شتێکی تر بێت، وەك بەڵخەم کە لە چەور و شیرینەوە پێك دێت، ئەگەر چی چەور لە شیرینەوە پێکیش بێت، و هەروەها زەرداو لە بەلخەمەوە پێك بێت، ئەگەر زەرداو لە مادەی یەکەمینی خۆیدا شی بێتەوە، چونکە((ئەم شتە)) و((ئەو شتە)) بە دوو جۆر پێك دێن، یان لەو ڕووەوە کە((ئەم)) ڕێگایەکە بەرەو ڕووی((ئەم))( و سەرەنجام لەودا بەدەست دێت)، یان لە ڕووەوە کە((ئەم)) لە بەشە سەرەتاییەکانی خۆیدا شی ئەبێتەوە،(٢٥) بەڵام لەوانەیە کە بە هۆی هۆکاری پاڵنەر لە((یەك)) مادەوە شتانێکی جیاواز پێك بێن، بۆ نموونە لە تەختەوە، هەم سندوق و هەم قەرەوێڵە،(دروست ببێت) بەڵام لەهەندێك لە شتە جیاوازەکاندا پێویستانە ئەبێت جیاواز بێت، بۆ نموونە مشار ناتوانێت لە تەختەوە دروست ببێت، تەنانەت بە یارمەتی هۆکاری یەکەمینیشەوە، چونکە ئەم ناتوانێت لە لۆکە یان تەختەوە مشار دروست بکات.

---

[1] ئاماژەیە بۆ بۆچوونەکانی هیپۆکراتس(بقرات) ب.بۆ ((مێژووی گیانەوەران))ئەرستۆ، ٨٥٧a١.

بەڵام ئەگەر (٣٠)ئەکرێت کە هەمان شت لەمادەیەکی تر یان جیاواز پێك بێت، ڕوونە کە ئەوکات هوونەر و بنەمای پاڵنەر هەمانن، چونکە ئەگەر مادە و پاڵنەریش جیاواز بن، بەرهەمهاتووش هەم جیاواز ئەبێت.

کەواتە هەر کاتێك کەسێك بە دوای ئەوەدا بگەڕێت کە هۆکار چیە، لەوێوە کە هۆکار بەچەندین جۆر ئەوترێتەوە، ئەبێت هەموو ئەو هۆکارانەی کە ئەگەریان هەیە دەریان بڕێت، بۆ نموونە ((هۆکاری "هەروەك مادە"ی مرۆڤ چیە؟))(٣٥) بڵێین((یاسایەکی هەمەکی)). هۆکاری"هەروەك پاڵنەر" چیە؟ بڵێن((منێتی)).

١٠٤٤b

هۆکاری هەروەك شێوە چیە؟ چی بوون یان ماهیەتی(مرۆڤ)، لێرەدا ئەبێت نزیکترین هۆکارەکان باس بکرێن،(لەم بارەیەوە) مادە چیە؟ نە ئاگر یان خاك، بەڵکو مادەی تایبەت( ئەبێت باس بکرێت).

کەواتە لە بارەی ناوەڕۆکە سروشتیەکان و دروست بوونەوە، ئەبێت بە ناچاری ئەم شێوازە بگرینە بەر، ئەگەر کەسێك بیەوێت بەدروستی خۆی سەرقاڵی ئەوە بکات، واتە ئەگەر هۆکارەکان ئەمانەو ئەم ژمارەیە بن،(٥) و هۆکارەکان ئەبێت بناسرێن، بەڵام لەبارەی ناوەڕۆکە سروشتیەکان، بەڵام جاویدان، قسە بەجۆرێکی ترە، لەوانەیە هەندێك لەمانە خاوەنی مادە نەبن، یان خاوەنی مادەیەکی لەم شێوەیە نەبن، بەڵکو تەنیا(ئەو مادەیەیان هەیە) کە جووڵاوە لە شوێندا، و هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە سروشتیانە بوونیان هەیە، بەڵام لە ناوەڕۆکەکانەوە نین، ئەم جۆرە شتانە مادەیان نیە، بەڵکو بابەتی ئەوانە ناوەڕۆکەکەیانە، بۆ نموونە هۆکاری (دیار نەمان-مەبەستی لە دیارنەمانی مانگە .و.ك)(١٠) چیە؟ مادەکەی چیە؟ بوونی نیە، بەڵکو ئەوە مانگە کە کردارێنراوە، هۆکاری (هەروەك پاڵنەری) چیە، کە ڕووناکی لەناو ئەبات؟ زەوییە، تا رادەیەك لێرەدا((لەبەر ئەو))(واتە هۆکاری ئامانجی.و.ف) بوونی نیە، بەڵام هۆکاری هەروەك شێوە، مانایە، بەڵام ئەگەر مانا هاوڕێ لەگەڵ هۆکاردا نەبێت، نادیارە، بۆ نموونە دیارنەمان چیە؟ لەناوچوونی ڕووناکی، بەڵام ئەگەر ئەوە زیاد بکەین(بە هۆی لە نێواندا جێگیر بوونی زەوی))، ئەوکات(١٥) ئەمە ئەو مانایەیە، کە هاوڕێیە لەگەڵ هۆکاردا، لە بارەی خەوەوە ڕوون نیە کە یەکەمین کارتێکراو (کردارێنراو) چیە؟ ئایا ئاژەڵە؟ بەڵی، بەڵام بە پێی چ شتێك؟ و یەکەمین (کارتێکراو)(کردارێنراو) چیە؟ دڵ یان شتێکی تر، زیاد لەمەش، ئەو کرداراندنە چیە کە لە بەشدا ڕوو ئەدات نەك لە((گشت))ایەتی ئاژەڵدا؟ یان ئەوەی کە(خەو) جۆرێکە لە بێجووڵەیی؟ بەڵی، بەڵام ئەمە لە ڕووی چ (کردارێنراویەك)(٢٠) لە یەکەمین کرداراندندایە؟

## "وەرزی پێنجەم"

# ( مادە و دژەکـــــــــان )

لەبەر ئەوەی هەندێك لە شتەکان بە بێ دروست بوون و لەناوچوون، ((هەن))و((نین)) ، وەك خاڵەکان (ئەگەر بەهیچ شێوەیەکیش هەبن) و بە شێوەیەکی گشتی شێوەکان( hai morfai){ چونکە ((سپی)) دروست نابێت، بەڵکو ((تەختەی سپی)) دروست ئەبێت، لەو ڕووەوە کە هەر دروستکراوێك لە شتێکەوە بەدەست دێت، و ئەبێت بە شتێك} کەواتە هەموو دژەکان ناتوانن لە یەکتریەوە دروست بن،(٢٥) بەڵکو بە جۆرێکی ترە کە مرۆڤێکی سپی لە مرۆڤێکی رەش دروست ئەبێت، و هەروەها هەموو شتێك خاوەنی مادە نیە، بەڵکو ئەوانەی کە(خاوەنی مادەن) لە ئەگەری پەیدا بون و لەناوچوونی پێکەوەییدان، بەلام هەموو ئەوانەی کە بە بێ لەناوچوون ((هەن)) و ((نین)) ، ئەوانە خاوەنی مادەیەك نین.

بەلام لێرەدا گومانێکی قورس بوونی هەیە کە چۆن مادەی هەرتاك شتێك پەیوەندی لەگەڵ دژەکانی دا هەیە، (٣٠) بۆ نموونە ئەگەر پەیکەر((هیزەکیانە) تەندروستە، و دژە نەخۆشیە، ئایا لاشە،لە رووی هێزەوە، هەردوکیانە؟ و ئایا ئاو هێزەکیانە شەراب و سرکەیە؟ یان(وەلام ئەمەیە) کە لە بارەیەکەوە کە بە پێی خەسڵەت و شێوەوە مادەیە، و لە لایەنێکی ترەوە بە پێی ((نەبوون))ێکەوە کە بە پێچەوانەی سروشتە؟ قورسە گومانێکی تر ئەمەیە کە لە چ ڕوویەکەوە و بۆ چی شەراب مادەی سرکە نیە، و هێزەکیانە سرکە نیە،(٣٥){ هەرچەندە سرکە لەوەوە پێك دێت}؟ و ئایا زیندوو هێزەکیانە مردووە؟

١٠٤٥a

بەڵام بەم شێوەیە نیە، بەڵكو لەناوچوونەكان (دەركەوتەن)،بەڵام مادەی بوونەوەری زیندو خۆی بە پێی لەناوچوون، تواناداری و مادەی بوونەوەر ئەمرێت، و ئاو، مادەی سركە، چونكە ئەمیان لەویان پێك دێت، وەك شەو لە رۆژ، هەموو ئەو شتانەی كە بەم شێوەیە لە یەكتریدا لەناو ئەچن ئەبێت بگەڕێندرێنەوە بۆ مادە، بەو شێوەیە كە ئەگەر زیندوو لە مردوو پێك بێت، یەكەمجار بۆ مادە بگەڕێتەوەو ئەوكات لەم ڕێگەیەوە بوونەوەرێك زیندو بێتەوە، سركەش یەكەمجار بگەڕێتەوە بۆ ئاو و ئەوكات لەو ڕێگایەوە ببێت بە شەراب.

" وەرزی شەشەم"

# (یەکـــــێتی پێناسە)

بەڵام با بپەرژێینە سەر مەسەلەیەکی قورس کە لە بارەی پێناسەکان و ژمارەکانەوە خستمانە ڕوو، کە هۆکاری ((یەك-بوونی)) ئەوان چیە؟ چونکە لە هەموو ئەو شتانەی کە خاوەنی بەش گەلێکی زۆرن، و ((گشت))ایەتیەکەیان هەروەك کەڵەکە بوونێك نیە، بەڵکو(١٠)((گشتایەتی)) ئەوانە شتێکی جیا و بەدەر لە بەشەکانە، هۆکارێك بوونی هەیە، بەهەمان جۆر کە لە تەنەکانیشدا هۆکاری((یەك-بوونیان)) هەندێ جار ،پەیوەندی و هەندێ جار پێکەوە لکان، یان کارتێکەریەکی تری لەم شێوەیەیە، بەڵام پێناسە ((یەك)) مانایە، ئەویش نەك بە یارمەتی پێکەوە بەستن هەروەك کتێبی((ئیلیاد))، بەڵکو لەو ڕووەوە کە مانا یەك شتە.

کەواتە هەنووکە چ شتێکە کە((مرۆڤ)) ئەکاتە((یەك))ێك، و بۆ چ یەکێکە و زۆر نیە،(١٥) وەك((ئاژەڵ)) و((دووپێ))؟ بە جۆرێکی تری قسە، بە تایبەتی ئەگەر، بەو شێوەیەی کە هەندێ کەس ئەڵێن،((یەك خودی مرۆڤ و یەك خودی ئاژەڵ، بوونی هەیە؟ بۆچی((مرۆڤ)) ئەو((خودانە auta)) نیە و بۆ چی مرۆڤەکان بە پێی بەشداری، ئەویش نە لە((یەك)) بەڵکو لە ((دوو))دا، واتە لە ((ئاژەڵ)) و ((دووپێ))، دەبوو بوونی هەبووایە، و بە شێوەیەکی گشتی مرۆڤ نە یەکێك، بەڵکو زیاد لە یەکێك- واتە ((ئاژەڵ)) و ((دووپێ))- {ئەبێت} بێت؟ ڕوونە کە ئەگەر، بەو شێوەیەی کە خوو نەریتی ئەمان وەهایە، لە پێناسەکان و مەسەلەکاندا بەم شێوەیە پێش بچین، لەو شێوەیەدا خستنە

ڕوو چارەسەر کردنی ئەم مەسەلەیە قورس نیە، بەڵام ئەگەر، بەو شێوەیەی ئێمە ئەیڵێین، لەلایەکەوە مادەو لە لایەکی ترەوە شێوە بوونی هەیە، و یەکێك ((هێزەکی))یانەو یەکێکی تر((کرداریانە))یە. گومانی ئەوە(٣٥) ئەکرێت کە لە بابەتی گەڕانەکەی ئێمەدا ئیدی مەسەلەیەکی قورس یان گوماناوی بوونی نەبێت، چونکە ئەم گومانە وەك ئەوەیە کە ئەگەر پێناسە (یان ئاست=سنور)ی((جبە)) برۆنزی خڕ کراوە بوایە، لەبەر ئەوەش ئەم ناوە نیشانەی مانای ئەگەیاند، و بەشێوەیەك کە مەبەستەکەش ئەمە ئەبوو کە :((چیە هۆکاری "یەك" بوونی((خڕ))و((برۆنز))؟ لێرەدا دژوارییەکی تر ڕوون نابێتەوە، چونکە یەکێیان مادەو یەکێکی تریان شێوەیە، (٣٠) کەواتە چ شتێك ئەبێتە هۆکاری ئەوەی کە((بوونەوەر)) هێزەکییانە لەو شتانەدایە کە خاوەنی پەیدابوونن، کردارییانەش((هەیە))؟ چونکە هیچ هۆکارێکی تر بۆ((گۆی کردارەکی بوونی گۆی هێزەکی بوون )) نیە، بەڵکو ئەم چی بوونی هەر یەك لەوانە بووە، بەڵام مادە لە لایەکەوە ئەقڵێنراوەو لە لایەکی ترەوە هەست پێکراو، و لە ماناشدا هەمیشە لە لایەکەوە مادەو لە لایەکی ترەوە کردارێتی(٣٥) بوونی هەیە، (وەك ئەوەی کە بازنەش شکڵێکی ئاستدارە)، بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە مادەیان- چ ئەقڵێنراو چ هەست پێکراو- نیە، هەریەك ڕاستەوخۆ ((یەك))ێکن، ڕێك بە هەمان جۆر کە بونەوەرێکن، واتە: یەك((ئەم شتە))،یەك چۆنایەتی و یەك چەندایەتیە، لەبەر ئەمە لە پێناسەکاندا نە((بونەوەر)) بەدەست دێت و نە((یەك))، و چی بوون ڕاستەوخۆ لەوکاتەدا، هەم ((یەك))ێکەو هەم بوونەوەرێك.(٥) لەبەر ئەمە بۆ هیچ یەك لەمانە هۆکارێکی تر بۆ((یەك))بوون یان ((بوونەوەر بوون)) بوونی نیە، چونکە هەریەکەیان ((بوونەوەر))ێکە و((یەك))ییەك،

١٠٤٥b

بەڵام نەك بەو شێوەیە لە ڕەگەزی((بوونەوەر))و((یەك))دا بێت، و هەروەها نەك بەو شێوەیە کە ئەمانە بتوانن بوونەوەر گەلێکی جیا و بەدەر لە تاك شتەکان بن.

بە هۆی ئەم گومان و دژوارییەوە، هەندێ لە کەسەکان قسە لە((بەشداری-هاوبەشی methexis)) ئەکەن، و لەم بارەیەوە کە هۆکاری ((بەشداری-هاوبەشی)) چیە و(( بەشداری کردن)) یانی چی، دووچاری سەرگەردانی ئەبن، و هەندێك(١٠)یش قسە لەسەر ((هاوبوونی sunosuia)) ئەکەن، وەك چۆن((لوکوفرون)) ئەڵێت کە ((ناسین-زانست)) هاوبوونی دەروون و ناسینە، و ئەوانی تر ژیان بە هاوپەیوەندی نێوان ڕۆح و جەستە ئەژمار ئەکەن، بە بونی ئەمەش، هەر ئەم بەڵگەیە ئەبێت لە هەموو بوارەکاندا

راست بێت، چونكه((تەندروست بوون)) یان((هاوبوونی)) یان((پێكەوە لكان))یان تێكەڵ بوونی(( رۆح و تەندروستی)) ئەبێت، و((سێگۆشەی برۆنزی بوون))یش تێكەڵەیەكە(١٥) لە برۆنز و سێ گۆشە، و هەروەها((سپی بوون)) تێكەڵەیەكە لە ئاست و سپێتی بون، هۆكاری ئەمە ئەوەیە كە كەسەكان بۆ((هێزەكی بوون)) و هاتنە ئارایی تێروتەسەل،بە دوای مانایەكی تاقانە، و هەروەها( لەهەمان كاتدا) جیاواز، ئەگەڕێن، بەلاّم بەو شێوەیەی كە گووترا،((مادەی نزیك))و((شێوە)) یەكێكن و هەمانن، كە یەكێكیان هێزەكیانەو و ئەوی تریان كردارەكیانەیە، لەبەر ئەمە گەڕان بە دوای هۆكارێك بۆ((یەك))ی، هەروەك گەڕانە بە دوای هۆیكارێك بۆ((یەك-بوون))،(٢٠) چونكه هەر تاك شتێك خاوەنی یەك((یەك))یە، و((هێزەكی بوون و كردارەكی بوون))یش بە جۆرێك لە جۆرەكان، یەكێكن، كەواتە هیچ هۆكارێكی تر بوونی نیە جگە لەو(هۆكارەی) كە((هێزداری)) بەرەو((كردارێتی)) ئەجولێنێت، بەلاّم ئەو شتانەی كە مادەیان نیە، هەموویان بە شێوەیەكی ڕەها، لە راستیدا یەك (( یەك))ین.

"وەرزی یەکەم"

# ( هێز هەروەك جووڵە )

(٢٧) کەواتە لە بارەی بوونەوەری یەکەمین(سەرەتا) کە هەموو گوتارەکانی تری((بوونەوەر)) پەیوەستن بەوەوە، وبۆ ئەو ئەگەڕێنەوە، واتە لەبارەی((ناوەرۆك)) قسە کرا، چونکە ئیدی(شتەکانیش) بە پێی مانای ناوەرۆك، ناویان ئەنرێت((بوونەوەران))(٣٠)چەندێتی و چۆنێتی و شتەکانی تریش کە بەم شێوەیە قسەیان لەسەر ئەکرێت، لەبەر ئەوەی هەموو ئەمانە، وەك چۆن، بەو شێوەیەی کە لە تەوەرەکانی سەرەتادا گوتمان، مانای ناوەرۆکیان لەخۆدا هەڵگرتووە، بەڵام لەوێوە کە بوونەوەر لە لایەکەوە بە((شتێك to ti)) یان بە چەندێتی و چۆنایەتی ئەوترێت، و لە لایەکی ترەوە بە پێی تواناداری(هێز) و هاتنە ئاراییەکی تیرو تەسەل، و هەروەها بە پێی کردار(to ergon)، کەواتە خۆمان سەرقاڵی دیاری کردنی تواناداری و هاتنە ئاراییەکی تێرو تەسەلْ ئەکەین، (٣٥) و یەکەمجار بە تواناداری کە لە وردترین مانادا کە قسەی لەسەر ئەکرێت، نەك بە سودترین ئەو مانایەی کە هەیەتی،

١٠٤٦a

چونکە تواناداری و کردارێتی زەمینەیەکی فراوانتر، لەوەی کە تەنیا پێی ئەوترێت جووڵە، لەخۆ ئەگرێت، بەڵام کاتێك کە لەم مانایەدا قسەمان لەسەر تواناداری کرد، لە ماوەی ئەو پێناسانەی کە لە بارەی کردارێتییەوە ئەنجامیان ئەدەین، لەبارەی جۆرەکانی تری(تواناداری)یشەوە ڕوونکردنەوەی زیاتر ئەدەین.

لە شوێنێکی تردا دیاریمان کرد، کە((بە توانایی))و((توانین)) بە جۆرگەلێکی زۆر قسەیان لەسەر ئەکرێت،(٥) لەم نێوانەدا هەموو ئەوانەی کە بە جۆرێکی هاوناوی پێیان ئەوترێت ((بەتوانایی=تواناداری))، ئەخەینە لاوە،چونکە هەندێك لەروانگەی جۆرێك لە هاوناوییەوە بەو جۆرە ناو ئەنرێن، بەو شێوەیەی کە لە ((ئەندازیاری))دا ئەڵێین کە شتانێك ((ئەگەریان هەیە))یان ((ئەگەریان نیە=مەحاڵن))، لەو ڕووەوە کە بە شێوەیەك((هەن)) یان((نین))، بەڵام ئەو تواناداریێتیانەی کە لە یەك جۆرن، هەموویان جۆرێکن لە بنەماکان(١٠) و بە خستنە سەر یەك((یەکەمین جۆری تواناداری))قسەیان لەسەر ئەکرێت، کە بنەمای لەناوچوون لە شتێکی تر یان(لە هەمان شت) هەروەك شتێکی ترە.

جۆرێك لە تواناداری، کردارێنراویە(کارتێکراویە) کە لە خودی شتە کارتێکراوەکەدا بنەمای لەناچوونی کرداراندن بوونی هەیە، بە یارمەتی شتێکی تر یان لە هەمان شتی هەروەك شتێکی تر، ئەوی تر خەسڵەتی کارتێکەرخوازیە بە ئاراستەی شتێکی خراپتر یان لەناوچوو بە یارمەتی شتێك تر یان هەمان شتی هەروەك شتێکی تر(١٥)واتە بەیارمەتی بنەمایەکی لەناوبەر((سەرنگوومکەر))، لە هەموو ئەم پێناسانەدا مانای یەکەمین تواناداری گوونجێنراوە، ئەمانە هاوکات یان لەو ڕووەوە پێیان ئەوترێت تواناداری کە تەنیا بکەر یان بکەرێنراون(کارتێکراون) یان بە جوانی بەم شێوەیەن، بە شێوەیەك کە لە ماناکانی ئەواندا بە شێوەیەك لە شێوەکان ماناکانی پێش تواناداری(بە توانایی)ش ئامادەن.

کەواتە ڕوونە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بۆ ((کردار و کرداراندن)) تەنیا یەك تواناداری بوونی هەیە،(٢٠) {چونکە شتێك لەو ڕووەوە((بە توانایە)) کە یان خۆی خاوەنی تواناداری کرداراندنە یان بە هۆی خۆیەوە کار لە شتێکی تر ئەکات} بەڵام بە شێوەیەکی تریش تواناداریەکان لە جۆرێکی ترن، چونکە یەکێك لە شتدا، کارتێکراوە( چونکە خاوەنی بنەمایەکە و هەروەها لەو ڕووەوە کە مادەش جۆرێکە لە بنەما، کارتێکراو کرداران قبوڵ ئەکات، واتە شتێك بە یارمەتی شتێکی تر، بۆ نموونە ئەوەی کە لە جۆری ڕۆنە، پیس ئەبێت(٢٥) و ئەوەی کە بە شێوەیەك شکڵێنراو، شایەنی شکاندنە، و مەسەلەکانی تریش هەر بەم شێوەیە)(٢٥) و ئەوی تریش لە شتدا بکەرە، وەك گەرماو هوونەری بیناسازی، یەکێك لە گەرمکەرەوەو ئەوی تر لە بیناسازدا، لەبەر ئەمە تا ئەو شوێنەی کە شتێك((پێکەوە ڕوواوە_یان یەکێتیەکی سروشتی هەیە))، خۆی ناتوانێت کار لە خۆی بکات، چونکە یەك شتەو و شتێکی تر

نیــە،((بێتوانــایی))و((بێتوانــا)) دژەکــانی ئــەم جــۆرە ((تواناداریــیــە)) واتــە ئــەویان ((نیــە))،(٣٠)بەو شێوەیەی کە تواناداری خودی هەر شتێك، بە پێی خۆی، خاوەنی بێتواناییەکە.

((نەبوون)) بە جۆرگەلێکی زۆر قسەی لەسەر ئەکرێت،١_ئەوەی کە نیەتی(خاوەن نیە)،٢_ ئەوەی کە سروشتیانە خاوەنداره، بەڵام نیەتی، یان بە شێوەیەکی گشتی، یان لە کاتێك کە سروشتیانە ئەبێت هەیبێت (خاوەن بێت) و یان بەو شێوەیە کە ئەبێت، واتە بە شێوەیەکی تەواو، یان بە شێوەیەکی(تر)لە لایەنەکانی((خاوەنێتی=هەبوون)) دا نیە،٣_لە هەندێ بواریشدا کاتێك کە شتێك سروشتیانە ئەبێت خاوەنی شتێك بێت (٣٥) بەڵام بە (زۆر وبە هۆی بەسەردا بڕین))ەوە نیەتی، ئەڵێین ((ئەو شتەی نیە)) یان((نیەتی.و.ك)).

"وەرزی دووەم"

# ( تواناداریە مانادار و بێمانا )

١٠٤٦b

لەوێوە کە هەندێك لەم جۆرە بنەمایانە لە شتە بێرۆحەکاندا و هەندێك لە شتگەلێکی رۆحدار و لە رۆحدا(دەرون)، ئەویش لە بەشی خاوەنی مانای رۆح(یان بەشە ئەقڵانیەکەی رۆح)، کەواتە ڕوونە کە هەندێك لە تواناداریەکان بێمانا (نائەقڵانی)(alogoi) و هەندێك خاوەنی مانان(ئەقڵانی)ن، لەبەر ئەمە هەموو هوونەرەکان و زانستە پێکهێنەرەکان(لە ریزی) تواناداریتیەکانن، چونکە هەموو بنەما لەناوبەرەکان لە شتێکی تر یان لەهەمان شتی هەروەك شتێکی ترن.

هەروەها هەموو(تواناداریەکان) خاوەنی مانای(٥)بکەری دژەکانن، بەڵام ئەوانەی کە بێمانان، بکەری یەك شتن، وەك گەرم کە تەنیا گەرمی دروست ئەکات، بەڵام زانستی پزیشکی کە(توانا‌داری) دروست کردنی نەخۆشی و هەم ساغیشی هەیە، هۆکارەکەش ئەمەیە کە زانست مانایەکی((ئەقڵانیە))، و خودی ماناش هەم ڕوونکەرەوەی شتێکە هەم لەناوبەریشیەتی، هەرچەند نەك بەیەك جۆر، بە جۆرێك بۆ هەردوکیان راستە، بەڵام بە شێوەیەکی تر زۆربەیان بۆ ئەم مەسەلەیە راستن(١٠) کەواتە وەك پێویستیەك، ئەم جۆرە زانستانە پەیوەندیان لەگەڵ دژەکاندا هەیە، بەڵام لەگەڵ هەندێکیاندا وەك خودی خۆیان، بەڵام لەگەڵ هەندێکی تر وەك خودی خۆیان نا، چونکە مانا بۆ برێك ((لەخۆیدایە)) بەڵام بۆ برێکی تر ((دەرکەوتانەیە))چونکە تەنیا بە یارمەتی رەتکردنەوە و لابردن، ((دژ)) پیشان ئەدات، ((چونکە دژ لەناوچوونی یەکەمینێتیە)) و ئەمە(١٥) لابردنی ئەو شتەیە کە دژیەتی، هەنووکە لەوێوە کە دژەکان لەیەك و هەمان شتدا کۆنابنەوە، بەڵام زانست

پەیوەستە بە بوونی ماناوە، و لەوێوە کە ڕۆح خاوەنی بنەمای جووڵەیە، کەواتە ئەنجام ئەوەیە کە لەکاتێکدا ((دەرمانسان)) تەنیا تەندروستی ئەهێنێتە بوون، و گەرمکەرەوە تەنیا گەرمی، ساردکەرەوە تەنیا ساردی، بەڵام خاوەنی زانست هەردووکیان (کاریگەریەکە)(٢٠) ئەهێنێتەوە بوون، چونکە مانای هەردووکیان لەخۆ ئەگرێت،هەرچەند نەك بەیەك جۆر، و هەروەها لە ڕۆحیشدایە، کە خاوەنی بنەمای جووڵەیە، بە شێوەیەك کە هەردوکیان بە هۆی هەمان بنەماوە ئەهێنێتە جووڵە و هەردووکیان لەیەك و هەمان شتدا کۆ ئەکاتەوە، لەبەر ئەمە ئەو شتانەی کە بە پێی مانا توانادارن، دژەکانی شتانێك ئەهێننە بوون کە تواناداریی گەلێکی بێ مانا ئەهێننە بوون، چونکە ئەوان لە ((یەك)) بنەمادا، واتە لە مانادا کۆ ئەکەنەوە.

هاوکات ڕوونە کە (٢٥)تواناریێتی پەتی کردار یان کرداراندن، بە دوای کردار یان کرداراندنی باشەوە دێت، بەڵام ئەمیان هەمیشە بە دوای ئەوەوە نایەت، چوونکە کردارێنراوی باش هەمیشە کرداری (کارتێکەری) باشە، بەڵام ئەوەی کە تەنیا( کردارێنراوی) باشە، پێویستانە(وەك پێویستیەکی بێ ئەم لاو ئەولا) کارتێکەرێکی(کردارێکی) باش نیە.

" وەرزی سێهەم"

# ( توانـــــاداری و کرداریێتی )

هەن کەسانێك کە، هەروەك((مێگارییەکان))[1]، ئەڵێن(( شتێك، کاتێك بە توانایە کە چالاکە و کاتێك کە چالاك نیە بە توانا(٢٠)ش نیە، بۆ نموونە کەسێك کە خەریکی دروست کردنی خانوو نیە، توانای دروست کردنی خانووی نیە، بەڵکو تەنیا کەسێك کە خەریکی دروست کردنی خانووە ئەویش تا ئەو کاتەی کە خانووەکە دروست ئەکات، بەتوانایە، و هەربەم شێوەیەشە لە بوارەکانی تریشدا)) بینینی ئەنجامە پووچەکانی ئەم قسەیە قورس نیە، چونکە ڕوونە کە کەسێك((وەستا دیوار)) نیە تا ئەو کاتەی کە خانوویەك دروست ئەکات،(چونکە وەستایەتی(دیوار) واتە بوونی توانای دروست کردنی خانوو)،(٣٥) و بەم شێوەیەشە لەبارەی هونەرەکانی تر یان پیشەکانی تریشەوە، کەواتە ئەگەر مەحاڵە خاوەنی ئەم هونەرانە بیت بەبێ ئەوەی کە ئەوانەت فێر کرابێت یان پێ وترابێت، یان نەبوونی ئەوانەی کە بێ ئەوەی کاتێك هەبێت کە ئەوانمان لەدەست دابێت،(یان بەهۆی کاریگەری لەبیرچوونەوە یان بەهۆی نەخۆشیەکەوە یان بە تێپەربونی کات، بەلام نەك بەهۆی لەناوچوون و فەنا بوونی خودی شتەکە(واتە شێوەکەی.و.ف) چونکە ئەمە هەمیشە هەیە)

١٠٤٧a

[1] ئاماژەیە بۆ فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی مێگارا(megara) لە قوتابخانە سووقراتیەکان، دانەرەکەی ((یوکلایدس)) لە پەیڕەوانی سووقرات بوو، ئەمان کە((دیالێکتیەکان))یش ناو ئەنران، کاریگەری یان خستە سەر مەنتیقی ئەرستۆ، سەیری((لە سووقرات تا ئەرستۆ)) بکەن، چاپی دووەم، ل ٧٤-٧٣.

ئایا هەرکاتێك کە کەسێك لە(بۆ نمونە خانوو دروست کردن) بوەستێت، ئیدی خاوەنی ئەم هوونەرە نیە؟ بەڵام ئەگەر دووبارە دەستی بکاتەوە بە دروستی خانوو، چۆن دیسانەوە ئەو هوونەرە بەدەست بهێنێتەوە؟ و هەر بەم شێوەیەشە لە بارەی شتە بیرۆحەکانیەوە، چونکە نەسارد، نە گەرم، نەشیرین، و بە شێوەیەکی گشتی هیچ هەست پێکراوێك، بە بێ هەست پێکەرێك بوونی نابێت، لەبەر ئەمە ئەنجامەکە ئەمە ئەبێت کە ئەمانیش هەمان قسەی ((پرۆتاگۆراس)) ئەڵێنەوە، بەڵام لە راستیدا هیچ شتێك هەستی نیە، مادام کە هەست ناکات و بەکاری ناهێنێت، کەواتە ئەگەر کەسێك هەیە کە بینینی لەدەست داوە، هەرچەند لە سەر بنەمای سروشت ئەبێت خاوەنی بینین بێت، ئەویش رێك لەم کاتەدا و بەم جۆرە، لەو شێوەیەدا(١٠)خودی ئەم جۆرە کەسانە دەبوو لە ماوەی یەك رۆژدا چەندین جار کوێر و هەروەها کەڕ بوونایە.

هاوکات ئەگەر بێتوانا کەسێکە کە توانای ((نیە))، ئەوەی کە دروست نەبووە، توانای دروست بوونی نیە، و ئەو کەسەی کە بڵێت ئەوی کە توانای دروست کردنی نیە((هەیە)) یان(( ئەبێت))، درۆ ئەکات، چونکە(( بێتوانا)) رێك بەڵگەیە لەسەر ئەمە،(واتە لەسەر نەبوونی توانا.و.ف)لەبەر ئەمە قسەکانی جووڵە و دروست بوون(پێکهاتن) رەت ئەکەنەوە، (١٥) لەبەر ئەوەی(بە پێی ئەو گوتەیە) وەستاو هەمیشە وەستاوەو دانیشتوو (هەمیشە) دانیشتووە،لەبەر ئەوەی دانیشتووە، هەڵناسێتەوە، چونکە ناتوانێت هەڵسێتەوەو لە بەرامبەر هەڵسانەوە بێتوانایە، کەواتە ئەگەر قسەیەکی لەم جۆرە مەحاڵە، روونە کە((تواناداری-یان هێز dunamis)) و ((کردارێتی-ووزە)) جیاوازن، لەکاتێکدا کە ئەو قسانە، تواناداری و کردارێتی بەیەك و ((هەمان)) ئەزانن،(٢٠) لەبەر ئەمە گەریدەی لابردنی مەسەلەیەکی بچووك نین (واتە مەسەلەکە زۆر گرنگە.و.ف).

بەم شێوەیە روونە کە ئەکرێت شتێك کە توانای((بوونی))هەبێت بەڵام ،نەبێت، و توانای((نەبوونی)) هەبێت و بەڵام هەبێت، بەم شێوەیە لە باقی گووتەکانی تردا، بەو شێوەیەی کە کەسێك توانای بەرێدا چوون هەیەو بەرێدا نەڕوات و ئەوەی کە توانای بە رێگادا چوونی نیە، بە رێگادا بڕوات، بەڵام((بەتوانا)) ئەوکەسەیە کە بۆ بوونی کردارێتی ئەوەی کە ئەگوترێت توانای هەیە،(٢٥) هیچ بێتواناییەك لەودا بوونی نیە، مەبەستم ئەوەی کە ئەگەر شتێك توانای دانیشتنە و ئەگەری دانیشتنی هەیە، هەرکاتێك کە لە راستیدا دانیشتبێت، بۆ ئەو هیچ بێتواناییەك بوونی نیە، و هەربەم شێوەیە ئەگەر شتێك توانای جووڵان یان جووڵاندن یان وەستان یان وەستاندن، بوون یان بوواندن، نەبوون یان نەبوواندن بێت.

(٣٠) ناوی ((کردارێتی)) کە لە پێکەوە بەستن لەگەڵ(( ئەوپەڕی هاتن ئارایی)) جێگیر بێت، لە جووڵەکاندا بە تایبەتی و بۆ شتەکانی تریش گوازراوەتەوە،((چونکە گومانی ئەوە ئەکرێت کردارێتی لە پێش هەمووان و بەتایبەتی جوڵەیە)) بەم هۆیەوەیە کە((جووڵان)) نادەنە پاڵ ئەوشتانەی کە ((بوونیان))نیە، بەڵکو چەندین گووتەی تریان لەبەرامبەردا بەکار ئەهێنن، بۆ نمونە ئەڵێن کە((نەبووەکان)) شایەنی بیرو ئەندێشەن، بەڵام ناجووڵێن، ئەمە لەو ڕووەوەیە کە(٣٥) هەرچەندە ئەوان کردارییانە((بوونیان نیە)) بەڵام کاتێك دێت ((کردارێتیانە)) بوونیان هەبێت، چونکە هەندێك لە((نەبووەکان)) هێزەکیانە ((هەن-یان بوونیان هەیە))،

١٠٤٧

بەڵام بە بوونی ئەمەش هەر ((نین)) چونکە لە((هاتنە ئارایی-پەرەپێدانێکی))کامڵدا نین.

"وەرزی چوارەم"

# ( تواناداروبێتوانا- مومکین و مەحاڵ )

هەنوکە ئەگەر((تواناداڵ)) کە قسەی لێوە کرا، ئەوەیە کە ((بێتوانا)) پێویستی پێیەتی، کەواتە ڕوونە کە مەحاڵە ئەم قسەیە ڕاست بێت کە(( ئەم شتە توانای بوونایەتی))ە، بەڵام نابێت،(٥) بەو شێوەیەی کە بە پێی ئەم قسەیە((مەحاڵەکان ta adunata)) لەبەر چاو وون ئەبن، مەبەستم ئەمەیە کە بۆ نموونە کەسێک- کە بیر لە مەحاڵێتی ناکاتەوە-بڵێک کە تیرە توانا پێوانە کردنە، بەڵام بە بوونی ئەمەش پێوانە ناکرێت، چونکە هیچ بەربەستێک نیە لەوەی کە شتێک توانای ((بوون))یان ((شتێک بوونی)) هەیە، نە((هەبێت)) یان ((ببێت))، بەڵام لەو بابەتانەو گرنگتر ئەمەیە کە(١٠) ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین کە (( ئەوەی کە نیە))بەڵام توانای ئەوەی هەیە کە ((هەبێت))،هەیە یان((شایەنی دروست بوونە))، هیچ ((مەحاڵێک)) لەم نێوانەدا بوونی نابێت، بەڵام لەو بوارەشدا ئەنجام هەربەم شێوەیە دەبوو، چونکە ئەوەی کە(تیرە) شایەنی پێوانە کردنە مەحاڵە.

بەڵام ((درۆ)) و ((مەحاڵ)) یەکێک و هەمان نین، چونکە هەرچەندە ئەوەی کە تۆ هەنووکە وەستاوی درۆیە، بەڵام((مەحاڵ)) نیە، لە هەمان کاتدا ڕوونە کە ئەگەر(A) بوونی هەیە(١٥)،B یش ناچار ئەبێت هەبێت، ئەوکات ئەگەرA ئەگەری ئەوەی هەیە کە هەبێت، بێگومان B ش ئەبێت بوونی هەبێت، چونکە ئەگەر B وە ک پێویستیەک((پێویستانە)) بوونی نەبێت، هیچ شتێک بەربەست نیە لە ((مەحاڵ))بوونی دا، کەواتە بڵێین ئەگەری A هەیە، لەبەر ئەوە کاتێک کە ئەگەری A هەیە، ئەوکات ئەگەر

گریمانەی ئەوەمان کردبێت کە A هەیە، هیچ مەحاڵێتیەك لەدوایەوە نایەت، بەڵام ئەوکات B پێویستانە(۲۰) بوونی هەیە، بەڵام (لەسەر بنەمای گریمانەکە) مەحاڵ دەبوو، هەنووکە گەر بڵێین B مەحاڵ بێت، بەڵام ئەگەر B مەحاڵە، A یش بێگومان مەحاڵە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەری بوونی Aهەیە، کەواتە ئەگەری بوونی B ش هەیە.

کەواتە ئەگەر ، ئەگەری بوونی A هەیە، کەواتە Bش هەیە، واتە ئەگەر پەیوەندیەکەیان بەو شێوەیە بێت کە لەبەر ئەوەی A بوونی هەبێت B ش پێویستانە بونی هەبێت،(۲۵) بەڵام ئەگەر- بەوەشەوە کە A و B پەیوەندیەکەیان بەو شێوەیەیە- Bش بەم شێوەیە ئەگەری نەبێت، ئەوکات پەیوەندی AوB بەو شێوەیە کە گریمانەمان بۆ داناوە نابێت، و ئەگەر، ئەگەری A هەیە،B ش (پێویستانە) ئەگەری هەیە، کەواتە ئەگەر A هەیە، پێویستانە B یش بوونی هەیە، چونکە ئەگەر بڵێین B پێویستانە(یانی بە زۆر) ئەبێت بوونی هەبێت، ئەگەر A ئەگەری بوونی هەیە، بەو مانایەیە کە ئەگەر B هەیە،- لەکاتێك و بەو جۆرە کە گریمانەمان بۆی دانا ئەگەری هەیە- ئەوکات A یش لەو(۳۰) کاتەدا و بەو جۆرە و(پێویستانە) بوونی هەیە.

## "وەرزی پێنجەم"

# ( هێز یان تواناداری و کردارێتی )

لەوێوە کە هەموو تواناداریتیەکان یان زگماکین- هەروەك تواناداریتی هەستەوەرەکان- یان ئەنجامی خوو راهێنانەکانن، -وەك ژەنینی نەی- و هەندێکیش لە ئەنجامی فێرکردن-وەك ئەوانەی کە پەیوەستن بە هوونەرەکانەوە،-بێگومان ئەوانەی کە ئەنجامی راهێنان(و فێر بوونی) مانای تیۆرین ئەبێت بە یارمەتی چالاکیە لە پێشەکانەوە بەدەست بێن، بەلاّم ئەوانەی کە لەم جۆرە(٣٥) نین، و یا لەو ((تواناداریتیانەی)) کە خەسلەتی کرداراندنیان هەیە، پێویستایەتیەکی لەم شێوەیە دەست ناکەوێت.

١٠٤٨a

هاوکات لەوێوە کە ((بەتوانا)) توانای شتێکی هەیە بە شێوەیەك و لەکاتێکی دیاری کراودا، (هاوڕێ لەگەڵ هەموو ئەو مەسەلانەی کە وەك پێویستیەك ئەخرێنە سەر پێناسەکە) و هەروەها لەوێوە کە هەندێك لە شتەکان بە پێی مانایەکی ئەقلانی ئەتوانن جووڵە بهێننە ئاراوە و تواناداریتیەکانیان هاوڕێ لەگەڵ مانای ئەقلانیدایە، و لەوێوە کە ئەو تواناداریتیانەی گرووپی یەکەم پێویستانە لە بوونەوەری رۆحداردا بەدەست دێن، بەلاّم گرووپی دووەم لە هەردووك ( واتە رۆحدار و بێرۆح) بەدەست دێت (٥) ،کەواتە لە بارەی تواناداریتیەکانی گرووپی دووەم پێویستە کە هەرکاتێك ((بکەر)) و((بکەرێنراو=کارێکراو)) بە پێی تواناداریتیەکانیان پێکەوە نزیك ئەبنەوە، یەکێکیان ((کارکەر))وئەوی تریان ((کارخوان))ە، بەلاّم لەبارەی ئەو((تواناداریتیانەی گرووپی یەکەم)) مەسەلەیەکی لەم شێوەیە پێویستیە، چونکە ئەمانە(واتە تواناداریتی گەلێك بە

بێ ماناى ئەقلانى) هەموو یان هەریەك بکەرى تەنیا یەك کاریگەرین، بەلام ئەوانە(واتە گروپى یەکەم) بکەرى دژەکانن، چونکە هاوکات کاریگەریە دژەکان بەدى ئەهێنن، بەلام ئەمە مەحاڵە،(١٠)کەواتە بێگومان فاکتەرى دیاریکەر شتێکى ترە، کە مەبەستم لەو((مەیلە horexis)) یان ((هەڵبژاردنى پێوراو))و ((سەر پشکى))یە، چونکە (هەر بوونەوەرێکى رۆحدار) هەریەك لەو دوو شتەى کە بە راستى مەیلى لێیان هەیە، ئەیان کات، هەر کاتێك کە ئەو لە لایەنى تواناداریتیەوە بوونەوەرى ئەو بێت و نزیك بێتەوە لە شتێکى کردارێنراو، لەبەر ئەمە ئەوەى کە بە پێى ماناى ئەقلانیەت ((توانادار))ە، بێگوومان هەرکاتێك کە مەیلى لە شتێك بێت، کە توانای ئەوى هەیە، و بەو جۆرە کە هەیەتى، ((ئەیکات))،(١٥) و ئەمە کاتێکە کە شتى کارتێکەرخواز((ئامادەیە))و بەو شێوەیە کە ئەبێت، هەبێت، ئەگەرنا تواناى ئیش کردنى نابێت؛{ئیدى زیاد لەمەش ئەوەى کە((ئەگەر هیچ شتێك لە دەرەوە بەربەست نەکرێت)) پێویست نیە، چونکە ئەمە تا ئەو شوێنە و بەم هۆیەوە کە تواناداریتى بۆ ((کردار))ە، خاوەنى تواناداریتیە، و ئەمەش لە هەموو حاڵەتەکاندا نیە، بەڵکوله حاڵەت گەلێکى دیارى کراودایە، کە لەواندا بەربەستە دەرەکیەکان ئەگەرێنرێنەوە،(٢٠) چونکە ئەمانە هەندێك لە جیاکاریە پەیوەستەکان رەت ئەکەنەوە،}بەم هۆیەوە ئەگەریش مرۆڤ بیەوێت یان مەیلى ئەوەى هەبێت کە دووشت، یان دژەکان، هاوکات ئەنجام بدات، ئەوە ناکات، چونکە لەم حاڵەتەدا توانایى ئەوەى نیە، و هەروەها ئیش کردنێکى تواناداریانە،(بە هەردووك یان بە دژەکان) هاوکات بوونى نیە، چونکە مرۆڤ بەوەى کە تواناى هەیە و بەو جۆرەى کە توانادارە، ئیش ئەکات.

"وەرزی شەشەم"

# (کردارێتی"ووزەداری" و جیاوازی لەگەڵ تواناداری‌تی و جوڵە)

(٢٥) لەدوای ئەوەی کە لە بارەی((تواناداریێتی))یەوە کە لە روانگەی جووڵەوە وا ناو ئەنرێت، قسە کرا، هەنووکە لەبارەی ((کردارێتی))یەوە قسە ئەکەین، کە کردارێتی چیەو چۆنە؟ چونکە لە ماوەی ئەم روونکردنەوەیە، هاوکات لەبارەی((تواناداریێتی))یەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ئێمە((بەتوانا)) نە تەنیا بە شتێك ئەڵێین کە بە پێی سروشتی خۆی شتێکی تر ئەهێنێتە بوون یان بەهۆی شتێکی تر دێتە جوڵە، (یان بە شێوەیەکی ڕەها یان بە شێوەیەکی دیاری کراو)، بەڵکو هاوکات ئەو بە جۆرگەلێکی تریش ناوزەد ئەکەین،(٣٠)بەم هۆیەوەیە کە ئێمە لە ماوەی پشکنینەکەی خۆمان ئەوانەش باس ئەکەین.

((کردارێتی، هەبوونێتی to huparkhein شتە))، بەڵام نەك بەو جۆرە کە ئەڵێین((هێزەکیانەیە-خۆهێزانەیە))، ئێمە((هێزەکیەتی)) بە شتێك ئەڵێین کە هەروەك پەیکەرەکەی((هێرمێس)) لە تەختەیە یان نیوەیەکە لە هەموو، چونکە ئەتوانێت لەم جیا بێت، و هەروەها(هێزەکی ناو نانی شتێك) وەك ئەمەیە کە تەنانەت کەسێك کە لایەنگری((بینین و بڕوا ئەربڕین نیە)) بە زانا بزانین، ئەگەر توانای خوێندنەوە و ڕاگۆرکێی هەبێت(٣٥) و هەرچیەك کە لەم جۆرانە نەبێت، ئەڵێین((کردارێتیە))،(یان هەیە)،ئەوەی کە ئەمانەوێت بڵێین لە ڕێگای ئیستقرا وە لە تاك شتەکاندا (شتە تاکەکاندا)ڕوون ئەبێتەوە، پێویست ناکات کە((بۆ هەر شتێك بە دوای پێناسەیەکدا بگەڕێین))، بەڵکو لە ڕێگای بەراوردەوە ئەتوانین یەك لایەنانە سەیری بکەین، بەو

شێوەیەی کەنیسبەتی وەستا بەوەوە کە ئەتوانێت دروست بکات یان نیسبەتی خەو زڕاو بە خەوتوو، یان نیسبەتی بینەر بەوەی کە چاوەکانی بەستووە، بەڵام خاوەنی دیدەو بینینە، یان نیسبەتی ئەوەی کە جیا بووەتەوە لە مادە لەگەڵ مادە، یان نیسبەتی ئەوەی کە ئیشی دروست کراو ئەوەی کە ئیشی دروست نەکراوە، هەنوکە یەکێك لەم دو بەشە جیایە، کردارێتی(هەبووێتی) و ئەوی تر(٥) ((بەتوانا)) ئەبێت.

بەڵام کردارێتی (بوونێکی کردارێتیانە .و.ك) لەبارەی هەموو شتەکانەوە بەیەکسانی ناووترێت، بەڵکو یان لە ڕێگای بەراوردەوەیە، بەو شێوەیە(بڵێین)((ئەم شتە))لە((ئەم شتە))دایە، یان((لە پەیوەندی لە گەڵ ئەم شتە)) دایە، چونکە نیسبەتی هەندێك وەك جووڵە بە تواناداریێتی، و نیسبەتی هەندێك وەك ناوەڕۆك بە یەك مادەوەیە،(١٠) لەبارەی ((ناکۆتا)) و((بۆشایی))و هەموو ئەم جۆرە شتانە بە شێوەیەکی تر لە((کردارێتی))و ((هێزەکێتی)) قسە ئەکرێت تا لەبارەی زۆربەی بوونەوەرەکانی تر، وەك لەبارەی بینەر و ڕەوەند و بینراو، چونکە ئەمانە لەکاتێکی دیاری کراودا لەوانەیە بە ڕەهاییانەش ڕاست بن، چونکە((بینراو)) هەندێ جار بەو هۆیەوە ناو ئەنرێت کە کە((ئەبینرێت)) و هەندێ جار بەو هۆیەوە کە توانای ئەوە هەیە کە((ببینرێت))، بەڵام(( ناکۆتا)) نە بەو جۆرە هێزەکیانە بوونی هەیە،(١٥) کە هەرگیز بتوانێت بە جیا و کردارییانە بوونی هەبێت، بەڵکو تەنیا لە ناسیندا بوونی هەیە، چونکە ئەم مەسەلەیە کە دابەش کردن هەرگیز ناگاتە کۆتایی، لەبەر ئەوەیە کە پیشاندەری بوونایەتی((هێزەکێتی)) ئەم کردارێتیەیە، نەك ئەوەی کە بتوانێت بە جیاجیا بوونی هەبێت.

لەبەر ئەوەی لەو کردارانەی کە خاوەنی ((ئاست=سنوورن)) هیچ دانەیەکیان ئامانج نین، بەڵکو بەستراون بە ئامانجێکەوە، (وەك لاواز بوون و لاوازی، و هەروەها خودی ئەندامە لاواز بووەکان،(٢٠) کاتێك لاواز ئەبن کە بەو جۆرە لە جووڵەدان، بە بێ ئەوەی کە، ئەوەی کە جووڵە لەبەر ئەوە، بوونی هەیە) بەم شێوەیە ئەمە جووڵە نیە. یان بەلایەنی کەمەوە جووڵەیەکی کامڵ(تێروتەسەل) نیە، چونکە ئامانجێکی لەخۆدا نیە. بەڵام ئەوەی کە ئامانج لەودا ئامادەیە، ((کردارە parxis))، بۆ نموونە مرۆڤ لەهەمان کاتدا ئەبینێت و ئەبینرێت، تێئەگات و تێئەگەیەنرێت، بیر ئەکاتەوەو بیرکەرەوەیە، بەڵام نەك ئەوەی کە مرۆڤ فێر ئەکات و پێشتر فێر بووە، و نە ئەوەی کە تەندروست ئەبێت و لەهەمان کاتدا پێشتر تەندروست بووە(٢٥)بەڵام مرۆڤ باش لەدایك ئەبێت و لەهەمان کاتدا باش ئەژیت، و خۆشبەختەو لەهەمان کاتدا خۆشبەخت بووە، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، ئەم گوزەرە ئەبێت لەکاتێکدا بوەستێت، بە شێوەیەك کە هەرکاتێك مرۆڤەکە لاواز

ئەبێت بەم شێوەیەیە، بەڵام هەنوکە بەم شێوەیە نیە، بەڵکو مرۆڤ ئەژیت و لەهەمان کاتدا زیندووش بووە،

لەم شتانەوە ئەبێت هەندێکیان جووڵەو هەندێکیان کردارێتی ،ناو بنێین، ((هەر جووڵەیەك لە راستیدا ناتەواوە))-لاواز بوون، فێر کردن، بە رێگادا چوون و دروست کردن- ئەمانە جووڵەن،(٣٠) و لە راستێدا ناتەواون، چونکە مرۆڤ بە رێگادا ناروات، و لەهەمان کاتدا بە رێگاداچووە، دروست ناکات(مەبەست لە دروست کردنی دیوارە) و لەهەمان کاتدا پێشتر دروستی کردووە، هەڵناسێتەوەو لەهەمان کاتدا پێشتر هەڵساوەتەوە، یان((هەست ئەکرێت))و لەهەمان کاتدا پێشتر هەست کراوە، یان ئەجووڵێت و لەهەمان کاتدا پێشتر جووڵاوە،{ئەبێت سەرنجی ئەوە بدەن کە}((ئەجولێت))لەگەڵ ((جووڵاوە)) شتێکی جیاوازە، بەڵام ئەوەی کە بینیوویەتی و ئەوەی کە ئەیبینێت هاوکات یەکێکە، و هەروەها ئەوەی کە بیر ئەکاتەوە و ئەوەی کە بیری کردۆتەوە. کەواتە من ئەم رەوەندە ناو ئەنێم((کردارێتی-یان کارایيەتی energia)) و ئەوی تر ناو ئەنێم((جووڵە))،(٣٥) کەواتە ئەوەی کە کردارێتی چیەو چۆنە، ئەبێت لەم گووتارانەو لەشێوەکانی ئەمەدا بۆمان ڕوون بووبێتەوە.

"وەرزی حەوتەم"

# ( لەبارەی بوونەوەری هێزەکیانە )

١٠٤٩a

هەنووکە ئەبێت ئەوە دیاری بکەین کە هەر تاك شتێك، چ کاتێك((هێزەکی))انەیەو چ کاتێك وانیە، چونکە لە هەرکاتێکدا بەم شێوەیە نیە، بۆ نموونە ئایا خاك یان زەوی ((هێزەکیانە)) مرۆڤە؟ یان نا، بەڵکو زیاتر کاتێك (بەم شێوەیەیە) کە بووبێت بە((تۆوێك-مەبەست لە تۆوی مرۆڤە)) بەلاّم لەوانەشە لەوکاتەشدا نەبێت، رێك بەو شێوەیە کە هەر شتێك لە رێگای پزیشکی یان لە رێگای رێکەوتەوە ناتوانێت چارەسەر بکرێت، بەڵکو شتێکی دیاری کراو بوونی هەیە کە تواناداریّتی ئەوەی هەیە، و ئەمەش هەمان تەندروستی هێزەکیە.(٥)

بەلاّم ئاستی ئەوەی کە بە یارمەتی بیرکردنەوە لەیەك بوونەوەری هێزەکی بە شێوەی هاتنە ئاراییەکی تێروتەسەل دێتە بوون، ئەمەیە کە هەرکاتێك فاکتەرەکە ئیرادە بکات،- و هیچ شتێك لەدەرەوە بەربەست نەکرێت- هەست نەکرێت، بەلاّم لە بارەی ئەوەی کە تەندروست ئەبێت، لەمەدایە کە لە خودی ئەودا هیچ بەربەستێك بوونی نیە، و لەبارەی خانووی هێزەکیانەشەوە هەر بەم شێوەیەیە، ئەگەر لەوداو لە مادەدا شتێك روو نەدات کە لە خانووبووندا بەربەست دروست بکات، واتە(١٠)شتێك نەبێت کە ئەبێت زیاد یان کەم یان لەناو بچێت، و لەبارەی هەموو شتەکانی تریشەوە کە سەرەتا یان سەرچاوەی دروست بوون لەدەرەوەی ئەوانەوەیە، و لە هەموو ئەو شوێنانەی کە لەبارەی هەموو شتەکانەوە کە سەرچاوەی دروست بوونیان لە خۆیاندا هەیە، ئەوە شتێکی هێزەکیانەیە کە- ئەگەر هیچ شتێك لە دەرەوە بەربەست نەکرێت و بەری نەگیرێت- بە یارمەتی خۆی

بوونی دەبێت، وەك((تۆو)) کە هێشتا(مرۆڤ نیە)(١٥)، چونکە یەکەمجار ئەبێت لە شتێکی تردا بڕوات و لەناو بچێت، بەلاّم هەرکاتێك کە بە هۆی بنەماکەی خۆیەوە خاوەنی چۆنایەتیەکی لەو شێوەیەیە، ئەوکات پێشتر ئەم (مرۆڤ)ە هێزەکیانەیە(خۆهێزە) و لەکاتێکدا کە ئەوی تریان(واتە تۆو) پێویستی بە بنەمایەکی ترە، ڕێك بەو شێوەیە کە زەوی هێشتا هێزەکیانە پەیکەرێك نیە، چونکە یەکەمجار ئەبێت بگۆڕێت (بەناوبچێت)تا ببێت بە برۆنز.

وا دەرئەکەوێت کە ئەوەی ئێمە لێیەوە قسە ئەکەین،((ئەمە))یەك نیە، بەڵکو((ئەوی))یەکە، بۆ نموونە(٢٥)،تەختە نیە، بەڵکو تەختەییە، و تەختەی زەوی نیە، بەڵکو((زەوینی))یە، هەربەم شێوەیەشە ئەگەر زەویش نەك هەربەم شێوەیە شتێکی تر بێت، واتە((ئەوی)) بێت،((ئەو شتە))ی تر هەمیشە بە ڕەهایی و هێزەکیانە ((پاشکەوتە-لە دواوەیە))، بۆ نموونە سندوق نە زەوینیە، و نە زەوی، بەڵکو تەختەییە، چونکە ئەمە هێزەکیانە سندوقە و ئەمە خۆی مادەی سندوقە، ئەویش تەختە بە شێوەیەکی ڕەها(مادە بۆ) ،سندوق بە شێوەیەکی ڕەهایە، و ئەم تەختە لێرەدا مادەیە بۆ ئەم سندوقە لێرەدا.(٢٥).

((بەلاّم ئەگەر شتێك یەکەمینە کە ئیدی لەروانگەی)) شتێکی تر((ئەوی)) ناونانرێت، ((ئەو ،هەمان مادەی یەکەمینە-هیولی یەکەمین))ە، بۆ نموونە ئەگەر زەوی((هەوایی))ە، و هەوا ئاگر نیە بەڵکو ئاگرینە، کەواتەس ئاگر مادەی یەکەمینە، کە یەك((ئەم شتە))نیە، چونکە((لەبەر ئەو)) لەگەڵ ((بابەت)) لەو ڕووەوە کە جیا ئەکرێتەوە کە یان یەك((ئەم شتە))یە یان نیە، بۆ نموونە((مرۆڤ)) بابەتە بۆ کرداراندنەکان، ((تەن))ە، و((ڕۆح))ە،(٣٠) و بابەتی کرداراندنی((مۆسیقاڕ)) و((سپی))یشە، بەلاّم ئەوەی کە مۆسیقا لەودا پێك هاتووە، ناوی نانرێت مۆسیقا، بەڵکو ((مۆسیقاڕە)) و مرۆڤ پێی ناوترێت((سپێتی)) بەڵکو پێی ئەوترێت((سپی))، و نە ڕێگادا چوون، و جوولاّن، بەڵکو بە ڕێگاداچوو، و جولاّو(ناو ئەبرێت)، ڕێك هەروەك ئەوەی کە لەبارەی((ئەوی)) گووترا، کەواتە شتانێك کە بەم شێوەیەن، پاشکەوتی(بابەتی) ئەوان ناوەڕۆکە، بەلاّم شتانێك کە بەم جۆرە نین،(٣٥) بەڵکو((هەڵگیراوی)) ئەوان یەك((شێوە)) و یەك((ئەم شتە))یە، پاشکەوتی(بابەتی) ئەوان مادەو ناوەڕۆکی مادییە، و بە تەواوی دروستە کە ((ئەوی)) هەم لە روانگەی مادەوە ئەگووترێت و هەم لە روانگەی ((کردارێتی))ەوە، چونکە هەردوکیان دیاری نەکراو و بێسنورن(aorista)، کەواتە گووترا کە چ کاتێك ئەبێت بڵێین کە شتێك ((هێزەکی))یە وچ کاتێك نیە.

"وەرزی هەشتەم"

## (کردارێتی لە پێش تواناداڕێتی یان"هێزەکیەتی"ەوەیە)

وەك چۆن پێشتر دیاری کرا کە((پێشکەوت=لەپێش)) بە چەند جۆرێك ئەگوترێت، ڕوونە کە کردارێتی لە پێش تواناداڕێتیەوەیە،(٥)مەبەستم لە((تواناداڕێتی)) نە تەنیا ئەو جۆرە سنوردارەیە کە ئەگوترێت ((بنەمای لە ناوچوون لە شتێکی تردا یان هەروەك شتێکی تر))، بەڵکو مەبەستم(لە تواناداڕێتی) بە شێوەیەکی گشتی هەرجۆرە بنەمای جوولە یان وەستانە، چونکە((سروشت)) یش لەهەمان ڕەگەزی تواناداڕێتیە، لەبەر ئەوەی((بنەمای جوولە(١٠)یە، بەڵام نە لەشتێکی تر، بەڵکو لە خودی((شتی هەروەك خۆی))لەسەر هەر (تواناداڕێتیەکی) لەم جۆرە، کردارێتیش هەم بە پێی ماناو هەم بە پێی ناوەڕۆك، لە پێشترە، بەڵام بە پێی کات لە ڕوانگەیەکەوە بەم شێوەیەو لەڕوانگەیەکی ترەوە بەم شێوەیە نیە.

ئەوەی کە بە پێی مانا لە پێشترە، شتێکی ڕوونە،چونکە ((تواناداڕێتی))بە یەکەمین مانا ئەوەیە کە توانای کردارێتی پێبەبەخشینە، بۆ نموونە من بە کەسێکی بیناساز ئەڵێم کە توانای دروست کردنی خانووە،(١٥)یان بەکەسێکی بینا ئەڵێین کە توانا بینینە، وبینراو ئەو شتەیە کە توانای بینراوی هەیە،(یەکێك ببینێت) ،هاوکات ئەم قسە لەبارەی بوارەکانی تریشەوە هەر ڕاستە، بەو شێوەیەی کە ماناو زانست(ناسین)ی ئەو دانەیە(واتە کردارێتی) پێویستانە لە پێش ناسینێکی ترەوەیە(واتە تواناداڕێتی).

بەڵام(کردارێتی) بە پێی کات بەم شێوەیە لە پێشەوەیە، ئەو((کردارەی))کە بە پێی جۆر نەك ژمارەییانە، لەگەڵ (هێزەکی بووندا)) یەکێکە، مەبەستی من ئەوەیە کە: لەم مرۆڤە کە هەنووکە و کردارێتانە بوونی هەیە و لە ((گەنم)) و(٢٠)لە ((بینەر))بە پێی کات

لە پێشترن، ئەو مادەو ئەو تۆوە، و ئەو سەیرکەرەی کە هێزەکیانە هەمان مرۆڤ و گەنمن، بەڵام هەنووکە بەو شێوەیەش ((کردارێتی)) نین، بەڵام لە لەمانەو بەپێی کات بوونەوەر گەلێکی تری کردارێتیانەی تر لە پێشترن، کە لەوانەوە ئەمانە هاتوونەتە بوون، چونکە هەمیشە بوونەوەری((خۆ کردار-کردارەکی))(٢٥) لە بوونەوەری ((خۆ هێز-هێزەکی)) و بەیارمەتی بوونەوەرێکی کردارێتیانەوە دێتە بوون، وەك مرۆڤ لە مرۆڤ، و مۆسیقاژ لە مۆسیقاژ، هەمیشە یەکەمین پاڵنەرێك بوونی هەیە، پاڵنەر پێش هەموو شتێکیش ((کردارەکیە)).

لە گووتارەکانی لێوارەکانی ناوەرۆك، گووترا، کە هەر ((دروست بوویەك یان-هەست پێکراوێك to gignomenon))، شتێکە کە لە شتێك و بە یارمەتی شتێك دێتە بوون، و ئەمە لەروانگەی جۆرەوە هەمانە، بەم هۆیەوە (٣٠) گوومانی ئەوە ئەکرێت کە مەحاڵە کەسێك((بیناسان)) بێت کەهەرگیز خانوویەکی دروست نەکردبێت، یان چەنگ ژەنێك بێت و هەرگیز چەنگی لێنەدابێت، چونکە ئەو کەسەی کە فێری چەنگ لێدان ئەبێت، لە کاتێکدا فێری چەنگ لێدان ئەبێت کە لێی ئەدات، و هەر بەم شێوەیەشە لە بوارەکانی تردا، لێرەوەیە کە هەڵەکەی سۆفستاییەکان دەرئەکەوێت کە: کەسێك کەخاوەنی ناسین و مەعریفە نیە وا بکات کە بابەتەکەی ناسینە، چونکە فێرکەری شتێك هێشتاکە خاوەنی ئەو شتە نیە،.(٣٥) بەڵام لەبەر ئەوەی شتێك لە دروست بوو ئەبێت پێشتر هاتبێتە بوون و لە پاڵنراوەوە بە شێوەیەکی گشتی ئەبێت پێشتر شتێك هاتبێتە جووڵە، (ئەم خاڵە لە گووتاری لێوارەکانی جووڵەوە ڕوون بووەتەوە)، کەواتە بەم شێوە کەسێکیش کە فێر ئەبێت، ئەبێت خاوەنی شتێك لە ناسین بێت، بەڵام هەنووکە لەم خاڵەشەوە ڕوون ئەبێتەوە کە کردارێتیش بەم شێوەیە هەم لە روانگەی دروست بوونە و کاتەوە لە پێش تواناداریتیەوە(هێزەکیتی)یەوەیە.

بەڵام بە پێی ناوەرۆکیش بەم شێوەیەیە، یەکەمجار بەو هۆیەی کە شتانێك کە لە دروست بوون(یان هەست پێ کردن) لە پاشن،(٥)لە روانگەی شێوە و ناوەرۆکەوە لە پێشن، (وەك ئەوەی کە خەڵك لە پێش منداڵەوەن، و مرۆڤ لە پێش تۆوەوەن، چونکە یەکێکیان پێشتر خاوەنی شێوەیە و ئەوی تر نا) و هەروەها بەو هۆیەوە کە هەر دیاردەیەك بە ئاراستەی بنەمایەك و ئامانجێکەوە بەرێ ئەکەوێت، بنەما هەمان((لەبەر ئەو))ە، بەڵام ((دروست بوون لەبەر ئامانجە telos)) و ((ئامانج هەمان کردارێتیە)) ولەبەر ئەمەش تواناداریتی دروست ئەبێت،(١٠)چونکە بۆ بوونی بینین نیە کە گیانەوەر ئەبینێت، بەڵکو خاوەنی بینینین بۆ ئەوەی کە ببینین، بەم شێوەیە مرۆڤەکان خاوەنی

هوونەری بیناسازین بۆ ئەوەی خانوو دروست بکەن، و خاوەنی هێزێکی تیۆرین بۆ ئەوەی کە تیۆردارێژن، بەڵام تیۆردارێژی ناکەن بۆ ئەوەی توانای تیۆریان هەبێت مەگەر کەسانێك کە راهێنان ئەکەن، ئەمانە تیۆردارێژی ناکەن، مەگەر تا ئەندازەیەك، یان لەو رووەوە کە پێویستیەکیان بە تیۆردارێژی نیە.(١٥).

هاوکات مادەش هێزەکیانە بوونی هەیە، چونکە ئەتوانێت بگات بە شێوە، بەڵام هەرکاتێك کە بگاتە کردارێتی (یان بکردارێت) ئەوکات لە شێوەدا بوونی هەیە، و لە بوارەکانی تریشدا هەربەم شێوەیە، و هەروەها لە لای شتانێك کە ((ئامانجیان)) جووڵەیە، لەبەر ئەمە رێك بەهەمان جۆر کە فێرکارەکان وا دائەنێن کە بە ئامانجەکەیان گەیشتوون، کاتێك کە فێرخوازەکەیان لە کاتی ئیش کردن و ئەنجامداندا پیشان دابێت، سروشتیش هەربەم شێوەیە، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، حاڵەتەکە هەروەك((هێرمێس(٢٠) پاوسۆن)) ئەبێت، چونکە روونە کە ناسین یان دانایی لە دەرەوە یان لە ناوەوەی (فێرخوان)ەکەوەیە، رێك وەك چۆن لە لای ئەو هێرمێسەش هەروابوو. چونکە ئیش ،ئامانجە، ئیش کردارێتیشە، بەم هۆیەوەیە ناوی (کردارێتی)) (لە یۆنانی)دا بە پێی ((ئیش یان کردار ergon)) ئەگوترێت، و بە ئاراستەی((ئەوپەری هاتنە ئارایی–یان پەرەپێدانی کامڵ یان بە ئامانج گەیشتویی))ئەکەوێتە رێ.

بەڵام لەبەر ئەوەی لە هەندێك بواردا، مەسەلەی دوایین، بەکارهێنانە، وەك بینایی بۆ بینینە، جگە لەم ئیشە شتێك تر لە بینایی نایەتە بوون(٢٥) بەڵام لەهەندێك بواری تردا شتێك دێتە بوون، بۆ نموونە بە یارمەتی هونەری بیناسازی جگە لە بوونیاد نان، خانوش دروست ئەکەن، بە بونی ئەمەش، بەکار هێنان لەو بارەدا ئامانجەو و لەم بوارەی دووەمدا زیاتر لە توانادارێتی، ئامانجە، چونکە کرداری خانوو دروست کردن، لە دروست کردنی خانودا دەرئەکەوێت، واتە هاوکات لەگەڵ ((خانوو))دا دێتە بوون و هەیە.

(٣٠) کەواتە بەم شێوەیە لەو بوارانەی کە شتی دروست بوو، شتێکی تری بەدەر لە بەکارهێنان نیە، کردارێتی لە شتە دروست بووەکەدا بوونی هەیە، بۆنموونە وەك بوونیادنان، لە شتە دروست بووەکەدا، و چنین لە شتە چنراوەکەدا، و لەبوارەکانی تریشدا هەربەم شێوەیەشە، و بە شێوەیەکی گشتی جووڵە لە شتە جووڵاوەکەدا، بەڵام لەو بوارانەی کە ئیشێکی تر لە پاڵ کردارێتی(٣٥)دا بوونی نیە، کردارێتی لە خودی کرداری(ئیش)دا ئامادەیە، وەك بینین لە بینەر و تێرامان لە رامار و ژیان لە رۆحدا،(و خۆشبەختیش هەربەم شێوەیە، چونکە ئەمیش جۆرێـــــــــکی دیاری کراوە لە ژیان)

1050a

لەبەر ئەمە ڕوونە کە ناوەڕۆك و شێوە کردارێتیە، کەواتە لەم گوتارەوە ڕوون ئەبێتەوە کە کردارێتی بە پێی ناوەڕۆك لە پێش تواناداریتیەوەیە، و بەو شێوەیەی کە گووتمان، لە ڕوانگەی کاتەوە کردارێتیەك هەمیشە(5) لە پێش ئەوی ترەوەیە، و هاوکات ئەگەڕێتەوە تا بە هۆکارێتی یەکەمین پاڵنەری هەمیشەیی بگات.

بەڵام هەربەم شێوەیە(کردارێتی) بە مانایەکی وردتر و ڕاستر، لە پێشەوەیە، چونکە شتە جاویدانەکان بە پێی ناوەرك لە پێش شتە لەناو چووەکانەوەن،هیچ شتێکی((هێزەکی)) جاویدان نیە، هۆکاری ئەوەش ئەمەیە :هەر تواناداریتیەك هاوکات تواناداریتیەکی ناهاوتایە، چونکە ئەوەی کە هەبوونێتی نیە(10) بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت هەبێت؟ بەڵام ئەوەی کە توانای ((هەبوونە)) لەوانەیە کە کردارێتی نەبێت، کەواتە ئەوەی کە توانای هەبوونە، لەوانەیە هەم هەبێت و هەم نەبێت، لەبەر ئەمە هەمان شت، هەم توانای بوون و هەم توانای نەبوونە، بەڵام ئەوەی کە توانای نەبوونە، ئەگەری هەیە کە نەبێت، ئەوی کە ئەگەری ((نەبوونایەتیە))، لەناوچووە، چ بە شێوەیەکی ڕەها، چ بەم جۆرەی کە گووترا لەوانەیە نەبێت، چ لە ڕوانگەی شوێن و چ لە ڕوانگەی چەندایەتی و چ لە ڕوانگەی چۆنایەتیەوە، ((بە شێوەیەکی ڕەها)) واتە لە ڕوانگەی ناوەڕۆکەوە، کەواتە هیچ شتێك کە بە شێوەیەکی ڕەها لەناوچووەخوازە، بە شێوەیەکی ڕەها هێزەکی نیە،(بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێت کە لە ڕوانگەیەکی دیاری کراوەوە بەم شێوەیە بێت، بۆ نموونە لە ڕوانگەی چۆنایەتی یان شوێنەوە) کەواتە هەموو ئەوانە کردارێتیانەن، هیچ شتێك پێویستانە ناتوانێت بوونەوەریش بێت، (واتە هێزەکی بێت) بە بوونی ئەمە، ئەمانە (واتە هێزەکیەکان.و.ف) یەکەمینن، چ ئەگەر نەبوونایە، بە هیچ شێوەیەك، هیچ شتێك بوونی نەدەبوو،(20) جووڵەش، ئەگەر شتێکی جاویدانی لەم شێوەیەیە،(ناتوانێت هێزەکی بێت) و ئەگەریش پاڵنەرێکی جاویدان بوونی هەیە، جوڵێنراو هێزەکی نیە، مەگەر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بێت، هیچ شتێك بەربەست نیە لە دروست بوونی مادەکەی ئەودا( کە بەو هۆیەوە بتوانێت لە ڕوانگە جۆراوجۆرەکانەوە بجووڵێت.و.ف) بەم هۆیەوەیە کە خۆر، ئەستێرەکان و هەموو گەردوون هەمیشە چالاکن و ترسی ئەوەش نیە کە لە کاتێکدا بووەستن، بەو شێوەیەی کە((توێژەرەوانی دەربارەی سروشت)) ئەو ترسەیان هەیە، ئەوان لەو ئیشەش ماندوو نابن، چونکە جووڵە لە لای ئەوان، هەروەك شتە لەناوچووەکان، پەیوەست نیە بە تواناداریتی(25) بۆ ناهاوتایی ، بە شێوەیەك کە پێکەوە لکان و بەردەوامیتی جووڵە

بۆئەمان ماندوکەر بێت، چونکە هۆکاری ئەمە کاتێکە کە ناوەرۆك، مادەو هێزەکیانە بێت نەك، کردارێتانە.

بەلاَم ئەو بونەوەرانەی کە لە گۆڕاندان لە گەلّ شتە لەناونەچووەکان هاوشێوەن، وەك زەوی و ئاگر، چونکە ئەمانە هەمیشە چالاکن، چونکە بە خودی خۆیان و لەخۆیاندا خاوەنی جوولّەن،(٣٠) بەلاَم تواناداریتیەکانی تر، بە پێی ئەوەی کە دیاریمان کرد، هەموو تواناداریتیەکان ناهاوتا(خوازن)، چونکە ئەوەی کە توانای جوولّە پێدان (( بەم جۆرە))یە، بە پێی مانایەکی ئەقلاّنی ئیش ئەکات، خودی تواناداریتیەکانیش بە بێ مانایەکی ئەقلاّنیش، بە پێی ئامادەیی یان نەبوونی ئامادەییان، توانای دروست کردنی ناهاوتاییەکانیان هەیە، کەواتە ئەگەر سروشت گەلێك یان ناوەرۆك گەلێك لەو((جۆرە)) بوونیان هەیە کە((دیالێکتیەکان)) ئەلّێن،((ئایدیەکان)) لەون، و لەو شێوەیەدا ئەبێت شتێکی ناسێنەرتر لە ناسین و زۆر جوولاّوتر لە جوولّە، بوونی هەبێت، چونکە ئەمانە(واتە ناسێنراون و جوولّێنراو.و.ف)) زیاتر کردارێتین، لەکاتێکدا کە ئەوانە

١٠٥١a

(واتە خودی ناسین و خودی جوولّە.و.ف) تواناداریتیەکانی ئەمانن، کەواتە ڕوون ئەبێتەوە کە کردارێتی هەم لە تواناداریتی و هەم لە بنەمای لەناوچوون، لە پێشترە.

## "وەرزی نۆیەم"

# ( درێژەی گوتاری کردارێتی و تواناداریێتی )

ئەم خاڵە کە کردارێتی باشتر و بەرێزترە، تەنانەت لە تواناداریێتیەکی شایستە، لەم گوتارانەوە ڕوون ئەبێتەوە،(٥) چونکە هەرچی کە ئەگوترێت بەتوانایە، خودی ئەو توانای دژەکانە، وەك ئەوەی کە توانای تەندروستی یە، هەرخودی خۆی توانای نەخۆشیشە، ئەویش بە شێوەیەکی هاوکات، هەردوکیانە، چونکە هەمان تواناداریێتیە، بۆ تەندروست بوون و نەخۆش بوون، بۆ وەستان و بۆ جووڵە، بۆ دروست کردن و وێران کردن،(١٠) بۆ ڕاستە بوونەوە(مەبەست لە بینایە.و.ك) و ڕمان، کەواتە تواناداریێتی بۆ دژەکان، هاوکات بوونی هەیە، بەڵام بوونی دژەکان هاوکات نەگەری نیە، (مەحاڵە)، بوونی کردارێتیەکانیش هاوکات مەحاڵە، بۆ نموونە (هاوکات) ساغ بوون و نەخۆش بوونیش مەحاڵە، لەبەر ئەمە بەناچاری یەکێك لەم دووانە باشە،(١٥) بەڵام تواناداریێتی یان بەیەکسانی بۆ هەردووکیانە، یان بۆ هیچ یەك لەو دووانە، کەواتە کردارێتی باشترە.

بەڵام لە لای ساویلکەکان، ئامانج و کردارێتی ئەبێت خراپتر لە تواناداریێتی بن، چونکە هەمان تواناداریێتی بۆ هەردوو دژەکان بەتوانایە، کەواتە ڕوونە کە((خراپ))ێکی جیا لە شتەکان بوونی نیە، لەبەر ئەوەی ((خراپ)) بە سروشتی لەدوای تواناداریێتیەوەیە، لەبەر ئەمە لەو شتانەی کە لە سەرەتاوە بوون، و لە شتە جاویدانەکاندا، (٢٠) نە شتێکی خراپ هەیە و نە هەڵەیەك، و نەشتێکی لەناوچوو، چونکە لەناوچوون لە ریزی شتە خراپەکاندایە.

بەلاّم شکلّە ئەندازەییەکانیش لە کردارێتیدا ئەتوانین بەدەست بهێنین، چونکە ئەگەر دابەش بکرێن ئەوانە بەدەست ئەهێنن. ئەگەریش پێشتر دابەش ببوونایە، دەر ئەکەوتن، بەلاّم هەنووکە(دابەش) هێزەکیانە لەودا بوونی هەیە، بە چ هۆیەك گۆشەکانی سێگۆشەیەك یەکسانن لە گەلّ کۆی دوو گۆشەی وستاو؟ چونکە گۆشەکانی(٢٥) پالّ یەك خالّ(لە یەك هێلّی راستدا) یەکسانن لە گەلّ دوو ((گ.وەستاودا)) هەنووکە ئەگەر هێلێکی تەریب بە سەرەوە بکێشرێت، هۆکارەکەی یەکسەرە بە روونی دیارە. بە چ هۆیەك لە نیوە بازنەیەکدا بە شێوەیەکی گشتی گۆشەکە وەستاوە؟ ئەگەر سێ هێلّی یەکسان بن، دوو هێلّ کە قاعیدەکە پێك ئەهێنن و هێلێکی ستونی لە ناوەراستی قاعیدەکەوە، وەلاّم لە یەك نیگادا بۆ ئەو کەسەی کە ((مەسەلەکەی -پێردۆزەکەی)) پێشوو ئەزانێت، روون ئەبێتەوە.

لەبەر ئەمە روون ئەبێتەوە کە((شکلّەکان)) بوونەوەری هێزەکین(هەبوویی هێزەکین)، هەرکە بکرێنە ((کردارێتی)) (٣٠) ئەدۆزرێنەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئەندێشە لێرەدا کردارێتیە، کەواتە تواناداریتی(هێزەکێتی) لە کردارێتیەوە روو ئەدات، و بەم هۆیەوەیە کە مرۆڤەکان لەبەر ئەوەی دروست ئەکەن، ئەناسن، چونکە کردارێتی لە روانگەی ژمارەوە لە دوای(کردارێتیەوەیە) لە روانگەی دروست بوونەوە.

"وەرزی دەیەم"

# ( راست و درۆ، و پێناسەی مەنتیقیانەی راستی )

١٠٥١b

لەبەر ئەوەی ((بوونەوەر-هەبوو)) و((نابوونەوەر-نەبوو)) هەندێك بە پێی شکڵی گووتارەکان یان(هەڵگیراوەکان)) ئەگووترێن و هەندێك(٣٥)بە پێی تواناداری(هێزەکیتی) و کردارێتی(کردار) یان دژەکانیان، بەڵام هاوکات، ((بوونەوەر)) (بە وردترین یان گشتی ترین ماناکەی) بە((راست ))یان((درۆ)) ئەگوترێت، و ئەمە لە لای شتەکان لەروانگەی پێکەوە بەستن یان جیابوونەوەیانەوەیە، ((بە شێوەیەك کە ئەو کەسە راستی ئەڵێت کە جیا بووەوە بە جیابووەوە ئەزانێت و پێکەوە بەستراو بە پێکەوە بەستراو)) بەڵام ئەو کەسە درۆ ئەکات کە(٥) بە پێچەوانەی بارودۆخی(شکڵی) شتەکانەوە بیر ئەکاتەوە، کەواتە((چ کاتێك)) ئەوەی کە راست یان درۆ ناو ئەنرێت، هەیە یان نیە؟ ئەبێت پێداچوونەوەی ئەوە بکەین کە مەبەستی ئێمە لەمە چیە، نەك بەو هۆیەی کە ئێمە بەراستی مەزەندەی ئەکەین کە تۆ سپیت، تۆ سپیت بەڵکو بەو هۆیەی کە تۆ سپیت، ئێمە بە گووتنی ئەم قسەیە راستی ئەڵێین، (یان راست ئەڵێین)، کەواتە ئەگەر هەندێك لە شتەکان هەمیشە پێکەوە بەستراون و ناتوانن جیا بوەوە بن، و هەندێك لە شتەکان(١٠) هەمیشە جیان و ناتوانن پێکەوە بلکێن، و هەروەها لە هەندێك لە شتەکانیشدا ئەگەری دژەکانی ئەمانە هەیە، بەم شێوەیە((هەبوون)) ،پێکەوە لکان و یەك-بوونە، و((نەبوون)) پێکەوە نەبەستوویی، بەڵکو چەندین بوونە، هەنووکە لەبارەی ئەو مەسەلانەی کە ئەگەریان هەیە (ta endekhomena)) هەمان بڕواو هەمان قسە ئەتوانێت

((راست))یان((درۆ)) بێت، و لەوانەشە کە مرۆڤ هەندیٚ جار راست بڵێت و هەندیٚ جار درۆ،(١٥) بەڵام لەبارەی ئەو شتانەی کە ناتوانن بە جۆرێکی تر بن(ئەبێت بڵێین کە) ناتوانن هەندیٚ جار راست و هەندیٚ جار درۆ بن، بەڵکو ئەمانە یان هەمیشە راستن یان هەمیشە درۆن.

بەڵام لەبارەی ((شتە تێکەڵ نەبووەکان))((هەبوون))و((نەبوون))و((راست))و((درۆ)) چیە؟ چونکە شتێکی بەم شێوە تێکەڵە بوونی نیە، بە شێوەیەك کە هەرکاتێك تێکەڵ بێت((هەیە))و ئەگەر جیا بووەوە بێت((نیە))،(٢٠) وەك((تەختەی سپی)) یان((نایەکسانی تیرە لەگەڵ لایەکی چوار گۆشە)) و راست و درۆ لێرەدا، بە هەمان شێوەی حاڵەتەکەی تر، بوونی نیە، یان رێك بەو جۆرە کە لە لای ئەمانە راست هەمان نیە،((هەبوون))یش هەمان نیە، بەڵکو راست و درۆ بەم شێوەیەیە، وەرگرتن و باوەرهێنان(دەربڕین) راستن(چونکە سەلماندن نابێتە هۆی هەمان دەربڕین) بەڵام وەرنەگرتن(تێنەگەیشتن) نەزانینە،(٢٥) چونکە لەبارەی((چیەتی)) هێڵ فێڵ لێکرانێك بوونی نیە، مەگەر ((دەرکەوتانە))،و لەبارەی ((ناوەرۆکە ناتێکەڵەکانیشەوە)) هەربەم شێوەیەیە، چونکە لەم بارەیەشەوە فێڵ لێکران بوونی نیە، بەڵام هەنووکە((خودی بوونەوەر))نە دێتە بوون(٣٠) و نە لەناو ئەچێت، ئەگەر نا دەبوو لە شتێك بهاتایەتە بوون، کەواتە لەبارەی ئەو شتانەی کە((شتێکن einai ti)) و کردارەکین، فێڵخواردنێك بوونی نیە، بەڵکو تەنیا یان بیرکردنەوە(یە لەوان) یان بیرنەکردنەوە، بەڵام لەبارەی ئەوانەوە لە روانگەی((چیەتی))یەوە پشکنین ئەکرێت کە ئایا بەم شێوەیەن یان بەو شێوەیە یان نا.

بەڵام لەبارەی((هەبوون هەروەك راست)) و((نەبوون هەروەك درۆ))، ئەو دانەیە ئەگەر پێکەوە پەیوەست بێت،(واتە ئەگەر بابەت و هەڵگیراو بە دروستی پێکەوە بلکێن.و.ف) راست و دروستە، و ئەگەریش پێکەوە بەستراو نەبێت، درۆیە،

١٠٥٢a

یەکێکی تر ئەمەیە کە ئەگەر((بوونی هەبێت))((بەم شێوەیەیە))، و ئەگەر((بەم شێوەیە)) نەبێت،(بوونی نیە)، لێرەدا راست و دروستی لە بیرکردنەوە لەمانەدایە، بەڵام نە درۆ و نە فێڵخوران، لەم نێوانەدا بوونیان نیە، بەڵکو تەنیا نەزانیە، بەڵام نە ئەو نەزانەی کە هەروەك کوێرێکە، چونکە کاتێك هەروەك کوێرێکە، کە کەسێك بە تەواوی خاوەنی ووزەی بیرکردنەوە نەبێت.

هاوكات ڕوونە كە لەبارەی شتە نەجولاوەكانیشەوە-ئەگەر كەسێك قبوڵ بكات كە ((نەجوولاوەكان)) بوونیان هەیە-لە ڕوانگەی كاتەوە فێل خواردن بوونی نیە،(٥) بۆ نموونە ئەگەر وێنای ئەوە بكرێت كە سێ گۆشە لەناو ناچێت، ئیدی وێنای ئەوە ناكرێت كە هەندێ جار خاوەنی دوو گۆشەی وەستاوە و هەندێ جار نا،(چونكە لەو شێوەیەدا لەناو ئەچێت)، بەڵكو(تەنیا وێنای ئەوە ئەكرێت) كە یەكێك((چی))یەو یەكێك((چی))نیە، وەك ئەوەی كە هیچ ژمارەیەكی جووت(ژمارەی) یەكەم نیە، یان هەندێك هەن و هەك هندێك نین بەلاّم لەبارەی ئەوەی ژمارەییانە یەكێكن، تەنانەت بەم جۆرەش ناتوانین وێنای ئەوەی بكەین،(١٠) چونكە ئیدی ناتوانێت وامەزەندە بكەین یەكێك شتێكی لەم شێوەیەیەو ئەوی تر شتێكی لەم شێوەیە نیە، بەڵكو(بڕیاری ئێمە)چ ڕاست بێت وچ درۆ، واقعیەتی مەسەلەكە هەمیشە بەم شێوییەیە(كە وابوو).

## "وەرزی یەکەم"

# ( چوار ماناى بنەمایی (( یەك ))..)

ئەوەی کە((یەك)) بە جۆرگەلێکی تر ئەگووترێت، پێشتر لە جیاکاریە پەیوەستە چەندێنیەکانی شتەکانی تردا بەیان کراوە، بەلاّم هەرچەندە بە چەندین جۆر ناو ئەنرێت، ئەتوانرێت شتانێك کە بە پلەی یەکەم ((و لەخۆدا)) و نەك ((دەرکەوتانە)) وناویان ئەنرێت((یەك))،لە چوار جۆردا کورت بکەینەوە:

(١) ((پێکەوە بەستراو))، یان بە شێوەیەکی ڕەها یان بەتایبەتی ئەوەی کە سروشتانە، و نەك لە کاریگەری پەیوەندی یان پێکەوە بەستنە(٢٠) و لەمانەدا ئەو شتە زیاتر و سەرەتاتر((یەك))ە کە جووڵەکەی دابەش نەبوو سادەترە،(٢) هاوکات لەمانەدا زیاتر(یەك) ئەوەیە کە یەك((گشت)) و خاوەنی شکلّ و شێوەیەکە، بەتایبەتی ئەوەی کە سروشتانە و نەك پێویستانە بەم جۆرەیە، بۆ نموونە هەروەك ئەو شتانەی کە بە یارمەتی چەسپ یان بزمار پێکەوە بەستراون(پێکەوە لکێنراون)، بەڵکوخۆی لە خۆیدا هۆکاری پێکەوەلکانی هەیە(٢٥)،شتێك بەم جۆرەیە کە جووڵەکەی یەکێکە و لە ڕووی شوێن و کاتەوە دابەش نەخوازە، لەبەر ئەمە ڕوونە کە، ئەگەر شتێك سروشتانە خاوەنی یەکەمین بنەمای جووڵەی یەکەمین بێت، (مەبەستم وەك جووڵەی بازنەیی)یە، ئەمە هەروەك یەکەمین(گەورەیی)،((یەك))یە.

کەواتە هەندێك لە شتەکان بەم جۆرە((یەك))ین کە یان(( پێکەوە بەستراون)) یان((گشت))ن، و هەندێکیش ئەوانەن کە ماناکەیان((یەك))ە،(٣٠) بەم جۆرەن و شتانێك کە ((ئەندێشە))کەیان((یەك))ێکە، واتە ئەندێشەکەیان (یان وێناکەیان) دابەش نەخوازە،

و ئەمە کاتێك دابەش خوازە، کە شتێك شێوەییانە یان ژمارەییانە دابەش نەخوازە، بەلآم(٣٠) تاك شت ((ژمارەییانە)) دابەشخوازە،(٤) و(( شێوەییانە)) ئەوەی کە لە روانگەی ناسین و ئەقلاّندنەوە(دابەش نەخوازە) ، بەو شێوەیەی کە ئەو شتەی کە ئەبێت((یەك))ی یەکەمین بێت ك هۆکاری ((یەکی–بوون))ی ناوەرۆکەکانە، کەواتە((یەك)) بەم جۆرانە ئەگووترێت،(٣٥): ((پێکەوە لکاوی سروشتیانە، گشت، تاك شت، و گشتیەتی))،هەموو ئەمانە لەو ڕووەوە((یەکی))ن کە دابەش نەخوازن، هەندێك لە روانگەی جوولەو و هەندێك لە روانگەی ئەندێشە یان ماناوە.

١٠٥٢b

بەلاّم ئەبێت بزانین کە(ئەم پرسیارە) کە((چۆن شتانێك بە یەکی ئەزانرێن))و(ئەم پرسیارە)کە((یەکی بوون چیە)) و((ماناکەی چیە)) هەموویان نابێت بەو یەك مانا ئەژمار بکەین، چونکە یەکی بە ژمارەی هەموو ئەم ژمارانە ئەگووترێت و هەروەها هەریەکێك لەو شتانەی کە شتێك لەم جۆرانە پەیوەست ئەبێتە پێیەوە،(٥) پێی ئەوترێت((یەك))ی.

بەلاّم((یەك–بوون)) هەندێ جار بۆ یەکێك لەم شتانەیە و هەندێ جار بۆ شتێکی ترە کە لە روانگەی ناوەوە لە((یەك)) نزیکترە، لەکاتێکدا کە ئەو ئەوی ترانە تەنیا هێزەکیانە ((یەك))ن، و لەبارەی((توخم)) و((هۆکار))یشەوە هەربەم شێوەیەیە، ئەگەر پێویست بکات کە لە بارەی پێناسەی شتەکان و((ناست=سنووری)) ڕووتەوە قسە بکەین، چونکە ئاگر بە شێوەیەك و مانایەك توخمە(١٠)(و هەروەها لەوانەیە((بێسنوور لەخۆیدا))و شتێکی تری لەم جۆرە)، بەلاّم بە شێوەو مانایەکی تر( بەم شێوەیە) نیە، چونکە((ئاگر بوون)) و((توخم بوون)) هەمان نین، بەلّکو وەك((شتێك)) و((سروشتێك)) ئاگر توخمە، بەلاّم ناو بەلّگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم((دەرکەوتە))ی ئەوە، واتە ئەوەی کە شتێك هەیە لەوداو هەروەك یەکەمین بنەمای دەروونی سەری دەرهێناوە ، و لەبارەی((هۆکار)) و((یەکی)) و(١٥) هەموو ئەم جۆرانەوە هەربەم شێوەیەیە.

لەبەر ئەمە ((یەك–بوون)) هەمان((دابەشنەخواز بوون))ە، واتە یەك((ئەم شت))ی دیاری کراوی جیایە، لە روانگەی کات یان شێوە یان بیرکردنەوە، و جیا بون یان((گشت بوون))و دابەشنەخواز بوون، و بەتایبەتی یەکەمین ((پێوەری)) هەر رەگەزێك و لەسەرووی هەموو(پێوانەکان))ی چەندایەتیەوەیە، چونکە لێرەوەیە کە رێ ئەچێتە سەر گووتەکانی تریش، چونکە((پێوانە metron)) ئەوەیە(٢٠) کە چەندایەتی لەو ڕووەوە ئەناسرێت؟ ((چەندایەتی هەروەك چەندایەتی))ش یان لەو ڕووەوە یەك یان بە یارمەتی یەك ژمارەوە ئەناسرێت، بەلاّم هەر ژمارەیەك لە یەك رێگاوە–و لەبەر ئەمە هەر

چەندایەتیەك هەروەك چەندایەتیەك لە یەك رێگاوە- ئەناسرێت، و ئەوەی کە هەموو چەندێتیەکانی یەکەم لە رێگایەوە ئەناسرێن ((خودی یەك))یە، بەم هۆیەوەیە کە((یەك))ی بنەمای ژمارەی هەروەك ژمارەن، لێرەوەیە کە لە بوارەکانی تریشدا ((یەك))ی بەوە ئەگووترێت(٢٥) کە یەکەمجار هەر شتێك لە رێگای ئەوەوە ئەناسرێت، و پێوانەی هەرشتێك یەك((یەکی))ە، لە درێژاییدا، و لە پانایی و لە قووڵی و لە قورسی و لە خێرایی دا( چونکە قورسایی و خێرایی هاوبەش لە نێوان دژەکاندان، چونکە هەریەك لەوانە دومانای هەیە، بۆ نموونە((قورسی)) هەم ئەوەیە کە خاوەنی بڕێك خوازیاریە بۆ ژێرەوە و هەم ئەوەیە کە خوازیاریەکی زیاتری بۆ ژێرەوە هەیە، و((خێرا)) یش هەم ئەوەیە کە خاوەنی بڕێك جووڵەیە و هەم ئەوەیە کە(٣٠) جوڵەیەکی زیاتری هەیە، چونکە((هێواش))یش خاوەنی خێراییەکە و((سوکتر))یش خاوەنی شتێك لە قورسیە).

لە هەموو ئەمانەدا پێوانەو بنەما شتێکی ((یەك))ی دابەشنەبوون، چونکە تەنانەت لە هێڵەکانیشدا، هێلێك کە یەك پێ درێژە، بە دابەش نەخواز ئەزانین، چونکە هەمو شوێنێك وەك پێوانەی شتێکی تاك و دابەش نەبوو ئەپشکنن، ئەمەش شتێکی سادەیە(٣٥) چ لە روانگەی چۆنایەتی وچ لەروانگەی چەندایەتیەوە، هەنوکە لە هەر شوێنێکدا کە کەمکردنەوەو زیادکردن مەحاڵە، لەو شوێنەدا پێوانە کردن وردە، بەم هۆیەوەیە پێوانە وردترین ژمارەیە،

١٠٥٢a

چونکە ئێمە هەموو((یەك))یەکان بە دابەشنەبوو ئەژمار ئەکەین، لە هەموو بوارەکانی تریشدا لاسایی ئەم شێوازە ئەکرێتەوە، چونکە لە بارەی یەك((ئیستادیۆن))((پێوانەی یەکسان بە ١٨٥ م)) و یەك((تالان))((کە دەورووبەری ٢٦ کیلوگرامە)) و پێوانەگەلێکی بەو شێوە گەورەترە، زیادبوون یان کەم بوون، لەبەرچاو وونترە تا لە بارەی شتە وردەکانی ترەوە،(٥) لەبەر ئەمە هەموو یەکەمێتی ئەو شتەی کە بە پێی پەی بردنی هەستەکی ئێمە بەم شێوەیە(زیادکردن یان کەم بوونەوە) تیایدا مەحاڵە، وکراوە بە پێوانەی تەڕ و ووشك و قورس و گەورە، و وێنای ئەوە ئەکەن کاتێك چەندایەتی ئەناسن کە ئەو لە رێگای ئەم پێوانەوە بناسن، و جووڵەش هەر لە رێگای جووڵەی هێواش و خێراوە ئەناسن،چونکە ئەمە کەمترین کاتی ئەوێت(و بەکەمترین کات ئەنجام ئەدرێت.و.ك).(١٠) بەم هۆیەوە لە ئەستێرەناسیدا، یەکەیەکی لەم شێوەیە بنەماو پێوەرە، چونکە وا وێنا ئەکرێت کە جووڵەی ئاسمان بە یەك ئەندازیەو خێراترینە،و بە نیسبەت ئەوەوە (لە بارەی جووڵەکانی ترەوە) داوەری ئەکەن، هەربەم شێویەشە لە

مۆسیقادا،یەك لەسەر چواری دانگ (دیَسیس)، لەبەر ئەوەی کە بچووکترین ماوەیە، وە هەروەها لە زمانی پیتەکانیشدا، هەموو ئەمانە بەم مانایە((یەکن))، بەلاّم نەك بەو شیّوەیەی کە یەکەی شتیَکی هاوبەش لە نیّوانیاندایە، بەلّکو بەو جۆرە کە گووترا، بەلاّم پیّوانە(١٥) هەمیشە ژمارەیانە ((یەك))نیە، بەلّکو هەندیّ جار زیاترە، وەك ئەوەی کە یەك لەچواری دانگ دودانەیە، لەگەلّ ئەوەشدا نەك بە پیّی بیستن، بەلّکو لە نیسبەتە ژمارەییەکاندا جیا ئەبیَتەوە، و ئەو ئاوازانەی کە ئیَمە بەیارمەتی ئەوانەوە پیّوانەیان ئەکەین بە چەندین جۆرن، هەربەم شیّوەیە تیرە(ی چوارگۆشە)و لاکان بە دوو پیّوەر، ئەپیّورریّن، و هەروەها هەموو گەورەییەکانی لەم جۆرە، بەم شیّوەیە،((یەك))ی، پیّوانەی هەموو شتەکانە، چونکە ئیّمە ناوەرۆك ئەناسین کە لە چیەوە سەری دەرهیّناوە، لەکاتیَك کە ئەو یان بە پیّی چەندایەتی یان بە پیّی شیّوە، دابەش ئەکەین،(٢٠)، بەم هۆیە((یەك))ی دابەشنەخوازە، چونکە یەکەمیّتی هەریەك لە شتەکان دابەشنەخوازە، بەلاّم هەر یەکیەك بە یەکسانی دابەش نەخواز نیە، وەك دریَژی پیّ و یەکەی بیرکاری، بەلّکو هەندیَك بە هیچ شیّوەیەك دابەش نەخوازن، و هەندیَك ئەبیَت لە نیّوان شتانیَکدا جیَگیر بکریَن کە تەنیا بە پیّی پەی بردنی هەستەکی ئیّمە دابەش نەخوازن، بەو شیّوەیەی کە پیَشتر گووترا، چونکە تارادەیەك هەر پەیوەندیَك، دابەشخوازە.

پیّوانە هەمیشە هاورەگەزی(٢٥) شتیَکی پیّوراوە، پیّوانەی گەورەییەکان یەکیَك گەورەیی و بۆ هەریەك لە دریَژییەکان یەکیَك دریَژاییەو، بۆ پانتاییەکان یەکیَك پانتایی، بۆ ئاواز یەك ئاواز، بۆ قورسی یەك قورسی، و بۆ یەکیەکان یەك یەکی. چونکە مەبەستەکە ئەبیّت بەم جۆرە پەی پیّ ببەین، و نەك ئەوەی کە(بەم جۆرە ویّنا بکەین) پیّوانەی ژمارەکان یەك ژمارەیە، بە بوونی ئەم مەبەستە بەم شیّوەیە دەبوو، ئەگەر بمانویستایە مەبەست بەیەك شیّوە دەربرین، بەلاّم نابیّت مەبەستەکە بەیەك شیّوە دەربرین، بەلّکو بەو جۆرە ئەبیّت دەری ببرین کە بۆ((یەك))ەکانیش، پیّوانە و پیّور،((یەك))بیّت، (٣٠) و نەك یەك((یەك))ی، بەلاّم ژمارەی فرەییەتی((یەك))یەکانە.

هاوکات بەم هۆیەوە ئەلّیَن کە ناسین و پەی بردنی هەستەکی پیّوانەی شتەکانن، چونکە بە یارمەتی ئەوانەوەیە کە ئیّمە شتەکان ئەناسین، ئەگەرچی ئەوان زیاتر ئەپیّورریّن تاخۆیان شتەکان بپیّون، بەلاّم لەلای ئیّمە بەو شیّوەیە ڕوو ئەدات کە وەك بلّیی کەسیَکی تر ئیّمەی پیّواوە، و ئیّمە( بەهۆی پیّوانەکەی ئەوەوە) زانیومانە(٥) کە چ ئەندازەیەکین، لەکاتیَکدا کە ئەو چەندین جار پیّوانەکەی خۆی خستۆتە سەر ئیّمە، بەلاّم((پرۆتاگۆراس)) ئەلّیَت: (( مرۆڤ پیّوەری هەموو شتەکانە)) بەو شیّوەیەی کە

مەبەستی لە مرۆڤی((زانا))یان مرۆڤی((هەست کەر))ە، چونکە لەمانە یەکێکیان ناسین و لەوی تریان هەستکردن هەیە، کە ئێمە ئەڵێین پێوەری بابەتەکانن، ئەم قسەیە وەک بڵێی هیچ شتێك نیە، هەرچەندە با وا دابنێین کە شتێکی نایاب ئەڵێت.

١٠٥٣b

کەوات ڕوونە کە ((یەك–بوون)) بە وردترین مانا، ئەگەر پێناسەکەی بە پێی مانای ئەم ناوە بگرین، یەك پێوانەیە کە سەرتر لە هەمووان بۆ چەندایەتی و پاشان بۆ چۆنایەتی بەکار دێت، هەندێك لە شتەکان لەم جۆرەن (واتە (یەك)ین..) ئەگەر بە پێی چەندایەتی دابەشنەخواز بن،و هەندێکی تر(یش لەم جۆرەن) ئەگەر بە پێی چۆنایەتی (بەم شێویە بن)، لەبەر ئەمە((یەك))ی دابەشنەخوازە، یان بە شێوەیەکی ڕەها یان هەروەك((یەك))ی.

## "وەرزی دووەم"

# ( "یەك"ی ناوەڕۆك نیە )

بەڵام لە ڕوانگەی ناوەڕۆك و سروشتی (یەك)ەوە ئەبێت پشكنین بكەین كە بەكام یەك لەم دووجۆرە بوونی هەیە(١٠)، ڕێك بەو شێوەیەی كە لە مەسەلە سەرگەردان كەرەكاندا پەرژابومانە سەری كە: (یەك)ی چیە و چۆن ئەبێت بەدەستی بهێنین؟ ئایا بەو شێوەیەی كە یەكەمجار((پیتاگۆریەكان))و پاشان((ئەفلاتوون)) ووتوویانە، خودی ((یەك))ی هەروەك ناوەڕۆكێكی((ببوو))ە، یان ئەوەی كە زیاتر سروشتێكی بابەتیانەیە؟ و چۆن ئەبێت بە شێوەیەكی ناسێنەرتر قسەی لەسەر بكەین، زیاتر هەروەك سروشتناسەكان (١٥) چونكە هەندێك لەمانە گووتوویانە كە((یەك))ی ئیشقە، و هەندێكی تر ووتوویانە كە ((هەوا))یە، و هەندێكی تریش بە((بێسنور))یان زانیوە.

بەڵام بەو شێوەیە كە لە گووتارەكانی((ناوەڕۆك و بونەوەر))دا گووترا، ئەگەر هیچ شتێك لە((گشتایەتی))ەكان ناتوانن ((ناوەڕۆك))بن، و ئەگەر خودی بوونەوەریش ناتوانێت بە مانای یەك((یەك))ی و لە پاڵ((زۆرینەكان))دا بێت، (چونكە هاوبەشی نێوان ئەمانەیە)، بەڵكو تەنیا هەروەك یەك گووتراو یان هەڵگیراوێكە، كەواتە ڕوونە كە ((یەك))یش ناوەڕۆك نیە،(٢٠) چونكە((بوونەوەر و یەك، گشتی ترین هەڵگیراوەكانی هەموو شتەكانن)) لەبەر ئەمە نە ڕەگەزە سروشتیەكان و ناوەڕۆك گەلێك، جیا لە شتەكانی ترن، و نە((یەك)) ئەگەری ئەوەی هەیە كە یەك((ڕەگەز))بێت، ((بەو هۆیەوە كە لەسەر بنەمای ئەوانە نە بوونەوەر(هەبو) و نە ناوەڕۆك، ڕەگەز نین.

هەربەم شێوەیە(یەك) ئەبێت لە هەموو حاڵەتەکاندا یەکسان بێت، بەلاّم ((یەك))ی، بە ژمارەی هەمان ئەو جۆرانە ئەگووترێت کە بوونەوەر(٢٥) بەو شێوەیەی کە لە چۆنایەتیەکاندا، ((یەك))ی شتێکی دیاری کراو سروشتێکی دیاری کراوە، و بەم هۆیەشەوەیە کە لە چەندایەتیەکاندا، ڕوونە کە بە شێوەیەکی گشتی ئەبێت بپشکنین کە: "یەك"ی چیە؟، ڕێك بەو جۆرە کە (ئەبێت بە دوای ئەوەشدا بگەڕێین کە) بوونەوەر چیە، چونکە ئەوە بەس نیە کە بڵێین خودی ئەم سروشتە ئەوەیە، بەلاّم لە ڕەنگەکاندا ((یەك))ی یەك ڕەنگە،(٠) وەك سپی، ئەگەر وا بێتە بەرچاو کە هەموو رەنگەکانی تر لە سپی و ڕەشەوە پێك هاتوون، و ڕەنگی ڕەش نەبوونی سپێتیە، بەو شێوەیەی کە لە تاریکیدا، ((نەبونی ڕووناکی))هەیە، لەبەر ئەمە ئەگەر بوونەوەرەکان ڕەنگەکان بوونایە، لەوکاتەدا بوونەوەرەکان یەك ژمارە دەبوون، بەلاّم لە چی؟ ڕوونە کە لە ڕەنگەکانەوە، ئەوکات یەك، یەکیەکی دیاری کراو دەبوو، بۆ نموونە سپی، بەم شێوەیە ئەگەریش بوونەوەرەکان ئاهەنگەکان بوونایە،(٣٥)ئەوکات ژمارە دەبوون، ژمارەیەك لە یەك لەسەر چواری دانگەکان، بەلاّم ناوەرۆکەکەیان یەك ژمارە نەدەبوو، و (( یەك))ی شتێك دەبوو کە ناوەرۆکەکەی نەك((یەك))ی بەڵکو یەك لەسەر چواری دانگەکان دەبوو، وهەربەم شێوەیەش لەبارەی ئاوازەکانیشەوە بوونەوەرە ژمارەییەکان لە پیتەکان دەبوون، و ((یەك))ی پیتێکی دەنگدار دەبوو،

١٠٥٤a

و ئەگەر بوونەوەرەکانە((شکڵ گەلێك)) بونایە لە هێڵی ڕاست، ئەوکات ژمارەیەك لە شکڵەکان دەبوون، و ((یەك)ی یەك سێگۆشە دەبوو، هەر ئەم بەڵگەیەش بۆ ڕەگەزەکانی تریش ڕاستە،(٥) لەبەر ئەمە لەبەر ئەوەی لە کرداراندنەکان و لە چۆنایەتیەکان و چەندایەتیەکان و لە جووڵەکاندا، ژمارەگەلێك بونیان هەیە، و لە هەموویاندا ((یەك)) یەکی هەیە، و ژمارە پەیوەستە بە شتانێکی دیاری کراو ((یەك))ی،((یەك))یەکی دیاری کراوە، بەلاّم ناوەرۆکەکەی ئەو، خودی ((یەك))ی نیە، کەواتە بارودۆخیش لەبارەی ناوەرۆکەکانیش بە ناچاری ئەبێت بەم جۆرە بێت، چونکە بارودۆخ لە هەموو بوارەکاندا بەم شێوەیەیە.

کەواتە ڕوونە کە ((یەك))ی لە هەموو ڕەگەزەکاندا(١٠) سروشتێکی دیاری کراوە، و لە هیچ بوارێکدا سروشتەکەی ئەو خودی ((یەك))ی نیە، بەلاّم بەو جۆرە کە لە بارەی ڕەنگەکان((خودی یەك))ی کە ئەبێت بە دوایدا بگەڕێین((یەك ڕەنگ))ە، بە هەمان شێوەش لە بارەی ناوەرۆکەکانیشەوە((خودی یەك))ی یەك ناوەرۆکە، بەلاّم ئەوەی

كه((یەك))ی، بە جۆرێك لە جۆرەكان بە هەمان مانای(( بوونەوەر=ببوو)) دێت، لێرەوە ڕون ئەبێتەوە كە ماناكەی بەدوای هەریەك لە جۆری گووتارەكانەوە دێت، بەڵام لە هیچ یەك لەوانەدا نەگوونجێنراوە،(١٥)( بۆ نموونە نە لە((چییەتی)) و نە لە چۆنێتی)، بەڵكو لە بارودۆخی ئەو بەهەمان شێوەی بارودۆخی((بونەوەرە)) لە پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا.

و هەروەها لێرەوەیە كە لە((یەك مرۆڤ))دا هیچ هەڵگیراوێكی تر زیاد ناكرێت كە لە((مرۆڤ))دا {ڕێك بەو شێوەیەی كە((بوونایەتی))ی جیا و لەپاڵ((شتێك)) یان چەندایەتی، یان چۆنایەتیەوە نیە}و سەرەنجام لەو ڕووەوە كە((یەك-بوون)) واتە(( تاك شتی-یان شتێكی تاك بوون=شیء منفرد))ە.

### "وەرزی سێهەم"

## ( یەکی و زۆری – یەك و زۆر )

یەك و زۆر (to hen-ta polla) بە چەندین جۆر لە ((بەرامبەرکێیانە antikeirai))کانن، یان(لە دژەکانن) یەکێك لەوانەی کە ئەوان یەك و زۆر وەك دابەشنەخواز و دابەشخوازە، چونکە دابەش بوو یان دابەش خواز، بە جۆرێك لە جۆرەکان بە ((زۆر)) ناوئەبرێت، و دابەش نەخواز یان دابەش نەبوو، بە ((یەك))، هەنووکە لەبەر ئەوەی ((بەرامبەرکێیەکان antitheseis)) چوارجۆرن، و هەریەك لەو دووانە لەروانگەی(نەبوون)ەوە ئەگووترێن، کەواتە ئەبێت دژ بن، ونە وەك ناهاوتا و نە وەك ((سەرخراو-زیادکراو) ناویان ئەبرێت، بەلأم ((یەك)) لە روانگەی دژایەتی ئەوەوە ئەگووترێت و ڕوون ئەبێتەوە،-دابەشنەخواز لە روانگەی دابەشخواز- چونکە((زۆر))و دابەش خواز، زۆر هەستپێکراوترن لە((دابەش نەبوو))، بەو شێوەیە کە بە پێی ئەمە لە روانگەی پەی بردنی هەستەکی، ((زۆر)) لە ڕووی ماناوە لەپێش دابەشنەخوازەوەیە.

بەلأم لەگەڵ ((یەك))دا( وەك لە خشتەی دژەکاندا خستمانە ڕوو) ((هەمانن ))و((وەك یەکن)) و((یەکسان))ن، و لەگەڵ ((زۆر))ێکی تردا((ناوەك یەك و نایەکسان))ن.

١٠٥٤b

((هەمان to auto)) بە جۆرگەلێکی زۆر ئەگوترێت، بەیەك شێوە هەندێ جار ئێمە ((هەمان)) لەروانگەی ژمارەوە ناو ئەنێین، پاشان ئەگەر شتەکان بە پێی مانا و

ژماره، هەردووکیان یەکێك بن، بۆ نموونە تۆ هەم لە ڕوانگەی شێوەو هەم لە ڕوانگەی مادەوە((یەك))ێکی.

هەربەم شێوەیە ئەگەر مانای ناوەرۆکی یەکەمین شتەکان یەکێك بێت، وەك ئەوەی کە هێڵە ڕاستەکان، یەکسان و هەروەها چوارلاکانی خاوەن گۆشەی یەکسان، هەمانن، هەرچەند لەمانە زۆر بێت، بەڵام لەمانەدا یەکسانی بە مانای((یەك))بوونە.

((وەك یەك homoia))شتانێك ناو ئەنێین کە هەرچەند نە بە شێوەیەکی ڕەها وەکیەکن، و نە بە پێی ناوەرۆکە ناتێکەڵەکەیانەوە ناجیاوازن،(٥) بەڵام لەڕوانگەی شێوەوە وەك یەکن، وەك ئەوەی کە چوارگۆشەی گەورە وەك چوارگۆشەی بچووکترە و هێڵە ڕاستە نایەکسانەکان، ناوەکیەکن، چونکە ئەمانە وەك یەکن، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەها هەمان نین، و هەروەها شتانێك کە خاوەنی هەمان شێوەن، و لەواندا ئەکرێت زۆرتری یان کەمتری بەدی بێت، بەڵام نە زۆرترن و نە کەمتر، هەر بەم شێوەیە شتانێك کە (١٠) کرداراندنەکەیان لە ڕوانگەی شێوەوە هەمان و ((یەك))ێکە، وەك سپی لە ئاستی دەرکەوتن و هەروەها کەمتر، ئەڵێین ئەمانە ((وەك یەکن))، چونکە شێوەیەکەیان ((یەك))ێکە، هەربەم شێوەیە شتانێك کە لەواندا ((هەمان بوون)) زیاترە لە((ئەوی ترییەکان)) یان بە شێوەیەکی ڕەها یان لەڕوانگەی سیفەتە بەرجەستەکانەوە، وەك قورقوشم کە هەروەك فافۆن سپییە، یان زێڕ کە هەروەك ئاگر وایە، لەو ڕوانگەیەوە کە زەرد و ئاگررەنگاو ڕەنگن.

بەم شێوەیە ڕوونە کە((ئەوی تر ti heteron)) و((ناوەکیەك to anomoin))بە جۆرگەلێکی زۆر(١٥) ئەوترێنەوە، بە جۆرێك((ئەوی تر to allo)) لەبەرامبەر ((هەمان)) دائەنرێت، و بەم هۆیەوە هەرشتێك لە پەیوەند بوون لەگەڵ هەر شتێکدا یان((هەمان))ە یان((ئەوی تر))ە، بە جۆرێکی تر، کاتێك شتەکان ناویان ئەنرێت((ئەوی تر)) کە مادە و ماناکەیان یەکێك نەبێت، بەم هۆیەوە تۆ دراوسێکەت نیت و((یەکێکی تری))، جۆری سێهەم وەك ئەو شتانەیە کە لە بیرکاریدا بەدەست دێن، کەواتە بەم هۆیەوە هەر شتێك لە پەیوەندی لەگەڵ هەر شتێك یان ((ئەوی تر))ێك یان((هەمان))ێك ناوئەنرێت، واتە ئەو شتانەی کە پێیان ئەوترێت یەکێك یان هەبوو ((بوونەوەر))،لەبەر ئەوەی((ئەوی تر)) ناهاوتای((هەمان)) نیە، (٢٠)بەم هۆیەوە لە بارەی ((نابوونەوەرەکانەوە)) ناگووترێت ، بەڵام لە بارەی هەموو بوونەوەرەکانەوە ئەگووترێت، چونکە((بوونەوەر)و((یەك))ی بە سروشتی یەك یان((نا-یەك))ێکە (لەگەڵ شتێکی تردا).

کەواتە((ئەوی تر)) و((هەمان)) بەم شێوەیە لە ریزی گوتارەکانن (یان هاوبەرامبەری بابەتەکانن)، بەڵام جیاوازی و ئەوی ترێتی((ئەوی تر بوون)) شتانێکی ترن، چونکە((ئەوی تر))و ئەوەی کە بەدەرە لەو پێویست ناکات لە روانگەیەکی دیاری کراوەوە ئەوی تر بن، چونکە(٢٥) هەربوونەوەرێك یان ئەوی ترێك یان هەمان، بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ شتێکدا جیاوازە، لەروانگەیەکی دیاری کراوەوە جیاوازە، بەو شێوەیەی کە یەك((هەمان)) ئەبێت بوونی هەبێت تا شتەکان بەو هۆیەوە جیاواز بن، بەڵام ئەمە((هەمان))ە یان رەگەزە یان جۆر، چونکە هەر جیاوازییەك یان بە پێی جۆر یان بە پێی رەگەز جیاواز ئەبێت، کاتێك بە پێی رەگەز جیاواز ئەبێت کە خاوەنی مادەیەکی هاوبەش نیە، و دروست بوونی ئەوان لە یەکترییەوە نیە، وەك هەموو ئەو شتانەی کە بە شکڵی گووتە جیاوازەکانەوە پەیوەستن،(٣٠) بەڵام بە پێی جۆر شتانێك جیاواز ئەبن کە رەگەزەکەیان هەمانە،(رەگەز لێرەدا واتە هەمان ئەو شتەی کە لە بارەی ((جیاوازەکانەوە)) بە پێی ناوەرۆك لێیانەوە ئەگووترێت).

بەڵام ((دژەکان)) جیاوازن، و((دژایەتی))یش جۆرێکە لە جیاوازی، بەڵام ئەوەی کە ئەم خاڵە بە دروستی گریمانەی بۆ کراوە، لە رێگای ئیستقراوە ڕوون ئەبێتەوە، چونکە هەموو ئەمانە(ئەم دژانە) ئاشکرا دیارە کە جیاوازن، چونکە نە تەنیا(٣٥)((ئەوی تری))ن،

١٠٥٥a

بەڵکو هەندێك بە پێی رەگەز ئەوی ترن و هەندێك لەهەمان ریزی گووتارەکانن، و بەم شێوەیە لەهەمان رەگەزن و بە پێی رەگەز هەمانن، لە شوێنێکی تردا جیاکراوەتەوە کە چۆن شتانێك هەن کە بە پێی رەگەز هەمانن یان جیاوازن.

## "وەرزی چوارەم"

# ( دژایـــــەتی )

بەلاّم لەوێوە کە شتە جیاوازەکان ئەگەری ئەوەی هەیە لەگەڵ یەکتردا کەمتر یان زیاتر جیاواز بن، کەواتە یەك گەورەترین جیاوازی بوونی هەیە و من ناوی ئەنێم((دژایەتی))، بەلاّم ئەوەی کە ئەم گەورەترین جیاوازییە کە لە رێگای ئیستقراوە ڕوون ئەبێتەوە، چونکە شتانێك کە بە پێی رەگەز جیاوازن رێگایەکیان بۆ یەکتری نیە، بەڵکو زۆر لێك دوورن و پێك ناگەن، بەلاّم شتانێك کە بە پێی جۆر جیاوازن، دروست بونەکانیان لە دژەکان و بە پێی دوورترین ماوەیە، دوورترین ماوەکان درێژترین دوورییان هەیە، کەواتە(دوری=ماوەی)دژەکانیش هەربەم شێوەیەیە، بەلاّم گەورەترین لە هەریەك لە رەگەزەکاندا((ڕووت و گشت))ە، چونکە((گەورەترین)) ئەوەیە کە هیچ شتێك لەسەرویەوە نیە، و ((کامڵ)) ئەوەیە کە لە دەرەوەی ئەوەوە هیچ شتێك دەست ناکەوێت، چونکە جیاوازی خاوەنی سنورێکی کۆتاییە، بەو شێوەیە کە هەموو ئەو شتانەی کە خاوەنی سنوری کۆتاین پێیان ناوترێت ((کامڵ=تێرو تەسەل))، بەلاّم لە دەرەوەی سنوری کۆتایی هیچ شتێك بوونی نیە، چونکە ئەم لەهەموو شتێکدا پاشکۆی شتەو هەمووی لە خۆئەگرێت، بەم هۆیەوە لە دەرەوەی سنوری کۆتایی هیچ شتێك بوونی نیە، و((کامڵ=تێروتەسەل))یش بە هیچ خستنە سەر و(زیادکردنێك) پێویستی نیە، کەواتە لێرەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ((دژایەتی)) جیاوازیەکی((کامڵە=تێروتەسەلە)) بەلاّم لەبەر ئەوەی دژەکان بە جۆر گەلێکی زۆر ناو ئەنرێن، شێوازی کامڵ بوونیش هەماهەنگە لەگەڵ هەر شێوەیەك لە دژ بوون کە پەیوەستە بە دژەکانەوە، ئەگەر بەم شێوەیە بێت،

ڕوونە کە(٢٠) بۆ ((یەك شت)) ئەگەری ئەوەی نیە کە دژ گەلێکی زۆر بوونیان هەبێت، (چونکە هیچ شتێك ((لە پاشتر)) لە پاشکۆ نیە، و هەروەها یەك((دووری=ماوە)) زیاتر نیە لە دوو کۆتایی)) و بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیەیە، ئەگەر دژایەتی ((جیاوازییەکە))، و جیاوازی، و لەبەر ئەوەی جیاوازی کامڵ، لە نێوان دوو شتدایە، بێگومان پێناسەگەلێکی تریش بۆ((دژەکان))،هەر ڕاستە، چونکە ١_ جیاوازی کامڵ زۆرترین جیاوازییە،(٢٥)(چونکە لە دەرەوەی ئەوەوە هیچ شتێك بەدەست نایەت، چ شتەکان بە پێی ڕەگەز جیاواز بن و چ بە پێی جۆر، چونکە پیشان درا کە لە پەیوەستی لەگەڵ شتانێك کە لە دەرەوەی ڕەگەزن، جیاوازییەکی بوونی نیە، خودی ئەمە گەورەترین جیاوازییە، و لەو شتانەی کە لە هەمان ڕەگەزن، زۆرترینی جیاوازەکان دژن، (چونکە گەورەترین جیاوازی ئەمانە، جیاوازی کامڵە (تیۆروتەسەل)ە..)(٣٠) ٢_ و شتانێکیش کە لە هەمان مادەی قبوڵکراو زۆرترین جیاوازییان هەیە، دژن(چونکە مادە بۆ دژەکان، هەمانە)و٣_ هەروەها شتانێك کە لە ژێر هەمان تواناداریێتی دا جێگیرن، جیاوازترینیان، دژەکانن، چونکە ناسینێك(یان زانستێك) کە ئەیپەرژێتە سەر ((یەك)) ڕەگەز،((یەك))ێکە، و لەواندا جیاوازیە کامڵ و تیۆروتەسەلەکە ، گەورەترین جیاوازیە.

یەکەمین دژایەتی((خاوەنداریێتی)) ((نەبوون))ە، بەڵام نەك هەموو((نەبوون))ێك (چونکە نەبوون بە جۆرگەلێکی زۆر ناوئەبرێت) بەڵکو ئەو((نەبوون))ەی کە کامڵە،(٣٥) هەموو دژەکان بە پێی ئەم((یەکەمین دژایەتیە)) وەسف ئەکرێن، هەندێك لەو ڕووەوە کە خاوەنی ئەم (دژایەتی)ەن، هەندێك لەو ڕووەوە کە ئەمانە دروست ئەکەن یان ئەتوانن دروست بکەن، و هەندێکیش لەو ڕووەوە کە((بگر)) و لەدەستدانی ئەمانە یان دژەکانی ترن، هەنووکە ئەگەر ((ناهاوتایی)) و ((نەبوون)) و ((دژایەتی)) و ((خستنە سەر)) و جۆرەکانی ((بەرامبەرکێ بوون))، ئەژمار ئەکرێن و یەکەمینی ئەوانە ناهاوتایە، و هیچ شتێکی نێوەندیش لە ناهاوتایی دا بوونی نیە،

١٠٥٥b

بەڵام لە نێوان دژەکاندا ئەگەری هەیە، کەواتە ڕوونە کە ((ناهاوتایی و دژایەتی)) هەمان نین، ((نەبوون))یش جۆرێکە لە لە ناهاوتایی، چونکە یان ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی بێتوانایە لە بوونی شتێك،(٥) یان ئەوەی کە سروشتانە ئەتوانێت هەیبێت بەڵام، نیەتی، لە ڕاستیدا شتێکی((نیە))، یان بە شێوەیەکی گشتی یان بەجۆرێکی دیاری کراو، چونکە((نەبوون)) پێشتر بە جۆرگەلێکی زۆر ناونراوە، بەو شێوەیەی کە لە شوێنێکی تردا جیامان کردەوە، لەبەر ئەمە ((نەبوون))جۆرێکە لە((ناهاوتایی))،

یان((بێتوانایی)) که بەر یارمەتی مادەی قبوڵکراو دیاری کراوە یان لەگەڵ ئەویشدا کۆ بووەتەوە، بەم هۆیەوە بۆ ناهاوتایی((نێوانێك)) بوونی نیە، بەڵام بۆ((نەبوون)) جۆرێك لەو بوونی هەیە، چونکە هەر شتێك(١٠) یان بەرامبەرە ((یەکسانە))، یان نابەرامبەرە ((نایەکسان))، بە بوون ئەمەش هەر شتێك یان یەکسانە یان نایەکسانە، ئەگەریش هەبێت، تەنیا لەبارەی مادەیەکەوەیە کە خوازیاری (قبوڵکەری) بەرامبەرێتیە، کەواتە ئەگەر دروستبوونەکانی مادە لە دژەکانەوە دەست پێ ئەکەن، و یان ئەگەر لە شێوەو خاوەنداریێتی شێوەوە، یان لە جۆرێك لە نەبوونی شێوە یان (شکڵ)، دروست ئەبن، کەواتە ڕوونە کە هەر دژایەتیەك ((نەبوون))ە، بەڵام هەر((نەبوون))ێك، دژایەتیەك نیە(١٥) هۆکاری ئەوە ئەمەیە کە((لەناوچوو=نەبوو)) لەوانەیە بە جۆرگەلێکی زۆر((نەبێت-لەناوبچێت)) چونکە پاشکەوتی ئەو سنورانەی کە لەناوچونەکان لێیانەوە دەست پێ ئەکەن، هەمان دژەکانن.

بەڵام ئەمەش لە ڕێگای ئیستقراوە ئاشکرا ئەبێت، چونکە هەر دژایەتیەك خاوەنی لەناوچونی یەکێك لە دولا دژایەکەیە، بەڵام لە هەموو بوارەکاندا یەکسان نیە، نابەرامبەری ((نەبوونی بەرامبەرییە))، ناوەکیەکی نەبوونی وەك یەکیە، خراپی نەبوونی باشیە، بەڵام لێرەدا، بەو شێوەیەی کە گوترا، جیاوازییەك دێتە بوون، واتە یەکجار ئەگەر شتێك بە تەواوەتی لەناوبچێت، هاوکات ئەگەر لە کاتێکی دیاری کراودا یان لە شتێکی دیاری کراودا (لەناوبچێت) (بۆ نموونە ئەگەر لە تەمەنێکی دیاری کراو لە ژیان لە قۆناغێکی گرنگدا) یان بە تەواوی لەناو بچێت، بەم هۆیەوە لە هەندێك بواردا یەك((نێوانی)) بوونی هەیە، (بۆ نموونە مرۆڤێك هەیە کە نە باشە وە نە خراپە)، بەڵام لە هەندێکی تردا(هیچ نێوانێك) بوونی نیە، بەڵکو بۆ نموونە ژمارە یان جووتە یان تاکە،(٢٥) هاوکات هەندێك بابەتێکی دیاری کراویان هەیەو هەندێك نیانە، لەبەر ئەمە دەر ئەکەوێت کە هەمیشە یەکێك لە دوو لاکەی دژەکان بە پێی یەك((نەبوون-لەناچوون)) ناویان ئەبرێت، بەڵام بەسە ئەگەر ئەمە لە بارەی یەکەمین دژەکانەوە، واتە ڕەگەزەکانەوە ڕاست بێت، بۆنموونە لە بارەی یەك و زۆر، چونکە ئەتوانرێت ئەوانی تر بۆ ئەمان، بگەڕێندرێنەوە.

"وەرزی پێنجەم"

# ( وەکیەك، گەورە و بچووك )

(٣٠) بەڵام لەوێوە کە یەك شت یەك دژی هەیە، ئەتوانرێت دووچاری ئەم سەرگەردانیە ببیت کە بە چ جۆرێك یەك و زۆر، یەکسان و گەورە و بچووك بەرامبەرکێن؟ چونکە ئەگەر ئێمە واژەی((ئایا)) کە هەمیشە لە بارەی ((بابەتەکانەوە)) بەکار ئەهێنین، وەك((ئایا)) سپییە یان رەش؟ و((ئایا)) سپییە یان سپی نیە؟ بەڵام ناڵێین ((ئایا مرۆڤە یان سپی؟)) مەگەر کاتێك کە لە دەرکەوتێکی دیاری کراو بە دواداگەردا دەست پێ بکەین(٣٥) و بۆ نموونە بپرسین (( ئایا باس لە کلێئون یان سوقرات کراوە؟)) بەڵام ئەمە لە هیچ رەگەزێکدا پێویست نیە، بەڵکو ئەمیش لەو حاڵەتەی((بەرامبەرکێ))دا هاتووە، چونکە ئەمە تەنیا بەرامبەرکێ گەلێکن کە ئەگەری نیە هاوکات بوونیان هەبێت، ولێرەشدا بەم جۆرە بەکار دێت کە: کام لەو دووانە باس کراوە(هاتووە)؟

١٠٥٦a

چونکە ئەگەر هەردوك هاوکات بوونیان هەبوایە، پرسیارەکە پێکەنیناوی دەبوو، بەڵام تەنانەت بەم شێوەیەش پرسیار لە بابەتەکانیشدا جێگیر ئەبێت، واتە لە (بەرامبەر)یەك و زۆر، بۆ نموونە ((ئایا هەردووکیان هاتوون یان یەکێك لەو دووانە)) کەواتە ئەگەر گەران بە دوای ((ئایا))، هەمیشە لەبارەی بەرامبەرکێکانەوەیە، بەڵام بە بوونی ئەمەش ئەگووترێت کە:(( ئایا گەورەترە یان بچووکتر؟))،(٥) کەواتە چ بەرامبەرکێ یەك لە نێوان ئەو دوانەو ((بەرامبەر))دا بوونی هەیە؟)) چونکە ئەم(بەرامبەر)ە نەك دژ بەڵکو یەکێکە لەوانە، نەك هەردووکیان، بۆچی ئەبێت زیاتر دژی

((گەورەتر)) بێت تا((بچووکتر))؟ و هەروەها((بەرامبەر)) دژی((نابەرامبەرە))، لەبەر ئەمە ئەبێت دژی شتانێکی زۆرتر بێت لە یەکێك، بەلاَم ئەگەر((بەرامبەر)) هاوکات بەڵگەیە لە سەر هەردووکیان، (واتە گەورەتر و بچووکتر)، (١٠)بەم هەمووەوە ئەبێت بەرامبەرکێی هەردووکیان بێت، ئەم گومانە یان ئەم پرسیارە گرانە پشتیوانی کەسانێکە کە ئەڵێن: ((بەرامبەر)) یەك((دوانێتی))یە، بەلاَم ئەنجام ئەمە ئەبێت کە یەك دژی دووە، شتێك کە مەحاڵە.

هاوکات ئاشکرایە کە((بەرامبەر)) نێوانی metaxu((گەورە))و ((بچووك))ە، بەلاَم بە هیچ شێوەیەك ئاشکرا نیە کە دژایەتی یەك((نێوانی))یە، یان بە پێی پێناسە ئەتوانێت بەم شێوەیە بێت،چونکە ئەگەر((نێوانی)) شتێك بووایە، کامڵ(تێروتەسەل)نەدەبوو، بەڵکو زیاتر(١٥)(دژ) هەمیشە شتێکی نێوانی نیە لە خۆیدا.

کەواتە ئەوە ئەمێنێتەوە کە (بەرامبەر) یان هەروەك رەتکردنەوە یان هەروەك نەبوون لەبەرامبەردا دەبێت، بەلاَم لە یەکێك لەو دووانەدا مەحاڵە، چونکە بۆچی ئەبێت زیاتر بەرامبەرکێی((گەورەتر))بێت تا((بچووکتر))؟ کەواتە رەتکردنەوەی،نەبوونی یان لەناوچوونی، هەردووکیانە، بەم هۆیەوەیە کە ((ئایا)) لە پەیوەندی لەگەڵ هەردووکیاندا ئەگووترێت، و نەك لە پەیوەندی لەگەڵ یەکێك لەو دووانە، بۆ نموونە ئێمە ناپرسین کە ((ئایا شتێك گەورەترە یان بچووکتر؟))و((ئایا بەرامبەرە یان بچوکتر؟))(٢٠) بەڵکو هەمیشە پرسیار لە هەرسێکیان ئەکرێت، بەلاَم ئەمە ((نەبوون))ێکی پێویستانە نیە، بەڵکو تەنیا شتانێکی بەرامبەرن، کە بە سروشتی خاوەنی ئەو سیفەتانەن.

کەواتە ((بەرامبەر)) ئەو شتەیە کە نە گەورەیە و نە بچووك، بەلاَم بە پێی سروشت ئەتوانێت گەورەتر یان بچووکتر بێت، و هاوکات رەتکەرەوەی نەبوونی بەرامبەرکێی هەردوکیانە، چونکە((نێوان))ی ئەوانە، و هەروەها ئەو شتەی کە نە باشە و نەخراپ، بەرامبەرکێی هەردووکیانە، بەلاَم بێ ناوە، چونکە هەریەك لەمانە (واتە باش و خراپ) بە جۆرگەلێکی زۆر باس ئەکرێن، وقبوڵکەرەکەی هەریەکە لەوانەش یەکێك نیە، بەڵکو ئەو شتەی کە نە سپیەو نە رەش، بەم شێوەیەیە، (یان شایستەی هەبوونی ئەم ناوەیە) بەلاَم تەنانەت ئەمەیش یەك ناوی نیە، بەڵکو ئەو رەنگانەی کە خودی ئەم رەتکردنەوەیە بە شێوەیەکی((نەبوونیانە)) لەبارەیانەوە ئەگووترێت، بە جۆرێك لەجۆرەکان، سنوردار و دیاری کراون، چونکە بێگومان یان((خۆڵەمیشیە)) یان((زەرد)) یان شتێکی تری لەم جۆرە.

لەبەر ئەمە دروست نیە سەرزەنشتی کەسانێك بکەین کە وا گوومان ئەکەن هەموو ئەمانە بە یەکسان باس ئەکرێن، بەو شێوەیەی کە بەو پێیە، ئەوەی کە نە((پێڵاو))ە و نە((دەست))، ((نێوانێکە)) لە نێوان پێڵاو و دەست، چونکە ئەوەی کە نە باشەو نە خراپ((نێوان))ی باش و خراپە، وەك چۆن بڵێی لە هەموو شتەکانەوە ئەبێت ((نێوان))ییەك بوونی هەبێت،(٣٥) بەڵام ئەم ئەنجامە پێویست نیە، چونکە رەتکردنەوەی هاوکاتی بەرامبەرکیٚ کان، تەنیا لە شوێنێکدایە کە جۆرێکی نێوانی و جۆرێك لە((ماوە-دووری سروشتی)) بوونی هەیە،

١٠٥٦b

بەڵام لە بارەی (پێڵاو ودەست) جیاوازییەك بوونی نیە، چونکە رەتکردنەوەی هاوکات لەبارەی شتانێکەوە رەوایە کە لە رەگەزی یەکترین (یان جیاوازین)، لەبەر ئەمەش ((بابەت)) یەکێکە.

"وەرزی شەشەم"

# ( یەکەکـــــان و زۆرەکـــــان )

بەم شێوەیە لە بارەی ((یەك و زۆرەکان))(یان یەکێك و زۆر) ئەتوانرێت دووچاری سەرگەردانی ببیت، چونکە ئەگەر((یەك)) لەگەل((زۆر))دا بە ڕەهایی بەرامبەرە(٥) هەندێك بەربەست لەخۆ ئەگرێت:١_چونکە یەك، چەند یان چەندێتی ئەبێت، لەبەر ئەوەی((زۆرەکان)) لەگەلْ((کەمەکاندا)) بەرامبەرن٢ _هاوکات دوو((زۆری)) بوونیان ئەبێت، چونکە((دووبەرامبەر)) واتە((چەند بەرامبەر))-کە بە پێی دوو ئەگووترێت، لەبەر ئەمە یەك چەندێتیە، چونکە بە زیادکردن و خستنەسەر چی دوو پێی ئەوترێت((زۆر))، ئەگەر بە زیادکردن و خستنەسەر یەك یان ((چەند)) نەبێت؟ چونکە هیچ شتێك کەمتر لە((یەك))نیە،(١٠) ٣_و هەروەها ئەگەر لە درێژایی، درێژی و کورتی بەدەست دێن، بەهەمان شێوەی لە زۆرێك((زۆر و کەم)) بەدەست دێت، و هەروەها ئەگەر ئەوەی کە زۆریە، ((زۆر))ە، و ئەوەی کە زۆرە، زۆرێتیە،(مەگەر ئەوەی کە بەراستی لە پێکەوەلکێنێکی ئاسانی سنووداردا جیاوازیەك بوونی هەبێت)[1] کەواتە کەم ((زۆر))ێتیەکە. لەبەر ئەمە یەکیش زۆرێکە، لەوێوە کە کەمە، و پێویستانە بەم شێوە ئەبێت، ئەگەر دوو ((زۆرێتی))بێت، بەلآم لەوانەیە(١٥) زۆرێتیش بە جۆرێك گەلێکی زۆر ناو بنرێت، بەلآم بەیەك جیاوازی، وەك ئاو کە زۆرە بەلآم ((زۆرێتی)) نیە، بەلآم بەهەموو شتە دابەشبوەکان ئەگووترێت زۆر، بە یەك مانا ئەگەر ((زۆرێتی))بێت خاوەنی زیادەیی چ بە جۆرێکی ڕەها،چ نیسبەت بە شتێك(چونکە بەم شێوەیەش ((کەم))یش

---

[1] وەك شلەکان کە ناتوانرێت بە ((زۆر))بزانرێن.

((زۆرێتی))ەکە کە خاوەنی((کەمێتیە))..)بە مانایەکی تر وەك ژمارە، کە تەنیا بەم مانایە لەگەڵ ((یەك))دا بەرامبەرە، چونکە(٢٠)ئێمە بەو شێوەیە ئەڵێین((یەك))یان((زۆر)) رێك بەو شێوەیەی کەسێك بڵێت ((یەك و یەکەکان)) یان((سپی و سپییەکان))یان پێوراو لەگەڵ پێو، بەم شێوەیە قسە لەسەر((چەند بەرامبەرەکان)) ئەکەن، چونکە هەر ژمارەیەك ((زۆریەك))ە، چونکە ((یەکەکان))لەخۆ ئەگرێت، و هەروەها هەریەکێك لەگەڵ((یەك))ێکدا شایەنی پێوانە، و هەروەها هەروەك بەرامبەرکێیە لەگەڵ ((یەك)) نەك لەگەڵ ((کەم)) (٢٥) کەواتە بەم شێوەیە ((دووەکانیش)) زۆرن، بەڵام نەك هەروەك ((زۆرێتی))یەك خاوەنی زیاتری چ نیسبەت بە شتێك ،و چ بە شێوەیەکی ڕەها، بەڵکو هەروەك یەکەمین((زۆرێتی))، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەها دووکەمێتیە،' چونکە یەکەمین زۆرێتی خاوەنی کەمێتیە، (بەم هۆیەوە ئاناگساگۆراس مەبەستەکەی بە ناڕەوایی ڕەها کردوە، کاتێك کە ئەڵێت ((هەموو شتەکان پێکەوە بوون و بێسنوورن،هەم لە زۆرێتی و هەم لە بچووکی))، لەجیاتی((لە بچووکی))دەبوو(٣٠) بیوتایە((لە کەمێتی))چونکە ئەوان لەکەمێتی دا بێسنوور نین)چونکە کەمێتی، وەك چۆن هەندێك ئەڵێن، بە هۆیەیەکەوە، یەك نیە، بەڵکوبەهۆیەکەوە، دووە.

کەواتە (( یەك))لە ژمارەکاندا لەگەڵ ((زۆرێتی))لەبەرامبەریدایە، وەك ئەندازە لەگەڵ ئەوەی کە شایەنی ئەندازە گرتنە، بەڵام ئەمانە هەروەك خستنەسەر لەبەرامبەردان، واتە ئەو شتانەی کەلە خۆیاندا لە((خستنە سەر))نین، ئێمە پێشتر لە شوێنێکی تر جیامان کردەوە کە((سەرخراو))(٣٥) بەدوو جۆر ئەوترێت، یەکێکی هەروەك دژەکان، و ئەوی تر هەروەك ناسین، نیسبەت بە ناسراو (یان زانست نیسبەت بە زانراو)، کە لەو شتەدا شتێکی تر لە خستنەسەر خودی ئەوەوە ئەگووترێت.

بەڵام هیچ بەربەستێك نیە لەوەی کە((یەك)) کەمتر لە شتێك، بۆ نموونە ((دوو))بێت، بەم هۆیەوە هۆکار، کەمێتی نیە، بەڵام زۆرێتی وەك بڵێی ڕەگەزی ژمارەیە، چونکە ژمارە زۆرێتیەکە کە لەگەڵ((یەك))دا ئەپێورێت،((یەك))یش بە جۆرێك لەگەڵ ژمارەدا بەرامبەرە، بەڵام نەك هەروەك دژ، بەڵکو(٥) بەو شێوەیەی کە گووترا، هەروەك هەندێك لە سەرخراوەکان. چونکە یەك و ژمارە لەو ڕوانگەیەوە بەرامبەرن کە یەکێکیان ئەندازە و ئەوی تریان ئەندازە گیراوە، بەم هۆیەوە هەرئەو شتەی کە یەك نیە ، یەك ژمارەیە، وەك ئەوەی کە دابەشنەخوازە، لەگەڵ ئەوەشدا ناسین لە خستنە پاڵ ناسێنراو هەربەم شێوەیە ئەگووترێت، بەڵام پێچەوانەی ئەوە بەم شێوەیە نیە، چونکە ئەکرێت وا بهێنرێتە بەر چاو کە ناسین((ئەندازە))یەو ناسێنراو((ئەندازە گیراو))(١٠) بەڵام وا ڕوو ئەدات کە

هەرچەندە هەر ناسینێك ناسێنراوە، بەلاّم هەر ناسێنراوێك ناسین نیە، چونكە ناسین بە جۆرێـك لـە جۆرەكـان ئـەپێورێت، بـەلاّم((زۆرێتـی))دژی ((كـەمێتی))نیـە، بـەڵكو دژەكـەی((زۆر))ە، (هـەروەك زۆرێتی سـەرخرێنراو كـە دژی زۆرێتـی سـەرخراوە)) بـەلاّم لەهـەر روانگەیەكـەوە و لەهـەر حاڵەتێكـدا دژی یـەك نیـە، بـەڵكو بـەو شـێوەیەی كـە گووترا(١٥) نیسبەت بەهەندێك، لە لایەكەوە هەروەك دابەشخواز و دابەش نەخواز، و لـە لایـەكی ترەوە هـەروەك زیادكراوێكـە، وەك ناسین نیسبەت بە ناسێنراو، ئەگەر زۆرێتـی ژمارە بێت و((یەك)) پێوانەو ئەندازە.

"ومرزی حەوتەم"

# ( نێـــوانی= نێوەنجی )

بـەڵام لـەوێوە کـە لـە دژەکانـدا بـوونی یـەک((نێـوان)) ئەگـەری هەیـە، و لەهەنـدێک لـە شتەکانیشدا هەم هەیە، کەواتە بێگۆمان((نێوان))یەکان لە نێوان دژەکانـدان،(٢٠)چونکە هەموو نێوانیەکان لەهەمان رەگەزی ئەو شتانەن کە ئەوان نێوانیانن، ئێمە ئەو شتانە بە نێوانی ئەزانین کە گۆڕاوی یەکەم تیایاندا ئەگۆڕێت، بۆ نموونـە ئەگەر لـە گڕترین تاڵەوە بۆ ناسـکترین تـاڵ، بـە کـەمترین جیـاوازیی ((ئەنتێروالـەکان))ەوە تـێ پـەڕین، یەکـەمجار ئەگەین بە ئاوازە نێوەندیەکان و، لەبارەی رەنگەکانیشەوە ئەگەر لە سپییەوە بـەرەو رەش بەرێ بکەوین، پیشتر بە(٢٥) سورو قاوەیی، ئەگەین تا بە رەش، و لـە بوارەکـانی تریشـدا هـەر بـەم شـێوەیەیە، بـەڵام((لەناوچـوون لـە رەگـەزێکـەوە بـۆ رەگـەزێکی تـر نیـە، مەگـەر دەرکەوتانە))،وەک(گۆڕان) لە یەک رەنگەوە بۆ یەک شکڵ، کەواتە بێگومان نێوانیەکان هەم لە خۆیاندا و هەم لەگەڵ شتانێک کە ئەمان نێوانیانن، لە یەک رەگەزن.

(٣٠)بـەڵام هـەموو نێوانیـەکان پەیوەسـتن بـە شـتانێکی بەرامبـەرکێ وە، چـونکە لەناوچـوون خـۆی لەخۆیـدا تـەنیا لەمانەیـە، بـەم هۆیـەوە بـوونی نێـوانی لـە نابەرامبەریەکانـەوە مەحاڵـە، و ئەگـەرنا ئـەوکات دەبـوو لـە نابەرامبەریەکانیشەوە لـەناو چوون هەبووایـە، بـەڵام لـە بەرامبەریەکانـەوە، ناهاوتـایی خـاوەنی نێوانێـک نیـە،(چونکە ناهاوتایی یەک هاوبەرامبەرییە antithesis)) کە یەکێک لە دوو بەشەکەی بە هـەر شتێک کـە ئـەبێت هـەبێت، لکـاوە، بێ ئـەوەی خـاوەنی هـیچ نێوانێـک بێـت، بـەڵام لـە نێـوان بـاقی بەرامبەرکێکانەوە هەندێک زیـادکراون، و هەندێک((نـەبوون))ن، و هەنـدێکیش دژن، بـەڵام لە زیادکراوەکـان ئەوانـەی کـە دژ نین، نێوانیـان نیـە، هۆکارەکەشـی ئەوەیـە کـە ئـەوان لـە

هەمان رەگەز نین، چونکە نێوانی ناسین و نەناسین، چییە؟ بەڵام لە نێوان ((گەورە)) و ((بچووک))دا نێوانێک دەست ئەکەوێت، کەواتە ئەگەر بەو شێوەیەی کە پیشان درا، نێوانەکان، لە هەمان((رەگەزن، و لە نێوان دژەکانن، کەواتە خودی ئەوانیش بێگومان تێکەڵەیەکن لەم دژانە)) چونکە ئەوان یان خاوەنی رەگەزێکن (٥) یان نین، ئەگەر خاوەنی رەگەزێکن، بەو شێوەیە کە شتێک لە پێش دژەکانەوە بوونی هەیە، ئەوکات ئەو جیاوازییانەی کە دروست کەری دژگەلێکی هەروەك جۆرەکانی رەگەزن، دژەکان لە پێشەوەیانەوە ئەبن، چونکە جۆرەکان لە رەگەز و جیاوازییەکان پێك دێن، بۆ نموونە ئەگەر سپێتی و رەشێتی دژن، و یەکێك لەوانە رەنگێکی جیاکەر[1](diakritikon) و ئەوی تر رەنگێکی کۆکەرەوە(sunkritikon)یە،(١٠) کەواتە ئەم دژانە،-جیاکەرەوە و کۆکەرەوە- لە پێشترن، بەو شێوەیەی کە ئەمانە دژ گەلێکی لە پێش یەکتر ئەبن، بەلام ئەو جۆرانەی کە بە شێوەی دژ، جیاوازن، (یان جیاوازییەکانیان بە شێوەی دژێتیە) زیاتر دژن، بەلام باقی(جۆرەکان) واتە((نێوانەکان)) لە رەگەز و جیاوازییەکانەوە دروست ئەبن، بۆ نمونە هەموو ئەو رەنگانەی کە((نێوان))ی سپی و رەشن،(١٥) ئەبێت لە رووی رەگەز و هەندێك لە رووی جیاوازییەکانەوە ناوبنرێن، بەلام ئەم جیاوازییانە یەکەمین دژەکان نین، ئەگەرنا هەر رەنگێك یان سپی یان رەش ئەبێت، کەواتە ئەمانە ((بەدەر)) لە (یەکەمین دژەکانن) لەبەر ئەمە ئەمانە نێوانی یەکەمین دژەکانن، و جیاوازییە یەکەمینەکان ((جیاکەر-جیاکەرەوە)) و((کۆکەرەوەن))، بەم شێوەیە یەکەمجار ئەبێت بەدوای دژ گەلێکدا بگەرێین کە لە(٢٠) یەك رەگەز نین، و تێ بگەین کە نێوانەکانی ئەوان لە شتێکەوە دروست ئەبن، چونکە شتانێك کە لە یەك رەگەزدان یان ئەبێت لەو شتانەی کە بە پێی رەگەز ،تێکەڵ نین، تێکەڵ بووبن، یان ناتێکەڵ بن، بەلام هەنووکە دژەکان لەیەکترییەوە تێکەڵ نەبوون، لەبەر ئەمە ((بنەما))ن، بەلام نێوانەکان یان هەموویان تێکەڵن یان هیچیان، لە دژەکان شتێکی وا دروست ئەبێت کە لەناوچوون لەناو ئەودا زووتر روو ئەدات تا لەناو خودی دژەکاندا، چونکە یەك ((کەمتری))لە یەك((دژ))و یەك((زۆرتری)) لەیەك((دژ))دا بوونی هەیە، کەواتە ئەمەش یەك((نێوان-دژ))ە، لەبەر ئەمە هەموو نێوانیەکانی تریش تێکەڵن، چونکە ئەوەی کە لە یەك دژ زۆرترە، بەلام لەوی تر کەمترە، بە جۆرێك لەجۆرەکان تیکەڵەیەك لەوانەی کە کە ئەوترێت لە یەکێك لەوانە زیاتر و لەوی تر کەمترە، و لەوێوە کە هیچ شتێکی تر نیە کە هاورەگەزی(نێوان))ەکان و

[1] وەربڕینێکە کە ئەفلاتوون بەکاری هێناوە، سەیری((تیمایۆس)) ٦٧E بەدواوە بکەن.

لە پێش دژەکانەوە بێت، کەواتە هەموو نێوانەکان ئەبێت تێکەڵ بن لە((دژەکان))، لەبەر ئەمە هەموو بابەتەکانیش،-چ دژەکان و چ نێوانیەکان- لە دژە یەکەمینەکانەوە بوونیان دەبێت (دروست ئەبن.و.ك) کەواتە ڕوو بوویەوە کە نێوانەکان هەموویان لەهەمان ڕەگەزن و نێوانەکان دژەکانن و هەموویان لە دژەکانەوە تێکەڵ بوون.

## "وەرزی هەشتەم"

# ( "جیاواز" یان "ئەوی تر" لە روانگەی جۆرەوە )

بەڵام((جیاواز یان ئەوی تر لەروانگەی جۆرەوە))،جیاوازە لەناو شتێك لە شتێك، و ئەم شتە ئەبێت پەیوەست بێت بە هەردووکیانەوە،(٣٥) بۆ نموونە لە روانگەی جۆرەوە جیاواز بن، (لەگەڵ گیانەوەرێکی تردا) هەردووك ئەبێت گیانەوەر بن، کەواتە شتانێك کە لە روانگەی جۆرەوە جیاوازن ئەبێت لە هەمان رەگەز بن، من ئەو جۆرە شتە بە((رەگەز)) ناو ئەبەم کە دوو شت لەودا بە ((هەمان)) ناویان ئەبرێت،

١٠٥٨a

و خاوەنی ((جیاوازی دەرکەوتانە)) نین، چ وەك مادە بن وچ بە جۆرێکی تر، چونکە نە تەنیا ئەبێت مەسەلەیەکی هاوبەش، ئەبێت بوونی هەبێت، بۆ نموونە هەردوکیان گیاندار بن، بەڵکو خودی ئەم((گیانەوەر))ەش ئەبێت لەهەریەك لەواندا جیاواز بێت، بۆنموونە لە حاڵەتێکدا((ئەسپ) و لە حاڵەتێکی تردا((مرۆڤ))بێت، بەم هۆیەوە ئەم مەسەلە هاوبەشە لە روانگەی جۆرەوە لێك جیاوازە،(٥) کەواتە ئەوانە ئەبێت یەکێك لەخۆیدا((ئەم جۆرە)) گیاندار و ئەوی تر((بەو جۆرە)) بێت، بۆ نموونە یەکێکیان ئەسپ و ئەوی تریان مرۆڤ بێت، کەواتە بێگومان ئەم جیاوازیە ((ئەوی تر بوونی))رەگەزە، (چونکە جیاوازی رەگەز، من بە((ئەوی تر بوونی رەگەز)) ناوی ئەبەم کە خودی ئەم رەگەزە ،شتێکی تر دروست ئەکات)، لەبەر ئەمە، ئەمە جۆرێکە لە دژایەتی کە لە رێگەی ئیستقراوە روون ئەبێتەوە، چونکە هەموو شتەکان لە رێگای بەرامبەرکێکانەوە دابەش ئەبن، (١٠) و پیشان درا کە دژەکان لە هەمان رەگەزن، چونکە((دژێتی)) جیاوازییەکی

کاملْ و تێروتەسەلە، بەلاّم جیاوازی لە روانگەی جۆرەوە بەردەوام (جیاوازی) لەناو شتێك،لە شتێکدایە، کەواتە ئەم شتە لە لای هەردووکیان رەگەزە(و بەم هۆیەوە هەموو ئەو دژانەی کە لە روانگەی جۆر و نەك لە روانگەی رەگەزەوە جیاوازن لەهەمان ریزی گووتەکانن و((ئامانجانە)) (لە ڕووی ئامانجەوە)((یەکتر نین))و (بەدەرن لە یەکتری)(١٥)، چونکە جیاوازیەکەیان کاملْ و تێروتەسەلە، و ناتوانن هاوکات لە یەکتریەوە دروست بن، کەواتە جیاوازی جۆرێکە لە دژایەتی.

لەبەر ئەمە ((جیاواز بوون یان ئەوی تر بوون)) لە روانگەی جۆرەوە بەم شێوەیەیە، بوونەوەر لە هەمان رەگەز و خاوەنی دژ بوون و دابەشنەخواز بوونە (بەلاّم ئەو شتانەی کە لە روانگەی جۆرەوە هەمانن، ئەوانەن کە خاوەنی دژ نین، لە کاتێکدا کە دابەشنەخوازن) چونکە لە گوزەری دابەش کردندایە کە دژەکان لە ((نێوان))یەکان(٢٠) دروست ئەبن، پێش ئەوەی کە بگەین بە دابەش نەخوازەکان، لەبەر ئەوە ڕوونە کە لە پەیوەندی لەگەلْ ئەوەیدا کە((رەگەز))ی پیْ ئەوترێت، هیچ یەك لەو شتانەی کە هەروەك جۆر، رەگەزە، نە لە روانگەی جۆرەوە هەمانە نە لە روانگەی ئەوی تر( یان جیاوازیەوە)، و بە شایستەییەوە بەم شێوەیەیە، چونکە مادە لە رێگای رەت کردنەوەوە ئاشکرا ئەبێت، (واتە لە ریگای نەبوونی شێوە.و.ف) و رەگەز مادەی ئەو شتەیە کە پێی ئەوترێت رەگەزی ئەو، بەلاّم نەك بەو مانایە کە لە رەگەز (واتە نەژاد) هراکلایدەکانەوە قسە ئەکرێت، بەڵکو بەو شێوەیە کە ئێمە قسە لە رەگەز و لە سروشتدا ئەکەین ،(٢٥) و هەروەها لە پەیوەندی لەگەلْ ئەوشتانەی کە لە هەمان رەگەز نین، بەڵکو لەگەلْ ئەمانەدا لە روانگەی رەگەزەوە جیاوازە بەلاّم لەروانگەی جۆرەوە لەگەلْ شتانێکدا جیاوازە کە لە هەمان رەگەزن، چونکە جیاوازییەك کە شتێك بە پێی ئەو لە روانگەی جۆرەوە جیاواز ئەبێت بێگومان دژایەتیەکە، ئەمەش تەنیا لە بارەی شتانێکەوە ڕوو ئەدات کە پەیوەستن بە هەمان رەگەزەوە.

"وەرزی نۆیەم"

# ( چ دژایەتیەك ئەبێتە هۆی جیاوازی لە روانگەی جۆرەوە؟ )

سەرگەردانیەك (یان پرسیارێکی قورس) ئەتوانێت بێتە پێشەوە کە بە چ هۆیەکەوە ژن لەگەڵ پیاو لە روانگەی جۆرەوە، جیاوازی نیە،(٣٠) لەگەڵ ئەوەشدا نێر و مێ دژی یەکترن، و جیاوازیش، دژێکە، و بۆ چی گیانەوەری مێ لەگەڵ گیانەوەری نێر بە پێی جۆر جیاواز نیە، هەرچەندە ئەم جیاوازیە لەخۆیدا پەیوەستە بە گیانەوەرەوە، و نەوەك سپێتی و رەشێتی، بەڵکو((نێرینە))و((مێینە))پەیوەستن بەو((هەروەك گیانەوەرەوە))،خودی ئەم سەرگەردانییە تا ئەندازەیەك هەمانە کە: بە چ هۆیەك هەندێك لە دژەکان(٣٥) شتانێکی((تری)) لە روانگەی جۆرەوە دروست ئەکەن، بۆ نموونە وەك((پێ دار))و((باڵدار)) و هەندێکی تریش نا، وەك ((سپێتی)) و ((رەشێتی))؟ ئەمە بەو هۆیەوەیە کە هەندێك لە کرداراندنەکان تایبەتن بە رەگەزەوە، و هەندێکی تر کەمتر بەو شێوەیەن، و لەبەر ئەوەی لە یەك لاوە مانا بوونی هەیە و لەلایەکی ترەوە مادە،

١٠٥٨b

کەواتە ئەو دژایەتیانەی کە لە مانادا بوونیان هەیە، جیاوازی گەلێك لە روانگەی جۆرەوە دروست ئەکەن، بەلآم ئەوانەی کە لەناو شتێکی کۆبووەوەن لەگەڵ مادەدا، جیاوازییەکی لەو شێوەی ناهێننە بوون، لەم ڕووەوە سپێتی یان رەشێتی لە مرۆڤدا (جیاوازیەکی لە رونگەی جۆرەوە) ناهێننە بوون، و لە نێوان مرۆڤی سپی بە پێی جۆر لەگەڵ مرۆڤ رەش جیاوازییەك نیە، (٥)تەنانەت ئەگەر لەسەر هەریەکەیانەوە یەك ناو بنرێت، چونکە لێرەدا مرۆڤ هەروەك مادەیە، و مادەش هیچ جیاوازییەك ناهێنێتە بوون،

و بەم هۆیەوە تاکەکانی مرۆڤیش جۆرەکانی مرۆڤ نین، هەرچەندە ئەو گۆشت و ئێسقانانەی کە ئەم مرۆڤ و ئەو مرۆڤ لەوانەوە دروست بوون جیاوازن، لەگەڵ ئەوەشدا ((گشتی دیاری کراو)) هەر جارێك جیاوازە، بەڵام لەروانگەی جۆرەوە جیاواز نیە، چونکە لە مانای دژدا بوونی نیە، و(٥) ئەمە ((دوا (جۆر)ی دابەشخوازە)) بەڵام((کالیاس)) مانایەکە لەگەڵ مادەدا، کەواتە((مرۆڤی سپی)) یش بەم شێوەیەیە، چونکە((کالیاس)) سپیە، بەم شێوەیە((مرۆڤ)) تەنیا ((دەرکەوتانە)) سپی یە، هەربەم شێوەیەشە لەبارەی بازنەی برۆنزی و تەختەشەوە (کە لەروانگەی جۆرەوە جیاواز نین))، ولەبارەی سێگۆشەیەکی برۆنزی و بازنەیەکی تەختەیشەوە هەربەو شێوەیەیە، نەك بە هۆی مادەکەیان (لەروانگەی جۆرەوە جیاوازن)، بەڵکو بەو هۆیەوە کە لە ناو ماناکەیاندا جیاوازییەك بوونی هەیە. بەڵام ئایا مادە، لەبەر ئەوەی بە جۆرێك جیاواز بێت، شتێکی لەروانگەی جۆری جیاوازەوە پێك ناهێنێت، یان بەجۆرێك ئەیهێنێنە بوون؟ چونکە بە چ هۆیەك ئەم ئەسپە لێرەدا لەگەڵ ئەم مرۆڤ لێرەدا لە روانگەی جۆرەوە جیاوازە؟ بە بوونی ئەمەش ئەوەی کە لەواندا ماناو مادە پێکەوە بەستراون، یان هۆکاری ئەوە ئەمەیە کە لە ماناکانیدا دژایەتیەك بوونی هەیە و هاوکات بەم شێوەیەشە لەبارەی ((مرۆڤی سپی)) و ((ئەسپی رەش))، ئەویش دژایەتیەك لەروانگەی جۆرەوە(٢٠) بەڵام نەك لەو ڕووەوە کە یەکێك سپی و ئەوی تر رەشە، چونکە تەنانەت ئەگەریش هەردووك سپی بونایە، هاوکات لە روانگەی جۆرەوە جیاواز دەبوون.

نێرینەو مێینە، کردارانەنێکی تایبەتی گیانەوەرەکانن، بەڵام نەك بە پێی ناوەرۆك، بەڵکو ئەوان لە مادەو جەستەن، بەم هۆیەوە هەمان تۆو، بەکاریگەری ((کارتێکەری)) شێوەیەك لە کرداراندن ئەبێت بە نێرینە یان مێینە.

(٢٥)کەواتە هەنوکە گوترا کە ((جیاوازی لە روانگەی جۆر))چیە و بە چ هۆیەك هەندێك لە شتەکان لە روانگەی جۆرەوە جیاوازن و هەندێك لە شتەکان نا.

"وەرزی دەیەم"

# ( لەناوچوو و لەناونەچوو بە پێی رەگەز جیاوازن )

لەوێوە کە دژەکان لەروانگەی جۆرەوە جیاوازن، و((لەناوچوو=لەناوچووخواز to ftharton)) و((لەناونەچوو= لە ناونەچوو خواز to aftharton ))یش دژن، (چونکە نەبوون یان لەناوچوون، بێتوانایییەکی دیاری کراوە) کەواتە لەناوچوو لەناونەچوو پێویستانە لە روانگەی((جۆر))ەوە جیاوازن، ئێمە تا هەنوکە لە بارەی دەستەواژە گشتیەکانەوە قسەمان کردووە،(٣٠) بەو شێوەیە کە ئەگەری ئەوە هەیە وا بێتە بەرچاو کە پێویست ناکات هەر لەناچوویەك و لەناونەچوویەك کە نەبێت هەبێت لەروانگەی شێوەوە جیاواز بێت، بەو شێوەیە کە سپی و رەشیش بەم شێوەیە نین، چونکە هەمان شت لەوانەیە هەردووکیان بێت، ئەویش هاوکات، ئەگەر یەکێك گشتی بێت، وەك((مرۆڤ)) کە بتوانێت هەم سپی بێت و هەم رەش، هەرچەند نەك هاوکات(٣٥)، بە بوونی ئەمە سپی دژی رەشە، بەلاّم هەندێك لە دژەکان دەرکەوتانە پەیوەست نەبن بە هەندێك لە شتەکانەوە، وەك شتانێك کە هەنووکە گوترا و زۆر شتی تریش، بەلاّم لە هەندێك لە شتەکاندا(ئەم پەیوەست بوونە) ئەگەری نیە (مەحاڵە)، لەناوچوو و لەناونەچووش هەربەم شێوەیەن،

١٠٥٩a

چونکە هیچ شتێك دەرکەوتانە لەناوچوو نیە، چونکە دەرکەوت لەوانەیە بوونی نەبێت ((بوونەوەر نەبێت))، بەلاّم لەناوچوو پێویستانە لە بارەی شتەکانەوە راست نەکات کە لەناوچوون، و ئەگەرنا هەمان شت لەناوچوو لەناونەچوو(٥) نەبێت، ئەگەر ئەگەری ئەوە هەبێت کە لەناونەچوو پەیوەست نەبێت بەوەوە، کەواتە لەناوچوو نەبێت

یان ناوەرۆك یان پەیوەست بە ناوەرۆكی هەریەك لە شتە لەناوچووەكانەوە بێت، هاوكات بەڵگەیەكی تریش لە بارەی لەناوچووەكانیشەوە ڕەوایە، چونكە هەردوكیان لەو شتانەن كە پێویستانە(وەك پێویستیەك) بوونیان هەیە، كەواتە ئەوەی كە هەروەك یەكەمین سیفەت بەپێی ئەو شتێكی لەناوچوو و شتێكی تر لەناونەچووە، خاوەنی یەك بەرامبەركێیە،(١٠) لەبەر ئەمە ئەوان بێگومان لەروانگەی جۆرەوە جیاوازن، بەم شێوەیە دەرئەكەوێت كە بوونی ((شێوە گەلێكی)) لەو جۆرە كە هەندێك ئەڵێن، شتێكی مەحاڵە، چونكە ئەوكات هەندێك لە مرۆڤەكان ((لەناوچوو))[1] وهەندێكی تر(( لەناونەچو))[2] ئەبن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگووترا كە((ئایدیەكان)) لە روانگەی جۆرەوە لەگەڵ تاكەكاندا هەمانن و تەنیا هاوناوی ئەوان نین، بەڵام شتە جیاوازەكان لە روانگەی رەگەزەوە زۆر دووترن لەو شتانەی كە لەروانگەی شێوە(جۆر)ەوە جیاوازن..

---

[1] واتە تاكەكانی مرۆڤ.

[2] واتە خودی مرۆڤ یان مرۆڤی ئایدیالی و شێوە جیاوازەكانی.

## "کتێبی یەکەم"

# ( دانایی، دووبارە کردنەوەی بابەتەکانی :کتێبی سێهەم، لە وەرزەکانی دووەم، سێهەم )

ئەوەی کە ((دانایی)) زانستێکە لەبارەی بنەماکان، لەیەکەمین گووتارەکانەوە ڕوون ئەبێتەوە کە لەوانـدا نیسبەت بەوەی کە لە لایەن(٢٠) ئەوانی ترەوە لەبارەی ((بنەماکان))ەوە گووترابوو، چەند نکۆڵیێ و نارەزاییەك هێنرانە ئارا، لێرەدا کەسێك ئەتوانێت دوچاری سەرگەردانی ببێت کە ئایا دانایی بە ((یەك))زانست بزانین یان ((چەند)) زانستێك. چونکە ئەگەر یەك زانستە،(ئەتوانرێت رەخنە بگیردرێت) کە((یەك))زانست هەمیشە لەگەڵ دژەکاندا سەرووکەلەی هەیە، بەڵام بنەماکان دژ نین، بەڵام ئەگەر((یەك))زانست نیە، چۆن ئەکرێت ((زانست گەلێك)) بە دانایی ئەژمار بکەین؟

هاوکات ئەتوانین بپرسین کە ئایا((یەك)) زانستە کە((بنەما گریماناوییەکان apodeiktikas arkhas)) ئەپشکنێت، یان زیاتر لەیەك زانست؟ (٢٥) ئەگەر یەك زانستە، بۆچی ئەم زانستەیە تا زانستێکی تر؟ بەڵام ئەگەر زیاتر لە یەکێکە، ئەبێت بە چ جۆرە زانستێکی بزانین؟

و هەروەها ئایا دانایی، زانستی هەموو ناوەرۆکەکانە یان نا؟ چونکە ئەگەر زانستی هەموو ئەوانە نیە، بە ئەستەم ئەتوانین بڵێین کە ((دانایی))چ جۆرە ناوەرۆك گەلێکە، بەڵام ئەگەر یەك زانستە و بۆ هەموو ئەوانە، ڕوون نیە کە چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە یەك و هەمان زانست، سەرقاڵی((ناوەرۆك گەلێکی زۆر)) بێت.

هاوکات ئایا(ئەم زانستە) تەنیا لەبارەی ناوەرۆکەکانەوە یان لەبارەی دەرکەوتەکانیشەوەیە؟(٣٠)چونکە ئەگەر گریمانەیەك لە بارەی دەرکەوتەکانەوە هەیە، لەبارەی ناوەرۆکەکانەوە نیە، بەلاّم ئەگەر بۆ(هەر یەك لەوانە) زانستێکی تر(جیا) هەیە، ئەوکات هەریەك لەوانە چ زانستێکە و کام یەك لەوانە ((دانایی))ە؟ ((هاوشێوەی زانستێکی گریمانەیی)) زانستێکە لە بارەی دەرکەوتەکان، و هاوشێوەی(هەروەکی) زانستێك لە بارەی شتە یەکەمینەکان،دانایی زانستی ناوەرۆکەکانە.

بەلاّم نابێت وا دابنێین کە ئەو زانستەی کە ئێمە مەبەستمانە لە بارەی((هۆکار گەلێکە)) کە لە گوتارەکانی دەربارەی ((سروشتایەتیەکان))دا گووتراوە، (٣٥) چونکە ئەم((لەبەر ئەو–یان ئامانج)) نیە، چونکە ئەم((چاکەیە))، و ئەمەش پەیوەستە بە مەسەلە کردارییەکان و ئەو شتانەی کە لە جوولەدان، و ئەم ((چاکە))یە یەکەمین شتێکە کە کە ئەهێنێتە جوولە (چونکە ئامانج لەم جۆرەیە)، بەلاّم لە شتە نەجوولاّوەکاندا یەکەمین ((پاڵنەر)) بوونی نیە.

بە گشتی مەسەلەیەکی قورسە کە ئایا ئەو زانستەی کە هەنووکە ئێمە مەبەستمانە لە بارەی ناوەرۆکە هەستپێکراوەکانەوەیە یان نا، ولەبارەی جۆرگەلێکی ترە لە ناوەرۆکەکان؟ ئەگەر لەبارەی (ناوەرۆك گەلێکی)ترەوەیە، لەو شێوەیەدا ئەبێت یان لەبارەی((شێوەکان))ەوە بێت یان لەبارەی شتە بیرکارییەکانەوە، و ئەوەی کە((ئایدیەکان)) بوونیان نیە، شتێکی ڕوونە،

١٠٥٩b

بەلاّم ئەگەریش کەسێك بوونایەتیانی پێ قبوڵ بێت، هاوکات مەسەلەیەکی دژوارە کە بە چ هۆیەك بارودۆخ بەو جۆرەی کە لەبارەی شتە بیرکارییەکانەوەیە، لە بارەی شتانێکی(٥) تر کە بۆ ئەوان شێوەیەك بوونی هەیە، بە هەمان شێوە نیە، مەبەستم ئەوەیە کە شتەکانی بیرکاری بە((نێوان))ی ئایدیەکان و هەست پێکراوەکان ئەزانن و جێگیر ئەکەن، وەك ((شتە سێهەمیەکان))لە پاڵ ئایدیەکان و شتەکانی ئەم دوونیایە، بەلاّم نە((مرۆڤی سێهەم)) بوونی هەیە و((ئەسپی سێهەم)) لەپاڵ "هەروەك ئەوان" و تاکەکانیاندا، بەلاّم ئەگەر بەو شێوەیە نیە کە ئەڵێن، کەواتە ئەبێت گریمانەی ئەوە بکەین کە بیرکاری زان هاووشێوی شتانێکی هەیە؟ کە لەگەڵ شتانێکی((ئەم جیهانی))نیە، چونکە لەمانەوە هیچ شتێك وەك شتانێك نیە کە زانستەکانی بیرکاری توێژینەوەیان لەسەر ئەکەن، زانستێکیش کە هەنووکە مەبەستی ئێمەیە لەبارەی شتەکانی بیرکارییەوە نیە،(چونکە هیچ شتێکی لەوان جیا بوونی نیە) بەلاّم ((لە بارەی ناوەرۆکە هەست پێکراوەکانیشەوە نیە))، چونکە ئەمانە لەناوچوون(لەناچوو خوان)ن.

بە گشتی مەسەلەیەکی دژوارە کە توێژینەوە لە بارەی مادەی شتەکانی بیرکاری پەیوەستە بەکام زانستەوە، پەیوەست نیە بە زانستی سروشتیەوە،((چونکە تەواوی ئیشی زانستی سروشتی لە بارەی شتانێکەوەیە کەلە خۆیاندا خاوەنی جوولەو وەستانن))هەم نە پەیوەستە بە زانستێکەوە کە لە بارەی((گریمانەو ناسینەوە)) توێژینەوە ئەکات، لەبەر ئەوە ئەمە تەنیا لە بارەی ئەم جۆرە شتانەوە ئەگەرێت، لەبەر ئەمە ئەمێنێتەوە فەلسەفە پێشنیاز کراوەکەی ئێمە کە لە بارەیانەوە دەست بکات بە توێژینەوە.

هاوکات ئەکرێت دووچاری ئەم سەرگەردانیە بیت کە ئایا ئەبێت وا دابنێین مەبەستی ئێمە لە بارەی ((بنەما گەلێکە)) کە لەلای هەندێك ناویان نراوە((توخمەکان stoikheia))؟ بەڵام هەموو کەسێك ئەوە قبوڵ ئەکات کە ئەمانە لە شتە تێکەڵەکاندا ئامادەن، بەڵام زیاتر گومانی ئەوە ئەکرێت کە ئەو زانستەی کە ئێمە مەبەستمانە ئەبێت بیپەرژێتە سەر((گشتایەتیەکان))، بەجۆرێك کە بەم شێوەیە ئەبێت پەیوەندی لەگەڵ رەگەزە یەکەمینەکانەوە بێت، بەڵام ئەمانەش ئەبن بە هەمان((بوونەوەری تاك))،چونکە زیاد لە گشت شتێك ئەتوانرێت وێنای ئەوە بکرێت کە ئەمانە هەموو بوونەوەرەکان لە خۆ ئەگرن و زیاد لە هەموویان بنەمان، چون بە پێی سروشت یەکەمین شتەکانن، چونکە بە لەناوچوونی ئەوان، باقی شتەکانی تریش ،لەگەڵ ئەواندا لەناو ئەچن، چونکە هەموو شتێك ((بوونەوەر-ببوو))ە، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەوان بە((رەگەزەکان)) ئەژمار بکات، جیاوازیەکانیش ئەبێت لەناویاندا پشکییان هەبێت، لە کاتێکدا کە هیچ جیاوازییەك لە رەگەزدا پشکی نیە، بەم شێوەیە نابێت شایستەی ئەوە بێت کە ئەوانە بە رەگەز یان بنەماکان ئەژمار بکات، هەر بەم شێوەیە ئەگەر ئەوەی سادەترە زیاتر بنەماترە لەوەی کە کەمتر بنەماترە، و هەروەها پاشکەوتی ئەندامە بەدەر لە رەگەزەکان، لە رەگەزەکان سادەترن(چونکە ئەوان دابەش ناکرێن)، بەڵام رەگەزەکان بۆ جۆرگەلێکی زۆر و جیاواز دابەش ئەبن، کەواتە گومانی ئەوە ئەکرێت کە جۆرەکان زۆرتر بن لە رەگەزەکان،

١٠٦٠a

بەڵام تا ئەوشوێنەی کە جۆرەکان هاوڕێ لەگەڵ رەگەزەکاندا لەناو ئەچن، رەگەزەکان زیاتر لە بنەماکان ئەچن، چونکە((بنەما)) ئەوەیە کە شتەکانی تریش لەگەڵ خۆیدا لەناو ئەبات، کەواتە ئەمانە و شتەکانی تریش لەم جۆرەن کە ئەبنە هۆی سەرگەردانی.

"وەرزی دووەم"

# ( دانایی: دووبارە کردنەوە بابەتەکانی "مەبەستەکانی" کتێبی سێهەم، وەرزەکانی چوارەم تا شەشەم )

هاوکات (ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە) کە ئایا گریمانەی ((شتێك)) لەپاڵ ((تاك شتەکان))دا پێویستە یان نا؟ یا(ئایا) ئەو زانستەی کە ئێمە مەبستمانە لەبارەی ئەمانەوەیە؟ بەلأم ئەمانە بێسنوورن،(٥)((شتانێك کە لە پاڵ تاك شتەکاندا ta kath hekasta بوونیان هەیە یان رەگەزەکانن یان جۆرەکان، بەلأم ئەو زانستەی کە هەنووکە مەبستمانە لە بارەی هیچ یەك لەمانەوە نیە)) پێشتر گووترا کە بۆ چی ئەمە مەحاڵە، چونکە مەسەلەیەکی دژوارە کە ئایا ئەبێت گریمانەی بوونی ناوەرۆك گەلێکی جیاواز بکەین لەپاڵ ناوەرۆکە هەست پێکراوەکاندا (واتە ناوەرۆکە ئەم جیهانیەکان)، یان نا، بەڵکو(تەنیا) ئەمانە بوونەوەرگەلێکی(١٠) واقعین، و((دانایی لەبارەی ئەمانەوەیە)) چونکە ((وا خۆیان دەرئەخەن)) کە ئێمە بەدوای ناوەرۆك گەلێکی تردا وێڵین و ئامانجی پێشنیازەکەی ئێمە ئەوەیە کە ببینین ئایا((شتێك))ی جیاواز لەخۆیدا ((یان خۆی لە خۆیدا جیاوان)) دەست ئەکەوێت کە پەیوەست نەبێت بە هیچ یەك لە هەست پێکراوەکانەوە، هاوکات ئەگەر لە پاڵ ((ناوەرۆکە هەست پێکراوەکانەوە، ناوەرۆکێکی تر بوونی هەیە))، ئەمە لە پاڵ کام یەك لە ناوەرۆکە هەستیەکان ئەبێت بگریمێنین (١٥)؟ بۆ چی ئەبێت بوونی ئەم ناوەرۆکە زیاتر لە پاڵ((مرۆڤ))یان((ئەسپ))دا گریمانە بکرێت تا لەپاڵ گیانەوەرەکانی تردا، یان تەنانەت لە پاڵ بێگیانەکان بەگشتی؟ بەلأم جێگری ناوەروکە جاویدانەکان هاو هێندی ناوەرۆکە هەست پێکراوەکان و لەناوچووەکان، وا دێتە بەر چاو کە لە پانتایی هەر گریمانەیەك لەدەرەوەیە(بەدەرە)، ((بەلأم ئەگەر ئەو

بنەمایەی کە ئێمە مەبەستمانە جیا لە تەنەکان نیە،(٢٠) ئەوا جگە لە مادە، ئەتوانین بە چ شتێکی تری گریمانە بکەین؟)) بەلاّم ئەمە((لە کردارێتی دا بوونی نیە، بەڵکو ((هێزەکیانەیە))، کەواتە زیاتر گومانی ئەوە ئەکرێت کە((شێوە eidos))و((شکڵ)) لەمادەدا زیاتر بنەما بن، بەلاّم شێوە و شکڵیش ، لەناوچوون، بەو شێوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی ناوەرۆکێکی جیالەخۆیدا بوونی نیە، ((بەلاّم ئەمە بێ مانابیە)) چونکە وا دەرئەکەوێت ((کە بنەماو ناوەرۆکێکی لەم شێوەیە بوونی هەیە (٢٥) و تائەندازەیەك لە لایەن بیرقوولترین کەسانێکەوە هەروەك شتێکی((بوواو)) بە دوایدا ئەگەڕێن)) لەبەر ئەوە((چۆن)) ئەکرێت((سیستەمێك هەبێت بە بێ بوونەوەرێکی جاویدان و جیا ونەمر؟)).

هاوکات ئەگەر بنەماو ناوەرۆکێك لەگەڵ سروشتێکی لەو شێوەیە، بە هەمان جۆر کە هەنووکە مەبەستی ئێمەیە بوونی هەیە، و ئەگەر بۆ هەموو شتەکان((یەك))ێکە، (واتە بۆ شتە جاویدانەکان و شتە لەناوچووەکان هەمانە) لەو شێوەیەدا ئەم گومان و دژوارییە دێتە ئاراوە کە بە چ هۆیەك- ئەگەر بنەما هەمان بێت-(٣٠)هەندێك لەو شتانەی کە لە ژێر ئەو بنەمایەدان، جاویدانن، بەلاّم هەندێکیان جاویدان نین، چونکە ئەمە بێ مانابیە، بەلاّم ئەگەر بنەمایەکی تر بۆ شتە لەناوچووەکان و بنەمایەکی جیاواز بۆ شتە جاویدانەکان بوونی هەیە، ئەگەریش بنەمای شتە لەناوچووەکان جاویدان بێت، شتانێکی کە لە ژێر بنەمادان و جاویدان نەبن؟ و ئەگەر ئەو بنەمایە لەناچووخواز بێت،(٣٥) بنەمایەکی تری بۆ ئەبێت و دیسانەوە بنەمایەکی تر ئەوی تر و، و هاوکات تا ناکۆتا ئەمە ئەرواتە پێشەوە.

بەلاّم ئەگەر لە لایەکی ترەوە بنەماگەلێك کە پێش هەمووان بە نەجوولاّو دێنە بەرچاو، واتە گریمانەی ((بوونەوەری)) و((یەك))بکەین، ئەوکات یەکەمجار(ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە) کە ئەگەر هەریەك لەمانە بەڵگە نەبن لەسەر یەك((ئەم شت)) و یەك ناوەرۆك، چۆن ئەبێت و ئەکرێت((لە خۆیدا))و(( جیا)) بوونیان هەبێت؟ بەلاّم ئەو بنەما جاوید و یەکەمینانە کە ئێمە بە دوایاندا ئەگەڕێن بەم جۆرەن، بەلاّم ئەگەر هەریەك لەوانە بەڵگە بن لەسەر یەك ((ئەم شتە لێرەدا))، ئەوکات هەموو بوونەوەرەکان ناوەرۆکن،

١٠٦٠b

چونکە((بوونەوەر))بە پێی هەموو شتەکان هەڵئەگیرێت و((یەك)) بە پێی هەندێك لە شتەکان،٥ )بەلاّم ئەوەی کە هەموو بوونەوەرەکان ناوەرۆکن، هەڵەیە، چۆنکە، چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە قسەی کەسانێك راست بێت کە ئەڵێن بنەمای یەکەمین((یەك))ە، و

ئەمەش یەك ناوەرۆكە، و لە یەك و مادە، ژمارە هەروەك یەكەمین شت ئەمێننە بوون و ناوی ئەمە ئەمنێن ناوەرۆك؟ چونكە دوو و هەریەك لە باقی ژمارە تێكەڵەكان چۆن ئەبێت بە یەك بزانرێن؟ ئەمانە لەم بارەیەوە شتێك نالێن، و گوتنی شتێكیش لەم بارەیەوە شتێكی ئاسان نیە.

هەنووكە ئەگەر هێڵەكان یان شتانێك كە خاوەنی (هێڵ گەلێكن)(مەبەستم یەكەمین ئاستەكانن) وەك بنەماگەلێك بخرێنە ڕوو، ئەوان بەلایەنی كەمەوە ناوەرۆك گەلێكی جیاواز نین، بەڵكو پارچە و دابەشكەرن–هەندێك لە ئاستەكان و هەندێكیش لە تەنەكان–(خاڵەكانیش پارچە دابەشكراوەی هێڵەكانن) و هەروەها سنورەكانیان هەر ئەم هێڵانەن، بەلاّم هەموو ئەمانە لە شتەكانی تردا بونیان هەیە و هیچ یەك لەوانە بە جیاجیا بوونیان نیە، زیاد لەمەش چۆن ئەبێت وا دابنێین كە بۆ ((یەك))و((خاڵ)) ناوەرۆكێك بوونی هەیە؟ چونكە هەر ناوەرۆكێك بۆ خۆی دروست بوونێكە، بەلاّم((خاڵ)) دروست بوون (پێكهاتن) نیە، چونكە خاڵ تەنیا یەك دابەش كردنە.

بەلاّم گوومان و دژوارییەكی تر ئەوەیە كە هەر زانستێك لەگەڵ گشتایەتیەكاندا و لەگەڵ((ئەم جۆرە شتانە toioudi))دا لە پەیوەندیدایە، بەلاّم ناوەرۆك لە گشتایەتیەكان نیە، بەڵكو زیاتر یەك ((ئەم شتە لێرەدا)) و ((جیا))یە، بەو شێوەیە كە ئەگەر زانست لە بارەی((بنەما))كانە، چۆن ئەبێت وا دابنێین كە((بنەما–بنەمای یەكەمین)) ناوەرۆكە؟

زیاد لەمەش، ئایا لە پاڵ ((گشتی دیاری كراوی هەست پێكراودا to sunolon))(مەبەستم مادەیە و ئەوەی كە پەیوەستە پێیەوە) شتێك بوونی هەیە یان نا؟ ئەگەر بوونی نیە ئەوكات هەموو ئەو شتانەی كە لە مادەدا لەناو ئەچن، بەلاّم ئەگەر شتێك بوونی هەیە، ئەو شتە ئەبێت((شێوەو شكڵ)) بێت، بەلاّم ئەمانە لە لای چ شتانێكەوە بوونیان هەیەو لە لای چ شتانێكەوە بوونیان نیە، دیاری كردنی قورسە، چونكە لە لای هەندێك لە شتەكانەوە بە ئاشكرا دیارە كە شێوە جیاوازیەكی هەبوو نیە، بۆ نموونە لە بارەی خانووەوە، هاوكات ئایا بنەماكان لە ڕووی جۆرەوە هەمانن یان لە ڕووی ژمارەوە؟ ئەگەر((ژمارەییانە)) یەكێكن و تاكن، ئەوكات هەموو شتەكان هەمان ئەبن.

"وەرزی سێهەم"

# ( بابەتی فەلسەفەی یەکەمین، شکڵێکی تر لە بابەتەکانی کتێبی چوارەم، وەرزی یەکەم و وەرزی دووەم )

لەوێوە کە زانستی فەیلەسوف سەرو کەلەی لەگەڵ((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)دا هەیە،-بە گشتی نەك بەشەکیانە- بەڵام بوونەوەر بە جۆرگەلێکی زۆر و نە بەیەك شێوە ناو ئەنرێت، کەواتە ئەگەر(بوونەوەر) تەنیا بە جۆرێکی هاوناوی ئەگوترێت و نە بە پێی مانایەکی هاوبەش، ئەوکات لە ژێر((یەك)) زانستدا جێگیر نابێت، (چونکە شتە هاوناوەکان لە یەك رەگەزی تەنیاوە نین)(٣٥) بەڵام ئەگەر بە پێی شتێکی هاوبەش ئەگووترێت، ئەوکات ئەبێت لە ژێر((یەك)) زانستدا جێگیر بێت.

١٠٦١a

دیارە کە(بوونەوەر) بە هەمان شێوە ناو ئەنرێت کە پێشتر گووترا، واتە وەك ((پزیشکی)) و((تەندروست))، چونکە هەریەك لەمانە بە جۆرگەلێکی زۆر ناو ئەنرێن، لەهەریەك لەمانە بەم شێوەیە قسان ئەکرێت، لەو ڕووەوە کە یەکێك، بە جۆرێك، لە پەیوەندی لەگەڵ زانستی پزیشکی دا بەیان ئەکرێت، و ئەوی تر لە پەیوەندی لەگەڵ تەندروستی دا،یان دیسانەوە لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکی تردا، بەڵام هەریەك هەمیشە لەگەڵ هەماندا لە پەیوەندی دایە، چونکە قسەکردن لەبارەی(دیاری کردن) و چەقۆی نەشتەرگەری، هەردووك پێیان ئەوترێت ((پزیشکی))، لەو ڕووەوە کە یەکێکیان ئەنجامی زانستی پزیشکیە و ئەوی تر(٥) گوونجاوە بۆی و چالاکە، و لەبارەی ((تەندروست)) یشەوە هەربەم جۆرەیە، یەکێك بەو هۆیەوە( بەو شێوەیە ناو ئەنرێت) کە بەڵگەیە لەسەر

تەندروستی، و ئەوی تر بەو هۆیەوە کە بەهۆی ئەوەوە ((دێتە بوون))، لەباقی بوارەکانی تریشدا هەربەم جۆرەیە.

لەبارەی هەر ((بوونەوەر-ببوو))یەکەوە بەم شێوەیە قسە ئەکرێت، هەر بوونەوەرێك لەو ڕووەوە پێی ئەوترێت ((بوونەوەر)) کە یان((کردارانەن))ێك یان(( خەسڵەتێکی پایەدار)) یان((حاڵەتێك)) یان ((جووڵەیەك)) یان شتێکی تری لەم جۆرەیە لە((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر))دا، (١٠) بەلاّم لەوێوە کە لە هەر بوونەوەرێکدا گەڕانەوەیەك لە خستنە سەر شتێکی تاك و هاوبەش ڕوو ئەدات، کەواتە هەر یەك لە دژەکانیش ئەتوانێت بگەرێتەوە بۆ یەکەمین جیاوازییەکان و دژەکانی((بوونەوەر))، چ ئەو یەکەمین جیاوازییانە((زۆرێتی))یان((یەکێتی)) بن ، یان((وەکیەکی و ناوەکیەکی))، یان شتانێکی تر، بەلاّم ئەمانە ئەبێت وەك شتێك پێشتر توێژینەوە لەسەر کراو، لەبەرچاو بگیرێن[1]، جیاوازی نیە کە گەڕاندنەوەی بوونەوەر، بۆ((بوونەوەر)) ڕوو بدات یان بۆ((یەك))، چونکە ئەگەریش بوونەوەر هەمان ((یەك))ی نیە بەڵکو شتێکی ترە، بەلاّم ئەتوانن جێگرەوەی یەکتر بن، چونکە ((بوونەوەر بە شێوەیەك یەك))و(( یەکیش بە شێوەیەك بوونەوەرە)).

بەلاّم لەوێوە کە توێژینەوە و تێرامانی دژەکان ئیشی ((یەك و هەمان زانستە))، وهەریەك لەمانە، بە پێی (٢٠) نەبوونی(ئەوی ترەوە)) ئەگوترێن، (هەرچەند ئەکرێت تووشی سەرگەردانی ببین کە چۆن هەندێك لەوانە (واتە دژەکان) ئەتوانن بە پێی نەبوون، ناویان بنرێت((دژەکان))، لەکاتیکدا کە((ئاستی ناوەراست)) لەواندایە، وەك((دادپەروەر))و((نادادپەروەر))،..) لە هەموو ئەم بوارانەدا، نابێت ((نەبوون)) پەیوەست بە تەواوی ماناکان، بزانین، بەڵکو ئەبێت پەیوەست بە جۆرێکی پاشکەوتی بزانین، بۆ نمونە ئەگەر دادپەروەر بە پێی خەسڵەتی پایەدار گوێرایەڵی یاساکانە(٢٥) نادادپەروەر ئەوە نیە کە تەواوی ماناکانی(دادپەروەری) نیە، بەڵکو تەنیا بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیڕەوی کردن لە یاساکانی ڕەها کردووە، و لە بوارەکانی تریشدا هەربەم شێوەیەیە.

بەهەمان شێوەش کە بیرکاری زان تێڕوانین و توێژینەوە لەبارەی شتانێك کە لە ڕێگای((ئەبستراکت))ەوە بەدەست دێن، ئەنجام ئەدات،(چونکە یەکەمجار ئەو لە

[1] ئاماژەی ئەرستۆ لێرەدا بۆ نووسراوێکی وون بوە بە ناوو نیشانی((لەبارەی چاکە)) سەیری((فەزیلەت لای ئەفلاتون ە ئەرستۆ))بکەن، هایدلبرگ،١٩٥٩، لا ٢٧٢.

پێداچوونەوەی خۆی هەموو هەست پێکراوەکانی، وەك(٣٠) قورسی و سوکی و سفتی و دژەکەی، و هاوکات گەرمی و ساردی ، و باقی دژە هەست پێکراوەکان لەخۆ ئەگرێت، و تەنها چەندایەتی و پەیوەستی ئەهێڵێتەوە، هەندێ جار لەیەك و هەندێ جار لە دوو، و هەندێ جار لە سێ لایەندا، و کرداراندنەکان لەو ڕووەوە کە چەندایەتی و پێکەوە بەستراون، توێژینەوە ئەکات، نەك بە پێی شتێکی تر، و لەهەندێك لە شتەکاندا بابەتە ڕێژەییەکانیان پێکەوە وهەروەها پەراوێز و پەیوەستەکانیشیان، توێژینەوە ئەکات، و لەهەندێك لە شتەکانی تریشدا((هاوئەندازەیی summetria))و ناهاوئەندازەیی asummetria))ەکەیان،

١٠٦١b

و هەروەها لە هەندێك حاڵەتدا، نیسبەتەکانیان، بە بوونی ئەمەشەوە ئێمە هەموو ئەمانە پەیوەست بە هەمان زانست، واتە ئەندازیاری ئەژمار ئەکەین)، باروددۆخەکەش لەبارەی ((بوونەوەر))ەوە هەر بەم جۆرەیە، چونکە تێڕوانین و توێژینەوەی ئەو، لەو ڕووەوە کە بوونەوەرە و بوونی هەیە، و هەروەها توێژینەوەی دژەکانی لەو ڕووەوە کە ((بوونی هەیە))و بوونەوەرە(٥) ئیشی زانستێکی تر نیە مەگەر ((فەلسەفە))، چونکە کەسێك کە توێژینەوەی بوونەوەر هەروەك بوونەوەر بۆ زانستێکی سروشتی دیاری کراو ناکات، بەڵکو ئەم زانستە زیاتر ئەپەرژێتە سەر بوونەوەر تا ئەو شوێنەی کە پشکی لە جووڵەدا هەیە، ((دیالێکتێك)) و((سەفسەتە))ش ئەپەرژێنە سەر دەرکەوتەی هەبووەکان، بەڵام نەك لەو ڕووەوە کە بوونەوەرن و ((هەبوو گەلێکن))، و هەروەها ناپەرژێنەی سەر بوونەوەر لەو ڕووەوە کە((بوونی هەیە-ببووە))(١٠).

لەبەر ئەمە تەنیا فەیلەسوف ئەمێنێتەوە کە لەبارەی ئەو شتانەی کە ناویان برا، لەو ڕووەوە کە بوونەوەرن و بوونیان هەیە، توێژینەوە بکات، بەڵام لەوێوە کە هەر بوونەوەرێك، هەرچەندە کە بە جۆرگەلێکی زۆر ناو ئەنرێت، بە پێی مانایەکی تاك و هاوبەش ئەگوترێتەوە، و هەرئەم مسەلەیەش لە بارەی دژەکانەوە ڕاستە،(چونکە ئەکرێت ئەوانە بگەڕێنینەوە بۆ یەکەمین دژەکان و جیاوازیە((هەبووەکان))..) و لەوێوە کە ئەم جۆرە شتانە(١٥) هەموویان ئەتوانن لە ژێر((یەك)) زانستدا جێگیر بن، کەواتە ئەو گوومان و دژوارییەی کەلەسەرەتاوە گوترا،(( ئەتوانرێت چارەسەر بکرێت))مەبەستم ئەم مەسەلەیەیە کە چۆن((یەك)) زانست ئەتوانێت لە بارەی بوونەوەر گەلێکی زۆر و بە پێی ڕەگەزی جیاوازەوە، دەست بە توێژینەوە بکات.

"وەرزی چوارەم"

## ( جیاوازی نێوان فەلسەفەی یەکەمین لەگەڵ بیرکاری و زانستی سروشتی، دووبارە کردنەوەی چەند بابەتێك لە کتێبی چوارەم، وەرزی سێهەم )

بەلاّم لەوێوە کە بیرکاری زانیش بنەما هاوبەشە ناسێنراوەکان، بە تەنیا بە شێوەیەکی تایبەت بەکار ئەهێنێت، کەواتە ئیشی ((فەلسەفەی یەکەمین))ە کە توێژینەوە لەسەر بنەماکانی ئەمانیش بکات،(٢٠) چونکە ئەوەی کە هەرکاتێك رێژەیەکی یەکسان لە رێژە یەکسانەکان وەربگیرێت، باقی ماوەکان یەکسان ئەبن، ((بنەمایەکی ناسراوی هاوبەش))ە بۆ هەموو چەندایەتیەکان، بەلاّم بیرکاری تەنیا لەبارەی بەشێك لە مادەو بابەتی تایبەتی خۆی کە جیای کردۆتەوە دەست بە پشکنین و توێژینەوە ئەکات، بۆ نمونە لە بارەی هێڵەکانەوە یان گۆشەکان یان ژمارەکانەوە، یان باقی چەندایەتیەکانی تر، بەلاّم نەك ((هەروەك بونەوەرەکان))، بەڵکو توێژینەوە لەسەر ئەوانە ئەکات ((هەروەك پەیوەستێك)) لە یەك، دوو یان سێ لایەندا،(٢٥) بەلاّم ((فەلسەفە)) لە بارەی شتە بەشەکیەکان، لەو لایەنەوە کە هەریەك لەوانە خاوەنی دەرکەوتن، توێژینەوە ناکات، بەڵکو لەبارەی هەریەك لەم جۆرە شتانە وەك (( بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) توێژینەوە ئەکات، بارودۆخ لەبارەی زانستی سروشتیشەوە هەربەم هەمان شێوەیە کە لە بارەی بیرکاریەوەیە، چونکە زانستی سروشتیش لە دەرکەوتەکان و بنەمای بوونەوەرەکان(٣٠) لەو ڕووەوە کە جووڵاون توێژینەوە ئەکات، بەلاّم نەك ((هەروەك بوونەوەرەکان))، بەلاّم وتمان کە((زانستی یەکەمین)) لەگەڵ ئەم شتانەدا لەم ڕوانگەیەوە لە پەیوەندی دایە کە بابەتەکانیان ((بوونەوەرەکان))ن، بەلاّم نەك لە روانگەیەکی ترەوە، بەم هۆیەوە ئەبێت زانستی سروشتی و بیرکاری بە بەش گەلێك لە((دانایی)) ئەژمار بکەین.

"وەرزی پێنجەم"

## ( بنەمای نەبوونی ناهاوتایی :
## چەند بابەتێك لە كتێبی چوارەم، ورزەكانی سێهەم و، چوارەم، و هەشتەم )

لە((شتە بووەوەكان en tois ousin))دا بنەمایەك هەیە كە لەبارەیەوە ناتوانرێت هەڵە بكرێت،(٣٥) بەڵكو هەمیشە پەیڕەوی كردن لە پێچەوانەكەی پێویستە، واتە ئەڵێین: ڕاستی لەودایە، و ئەو، ئەمەیە كە: مەحاڵە كە هەمان شت لە یەك و هەمان كاتدا هەم((هەیە))و هەم((نیە)) بێت،{ لەبارەی} باقی ئەوشتانەی كە بەم جۆرە بەرامبەركێكانن، (هەروەها ئەم بڕیارەش ڕاستە)، بۆ ئەم بنەمایانە گریمانەیەك بە شێوەیەكی ڕەها بوونی نیە، هەرچەند نیسبەت بە((كەسێكێكی دیاری كراو pros toned)) (گریمانە)یەك بوونی هەیە،

١٠٦٢a

چونكە لە بنەمایەكی دڵنیاكەرەوەتر لەخودی ئەمە، ناتوانێت پێوانە و هەڵسەنگاندێك بەدەست بهێنێت، ئەگەرچی ئەبێت بەم شێوەیە بێت، لە شێوەیەكدا كە مەسەلەیەكی تەواو گریمانەخواز بێت(٥) بەلأم ئەگەر كەسێك بیەوێت بە قسەكەری قسە ناهاوتاكان پیشان بدات و بسەلمێنێت كە بۆ چی هەڵە ئەكات، ئەبێت وای لێبكات كە شتێكی لەم شێوەیەی پێ قبوڵ بێت، كە لە واقعدا بریتیە لەم بنەمایە، كە ئەبێت بووترێت: ئەگەری ئەوە نیە كە هەمان شت لە یەك و هەمان كاتدا هەم((هەبێت)) و هەم((نەبێت))، بەلأم وا دێتە بەرچاو كە لەگەڵ ئەواندا یەكێك بێت، چونكە تەنیا بەم

شێوەیەیە کە ئەتوانرێت گریمانەی ئەم مەسەلەیە بکرێت لە بەرامبەر کەسێکدا، کە(١٠) ئەڵێت گووتە ناهاوتاکان لەبارەی یەك(یەك شت)و هەمان شت بە دروستی و بە راستی ئەگەریان هەیە، کەواتە کەسانێك کە ئەیانەوێت پێکەوە لە قسە کردنێکدا بەشداری بکەن، ئەبێت لە روانگەیەکەوە لەگەڵ خۆیاندا رێککەوتن و((گونجان))یان هەبێت، چونکە ئەگەر ئەم((پێکەوە گونجان))ە بەدەست نەیەت، چۆن هاوبەشی قسە هاوبەشیەك پێکەوە بوونی ئەبێت؟ لەبەر ئەمە هەریەك لە ووشەکان یان ئەو ناوانەی کە بەکاریان ئەهێنن، ئەبێت((مانا))و بەڵگە بن لەسەر شتێك، ئەویش نەك لەسەر شت گەلێکی زۆر(١٥)، بەڵکو لەسەر یەك شت، ئەگەریش بەڵگەن بن لەسەر چەندین شت، ئەبێت ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە ووشە یان دەربڕینەکە بەڵگەیە لەسەر کامیان، هەنووکە کەسێك ئەڵێت کە ئەم شتە ((هەیە)) و((نیە))، ئەوەی کە ئەیلێت ، نایلێت، بەو شێوەیەی کە ووشەکە بەڵگەیە لەسەری، ئەو ئەڵێت کە بەڵگە نیە لەسەری، بەڵام شتێکی لەم شێوەیە ئەگەری هەیە، لەبەر ئەمە ئەگەر ((ئەم شتە بوون to einai tode)) بەڵگەیە لەسەر شتێك، ناهاوتاکەی ئەو بە پێی هەمان شت ئەگەری نیە راست بێت.

(٢٠) هاوکات ئەگەر ناو یان ووشە بەڵگەیە لەسەر شتێك، و ئەمەش راست بێت، ئەم شتە پێویستانە ئەبێت بەو شێوەیە بێت، بەڵام((بوونەوەر وەك پێویست)) ئەگەری ئەوەی نیە کە هەندێ جار(نەبێت))، کەواتە گووتە ناهاوتاکان لەبارەی یەك شت(هەمان شت) شتێکی وانیە کە ئەگەری ئەوەی هەبێت راست بێت. زیاد لەمەش، ئەگەر سەلماندن لە رەتکردنەوە راستتر بێت(٢٥) کەسێك کە ئەڵێت((مرۆڤ)) لە کەسێك کە ئەڵێت((نا-مرۆڤ)) بە هیچ شێوەیەك زیاتر راست ناکات، بەڵام گومانی ئەوە هەیە کە ئەڵێت((مرۆڤ ئەسپ نیە)) یان زیاتر، یان بەلایەنی کەمەوە نە کەمتر، راستی ئەڵێت ، تا ئەو کەسەی کە ئەڵێت((مرۆڤ نا-مرۆڤ))ە، بە شێوەیەك کەسێك کە ئەڵێت ((هەمان مرۆڤ ئەسپە)) راست ئەکات{چونکە وادانرا کە بەرامبەرکێکان یان ناهاوتاکان، بە یەکسانی راست بن} کەواتە ئەنجام(٣٠) ئەوە ئەبێت کە هەمان کەس هەم مرۆڤە و هەم ئەسپ یان گیاندارێکی تر.

کەواتە هەرچەندە بۆ ئەم ((بنەما))یە بە شێوەگەلێکی ڕەها هیچ گریمانەیەك بوونی نیە، بەڵام لە بەرامبەر کەسێك کە شتانێکی لەو شێوە وێنا ئەکات، گریمانەیەك بوونی هەیە، ئەگەر کەسێك خودی((هراکلایتوس))یش بەم شێوەیە بخاتە ژێر پرسیارەوە ئەیتوانی بەو دانپیانانەی ناچار بکات کە گووتە ناهاوتاکان(٥) هەرگیز ناتوانن بە پێی یەك و هەمان شت راست بن، بەم شێوەیە ئەو بێ ئەوەی تێبگات و بزانێت کە ئەوەی

ئەیلێت چی تێدایە، بەم بڕوایە گەیشتووە[1]، بە شێوەیەکی گشتی ئەگەریش ئەم قسەیە لە لایەن ئەوەوە راست و دروست بووایە، لەو شێوەیەدا، تەنانەت خودی ئەم گووتەیە نەی ئەتوانی راست بێت، واتە ئەوەی کە: هەمان شت لەیەك و هەمان کاتدا ئەگەری نیە هەم((هەبێت))و هەم((نەبێت))، چونکە رێك بەو شێوەیە، بە جیاکردنەوەی ئەوانە(واتە هەردوولا، ناهاوتاکە و.ف) سەلماندن بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت لە رەتکردنەوە راستر بێت، بەهەمان شێوەیەش(٥) ئەگەر هەردوو گووتەکە پێکەوە لەبەرچاو بگرین و پێکەوە بیانچنین و بەشێوەی ((یەك))یان لێ بکەین، رەتکردنەوە بەهەمان شێوەی((گشتایەتی مەسەلەیەك)) راست ئەبێت ، کە هەروەك یەك((سەلماندن)) ئەژمار ئەکرێت، هاوکات ئەگەر نەتوانرێت هیچ شتێك لەگەڵ راستایەتیدا بسەلمێنرێت، ئەوکات خودی ئەم قسەیەش کە: هیچ شێوە سەلماندنێکی راست و دروست بوونی نیە، درۆ یان ناراست ئەبێت،(١٠) بەڵام ئەگەر شتێکی لەو شێوەیە (واتە سەلماندنی دروست.و.ف) هەیە، کەواتە بوونیادی قسەی کەسانێك کە ئەم جۆرە رەخنانە ئەهێننە ناوەوە، و هەر قسە کردنێك بەگشتی لەناو ئەبەن، دائەڕمێت.

[1] ئاماژەیەکە بۆ گووتەکەی((هراکلایتۆس)) کە ئەڵێت((ئێمە هەم هەین و هەم نین))(لەتی ٤٩ لاف) سەیری(( یەکەمین فەیلەسووفەکانی یۆنان)) بکەن، لا ٢٣٩ و ٢٥١ و هەروەها بەراوردی بکەن لەگەڵ کتێبی چوارەم :١٠٠٥b٢٢-٢٦.

## "وەرزی شەشەم"

# ( درێژەی بنەمای نەبوونی ناهاوتایی، چەند بابەتێك لەكتێبی چوارەم، وەرزەكانی پێنجەم و هەشتەم. )

قسەكەی ((پرۆتاگۆراس)) لەگەڵ ئەو تیۆرانەی كە باس كران، زۆر لێك ئەچێت، چونكە ئەو پیاوەش گووتوویەتی كە،((مرۆڤ پێوانەی هەموو شتەكانە)) و مەبەستی هیچ شتێكی تر نیە، جگە لەوەی كە، ئەوی كە لەلایەن هەرتاكێكەوە دیارە، بە دڵنیاییەوە بوونی هەیە،(١٥) بەلأم ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئەنجامەكە ئەوەیە كە هەم شت هەم((هەیە))و هەم((نیە))، هەم((خراپە))و هەم((باش))، و هەروەها هەموو ئەو شتانەی كە بە پێی قسە ناهاوتاكان ئەوترێت(بوونی هەیە)، چونكە بە زۆری ڕوو ئەدات كە((شتێكی دیاری كراو)) بۆ كەسانێكی دژی ئەو دەرئەكەوێت،و ئەوەی كە بۆ هەر تاكێك دیارە، پێوانەیە،(٢٠) بەلأم ئەم مەسەلە قورسە كاتێك چارەسەر ئەكرێت كە توێژینەوە لەسەر ئەوە بكرێت كە سەرچاوەی ئەم بیروباوەڕە لە كوێوەیە، لە هەندێك بواردا گوومانی ئەوە ئەكرێت كە لە بیرو باوەڕی سروشتناسەكانەوە دروست بووبێت، و لەهەندێ بواری تردا لەوەوە كە هەموو ئەو كەسانەی كە لەبارەی هەمان شتەوە، هەمان ناسینیان (تێگەیشتن)یان نیە، بەڵكو شتێكی دیاری كراو لە بڕوای ئەو كەسانەی كە خۆشیان لێی دێت و شتێكی تر لە بڕوای ئەوانەی كە دژین، دەرئەكەوێت، چونكە ئەوەی كە(٢٥) لە((نا-بوونەوەر)) هیچ شتێك نایەتە بوون، بەڵكو هەموو شتێك لە((بوونەوەر))ەوە دێتە بوون، بڕوای دۆگماتیزمی، تا ئەندازەیەك هەموو توێژینەوەكانە لەبارەی سروشتەوە، هەنووكە لەوێوە كە سپی نایەتە بون، مەگەر لەوەوە كە پێشتر بە تەواوی سپی بووبێت و بە هیچ شێوەیەك((نا-سپی)) نەبێت، كەواتە ئەوەی كە سپی

ئەبێت، ئەبێت لەوەی کە ((نا-سپی))یە پێك بێت، لەبەر ئەمە (بەپێی بەڵگاندنەکەی ئەمان) ئەو(سپی)ە لە((نا-بوونەوەر)) دروست ئەبێت، مەگەر ئەوەی کە(٣٠) هەمان شت لە سەرەتاوە((هەم)) سپی بووەو ((هەم)) نا-سپی، بەڵام چارەسەر کردنی ئەم گوومانە دژوار نیە،((لە گووتاری سروشتدا)) پیشتر ڕوون کرایەوە، کە دروست بووەکان چۆن و بە چ مانایەك لە ((نابوونەوەر-نەبوو))ەوە دروست ئەبن و بە چ مانایەك لە ((بوونەوەر))ەوە دێنە بوون.

بەڵام گێلانەیە کە بە یەکسانی دڵ بدەین بە بڕوای ئەو کەسانەی کە پێکەوە گفتگۆیان هەیە، چوونکە ڕوونە کە(٣٥) یەکێك لەمانە بێگومان هەڵە ئەکات، ئەم خاڵە لەوەی کە بە پێی هەست کردن ( یان پەی بردنی هەستەکی) ڕوو ئەکات، ڕوون ئەبێتەوە، چونکە هیچ کات هەمان شت بۆ کەسانێك شیرین و بۆ کەسانێکی تر دژەکەی نابێت و بەو شێوەیە دەرناکەوێت، مەگەر ئەوەی کە لە لای یەکێك لەو دووگروپە ئامرازی هەست کردن کە بەجیاکەرەوەی تامەکان ناوی براوە،بەسەر چوو یان زیانی پێ گەیشتبێت، کەواتە ئەگەر بەم شێوەیەیە، یەکێکیان ئەبێت وەك پێوەر قبوڵ بکەین و ئەوی تریان نا.(٥) مەبەستی من لەبارەی باش و خراپ و جوان و ناشیرین و هەموو ئەو شتانەی کە لەم جۆرەن، بەم شێوەیەیە، چونکە باوەڕێکی لەم شێوەیەیە (کە گووتە ناهاوتاکان) بەهایەکی یەکسانیان هەیە، هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ ئەوەی کە بڵێین ئەوەی بە ڕووی کەسەکاندا ئەبینرێت کە پەنجە بخەنە سەر چاوەکانیان و پەستانیان بخەنە سەر تا ئەوەی کە یەکێك بە دوو دانە ببینرێت، ئەبێت دوودانە بێت، چونکە بەم هێندە دەرئەکەوێت، و هەروەها ئەبێت یەکێکیش بێت،(١٠) چونکە بۆ کەسانێك کە چاویان(پەنجەی ناخەنە سەر) یەك، هەمان یەك ئەبێت کە ئەبینرێت.

بەگشتی داوەری کردن لەبارەی ڕاستی لەسەر بنەمای دەرکەوتنی ((شتە ئەم دوونیاییەکان)) کە لە، لەناوچوندان، - وهیچ کات لە بارودۆخی خۆیاندا جێگیر نین- ئیشێکی بێمانایە، بەڵکو ئەبێت لەسەر بنەمای شتانێك کە هەمیشە لەهەمان بارودۆخن و بەهیچ شێوەیەك ئەگەری لەناوچوونیان نیە، بە دوای ڕاستیدا بگەڕێین، (تەنە ئاسمانیەکانیش بەم شێوەیەن، چونکە ئەوان هەنووکە بە جۆرێك و دواتر بە جۆرێکی تر خۆیان دەرناخەن، بەڵکو هەمیشە هەمانن و بە هیچ شێوەیەك پشکێکیان لە لەناوچووندا نیە)).

زیاد لەمەش، ئەگەر جووڵە هەیە، جووڵێنراوێکیش هەیە، بەڵام هەر شتێك لە شتێکەوەو بە ئاراستەی شتێکی ترەوە ئەجووڵێت، کەواتە ئەبێت جووڵێنراو هەم لەو شتەدا بێت کە لەوەوە دێتە جووڵە(٢٠) و هەم لەناویشیدا نەبێت، و ئەبێت بە

ئاراستەی((ئەم شتە)) ئیدی بێتە جووڵە و لەودا بێتە بوون، بەڵام ئەو قسانەی کە ناهاوتایانە وترا، ناتوانن هاوکات و پێکەوە راست بن، و ئەگەر شتە ئەم جیهانیەکان بە پێی چەندایەتی و پێکەوە بەستراوی لە گۆزەرداو جووڵەدان، (با وادابنێین کەسێك کە وائەڵێت، هەرچەندە راستیش نیە)بە چ هۆیەك بە پێی چەندایەتی، سەقامگیر نەبن؟ چونکە وا دێتە بەرچاو کە هۆکاری ئەم دەربڕینانە کە ئەکرێت ناهاوتاکان بکەینە هەڵگیراوی هەمان شت، تا ئەندازەیەك ئەم بەیان کردنە کاتێکە کە چەندایەتی لە لای تەنەکان جێگیر نیە، و بەم هۆیەوە (بە بڕوای دژەکان) هەمان شت هەم چوار گەز درێژەو هەم درێژیش نیە، بەڵام((ناوەرۆك))بە پێی چەندایەتیە، و ئەمە خاوەنی سروشتێکی دیاری کراو و سنوردارە، بەڵام چەندایەتی خاوەنی سروشتێکی بێسنورە.

هاوکات بە چ هۆیەك کاتێك کە پزیشك فرمانی ئەم خۆراکە دیاری کراوەیان پێ ئەدات، قبوڵی ئەکەن؟(٣٠) بۆ چی ئەم نانە بۆ ئەمان زیاتر نانە تا «نا-نان»؟ لەبەر ئەمە نابێت هیچ جیاوازییەك هەبێت کە بیخۆین یان نەیخۆن، بەڵام هەنووکە وەك چۆن بڵێی راستی لەبارەی ئەم خۆراکە ڕێ پێدراوە ئەزانن، کە هەمان نانە و ئەو لە خۆئەگرێت، بە بوونی ئەمە ئەگەر لە شتە هەست پێکراوە سروشتیەکاندا جێگیر و سەقامگیر نەبوو، بەڵکو هەموو شتێك بەردەوام لە جووڵە و گووزەردا بوایە، نەدەبووایە ئەم ئیشەیان بکردایە.

(٣٥) وە هەروەها ئەگەر ئێمە بەردەوام لەناوئەچین و هیچ کاتێك وەك خۆمان نامێنینەوە، دەی چ سەیرییەکی تێدایە کە بۆ ئێمەش ، هەروەك نەخۆشەکان، شتەکان هیچ کاتێك بە هەمان شێوەی خۆیان دەرنەکەون؟

١٠٦٣b

چونکە لە بەرامبەر نەخۆشەکانیش، لەبەرئەوە خۆیان لە حاڵەتێکی یەکسانی وەك کاتی تەندروستی نابیننەوە، شتەکان بە پێی هەستەوەرەکانیان، وەك یەك و بە یەکسانی دەرناکەون، بەڵام ئەمە نابێتە هۆکار بۆ ئەوەی کە خودی هەست پێکراوەکان بە هیچ شێوەیەك پشکێك لە لەناوچوون بن، بەڵام ئەوان{ئەو هەستەوەرانە}لە نەخۆشەکاندا نەك وەکیەکەکان، هەست گەلێکی جیاواز ئەهێننە بوون،(٥) کەواتە لای ئێمەش، ئەگەر ئەو لەناوچوونەی کە گووترا، ڕوو بدات، باروودۆخەکە بێگومان (بەناچاری) ئەبێت بە هەمان شێوە بێت، بەڵام ئەگەر ئێمە لەناونەچین، بەڵکو بەردەوام بین لەسەر بوونایەتیەکەی خۆمان، کەواتە چ شتێك سەقامگیر و لەسەر پێیە.

هەنوکە لە بەرامبەر کەسانێك کە خاوەنی چەندین گومانی لەو شێوەیەن کە ناو بران، دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك ئاسان نیە، مەگەر ئەوەی کە بە تەواوەتی قبوڵ بکەن وە

داوای هیچ بەڵگەداری و سەلماندنێکی بۆ نەکەن،(١٠) چونکە هەر بەڵگەهێنانەوەیەك (بەڵگەدارییەك) و هەر گریمانەیەك تەنیا بەم شێوەیە دێتە بوون، چونکە ئەگەر هیچ شتێك بە تەواوەتی قبوڵ نەکەن، هەرجۆرە قسە کردن و بە گشتی هەر جۆرە بەڵگەهێنانەوەیەك لەناو ئەبەن، لەبەر ئەمە لە بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە بەڵگەدارییەك بوونی نیە، بەڵام لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دووچاری گومانێکن کە ئەوان خستوویانەتە سەریان، رووبەروو بوونەوەو چارەسەر کردنی هۆکارە گوماناویەکان و سەرگەردانی ئەمان، ئاسانە، ئەم خاڵە لەوەوە کە گووترا، ڕوون ئەبێتەوە.

(١٥) لەبەر ئەمە لەم گووتارانەوە ڕوون ئەبێتەوە کە گووتە ناهاوتاکان(یان وردتر،گووتە بەرامبەرکێکان) ئەگەری نیە لەبارەی هەمان شت، لە یەك کاتدا راست بن، و هەروەها نە گووتە دژەکان، چونکە هەموو دژەکان بە پێی یەك((نەبوون)) ئەگووترێن، بەڵام ئەم خاڵە کاتێك ڕوون ئەبێتەوە کە مانای(پێناسەی)دژەکان تا سنووری ((بنەماکان))یان ڕوون بکرێنەوە.

بەم شێوەیە ناتوانرێت شتێك ،هەروەك ناستێکی((نێوەندی))(دژەکان)بکرێتە هەڵگیراوی یەك یان هەمان شت،(٢٠) چونکە بابەتێك کە سپییە، ئەگەر بڵێین نە سپیە، نە رەشە، هەڵەمان کردووە، چونکە ئەنجامە ئەبێتە ئەوەی کە ئەم هەم سپیە و هەم سپی نیە، چونکە تەنها یەکێك لە دوو لایەنەکانی مەسەلە پێکەوە چنراوەکە راست ئەبێت و ئەویش ناهاوتای سپی یە.

کەواتە نەگووتەکەی((هراکلایتوس)) هاوشێوەی راستیە، و نەگوتەکەی ((ئاناکساگۆراس))(٢٥) و ئەگەر نا ئەنجامە ئەمە ئەبێت کە دژەکان ئەکرێت بکرێنە هەڵگیراوی هەمان شت (واتە لەسەر هەمان شت هەڵبگیرێن)، چونکە کاتێك کە ئەو(ئاناکساگۆراس) ئەڵێت:((هەر شتێك بەشێکە لە هەر شتێك))ئەیەوێت بڵێت کە هیچ شتێك زیاتر شیرین یان تاڵ نیە، و بەم شێوەیەش لە بارەی باقی دژەکانەوە، واتە ئەگەر هەر شتێك لە هەر شتێکدا نە تەنیا هێزەکیانە بەڵکو کردارەکییانە و بە جیا ئامادە بێت(٣٠).

بەهەمان شێوەش مەحاڵە کە هەموو گووتەکان نە درۆ بن و نە راست، چونکە زیاد لە زۆرێك لە دژەکانی تر ئەتوانن لەسەر بنەمای ئەو گریمانەیە بێنە ناو کایەکەوە، بەم هۆیەوە ناتوانرێت قبوڵی ئەوە بکرێت کە ئەگەر هەموو گووتەکان درۆ بن، ئەوکات تەنانەت خودی ئەو کەسەی کە ئەمە ئەڵێت راست ناکات، بەڵام ئەگەر هەمووانیش راست بن، ئەوکات کەسێکیش ئەڵێت کە هەموو گووتەکان راستن، درۆیی نەگوتووە.

" وەرزی حەوتەم"

# ( خوداناسی، بیرکاری و زانستی سروشتی، شکلێکی تر لە بابەتەکانی کتێبی شەشەم، وەرزی یەکەم )

1064b

هەر زانستێك لەگەڕاندایە بەدوای بنەما و هۆکارگەلێك، بۆ هەر یەك لە شتە ناسراوەکانی پەیوەست بەو زانستە، وەك پزیشکی، پەروەدەی لاشەیی،(ژیمناستیك) و هەروەها هەر یەك لەباقی زانستە دروست کەرەکانی تر، و بیرکاری، چونکە هەریەك لەمانە بۆ خۆی رەگەزێکی دیاری کراو دائەرێژێت، بەڵام نەك لەو رووەوە کە بوونەوەر ((هەروەك بوونەوەر))ە، بەڵکو زانست(٥)ێکی ترە کە لە پاڵ ئەم زانستانەدا بوونی هەیە، و(خۆی سەرقاڵی ئەم ئیشە ئەکات)، هەریەك لە زانستە ناوبراوەکان، بە جۆرێك لە هەریەك لە رەگەزەکاندا((چیەتیەك)) ئەگرێت و هەوڵ ئەدات کە باقی ئەوانی تر سادەتر یان وردتر بڵێین زیاتر ببەڵگێنێت، بەڵام هەندێك لەوانە ((چیەتی)) لە رێگای پەی بردنی هەستەکیەوە ئەدۆزنەوە و هەندێك لە رێگای ((گریمانەکانەوە hupotithemenia))بەم هۆیە لەم جۆرە گووزەرە بەردەوامەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ((بۆ ناوەرۆك و بۆ چیەتی هیچ بەڵگەیەك بوونی نیە)).

(١٠) بەڵام لەوێوە کە زانستێك لەبارەی سروشتەوە بوونی هەیە، ڕوونە کە ئەم زانستە لەگەڵ زانستە بەدی هێنەرەکەدا، و هەم (لەگەڵ زانست)ێکی کرداریدا جیاوازە، چونکە لە زانستی دروستکەری بنەمای جووڵە لە زانستە دروستکەرەکەدایە، نەك لە دروستکراوەکەدا، و ئەویش یان پیشەگەرییەکە(هونەر) یان تواناداریێتیەکی تر، بەم

شێوەیە لەلای زانستی کرداریش، جووڵە لەوەدا نیە کە خراوەتە ئیش، بەڵکو زیاتر لەوەدایە کە ئەخاتە ئیش، بەڵام زانستی سروشتناسەکان زیاتر لەبارەی ئەو شتانەوەیە کە بنەما جووڵەیان لەناوخۆدا هەیە، کەواتە لێرەوە ڕوون ئەبێتەوە کە زانستی سروشتی نە کردارییە وە نە دروستکەر، بەڵکو پێویستانە زانستێکی تیۆریە، چونکە بێگوومان لە ژێر یەکێك لەم ڕەگەزانەوە جێگیر ئەبێت، بەڵام لەوێوە کە هەریەك لە زانستەکان پێویستانە بە جۆرێك((چیەتی)) ئەناسن و ئەو هەروەك بنەما بەکار ئەهێنن، نابێت بە شاراوەیی بمێنێتەوە کە سروشتناس چۆن ئەبێت پێناسە بکات و بە چ شێوەیەك مانای ناوەرۆك قبوڵ بکات، ئایا هەروەك ((پان بینی)) یان زیاتر وەك((پووکی))، چونکە لەم دوو حاڵەتەدا نموونەی مانای ((پان بینی)) لە پەیوەندی لەگەڵ مادەی شت، بەڵام مانای((پووکی)) جیا لە مادە ئەگووترێت، چونکە(( بینینی پانی)) لە بینیندا دروست ئەبێت، و بەم هۆیەوە ماناکەشی هەر لەروانگەی ئەوەوە سەیری ئەکرێت، چونکە((پان بینی)) واتە بینینی ((پووکی-نێوان بۆشی)) کەواتە مانای گۆشتیش ڕوونە، چاو و باقی ئەندامەکانی(لاشە) هەمیشە لە پەیوەندی لەگەڵ مادەدا ئەبێت دەرکەون(دەربخرێن).

بەڵام لەوێوە کە زانستێك هەیە لەبارەی بوونەوەر، لەو ڕووەوە کە هەیە((بونەوەرە)) جیایە، ئەبێت پێداچوونەوەی ئەوە بکەین کە ئایا ئەبێت لەگەڵ زانستی سروشتیدا بەیەکێکیان بزانین، یان زیاتر یان جیاواز لێی، هەنوکە زانستی سروشتی لەبارەی شتانێکەوەیە کە بنەمای جووڵەیان لەناو خۆیاندا هەیە، بیرکاریش زانستێکی تیۆرییە و لەبارەی ئەو شتانەوەیە کە جێگیرن و ئەمێننەوە ((menonta))، بەڵام نەك (لەبارەی) شتە جیاکانەوە، کەواتە لەبارەی بوونەوەرە جیاواز و نەجووڵاوەکانەوە، زانستێکی جیاواز لەگەڵ ئەو زانستەدا بوونی هەیە، ئەگەر کە ناوەرۆکێك لەو جۆرە بوونی هەبێت، واتە ناوەرۆکێکی جیاواز و نەجووڵاو، بە شێوەیەك هەوڵ ئەدەین کە جێگیری بکەین، ئەگەر سروشتێکی لەم جۆرە لە دونیایی بینراودا بوونی هەیە((en tois ousin)) کەواتە (( بوونی خوداش to theion یش ئەبێت لەم جیهانەدا و لە شوێنێکدا بەدەست بێت، و ئەوە کە ئەبێت یەکەمین و تەنیاترین بنەما بێت))

١٠٦٤b

بەم شێوەیە ڕون ئەبێتەوە کە سێ جۆر لە زانستە تیۆریەکان بوونیان هەیە:(( سروشتی و بیرکاری و خوداناسی)) هەنووکە ڕەگەزی زانستە تیۆریەکان، باشترینە، بەڵام لەمانەش کەناویان براو کۆتاترینیان باشترینیانە، چونکە لەبارەی بەرێزترین

بوونەوەرەکانەوەیە،(٥) هەر زانستێك بە پێی بابەتە ناسێنراوەکەی باشتر یان خراپتر ئەبێت.

هەنووکە لەوانەیە کەسێك دووچاری ئەم سەرگەردانیە بێت کە ئایا((بوونەوەر هەروەك بوونەوەر)) ئەبێت بە گشتی بزانرێت یان نا، چونکە هەر یەك لە زانستەکانی بیرکای لەبارەی ((یەك)) رەگەزی دیاری کراوەوەن، بەلاّم بیرکاری گشتی، هاوبەشی نێوان هەموویانە، هەنووکە ئەگەر ((ناوەرۆکە سروشتیەکان hai fusikai ousiai)) یەکەمین بوونەوەرەکان بن(١٠) ئەوکات زانستی سروشتی ئەبێت لە نێوان زانستەکاندا یەکەمین بێت، بەلاّم ئەگەر سروشتێکی تر و ناوەرۆکێکی جیاواز و نەجولاّو بوونی هەیە، زانستی ئەو پێویستانە(وەك پێویستیەك) زانستێکی جیاوازەو لە پێش زانستی سروشتیەوەیە، و لە ڕووەوە کە لە پێشترە، گشتی ترە.

"وەرزی هەشتەم"

# ( "بوونەوەری دەرکەوتانە" و "بوونەوەر هەروەك راستی"، شکلێکی تر لە بابەتەکانی کتێبی شەشەم، وەرزی دووەم تا چوارەم، و لە کتێبی (( سروشت ))، و کتێبی دووەم، وەرزی پێنجەم و شەشەم )

(١٥) لەوێوە کە((بونەوەر)) بە شێوەیەکی رەها، و لەچەندین لایەنەوە ئەگووترێت، کە لەوانە یەکێکیان ئەوەبێت کە پێی ئەوترێت ((بوونەوەری دەرکەوتانە))، یەکەمجار لەبارەی بوونەوەرێکی لەم شێوەیە ئەبێت توێژینەوە بکەین، هەنووکە روونە کە هیچ یەك لە زانستەکان بە گشتگیری خۆی سەرقاڵی مەسەلەی ((دەرکەوت)) نەکردووە، چونکە نە بیناسازی ئەوەی کە بە رووی سودوەرگرانی خانوویەکدا دەرئەکەوێت، توێژینەوە ئەکات،-بۆ نموونە ئایا مانەوە و دانیشتن تیایدا بۆ ئەمان ترسناکە(٢٠) یان دژەکەی- نە هوونەری چنین، نە ئیشی پێڵاو و نە چێشت لێنان، هەریەك لەم زانستانە تەنیا ئەوەی کە تایبەتە پێی، توێژینەوەی لەسەر ئەکات، و ئەمە هەمان ئەو ئامانجەیە کە پەیوەستە پێیەوە، بەڵام لەبارەی ئەم مەسەلەیە کە ئایا تاکی((مۆسیقاڕ))،((نەحوو-زانیشە))(٢٥) یان ئەوەی کە بووە بە ((نەحوو-زان))،هاوکات ئەبێت بە هەردووکیان، هەرچەندە پێشتر نەبووە، بەڵام ئەوەی کە هەمیشە بوونی نیە، شتێکە کە بووە، و لەبەر ئەمە ئەو تاکە هاوکات بووە بە مۆسیقاڕ و نەحوو زان، بەڵێ، لەم بارەیەوە هیچ شتێك لەو زانستانەی کە قبوڵ کراون، توێژینەوە ناکەن، مەگەر هونەری سەفسەتە، ئەمە تەنیا زانستێکە کە ئەیپەرژێتە سەر ((مەسەلەی دەرکەوت))، و بەم هۆیەوە ((ئاقلاتوون))لەم

قسه پڕاوپڕەدا، خراپی ئەووتووە کە: سۆفستایی کاتی خۆی بە بەلاش لەبارەی ((نەبوون))ەوە بە زایە ئەدات،(٣٠) بەلام ئەوەی کە مەحاڵە زانستیك لەبارەی دەرکەوت بونی هەبێت، کاتێك ڕوون ئەبێتەوەو دەرئەکەوێت، کە هەوڵ بدەین بزانین لەواقعدا دەرکەوت چیە.

لەبارەی هەر شتێك لەلایەکەوە ئەڵێین کە، هەمیشە و وەك پێویستیەك هەیە (لێرەدا پێویست، بە مانای بە زۆر نیە، بەڵکو مەبەست لە بێگوومانیەتی، ئەوەیە کە لەبارەی بابەتەکانەوە بە پێی گریمانەکانەوە ئەیڵێین)(٣٥) و لە لایەکی ترەوە ئەڵێین کە((زۆر جار))هەیە، لە روانگەی سێهەمەوە ئەڵێین کە نە زۆر جار و هەمیشە هەیە و نە پێویستانەش، بەڵکو بەو جۆرە کە ڕوو بدات، بۆ نمونە لە نیوەی هاویندا لەوانەیە سەرما بێت، بەلام ئەمە مەسەلەیە نە هەمیشە و نە وەك پێویستیەك ڕوو ئەدات، و نە زۆرجاریش،بەلام هەندێ جار ئەتوانێت کە ڕووبدات، ((کەواتە دەرکەوت، ئەوەیە کە ڕوو ئەدات، بەلام نە هەمیشە و نە پێویستانە و نە زۆرجار)) کەواتە وترا کە دەرکەوت چیە، و بەم هۆیەوە ڕوون ئەبێتەوە کە زانستێکی پەیوەست بەو بوونی نیە، چونکە هەر زانستێك پەیوەستە بە بوونێکەوە کە یان هەمیشە یان زۆرجار هەیە،(٥) بەلام دەرکەوت بە هیچ یەك لەو جۆرانەوە پەیوەست نیە.

١٠٦٥a

کەواتە ڕوون ئەبێتەوە کە هۆکارەکان و بنەماکان بۆ((بوونەوەر دەرکەوتانە))، لەو جۆرە دەست ناکەوێت، کە بۆ((بوونەوەر لە خۆیدا)) هەیە و ئەگەرنا هەموو شتەکان پێویستانە بوونیان ئەبێت، چونکە ئەگەر ((ئەم شتە)) هەیە بەم هۆیەوەیە کە((ئەم شتەی تر بوونەوەرە))، و هەروەها((ئەم شتە))هەیە، چونکە((ئەم شتە)) سێهەمیەش هەیە، و ئەم شتە سێهەمیەش(١٠) نە بەو جۆرەی کە ڕوو ئەدات، بەڵکو وەك پێویستیەك هەیە، کەواتە ئەو شتەی کە هەم ئەم سێهەمینەش هۆکاری ئەو بووە، پێویستانە(وەك پێویستیەك)) بوونی هەیە، و بەم شێوە(تا بگەین) بەوەی کە((هۆکارێنراوی))کۆتایی ناو ئەنرێت،(بەلام ئەبێت وا گریمانە بکرێت کە ئەمە دەرکەوتانە بووە)، بەم شێوەیە هەموو شتەکان پێویستانە ، بوونیان ئەبێت، و ئەوەی کە بە جۆرێك ڕوو ئەدا و هەروەها ئەگەری ڕوودان و نەبوونی ئەو بە گشتی لە پانتایی دروست بوونیەوە دیار نامێنێت، تەنانەت ئەگەریش هۆکار نەك بە ((بوونەوەر-ببوو)) بەڵکو بە((بووێنراو)) ئەژمار بکەین، ئەنجامەکە(١٥) هەمان ئەبێت ، چونکە هەمووشتێك پێویستانە ڕوو ئەدات، دونیا تاریك دادێت بەیانی، ئەگەر ئەم شتە ڕوو بدات، و هەروەها ئەم شتەش ڕوو ئەدات، ئەگەر شتە

سێهەمینەکە ڕوو بدات، و ئەم شتە سێهەمینەش ئەگەر شتە چوارەمینەکەش ڕو بدات، و بەم شێوەیە ئەگەر لە هەنووکەوە تا بەیانی بەردەوام کاتێك کەرت بکەین، لەیەك چرکەدا ئەگەین بە هەنووکە، کەواتە لەوێوە کە ئەم بوونی هەیە(٢٠) هەر شتێك بەدوای ئەوەوە پێویستانە بوونی ئەبێت، و لەبەر ئەمە هەموو شتێك پێویستانە ڕوو ئەدات و دێتە بوون.

بەڵام (( بوونەوەر)) بەمانای ((ڕاست یان دروست)) و دەرکەوتانە، یەکێك لە پێکەوەنووسان لە ئەندێشە( یان هزر) و((کرداراندنی)) ئەودایە، (و بەم هۆیەوە نەك بۆ شتێکی لەم شێوەیە، بەڵکو بۆ بوونەوەرێکی دەرەکی، و جیا،بە دوای بنەماکاندا ئەگەڕێین) بەڵام ئەو((ئەوی تره))(مەبەستم لە بوونەوەری دەرکەوتانەیە) پێویستانە نیە،بەڵکو دیاری نەکراوە، و هۆکارەکانی بوونەوەرێکی لەم شێوەیە، شپرز و بێ سنورن.

بەڵام ((لەبەر ئەو)) (واتە غایە-ئامانجێکی لێڵ و دوور) یان لە شتانێك کە سروشتانە دێنە بوون، یان لە ئەندێشەدا بەدەست دێن، سوتفە(بەخت) کاتێکە کە شتێك لەم مەسەلە دەرکەوتانە ( بە پێی لەناکاوی) ڕو بدات، چونکە هەربەو شێوەیەی کە لە لایەکەوە((لەخۆیدایە-خۆی لەخۆیدا)) و لە لایەکی ترەوە((دەرکەوتانە))یە، هۆکاریش هەر بەم شێوەیەیە. (٣٠)((ڕێکەوت هۆکارێکی دەرکەوتانەیە کە لە شتانێکدا ڕوو ئەدات کە زیاتر بە هۆی سەرپشکی و هەڵبژاردنەوەیە)) بەم هۆیەوە هۆکاری ڕێکەوت و ئەندێشە لە یەك و هەمان پانتاییدایە، چونکە سەرپشکی(پێوراوی) جیا لە ئەندێشە بوونی نیە، بەڵام هۆکاری ئەو شتانەی کە بە پێی ڕێکەوت ئەتوانن روو بدەن، دیاری کراو نین، ((لەم ڕووەوە ڕێکەوت بۆ بەرێوەبەریەکانی مرۆڤ، نادیارەو و هۆکارێکی دەرکەوتانەیە)) بەڵام بە ڕەهاییانە هۆکاری هیچ شتێك نیە، (٣٥)ڕێکەوت (بەخت)باشە یان خرپە، کاتێك کە ئەنجامەکەی باش یان نەخوازراو بێت، بەختەوەری یان بەدبەختی بە پێی گەورەیی ئەم ئەنجامانەیە.

١٠٦٥b

بەڵام لەوێوە کە هیچ شتێکی دەرکەوتانە لە پێش ((شت لەخۆیدا))وە نیە، لە بارەی هۆکارەکانیشەوە هەربەم شێوەیەیە، (واتە هۆکاری لەخۆیدا لەپێش هۆکاری دەرکەوتانەوەیە.و.ف) کەواتە ئەگەر ڕێکەوت یان ((خۆ ورووژێنەری automaton)) هۆکاری گەردوونە،((ئەقڵ nous)) و((سروشت fusis)) هۆکار گەلێکن لە پێشەوە.(لە پێش ئەوەوە).

"وەرزی نۆیەم"

# ( جووڵە : گوشێنراوێك لە بابەتەکانی کتێبی (( سروشت ))، کتێبی سێهەم، وەرزەکانی یەکەم تا سێهەم )

(٥) شتێك تەنیا کردارەکیانە بوونی هەیە و شتێك، هێزەکیانە، بەڵام شتێك(یش هەیە کە) هەم هێزەکیەو هەم کردارەکی،یان یەك بوونەوەر، یان یەك چەندایەتی یان یەکێك لە باقی گووتراوەکانە، بەڵام جووڵەی جیا لە شتەکان بوونی نیە، چونکە لەناوچوون هەمیشە بە پێی گووتارەکانی((بوونەوەر)) بەدەست دێت، هیچ شتێکی هاوبەش لە نێوان ئەمانە کە لە یەکێك لە گوتارەکاندا جێگیر نەبێت، بوونی نیە، بەڵام هەریەك بە بابەتەکەی خۆیەوە بە دو جۆرەوە پەیوەستە،(١٠){ وەك((ئەم شتە))، چونکە لە لایەکەوە شێوەیە و لە لاکەی ترەوە نەبوونی ئەو و بە پێی چۆنایەتیشەوە لە لایەکەوە سپی یە و لەلاکەی ترەوە رەشە، بە پێی چەندایەتیشەوە، لە لایەکەوە تەواوەو لە لایەکی تریشەوە ناتەواوە، و بە پێی جووڵەی شوێنیەوە( یان جوڵەی گوازتنەوە foran)شەوە لە لایەکەوە بەرەو سەرەوەیە و لە لایەکی ترەوە بەرەو خوارەوەیە، یان سوکە یان (قورس) لەبەر ئەمە جووڵە و لەناوچوون خاوەنی هەمان ژمارەی ئەو شکڵانەن کە((بوونەوەر)) خاوەنیانە.

(١٥) هەنووکە بە پێی ئەوەی کە هەر رەگەزێك(لە شتەکان) بە پێی هێزەکێتی و پەرەپێدانی تێروتەسەل جیا ئەکرێتەوە، من کردارێتی((هێزەکێتی بوون)) لەو روانگەیەوە کە بەم شێوەیەیە، ناو ئەنێم جووڵە، ئەوەی کە ئێمە راستی ئەڵێین، لێرەوە روو ئەبێتەوە کە :هەرکاتێك کە((بوونیاد نەرێتی)) لەو روانگەیەوە کە ئەڵێین بەم

شێوەیەیە، کردارەکیانە بوونی هەبێت، کەواتە لە حاڵەتی((بوونیاد نان))دایە، و ئەمەش هەمان خانوودروست کردنە، و بەم شێوەیەشە لەبارەی(٢٠)فێرکردن و چارەسەر کردن، بە رێگاداچوون،پیر بوون،پێگەیین، ((جوولآن)) کاتێك ڕو ئەدات کە خودی((ئەوپەری پەرەپێدان)) بوونی هەیە، نە لە پێشیەوە وەنە لە دوایەوە، کەواتە پەرەپێدانی تەواوی بوونەوەری هێزەکیانە، کاتێك کە لەو پەڕی پەرەپێدانی کرداریێتیدا بێت، نەك لەروانگەی خۆیەوە، بەڵکو لە روانگەی جوولآنەوەوە، هەمان((جووڵە))یە، مەبەستم لە(( لە روانگەی)) بەم شێوەیەیە، برۆنز هێزەکیانە پەیکەرە، بەلام پەرەپێدانی تەواوی برۆنز، لە روانگەی برۆنزەوە (یان هەروەك برۆنز) جووڵە نیە،(٢٥)چونکە برۆنز بوون لەگەڵ شتێکی هێزەکیدا یەکێك نیە، چونکە ئەگەر بە پێی مانایەکی ڕەها یەکێك بووایە، ئەوکات پەرەپێدانی تێروتەسەلی برۆنز جۆرێك دەبوو لە جووڵە، بەڵام ئەوان یەکێك و هەمان نین، (ئەم حاڵە لە لای دژەکان روون ئەبێتەوە، چونکە تواناداریێتی تەندروستی وتواناداریێتی نەخۆش بوون یەکێك و هەمان نیە، ئەگەر تەندروست بوون هەمان نەخۆش بوونە)(٣٠) بەڵام بابەتێك کە تەندروست یان نەخۆشە، چ شتێ بێت، و چ خوێن هەریەکێکە) بەڵام لەوێوە کە هەردووکیان هاوکات نین،-رێك بە هەمان شێوە کە((رەنگ))و((بینراوی)) هەمان نین- کەواتە ئەوپەڕی هاتنە ئارایی(پەرەپێدان) لەو روانگەیەوە کە هێزەکیانەیە، هەمان جووڵەیە، کەواتە ئەوەی کە(جووڵە) ئەمەیە، و ئەوەی کە کەوتنە جووڵە کاتێك ڕوو ئەدات کە(٣٥) خودی ئەوپەری پەرەپێدان بوونی هەیە، ئەویش نە لە پێشتر و نە لە پاشتر، هەنووکە ڕوون ئەبێتەوە،

١٠٦٦a

چونکە هەر تاك شتێك لەوانەیە هەندێ جار هەبێت و هەندێکجار نەبێت، بۆ نموونە((بوونیاد نەرێتی)) لەو روانگەیەوە کە ((بوونیاد نەرێتی))یە، هەمان دروست کردنی خانووە، چوونکە یان ئەمەیە واتە دروست کردنی خانوو، یان خانووە، بەڵام کاتێك کە خانوو بوو، ئیدی((بونیاد نەرێتی)) بونی نابێت(٥) چونکە ((بوونیاد نەرێتی)) ئەوەیە کە لەگووزەری بونیادناندایە، کەواتە خاوو بێگوومان کرداریێتیە، و بەڵام ئیشی دروست کردنی خانوو جۆرێکە لە جووڵە، هەرئەم بەڵگەیە لەبارەی جووڵەکانی تریشەوە هەر راستە.

ئەوەی کە لەم بارەیەوە بە دروستی قسە کرا، لەوەی کە ئەوانی تر لەبارەی جوڵەوە ئەڵێن، ڕوون ئەبێتەوە، و هەروەها لەم مەسەلەیەوە کە پێناسەکەی بە جۆرێکی تر ئاسان نیە.(١٠) چونکە ناتوانرێت لە رەگەزێکی تردا جێگیر بکرێت، و ئەم مەسەلەیە لەوەی کە

ئـەوانی تــر ئــەیڵێن ڕوون ئەبێتــەوە، چــونکە هەنــدێك ئــەو لەگــەڵ ((ئــەوی تــر بوون))،((نابەرامبەری))،((نەبوو-نا-بوونەوەر)) بەیەکێك ئەزانن، کە لەمانەوە بێگومان هـیچ کامیـان نایەنـە جووڵـە، و هـەروەها گـۆڕان لەمانـەدا و لـەناو ئەمانـەدا، زیـاتر ڕوو نادات( بە پێـی ئـەوەی) کە لـە دژەکانیانـدا ( روو ئەدات)، بـەڵام هۆکـاری جێگیر کردنـی جووڵە لەم(ڕەگەزانەدا) ئەمەیە کە گوومانی ئەوە ئەکرێت جووڵە شتێکی دیاری نەکراوە، (١٥) بـەڵام بنـەماکانی ئـەو ریـزەی تـر(دژەکـان) لـەو ڕووەوە کـە((نـەبوون))یـن، دیـاری نەکراون، چونکە هیچ یەك لەوانە نە((ئەم شتە)) و نە یەك((بەم شێوەیە)) و نـە یـەکێك لـە باقی گووتراوەکانی تر، هۆکاری ئەم گومانە کە جووڵـە دیـاری نـەکراوە، ئەوەیـە کـە ئـەو نەدەتوانرێت لـە ریـزی((توانـادارێتی))دا جێگیر بکرێـت ونـە لـە ریـزی ((کردارێتـی))دا، چونکە نـە ئـەوەی کـە چەندایەتیەکی هێزەکیانـەیە، وەك پێویـست جووڵـە ئـەکات، نـەك ئەوەی کە چەندایەتیەکی کردارەکیە،(٢٠) و هەنووکە ئەوەی کە گوومـانی ئـەوە ئـەکرێت کـە جووڵـە، جۆرێکـە لـە کردارێتـی، هۆکارەکـەی ئەوەیـە کـە((ئـەو هێـزەی)) کـە ئەم((جوڵە))یە لەوەوەیە، ناکامڵە.

بەم هۆیەوە پەی بردنی ئەوەی کە((جووڵە))چیە، شتێکی قورسە، چونکە یان ئـەبێت لە ریزی((نەبوون))دا جێگیری بکەین یان لـە ریـزی توانـادارێتی، یـان لـە ریـزی کردارێتـی ڕەهـادا، بـەڵام وادەرئەکـەوێت کـە هـەموو ئەمانـە مـەحاڵن، (٢٥) لەبـەر ئەمـە ئـەوەی ئەمێنێتـەوە ئەوەیـە کـە ئـەو((جووڵـە))یـە، هـەمان ئەوەیـە کـە گووترا، واتـە کردارێتـی و نـاکردارێتی، بـەو جـۆرەی کـە بـەیانمان کـرد، و ئـەوەش خاڵێکـە کـە تێبینـی کردنـی ئەستەمە، بەڵام ئەتوانێت بەم شێوەیە بێت.

ئـەوەی کـە جووڵـە لـە جووڵێنراوەکەدایـە، خـاڵێکی ڕوونـە، چـونکە ئـەو((ئەوپـەڕی پەرەپێـدان-هاتنـە ئـارایی))یـە کـە بەیارمـەتی ئـەوەی کـە ئەیهێنێتـە جووڵـە، و ئەوپـەڕی هاتنــە ئارایی،پەرەپێــدانی ئــەوەی کــە ئەیهێنێتــە جووڵــەش شــتێکی تــر نیــە جگــە لـە((ئەوپـەڕی هاتنـە ئـارایی جـووڵێنراو))، چونکە(جوڵـە) ئـەبێت ئەوپـەڕی پەرەپێدانی هەردوکیان بێت، چونکە شتێك لـەو ڕووەوە جـووڵێنراوە کە توانـای ئـەم کـارەی هەیـە، و شتێك لـەو ڕوەوە جووڵێنـەرە کە کردارێتـی ئەبەخشێت، بـەڵام کردارێتـی تـەنیا یـەکێکە، هەمان شێوە کە مـاوەی نێـوان یـەك بە نیـسبەت دوو و دوو بـە نیـسبەت یـەك، هەمانـە، و هەروەهابەرەو ژووركێ و بەرەو خوارکێ یـەکێکن، بـەڵام ((بوون))ی ئەوان یـەکێك نیـە، و لەبارەی جووڵێنەر و جووڵێنراویشەوە هەرەبەم شێوەیەیە.

"وەرزی دەیەم"

# (بێسنوور، کورتەیەك لە بابەتەکانی((سروشت))،کتێبی سێهەم، وەرزەکانی چوارەم، پێنجەم، حەوتەم)

(٣٥)((بێسنوری to apeiron)) یان ئەوەیە کە بڕینی(پێوانی) تا کۆتایی، مەحاڵە، چونکە لە سروشتی ئەودا پێوان(بڕین) نیە، وەك ئاواز کە نەبینراوە، یان ئەوەیە کە خاوەنی دووریەکی زۆر دووروودرێژ و ناکۆتایە، کە بەدەگمەن (ئەپێورێت)، یان ئەوەیە کە هەرچەند لە سروشتی خۆیدا بەو شێوەیەیە، بەڵام شیاووی پێوان و خاوەنی سنوور نیە، هاوکات(بێسنور) بە پێی زیادکردن یان کەم کردن، یان هەردوکیانەوە، هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا بێسنوور، هەروەك بوونەوەرێك لەخۆیدا و جیا، کە هەست پێکراویش نەبێت، بوونی نیە، چونکە ئەگەر ئەو ئەستوورێتی و زۆرێتی نەبێت، بەڵکو خودی بێسنور ناوەرۆك بێت نەك دەرکەوت، ئەوکات دابەشیش ناکرێت، (٥)(چونکە دابەشنەبوو، یان کەمێتیە یان زۆرێتی). بەڵام ئەگەر دابەشخواز بێت، ناتوانێت بیسنوور بێت، مەگەر بە شێوەی ئاواز بێت کە نابینرێت، بەڵام نە خەڵکی بەم شێوە لێیەوە قسان ئەکەن، وە نە ئێمە بەو شێوەیە بەداویدا ئەگەڕێین، بەڵکو(ئەو) هەروەك شتێکی نەپێوراو (لەبەرچاو ئەگرین).

زیاد لەمەش، چۆن ئەکرێت بێسنوور خۆی لە خۆیدا بوونی هەبێت؟ مەگەر ئەوەی کە هەم ژمارەییانە و هەم ئەستوورییانە، کە بێسنووری (ناکۆتایی) کردارانذنێکە لەوان، (و هەروەها بە شێویەکی((لەخۆیدا))ش بوونی هەبێت)، بەڵام ئەگەر دەرکەوتانە بێت،

ناتوانێت، لەورووانگەیەوە کە ناکۆتایە، توخمی بوونەوەرەکان بێت(١٠) رێك بە هەمان جۆر کە((نەبینراو)) نابێتە توخمی گووتار، هەرچەند ئاواز نەبینراوە.

ئەوەی بێکۆتایی کردارەکیانە بوونی نیە، ڕوونە، چونکە لەو شێوەیەدا هەر لەتێك لەو کە بگرین بێکۆتاییە، چونکە ((ناکۆتایی بوون )) و((ناکۆتایی)) یەکێك و هەمانن، ئەگەر کە ناکۆتایی ناوەرۆك بێت ، نەك هەڵگیراوێك بە پێی بابەت، لەبەر ئەمە(ناکۆتایی) یان دابەشخوازە، یان ئەگەریش((لەت لەت بوو meriston)) بێت، لە ناکۆتاییەکاندا دابەشخوازە،(١٥) بەلآم هەمان شت(ناکۆتایی) ئەگەری ئەوەی نیە کە((گەلێك ناکۆتایی)) بێت، چونکە دروست هەمان جۆر کە هەوا بەشێکە لە هەوا، بەهەمان شێوە(بەشی) ناکۆتایی، ئەبێت ناکۆتایی بێت. لە شێوەیەکدا کە ئەو یەکدانەیە ناوەرۆك و یەك بنەمایە، کەواتە(ناکۆتایی) لەت لەت نەبوو و دابەشنەخوازە، بەلآم(شتێکی لەم شێوەیە) لە بارەی ناکۆتایی بوونەوەرێکی کردارەکی ئەگەری نیە، چونکە ئەبێت چەندایەتیەك بێت، کەواتە (ناکۆتایی) ئەگەری ئەوەی نیە کە بنەما بێت، بەڵکو ئەو شتەیە کە ئەم دەرکەوتیەتی، بۆ نموونە ((هەوا)) یان((ژمارەی جووت)).

ئەم پشکنینە تا هەنووکە گشتی بووە، بەلآم ئەوەی کە ناکۆتایی لە هەست پێکراوەکاندا بوونی نیە، لە بابەتەکانی داهاتوودا ڕوون ئەبێتەوە، چونکە ئەگەر مانای(تەن) ئەو شتەیە کە((سنووردارە بە ئاستەکان))، ئەوکات هیچ تەنێك، چ هەست پێکراو وچ ئەقڵێنراو ناتوانێت ناکۆتایی بێت، و هەروەها هیچ(٢٥) ژمارەیەکی جیاجیا و ناکۆتایی ناتوانێت بوونی هەبێت، چونکە ژمارە و ئەوەی کە خاوەنی ژمارەیە، ((بژمێر=ژمێرراو))ە، ئەم خاڵە بە شێوەیەکی سروشتی لەم بابەتەوە ڕون ئەبێتەوە، ناکۆتایی لەوانەیە تێکەڵ یان سادە بێت، (ناکۆتایی) تەن و تێکەڵ نیە، چونکە توخمەکان بە پێی زۆرێتی سنووردارن، چونکە دژەکان ئەبێت یەکسان بن، و یەکێك لەوانە نابێت ناکۆتایی بێت، چونکە ئەگەر(٣٠)تواناداریتی یەکێك لە دوو تەنەکە لەوی تر بەجێ بمێنێت، کۆتاداری، بە یارمەتی ناکۆتایی لەناو ئەچێت، بەلآم ئەوەی کە هەریەکەیان ناکۆتا بن، مەحاڵە، چونکە تەن ئەوەیە کە لە هەموو لایەکەوە خاوەنی((ماوە))و دوورییە، بەلآم ناکۆتایی ئەوەیە کە بە شێوەیەکی بێسنوور درێژەو بووە، بەو شێوەیەی کە ئەگەر ناکۆتایی تەن بێت، ئەبێت لە هەموو لایەکەوە ناکۆتایی بێت،(واتە هیچ تەنێکی تر لە پاڵ ئەودا بونی نەبێت) بەلآم ناکۆتاییەکی لەم شێوەیش مەحاڵە((یەك)) تەن بێت و سادە، وە نە بەو شێوەیەی کە(٣٥) هەندێك لە کەسەکان ئەڵێن لەپاڵ و جیا لە توخم گەلێك بێت کە لەوانە ئەمان، ئەوان ئەهێننە بوون، (چونکە تەنێکی

بەم شێوە جیا لە توخمەکان بوونی نیە، چونکە هەر شتێك لەوەیدا کە لێیەوە سەری دەرهێناوە، شی ئەبێتەوە، بەلاّم مەسەلەیەکی لەم شێوەیەی جیا لە تەنە سادەکان، بەردەوام نابێت) و هەروەها (ناکۆتایی) نە ئاگرە و نە شتێکی تر لە توخمەکان، چونکە بەدەر لەوەی کە چۆن یەکێك لەمانە ئەتوانێت ناکۆتا بێت، ئەگەری ئەوە نیە کە گشت- ئەگەریش سنوردار و کۆتادار بێت- یان یەکێك لەو توخمانە بێت یان ببێت،

١٠٦٧a

بەو شێوەیەی کە ((هراکلایتوس)) ئەڵێت کە: کاتێك هەموو شتەکان ئەبن بە ئاگر، هەر ئەم گریماندنە لەبارەی((یەك))ی، راستە کە سروشتناسەکان ئەویان بە جیا و لەپاڵ توخمەکاندا دائەنا، چونکە هەر شتێك لە دژێکەوە ئەگۆڕێت، بۆنموونە لەگەرمەوە بۆ سارد(ئەگۆڕێت).

زیاد لەمەش، تەنی هەست پێکراو لەیەك شوێندایە، و((شوێنی گشت(وەك زەوی) و بەشەکەی، یەکێك و هەمانن) لەبەر ئەمە ئەگەر(تەن)ناکۆتاییەکی هاوشێوە بێت، یان بە نەجوولاّوی ئەمێنێتەوە یان بەردەوام لەگۆڕاندا ئەبێت، بەلاّم ئەمە مەحاڵە، چونکە بۆ چی ئەبێت، زۆرتر بەرەو خوار یان بەرەو سەرەوە بجوڵێت تا بۆ هەر لایەکی تر؟ بۆ نموونە ئەگەر لەتە خشتێك بوونی هەبێت، لە کوێدا ئەجووڵێت یان لەکوێدا ئەمێنێتەوە (ئەوەستێت)؟ چونکە شوێنی تەنی هاورەگەز ناکۆتاییە، کەواتە ئایا ئەو لەتە خشتە هەموو شوێنەکە داگیر ئەکات؟ وە چۆن؟ کەواتە مانەوەو جوولەی ئەوچییە؟ یان لەهەمو شوێنێکدا ئەمێنێتەوە، کە لەو شێوەیەدا ناجوولێت، یان لەهەموو شوێنێکدا ئەجووڵێت، کە لەو حاڵەتەدا ناوەستێت، بەلاّم ئەگەر((گشت)) ناوەکییەك بێت، (واتە لە بەشەکانی خۆیدا.م.ف) کەواتە شوێنی(بەشەکانی) شی ناوەکییەك ئەبن، و ئەوکات یەکەم ((تەنی گشت)) یەکێك نیە، مەگەر لە رێگەی پەیوەندیەوە، و دووەم بەشەکان بە پێی جۆر یان کۆتادار ئەبن یان ناکۆتایی، بەلاّم ناتوانن کۆتادار بن، چونکە ئەوکات (ئەگەر گشت ناکۆتا بێت) هەندێك(لەبەشەکان) لەیەك جۆری خاوەن کۆتایی ئەبن، و هەندێك لە جۆرێکی تری ناکۆتایی نابن، بۆ نموونە ئاگر یان ئاو،(ناکۆتا ئەبن)بەلاّم توخمێکی ناکۆتایی لەم شێوەیە ئەبێتە هۆی لەناوچوونی دژەکانی توخمەکان، بەلاّم ئەگەر بەشەکان ناکۆتا و سادە بن، شوێنەکانیان ناکۆتاو هەروەها توخمەکانیشیان ناکۆتا ئەبن، بەلاّم ئەگەر ئەمە مەحاڵە، و شوێنەکان خاوەنی کۆتایین، کەواتە ((گشت))یش پێویستانە خاوەن کۆتایی ئەبێت.

بەگشتی مەحاڵە کە تەنێك ناکۆتا بێت و هەروەها شوێنێکیش بۆ تەنەکان بوونی هەبێت، ئەگەر هەر تەنێکی هەست پێکراو خاوەنی قورسی یان سووکیە(٢٥) چونکە ئەو(واتە تەنە ناکۆتاییەکە.م) یان ئەبێت بەئاراستەی سەنتەر بەرەو سەرەوە لە جووڵەدا بێت، بەڵام ئەگەری ئەوە نیە کە ناکۆتایی-چ گشت وە چ نیوە-یەکێك لەو دووانە ئەنجام بدات، چونکە چۆن ئەتوانی ئەوانە دابەش بکەیت، یان چۆن لە ناکۆتاییەوە بەشێك لەسەرەوەو بەشێك لە خوارەوە ، یان بەشێك لەکۆتایی سنوور و بەشێك لەنێوانەوە بوونی دەبێت؟ بەدەر لەمەش هەر تەنێکی هەست پێکراو لە شوێنێکی دیاری کراودایە بەڵام شوێنەکان شەش جۆرن، بەڵام بوونی ئەمانە لەیەك تەنی(٣٠) ناکۆتایی دا مەحاڵە، بە شێوەیەکی گشتی، ئەگەر بوونی شوێنێکی ناکۆتایی مەحاڵە، تەنی ناکۆتایش مەحاڵە، چونکە ئەوەی کە لەیەك شوێندایە، لە جێیەکدایە، و ئەمە بەڵگەیە لەسەر ((سەرەوە))یان((خوارەوە)) یان باقی شوێنەکانی تر، بەڵام هەریەك لەمانە بریتیە لە ئاستێك و سنوورێك.

بەڵام ناکۆتایی، وەك چۆن بڵێی سروشتێکی تاقانەیە، لە روانگەی گەورەیی(یان ئەستووری)) یان جووڵە یان کاتەوە، هەمان نیە، بەڵکو پاشکەوت بە پێی پێشکەوت ناوی ئەنرێت(ناکۆتایی)، بۆ نموونە جووڵە بە پێی ئەو ئەندازە دیاری کراوەی کە ئەجوڵێت یان لەناو ئەچێت، و زۆر ئەبێت،(ناوی ئەنرێت ناکۆتایی)و کات بە هۆی جووڵەوە (بەو شێوەیە ناو ئەنرێت).

## "وەرزی پانزەیەم"

# ( لەناوچوون و جووڵە، کورتەیەك لە کتێبی( ( سروشت ) )، کتێبی یەکەم، وەرزی پێنجەم )

((لەناوچوو-یان گۆڕاو to metaballon)) لە لایەکەوە دەرکەوتانە لەناو ئەچێت، وەك ئەوەی کە((مۆسیقاپ)) بە ڕێگادا ئەڕوات، و لەلایەکی ترەوە ئەگووترێت کە بە شێوەیەکی ڕەها، لەناو ئەچێت، لەو ڕووەوە کە شتێك لەودا ئەگۆڕێت، وەك ئەو شتانەی کە بە پێی بەشەکانیان لەناو ئەچن، چونکە بۆنموونە لەش، ساغە، بەو هۆیەی کەچاوەکان ،ساغن،(٥)بەڵام شتێکیش بوونی هەیە کە یەکەمجار خۆی لەخۆیدا دێتە جووڵە، و ئەم شتە ((جووڵێنەر لەخۆیدا))یە، مەسەلەی جووڵێنەریش هەربە هەمان شێوەیەیە، چونکە هەندێك جار دەرکەوتانە دێتە جووڵە، و هەندێ جار بە پێی بەشێك لەخۆی، و هەندێ جار((لەخۆیدا))، شتێکیش هەیە کە یەکەمجار (یان ڕاستەوخۆ) ئەمێنێتە جووڵە، و شتێکیش بوونی هەیە کە ئەبێت بە((جووڵێنراو))، و هەروەها کاتێك کە لەودا ئەجووڵێنرێت، و شتێك کە لەوەوە ئەجووڵێنرێت، و شتێك کە بەرەو ڕووی ئەو(بە ئاراستەی ئەو.و.ك) ئەجووڵێت،( واتە ما منە الحرکە و ما الیە الحرکە.و.ف)بەڵام(١٠) ئەو شێوە و کرداراندن و شوێنانەی کە جووڵێنراوەکان بەرەو ئەوان ئەجووڵێن، ئەجووڵاون، وەك زانست(ناسین) و گەرما، ئەمە گەرما نیە، بەڵکو ((گەرم کەرەوەیی))ە، کە جووڵەیە، لەناوچوون کە ((دەرکەوتانە)) نیە لە هەموو شتێکدا بونی نیە، بەڵکو لەدژەکاندا و نێوانیەکان و لە ئاهاوتاکاندایە، دڵنیایی لەم بارەیەوە لە ڕێگای ئیستقراوە بەدەست دێت.(١٥).

((لەناوچوو)) یان لەبابەتێکەوە بۆ بابەتێك لەناو ئەچێت، یان لە نابابەتێکەوە بۆ نابابەتێك، یان لە نابابەتێکەوە بۆ بابەتێك (مەبەستم لەبابەت،بەڵگێنراوی سەلمێنەرە) لەبەر ئەمە لەناوچوونەکان ،بەناچاری ئەبن بە سێ بەشەوە،(٢٠)چونکە ئەوەی کە لە نابابەتەوە بۆ نابەتە، لەناوچوون نیە، چونکە لێرەدا نە دژ هەیە وەنە ناهاوتا، لەو ڕووەوە کە بەرامبەرکێیەك بوونی نیە، هەنووکە لەناوچوون لە نابابەتەوە بۆ بابەت لە ڕێگای ناهاوتاییەوە هەمان پێك هاتنە، ئەویش لەناوچوونی ڕەهاییانە و پێکهاتنی ڕەهاییانە، و لەناوچوونی بەمەرج، دروست بوونێکی بەمەرجە، بەلأم لەناوچوون لە بابەتەوە بۆ نابابەت(واتە لە ئیجابیەوە بۆ سلبی) هەمان ((پەرت بوون–و لێك پچڕانە)) ئەویش لەناوچوونی ڕەهایی، هەمان((لێکپچڕانی ڕەهاییە))، و لەناوچوونی مەرجی، لێکپچڕانی مەرجیە، (٢٥) بەلأم لەبەر ئەوەی((نابوونەوەر))بە چەند جۆرێك ئەگوترێت، و نەك بە پێی تێکەڵ بوون یان دابەشەوە بێت، لەوانەیە جووڵە خواز بێت، نەك ئەوەی کە هێزەکیانە و بەرامبەرکێیانە بوونەوەری ڕەهاییە، (چونکە((نا–سپی)) یان ((نا–باش)) لەوانەیە دەرکەوتانە جووڵەخواز بن، چونکە((نا–سپی)) ئەیتوانی مرۆڤێك بێت، بەلأم ئەوەی کە بە ڕەهایی یەك((ئەم شتە)) نیە، بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت جووڵە خواز بێت.) کەواتە ((نا–بوونەوەر–نەبوو)) ئەگەری ئەوەی نیە کە بێتە جووڵە، (٣٠) بەلأم ئەگەر بەم شێوەیەیە، پەیدا بوونیش ناتوانێت جووڵە بێت، چونکە ئەمە((نابوونەوەر))ە کە دێتە بوون (یان ئەتوانێت ببێت)، چونکە ئەگەریش ئەو بە تەواوی دەرکەوتانە بێتە بوون، بەلأم هاوکات ڕاستە کە بڵێین((نابوونەوەر)) ئەتوانێت لەبارەی دروست بووەوە بە شێوەیەکی ڕەهایی ڕاست بکات، هەربەم شێوەیەش((وەستان))ەکەشی ناتوانێت پەیوەست بێت بە (( نابوونەوەر))ەوە،(٣٥)بەم شێوەیە نە تەنیا ئەم دژوارییانە دێنە سەر ڕێ، بەڵکو هاوکات(چەند مەسەلەیەکی وەك) ئەوەی کە ئەگەر هەر جوڵێنەرێك لە شوێنێکدایە،((نابوونەوەر)) لە یەك شوێندا نیە، چونکە ئەبێت لە جێیەکدا بێت، بەلأم لەناوچوون(لێك پچڕان)یش جووڵە نیە، چونکە دژی جووڵە یان جووڵەیەکی تر یان وەستانە، بەلأم لێکپچڕان(لەناوچوون) دژی دروست بوونە.

١٠٦٨a

هەنوکە کە هەر جووڵەیەك جۆرێکە لە، لەناوچوون، و ((لەناوچوو)) بە سێ جۆرە، کە گووترا، و لەمانە ئەوانەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ دروست بوون یان پەیدابوون و لێکپچڕاندان، لە ڕیزی جووڵەکاندا نین، چونکە ئەو دوجۆرە لەناوچوونانە لەریزی ناهاوتاکانن، کەواتە وەك پێویست تەنیا لەناوچوون لە بابەت(مووجەب) بۆ بابەت

جووڵەیە، (٥) بابەتەکانیش یان دژەکانن، یان نێوانیەکان (چونکە نەبوونیش ئەتوانێت ببێتە دژ) و لە رێگەی سەلماندنەوە دەرببڕێت، بۆ نموونە وەك((ڕووت))یان ((بێ ددان)) یان((رەش)).

"وەرزی دوانزەیەم"

# ( لەناوچوونی "لەناوچوون"[1] مەحاڵە، کورتەیەك لە کتێبی( ( سروشت ) )، کتێبی یەکەم، وەرزەکانی یەکەم و سێیەم )

هەنووکە ئەگەر گووتراوەکان، دابەش بن بۆ ((ناوەرۆك)) ،((چۆنایەتی)) ،((شوێن))،((کردار))یان ((کرداراندن))، ((خستنە سەر)) و((چەندایەتی))، کەواتە جووڵەکانیش بێگومان بۆ سێ جۆر دابەش ئەبن، (١٠) لە چۆنایەتی و چەندایەتی و شوێن،((بە پێی ناوەرۆك جووڵە بوونی نیە، چونکە ناوەرۆك هیچ دژێکی نیە)) و لە خستنە سەریشدا بونی نیە (چونکە لەوانەیە کە یەکێك لە دوو لایەنەکە لەناو بچن، ئەو لاکەی تر (لە خستنەسەر ئەمەدا) راست نەبێت، هەرچەند ئەم ئەوی ترەشیان لەناو نەچێت، لەبەر ئەمە جووڵەی سەرخراوەکان دەرکەوتانەیە) لە((بکەر poiountos))و((بکەرێنراو paskhontos)) یان ((جووڵێنەر kinountos)) و ((جووڵێنراو kinoumenon))یش (جووڵە بوونی نیە)،چونکە(١٥) جووڵەی جووڵە و دروست بوونی دروست بوون و بە شێوەیەکی گشتی لەناوچوونی لەناوچوون بوونی نیە، چونکە جووڵەی جووڵە تەنیا بە دوو جۆر ئەتوانێ هەبێت:١_یان جووڵە هەروەك بابەتی جووڵە( وەك مرۆڤ کە ئەجووڵێت،چونکە لە سپیەوە بۆ رەش ئەگۆڕێت، بەو شێوەیەی کە لەم بارەیەوە

---

[1] ئەتوانین بڵێن [گۆڕانی گۆڕان] چونکە واژەکانی((لەناوچوون))و((گۆڕان))لە لای ئەرستۆ زۆر تێکەڵ و هاومانان لە زۆر شوێندا.

جووڵەش ئەتوانێت سارد یان گەرم بێت، یان شوێنگۆرکیێ بکات، یان زیاد ببێت، بەڵام شتێکی(٢٠) لەم شێوەیە مەحاڵە، چونکە لەناوچوون جۆرێك نیە لە بابەت)، یان ٢_ئەوەی کە بابەتێکی تر ئەتوانێت لەیەك لەناوچوونەوە بە شێوەیەکی تر لەناو بچێت، بۆ نموونە مرۆڤێك لە نەخۆشیەوە بۆ تەندروستی، بەڵام ئەمەش بێ لە دەرکەوت ئەگەری نیە، چونکە هەر جووڵەیەك، لەناوچوونە لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر، لەبارەی پەیدابوون و لەناوچوونیشەوە بەهەمان شێوەیەیە،(٢٥)جگە لەوەی ئەمانە(لەناوچوونەکان) لە بەرامبەرکێکاندا بەیەك شێوەن، بەڵام جووڵە لەناوچوونێکە (لە بەرامبەرکێکاندا) بە شێوەیەکی ترە،(واتە لە دژەدا.و.ف) بەم شێوەیە شتێك هاوکات لە تەندروستیەوە بۆ نەخۆشی لەناوئەچێت، ولەم خودی لەناوچوونەوە بۆ شتێکی تر ئەگۆڕێت، کەواتە ڕوونە کە ئەگەر نەخۆش کەوتووە، لەناوچوو بە جۆرێکی تر، هەرچی بێت، بوونی دەبێت (چونکە لەوانەیە نەجووڵاو بێت) ئەویش هەمیشە نەك لەناوچوونێکی لەپڕ و لەناکاو، و ئەو لەناوچوونەش لە شتێکی دیاری کراوەوە(٣٠) بۆ شتێکی دیاری کراوی تر ئەبێت، لەبەر ئەمە دەبوو لەناوچوونێکی بەرامبەرکێیانەوە (دژانە) لەگەڵ ئەودا بوونی هەبووایە، واتە تەندروست بوون، بەڵاّن(ئەڵێین)ئەم لەناوچوونەی ئەم بە شێوەیەکەی دەرکەوتانەیە، بۆ نموونە وەك ئەوەی کە شتێك لە((بەیادهێنانەوە))وە بگۆڕێت بۆ ((لەبیرچوونەوە))، چونکە بابەت پەیوەستە بەو لەناوچوونەوە، هەندێ جار لەڕوانگەی زانستەوە، هەندێ جاریش لە ڕوانگەی نەزانینەوە.

١٠٦٨b

زیاد لەمەش،ئەگەر لەناوچوونی لەناوچوون، و دروست بوونی دروست بوون(٣٥) بوونی هەبێت، گووزەرەکە تا ناکۆتا بەردەوامی دەبێت، چونکە ئەگەر بڕیار لەبارەی ((دروست بوونی دواتر)) ڕاست بێت، بێگومان لەبارەی ((دروست بوونی پێشتر)یشەوە هەر ڕاست ئەبێت، بۆ نموونە ئەگەر دروست بوونی ڕەها، لە کاتێکدا دروست بووە، بێگومان((دروست بووی ڕەها))ش بوونی دەبێت، لەبەر ئەمە دروست بووی ڕەها هەنووکەیی نابێت، بەڵکو دروستبوویەکی لەپێشتر بووە، و ئەمەش کاتێك دروست بووبێت، بەو شێوەیەی کە لەوکاتدا هێشتا دروست نەبووە، بەڵام لەوێوە کە ناکۆتایی سەرەتایەکی نیە، لەم بارەیەشەوە((یەکەمینێك-سەرەتایەك)) بوونی نابێت،(٥)،لەبەر ئەمە ((بەدواداهاتوویەك))یش بوونی نابێت، بەم شێوەیە نە ئەگەری ئەوە هەیە کە شتێك بێتە بون، وە نە بجووڵێت، وە نە شتێك لەناو بچێت.

هاوکات ئەوەی کە خاوەنی جووڵەیە، خاوەنی جووڵەیەکی دژ و وەستانیشە، و ئەوەی ((دروست بوون))ی هەیە،((لەناوچوون))یشی هەیە، لەبەر ئەوە دروست بوو کاتێك کە دروست بووە، لەو کاتەدا لە لەناوچووندایە،(کە قسەیەکی بێ مانایە.و.ف) بەلأم بەدی هێنەر نە یەکسەر (لەناو ئەچێت) و نە لە دوای(١٠) ئەوەش، چونکە لەناوچوو نەبێت((هەبێت))..(یان هەست بکرێت.و.ك).

زیاد لەمەش، دروست بوو، و گۆڕاو ئەبێت خاوەنی مادەیەکی بابەتی بێت، کەواتە ئەو(دروست بووە) چیە؟ چیە ئەو دروست بووەی کە رێك بە هەمان شێوەی جووڵە و دروست بوون ئەتوانێت هەبێت هەروەك تەن یان رۆح کە شتانێکی گۆڕاون؟ و هاوکات ئەوە چیە کە ئەمانە بەرەو ڕووی ئەو ئەجووڵێن چونکە جووڵە یان دروست بوون ئەبێت پەیوەست بن بە شتێکی دیاری کراوەوەو و لە شتێکی دیاری کراوەوە بۆ شتێکی دیاری کراو بن، بەلأم ئەمانە لەم بارەیەوە چۆن ئەگەریان هەیە؟ چونکە فێربوونی فێربوون ،بوونی نیە،(١٥) لەبەر ئەمە دروست بوونی دروست بوونیش ناتوانێت بوونی هەبێت.

کەواتە لەوێوە کە(جووڵە) نە لە ناوەرۆکدا، و نە لە خستنە سەردا، نە لە کرداردا و نە لە کرداراندندا بەدەست دێت، (تەنیا ئەم)ە ئەمێنێتەوە کە جووڵە بە پێی چۆنایەتی و چەندایەتی و شوێنەوە بەدەست دێت، چونکە هەریەك لەمانە دژێکیان هەیە، مەبەستم لە چۆنایەتی لێرەدا ئەوە نیە کە لە ناوەرۆکدا بەدەست بێت، (چونکە جیاوازیش بۆ خۆی چۆنایەتیەکە) بەڵکو مەبەستم((کرداراندن))ێکە، کە بە پێی ئەو ئەگووترێت،(٢٠) شتێکی ئەکردارێنرێت، یان((کارتێکراوapathes )).

((ئەجوولأو))لەلایەکەوە ئەوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی ناتوانێت بێتە جووڵە، و لە لایەکی ترەوە ئەوەیە کە بە دژواری لەکاتێکی درێژدا ئەکەوێتە جووڵە یان بە خاوی دەست بەجووڵە ئەکات، یان ئەوەیە کە سروشتانە ئەتوانێت بێتە جووڵە، بەلأم بەتوانا نیە کە لەو کاتەدا و بەو شێوەیە کە لە سروشتدا هەیە، بێتە جووڵە، من تەنیا ئەم جۆرەی کۆتایی لە ((جووڵە نەخوازەکان)) ناو ئەنێم((وەستان))، چونکە ((وەستان)) دژی ((جووڵە))یە، و لەبەر ئەمە(٢٥) ئەبێت ((نەبوون))ێك لە شتێکدا هەبێت کە جووڵەخوازە.

شتانێك بە پێی شوێن پێکەوەن، کەلە یەك((شوێنی یەکەمین-سەرەتا))دا بەدەست بێن، و شتانێك((جیا))ن کە کە لە شوێنەکانی تردان، شتانێك((لەپەیوەندی لەگەڵ یەکدان))،کە سنوورەکانی کۆتاییان پێکەوە بەستراوە، بەلأم((نێوان))ی ئەوەیە کە لە شتە لەناوچووەکە بە شێوەیەکی سروشتی زووتر پێی ئەگات،-ئەم لەناچووە، لەسەر

بنـەمای سروشـتەکەی بـە شـێوەیەکی پێکـەوەلکاو لـەناو ئەچـێت-تابـە کۆتـایی سـنوورکە،((دژ بـە پێـی شـوێن))(٣٠) ئـەو شـتەیە کـە لـە هێڵـی راسـتدا، لـەدوورترن دووریەوەیە،((لەدوا)) ئەو شتەیە کە لەدوای ((سەرەتا))وەیە( چ لە روانگەی بارودۆخەوە و چلە روانگەی شێوە و چ بە جۆرێکی تر دیاری کرابێت)، و هیچ ((نێوانێك)) لەهـەمان رەگـەز کـە ((لـەدوا)) پەیوەسـتە پێیـەوە، بـوونی نیـە، وەك چـەند هێلێـك (لـەدوای)چـەند هێلێکـەوە یـان یـەکێك لـەدوای یەکێکـەوە، یـان خانوویـەك(لـەدوای) خانوویەکـەوە، بـەلاَم شتێك نابێتە بەربەست لەوەی کە شتێك(لە رەگەزێکی تر) ببێتە نێوان،(٣٥) چونکە((لـە دوا)) لەدوای شتێکەوە دێت و شتێکی پاشکۆییانەیە، چونکە نە یـەك لـە دوای دووەوە دێت و نە رۆژی (یەکەم) مانگی نۆ لەدوای رۆژی دووەمەوە،

١٠٦٩a

بەلاَم ئەوشتەی کە لەگەڵ ((لەدوا))لە پەیوەندیدایە،((لکێنراو))ە، بەلاَم لەوێوە کە هەر گۆڕانێـك لـە بەرامبەرکێکانـدا ڕوو ئـەدات، و ئەمانـەش دژەکـان یـان ناهاوتاکـانن،(٥) و ناهاوتاکانیش ئاستێکی نێوەندی یان نیە، کەواتە ڕوونە کە((نێوان)) تـەنیا لـە دژەکانـدا بەدەست دێت و بوونی هەیە،(٥) ((پێکـەوە بەسـتراو)) وەك جۆرێك لـە ((لکێنـراو))ە، من کاتێك دوو شت ناو ئەنێم بەوەی کە((پێکەوە بەستراون)) کە سنورەکانیان، بـەو شـێوەیە لەگەڵ یەکتری دا لە پەیوەندیدان و پێکەوە ئەپارێزرێن، بێن بە یەکێك و بە هـەمان، لەبـەر ئەمـە ڕوونـە کـە ((پێکـەوە بەسـتراو)) لـەو جـۆرە شـتانەدا بەدەسـت دێـت، کـە بـەهۆی پەیوەندی ئەوانە پێکەوە،((یەك شت)) دروست ئـەبێت، و ئـەوەی کـە((پێکـەوە بەسـتراوی یەکـەمین))ی ئـەم جـۆرە شـتەیە، ڕوونـە، چونکە((لـەدوا))پێویـست ناکـات لـە پەیوەندیـدا بێـت،(١٠) بـەلاَم ((لـەدوا)) لـە پەیوەندیدایـە، و ئەگـەر شـتێك پێکـەوە بەسـتراوە، لـە پەیوەنـدی دایـە، بـەلاَم ئەگـەر لـە پەیوەنـدی دایـە، هەنوکـە پێویـست ناکـات کـە پێکـەوە بەسـتراو بێـت، بـەلاَم لـەو شـتانەی کـە پەیوەنـدی بـوونی نیـە، لەوانـدا((هـاو-ڕووان sumfusis))یش بەدەست نایەت، لەبەر ئەمە((خاڵ))و((یەك))ایـەتی هـەمان نین، چونکە لە ((خاڵەکاندا)) پەیوەندی بوونی هەیە، بەلاَم لە((یـەك))ایەتیەکانـدا-یەکەکانـدا- بـوونی نیە، بەڵکو بۆ ئەمانە((لەدوا))یی بوونی هەیە، لـەلای خاڵـەکان شـتێکی نێوانی بەدەست نایەت، بەلاَم لەلای یەکەکان بەم شێوەیە نیە.

## "وەرزی یەکەم"

# ( نـاوەرۆك و جۆرەكـانی )

١٠٦٩a

ئەمـەش تێـڕوانین و پێداچـوونەوەیە لـەبارەی ((نـاوەرۆك))، لەبـەر ئـەوەی بنـەماكان ،هۆكاری ئەو ناوەرۆكانەن كە بە دوایاندا ئەگەڕێن، لەبەر ئەوە ئەگەر ((هەموان)) هـەروەك جۆرێك لە ((گشت))بن(٢٠) ناوەرۆكی یەكەمین بەشێكە لەو، و ئەگەر لـە روانگـەی یـەكێك لـە دوای ئـەوی تـرەوە سـەیری بكرێـت ،ناوەرۆكیش هەربـەم شـێوەیە یەكەمینـە، پاشـان چۆنایەتی و لەدوای ئەوەش چەندایەتیە، بەڵام لەهەمان كاتدا ناتوانرێت ئەوە بووترێت كـە ئەمانـە بـە شـێوەیەكی ڕەهـا بوونـەوەرن(بوونیـان هەیـە) بـەڵكو چـۆنایەتیەكان و جووڵەكان(پەیوەستن بە ناوەرۆكەكانەوە) و ئەگەرنا((نا-سپی)) و((نـا-راسـتەوخۆ))یـش بوونیان دەبوو، بەهەر حاڵ بەمانەش ئەڵێین كە((هەن))، وەك ئەوەی كە ئەڵێین ((نا-سپی هەیـە))،هاوكـات هـیچ یـەك لـە بـاقی((گوتراوەكـانی))تـر بـە((جیـا-سـەربەخۆ) بوونیـان نیە،(٢٥) پێشینانیش بە شێوەیەكی كردارەكی شایەتن لەسەر ئەمە، چونكە ئەمانیش بە دوای بنەماوهۆكار و ناوەرۆكەكاندا ئەگەڕان، بەڵام فەیلەسوفەكانی هەنوكە[1] زیاتر(( شتە گشتیەكانta kathoiou)) بە بنەما ئەزانن، چونكە رەگەزەكان گشتین، و ئەمان ئـەڵێن كـە ئەمانـە زیـاتر بنـەما و نـاوەرۆكن، لـەو ڕووەوە كـە گـەڕانی ئـەمان بـە شـێوەیەكی

[1] مەبەست لە پەیڕەوانی ئەفلاتونە كە هاوسەردەمی ئەستۆ بوون.

ڕەهاییانەیە، بەڵام پێشینان((تاك شتەکان-اشیئ منفرد یان جزئیات))ی وەك ئاگر و خاکیان بە ناوەرۆك ئەژمار ئەکرد،نەك ((تەن بەگشتی)).(٣٠).

بەڵام((ناوەرۆك)) بە سێ جۆر هەن:

- ناوەرۆکی هەست پێکراو، کە لەم جۆرەدا هەندێکیان جاویدان(سەرمەدین aldios)) و هەندێك لەناوچووخواز، لە قبوڵ کردنی ئەم ناوەرۆکەی کۆتاییدا،-بۆ نموونە گیاکان و گیانەوەران- هەموویان هاوڕان، پێویستە کە توخمەکانی ئەمانە بدۆزینەوە، چ یەکێك بن و چ زۆر.
- ئەوی تر ناوەرۆکی نەجووڵاوە، هەندێك ئەڵێن کە ئەمیان بەجیا بوونی هەیە، و هەندێکی تر ئەو بۆ دوجۆر دابەش ئەکەن(٣٥).
- هندێکیش شێوەکان و شتە بیرکارییەکان لە سروشتێکی تاقانەدا ئەژمار ئەکەن، و هەندێك تەنیا شتەکانی بیرکاری لەم سروشتە ئەژمار ئەکەن، ئەو دوو ناوەرۆکەی یەکەمین پەیوەستن بە زانستی سروشتیەوە(چونکە جوڵەیان لەخۆیاندا هەیە) بەڵام ئەم ناوەرۆکەی کۆتایی پەیوەست نیە بە زانستێکی ترەوە[1]، ئەگەر هەرسێکیان خاوەنی بنەمایەکی هاوبەش نەبن.

١٠٦٩b

بەڵام ناوەرۆکی هەست پێکراو ((لەناوچوو))ە (واتە لەناو ئەچێت.و.ك)، هەنووکە ئەگەر گۆڕان لە بەرامبەرکێکان یان لە(نێوان)یەکان، ئەویش نەك لەهەر بەرامبەرکێیەکەوە،(٥) (چونکە ئاوازیش((سپی نیە))...)،بەڵکو تەنیا لە دژەوە ڕوو ئەدات، کەواتە ئەبێت شتێك بابەت بێت، تابگۆڕێت بۆ دژ، چونکە((دژەکان)) ناگۆڕێن.

[1] واتە بە فەلسەفەی یەکەمینەوە.

"وەرزی دووەم"

# ( مـــــــادە و گۆڕان )

بـەردەوام شـتێکیش هەیـە کـە لـە شـوێنی خۆیـدا ئەمێنێتـەوە(واتـە لـە گـووزەری گۆڕانـدا.و.ف)، بـەلأم دژی جـێگیری نیـە، کەواتـە شـتێکی سـێهەمی لـەپاڵ و بـەدەر لـە دژەکـان بـوونی هەیـە کـە هـەمان((مـادە=هیـولی))یـە،(١٠) بـەم شـێوەیە ئەگـەر گۆڕانـەکان چوارینەن، یان لەروانگەی شتێکەوە(واتە ناوەرۆك to ti))یان لەروانگەی چۆنایەتی یـان چەندایەتی یان شوێنەوە، و ئەگەر گۆڕان لە روانگەی ((ئـەم شـتە))وە دروسـت بـوون یـان لەناوچـوونی ڕەهایـە، و گـۆڕان لـە روانگـەی چـەندایەتی، زیـادکردن یـان ڕووان و کـەم کردنـەوە(ftthisis) و گـۆڕان لەروانگـەی کرداراندنـەوە((ئـەوی تـر بـوون))ە، و گـۆڕان لەروانگەی شـوێنەوە، جووڵـەی((گوازتنەوەیـە))، کەواتـە((گۆڕانـەکان hai metabolai)) بە پێـی هـەر بوارێـك ئـەبێت لەدژەکانـدا ڕوو بـدەن، لەبـەر ئەمـە(١٥) بێگومـان مـادە لـەو ڕووەوە کە ئەگەر هەردو دژەکەی هەیە، ئەبێت لەناو بچێت، بەلأم لەوێوە کـە((بوونـەوەر)) بە دو شێوەیە، هەر شتێك لە بوونەوەری هێزەکیەوە بۆ بوونەوەری کردارەکی ئـەگۆڕێت، بۆ نموونـە لـە سپی هێزەکیانـەوە بـۆ سپی کردارەکییانـە(و لـەبارەی زیـاد کـردن و کـەم کردنیشەوە هەربەم شێوەیەیە) لەبەر ئەمە دروست بوونەکان نە تەنیا دەرکەوتانە لە((نا-بوونـەوەر))ەوە ئەگـەری هەیـە، بەڵکو هاوکـات هـەموو شـتەکان لـە((بوونـەوەر))ەوە دێنـە بوون، کە بە هـەرحاڵ هێزەکیانـە بوونیـان هەیـە، بەلأم((کردارێتـی)) بـوونی نیـە(یـان نـا-بوونـــەوەرە)(٢٠) و ئەمـــە هـــەمان((''یـــەك''ەکـــەی ئاناکـــساگۆراس))ە،چـــونکە لـــەجیاتی گووتەکەی ئەو کـە((هـەموو شـتەکان پێکـەوە بوون))و هـەروەها((تێکهەڵکێشراو))یەکـەی ((ئیمپێدوکلێس))و((ئاناکسیماندروس))و تیۆریـەی((دیموکریتـوس))باشـتر وایـە بڵێین:

((هەموو شتەکان هێزەکیانە پێکەوە بوون، نەك کردارێتیانە))بەم شێوەیە لە مانای((مادە)) تێگەیشتبوون، هەموو ئەو شتانەی کە ئەگۆڕێن، خاوەنی مادەن(٢٥) بەلاّم ئەم(مادانە) جیاوازن)، شتە جاویدانەکانیش، ئەوانەی کە دروست نابن، بەلاّم جوولێنراون بە جوولەیەکی گوازتنەوەیی، هەموویان خاوەنی مادەن، بەلاّم نە مادەی پێکهێنەر یان دروست بووخوازن، بەڵکو(مادەیەك) بۆ(جوولە) لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك.

بەلاّم ئەکرێت بپرسرێت کە لە جۆرە((نا-بوونەوەرێکەوە)) دروست بوون ڕوو ئەدات، چونکە((نابوونەوەر)) بە سێ جۆرە، ئەگەر شتێکی هێزەکیانە بونی هەیە، لە شتێکەوە دێتە بوون کە هێزەکیانەیە، بەلاّم نەك هەر هێزەکیەکی لەناکاو لەپڕ، بەڵکو شتە جیاوازەکان لە شتە جیاوازەکان دێنە بوون،(٣٠) و هەروەها بەس نیە کە بووترێت ((هەموو شتەکان پێکەوەن)) چونکە ئەوان لە ڕوانگەی مادەوە جیاوازن، و ئەگەر نا بە چ شێوەیەك شتەکان، ناکۆتایانە هاتونەتە بوون، و یەك دانە نین؟((چونکە ئەقڵ یەکێکە))بەو شێوەیەی کە ئەگەر((مادە))ش ((یەك))ێك بووایە، ئەو شتە دەبوو بە کردارێتی کە مادەکەی هێزەکییانەیە ، کەواتە هۆکارەکان و بنەماکان سێ جۆرن، دووان لەوانە دژن (واتە دوو دژ) کە یەکێك لەم دووانە مانا(یان پێناسە) و شێوەن، و ئەوی تر ((نەبوون))ە، و سێهەمیشیان((مادە))یە.

" وەرزی سێهەم"

# ( مادەو شێوە لە دروست بووندا )

١٠٧٠a

خاڵێکی تر ئەوەیە کە نەمادە و نە شێوە(مەبەستم مادەو شێوەی کۆتاییە)، دروست بونیان نیە، چونکە هەر شتێك لە شتێکەوە و بەیارمەتی شتێك و بۆ شتێك ئەگۆڕێت، ئەوەی کە بە یارمەتی ئەو شتە ئەگۆڕێت،((پاڵنەری یەکەم))ە، ئەوەی کە ئەگۆڕێت مادەیە، و ئەوەی کە بۆی ئەگۆڕێت، شێوەیە، بەم شێوەیە گوورزەرەکە ناکۆتا ئەبێت، بۆ نموونە ئەگەر کە برۆنز نەتەنیا بە شێوەیەکی خڕ دەربێت، بەڵکو هاوکات ئەگەر خڕی و برۆنزیش شتانێکی دروست کەر بن، کەواتە ئەبێت خاڵێکی وەستان بوونی هەبێت.

دیسانەوە خاڵێکی تر ئەوەیە کە هەر((تاك شت))ێك(٥) لە هاوناوەوە پێك دێت، چونکە هەم شتە سروشتیەکان (لە ریزی) ناوەرۆکەکانن و هەم باقی شتەکانی تر،شتەکان یان بە یارمەتی هونەرەوە دێنە بوون، یان بە سروشتی یان خۆلەخۆ، بەلاّم هوونەر((بنەما))یەکە لە شتێکی تردا، و سروشت، بنەمایەکە لە خودی شتەکەدا،(چونکە مرۆۆ ئەزێت) ،بەلاّم باقی هۆکارەکانی تر((نەبوونێتی))یەکانی ئەمانن.

بەلاّم((ناوەرۆکەکان)) سێینەن:

- یەکێك((مادە))یەو کە بە شێوەیەکی ناشکرا ((ئەم شت))ێکە (١٠)(چونکە هەر شتێك بە یارمەتی ((پەیەندیەوە)) بوونی هەیە ،نەك بەیارمەتی ((هاو-ڕووان))ی،مادەو شێوەوە)، وەك(٢٠) ئاگر و گۆشت و سەر،چونکە هەموو ئەمانە مادەن و کۆتا مادەی پەیوەست بە ناوەرۆك، تایبەتی ترین مانایەتی.

- دووەم ((سروشت))ە کە ((ئەم شت))و خەسڵەتێکی پایەدارە کە(ناوەرۆکی مادی) ئەگاتەوە بەو (واتە شێوە.و).
- سێیەم تێکەڵەیەك لەهەردووکیانە، کە هەمان تاك شتەکانن، وەك((سوقرات))یان((کالیاس)). هەنووکە لە هەندێك لە بوارەکاندا، ((ئەم شتە)) لەپاڵ و جیا لە ناوەرۆکی تێکەڵ بوونی نیە،(بۆ نموونە وەك شێوەی خانوو، ئەگەر هوونەری بیناسازی نەبێت، و هەروەها دروست بوون و لەناوچوون بۆ ئەم شێوانە نیە، بەڵکو بە شێوەیەکی ترە کە ((خانوو))و((تەندروستی))(١٥)ی بە بێ مادە و هەر شتانێك کە بە دوای پیشەگەریەوە دێت، ئەڵێین کە((هەن))یان((نین))..) بەلآم ئەگەریش بوونی هەبێت، تەنیا لەبارەی شتە سروشتیەکانەوەیە، بەم هۆیەوەیە((ئەفلاتوون)) زۆر نارەواش نەیگووتووە، کە بە ژمارەی شتە سروشتیەکان، شێوەکان یان ئایدیەکانیش بوونیان هەیە، بەو مەرجەی کە(٢٠) بە هیچ جۆرێك، شێوەگەلێکی بەدەر لە شتە سروشتیەکاندا بوونیان هەبێت.

هۆکارە پاڵنەرییەکانی هەروەك بوونەوەرە لە پێشدا هەبوەکان، بوونیان هەیە، بەلآم ئەو هۆکارانەی کە هەروەك مانا (یان پێناسە)ن هاوکات لەگەڵ هۆکارێنراوەکانن، چونکە ئەوکات کە مرۆڤ تەندروستە، تەندروستیش ئەوکات بوونی هەیە، و شکڵی گۆی برۆنزی هاوکات لەگەڵ گۆی برۆنزیدا بوونی هەیە، (بەلآم ئەوەی کە ئایا شتێك (لەم شێوانە)لەدوای (لەناوی چوونی تێکەڵەی ئەو دووانە) ئەمێنێتەوە، بابەتێکە کە ئەبێت توێژینەوەی لەسەر بکرێت)(٢٥) چونکە بە هەندێك لە شتەکاندا هیچ شتێك بەربەست نیە لەبەردەم ئەم مەسەلەیەدا، بۆ نموونە ئەگەر دەروون(رۆح) بەم شێوەیە بێت،(لەگەڵ ئەوەشدا نەك هەمووی،بەڵکو"ئەقڵ"..)چونکە مانەوەی هەموو رۆح تارادەیەك مەحاڵە (ئەگەری نیە).

کەواتە ڕوونە کە بە یارمەتی ئەم بەڵگانە پێویست بە بوونی((ئایدیە))یەك ناکات، چونکە مرۆڤ مرۆڤ ئەزێنێت، و تاکیش، تاکێك، و لەبارەی باقی هوونەرەکانی تریشەوە هەربەم شێوەیەیە، چونکە هوونەری پزیشکی(٣٠) هەمان مانای(واتە هۆکاری شێوەیی) تەندروستیە.

"وەرزی چوارەم"

# ( هەمانبوونی و جیاوازی هۆکارەکان و بنەماکان )

هۆکارەکان و بنەماکان بەیەك جۆر بۆشتە جیاوازەکان ،جیاوازن، و بە جۆرێکی تر، ئەگەر کەسێك بە شێوەیەکی گشتی و بە پێی گوونجاوی قسان بکات، بۆ هەموو شتەکان هەمانن، لەوانەیە کەسێك گوومانی ئەوە بکات کە ئایا بنەماکان و توخمی ناوەرۆکەکان و سەرخراوەکان(٣٥) و بەم شێوەیە هەریەك لە گووتراوەکانی تر، هەمانن یان جیاوازن، بەلاّم بێ ماناییە کە ئەگەر ئەوانە بۆ هەموویان هەمان بن، چونکە ئەوکات سەرخراوەکان و ناوەرۆك پێکهاتوویەك لەهەمان توخمەکان ئەبن، هەنوکە ئەم توخمە چیە؟

١٠٧٠b

چونکە لەپاڵ ناوەرۆك و هەڵگیراوەکانی تر هیچ شتێکی هاوبەش بوونی نیە، بەلاّم توخم لە پێش ئەوەوەیە کە(خودی) توخمە(پێکهێنەرەکەی) ئەوە، بەلاّم هاوکات نە ناوەرۆکی توخم سەرخراوە و نە ئەم توخمە ناوەرۆکە، زیاد لەمەش چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە هەموو شتەکان خاوەنی هەمان توخم بن؟(٥) چونکە هیچ یەکێك لە تووخمەکان ناتوانن لەگەڵ شتێکدا کە لەگەڵ توخمدا تێکەڵە، هەمان بێت، بۆ نموونە((با)) نە هەمان((ب))یە و نەهەمان((ا))، (کەواتە هیچ یەك لە((ئەقڵێنراوەکان)) وەك((یەك))یان ((بوونەوەر))یش توخم نیە، چونکە ئەم دووانە لەسەر هەریەك لە تێکەڵ بووەکانیش راست ئەبن-واتە بە پێی هەریەکەیان) ، لەبەر ئەمە هیچ یەك لە توخمەکان نە ناوەرۆکن و نە سەرخراو، بەلاّم پێویستانە یەکێکە لەو دووانەیە، کەواتە هەموو گووتراوەکان خاوەنی هەمان توخم(١٠) نین.

یان به پێی گووتەکەی ئێمە بە جۆرێك( خاوەنی هەمان توخمن) و بە جۆرێکی تر نا، بۆ نموونە لەوانەیە توخمی تەنە هەست پێکراوەکان، هەروەك ((شێوە))،(توخمی)گەرم کەرەوە بێت و بە شێوەیەکی تر(توخم) سارد بێت کە ((نەبوونی)) ئەوە، بەلاّم هەروەك ((مادە)) ئەو شتەیە کە سەرەتا و لەخۆیدا، هێزەکیانە هەردووکیانە، بەلاّم ناوەرۆکەکانیش هەم ئەم توخمانەن و هەم ئەم شتانەی کە لەم توخمانەوە تێکەڵ بوون و ئەم توخمانە بنەماکانی ئەوانن، یان هەر شتێك کە هەروەك(( "یەك"ێتیەك)) لە سارد و گەرم دێتە بوون،(١٥)بۆ نموونە وەك گۆشت یان ئێسقان، چونکە شتە دروست بووەکە بێگومان ئەبێت بەدەر بێت لەوانە، کەواتە ئەم شتانە، خاوەنی هەمان توخم و بنەماکانن، هەرچەند یەکێك شتێکی بەدەر لەوی ترە،بەلاّم ناتوانین ئەوە بڵێین کە هەموو شتەکان بەم مانایە خاوەنی هەمان توخمەکانن، بەلاّم بە شێوەیەکی بەراوردکردنانە ئەتوانین بڵێین کە بەم شێوەیەیە، بۆ نموونە وەك ئەوەی کە کەسێك بڵێت، کە بنەماکان سێ جۆرن: ((شێوە))،((نەبوون))،((مادە))، بەلاّم هەریەك لەمانە لە بارەی هەر ناوەرۆکێکەوە جیاوازە،(٢٠) بۆ نموونە لەبارەی رەنگەکانەوە، سپی، رەش و ئاستەکانن، یان لەگەڵ ئەوەشدا ڕووناکی، تاریکی و هەوایە کە ئەمانە رۆژ و شەو دێنە بوون.

بەلاّم لەوێوە کە هۆکارەکان نەتەنیا(توخمەکان یان بەشە)((لە دەروونداا))یەکانی یەك شتن، بەڵکو لە دەرەوەشەوە شتێکی هەروەك پاڵنەر دێتە ئاراوە، ڕوونە کە بنەما و توخم جیاواز ئەبن، بەلاّم هەردووکیان هۆکارن، و((بنەما)) بۆ ئەم دووانە دابەش ئەبێت،(٢٥) ئەوەی کە پاڵنەر یان پاڵنەری وەستانە و لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێکە لە بنەماو ناوەرۆك، لەبەر ئەمە بە شێوەیەکی بەراوردیانە، توخمەکان بە سێ جۆرن، بەلاّم هۆکارەکان و بنەماکان چوارینەن، بەلاّم(توخمەکان) لە شتە جیاوازەکاندا جیاوازن، و هۆکاری یەکەمین هەروەك پاڵنەریش لە شتە جیاوازەکاندا جیاوازە، تەندروستی و نەخۆشی و تەن، پاڵنەر لەمانەدا هوونەری پزیشکیە، یان: شێوە، نارێکخستنێکی لەم شێوەیەیە، و خشتەکان، پاڵنەری هوونەری بیناسازین.

(٣٠) بەلاّم لەوێوە کە لە شتە سروشتیەکاندا، هۆکاری پاڵنەر، بۆ نموونە بۆ مرۆڤ، مرۆڤە، بەلاّم لەو شتانەی کە لەدایك بوونی بیرکردنەوەن، (هۆکاری پاڵنەر) شێوە یان دژایەتی، کەواتە بە یەك شێوە هۆکارەکان ئەتوانن سێینەو بە شێوەیەکی تر چوارینە بن، چونکە، هونەری پزیشکی بە جۆرێك تەندروستیە، و هوونەری بیناسازی شێوەی خانووە، و مرۆڤ مرۆڤ ئەزێنێت، هاوکات لەپاڵ ئەمانەدا ئەو شتەیە(٣٥)((کە هەروەك یەکەمینی هەموو شتەکان پاڵنەری هەموو شتەکانە)).

## "وەرزی پێنجەم"

## (تواناداریێتی و کرداریێتی-هێز و کردار-هەروەك بنەما و هۆکار)

١٠٧١a

بەڵام لەوێوە کە هەندێك لە شتەکان بەجیا(یان سەربەخۆ) و هەندێك بە جیا بوونیان نیە، ئەو یەکەمینانە لەریزی ناوەرۆکەکانن، و بەم هۆیەوە هەموو شتەکان خاوەنی هەمان هۆکارەکانن، چونکە بە بێ ناوەرۆکەکان، کرداراندنەکان و جووڵەکان بوونیان نیە، پاشان ئەم هۆکارانە ئەتوانن تا رادەیەك رۆح و جەستە، یان ئەقڵ و شەهوەت و جەستە بن، هاوکات بە شێوەیەکی تر، بە پێی هاوشێوەیی، بنەماکانیش هەمانن، واتە هەمان تواناداریێتی و کرداریێتی: بەڵام ئەمانەش بۆ شتە جیاوازەکان جیاوازن و لە چەند روانگەیەکی جیاوازەوە جەخت (٥) ئەکەنەوە لەسەریان، چونکە لە هەندێك بواردا((هەمان شت هەندێ جار بوونی هەیە و هەندێ جار هێزەکیانە)) وەك شەراب، و گۆشت و مرۆڤ، (چونکە ئەمانە لە ژێر هۆکارە ناوبراوەکانەوە بوونیان هەیە، چونکە شێوە ،کاتێك کردارەکیانە بوونی هەیە، کە جیا بێت، و هەربەم جۆرەشە بۆ تێکەڵە لە مادە و شێوە و هەروەها ((نەبوون))یش، بۆنموونە وەك تاریکی یان نەخۆشی(١٠)،مادە، بەڵام هێزەکیانە بوونی هەیە، چونکە توانای ئەوەی هەیە کە هەردووکیان بێت) بەڵام بەجۆرێکی ترە جیاوازی نێوان کرداریێتی و هێزەکێتی لەبارە شتانێك کە مادەی (هۆکار و هۆکارێنراو) لەواندا هەمان نیە، و لەهەندێك بواردا شێوە هەمان نیە ،بەڵکو جیاوازە، وەك هۆکاری مرۆڤ کە توخمەکانی ئەوە، ئاگر و خاکی هەروەك مادە، و شێوەی ((تایبەت))، و هەروەها شتێکی تر لەدەرەوە(١٥) بۆنموونە باوکی ئەو، وبەدەر لەمانە خۆر و رێرەوە خوازراوەکەی، کە نە مادەن و نە شێوەو نە

نەبوون و نە هاوجۆری ئەون، بەڵکو هۆکارەکانی جووڵێنەر(پاڵنەرن). هاوکات ئەبێت تێبینی ئەوە بکەین کە هەندێك لە هۆکارەکان ئەتوانن ناو بنێن گشتی، و هەندێکیان نا، بنەما یەکەمینەکانی هەموو شتەکان، یەکەمین ((ئەم شت)) کردارەکیە و شتەکەی تر هێزەکیانەیە،(٢٠) کەواتە ئەو(هۆکارە)گشتیانە بوونیان نیە، چونکە تاك (تاك شت) بنەمای تاکە، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بەگشتی بنەمای مرۆڤە، بەڵام مرۆڤێکی گشتی لەو شێوە بوونی نیە، بەڵکو((پلێئۆس))بنەمای((ئاخلئۆس))، ئەوە کە تۆ هی ئەوی باوکی تۆیە، و ئەم((ب)) لێرەدا بنەمای ئەم((با))یەیە لێرەدا، بەڵام((ب)) بەشێوەیەکی گشتی بنەما یان بە شێوەیەکی ڕەهایە، هاوکات ئەگەریش هۆکاری ناوەڕۆکەکان گشتی بن، بەڵام لەو شێوەیەی کە گووترا، شتە جیاوازەکان، کە لە هەمان ڕەگەز نین، وەك ڕەنگەکان، ئاوازەکان، ناوەڕۆکەکان،و چۆنایەتی، خاوەنی هۆکارو توخم گەلێکی جیاوازن، مەگەر بە مانایەکی هاوشێوەیی، هۆکاری ئەو شتانەش کە لە هەمان جۆرن، هەر جیاوازە، بەڵام نەك بە پێی جۆر، بەڵکو لەو ڕووەوە کە هۆکاری تاکە جیاوازەکانن، مادەو شێوە و هۆکاری پاڵنەری تۆ، بەدەرە لە مادەو شێوەو هۆکاری پاڵنەری من، هەرچەند بە پێی مانا گشتیەکە هەمانن.

بەڵام لەبارەی پشکنینی ئەوەی کە بنەماکان و هۆکاری ناوەڕۆکەکان(٣٠) و سەرخراوەکان و چۆنایەتیەکان چین، ئایا هەمانن یان جیاوازن، ڕوونە کە چۆن ئەوان بە جۆرگەلێکی زۆر ناو ئەنرێن، بۆ هەر شتێك هەمانن، بەڵام ئەگەر جیا بکرێنەوە، ئیدی ((هەمان))ەکان نین،بەڵکو جیاوازن، جگە لەوەی کە بە یەك مانا بۆ هەمووان بن، ئەوان بەم شێوەیە هەمان و هەمانن، چونکە مادە، شێوە، نەبوون، و پاڵنەر لەهەموو شتەکاندا ئەژمار ئەکرێن، و بە شێوەیەکی دیاری کراو(٣٥) هۆکاری ناوەڕۆکەکان هەروەك هەموو شتەکان ئەژمار ئەکرێن، چونکە بە لەناوچوونی ناوەڕۆکەکان هەموو شتەکان لەناو ئەچن، هاوکات هەموو کە لە پەرەپێدانی کامڵدا (هاتنە ئارایی کامڵدا) یەکەمینە(واتە پاڵنەری یەکەمە.و.ف) لە هەموو شوێنێکدا هەمانە، بەڵام بە شێوەیەکی دیاری کراویش هۆکارە یەکەمینەکان جیاوازن، وەك هەموو ئەو دژانەی کە نە هەروەك ڕەگەزەکان ناوئەبرێن و نە بە جۆرگەلێکی زۆر ئەووترێن،(واتە جۆرە خاوەن ناوە هاوبەشەکان.و.ف) و هەروەها مادە جۆراجۆرەکان.

١٠٧١b

کەواتە گووترا کە بنەمای هەست پێکراوەکان چین و چەندن، و هەروەها چۆن هەمانن و چۆنیش جیاوازان.

"وەرزی شەشەم"

# ( پێویستایەتی یەکەمین پاڵنەر )

لەوێوە کە ناوەرۆکەکان سێینە بوون ،دوودانە سروشتی، و یەکێکی نەجوولاو، لەبارەی ئەم دانەیە ئەبێت بڵێین کە بوونی یەك ناوەرۆکی جاویدانی نەجوولاو پێویستە،(٥) چونکە ناوەرۆکەکان لەپێش بوونەوەرەکانەوەن، و ئەگەر ئەوان لەناوچوو خوازن، کەواتە هەموو شتەکان لەناو ئەچن، ((بەلاّم جووڵە مەحاڵە کە دروست بوو‌بێت یان لەناوبچێت، چونکە هەمیشە بووە)) ((کات))یش هەربەم شێوەیەیە، چونکە بە بێ بوونی کات، پێشتر و دواتر ناتوانن بوونیان هەبێت، کەواتە جووڵە بەهەمان شێوەی کات ،پەیوەستە.(١٠)چونکە(کات) یان خودی جووڵەیە یان کردارانەدنێك لە جووڵە، بەلاّم جووڵەی پێکەوە بەستراو بوونی نیە، جگە لە جووڵەیەك کە لە شوێندایە، و لەم (جووڵە لەشوێندا)شدا (جووڵەی بازنەیی) (جووڵەیی پێکەوە بەستراوە).

بەلاّم ئەگەر هەم پاڵنەرێك یان بکەرێك بوونی هەبێت،و لە واقعدا چالاکیەك ئەنجام نەدات، کەواتە ناشجوڵێت، چونکە لەوانەیە ئەوەی خاوەنی تواناداریّتیە، ئیشێك ئەنجام نەدات، کەواتە سودێکی نیە ئەگەر ئێمە ناوەرۆك گەلێکی جاویدان بهێنینە ئاراوە(١٥)- وەك کەسانێك کە ئایدیەکان ئەهێننە ناوەوە- ئەگەر بنەماگەلێك لە دەروونی ئەواندا نەبێت، کە توانای گۆڕاندنە، بەلاّم تەنانەت ئەمەش بەس نیە، ناوەرۆکێکی تریش لەپاڵ ((ئایدیە))شدا وەك پێویست نیە، یان(بەس نیە)، چونکە ئەگەر چالاکیەك ئەنجام نەدات، ناتوانێت جووڵەیەکیشی هەبێت، تەنانەت ئەگەریش چالاکیەك بکات، بەلاّم ناوەرۆکەکەی تواناداریّتی(هێز) بێت (دیسانەوە هەر ناجووڵێت) چونکە ئەوکاتیش جوڵەی جاویدان

یـان ئـەزەلی بـوونی نابێـت، چـونکە بوونـەوەری هێزەکـی لەوانەشـە بـوونی نـەبێت(٢٠) ((کەواتە ئەبێت بنەمایەکی بەم شێوەیە بوونی هەبێت کە ناوەڕۆکەکەی کرداریێتیە)) و هەروەها ئەبێت ئەم ناوەڕۆکانە بیّ مادە بن، واتە ئەگەریش شتێکی تر بتوانێت جاویدان بێت،ئەو ناوەڕۆکانەن کە ئەبێت جاویدان بن، کەواتە ئەوان ئەبێت((کرداریێتی)) بن.

بە بوونی ئەمەش لێرەدا گوومانێك هەیە، چونکە گوومانی ئەوە ئەکرێت کە هەر ((ووزەمەندیەك))توانادارە، بەلاّم هەر تواناداریێتیەك ووزەی نیە، وەك بلێی کە تواناداریێتی لە پێشترە، بەلاّم ئەگەر بەم(٢٥)شێوەیە بوایە، هیچ یەك لە بوونەوەرەکان بوونیان نەدەبوو، چونکە لەوانەیە و ئەکرێت شتێك توانای بوونی هەبێت و هێشتاکە بوونی نەبێت، بەلاّم ئەگەر بەو شێوەیەی کە خوداناسەکان ئەلێن و قبولی بکەین کە جیهان لە شەو ئەمێننە بوون[1]، یان بەو شێوەیەی کە سروشتناسەکان ئەیلێن کە ((هەموو شتەکان پێکەوە بوون))[2]، دیسانەوە هەمان مەحالێتی ئەبێتە ئەنجام، چونکە چۆن شتێك ئەیتوانی بێتە جوولە ئەگەر هۆکارێکی کردارەکی بوونی نەبوایە؟ چونکە مادە (لێرەدا بە مانای تەختەیە، کە مانایەکی تری ووشەی هیولی یە.و.ف) خودی خۆی ناکەوێتە جوولە(٣٠)،بەلکو هونەری دارتاشی(کار ئەکاتە سەری)و نە ووزەری خوێنی سووڕی مانگانە و نە زەوی(ئەتوانن خۆ لەخۆ بجوولێن)، ئەوەی کە ئەمە تۆوەکان(مەبەستی هەردوو تۆوی پیاو لەگەلّ تۆوی سروشتی) ئەنجامی ئەدەن، بەم هۆیەوەیە کە هەندێك کراریێتیەکی هەمیشەیی ئەمێننە ئاراوە، وەك ((لوکیپۆس))و ((ئەفلاتوون))چونکە ئەمان ئەلێن کە جوولە هەمیشە هەیە، بەلاّن نالێن بە چ هۆیەك هەیەو چیە، و لەبەر ئەوە ئەگەر شتێك بەم شێوەیە یان بەو شێوە(ئەجوولێت) هۆکارەکەی نالێن، چونکە هیچ شتێك(٣٥) بە ڕێکەوت نایەتە جولە، بەلکو ئەبێت هەمیشە بوونی هەبێت (کە ئەیهێنێتە بوون) بەو شێوەیەی کە هەنووکە شتێك سروشتانە بەم شێوەیە، بەلاّم پێویستانە یان بە یارمەتی ئەقلّ یان شتێکی تر، بەو شێوەیە ئەجوولێت، و هەروەها چ جۆرە(جوولەیەك) سەرەتاییە،چونکە جیاوازیەکە لێرەدا زۆرە،

١٠٧٢a

بەلاّم ئەفلاتوون تەنانەت ناتوانێت ئەوەی هەندیّ جار گریمانەی ئەکات، کە بنەمای(جوولە)یە واتە((پالّنەری خۆی لەخۆیدا to auto heauto kinoun))

---

[1] ب.بۆ، بەرهەمەکەی هێسیودوس(هزیۆد) (( ئیشەکان و رۆژەکان)) و هەروەها(( لەدایك بوونی خوداکان))((تئۆگۆنیا)) نیوە دێڕی ١١٦ بە دواوە.

[2] لەتی یەکەم ئاناکساگۆراس.

بناسێنێت، چونکە ڕۆح (دەروون) بەو شێوەیەی کە ئەو ئەڵێت، شتێکی((دواتر))و هاوکات لەگەڵ دوونیای بۆشایی دایە.

بەڵام ئەم گوومانە کە تواناداریێتی (هێز)لە پێش کرداریێتیەوەیە، لە ڕوانگەیەکەوە ڕەوایە و لەڕوانگەیەکی ترەوە نارەوایە، پێشتر باس لە چۆنایەتیەکەی کرا، بەڵام لەسەر ئەوەی کە کرداریێتی لە پێشترەوەیە، ((ئاناکساگۆراس))(لەبەر ئەوەی ئەقڵ لە پێشتر) و هەروەها((ئێمپێدوکلێس))کە (خۆشەویستی و شەڕ)ی قبوڵ کردبوو شایەتی ئەوە ئەدەن، و هاوکات کەسانێك کە ئەڵێن جووڵە هەمیشە بوونی هەیە، وەك ((لوکیپۆس)).

لەبەر ئەوە((خائۆس))(شڵەژاوی)) یان شەو(نوکس) لە کاتێکی ناکۆتادا نەبوون، بەڵکو هەمان شتەکان هەمیشە بوونیان هەبووە، یان لە سەردەمەکاندا یان بە شێوەیەکی تر، واتە لەم ڕوانگەیەوە کە کرداریێتی لە پێش تواناداریێتیەوەیە، هەنووکە ئەگەر(١٠)هەمان سەردەم هەمیشە بوونی هەیە، کەواتە ئەبێت شتێکی هەمیشە جێگیر و بەیەکسان کرداریێتی بەخش بێت، بەڵام ئەگەر ئەبێت دروست بوون و لەناوچوون بوونیان هەبێت، شتێکی تریش ئەبێت بوونی هەبێت کە هەمیشە بە شێوە گەلێکی جۆراوجۆر لە چالاکی دا بێت، کەواتە ناچارە کە بەیەك شێوە خۆی لەخۆیدا چالاکی بکات و بە شێوەیەکی تر لە ڕوانگەی شتێکی ترەوە، و ئەمەش یان بە پێی شتێکی سێهەمی یان بەپێی یەکەمییەك. چونکە ئەو جارێکی تر هۆکاری خۆی و(١٥) ئەو((ئەوی تر))ەیە، کەواتە ئەو((یەکەمینە)) باشترە، چونکە ئەو هۆکارە هەمیشە بە یەکسانی ماوەتەوە، بەڵام(هۆکاری) جۆراوجۆر بوون شتێکی ترە، بەڵام ئاشکرایە کە هەردووکیان پێکەوە هۆکاری جۆراوجۆر بوونی هەمیشەیین، لەبەر ئەمە خەسڵەتی جووڵەکان بەم شێوەیەیە، کەواتە بۆ چی ئەبێت بەدوای بنەما گەلێکی تردا بگەڕێین؟

" وەرزی حەوتەم"

# ( پاڵنەری یەکەم و چالاکیەکەی )

لەوێوە کە روون کردنەوەکە بەم شێوەیەیە، و ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو، ئەوکات هەموو شتە دروست بووەکان لە((شەو)) یان لە(( پێکەوە بوونی هەموو شتەکان)) یان لە((نا-بوونەوەر)) ئەبن،(٢٠) کەواتە ئەتوانین ئەم مەسەلانە بەچارەسەرکەر ئەژمار بکەین، شتێك هەیە کە جووڵێنراوە بە جووڵەیەکی هەمیشەیی و نەوەستاوە، و ئەم جووڵەیەش بازنەییە، و ئەمە نە تەنیا مەنتیقیانە بەڵکو واقعیانە ڕوونە، لەبەر ئەمە ئاسمانی یەکەمین ئەبێت جاویدان بێت، کەواتە شتێکیش هەیە کە ئەو ئەهێنێتە جووڵە، بەڵام لەوێوە کە لە نێوان جووڵێنراو جووڵێنەر((نێوانێك)) بوونی هەیە، کەواتە پاڵنەرێکیش هەیە کە جووڵێنراو((پاڵنراو)) نیە و ئەهێنێتە جووڵە،(٢٥)و شتێکی جاویدانە و ناوەرۆك و کردارێتییە.

هێنانە جووڵەی ئەو بەم شێوەیەیە: شتێکی ((ئارەزوو کراو to orekton)) و(( شتێکی بیر لێ کراوە)) ئەهێننە جووڵە، بەڵام جووڵێنراو نین، یەکەمینەکانی ئەمانە هەمانن، چونکە بابەتی ڕووناکیە دیارەکە، جوانە، بەڵام یەکەمین((خوازراو)) بوونەوەری جوانە((to on kalon))، خوازیاری ئێمە بۆ شتێك بەو هۆیەوەیە کە جوانی پایەدارە، نەك ئەوەی جوانی پایەدارە بەو هۆیەی کە خوازیاری ئێمە بۆ ئەوە،(٣٠) چونکە((ئەندێشە)) بنەمایە، بەڵام ((ئەقڵ)) بە یارمەتی ئەقڵێنراو دێتە جووڵە، بەڵام یەکێك لە دوو ڕیزی (دژەکان) ئەقڵێنراو لەخۆیدایە، لەم ڕیزەدا، یەکەم ناوەرۆکە، و(لە ناوەرۆکی)یشدا یەکەم، ناوەرۆك سادەو کردارەکیە،("یەك"ایەتی و"سادە" هەمان نین،

چونکە"یەک"ایەتی بەڵگەیە لەسەر پێوانەیەک، بەڵام "سادەto haplou " بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خۆی شتێکی خاوەن چۆنایەتیە)بەڵام((جوان to kalon))(٣٥)و((هەڵبژێردراو to haireton)) لەبەر خۆی، لەیەک و هەمان ریزدان، و((یەکەمین))هەمیشە باشترین یان هەروەك(باشترین)ە.

١٠٧٢b

بەڵام ئەوەی کە((لەبەر ئەو-هۆکاری ئامانجی))لە شتە نەجووڵاوەکاندا بوونی هەیە، لە ریگای دابەشکردنی(مانا)کەیەوە ڕوون ئەبێتەوە، چونکە((لەبەر ئەو)) هەم بۆ شتێکە و هەم((بە ئاراستەی شتێك))،کە لەو دووانە ئەم دانەیە لە شتە نەجووڵاوەکاندا بوونی هەیە، بەڵام ئەو دانەکەی تر نا، کەواتە(لەبەر ئەو) هەروەك مەئشوق ئەهێنێتە جووڵە، بەڵام شتەکانی تر لەو روانگەیەوە ئەهێننە جووڵە کە خۆیان جوڵێنراون، هەنووکە ئەگەر شتێك بجووڵێت،(٥) لەوانەیە خاوەنی چەند حاڵەتێکی جیاواز بێت، لەبەر ئەمە ئەگەر(جووڵە) یەکەمین جووڵێنراوی کردارەکی جووڵەی شوێنیە، کەواتە لەوانەیە تا ئەو شوێنەی کە ئەجووڵێت، بە پێی شوێن خاوەنی حاڵەت گەلێکی جۆراوجۆر ببێت، هەرچەندە نە بە پێی ناوەرۆك، بەڵام لەوێوە کە بوونەوەر پاڵنەرێکە کە خۆی پاڵنراو نیە، و بوونەوەر((کردارەکیانەیە))، ئەم بوونەوەرە مەحاڵە کە ببێتە خاوەنی حاڵەت گەلێکی جیاواز، چونکە جووڵەی شوێنی((گوازتنەوەیی) یەکەمین جۆری گۆڕانەکانە، (و یەکەمین جۆری جووڵەی شوێنی)یش جووڵەی بازنەییە،(١٠) بەڵام ئەم(جووڵە)یەش ئەو((بوونەوەر))ە ئەیهێنێتە جووڵە، کەواتە ئەو((پێویستانە بوونەوەر))ە، (واتە ئەم لاو ئەولای تێدا نیە مەرجە کە بوونەوەر بێت.و.ك) و تا ئەو شوێنەی کە بوونەوەر ((پێویستە))،((بوونایەتیەکەی چاك و جوانە)) وە بەم شێوەیەش بنەمایە، چونکە((پێویستایەتی))خاوەنی ئەم مانایانەیە، یەکێك ئەوەی کە بە((پێویستانەیە)) چونکە بە پێچەوانەی مەیلەوەیە، ئەوی تر، ئەوە بوو کە ئەو((باش یان چاك to eu)) بەدەست نایەت، و هەروەها ئەوەی کە مەحاڵە بەجۆرێکی تر بوونی هەبێت، مەگەر رەهاییانە (بەو جۆرەی کە هەیە)، کەواتە ئەم شێوە ((بنەما))یەیە کە ئاسمان و سروشت پەیوەستن پێیەوە، بەڵام گووزەرانی ژیانی ئەو(١٥) لەو باشترین جۆرەیە کە ئێمە تەنیا کاتێکی کەم خاوەنین. ئەو ئەبێت هەمیشە بەو شێوەیە بێت، (بەڵام بۆ ئێمە مەحاڵە) چونکە کردارێتی ئەو هەروەك ((چێژ))وایە، (و بەم هۆیەوەیە کە بێداری، هەستکردن و ئەندێشە بەتام ترینن، و بە هۆی ئەوانیشەوە ئومێد و یادەوەرییەکان بەم شێوەیەن) بەڵام ئەندێشەیەك کە ((خۆی لەخۆیدا))یە،پەیوەستە بەو شتەوە کە((خۆی

لەخۆیدا))باشترینە، و ئەندێشە لەبەرزترین ئاستی دا، پەیوەستە بەو شتەوەی کە لە بەرزترین ئاستدا باشترینە.(٢٠).

((ئەقڵ)) لە ڕێگای((یەکێتی-یان هاوبەشی))لەگەڵ ((ئەقڵێنراو))دا بیر لەخۆی ئەکاتەوە، و(خۆیشی) لە پەیوەندی و ئەقلاندنی ئەودا،دەئەقڵێنرێت، بەو شێوەیەی کە ئەقڵ"و ئەقڵێنراو یەکێك و هەمانن، چونکە وەرگری ئەقڵێنراو ناوەرۆك، ئەقڵە، بەلام کاتێك چالاکی ئەنجام ئەدات کە خاوەنی ئەقڵێنراوە، لەبەر ئەمە ئەم((خاوەنێتیە)) زیاتر لە ئەو((وەرگرتنە)) گومانی ئەوەی لێ ئەکرێت کە تایبەت بێت بە(( ئەقڵی خودایی)))، تێبینی کردنی(ئەقڵ)یش بە چێژترین و باشترین شتە، هەنوکە ئەگەر خودا هەمیشە لەو حاڵەتەدا خۆشیەدایە(٢٥) کە ئێمە جاروبار تێیدااین، سەرسامکەرە، بەلام ئەگەر لە حاڵەتێکی خۆشتر لەوەدایە، دیسانەوە سەرسامکەرترە، بەلام هەنووکە ئەو بەم شێوەیەیە،((ژیان))یش هەر لەوەویە(لەبەر ئەوە) ((چونکە ئەقڵ لە کردارێتیدا ،خودی ژیانە) و ئەو کردارێتیە، بەلام ((کردارێتییە لە خۆیداکەی ئەو ژیانی باشترین و جاویدانە)) لێرەوەیە کە ئێمە ئەڵێین خودا((زیندوو، جاویدان و باشترینە)) بەو شێوەیەی کە ژیانی جاویدانانە(٣٠) و بوونایەتی بەردەوام و جاویدانانە لە خوداوەیە و(هی ئەوە)، چونکە ((خودا ئەمەیە)).

بەلام ئەو کەسانەی کە وەك((پیتاگۆریەکان)) و((ئسپوسیپوس)) وا وێنا ئەکەن کە((جوانترین و باشترین)) لە بنەمادا بوونی نیە، بەم هۆیە کە لە گیاکان و گیانداران، بنەماکان لەوقعدا هۆکارەکانن، بەلام جوانی و تێروتەسەلی لە بەرهەمەکانیاندا بەدەست دێت، بڕواکەیان دروست نیە،(٣٥) چونکە ((تۆو)) لە شتێکی ترەوەیە کە لە پێشتر و کاملترە(تێروتەسەلترە)، و یەکەمین شت باوك نیە، بەڵکو((بوونەوەری کاملە))، وەك ئەوەی کە بڵێین((مرۆڤێك لەپێش "تۆو"ەوەیە))نەك ئەوەی کە لە "تۆو"وەوە دروست ئەبێت، بەڵکو مرۆڤێکی تر کە"تۆو" لەوەوەیە.

١٠٧٣a

هەنووکە ئەگەر ناوەرۆکێکی جاویدان و نەجووڵاو و جیا لە هەست پێکراوەکان بوونی هەیە، لەوەی کە گووترا ڕوون نەبێتەوە، (٥) بەلام هاوکات، سەلمێنرا کە ئەم((ناوەرۆك))ە ئەگەری ئەوەی نیە کە خاوەنی ئەستووری بێت، بەڵکو بێ بەش و دابەشنەخوازە،(چونکە لە کاتێکی ناکۆتادا دێتە جووڵە، و شتێکی خاوەن کۆتایی، خاوەنی توانادارێتیەکی ناکۆتا نیە)، بەلام لەوێوە کە هەر ئەستوورییەك یان ناکۆتا یان سنوودارە، بە هەمان بەڵگە ناتوانێت خاوەنی((ئەستووریەکی))سنووردار بێت، (١٠) و

هاوکات ناشتوانێت خاوەنی ئەستووریەکی (گەورەیی)یەکی ناکۆتاش بێت، چونکە ئەستووری(گەورەیی) ناکۆتا بە هیچ شێوەیەك بوونی نیە، و هەروەها سەلمێنرا کە(ئەو ناوەرۆکە) کارتێنەکەر و لەناونەچووە، چونکە هەموو جوولەکانی تر لەدوای جوولەی شوێنیەوەن، کەواتە ڕوون بوویەوە کە بۆ چی ئەو(ناوەرۆکە) بەم شێوەیەیە.

"وەرزی هەشتەم"

# ( ژمارەی ناوەرۆکە جوولێنراوەکان )

بەڵام نابێت لەم پرسیارە بێ ئاگا بین کە ئایا ئەم جۆرە ناوەرۆکە ئەبێت بە((یەک))یەک بزانرێت یان بە((چەندین))، و ئەگەر بەم شێوەیەیە،((چەندە))(١٥) بەڵکو هاوکات ئەبێت مەسەلەکانی فەیلەسوفەکانی تر بەیاد بهێنینەوە کە ئەمان لەبارەی ژمارە(ئەم ناوەرۆکانە) هیچ شتێکیان نەووتووە کە بتوانرێت ئەوە بە ڕوونی بەیان بکات، گریمانەی پەیوەست بە((ئایدیە)) هیچ جۆرە توێژینەوەیەکی تایبەتی لەم بارەیەوە ئەنجام نەداوە، چونکە پەیوەست بووانی ((ئایدیەکان tas ideas)) ئەڵێن ((ئایدیەکان)) ژمارەکانن، و لەبارەی ژمارەکان هەندێ جار بە شێوەیەک قسە ئەکەن کە وەک بڵێی بێسنوورن(٢٠) و هەندێ جار بەو شێوەیەی کە بە ژمارە((دە)) سنوورداون، بەڵام لەوەی دا کە بە چ هۆیەک زۆریتی ژمارەکان بەم شێوەیەیە، هیچ شتێک بە گریمانەیەکی گرنگ نەگووتراوە، بەڵام بە پێی ئەو بابەتانەی کە پێشتر جیاو دیاری کران، ئەبێت لەم بارەیەوە قسە بکەین.

((بنەماو یەکەمین)) لە بوونەوەران، نەجوولاوە، ((هەم لەخۆیدا و هەم بەرکەوتنە))(٢٥)بەڵام یەکەمین جوولەی جاویدانی تاقانە ئەهێنێتە جوولە، بەڵام لەوێوە کە جوولێنراو بەناچاری بە یارمەتی شتێکەوە دێتە جوولە، و پاڵنەری یەکەمین لەخۆیدا نەجوولاوە، و جوولەی جاویدان بە یارمەتی بوونەوەرێکی جاویدان دێتە جوولە، و یەک جوولە لەیەک جوولێنەرەوە ڕوو ئەدات، و هەروەها لەوێوە کە ئەبینین کە بێ لە جوولەی ڕەهاییانەی گشت جیهان، کە ئەڵێن ناوەرۆکی یەکەمین نەجوولێنراو ئەو ئەهێنێتە

جوولـە(٣٠) جووڵـە گـەلێکی شـوێنی تـریش بوونیـان هەیـە، وەك جووڵـە جاویدانـەکانی ئەسـتێرەکان واتـە(هەسـارەکان)(چـونکە تـەن خـاوەنی جوڵەیـەکی بازنـەیی جاویـدان و نەوەستاوە، بەو شێوەیەی کە گووتـار لـەبارەی سروشـتایەتیەکاندا سەلمێنراوە) کەواتـە هەریـەك لـەم جووڵـە شـوێنەکیانەش ئـەبێت یـەك نـاوڕۆکی لەخۆیـدا نـەجولاو جاویـدان بهێنرێنـە جووڵـە، چـونکە سروشـتی ئەسـتێرەکان جۆرێـك لـەناوەڕۆکی جاویدانـە،(٣٥) وپاڵنـەریش لـە پـێش و جاویـدان تـرە لـە پـاڵنراو، و ئـەوەی کـە لـە پـێش ناوەڕۆکەوەیـە ((پێویـستانە)) خـودی ناوەڕۆکـە، کەواتـە ڕوونـە کـە ناوەڕۆکـەکان پێویـستانە بـە هـەمان ژمارەی(جوڵەی شوێنەکی ئەستێرەکان) بوونیان هەیە، و بەپێی سروشتەکەیان جاویدان و ((لەخۆیاندا)) نەجوولاو بە بێ گەورەیی (نەستووری)، بەهەمان هۆکار کە لە پێشەوە قسەی لەسەر کرا.

١٠٧٣b

کەواتە ئـەوەی کـە ئـەم ناوەڕۆکانـە بوونیـان هەیـە، و لەوانـەوە یـەکێك ((یەکـەمین))ەو ئەوتر ((دووەمین))، بەهەمان شێوە، ڕیزبەندی جوڵەی شـوێنەکی ئەسـتێرەکان، خـاڵێکی ڕوونە، بەلام لەبارەی زۆرێتی جووڵە شوێنەکیەکان ئـەبێت بەیارمـەتی نـزیکترین لقـەکانی زانستی بیرکاری، واتە ئەستێرەناسی(هێنت astrologia)(٥)توێژینـەوە بکـەین، چـونکە ئەم زانستە لەبارەی ناوەڕۆکە هەست پێکراو بەلام جاویدانـەکان، تێڕامـان ئـەکات، بـەلام ئـەوانی تـر، وەك زانـستی ژمێریـاری و ئەنـدازیاری، لـەبارەی هـیچ جـۆرە ناوەڕۆکێکـەوە تێڕامـان ناکـەن، هەنوکـە ئـەوەی کـە جووڵـە شـوێنەکیەکان زیـاتر لـە جـووڵێنراوە شوێنەکیەکانن، بۆ کەسـانێك کـە تارادەیـەك لـە بابەتەکـە تێگەیشتوون، ڕوونـە، چـونکە هەریـەك لـە ئەسـتێرەکان(١٠)لەسـەر زیـاد لەیـەك جووڵـەی شوێنەکین، بـەلام ئـەوەی کـە ڕووبەڕووی چەند دانە لەم جوولانە ئەبنەوە، هەنووکە ئێمە ئەوی کە هەندێك لە بیرکاری زانەکان ئەیلێن- بۆ ئەوەی کە ئەندێشەیەکمان لێیەوە بەدەست بێت- بەیان ئەکەین تا ئەندێشەکەی ئێمە بتوانێت لە ژمارە سنوردارەکەی ئەوان تێ بگات، بەلام لە باقی ئەوانی تـر هەنـدێکیان ئـەبێت خـودی خۆمـان توێژینـەوەیان لەسـەر بکـەین، و هەندێکیـشیان لەوانەوە کە گەریدەیی و گەران وتوێژینەوەیان کردووە، و لـەم بارەیـەوە فێـر بین(١٥) و ئەگەر شتێکی بەدەر لە گووتـە هەنووکیـەکان، لـە لای کەسـانێك کـە خۆیـان سـەرقاڵی ئـەم مەبەستە کردوە، بەدەست بێت، ئەبێت هەردوو گروپەکەمان خۆش بوێت، بەلام ئـەبێت لە وردترین تیۆریەکان پەیڕەوی بکەین.

هەنووکە((یودوکسوس))[1] گریمانەی ئەوەی دائەنا کە جووڵە شوێنەکیەکانی خۆر و مانگ، بۆ هەریەك لەوانە سێ ((گەردوون)) لە خۆ ئەگرن، کە یەکەمینیان گەردوونی ئەستێرە ناسەرگەردانەکانە(جێگیرەکان).(٢٠) و دووەمینیان ئەوەیە کە لە ناوەڕۆاستی گەردوونی سەرەوە ئەسوڕێنەوە، و سێهەمینیان لە بازنەیەکی خوازراو لە ئاستی گەردوونی سەرەوە ئەسوڕێنەوە، بەڵام ئاسمانێك کە مانگ لەودا ئەسوڕێتەوە خوازاروتر لەو ئاسمانەی کە خۆر لەودا ئەسوڕێتەوە، وە هەروەها(بە بڕوای ئەو) جووڵەی هەریەك لە ئەستێرەکان هەرچوار گەردوونەکە لەخۆ ئەگرن (sfairais)، کە یەکەمین و دووەمینیان هەمان دوئاسمانی(٢٥)(خۆر ومانگ)ە (چونکە گەردوونی ئەستێرە جێگیرەکان هەموو گەردوونەکان ئەسوڕێنێتەوە، و گەردوونێك کە بە لەدوای ئەوەوەیە و لەبازنەیەکی ناوەراست گەردوونی سەرەوەدا ئەسوڕێتەوە؛ بۆ هەموو ئەستێرەکان هاوبەشە) بەڵام جەمسەرەکانی سێهەمین گەردوون هەریەك لە ئەستێرەکان لە بازنەی ناوەراستی گەردونی سەرەوەدا جێگیرن، و سوڕانەوەی گەردوونی چوارەم (٣٠) لە بازنەیەکدا کە نیسبەت بە ناوەراستی گەردونی سێهەم خوازیارە کە بسوڕێتەوە، بەڵام لە گەردوونی سێهەمدا، هەسارەکانی تر جەمسەری تایبەتیان هەیە، بەڵام جەمسەرەکانی((زووهرە و عەتارد)) هەمانن.

((کالیپسوس))بارودۆخی گەردووکانی بە هەمان شێوە جێگیر کرد کە(یودوکسوس) جێگیر کردبوو،(واتە لە روانگەی ڕێکخستنی جیاوازیەکانیانەوە) بەڵام لە(٣٥) ژمارەی گەردوونەکانەوە بۆ((مشتەری و زووحەل)) بڕوای ئەمیش هەمانە کە(یودوکسوس)) ئەیووت: بەڵام لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە بۆخۆر و مانگ دوو گەردوون (ئاسمان)ی تر ئەبێت زیاد بکرێن، ئەگەربە شێوەیەك بێت کە دیاردەکان ڕوون بکەنەوە، و هەروەها یەك گەردوون بۆ هەریەك لە هەسارەکانی تر.

١٠٧٤a

بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بێت کە کەڵەکەبووی هەموو گەردوونەکان، دیاردەکان ڕوون بکەنەوە، پێویستە کە بە پێی هەریەك لە هەسارەکان گەردوون گەلێکی تر بونیان

[1] خەڵکی کنیدۆس بووە کە لە نێوان ساڵەکانی ٤٠٨ و٣٥٥ ی پ.ز دا ژیاوە، ئەو فێرخواز و بیرکاری زانی گەورەی و هاورێی نزیکی ئەفلاتوون بووە و بە نۆبەی خۆی یەکێك بووە لە گەورەترین بیرکاری زانەکانی و ئەستێرەناسەکان و هەروەها جوگرافی ناسیش بووە، و کاتی هاتنی ئەرستۆ بۆ ئاتا، ئەو سەرپەشتی ئەکادیمیا بوو، و ئەو تەنیا کەسایەتیەکە کە ئەرستۆ دانی خێری پێدا ئەنێت لە قوتابخانەکەی ئەفلاتوون و لەناو هەموو فێر خوازەکاندا،ب.بۆ((ئەخلاقی نیکۆماخۆس))،کتێبی دەیەم، وەرزی دووەم،:١٨-١١٧٢b١٥.

هەبێت، کە ژمارەیان یەکی کەمتر لەوانە ئەبێت کە تا هەنووکە قبوڵمان کردوون، کە بە پێـچەوانەی ئاراسـتەی ئـەوانی تـرەوە ئەسـوڕێنەوە، و یەکـەمین گـەردوونی هـەر ئەسـتێرەیەك کـە لـە نزیـك ئـەوەو لـە ژێـرەوە جێگیرە هەمیـشە بـۆ هـەمان بـارودۆخ ئەگەڕێنـەوە، چـونکە تـەنیا بـەم شـێوەیە ئەگـەری هەیـە(٥) کـە کۆمەڵـەی جووڵـەی ئەستێرەکان دروست بکرێت.

هەنووکـە لـەوێوە کـە ژمـارەی ئـەو گەردونانـەی کـە خـودی هەسـارەکان لەوانـدا ئـەجووڵێن، بـۆ((مـشتەری)) و((زووحـەل)) ٨ هەوبـۆ ئـەوانی تـر ٢٥ و لەمانـەوە تـەنیا ئەو((یەکیانەی)) کە لەخوارترین ئەستێرە تیایاندا ئەجووڵێت پێویستی بە جووڵە بە ئاراستەی پێچەوانە نیە، کەواتە ژمارەی ئەو ئاسمانانەی کە بە ئاراستەی پێچەوانەی دوو هەسارەی یەکەم ئەجووڵێن ٦ ە،(١٠) و بۆ ئەو چوار هەسارەیەی تر ١٦ ەیە، کەواتە کـۆی ژمـارەی هەسـارەکان-چ ئەوانـەی کە بـۆ پێـشەوە ئـەجووڵێن و چ ئەوانـەی کـە بـە ئاراسـتەی پێـچەوانەوە ئەجووڵێنـەوە،-٥٥ ئـەبێت، بـەڵام ئەگـەر بـۆ مـانگ و خـۆر، ئـەو جووڵانـەی کـە قـسەمان لێیانـەوە کـرد، زیـاد نەکـەین، ئـەوکات ژمـارەی ئاسمانـەکان ٤٧ ئەبوون.

کەواتـە با وا دابنێین کـە ژمارەی ئاسمانـەکان ئەوەنـدە بێـت،(١٥) بـەو شێوەیەی کە ئـەتوانین تاراددەیـەك ناوەڕۆکـەکان و بنـەما نـەجووڵاوەکانیش هەربـەم ژمارەیـە گریمانـە بکـەین، چونکە قسە لـە((پێویستایەتی)) کردن ئـەبێت بـۆ زاناگـەلێکی بـەتواناتر بـەجێ بهێڵین.

بـەڵام ئەگـەر هـیچ جووڵەیـەکی شـوێنەکی نـەتوانێت بـونی هـەبێت، کـە بـەهۆی جووڵەیەکی شوێنی ئەستێرەیەکەوە ڕێنوێنی ئەکرێت، وهەروەها ئەگەر هـەر سروشـت و هـەر ناوەڕۆکێـك کـە کارتێکـەرخوازە، و خـۆی لەخۆیـدا(٢٠) دەسـتی بـە((باشـترین)) گەیشتووە، ئـەبێت یـەك ئامانج بناسـێنرێت، کەواتـە هـیچ سروشـتێکی تـر بـەدەر لەمانـە ناتوانێـت هـەبێت، بەڵکو بەناچاری ژمارەی ناوەڕۆکـەکان ئەمەندەیـە،(کـە بیانـژمێرین)، چونکە ئەگەر (ئەوانی تر)هەن، ئەوکات بە پێی ئامانجی جووڵەکەیان، ئەبنە هۆی چەند جووڵەیەکی تر، بەڵام بوونی جووڵەی شوێنی تر بەدەر لەوانەی کە ووتران مەحاڵە، ئەمـە ئەنجامێکی ئەقڵانیـە کـە ئـەتوانین لـە تێبینـی کردنـی جووڵێنراوە شوێنیەکانەوە بیگـرین (٢٥)چـونکە ئەگـەر هـەر پاڵنـەرێك سروشـتانە لەبـەر پاڵنراوێـك بـوونی هەیـە، و هـەر جووڵەیەکی شوێنەکی لە پاڵنراوێکی شوێنەکیەوەیە، کەواتە هیچ جووڵەیەکی شوێنەکی ناتوانێت لەبەر خۆی یان لەبەر جووڵەیەکی شوێنەکی تر بونی هەبێت، ئەمەش ئەبێت

لەبەر یەکێکی تر بووایە، لەبەر ئەمە، لەبەر ئەوەی زنجیرەکە تا ناکۆتا ناتوانێت بەردەوامی هەبێت، ئامانجی هەر جوولەیەکی شوێنەکی(٣٠) یەکێك ((تەنە خوادییەکان)) ئەبێت لە ئاسماندا.

بەڵام ئەوەی کە(( یەك ئاسمان))بوونی هەیە، ڕوونە، چونکە ئەگەر ئاسمانگەلێکی زۆر، وە مرۆڤە زۆرەکان بوونیان هەبوایە، ئەوکات هەر بنەمایەك((شێوەییانە))یان ((جۆرەکیانە)) یەکێك، بەڵام لە ڕووی ژمارەوە زۆر ئەبن، بەڵام هەر ئەوەی کە ژمارەییانە زۆرە، خاوەنی مادەیە، چونکە یەك و هەمان مانا بەڵگەیە لەسەر زۆرێك، وەك مانای ((مرۆڤ))(٣٥)کە بەڵگەیە لەسەر زۆرێك، بەڵام((سوقرات))یەکێکە، بەڵام چیەتی(ماهیەتی) یەکەمین خاوەنی مادە نیە، چونکە پەرەپێدانێکی کاملە[1]، کەواتە پاڵنەری یەکەم کە نەجووڵاوە، هەم لە ڕووی ماناوە و هەم لە ڕووی ژمارەوە یەکێکە، و لەبەر ئەو ئەو جووڵێنراوە کە جاویدانانە و بەردەوام لە جووڵەدایە، هەربەم شێوەیەشە، کەواتە تەنیا((یەك))ئاسمان هەیە.

١٠٧٤b

لە لایەکی پێشینان و چاکەخوازە کۆنەکانەوە هەروەك میراتێکی بەجێماو لە شێوەی ئەفسانەیەکدا ئەوە بۆ پاشینەکان بە جێ هێڵراوە کە ئەم تەنە ئاسمانیانە خوداکانن و ((بوونی خوودا)) هەموو سروشتی تەنیووە، ئەوکات پاشکۆکانی ئەوەیش لە شێوەی ئەفسانەیەکدا بۆ باوەڕپێهێنانی زۆرینەی خەڵك و لەبەر بەکار هێنانی یاسایەکی هەمەکی و بەرژەوەندی، دواتر(٥) ئەوەش زیاد کرا کە ئەڵێن ئەم خودایانە مرۆڤ شێوەن و هەروەك باقی گیانەوەرەکانی ترن، وشتانێکی تری لەو شێوەیەش لەدوای ئەوە ووتران، و ئەڵێنەوە، هەنوکە ئەگەر کەسێك واداننێت کە ناوەرۆکە یەکەمینەکان، خوداکانن، ئەوکات(١٠) ئەبێت ئەوە قبوڵ بکات کە قسەیەکی خودایانە گووتراوە، و لەبەر ئەوەی هەر هوونەرێك وهەر فەلسەفەیەك تارادەیەك چەندین جار تا ئەوپەڕی سنور دۆزراونەتەوە و جارێکی تر لەناو ئەچن((لەناوچوون))، ئەم بڕوایەی ئەمانیش هەروەك ((بەشێکی تر لە بڕوای پێشینان)) تا هەنووکە پارێزراون، تەنیا بەم ئەندازەیە بڕوای باوکەکان و پێشینەکان بۆ ئێمە ڕوون ئەبنەوە و لێیان تێ ئەگەین.

[1] چی بوون کە مەسەلەیەکی جێگیرە، و بەڵگەیە لەسەر بوونایەتی شتێك، ناتوانێت خاوەنی مادە بێت، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بوایە، خاوەنی ماهیەتێکی تریش ئەبو، و هەربەم شێوەیە تا ناکۆتا، چونکە هاتنە ئارایی تێروتەسەل ، ناتوانێت خاوەنی شێوە بێت و سادەیە، و هەر سادەییەکیش بەدەرە لە مادە.

"وەرزی نۆیەم"

# ( ئەقلـــــی خودایی )

(١٥) لـەبارەی ((ئـەقڵ)) هەنـدێك مەسـەلەی دژوار دێنـە كایـەوە، چـونكە وا گوومـان ئەكرێت كە لـە نێوان دیاردەكاندا خـودایی ترینـە، بـەڵام ئـەوەی كـە چۆن ئـەتوانێت بـەم شێوەیە بێت، پرسیارێكە كە هەندێك لە دژوارییەكان لەخۆ ئەگرێت، چونكە ئەگەر بیر لـە شتێك نەكاتەوە، گەورەیی ئەو لە چیدایە؟ هەنوكە ئەو ، ئەوكات حاڵی هەروەك پیـاوێكی خەوتوو ئەبێت، و ئەگەر بیر ئەكاتەوە، بـەڵام شـتێكی تـر زاڵـە بەسـەر(ئەندێشەی) ئـەودا، ئەوكات لەوێوە كە ناوەرۆكی ئەو نە ئـەم((بیركردنەوەیـە))یە، بـەڵكو هێـزە(توانادارێتیـە))، كەواتە ناتوانێت شەریفترین ناوەرۆك بێت، چونكە لـە رێگـای بیركردنـەوە و ئەندێشەوە، وای لێ لێدێت بـەرێزی پەیوەست بێـت پێیـەوە، هەربـەم شێوەیە چ نـاوەرۆكی ئـەو ئـەقڵ بێت و چ ئەندێشە، بیر لە چی ئەكاتەوە؟ ئەو یان بیر لەخۆی ئەكاتەوە یان لە شتێكی تـر، و ئەگەر بیر لە شتێكی تر ئەكاتەوە، یان هەمیشە بیر لەو شتە ئەكاتـەوە یـان لـە شـتێكی تر، كەواتـە ئایـا جیـاوازی هەیـە یـان نیە، بیركردنـەوە لـە جوانی(یـان بـاش) و یـان هـەر شـتێكی تـر؟ یـان ئایـا((بیركردنـەوە to dianoesthai)) لـە هەنـدێك لـە شـتەكان بۆ ئـەو بێمانـا نیـە؟(٢٥) كەواتـە ڕوونـە لـەوەی كـە خـودایی ترینـە بـیر ئەكاتـەوەو ناشـگۆڕێت، چونكە گۆڕانێك بە ئاراستەی خراپتر ئەبێت، و شتێكی لەم شێوەیە جۆرێك جووڵەی تێدا ئـەبێت، هەنووكـە ئەگـەر ئـەقڵ بیركردنـەوە نیـە، بـەڵكو هێـزە، یەكـەم، ئەگـەر لەوانەیـە كـە بەردەوامی لە بیركردنەوە بۆ ئەو ئازاراوی و ماندوو كەر بێت، پاشـان ڕوو نـە كـە ئـەبێت شـتێكی تـر لـە ئـەقڵ بـەرێزتر (٣٠) واتـە ((ئـەقڵێنراو to noumenon)) بێت، چـونكە ((ئەقڵاندن)) و((ئەندێشە كـردن)) هاوكـات پەیوەسـت ئـەبن بەكەسـێكەوە كـە بـیر لـە

خراپترین شت ئەکاتەوە، لەبەر ئەمە ئەگەر دەبێت خۆ لەم سنورە بپارێزرێت(چونکە نەبینینی هەندێك لە شتەکان باشترە لە بینینیان) ئەندێشە کردنی تەواو، باشترین شت نابێت، کەواتە ئەقڵ، وەك بەرزترین شت وایە، بیر لەخۆی ئەکاتەوە(٣٥) و((بیرکردنەوەی ئەو بیرکردنەوەیە لە بیرکردنەوە)).((ئەندێشەکردنی ئەو ئەندێشەیە لە ئەندێشەیە)).

بەڵام واخۆی دەرئەخات کە ناسین و هەست کردن و گوومان و تێگەیشتن هەمیشە پەیوەست ئەبن بە شتێکی ترەوە، بەڵام بە شێوەیەکی لاوەکی پەیوستن بە خۆیانەوە، و هەروەها ئەگەر ئەندێشە کردن و ئەندێشێنراو بوون (to noein kai to noeisthai)) جیاوازن،((چاکە)) بە پێی کام یەك لەوانە پەیوەست ئەبێت بە ئەقڵەوە؟ چونکە بوونایەتی بیرکردنەوەو بیرلێکراوەو یەکێك و هەمان نیە، جگە لەوەی کە لە هەندێك بواردا ناسینی هەمان شت (ناسراو)ە، لە زانستە دروستکەرەکاندا-بەدەر لەمادە- ئەم شتە، ناوەرۆك و ماهیەتە،

١٠٧٥a

بەڵام لەلای زانستە تیۆریەکان، ((ئەم شتە)) مانا و ئەندێشەیە، لەوێوە کە لە شتانێکدا کە مادەیان نیە،((ئەقڵێنراو))و((ئەقڵ)) دوو شتی جیاواز نین، کەواتە(هەردووك) هەمان ئەبن، و ئەندێشە یان ئەندێشێنراو یەکێکن.

(٥) بەڵام هەربەم شێوەیە ئەم پرسیارە ئەمێنێتەوە کە ئایا((ئەقڵێنراو)) تێکەڵە؟ چونکە ئەوکات ئەندێشە یان ئەقڵ بە پێی پەیوەستی بەهەریەك لە بەشە گشتەکان ئەگۆڕێت، بەڵام (وەڵام ئەوەیە کە) هەرچی خاوەنی مادە نیە، لێك هەڵوەشاو نیە، رێك وەك ئەقڵی مرۆڤ، یان ئەقڵی بوونەوەرە تێکەڵەکان، کە تەنیا لە کات گەلێکی دیاری کراودا حاڵەتێکی لەو شێوەیەی هەیە، (چونکە ئەو(ئەقڵە خوودایە) لەم کاتەدا یان لەو کاتەدا خاوەنی ((چاکە)) نیە، بەڵکو لە هەر شتێکدا لە باشترینەکانیان تێئەگات، کە شتێکی بەدەر لەخودی ئەوە)(١٠) و بەم شێوەیە لە سەرتاسەری(( رۆژگار))دا ئەندێشەیە لە خۆیەتی خۆ.

"وەرزی دەیەم"

# ( چاك و باشترین لە سروشتی گشتدا )

هاوکات ئەبێت توێژینەوەی ئەوە بکەین کە بەکام یەك لەم دوو شێوەیە، سروشتی گشت خاوەنی((چاك-باش to agathon)) و((باشترینto ariston)) ە، ئایا هەروەك شتێکی جیا و هەبوو و خۆی لەخۆیدا، یان هەروەك رێکخستن وریزبەندی(taxin) بەشەکانی، یان بەهەردوو جۆر، وەك سوپایەك؟ چونکە لێرەشدا ((باشی)) هەم لە رێکخستن و هاوریزی دایەو هەم لە سوپاسالاردا، بەڵکو زیاتر لە یەکێکیدایە،(١٥)چونکە ئەمە ئەو نیە کە بە هۆی رێکخستن و هاوریزیەوە بوونی هەیە، بەڵکو ئەو دانەیە(رێکخستن و هاوریزییە کە) بەهۆی ئەوەوە هاتۆتە بوون، هەموو شتەکان بە جۆرێك پێکەوە رێکخراون، بەلاّم نەك بەیەکسانی، ماسیەکان و باڵندەکان و گیاکان، حاڵەتی شتەکان بەو شێوەیە نیە کە یەکێکیان لەپەیوەندی لەگەڵ ئەوەی تریاندا نەبێت، بەڵکو پەیوەندیەك هەیە، چونکە هەموو شتەکان لە پەیوەندی لەگەڵ یەك بوونەوەردا پێکەوە رێکخراون، بەلاّم بارودۆخی ئەوان هەروەك بارودۆخی ناو خانوویەکە، کە تیایدا ئازادن (٢٠)و بەکەمترین شێوە رێی ئەوەیان پێی ئەدریت ئەوەی کە دێتە پێشەوە ئەنجامی بدەن، بەڵکو هەموو یان زۆربەی ئیشەکانی ئەمان رێکخراوە، بەلاّم کۆیلەکان و گیانەوەرەکان لە برێکی کەم لە کردارەکاندا هاوبەشن و زیاتر ئیشەکانیان ئەوەیە کە هەر چی بێتە ئاراوە، چونکە بنەمای هەریەك لەوانە سروشتێکی لەم شێوەیەیە، مەبەستم من ئەوەیە کە هەمووان بەناچاری بەرەو توانەوەو شی بوونەوە ئەچن، و شتەکانی تر لەم شێوەیەن کە هەمووان بەپێی ئەوان لەگشتدا بەشدارن.(٢٥)

بەلاّم هەموو ئەو مەحالاّت و بیّ ماناییانەی کە لە گووتەکانی ئەوانەوە بەدەست هات، و لەگەلّ ئەوەشدا، ئەوەی ناسکتر ووتوویانە، و ئەوەی کە کەمترین سەرگەردانیەکان لەلای کامیانەوەیە، نابیّت لەبەر چاو وون بکریّت،چونکە هەموو ئەمانە هەموو شتەکان لە دژەکان ئەهیّننە بون، بەلاّم نە قسەی((هەموو شتیّك)) و نە ((لە دژەکان))دروستە، و هەروەها ئەلّیّن کە ئەوشتانەی کە لەواندا دژن(٣٠)و بوونیان هەیە چۆن لەدژەکان دیّنە بوون، چونکە دژەکان لە بەرامبەر یەکتریدا کارتیّکەریان تیّناکریّت و ناخوازن کاریان تیّ بکریّت، بەلاّم بۆ ئیّمە ئەم مەسەلەیە وەك ((بوونی شتیّکی سیّهەمی)) بە شیّوەیەکی ئەقلاّنی چارەسەر ئەکریّت، بەلاّم ئەمان یەکیّك لە دوو دژەکە بەمادە ئەزانن، وەك کەسانیّك کە ((نابەرامبەر)) بە مادەیەك بۆ((بەرامبەر)) یان زۆریّتی بۆ تاکیّتی جیّگیر ئەکەن، بەلاّم ئەمەش بەهەمان شیّوە چارەسەر ئەکریّت، چونکە مادەی تاك(یەکیّتیانە) دژی هیچ شتیّك نیە،(٣٥) هەربەم شیّوەیە(بە پیّی بڕوای ئەمان.و.ف) هەموو شتەکان،جگە لەیەك، بەشدارن لە ((خراپەدا)) چونکە خودی ((خراپە)) یەکیّکە لە دوو توخم، بەلاّم ئەوانی تر تەنانەت چاکە و خراپە بە بنەما ئەژمار ناکەن، بە بوونی ئەمەش چاکە لەهەموو شتەکاندا بەرزترینە، ئەو گروپەی یەکەم ڕاست ئەکەن کە ئەلّیّن چاکە بنەما و بە بنەمای ئەژمار ئەکەن، بەلاّم نالّیّن کە چۆن چاکە بنەمایە، ئایا هەروەك ئامانج، یان هەروەك پالّنەر یان هەروەك شیّوە.

١٠٧٥b

تیۆریەی ((ئیّمپیّدوکلیس))یش بیّ مانایە، چونکە ئەو ئیشق بە((چاکە)) ئەزانیّت، بەلاّم ئەمە بنەمایەکە هەروەك پالّنەر(چونکە پیّکەوە کۆ ئەبیّتەوە) و هەم هەروەك مادە(چونکە بەشیّکە لە تیّکهەلّکیّشاوییەك) ئەگەریش ڕوو بدات کە یەکیّك و هەمان شت بنەمایەکی هەم هەروەك مادە بیّت و هەم هەروەك پالّنەر(٥) بەلاّم دیسانەوە بوونی ئەوان یەکیّك نیە، کەواتە((ئیشق)) لە چ ڕوانگەیەکەوە بنەمایە؟ و هەروەها بیّماناییە کە(ئەو ئەلّیّت)((نەبەرد)) لەناوچوو یان((لەناوئەچیّت))، ئەمە خۆی سروشتی خراپەیە.

بەلاّم((ئاناکساگۆراس)) چاکە بە بنەمایەکی هەروەك پالّنەر ئەژمار ئەکات، چونکە((ئەقلّ)) ئەهیّنیّتە جوولّە، بەلاّم ((لەبەر شتیّك)) ئەیهیّنیّتە جوولّە، واتە شتیّکی بەدەر لەخۆی، مەگەر ئەوەی کە خواستی بەو شیّوەیە بیّت(١٠) کە ئیّمە ئەلّیّین، چونکە(بە پیّی بڕوای ئیّمە) پزیشکی بەجۆریّك لەجۆرەکان هەمان تەندروستیە، و هەروەها بیّ ماناییە کە دژیّك بۆ چاکە و بۆ ئەقلّ دانەنریّت، بەلاّم هەموو ئەو کەسانەی کە قسە لە دژەکان ئەکەن، دژەکان بەکار ناهیّنن، مەگەر ئەوەی کە بڕواکانیان هەماهەنگ

بکەن، و هیچ کەسێك ناڵێت کە بە چ هۆیەك شتەکان لەناوچوون، و هەندێك شتیش لەناونەچوو، چونکە ئەمان هەموو بوونەوەرەکان لەهەمان بنەما سەرەتاییەکانەوە ئەهێننە بوون، و هەندێکیش بوونەوەرەکان لە((نا-بوونەوەر))ەوە ئەهێننە بوون، هەندێکیش بۆ ئەوەی کە ناچار بەم ئیشە نەبن، هەموو شتەکان بە((یەك))ئەزانن، هەربەم شێوەیە هیچ کەسێك ناڵێت بە چ هۆیەك دروست بون هەمیشە ئەبێت و هۆکاری دروست بوون چیە؟

کەسانێکیش کە دو بنەما جێگیر ئەکەن، و هەروەها کەسانێکیش کە((ئایدیە))یان قبوڵ کردووە، ناچارن کە بنەمایەکی زاڵتر قبوڵ بکەن، چونکە بە چ هۆیەك شتەکان (لە ئایدیەکان)دا بەشدار بوون یان بەشدارن؟ و ئەوانی تر هەر بەم شێوەیە ناچارن قبوڵ بکەن کە بۆ((دانایی))و بۆ بەرێزترین زانستیش دژێك هەر هەیە، بەڵام بۆ ئێمە بەم شێوەیە نیە، چونکە ئەوەی کە یەکەمینە هیچ دژێکی نیە، چونکە هەموو دژەکان خاوەنی مادەن و ئەمە هێزەکیانە بوونی هەیە و نەزانی کە((دژی)) داناییە، بە شتێك ئەڵێن کە دژی بنەمای یەکەمینە، بەڵام ئەوەی کە یەکەمینە هیچ دژێکی نیە.

هەر بەم شێوەیە ئەگەر شتانێکی تری بەدەر لە هەست پێکراوەکان بوونیان نەبێت، نە بنەما بونی دەبوو، نە رێکخستن و نە دروست بوون و نە تەنە ئاسمانیەکان، بەڵکو بەردەوام بنەمایەك بنەمایەکی هەیە، بەهەمان شێوە کە لەلای هەموو دونیاناسەکان وسروشت ناسەکان ئەبینرێت، بەڵام ئەگەر((ئایدیە و ژمارەکان)) بوونیان هەبێت، هۆکاری هیچ شتێك، و ئەگەریش نە هیچ شتێك، بەلایەنی کەمەوە نابێتە هۆکاری هیچ جووڵەیە، هەربەم شێوەیە چۆن لەوەی کە گەورەیی نیە، شتێکی گەورەو و پێکەوە پەیوەست دروست بکرێت؟ چونکە ژمارە، نە هەروەك پاڵنەر و نە هەروەك شێوە، شتێکی پێکەوە بەستراو ناهێنێتە بوون، و هەروەها هیچ یەك لە دژەکان ناتوان پێکهێنەر(بکەر) بن و ناشتوانن پاڵنەر بن، چونکە ئەگەری هەبوو کە بوونی نەبێت، بەڵام بەهەر حاڵ (کردار)ی ئەو، لەپاش هێزی ئەو دەبوو، کەواتە بوونەوەرگەلێکی جاویدانیش بەدەست نەدەهاتن، بەڵام هەن بوونەوەرگەلێك کە جاویدانن، کەواتە یەکێك لەم دوو تیۆریە ئەبێت لەکایەکە بخەینە دەرەوە، بەڵام چۆن؟ پێشتر گووترا.

١٠٧٦a

زیاد لەمەش لەبارەی ئەوەی کە لە چ روویەکەوە ژمارەکان، یان رۆح(دەروون)، یان تەن یان بەگشتی هەم شێوەو هەم شت، یەکن، هیچ کەس شتێك ناڵێت، گوتنی شتێکیش مەحاڵە، مەگەر بەو شێوەیە بێت کە ئێمە ئەیڵێین، واتە پاڵنەری (یەکەم) بەو

جۆرە دروستی ئەکات، بەڵام کەسانێك کە ئەڵێن ژمارەکانی بیرکاری یەکەمین و بەم شێوەیە بەردەوام ناوەرۆکێك لەدوای ناوەرۆکێکی تر ئەهێنن و بۆ هەریەك بنەمایەکی تر ئەهێننەوە، ناوەرۆکی(جیهان)ی گشتیش تێك و پێك ئەدەن،(چونکە هیچ ناوەرۆکێك لەگەڵ ناوەرۆکێکی تردا پێکەوە کۆ نابنەوە، چ بێت و چ نەبێت) و بنەماگەلێکی زۆر بەدەستەوە ئەدەن، بەڵام بوونەوەرەکان نایانەوێت بە خراپی فرمان بدرێت بەسەریاندا.

((باش نیە چەند فەرمانرەوایی، با فەرمانرەوا یەکێك بێت))[1].

---

[1] دێڕێك لە((ئیلیادە))ی هۆمیرۆسن،دێری ۲۰٤

"وەرزی یەکەم"

# ( شتـــــەکانی بیرکاری )

١٠٧٦a

(٨) کەواتە لە بارەی ناوەڕۆکی هەست پێکراوەوە گوترا کە چیە، یەکەمجار لە نامەی پەیوەست بە ((سروشتایەتیەکان))دا، لە گووتاری مادەدا، و پاشان لە گوتارە پەیوەست بە ناوەڕۆکەکان لە ڕوانگەی کرداریێتیەوە، (١٠)بەڵام لەوێوە کە توێژینەوە لەم بارەیەوەیە کە ئایا لەپاڵ و جیا لە ناوەڕۆکە هەست پێکراوەکان، ناوەڕۆکێکی نەجوڵاو و جاویدان هەیە یان نیە(؟)ن و ئەگەر هەیە چیە(؟)پێویستە کە یەکەمجار لە سەر بڕوای کەسەکانی تر کەمێك ڕامێنین، بۆ ئەوەی کە ئەگەر شتێك بە نادروستی ئەڵێن، خۆمان لەئەگەری تووش بوونی ئەو هەڵانە بە دوور بگرین، و ئەگەریش بڕوایەکی هاوبەش لە نێوان ئێمەو ئەواندا بوونی هەیە (١٥)،لەم ڕوانگەیەوە بەتایبەتی نابێت خۆمان بەکەم بزانین، چونکە مرۆڤ ئەگەر هەندێك لە شتەکان باشتر و هەندێکی شتی تر نە خراپتر لەوانی تر بڵێت، ئەبێت مایەی دڵخۆشی بێت.

لەم بارەیەوە دو بڕوا بوونیان هەیە، هەندێك ئەڵێن کە شتەکانی بیرکاری، وەك ژمارەکان و هێڵەکان و شتە پەیوەستەکانی بەمانە، جۆرێکن لە ناوەڕۆکەکان، و جارێکی تر((ئایدیەکان))بە ناوەڕۆك ئەژمار ئەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێك ئەمانە بە دو ڕەگەز ئەژمار ئەکەن،(٢٠)- ئایدیەکان و ژمارەکانی بیرکاری،و هەندێکیش هەردووکیان لە یەك سروشتەوە ئەژمار ئەکەن، کەواتە یەکەمجار ئەبێت لەبارەی شتەکانی بیرکاریەوە توێژینەوە بکرێت، بێ ئەوەی هیچ جۆرە سروشتێکی تر بخرێتە سەریان، (وەك ئەوەی کە بپرسن کە ئایا ئەوانە ئایدیەکانن یان نا، و ئایا بنەماکان و ناوەڕۆکەکان

بوونەوەرەکانن یان نا،(٢٥)بەڵکو تەنیا(ئەبێت تەنیا ئەم پرسیارە دابڕێژرێت کە) ئایا ئەوان بە پێی شتە بیرکاریەکان بوونیان هەیە یان بوونیان نیە؟ و ئەگەر بوونیان هەیە، چۆن بونیان هەیە، پاشان ئەبێت بەجیا لەبارەی خودی ئایدیەوە بە شێوەیەکی ڕەها و بەو ئەندازەیە کە شێوەی توێژینەوەیەك ئەیخوازێت و داوای ئەکات، توێژینەوەی بکەین، چونکە لەبارەی زۆربەی ئەم بابەتانە لەو نووسینانەی کە لە دەرەوەی قووتابخانە بڵاوبوونەوە، قیل و قاڵی زۆر بووە، هاوکات ئەبێت پێداچوونەوەیەکی تایبەت تر تەرخانی ئەم بوارە بکرێت،(٣٠) ئەویش کاتێك پێداچوونەوە بکەین کە ئایا ناوەڕۆکەکان و بنەمای بوونەوەرەکان، ژمارەو ئایدیەکانن یان نا، چونکە لە دوای پەرژانە سەر ئایدیەکان ئەم پێداچوونەوەی سێهەمە ئەمێنێتەوە.

بەڵام ئەگەر شتە بیرکاریەکان بوونیان نیە، بەناچاری یان لە هەست پێکراوەکاندا هەن-وەك ئەوەی کە هەندێك ئەڵێن- یان جیا لەهەست پێکراوەکانن،(چونکە هەندێك کەسیش بەم شێوەیە قسان ئەکەن)،(٣٥) یان ئەگەر هیچ کام لەم دووانە نین، کەواتە یان بە هیچ شێوەیەك بونیان نیە، یان بە شێوەیەکی تر بوونیان هەیە، لەبەر ئەوە گووتارەکەی ئێمە لەبارەی((بوونایەتی)) ئەوانەوە نیە، بەڵکو لە لێوارەکانی و دەروورووبەری بوونایەتی ئەوانەوە ئەبێت.

"وەرزی دووەم"

## ( شتەکانی بیرکاری ناتوانن هەروەك ناوەڕۆکە جیاوازەکان بوونیان هەبێت )

١٠٧٦b

کەواتە ئەوەی کە مەحاڵە شتەکانی بیرکاری لە هەست پێکراوەکان بوونیان هەبێت- و ئەوەی کە لەهەمان کاتدا ئەمە قسەیەکی دروست کراوە،-لە گوتارە پەیوەست بە گوومانە دژوارەکانداً بەیان کراوە، چونکە بوونی دوو تەن لەیەك شوێندا مەحاڵە، و ئەگەرنا هەربەم هۆیە هێزەکان و سروشتەکانی تریش لە هەستپێکراوەکاندا بوونیان دەبوو، و هیچ یەك لەوانە ناتوانێت بە جیا بوونی هەبێت، هەموو ئەمانە لەدوای ئەمە بەیان کراوە، بەڵام بەدەر لەمەش ئاشکرایە کە بە پێی ئەم بڕوایە مەحاڵە کە هیچ تەنێك دابەش بکرێت، چونکە(٥) یەکەمجار ئەبیت بەپێێ ئاست دابەش بووبێت، و(بە نۆبەی خۆی) ئەمیش بە پێی هێڵ، و خودی ئەمەش بە پێی خاڵە، بە شێوەیەك ئەگەر دابەش بوونی خاڵ مەحاڵە، دابەش کردنی هێڵیش مەحاڵە، و ئەگەر ئەمەش مەحاڵە، ئەوانی تریش هەربەم شێوەیەن، کەواتە هەنووکە چ جیاوازییەکی هەیە کە یان هەست پێکراوەکان لەم جۆرە سروشتانە بن یان لەمانە نەبن، (١٠) یان لەواندا ئەم جۆرە سروشتانە بوونیان هەبێت؟ چونکە ئەنجامەکە هەر یەکێکە، چونکە بەدابەشبوونی هەست پێکراوەکان(ئەو سروشتانە، واتە شتەکانی بیرکاری.و.ف)یش دابەش ئەبن، یان ئەوەی کە هەست پێکراوەکانیش ناتوانن دابەش بوو بن.

بەلاّم هەربەم شێوەیە مەحاڵە کە ئەم جۆرە سروشتانە بە جیا بوونیان هەبێت، چونکە ئەگەر لەپاڵ هەست پێکراوەکان و جیا لەوانە، تەن گەلێکی تر و لە پێش هەست پێکراوەکان بوونیان دەبوو، ڕوونە کە لە پاڵ ئاستە (هەست پێکراوەکان)یش بێگومان ئەبێت ئاست گەلێکی تری ((بەجیا)) بوونیان هەبێت،(١٥)(هەربەم هۆیەوە)و هەربەم شێوەیە خاڵەکان و هێڵەکانی تر ئەبێت بوونیان هەبووایە، ئەویش بەهەمان هۆ، بەلاّم ئەگەر ئەمانە بوونیان هەبێت (بوونەوەر بن.و.ك) جارێکی تر لەپاڵ ئاستەکان و هێڵەکان و خاڵەکانی تەنە بیرکارییەکان،((چەندین ئەوانی تر)) ئەبێت بەجیاجیا بوونیان هەبێت، چونکە ناتێکەڵەکان لە پێش تێکەڵبووەکانەوەن، و ئەگەر تەنە هەست پێنەکراوەکان لە پێش هەست پێکراوەکانەوەن(٢٠) ئەوکات بە پێی ئەم بەڵگەیە، ئاستەکان لەخۆیاندا ئەبێت لە پێش ئەو ئاستانەوە بن کە لە تەنە نەجوڵاوەکاندا بوونیان هەیە، لەبەر ئەمە ئەم ئاستانە و ئەم هێڵانە بەدەرن لەوانەی کە هاوکات لە تەنە جیاوازەکاندا بوونیان هەیە، چونکە هەندێك ئەبێت هاوکات لەگەڵ تەنە بیرکارییەکان و هەندێك لە پێش تەنە بیرکارییەکانەوە بوونیان هەبێت،(٢٥) کەواتە جارێکی لەم ئاستانەدا چەندین هێڵ بوونیان هەیە، کە دیسانەوە بەم هۆیە لە پێش ئەوانەوە ئەبێت چەندین هێڵ و خاڵی تر بوونیان هەبێت، و لەپێش ئەم خاڵ و هێڵانەوە ئەبێت خاڵ گەلێکی لەپێشتر بوونیان هەبێت،کە ئیدی لە پێش ئەوانەوە خاڵ گەلێکی تر بوونیان نیە، بەلاّم ئەم کەڵەکە بوونە بێ مانا ئەبێت، چونکە ئەنجامەکە ئەوەیە کە ئێمە لە لایەکەوە لەگەڵ یەك گروپ لە تەنەکان لەپاڵ تەنە هەست پێکراوەکاندا لە ڕووبەڕوودایین، بەلاّم لەلایەکی ترەوە لەگەڵ سێ گروپ لە ئاستەکان لەپاڵ ئاستە هەست پێکراوەکان(ڕوبەروو ئەبین)،واتە ئەوانەی کە جیا لە ئاستە هەست پێکراوەکان بوونیان هەیە، و ئەوانەی کە لەتەنە بیرکارییەکاندا (بوونەوەرن-بوونیان هەیە) و هەروەها ئەوانەی کە جیا لەوانەی بوونیان هەیەو لەوانە تەنە بیرکارییەکاندا بونیان هەیە، واتە چوار گروپ لە هێڵەکان و پێنج گروپ لە خاڵەکان، لەبەر ئەمە زانستەکانی بیرکاری لەگەڵ چ جۆر گەلێك لەمانە لە پەیوەندی دان؟ بێگومان لەگەڵ ئاستەکان و هێڵەکان و ئەوخاڵانەی کە لە تەنی نەجوڵاودان نیە ، چونکە زانست هەمیشە لەگەڵ شتێکی" لەپێشتر" لە پەیوەندی دایە.

ئەم بەڵگاندنە لەبارەی ژمارەکانیشەوە هەر ڕاستە، چونکە لەپاڵ تاك خاڵەکانیشدا((یەك)) گەلێکی تر بوونیان هەیە، و لە پاڵ تاك بوونەوەرەکانیشدا لە لایەکەوە هەست پێکراوەکان و پاشان(و لەلایەکی ترەوە) ئەقڵێنراوەکان بوونیان ئەبێت، وەك چۆن بڵێی ئەبێت ژمارە بیرکارییەکان بە شێوەیەکی ناکۆتا بونیان هەبووایە.

بەدەر لەمەش، چارەسەر کردنی ئەو مەسەلانەی کە ئێمە لە گووتارە گوومانـاوی و دژوارەکاندا بەیانمان کردن، چۆن ئەگەر هەیە؟ چونکە ئەو شتانەی کە ئەستێرەناسی لە پەیوەندی دایە لەگەڵیاندا، ئەبێت بەهەمان شێوە لە پاڵ و جیا لە هەست پێکراوەکان بن، و هەروەها(هەربەم شێوەیەشە لەبارەی)ئەو شتانەی کە ئەندازیاری پەیوەندی هەیە پێیانەوە،((بەڵام چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە یەك ئاسمان و بەشەکانی لەپاڵ ئەم ئاسمانە هەست پێکراوەدا- یان هەر شتێکی تر کە خاوەنی جووڵەیە- بوونی هەبێت؟)) و لەبارەی بینراوەکان و تێکەڵەی ئاهەنگەکانیش هەربەم شێوەیە(٥) چونکە ئەوکات ئاواز و دیمەنێکی جیا و لەپاڵ هەستپێکراوەکان و تاك شتەکان ئەبێت بوونی هەبێت، بە شێوەیە ڕوونە کە هەستەوەرەکان و هەست پێکراوەکانی تریش ئەبێت بە جیاجیا بوونیان هەبێت، (چونکە بۆ چی ئەبێت شتانێکی زیاتر لە شتانێکی تر لەم شێوەیە بن؟) وە ئەگەریش بەم شێوەیەیە، ئەوکات، تا ئەوشوێنەی کە هەستەوەرگەلێکی( جیا لە هەست پێکراوەکان) بونیان هەیە، گیانداره جیاوازەکانیش بوونیان ئەبێت.

هەربەم شێوەیە لە لای بیرکاری زانەکانەوە لەپاڵ ئەم ناوەرۆکانەدا هەندێك مەسەلەی گشتی خراوەتە ڕوو، کەواتە ناوەرۆکێکی تری نێوانی بوونی(١٠) دەبێت کەهەم لە((ئایدیەکان)) جیایە و هەم لە ((نێوانەکان))، ناوەرکێك کە نە ژمارەیە و نە خاڵ، نە ئەستورە، و نە کاتە، بەڵام ئەگەر شتێکی مەحاڵە، بەئاشکرا ئەوەش مەحاڵ ئەبێت کە ناوەرۆکی جیا لە هەست پێکراوەکانی بوونی هەبێت(یان بوونیان ببێت).

بەگشتی ئەنجامێك بەدەست دێت کە هەم لە گەڵ ڕاستی دا دژەو هەم لەگەڵ ئەوەی کە زۆرجار قبوڵ کراوە، ئەگەر(١٥) کەسێك بەم شێوەیە شتەکانی بیرکاری هەروەك سروشتگەلێکی جیا بە بوونەوەر( ئەژمار بکات) یان (گریمانە بکات)، چونکە لەو ڕووەوە کە ئەوان بەم شێوەیە بوونیان هەیە، کەواتە بە شێوەیەکی پێویست(پێویستانە) لە پێش گەورەییە هەست پێکراوەکانەوەن، لەکاتێکدا کە بە پێی ڕاستی لەداوی ئەوانەوەن، چونکە گەورەییەکی ناکامڵ(ناتێروتەسەل) بە پێی پێکهاتن لە پێشەوەیە، بەڵام بە پێی ناوەرۆك لەدواوەیە،(٢٠) وەك بێ گیان لەبەرامبەر گیاندار.

بەدەر لەمەش لە چ ڕویەکەوە و چ کاتێك گەورەییەکانی بیرکاری((یەك))ن؟ چونکە شتە ئەم جیهانیەکان تارادەیەك بە یارمەتی ڕۆح یان بەشەکانی ڕۆح، یان شتێکی تر، ئەبن بە یەك، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، گەورە و لێك پەرتەوازە ئەبن، بەڵام لەوێوە کە ئەوان(واتە گەورەییە بیرکاریەکان) دابەشخواز و لەریزی چەندایەتیەکانن، هۆکاری یەك- بوون پێکەوە خربوونەوەیان چیە؟

زیاد لەم دروست بوونەی ئەوان( واتە شتەکانی بیرکاری)یش ئەم خاڵەش ڕوون ئەکاتەوە،(٢٥) چونکە یەکەم جار لەئاراستەی درێژیەوە دێنە بوون، پاشان لە ئاراستەی پانایی و سەرەنجام لە ئاراستەی(قووڵی)) و بەمە مەسەلەکە کۆتایی دێت، کەواتە ئەگەر ئەوەی کە بە پێی پێکهاتن لەدواوەیە و بە پێی ناوەرۆک لە پێشەوە بێت، لەو شێوەیەدا ئەبێت لە پێش ئاست و درێژیەوە بێت و بەم شێوەیە زیاتر((کامڵ–تێروتەسل))و ((گشت)) ئەبێت، چونکە ئەبێتە خاوەنی ڕۆح، بەڵام یەك هێڵ یان یەك ئاست چۆن ئەتوانێت ڕۆحدار بێت؟ (٣٠)چونکە گریمانەیەکی لەم شێوەیە لە سەرەوەی پەی بردنە هەستەکیەکانی ئێمەوەیە.

بەدەر لەمەش، تەنیش جۆرێکە لە ناوەرۆکی ئێمە، چونکە ئارادەیەك بە جۆرێك لەجۆرەکان کامڵە، بەڵام هێڵەکان چۆن(لە ریزی) ناوەرۆکەکانن؟ نەك وەك جۆرێك لە شێوەو شکڵ، بەو شێوەیەی کە بۆنموونە ڕۆح بەم شێوەیەیە، و نە بە پێی( و وەك) مادە،بەو شێوەیەی کە ((تەن))ە، چونکە وا دەرئەکەوێت کە هیچ شتێك ناتوانێت نەلە ئاستەکان و نە لەخاڵەکان (٣٥) فەراهەم بێت، بەڵام ئەگەر ئەمانە جۆرێك لە ناوەرۆکی مادی بوونایە، ئەوکات ئاشکرا بوو کە توانایی کرداراندنێکی لەم شێوەیەیان دەبوو.

١٠٧٧b

هەنوکە با وادابنێین کە(شتەکانی بیرکاری) بە پێی مانا لە پێشەوە بن، بەڵام بەم شێوەیە نیە کە هەموو ئەو شتانەی کە بە پێی مانا لە پێشەوەن، بە پێی ناوەرۆکیش لە پێشەوە بن، شتانێك کە بە پێی ناوەرۆك لە پێشەوەن، کە هەروەك شتانێکی سەربەخۆ– لەروانگەی بوونەوە– لەوانی تر لە سەرەوەن، بەڵام بە پێی مانا شتانێك لە پێشەوەن کە لەماناکانی ئەوانەوە مانای شتانێکی تر فەراهەم دێت، بەڵام ئەم خەسڵەتانە هاوکات بوونیان نیە، (٥) چونکە ئەگەر دەرکەوتەکان، بۆ نموونە((یەك پاڵنەر))یان((سپی))جیا لە ناوەرۆك نین، کەواتە((سپی)) بە پێی مانا لە پێش ((مرۆڤی سپی))ەوەیە، بەڵام نەك بە پێی ناوەرۆك، چونکە(سپی) مەحاڵە بە جیا و سەربەخۆ بونی هەبێت، بەڵکو هەمیشە هاوڕێ لەگەڵ((گشتدا))دیاری کراوە، مەبەستم لە((گشتی دیاری کراوی مرۆڤیی سپییە))، لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە نە ئەوەی کە لە ئەبستراکتیەتەوە بەدەست دێت(١٠) لە پێشەوەیە، و نە ئەوەی کە لە((خستنە سەر))ەوە بەرهەم دێت، لە دواوەیە، چونکە بە خستنە سەری((سپی))یەوەیە کە قسە لەسەر((مرۆڤی سپی)) ئەکرێت.

کەواتە بە ئەندازەیەکی پێویست بەیان کرا، کە(شتەکانی بیرکاری) نە زیاتر لە تەنەکانی ناوەرۆکن نە بە پێی بوونی هەست پێکراوەنەوە لە پێشترن، بەڵکو تەنیا بە

پێی مانا(یە کە لە پێشەوەن)، هەروەها ئەگەری ئەوە هەیە کە بە جیا لە شوێنێکدا بوونیان هەبێت، هەر لەوێشەوە کە ئەگەری نەبووە لە هەست پێکراوەکاندا(١٥) بونیان هەبوو بێت، کەواتە ئاشکرایە کە ئەوان یان بە هیچ شێوەیەك بوونیان نیە یان بە شێوەیەکی دیاری کراو بونیان هەیە، و بەم هۆیەوە و بە شێوەیەکی ڕەها بوونیان نیە، چونکە ئێمە بە جۆرگەلێکی زۆر قسەمان لەسەر ((بوون)) کرد.

## "ورمزی سێهەم"

# ( بیرکاری و بابەتەکانی )

ڕێك هەربەو شێوەیەی کە لە بیرکاریدا،((گشتایەتی مەسەلەکان ta katholou)) لەگەڵ جیاوازی گەلێکی بەدەر لە((گەورەییەکان)) و ژمارەکان پەیوەندی لەگەڵ هیچ شتێکدا نیە، بەڵکو بەهەموو شێوەیەك لەپەیوەندی دان لەگەڵ ئەمانەدا، ئەویش نەك لەو ڕوانگەیەوە کە ئەمانە خاوەنی گەورەیی یان دابەش خوازین(٢٠)، کەواتە ڕوونە کە ماناکان و ئەو گریمانانەی کە لە بارەی گەورەییە هەست پێکراوەکانەوە ئەتوانن بوونیان هەبێت، بەلاّم نەك هەروەك هەست پێکراوەکان بەڵکو هەروەك شتانێك کە خاوەنی گەورەدییەکی لەو شێوەیەن، چونکە ڕێك بەهەمان جۆر کە لە بارەی شتە تەنیاکان لەو ڕوانگەیەوە کە جووڵاون- بەدەر لە چیەتی هەریەك لەوانە و هەروەها جیا لە دەرکەوتەکانیان- قسەی زۆر هەیە(٢٥)، و هەمان جۆر کە بەم هۆیەوە پێویست بەوە ناکات کە یان جووڵێنراویکی جیا لە هەست پێکراوەکان بوونی هەبێت یان سروشتێکی جیا تیایاندا بەدەست بێت، بە هەمان شێوەش قسەکان و زانست گەلێك کە لەبارەی جووڵێنراوەکانەوە بوونیان ئەبێت، بەلاّم نەك لەڕوانگەی جوڵێنراوەکانەوە، بەڵکو تەنیا لە ڕوانگەی تەنەکانەوە، و دیسانەوە تەنیا لەڕوانگەی ئاستەکان و تەنیا لەڕوانگەی درێژیەکانەوە، و هەروەها لەڕوانگەی دابەشخوازیەکان یان دابەشنەخوازیە خاوەن بارودۆخاکان(٣٠) و یان تەنیا لە ڕوانگەی دابەش نەخوازیەکانەوە، لەبەر ئەوە لەوێوە کە بە ڕەهایی دروستە ئەگەر بڵێن کە نە تەنیا جیاوازیەکان (ئەو شتانەی کە بە جیا بوونیان هەیە)، بەڵکو بەدەر لە جیاوازەکانیش بوونیان هەیە،(وەك ئەوەی کە بڵێن

جووڵێنراوەکان بوونیان هەیە) هەربەم شێوەیە بە ڕەهایی دروستە ئەگەر بڵێن کە شتەکانی بیرکاریش بوونیان هەیە، ئەویش بەو جۆرە کە بیرکاری زان ئەڵێت، و هەروەها بە هەمان جۆر کە بە ڕەهایی راستە ئەگەر بڵێن کە زانستەکانی تر(٣٥)لە پەیوەندی لە گەڵ مەسەلەیەکی تایبەت و دیاری کراودان، نەك لەگەڵ شتێك دەرکەوتانەی وەك{((سپی) )ئەگەر ((تەندروست)) سپی بێت ، و زانست لەگەڵ((تەندروستی)) پەیوەندی هەیە}

١٠٧٨a

بەڵکو لەگەڵ ئەوشتەی کە هەر تاك زانستێك پێوە سەرقاڵ ئەبێت- بۆ نموونە((تەندروست)) ئەگەر لە روانگەی((تەندروست))ەوە بپەرژێتە سەری، یان بە((مرۆڤ)) لەو رووەوە کە((مرۆڤ))ە- بەم شێوەیە ئەتوانرێت لەبارەی ئەندازیاریشەوە قسە بکرێت، ئەگەر ئەوەی کە ئەم زانستە ئەیپەرژێتە سەری بە شێوەیەکی دەرکەوتانە لە هەست پێکراوەکان بێت-هەر چەند نەك هەروەك هەست پێکراوەکان بیپەرژێتە سەریان- و ئەمە بەو مانایەیە کە زانستەکانی بیرکاری زانست گەلێکی پەیوەست بە هەست پێکراوەکان نابن، بەڵام ئەمە بەو مانایە نیە کە لەشتەکانی تر جیا و لە پاڵ هەست پێکراوەکاندا لە پەیوەندی دان.

(٥) بەڵام زۆرێك لە ((دەرکەوتە لەخۆکان)) لە شتەکاندا-لەو روانگەیەوە کە هەریەك بە تاقانەیی بوونی هەیە- بەدەست دێت، بۆ نمونە ئاژەڵ لە روانگەی نێرینە و مێینەوە خاوەنی کرداراندنێك یان(هەڵچوون.و.ك) گەلێکی تایبەتە،( بو بوونی ئەم شتە کە نێرینە و مێینە، بە شێوەیەکی جیا و(سەربەخۆ) لە ئاژەڵەکان بوونی نیە) لەسەر بنەمای ئەمەش دەرکەوت گەلێکی تایبەتیش بۆ شتەکان- تەنیا لەو روانگەیەوە کە ئەوان درێژیەکان و ئاستەکانن- بوونیان هەیە، بەهەمان نیسبەت شتێك، کە ئێمە سەرقاڵین و بە پێی مانا لە پێش و سادەیە(١٠) بەهەمان نیسبەت (ناسینی ئێمە لەو.و.ف) خاوەنی وردبینیەکی زیاترە،(وردیەك کە هەمان سادەییە) لەسەر بنەمای ئەمە زانستێك کە لەگەڵ ((گەورەیی)) سەروکاری نیە، وردترە لەو زانستەی کە سەروکاری لەگەڵ گەورەیی دا هەیە، و وردترین زانست ئەوەیە کە سەروکاری لەگەڵ ((بێجووڵە)) داهەیە، یان ئەگەریش ((لە گەڵ جووڵەداردایە)) کاتێك وردترین زانستە کە لەپەیوەندی لەگەڵ ((یەکەمین جووڵە))دا بێت، چونکە ئەمە سادەترین جووڵەیە، و سادەترین شکڵی جووڵە هەمان جووڵەی هاوسەنگە.

هـەر ئـەم قـسەیە لـەبارەی زانـستی تێکەڵـەکان و ئاهەنگـەکانیش و بینراوەکـانیش (ئوپیتیك)ەوە هەر راستە، چونکە هیچ کام لەوانە(١٥) بینایی لەروانگەی بینین یان ئاواز لەروانگـەی ئـاوازەوە  توێژینـەوە ناکـەن، بـەڵکو لـە روانگـەی هێڵـەکان و ژمارەکانـەوە ئەپەرژێنـــە ســـەریان، هەرچـــەندە ئەمانـــە دەرکەوتـــە تایبەتـــەکانی ئـــەوانن، زانـــستی میکانیکیش خاوەنی بارودوخێکی لەم شێوەیەیە، لەبەر ئەمە ئەگەر کەسێك شتەکان بە جیا و سەربەخۆ لە دەرکەوتەکانیان لەبەر چاو بگرێت و لەبارەیانەوە هەروەك ئەوەی کە هەن توێژینەوە بکات، بەم هۆیەوە تووشی هیچ هەڵەیەك نابێت رێك هەروەك ئەوەی کە ئەو هێڵێك لەسەر زەوی بکێشێت و بڵێت کە درێژیەکەی یەك هەنگاوە، لەکاتێکدا کە یەك هەنگاو نیە(٢٠) چونکە هەڵە یان(درۆ) لە پێشەکیدا نیە.

باشترین شێوەی توێژینـەوەی و پێراگەیـشتنی هـەر تـاك شـتێك بـەم شـێوەیەیە کـە کەسـەکە ،شـتێك کـە جیـا نیـە، بـەجیا سـەیری بکـات، بـە شـێوەیەك کـە ژمێریـار و ئەندازیارەکان ئەوە ئەنجام ئەدەن، چونکە مرۆڤ لەروانگـەی مرۆڤەوە شتێکی تاقانە و دابەشنەخوازە، ژمێریار سەیری شتێکی تاکی دابەشنەخواز ئەکات و پاشان سەیری ئەوە ئەکات کە ئایا شتێك لـە مرۆڤەوە لەو روانگەیەوە کە دابەشنەخوازە دەرئەکەوێت یـان نـا(٢٥) بـەڵام ئەندازیار ئـەو لـەو روانگەیـەوە کـە مرۆڤـە یـان لـەو روانگەیـەوە کـە دابەشـخوازە، لەبەرچـارو ناگرێـت، بـەڵکو ئـەو هـەروەك تـەنێك گریمانـە ئـەکات، چـونکە ئـەوەی کـە بـەو، و تەنانـەت ئەگـەریش بـە جـۆرێکی دابـەش نـەخواز بێـت، پەیوەسـتە، لەوانەیە بە بێ ئەوانەش پەیوەست بێت پێیەوە ، لەبەر ئەمە ئەندازیار بـە دروسـتی ئـەوە دەرئـەخات کـە گفتگۆیـەکانیان لـەبارەی ((بوونـەوەر))ەوەیـە(٣٠) و ئـەم بوونەوەرانـە بوونیـان هەیـە، چـونکە ((بوونـەوەر)) دووجـۆرە: لەلایەکـەوە بوونـەوەری لەوپـەڕی پەرەپێداندا و لەلایەکی ترەوە بوونەوەری (مادەکی- واتە هێزەکیانە).

بەڵام لەوێوە کە ((چاك))و((جوان)) جیاوازن، (چونکە هەمیشە لە کرداردایە، بەڵام جوانی لە شتە نەجووڵاوەکانیشدا بوونی هەیە) کەواتە هەڵـە ئەکەن کەسانێك کە ئەڵێن زانستەکانی بیرکاری لەبارەی جوانی یان چاکەوە قسە ناکەن، چونکە ئەو زانستانە بە باشترین شێوە لەبارەی ئەوانەوە(جوانی وچاکە) قسە ئەکەن،(٣٥) و بەڵگەش بۆ ئەوە ئەهێننـە، چـونکە ئەگـەریش نـاوی ئەوانـەیان نەبردایـە، کـردارو ماناکانیـان ئـەوانی دەرئەخست و بەڵگەی بوونی ئەوان دەبوون، و ئەمە بەو مانایە نیە کە لـەبارەی ئەوانـەوە شتێك نالێن،

١٠٧٨b

جۆرە بەرجەستەکانی جوانی بریتین لە((رێك خستن و گوونجاوی و دیاری کردن))، ئەمانە زیاد لە هەمووان، زانستەکانی بیرکاری ئەیان سەلمێنن، و لەوێوە کە ئەمانە(مەبەستم لە رێکخستن و دیاری کردنە) هەروەك هۆکاری زۆرێك لە شتەکان ئاشکرا ئەبن، کەواتە ڕوونە کە ئەو زانستانە ئەیانپەرژێتە سەر ئەم جۆرە هۆکارانەشەوە، کە هەروەك جوانی بە شێوەیەك هۆکارە،(٥) لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی پڕماناتر لە شوێنێکی تردا قسە ئەکەین.[1]

---

[1] وادیارە کە ئەرستۆ وەفای بۆ قسەکەی خۆی نەبووەو لە بەرهەمەکانی ئەودا شتێك لەم بارەیەوە بەدەست نایەت.و دیار نیە.

## "وەرزی چوارەم"

# ( رەخنە لـــــە تیۆریەی ئایدیەکان )

کەواتە لەبارەی ئەوەی کە شتەکانی بیرکاری بوونیان هەیە و چۆن بوونەوەرن و چۆن لـە پێشترن و چۆن لـە پێشەوە نین، هـەمان ئەندازە کـە گـووترا بەسـە، بـەڵام لـەبارەی ئایدیەکانەوە، یەکەم خودی بڕوا بە ئایدیە ئەخەینە ژێر توێژینـەوە،(١٠) بـیَ ئـەوەی کـە سروشتی ژمارەکان پێکەوە ببەستین، بەڵکو (توێژینەوەکەی ئێمە ئەبێت بەو) جۆرە بێت کە یەکەمین باوەڕهێنەران بە ئایدیەکان لە سەرەتاوە وێنای ئەوەیان ئەکرد.

باوەڕ هێنان بە ئایدیە لەو ڕووەوە کە بۆ ئەوانەی کە رازین پێی، لەوەوە هاتە پێشەوە کـە باوەڕیـان بـە راسـتێی قـسەکانی ((هراکلایتـوس)) هـەبوو کـە ئـەڵێت((هـەوو هەسـت پێکراوەکان بەردەوام لە گووزەردان)) بە شێوەیە کە ئەگەر ((١٥) ناسین و تێڕوانینێك لـە شـتێك بـوونی هـەبێت، کەواتـە ئـەبێت سروشـت گـەلێکی پایـەدارتر لەوپـەڕی هەسـت پێکراوەکانـەوە بوونیـان هـەبێت، چـونکە هـیچ ناسـینێك بـۆ شـتە ((لـەگووزەرەکان-گۆڕاوەکـان)) بـوونی نیـە، بـەڵام ((سـوقرات)) لـەو کاتـەدا پێراگەیـشتن بـە ((فەزیلەتـە ئەخلاقیـەکانی)) کردبوویـە پیـشە و یەکـەمین کـەس بـوو کـە لـەبارەی ئەوانـەوە، بـەدوای پێناسـەیەکی گشتی ئەگـەڕا،(چـونکە لـە نێـوان سروشتناسـەکان تـەنها دیمۆکریتـوس، ئـەویش کـەمێك، (٢٠) هەسـتی بـەم مەسـەلانە ئـەکرد، و بـەجۆرێك لـە جۆەکـان ((گـەرم))و((ساردی)) پێناسـە ئـەکات، پـیش ئـەویش پیتاگۆریـەکان بـە کـورتی لـەبارەی هەنـدێك لەشـتەکانەوە خۆیـان سـەرقاڵ کردبـوو و ماناکانیـان لەگـەڵ ژمارەکانـدا پێکـەوە گـرێ ئـەدا، وەك ئـەوەی کـە پێناسـەی شـتانێکی وەك ((فرسـەتی گوونجـاو))یـان

(دادپەروەری)) یان((ژن و مێردی)) چیە)، بەڵام ئەو(سوقرات) بە راستی بە دوای ((چیەتی to ti esti))یەوە بوو، چونکە ئەو بەدوای بەڵگاندنی پێوانەییەوە بوو، و بنەمای پێوانە هەمان((چیەتی)یە،(٢٥) چونکە لەو کاتەدا هوونەری ((دیالێکتیك)) هێشتا بەهێز نەبوو کە کەس بتوانێت جیا لە((چیەتی) لەبارەی دژەکان توێژینەوە بکات، و تێبگات لەوەی کە ئایا یەك و هەمان زانست دژەکان لەخۆ ئەگرن، دووشت کە بەراستی ئەبێت بیاندەینە پاڵ سوقرات، ((بەڵگاندنی ئیستقرایی eoaktikos logos)) و ((پێناسەی گشتی to horizesthai katholou)) ، چونکە هەردووکیان لەپەیوەندی لەگەڵ بنەمادا ناسێنراون.

(٣٠) ((بەڵام سوقرات نە گشتایەتیەکانی لە ریزی جیاوازەکان(یان مەسەلە جیاکان) جێگیر ئەکرد وەنە پێناسەکان)) بەڵام ئەمان ((ئەوانیان بە جیا ئەژمار ئەکرد و ئەم جۆرە لە بونەوەرەکانیان ناو ئەنا ((ئایدیەکان))..)) لەبەر ئەمە، تارادەیەك هەرلەسەر ئەم بنەمایە ئەنجامەکە بۆ ئەمان هەر ئەوە بوو کە بۆ هەموو هەڵگیراوە گشتیە ئایدیاییەکان بوونی هەبوو، و ئەمە تارادەیەك وەك ئەوە ئەمێنێتەوە کە ئەگەر کەسێك خوازیاری ژماردنی شتانێك بێت (٣٥) وێنا ئەکات کە لەبەر ئەوەی ژمارەیان کەمە ناتوانێت بیانژمێرێت، بەڵام ئەگەر ئەوانە زیاتر بکات، ئەوکات ئەتوانێت بیانژمێرێت،

١٠٧٩a

چونکە بە پێی ئەم بنەمایە ئەتوانین ئەوە بڵێین کە((ئایدیە))کان زیاتر لە تاکەکان هەستەوەرترن، کە ئەوان لەگەڕان بەدوای هۆکارەکاندا،-لەوانەوە- بە ئایدیەکان گەیشتوون،(چونکە بە بڕوای ئەمان هەرتاك شتێك خاوەنی ((هاوناوێکە)) کە لەگەڵ ناوەرۆکەکاندایە، و هەروەها بۆ شتەکانی تر یەکێەك لەبەرامبەر زۆرێکدایە، چ لەبارەی شتە ئەم جیهانیەکان و چ لەبارەی شتە جاویدانەکان.

بەدەر لەمەش، هیچ یەك لەو لایەنانەی کە لە سەلماندنی بوونی(٥) ئایدیەدا بەکار دێت، شتێکی لەم شێوەیە بەکار ناهێنێت، لەهەندێك لەوانەوە ئەنجامێکی پێویستی پێوانەکردن، بەدەست نایەت، بەڵام لەهەندێکیشەوە ئایدیەکان بۆ شتانێك بەدەست دێن کە ئەمان بۆ ئەوان ئایدیەیەك وێنا ناکەن، چونکە بە پێی بەڵگە بەدەر لە زانستەکان، هەمو ئەو شتانەی کە بۆیان زانست گەلێك بوونیان نیە، خاوەنی ئایدیەیەکن، و بە پێی بەڵگاندنی ((یەك لەبەرامبەر زۆر)) سلبیەکانیش خاوەنی شێوە ئەبن،(١٠) و هەروەها بە پێی ئەم بەڵگاندنە (سەڵماندنە) کە ((ئەندێشە تەنانەت شتێکیش لەخۆ ئەگرێت کە فەنا بووە)) شتە لەناوچووەکانیش (ئەبێت خاوەنی شێوە بن) چونکە لە ئێمەدا وێنایەك

لەوان بوونی هەیە، هەربەم شێوەیە بە پێی هەندێك لە وردترین بەڵگەكان، لە لایەكەوە بۆ سەرخراوەكان، واتە ئەو شتانەی كە بە گووتەی ئەمان بۆ ئەوان ((رەگەزێكی لەخۆدا یان سەربەخۆ)) بوونی نیە، هەروەها ئایدیەیەك بوونی هەیە، كەسانێكیش قسە لەسەر ((مرۆڤی سێهەم)) ئەكەن.

بەگشتی بەڵگە پەیوەستەكان بە((ئایدیە))، شتانێك لەكایەكە ئەخەنە دەرەوە كە خوازیاریانی ئایدیە، زیاتر خوازیاری بوونی ئەوانن تا بوونی((ئایدیەكان))(١٥)چونكە ئەنجامی ئەو بەڵگانە ئەمەیە كە نە ((دوو)) بەڵكو ((ژمارە))، یەكەمە، و هەروەها ((سەرخراو))لە پێش ژمارەو بەم شێوەیە لە پێش ((بوونەوەر لەخۆیدا))یە، و هەروەها (لەسەر بنەمای ئەو بەڵگانە) هەموو ئەو ئەنجامانەی كە بەهۆی ئەوانەوە هەندێك لە پەیڕەوانی((بیرو باوەڕی ئایدیەكان)) لەگەڵ بنەماكانی خۆیاندا تووشی دژایەتی ئەبن.

زیاد لەمەش، بە پێی بڕوایەك كە ئەمان بە پێی ئەو ئەڵێن كە ((ئایدیەكان)) بوونیان هەیە (٢٠) نە تەنیا بۆ ناوەرۆكەكان، بەڵكو بۆ زۆرێك لە شتەكانی تریش شێوەیەك بوونی هەبوو،چونكە ((مانای ئەقڵێنراو))نە تەنیا بۆ ناوەرۆكەكان، بەڵكو بۆ ((نا-ناوەرۆكەكان))یش یەكێكە، و لەو شێوەیەدا زانست گەلێك بوونیان هەیە تەنیا لەبارەی ناوەرۆكەكانەوە نین، بەڵام بە پێی خودی تیۆریەی ((ئایدیەكان))(٢٥) ئەگەر شێوە گەلێك بوونیان هەیە كە بەشداری ئەكەن، كەواتە تەنیا بۆ ناوەرۆكەكان، ئەكرێت شێوە گەلێك بوونیان هەبێت، چونكە گەڕان بەدوای بەشداری لەواندا، دەركەوتانە نیە، بەڵكو بەشداری لەهەریەك لە شێوەكان ئەبێت لەو روانگەیەوە بێت كە لەسەر بابەتێك بگووترێنەوە، مەبەستم ئارادەیەك ئەوەیە كە ئەگەر شتێك لە((دووبەرامبەر لەخۆدا))بەشداری بكات، لە شتێكی جاویدانیشدا بەشدارە، بەڵام تەنیا دەركەوتانە،(٣٠)چونكە جاویدان بوون بۆ دووهێندی (یان دووبەرامبەری) مەسەلەیەكی دەركەوتانەیە، لەسەر ئەم بنەمایەش، شێوەكان، ناوەرۆكەكان ئەبن، بەڵام ناوەرۆكەكانیش لە(دوونیای هەست پێكراو) و هەم لەوێدا(لە دوونیایی شێوەكان) بە یەك مانان، ئەگەرنا مانای ئەم قسەیە چیە كە شتێك لەگەڵ بەشەكیەكان (یان هەست پێكراوەكاندا) بوونی هەیە؟ ئایا ((یەك))یەك هەیە كە زۆرێتی لەخۆ بگرێت؟ و ئەگەر شێوە و ئایدیەكان و هەروەها ئەو شتانەی كە بەشداری كەر لەواندا یەكێك و هەمان بن، كەواتە ئەوكات شتێكی هاوبەش لەناو ئەواندا بوونی ئەبێت(چونكە بە چ هۆیەك((دوو))بوون ئەبێت لە((دوو))ە لەناوچووەكاندا، یان لەو ((دوو))انەی كە زۆرن و جاویدانن، زیاتر یەكێك و هەمان بن، تالە (دوو لەخۆیدا) ویەك((دوو))ی بەشەكی؟) بەڵام

ئەگەر شێوەی(ئەوان) هەمان نەبێت، ئەوکات(٣٥) تەنیا هاوناو ئەبن، و وەك ئەوە ئەبێت کە کەسێك بۆ نموونە((کالیاس)) و یەك پارچە تەختە، هەردووکیان بە مرۆڤ بزانرێن، بێ ئەوەی کە هیچ جۆرە هاوبەشیەك لە نێوان ئەواندا تێبینی کرابێت.

١٠٧٩b

بەلآم ئەگەر وادابنێین کە ماناهاوبەشەکان لەروانگەیەکی ترەوە هاوشێوەی ((شێوەکان))ن، (بۆنموونە وەك، ئەوەی کە گریمانەی ئەوە بکەین کە((شکڵی ئاست)) و باقی بەشە پێناسە کراوەکان(یان ماناکان) لەگەڵ ((بازنە لەخۆیدا)) هاوشێوەیە)(٥)ئەوکاتیش ئەبێت ئەوە زیاد بکەین کە(شێوەی)چ شتێکە، بەلآم ئەبێت ئاگادار بین کە ئەمە قسەیەکی تەواو بێمانا نەبێت، چونکە ئەم بەشەی پێناسەی ئەبێت بخرێتە سەر چی، ئایا بخرێتە سەر ((سەنتەر)) یان ((ئاست))یان هەموو((بەشەکانی مانا))؟ چونکە هەموو ئەو بەشانەی کە لە ناوەرۆکدا بەدەست دێن، ئەبێت ((ئایدیەکان)) بن، بۆنموونە(بەشگەلێکی) هەروەك ((ئاژەڵ)) و ((دوپێ))، هەربەم شێوەیە ڕوونە کە (ئایدیە) خۆی پێویستانە ئەبێت شتێك بێت، ڕێك وەك((ئاست))، واتە سروشتێك کە هەروەك ڕەگەز لە هەموو شێوەکاندا گونجێنراوە.

## "وەرزی پێنجەم"

# ( ئایدیەکان ناتوانن هۆکاری گۆڕانی هەست پێکراوەکان بن )

بەلأم گرنگتر لەهەموان ئەبێت بپەرژێینە سەر ئەم پرسیارە کە((ئایدیەکان)) چ پشکێکیان لە هەست پێکراوە جاویدان و یان لە هەست پێکراوە دروستبووەکان و لەناوچووەکاندا هەیە،(١٥)چونکە ئەوان بۆ ئەمان نە هۆکاری جوولەن وە نە هۆکاری گۆڕان، بەڵکو هەربەم شێوەیە یارمەتی ناسینی هیچ یەك لە شتەکان نادەن، (چونکە ئەوان ناوەرۆکی هیچ یەك لەمانە نین، و ئەگەرنا لەمانەدا دەبوون) و یارمەتی بوونایەتی شتەکانی تر ناکەن، چوونکە ((لەناودابووی enuparkhonton)) ئەو شتانەی کە تیایاندا بەشدارن، نین، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بوونایە، لەو شێوەیەدا لەوانەیە بیانتوانیایە لەم مانایە هۆکار بن کە بۆنموونە ((هۆکاری تێکەڵ بوونی سپی لە شتێکدا)) هۆکاری سپێتی ئەو شتەیە،(٢٠) بەلأم ئەم بەڵگاندنە کە یەکەمجار ((ئاناکساگۆراس)) و ((یودوکسوس)) و هەندێك کەسی تر لە زەمینەی خستنە ڕووی مەسەلەکاندا بەیانیان کردووە، بەتووندی پیّ لەقە، چونکە زۆرێتی مەحاڵێتیەکانی ئەم باوەڕە ئەتوانین بژمێرین، هەربەم شێوەیە بە هیچ شێوەیەکی تر کە بابەتەکە ڕوون بکەنەوە، ناتوانین قبوڵی بکەین کە شتەکانی تر لە ((ئایدیە)) یان((شێوەوە)) پێك دێن،(٢٥) بەلأم ئەم قسەیە کە: ((شێوەکان، پیشەنگەکانن و شتەکانی تر لەواندا بەشدارن،(هاوبەشن) گوتەیەکی پووچ و لە ریزی نادیاریە شاعیرانەکاندایە)) چونکە چیە ئەو دروست کەرەی کە چاوتێبڕە لە ئایدیەکاندا(و شتەکان هاوشێوەی ئەوان دروست ئەکات)؟ هەر شتێك لەوانەیە هەم((هەبێت) و هە پێك بێت بیّ ئەوەی ((خێو ئاسا

eikazomenon) شتێکی تر بێت، بەو شێوەیەی کە چ سوقرات بوونی هەبێت وە چ بوونی نەبێت،و ئەکرێت یەکێکی هەروەك ئەو پێك بێت،(٣٠)(روونە کە ئەگەریش سوقرات جاویدان بووایە بارودۆخەکە هەربەم شێوەیە دەبوو) و هەروەها بۆ یەك و هەمان شت، دەبوو پێشەنگ ومۆدێل گەلێکی زۆر بونیان هەبێت، بۆنموونە مۆدێلەکانی ((ئاژەڵ)) و ((دووپێی)) بۆ ((مرۆڤ)) و هاوکاتیش((خودی مرۆڤ))(واتە نموونەی مرۆڤ.و.ف) بوونی هەبێت، هەربەم شێوەیە ئەوکات ((ئایدیە)) نە تەنیا مۆدێل و پێشەنگی هەست پێکراوەکان، بەڵکو مۆدێل و پێشەنگی خۆشیان ئەبن، بۆنموونە رەگەز، مۆدێلی شێوە بەمانای شێوەی رەگەز ئەبێت، لەبەر ئەمە(٣٥) هەمان شت هەم پێشەنگ ئەبێت و هەم تارمایی(خێو).

بەدەر لەمەش بە سەرپێچی دێتە بەرچاو کە ناوەرۆك جیا لە شتێك کە ناوەرۆکیەتی بوونی هەبێت، لەبەر ئەمە ((ئایدیەکان)) ئەگەر ناوەرۆکی شتەکانن، چۆن ئەتوانن جیا لەوان بوونیان هەبێت؟

١٠٨٠a

بەلاّم لە((فایدۆن))دا بەم شێوەیە گوتراوە کە ئایدیەکان هەم هۆکارەکانی ((بوونایەتی))ن و هەم((هۆکاری)) دروست بوون، بە بوونی ئەمە تەنانەت ئەگەر هەم ئایدیەکان بوونیان هەبێت دیسانەوە هیچ شتێك نایەتە بوون، مەگەر ئەوەی کە جووڵە بەخشێك بوونی هەبێت، و هەروەها زۆر شتی جیاواز دێنە بوون (بۆنموونە: خانوو ، مستیلە)(٥) کە بە پێی بڕوای ئەمان بۆ ئەوان ئایدیە بوونی نیە، لەسەر بنەمای ئەمە روونە کە تەنانەت شتانێك کە ئەمان بۆ ئەوان قایل بە ئایدیەن لەوانەیە کەهەم ((هەبن)) و هەم((دروست بن))، رێك بەیارمەتی هەمان جۆر هۆکار کە بۆ شتانێك بەدەست دێن کە هەنووکە گوتران، بەلاّم نەك بە یارمەتی شێوەکان (ئایدیەکان)، بەلاّم لەبارەی ئایدیەکان، هەم بەم شێوەیەو(١٠) و هەم بە یارمەتی بەڵگەگەلێکی مەنتیقی تر و وردتر ئەتوانرێت بابەت گەلێکی زۆر، هەروەك تێبینیەکانی رابردوو، کۆبکەینەوە.

"وەرزی شەشەم"

## ( بڕوا گەلێك لەبارەی ژمارەكان هەروەك ناوەرۆكە جیاكان )

هەنووكە لەوێوە كە بابەتەكانی دەربارەی ئەم شتانە (واتە ئایدیەكان) روون بووەتەوە، باشە كە جارێكی تر بیر لە ژمارەكان بكەینەوە و پێدا بچینەوە لەسەر ئەنجامی بڕوای كەسەكان بكەین ، كە ئەڵێن ژمارەكان ناوەرۆكی جیای یەكەمین هۆكاری بوونەوەرەكانن (١٥)، بەڵام ئەگەر ژمارە سروشتێكەو و ناوەرۆكەكەی شتێكی تر نیە جگە لە خودی ژمارە-بەو شێوەیەی كە هەندێك ئەیڵێن-كەواتە وەك پێویستیەك ئەبێت شتێك لەلایەكەوە لە پێشترو و لەلاكەی ترەوە لە پاشتر بێت كە هەریەك بە پێی جۆر لەگەڵ ئەوی تردا جیاوازە، و ئەمەیان راستەوخۆ لەبارەی ((یەك))ایەتیەكان راستە و هەرجۆرە یەك لەگەڵ هەر جۆرە یەكێكی تر، كۆناكرێتەوە(٢٠) و لەگەڵ ئەمەشدا كە هەموو((یەك))ەكەكان یەك لە دوای یەكن و هەر ((یەك))یەك لەگەڵ((یەك))یەكی تردا ئەتوانێت كۆبێتەوە، بەو شێوەیە كە ئەڵێن ژمارە بیركاری بەم شێوەیەیە، (چونكە لە ژمارەی بیركاری دا هیچ ((یەك))یەك لەگەڵ هیچ یەكییەكی تردا جیاواز نیە) یان ئەوەی كە هەندێك لە(تاكایەتیەكان)) پێكەوە كۆنەكرێنەوەو هەندێك نا {بۆنموونە ٢ لەدوای ١ یەكەمین ژمارەیەو پاشان ٣ دێت و بەم شێوەیە باقی ژمارەكانی تر}(٢٥) و یەكییەكان لەهەر ژمارەیەكدا پێكەوە كۆ ئەكرێنەوە، بۆنموونە یەكییەكان لە یەكەمین ٢ دا پێكەوە كۆ ئەكرێنەوە و یەكییەكان لە یەكەمین ٣ دا پێكەوە كۆ ئەكرێنەوە و بەم شێوەیە لەبارەی ژمارەكانی تریشەوە، بەڵام یەكییەكان لە ٢ لەخۆیاندا(یان ٢ ئایدیاڵی) لەگەڵ یەكایەتی لە٣ لەخۆیدا پێكەوە كۆ ناكرێتەوە، و بەم شێوەیە لەبارەی ژمارە یەكە لە

دوای یەکەکانی تر(٣٠) بەم هۆیەوەیە کە ژمارەی بیرکاریش بەم شێوەیە ئەژمار ئەکرێن(ئەژمێردرێن) (واتە ١ێك ئەخرێتە سەر ١ەکەی پێشتر) و هەروەها ٢( لەکاتێکدا کە لەسەر ئەم٢، ١ زیاد ئەکەن) و باقی ژمارەکانیش هەربەم شێوەیە، بەڵام ئەو( واتە ژمارەی ئایدیالی یان لەخۆیدا) بەم شێوەیە ئەژمێرن، واتە لەدوای ٢،١یکی تر کە ١ەکەکەی پێشووتر لەخۆی ناگرێت و یەك ٣ کە ٢ لەخۆ ناگرێت، و بەم شێوەیە لەبارەی ژمارەنی تریشەوە،(٣٥) یان ئەوەی کە جۆرێك لەژمارە ئەبێت بوونی هەبێت وەك ئەوەی کە یەکەمجار ئاماژەی پێ کرا، و هەروەها جۆرێکی تری وەك ئەوەی کە بیرکاری زانەکان ئەیلێن، و جۆرێکی تری سێهەمیانە وەك ئەوەی کە لە کۆتایی قسەی لێوە کرا.

١٠٨٠b

زیاد لەمەش، یان ئەبێت ئەم ژمارانەی لە شتەکان جیا بن یان نەبن، و بەڵکو لە هەست پێکراوەکاندا بن، (لەگەڵ ئەوەشدا نەك بەو شێوەیە کە ئێمە یەکەمجار پێراگەیشتنمان بۆی کرد، بەڵکو بەو جۆرەی کە بوونەوەرەکان لە ژمارە لەناودابوەکانی ئەوانەوە پێك دێن) واتە یان هەندێك لەوانە بەم جۆرە بن و هەندێك نا، یان هەموویان بەم جۆرە بن،(٥) کەواتە ئەمانە تەنیا شێوە گەلێکن کە بەپێی ئەوان ژمارەکان لەوانەیە بونیان هەبێت، بەلام لەوکەسانەوەی کە ئەڵێن ((یەك)) بنەما و ناوەرۆك و توخمی هەموو شتەکانە و ژمارە لەو و لەشتێکی تر پێك هاتووە، تارادەیەك هەریەك بەیەکێك لەم شێوانە لەو بارەیەوە قسە کراوە، جگە ئەوەی کە هیچ یەك نەیانووتوە کە هەموو((یەك))ەکەکان پێکەوە کۆناکرێنەوە، ئەمەش ئەنجامێکی ئاقڵانەیە(١٠) چونکە بەدەر لەوەی کە گوترا ئەگەری بوونی شێوازێکی تر نیە، هەنووکە هەندێك ئەڵێن کە هەردوو جۆری ژمارەکان بوونیان هەیە، جۆرێك کە خاوەنی لە پێش و لەدواین کە هەمان ئایدیەکانن، و جۆرێکی تر لە ژمارەکان کە بیرکارین و بەدەر لە ئایدیەکان و هەست پێکراوەکانن، و هەردوو جۆر جیان لە هەست پێکراوەکان، بەلام هەندێکیش ئەڵێن کە تەنیا ژمارە بیرکاریەکان بوونیان هەیە کە لە نێوان بونەورەکاندا، یەکەمین و جیا لە هەست پێکراوەکانن (یان یەکەمین و جیا لە هەست پێکراوەکانە).

((پیتاگۆریەکان)) یش قایل بەیەك جۆر ژمارە، واتە ژمارەی بیرکارین، جگە لەوەی کە بە جیای نازانن، بەڵکو ئەشڵێن کە ناوەرۆکە هەست پێکراوەکان لەوانەوە سەریان دەرهێناوە، چونکە ئەمان هەموو دوونیای بۆشایی ، بە ژمارەکانەوە پەیوەست ئەکەن، بەلام نەك لەو ژمارانەی کە خاوەنی((یەك))ە ئەبستراکتەکانن، بەڵکو وا وێنا ئەکەن (٢٥) کە((یەك))یەکان خاوەنی گەورەیی و((ئەستوورین))، بەلام لەم بارەیەوە کە چۆن((یەك))ی

یەکەمین دروست بووە کە خاوەنی گەورەیی بێت، گومان ئەکرێت کە دووچاری سەرگەردانی بوو بن.

بەڵام کەسێکی تر ئەڵێت کە ژمارەی یەکەم، واتە ژمارەی ئایدیالی ، بەتەنیا بوونی هەیە، هەندێك کەسیش ئەڵێن کە خوودی ژمارەی بیرکاری هەمان ژمارەیە.

وە لەبارەی درێژییەکان و ئاستەکان و تەنەکانیش، هەربەم شێوەیەیە، چونکە بە بڕوای هەندێك، شتەکانی بیرکاری بەدەر لەوانەن کە بە دوای ئایدیەکانەوەن، بەڵام لە نێوان قایلانی تیۆرییەکانی تر، هەندێك بە شێوەیەکی بیرکاریانە قسە لەسەر شتە بیرکارییەکان ئەکەن، واتە هەموو ئەو کەسانەی کە ئایدیەکان بە ژمارە نازانن و هەروەها قایل بە بوونی ئایدیەکان نین، هەندێکیش هەم لەبارەی شتەکانی بیرکارییەوە قسە ئەکەن، بەڵام نەك بە شێوەیەکی بیرکارییانە، چونکە بە بڕوای ئەمان نەهەر گەورەییەك دابەشخوازە بۆ گەورەییەکان نە هەر جۆرە((یەك))ایەتیەك ئەتوانێت ٢ بێت، بەڵام هەموو ئەو کەسانەی کە ئەڵێن ((یەك))توخم و بنەمای بوونەوەرەکانە، ژمارە بە پێکهاتووی ((یەك))ایەتیەکان ئەزانن، جگە لە ((پیتاگۆرییەکان))، ئەمان، بەو شێوەیەی کە پێشتر گووترا، ژمارە بەخاوەنی گەورەیی یان ئەستووری ئەزانن.

کەواتە لەم گوتارەوە ئەوە ڕوون ئەبێتەوە کە بە چەند جۆر لەوانەیە لەبارەی ژمارەکانەوە قسە بکرێت، و هەروەها ڕوون ئەبێتەوە کە لە بارەی هەموو لایەنەکانیەوە(٣٥) قسە کراوە، لە واقعدا هەموو ئەم بڕوایانە لە مەحاڵەکانن، بەڵام لەوانەیە هەندێك مەحاڵتر لەوانی تر بن.

"وەرزی حەوتەم"

# ( دژایەتی لەگەڵ بڕواکانی ئەفلاتوون )

یەکەمجار ئەبێت توێژینەوەی ئەوە بکەین کە ئایا یەکەکان پێکەوە کۆئەکرێنەوە یان کۆناکرێنەوە، و ئەگەر پێکەوە کۆناکرێنەوە، بەکام یەک لەو دوو شێوەیەی کە ئێمە جیامان کردوونەتەوە پێکەوە کۆناکرێنەوە، چونکە لەلایەکەوە هەرجۆرە یەکێك لەوانەیە لەگەڵ هەر جۆرە (یەك)ێکی تر پێکەوە کۆ نەکرێتەوە، و لەلایەکی ترەوە لەوانەیە ((یەك))ێك کە لە((٢ لەخۆیدا)) یان ئایدیالێك بوونی نیە لەگەڵ ئەوانەی کەلە ٣ی ئایدیالی دان پێکەوە کۆ نەکرێنەوە، و بەم شێوەیە ئەو ((یەك))انەی کە لە هەر ژمارەیەکی یەکەمینی یان(ئایدیالی)دان پێکەوە کۆ نەکرێنەوە.

(٥) هەنوکە ئەگەر هەموو((یەك))ەکان پێکەوە کۆبکرێنەوە و هەروەها ناجیاواز بن، ئەوکات تەنیا((یەك)) جۆر ژمارە بەدەست دێت، ئەویش ژمارەی بیرکارییە، و ئایدیەکان مەحاڵە کە لەم جۆرە ژمارانە بن، چونکە کام ژمارە ئەبێت ((مرۆڤ لەخۆیدا))(- ئایدیالی) ،یان ((ئاژەڵ لەخۆیدا)) یان هەرجۆرە((ئایدیە))یەکی تر بێت؟ چونکە بۆ هەر تاك شتێك تەنیا((یەك)) ئایدیە بوونی هەیە، بۆنموونە بۆ ((مرۆڤ لەخۆیدا))(١٠)((یەك)) ئایدیە و بۆ((ئاژەڵ لەخۆیدا)) ش هەر ((یەك)) ئایدیەی تر بوونی هەیە، بەڵام لەو ژمارانەی کە هەروەك یەك و ناجیاوازن، ناکۆتا بەدەست دێت، بە شێوەیەك کە((ئەم ٣))یە زیاتر لەهەر جۆرە ٣یەکی تری((خودی مرۆڤ)) ناتوانن بین،،بەڵام ئەگەر ئایدیەکان ژمارە نین، کەواتە بە هیچ شێوەیەك ئەگەری ئەوە نیە کە بوونیان هەبێت، چونکە ئایدیەکان لە چ بنەماگەلێکەوە دێنە بوون؟ چونکە ژمارە لە((یەك و دووانێتی))یەکی دیاری

نەکراو((duadon aoriston)) دێتە بوون، (١٥) و گووترا کە بنەماکان و توخمەکان، بنەما و توخمی ژمارەن، و مەحاڵە کە ئایدیەکان- لە ریزبەندی دا- لە پێش یان لە دوای ژمارەکانەوە جێگیر بن.

بەڵام ئەگەر((یەك))یەکان کۆ نەکرێنەوە، ئەویش بەو شێوەیە کۆناکرێتەوە کە هیچ یەك لەگەڵ هیچ جۆرێکی تردا کۆنەکرێتەوە، ئەوکات ژمارەیەکی لەم شێوەیە نە ژمارەیەکی بیرکارییە (چونکە ژمارەی بیرکاری تێکەڵەیەکە لە یەکی یە ناجیاوازەکان(٢٠) و ئەوەی بە پێی ئەوە ئەسەلمێنرێت لەگەڵ ئەم خەسڵەتەدا هەماهەنگی هەیە) و نەك لە ژمارە ئایدیاڵیەکانەوە، چونکە لە سەر ئەم بنەمایە ٢ی یەکەمین ژمارەیەك نابێت کە لە((یەك))و((دوو))ی دیاری نەکراو پێك بێت و پاشان ژمارەکانی تریش یەك لەدوای ئەوەوە نایەن، بەوشێوەیەی کە گووترا، دو ،سێ، چوار، ...چونکە یەکیەکان لە دووی یەکەمین(ئایدیاڵی))دا هاوکات پێك دێن، چ لە نابەرامبەرەکانەوە،-بە شێوەیەك کە یەکەمین کەس قایلە پێی-(چونکە کاتێك دروست بوون کە ئەمان بەرامبەر بوون) چ بە شێوەیەکی تر، چونکە ئەگەر یەك((یەك))ی لەپێش دانەیەکی ترەوە بێت، لەپێش((دوو))ە تێکەڵەکەوە ئەبێت، چونکە کاتێك کە یەکێك لەپێش و یەکێکی تر لەپاش بێت، ئەوەیش کە لێیانەوە پێك دێت، لەپێش ئەم دانەیەو لەپاش ئەو دانەیەی ترەوە ئەبێت.

زیاد لەمەش، لەوێوە کە(٣٠)((یەك لەخۆیدا))یەکەمینە، لە پاش(ئەو)یەك((یەکی)) بریتیە لە بەشێك کە لە نێوان ئەوانی تردا یەکەمینە، بەڵام لەدوای ((یەکی))یەکەمین (ئایدیاڵی)،دووەمین((یەك))ە، و پاشان ((یەکی)) سێهەمین(هەیە) کە لەدوای((یەکی))دووەم،دووەمین یەك،بەڵام لەدوای یەکی یەکەمین،((یەکی))سێهەمینە، لەو شێوەیەدا ((یەك))ەکان ئەبێت لە پێش ژمارەیەکەوە بن کە لەدوای ئەوانەوە ناوئەنرێت، بەو شێوەیە کە بۆنموونە لە٢ دا ((یەکیەکی))سێهەمی بوونی هەیە.(٣٥) پێش ئەوەی کە ٣ بوونی هەبێت،((یەکی))ە چوارەم و پێنجەمەکە، لە ٣دا بوونی ئەبێت، پێش ئەوەی ئەم ژمارانە بونیان هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك نەیووتووە کە یەکیەکان بەم شێوەیە کۆناکرێنەوە، بەڵام بە پێی بنەماکەی ئەمان ئەم گەیشتنە ئەنجامەش نەقڵانیە، هەرچەندە بە پێی راستی مەحاڵە، شتێکی نەقڵانیە کە((یەکیە))یەکەمینەکە یان یەك،١ یەکەمین بێت، یەکیەکان لە پێش و لەپاش ئەبن، بەم شێوەیەیە لەبارەی ٢ ەکانیش، ئەگەر یەك ٢ی یەکەمینی بوونی هەبێت، چونکە هەم ئەقڵانیە و هەم پێویستیە کە لە دوای یەکەمین، یەك دووەمین

بوونی هەبێت، (٥) و ئەگەر دووەمین هەیە، یەك سێهەمین و بەم شێوەیە ئەوانی تریش یەك لەدوای یەك ئەبێت بوونیان هەبێت، بەلأم قسە بەپێی هەردو مەسەلەکە، واتە ئەوەی کە لە دوای ١ یەك((یەکی))یەکەمین و هەروەها دووەمینێك بوونی هەیە، و هەروەهابە پێی ئەوەی کە یەك ٢ی یەکەمین بوونی هەیە، مەحاڵە، بەلأم ئەمان یەك((یەکی))یەکەمین و یەك ١ یەکەمین جێگیر ئەکەن، بەلأم نە دووەمین و سێهەمین((یەکی))جێگیر ئەکەن، و هەروەها(١٠)یەك ٢ی یەکەمین جێگیر ئەکەن، بەلأم دووەمین و سێهەمین جێگیر ناکەن،

هەربەم شێوەیە ڕوونە کە ئەگەر هەموو یەکییەکان، کۆنەکرێنەوە، بوونی ٢و ٣لەخۆیاندا(یان ئایدیاڵیانە) و هەروەها بوونی باقی ژمارەکانی تریش مەحاڵ ئەبێت، چونکە چ یەکییەکان جیاواز بن و چ هەریەك لەگەڵ هەریەکدا جیاواز بن، وەك پێویستیەك ژمارەکان بە یارمەتی زیادکردن ناژمێردرێن، وەك ئەوەی کە ٢بە زیادکردنی ١(١٥) بۆ یەك ١ی تر و ٣بە زیادکردنی یەك ١ی تر بۆ٢ و ٤یش بەم شێوەیە دروست ئەبێت، کەواتە ئەگەر بەم شێوەیەیە، مەحاڵە دروست بوونی ژمارەکان بەو شێوەیە بێت، کە ئەو کەسانە ئەوان لە((یەك))و((دوو)) ئەهێننە بوون، چونکە ٢ بەشێك لە ٣ و ئەمیش بەشێك لە ٤ ئەبێت، و هەر ئەم شێوەیەش لەبارەی باقی ژمارەکانەوە ڕاست ئەبێت،(٢٠) بەلأم ئەمان ٤ لە٢ی یەکەمین(ئایدیاڵی) و٢ ی دیاری نەکراو، ئەهێننە بوون، واتە لە دوو٢ و بەدەر لە٢ لەخۆیدا، و ئەگەرنا ٢ لەخۆیدا بەشێك لە ٤ ئەبوو کە یەك ٢ی بەدەر لەو ئەبێت بخرێتە سەری، بەلأم هەر بەم شێوەیە ٢ بریتی ئەبێت لە(یەك)١ لەخۆیدا و یەك ١ی تر،(٢٥) بەلأم ئەگەر بەم شێوەیە بێت، مەحاڵە کە ئەو توخمەی تر جیا(لە یەکێتی)٢ی دیاری نەکراو بێت، چونکە ئەو ئەبێت یەك((یەکی)) و نەك یەك ٢ی دیاری نەکراو بهێنێتە بوون.

هەربەم شێوەیە چۆن لە پاڵ ٣ یەکان و ٢ەکانی لەخۆدا(ئایدیاڵی)٢ەکان و ٢ەکانی تریش بونیان هەبێت؟ و بە چ شێوەیەك لە ((یەکی))یە لە پێش و لە پاشەکان تێکەڵ ئەبن؟ (٣٠) هەموو ئەم بڕوایانە بێماناو دروست کراون، و بوونی یەك ٢ی یەکەمین و هەربەم شێوەیە ٣ لەخۆیدا مەحاڵە، بەلأم ئەنجامەکە پێویستانە بەم شێوەیە ئەبوو ئەگەر کە یەکی و دوو نادیاری کراو لە توخمەکان بوونایە، بەلأم ئەگەر ئەم حاڵەتانە مەحاڵن، کەواتە مەحاڵە، کە ئەوان بنەما بن، هەنووکە ئەگەر هەر یەکییەك ئەبێت لەگەڵ هەر یەکییەکی تر جیاواز بێت، مەسەلەیەکی لەم شێوەیە و مەسەلەیەکی تری لەم شێوەیە، ئەبێتە ئەنجام،(٣٠) بەلأم ئەگەر یەکیەکان لە یەك ژمارەدا لەگەڵ یەکیەکی تر لە ژمارەیەکی تردا جیاواز بن، بەلأم تەنیا ئەو یەکیانەی کە لە هەمان ژمارەدان پێکەوە

جیاواز نەبن، دیسانەوە لەم شێوەیەشدا ئەنجامە دژوارەکان کەمتر نابن، چونکە بۆنموونە لە١٠ لە خۆیدا ((دە یەکی)) گوونجێنراون، بەلام ١٠یش هەم لەمانەوە تێکەڵ بووە و هەم لە دوو ٥ی، هەنوکە لەوێوە کە ١٠ لەخۆیدا یان ئایدیالیانە، ژمارەیەکی لەناکاو نیە، و هەروەها لە ٥ ە لەناکاوەکان تێکەڵ و دروست بووە، نەك لە یەکییە لەناکاوەکان، کەواتە وەك شتێکی پێویست ئەو یەکییانەی کە لەم ١٠ یەدان، جیاوازن(٥) چونکە ئەگەر جیاواز نەبن، ئەوکات ئەو ٥انەی کە ١٠ لەوانەوە تێکەڵ و دروست بووە، جیاواز نین،

١٠٨٢a

بەلام لەوێوە کە ئەمانە جیاوازن، یەکییەکانیش ئەبێت جیاواز بن، ئەگەر یەکییەکان جیاوازن، ئەوکات ئایا ٥ەکانی تری بەدەر لەم دووانە لە ١٠ دا بوونیان نیە، یان بونیان دەبێت؟ بەلام ئەگەر(٥ ەکانی تر) لەودا نەگوونجێنرابن، بێمانایە،(١٠) و ئەگەر گوونجێنرابن، چۆن(١٠)یەك لەوانەوە هاتە بوون؟ چونکە لە ١٠ دا، بەدەر لەم خودی ١٠،١٠ یەکی تر بوونی نیە.

بەلام هەر بەم شێوەیە پێویستە کە ٤یش لە ٢ە لەناکاوەکان تێکەڵ و دروست نەبووبێت، چونکە، بەو شێوەیەی کە ئەمان ئەڵێن،٢ دیاری نەکراو بە گرتنی ٢ی دیاری کراو، دوو ٢ ی دروست کردووە، چونکە ئەوەی کە گرتوویەتی، توانیویەتی دوو هێندی بکات.(١٥).

زیاد لەمەش، چۆن ئەکرێت ٢ لە پاڵ و جیا لە دوو یەکی، سروشتێکی دیاری کراو بێت، و هەربەم شێوەیەش لەبارەی ٣ جیا و لەپاڵ سێ یەکی دا؟ چونکە یان ئەبێت یەکێك لەوی تردا هاوبەش بێت، وەك((مرۆڤی سپی)) کە لەپاڵ ((سپی))و((مرۆڤ))دا بوونی هەیە،(چونکە لەم مانایەدا هاوبەشە) یان یەکێك یان ئەبێت((جیاوازی)) ئەوی تر بێت، وەك((مرۆڤ)) کە لە پاڵ((ئاژەڵ)) و ((دوو پێ)) دا بوونی هەیە.

(٢٠) هەر بەم شێوەیە هەندێك لە شتەکان بەدوای پەیوەندی یەکدان، و هەندێك لە شتەکانیش بەدوای پێکەوە تێکهەڵکێش بوون (و یەك-بووندان) و هەندێکیش بە پێی گشت، بەلام هیچ یەك لەمانە ئەگەری ئەوەیان نیە لە بارەی ئەو((یەکی))انەی کە ٢ و ٣ لەوانەوە دێتە بوون، راست بن، بەڵکو رێك هەربەو شێوەیە دوو مرۆڤ شتێکی تاك لەپاڵ هەردووکیاندا نیە، لەبارەی یەکی یەکانیش ئەبێت بەم شێوەیە بێت، و ئەوەی کە یەکییەکان دابەش نەخوازن، هەربەم هۆیەوە هیچ جیاوازییەك ناهێنێتە ئاراوە:(٢٥)

چونکە خاڵەکانیش دابەشنەخوازن، بەڵام بە بوونی ئەم دووانەی ئەوان، لە پاڵ دوو دانە خاڵی تر،دوویەکی ٢، جیاوا نیە لەگەڵیاندا.

بەڵام نابێت ئەم خاڵەش بە شاراوەیی بمێنێتەوە کە لەو تیۆریەوە ئەم ئەنجامە بەدەست دێت کە ((٢ دوو)) گەلێکی لە پێش و لە پاش بوونیان هەیە، ولەبارەی باقی ژمارەکانی تریش هەربەم شێوەیەیە، چونکە با وا دابنێین کە ٢ەکان هاوکات پێکەوە لە ٤ دا بوونیان هەبێت، بەڵام بە بوونی ئەمەش هاوکات لە پێش ئەو ((٢ انەن)) کە لە ٨ دا هەن، و رێك بەو جۆرە کە ٢( دیاری نەکراوەکە) لە( ٤)ە ئایدیاڵیەکاندا ئەهێنێتە بوون، ئەمانیش ٤ رەکانیان هەر لە ٨ لەخۆداکاندا هێنابێتنە بوون، لەبەر ئەمە ئەگەر ٢ی یەکەمین یەك((ئایدیە)) بێت، ئەم ٢انەش جۆرێك ئەبن لە ئایدیە، هەر ئەم بەڵگاندنەش لەبارەی یەکیەکانیشەوە هەر راستە، چونکە ئەو یەکییانەی کە لە ٢ی یەکەمین، ٤ یەکی ئەهێننە بوون کە لە ٤ دا گوونجێنراون،(٣٥) بە شێوەیەك کە هەموو یەکییەکان ئەبن بە ئایدیەکان و ئایدیەیەکی تێکەڵ لە ئایدیەکان، لەبەر ئەمە ڕوونە کە ئەو شتانەش کە ئەمان ئایدیەی ئەوانن، تێکەڵ ئەبن، وەك ئەوەی کە کەسێك بڵێت: گیانەوەرەکان تێکەڵەیەکن لە گیانەوەرەکان، ئەگەر ئایدیەیەکیش لەوان بوونی هەبێت.

١٠٨٢b

بەگشتی جیاواز کردنەوەی هەموو یەکییەکان بەهەر جۆرێك قسەیەکی بێ مانا و دروست کراوە، (مەبەستم لە دروست کراوی ئەوەیە کە شتێك بە زۆر بۆ پشتگیری گریمانەیەك دروست کرابێت) چونکە ئەبینین کە یەك ((یەکی) لەگەڵ ((یەکیەکی)) تر لە ڕووی چەندی و چۆنیەوە جیاواز نیە،(٥) و ژمارەش بێگوومان یان یەکسانە یان نایەکسانە،-ئەمە لەبارەی هەموو ژمارەکانەوە و بەتایبەتی لەبارەی ئەو ژمارانەی کە تێکەڵن لە یەکیە ئەبستراکتەکان، لەبەر ئەمە ئەگەر ژمارەیەك لە ژمارەیەکی تر نە زیاترە و نەکەمتر، کەواتە یەکسانە پێی، بەڵام شتانێك کە یەکسانن و بە شێوەیەکی گشتی ناجیاوازن، لە بارەی ژمارەکانەوە ئێمە ئەوانە بە یەکێك و هەمان ئەزانین، ئەگەرنا تەنانەت ئەو ٢انەی کە لە ١٠ی ئایدیاڵی دا بوونیان هەیە، هەرچەندە یەکسان بن، بەڵام هەر جیاوازن، (١٠)چونکە کەسێك کە ئەڵێت ئەوان ناجیاوازن بە چ هۆیەك بە دوی نزیك کەوتنەوەن؟

بەدەر لەمەش، ئەگەر هەر یەکیەك لەگەڵ یەکیەکی تر یەك ٢ پێك بهێنێت، ئەوکات یەك یەکی لە ٢ی ئایدیاڵی و یەك یەکی لە ٣ی ئایدیاڵی و یەك ٢پێك ئەهێنێت،- و ئەمە((٢))یەك ئەبێت کە تێکەڵە لە یەکیە جیاوازەکان، و لەو شێوەیەدا ئایا ئەم ٢ە لە

پێش یان لە پاش ٢وە ئەبێت،؟ زیاتر گوومانی ئەوە ئەکرێت کە بێگوومان ئەبێت لە پێش بێت، چونکە(١٥) یەکێك لە دوو یەکیەکە هاوکات لەگەڵ ٣ و ئەوی تر هاوکات لەگەڵ ٢ دایە، بەڵام ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە ١ و ١ بە شێوەیەکی گشتی، چ شتەکان یەکسان بن وچ یەکسان نەبن،٢ ە، بۆ نموونە وەك چاك و خراپ، و مرۆڤ و ئەسپ، بەڵام قایلانی ئەو تیۆریە تەنانەت ئەمەش لەبارەی یەکیەکانەوە قبوڵ ناکەن.

بەڵام ئەگەر ژمارە ٣ی ئایدیاڵی زیاتر لە ژمارە ٢ی ئایدیاڵی نەبێت،(٢٠) مایەی سەرسوڕمانە و ئەگەر زیاترە، ڕوونە کە لەودا ژمارەیەکی یەکسان بە ٢ بوونی هەیە، بە شێوەیەك کە ئەم ژمارەیە لەگەڵ ٢ی ئایدیاڵی دا جیاواز نیە، بەڵام ئەمەش، ئەگەر یەك ژمارەی یەکەمین و یەك ژمارەی دووەمین بوونی هەبێت، مەحاڵە، بەڵام ئایدیەکانیش ژمارە نین، چونکە لەم بارەیەوە ڕاست ئەکەن کەسانێك کە باوەڕیان وایە(٢٥) ئەگەر ئایدیەکان بوونیان هەبێت، یەکیەکان ئەبێت جیاواز بن، بەو شێوەیەی کە پێشتر گووترا، چونکە ((ئایدیە eidos)) یەکێکە،(واتە تاقانەیە.و.ك)،بەڵام ئەگەر یەکیەکان یەك لە دوای یەك جیاواز بن، ٢ ەکان و٣یەکانیش ناجیاواز ئەبن، کەواتە ئەمانیش هەر بەم شێوەیە ئەبێت بڵێن کە هەرکاتێك کە بەم شێوەیە ١،٢،... ئەژمێرین، شتێکی وا بۆ ژمارەیەکی پێشوو زیاد ناکەین، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بکیەن،(٣٠) نە ژمارەگەلێك لە ٢ی دیاری نەکراو دروست ئەبن، و نە ژمارەش لەوانەیە ئایدیەیەك بێت، چونکە لەو شێوەیەدا یەك ئایدیە لە دەروونی ئایدیەیەکی تردا بوونی دەبێت، و هەموو ئایدیەکانیش بەشێك لە ئایدیەیەك ئەبن، بەم هۆیەش ئەمان لەروانگەی گریمانەکەیانەوە ڕاست ئەکەن، چونکە تیۆریەکەی ئەمان زۆرێك لەشتەکان لەناو ئەبات، چونکە قبوڵ ئەکەن کە ئەم گریمانەیە چەندین دژواری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، چ ئێمە(٣٥) کاتی ژماردن بڵێین،١،٢،٣... و یان بە زیاد کردن، بژمێرین، یان بە پێی بەشە جیاکان(ئەم ئیشە ئەنجام بدەین)، بەڵام ئێمە هەردوو ئیشەکە ئەکەین، و بەم شێوەیە پێکەنیناوییە کە ئەم مەسەلەیە بۆ چ جیاوازییەکی گرنگی ناوەرۆکیمان گەراندەوە.

"وەرزی هەشتەم"

# ( دژایەتی لە گەڵ بڕواکانی ئەفلاتوون، ئسیوسیپوس، کسێنوکراتێس و پیتاگۆریەکان )

١٠٨٢a

لە پێش هەموانەوە شایستەی ئەوەیە کە جیاوازی (diafora) ژمارەو و هەروەها ((یەکی))ش (monados))-ئەگەر جیاوازیەك بوونی هەبێت- پێناسە بکەین، بەڵام ئەوان یان بە پێی چەندایەتی یان بە پێی چۆنایەتی جیاوازن، بەڵام وا دەرئەکەوێت کە هیچ یەك لەم دووانە ئەگەری ئەوەیان نیە راست بڵێن، بەڵام ژمارە بە پێی ژمارە و لەروانگەی چەندایەتیەوە جیاوازە،(٥) ئەگەر یەکیەکانیش لەروانگەی چەندایەتیەوە جیاواز بوونایە، ئەوکات ژمارەیەکیش لەگەڵ ژمارەیەکی تردا جیاوازی دەبوو، هەرچەند لە روانگەی رێژەوە((یەکیەکان)) یەکسان دەبوون بەو، هەربەم شێوەیە ئایا یەکەمین یەکیەکان زیاتر یان کەمترن، و ئایا دواترینەکان زیاد ئەبن یان بە پێچەوانەوە؟ هەموو ئەمانە نائەقڵانین، بەڵام بە پێی چۆنایەتی یش یەکیەکان مەحاڵە جیاوازیان هەبێت، چونکە(١٠) لەواندا کردارانـدن ناتوانێت بوونی هەبێت، چونکە ئەمانیش ئەڵێن کە تەنانەت لە ژمارەکانیشدا چۆنایەتی کە لەدوای چەندایەتیەوە پەیوەست ئەبێت، هەربەم شێوەیە(چۆنایەتی) نە بەیارمەتی یەکی،نە بەیارمەتی ٢ ئەتوانێت پێیانەوە پەیوەست بێت، چونکە ئەو دانەیە چۆنایەتی نیە، و ئەم دانەیەش چەندایەتی دروست ئەکات، چونکە سروشتی دوو ئەوەیە کە هۆکاری زۆرێتی بوونەوەرەکان بێت، کەواتە ئەگەر مەسەلەکە بە جۆرێکی ترە(١٥)-بەتایبەتی- ئەبێت لە سەرەتاوە بوترێت، و جیاوازی((یەکی))یش ئەبێ دیاری بکرێت، و بەتایبەتی(دیاری بکرێت) کە بە چ هۆیەك

ئەبێت جیاوازیەکی لەم شێوەیە بوونی هەبێت، و ئەگەر بەم شێوەیە نیە، مەبەستیان لە چیە؟

کەواتە ڕونە کە ئەگەر ئایدیەکان ژمارەن، نە لەوانەیە هەموو یەکییەکان کۆبکرێنەوە، و نە بە هیچ یەك لەو دووانە(٢٠)(ئەو دوو شێوەیە) کە گوتران، پێکەوە کۆنەکرێنەوە، بەڵام ئەوەی کە کەسانێکی تر لەبارەی ژمارەکانەوە ئەیڵێن قسەیەکی دروست نیە، ئەمانە کەسانێکن کە باوەڕیان بە ئایدیەکان نیە، نەبە شێوەیەکی ڕەها و نە هەروەك جۆرێك لە ژمارەکان، بەڵکو باوەڕیان وایە کە لە شتەکانی بیرکاری دا بوونیان هەیە، و ژمارەکان لە نێوان بوونەوەرەکاندا یەکەمین شتەکانن، و بنەمای ئەو((خودی(٢٥) یەکیە))(یان یەکی لەخۆیدا auto to hen))یە، چونکە بێ ماناییە کە ئەو شێوەیەی ئەوان ئەیڵێن، یەکیەکی یەکەمین بۆ یەکیەکان بوونی هەبێت، بەڵام یەك ٢ی یەکەمین بۆ ٢ ەکان، یان یەك ٣ی یەکەمین بۆ ٣ کان، بوونی نەبێت، چونکە هەمان هۆکار بۆهەموویان راستە، هەنووکە ئەگەر بارودۆخ لەبارەی ژمارەکانەوە بەم شێوەیە بێت، و کەسێك تەنیا بوونی ژمارەی بیرکاری بهێنێتە ئاراوە، یەکییەکی تر نابێتە بنەما، چونکە پێویستە کە یەکییەکی لەم شێوەیە، لەگەڵ یەکییەکانی تر جیاواز بێت، (٣٠) و ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئەوکات یەك ٢ی یەکەمینیش بۆ٢ ەکانی تر بوونی دەبێت، و لەبارەی شتەکانی تریش و یەك لەدوای یەك لەبارەی ژمارەکانی تریشەوە هەربەم شێوەیەیە، بەڵام ئەگەر((یەك))بنەما بێت، ئەوکات لەبارەی ژمارەکانیشەوە بارودۆخەکە ئەبێت بەهەمان شێوە بێت کە ئەفلاتوون ئەیووت: واتە یەك ٢ و یەك ٣ی یەکەمین بوونیان هەیە، و ژمارەکان پێکەوە کۆناکرێنەوە، (٢٥)بەڵام دیسانەوە ئەگەر کەسێك وا بگریمێنێت، گووترا کە مەحاڵ گەلێکی زۆر لەوەوە بەدەست دێن، بەڵام بارودۆخەکە وەك پێویست یان بەم شێوەیەیە یان بەو شێوەیە، بە شێوەیەك کە ئەگەر لە هیچ یەك لەوانەوە نەبێت، ئەوکات بوونی بەجیا(یان جیاوازی ژمارە، مەحاڵە).

لێرەوە ئەم خاڵەش ڕوون ئەبێتەوە کە شێوەی سێهەم خراپترین (شێوەیە) کە ئەڵێت ژمارەی ئایدیاڵی لەگەڵ ژمارەی بیرکاری یەکێك و هەمانە، چونکە لەم بڕوایەوە دوو ئەنجام بەدەست دێت، چونکە ژمارەی بیرکاری مەحاڵە بەم شێوەیە بوونی هەبێت(٥)بەڵکو گریمانەرێژ ئەبێت قسە لەبارەی گریمانە تایبەتەکانی خۆی درێژ بکاتەوە، و لەلایەکی ترەوە ئەبێت وەك کەسانێك قسە بکات کە لە ژمارە هەروەك شێوە(ئایدیە) قسە ئەکەن، و بەهەمان ئەنجام بگات.

بەڵام شێوازی ((پیتاگۆریەکان)) لەوانەی کە پێش کەمێك لەمەوبەر بەیان کرا، لەلایەکەوە دژواری گەلێکی کەمتر لەخۆ ئەگرێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە دژواری گەلێکی تایبەت بەخۆی هەیە(١٠)لە لایەکەوە-لە جیا نەکردنەوەی ژمارە- زۆرێك لە مەحاڵێتیەکان لەکایەکە ئەخاتە دەرەوە، بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەم بڕوایە کە تەنەکان کەڵەکەیەکن لە ژمارەکان، و ئەم ژمارەیە ژمارەیەکی بیرکارییانەیە، مەحاڵە، چونکە قسە کردن لەسەر گەورەییە دابەشنەخوازەکان، راستی نیە، و ئەگەریش وا دابنێین کە گەورەییەکان بەم شێوەیە(١٥) بوونیان هەبێت، بەتەواوی یەکییەکان خاوەنی گەورەیی نیە، کەواتە کەڵەکە کردنی یەك "گەورەیی" لە دابەشنەخوازەکانەوە چۆن ئەگەری هەیە؟ ژمارەی ژمێرەریش کە یەکیە ئەبستراکتەکان لەخۆ ئەگرێت، بەڵام ئەمان(واتە پیتاگۆریەکان.و.ف) ئەڵێن کە بوونەوەرەکان ژمارەن، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەمان(بڕوا بیرکاریەکان) لەبارەی تەنەکان بەمانایەك بەکار ئەهێنن، کە وەك بڵێی ئەمان لەو ژمارانەوە تێکەڵ بوون.

لەبەر ئەمە، بەو شێوەیەی کە ژمارە بوونەوەرێك لەو بوونەوەرانە بێت کە((هەن لەخۆیاندا))، بە یەکێك لەم دوو شێوە گوتراوانە بونی هەیە، بەڵام هیچ یەك لەو دوو شێوەیەش ئەگەریان نیە، کەواتە ڕوونە کە ژمارە خاوەنی سروشتێکی لەو شێوەیە نیە، کە جیاوازی دروست کەرەکان، بۆی دروست ئەکەن.

زیاد لەمەش، ئایا هەر تاك یەکییەك، لە گەورەو بچوك پێك دێت،- ئەگەر هەردووکیان یەکسان بن- یان یەکێك لە بچووك و ئەوی تر لە گەورەیی دروست ئەبێت؟

ئەگەر بەم شێوەیەی دواتر بێت(واتە دروست بوونی تاك یەکیەکان لە گەورەیی) ئەوکات نە هەرتاك شتێك خاوەنی هەمو توخمەکان ئەبێت و نە یەکییەکان جیاواز ئەبن، چونکە لەیەك (یەکی)دا "گەورە" بوونی هەیەو لەوی تردا "بچووك"،کە بە سروشتی دژیەتی، و هەروەها بارودۆخی یەکیەکان لە ٣ لەخۆیدا چۆن ئەبێت؟ چونکە یەك یەکی لەو تاکەدایە، بەڵام لەوانەیە بەم هۆیەوە بێت کە ئەمان یەکیەکی ئایدیاڵیان بە (نێوانی) ژمارە تاکەکان جێگیر ئەکەن(٢٠)، بەڵام ئەگەر هەریەك لە دوو یەکی، لەهەردووکیان- واتە لە گەورە و بچووك کە هەردووك یەکسانبن- دروست بێت، ٢ی ئایدیاڵی-کە سروشتێکی تاقانەی هەیە-چۆن ئەتوانێت خاوەنی گەورەیی و بچووکی بێت؟ یان چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ یەکیدا؟ بەدەر لەمەش،((یەك)) لە پێش ٢ەوەوەیە، چونکە بە لەناوچونی ئەو ،٢یش لەناو ئەچێت، کەواتە ((یەك))ی بێگومان ئەبێت ئایدیەی ،ئایدیەیەك بێت، چونکە لە پێش ئایدیەیەکەوەیە،(٣٥) و ئەبێت لە پێش ئەویشەوە پێك

هاتبێت، هەنووکە ئەبێت ببینین لە چیەوە پێك هاتووە؟ چونکە(وەك چۆن بینیمان) ٢ی دیاری نەکراو ٢ی هێنابوویە بوون.

١٠٨٤a

هەر بەم شێوەیە ژمارە بێگوومان یان سنووردار ئەبێت یان بێ سنور، و ئەمان ژمارە جیا ئەکەنەوە، بە شێوەیەك کە مەحاڵە هیچ یەك لەم دوو حاڵەتە دروست بێت، هەنووکە ئەوەی کە مەحاڵە (ژمارە) بێ سنورە، مەسەلەیەکی ڕوونە، چونکە ژمارەی بێسنور نە تاکە و نە جوت، و دروست بوونی ژمارەکان هەمیشە یان لە ژمارەیەکی جووتەوەیە یان لە تاکەوە، بەم شێوەیە کە چۆن ئەگەر((یەك))یەك بڕواتە سەر ژمارەیەکی جووت، ئەیکات بە تاك، و بە شێوەیەکی تر ئەگەر هەر کە ٢ خرایە سەری ژمارەکە بەرهەم هاتووەکە لە دوو هێندبوونی یەکەوە دروست ئەبێت، و هەروەها بە شێوەیەکی تر لەبەر ئەوەی ژمارە تاکەکان بخرێنە سەری،(٢) باقی ژمارە جووتەکان پێك دێن، هەربەم شێوەیە ئەگەر هەر ئایدیەیەك،ئایدیەی شتێکە، وژمارەکانیش ئایدیەکانن، ژمارەی بێ سنور نە بە پێی گریمانەی خودی ئەمانە ئەگەری هەیە، و نە بە پێی مانا(١٠) چونکە بەلایەنی کەمەوە ئەمان بەم شێوەیە سەیری ئایدیە ئەکەن.

بەڵام ئەگەر ژمارە سنوردار بێت، تا چ ئەندازەیەك ئەڕواتە پێشەوە؟ چونکە لەم بارەیەوە نە تەنیا خودی مەسەلەکە،بەڵکو هەربەم شێوەیە ئەبێت ((بۆچی))یێتیەکەیشی بەیان بکرێت، بەڵام ئەگەر ژمارە تا ١٠ بڕواتە پێشەوە، وەك چۆن هەندێك ئەڵێن، یەکەم ئایدیەکان زۆر بە زوویی کەم ئەبنەوە، بۆنمونە ئەگەر ٣((خودی مرۆڤ)) (یان ئایدیەی مرۆڤ بێت)، ژمارەی((خودی ئەسپ))(یان ئەسپی ئایدیاڵی) چی ئەبێت؟(١٥) چونکە هەر ژمارەیەك تەنها تا ١٠لە خۆیدا یان ئایدیاڵی یە، کەواتە (ژمارەی ئەسپی ئایدیاڵی) ئەبێت ژمارەیەك لەنێوان ژمارەکانی تردا بێت، چونکە ئەمانەن کە ناوەڕۆکی ئایدیەکانن، بەڵام بەهەرحاڵ کەم ئەبن، چونکە جۆری گیانەوەرەکان لەم ژمارەیە زۆرتر نابن، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕوونە کە ئەگەر بەم شێوەیە ٣ لەخۆیدا یان ئایدیاڵی ((خودی مرۆڤ))بێت، ٣یەکانی تریش هەربەو شێوەیەن،(چونکە ئەمانەش لە ژمارە ئایدیاڵیەکانیشدا هەربەم شێوەیەن) ، (٢٠) بە شێوەیەك کە مرۆڤەکان ناکۆتا بوونیان دەبوو، و ئەگەر هەر((٣))یەك، یەك ئایدیە بێت، ئەوکات هەر مرۆڤێك ئایدیەی یەك مرۆڤ دەبوو، و ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت، دیسانەوە مرۆڤ نەبێت، و ئەگەر ژمارە بچووکترەکە بەشێك لە ژمارە گەورەکەیە(واتە ژمارەیەکی تێکەڵ لە یەکیە کۆنەکراوەکان لەهەمان ژمارەدا)، ئەوکات ئەگەر٤ لەخۆیدا ئایدیەی شتێك، بۆنموونە((ئەسپ))یان((سپی)) بێت، کەواتە

**مرۆڤیش-ئەگەر مرۆڤ ٢ بێت- بەشێك لە ئەسپ(٢٥) دەبوو، هەربەم شێوەیە بێمانایە كە ئایدیەیەك لە ١٠ دا بونی هەبێت بەلاّم لە ١١ و لە ژمارە یەك لەدوای یەكەكانی تردا بونی نەبێت.**

**- بەدەر لەمەش، هەندێك لە شتەكان كە بۆ ئەوان شێوەیەك بوونی نیە، هەم هەن و هەم دێنە بوون، بە شێوەیەك كە (ئەتوانین بپرسین) بە چ هۆیەك ئایدیەیەك بۆ ئەوانە بوونی نیە؟ كەواتە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی كە((ئایدیەكان)) هۆكارەكان نین.**

**هەربەم شێوەیە بێ مانایە كە ژمارە تا ١٠،زیاتر لە خودی ١٠ەیش بوونەوەرێكی(٣٠)(هەم) واقعی و هەم ئایدیە بێت، هەرچەندە كە ئەو دانەیە هەروەك شتێك خاوەنی پێكهاتنێك نیە، بەلاّم ئەم دانەیە خاوەنی پێكهاتنە، بەلاّم هەوڵدانەكەی ئەمان بە شێوەیەكە كە وەك بڵێی زنجیرەی ژمارەكان تا ١٠ كامڵ ئەبێت، بەلایەنی كەمەوە ئەمان لێ دروست كراوەكان، بۆنموونە بۆشایی، گوونجاوی،تاك و شتەكانی تری لەم جۆرە لە دەروونی ١٠ ەوە پێك ئەهێنن، هەندێك لە شتەكان، وەك جووڵە، وەستان، چاكەو خراپەش بۆ بنەماكان ئەگەرێننەوە(٣٥) و باقی شتەكانی تر بۆ ژمارەكان، بەم هۆیەیوەیە كە ئەمان تاك لەگەڵ ((یەك))،بە یەك دەزانن، چونكە ئەگەر تاك لە ٣ دا بوونی هەبێت،٥ چۆن ئەتوانێت تاك بێت؟**

**١٠٨٤b**

**هەربەم شێوەیە بە بڕوای ئەمان گەورەییەكان و هەموو شتەكانێكی لەم جۆرە تا چەندایەتیەكی دیاری كراو ئەچنە پێشەوە، بۆ نموونە یەكەمجار هێڵێكی دابەشنەبوو،پاشان ٢ و..هتد،تا بگەن بە ١٠.**

**بەگشتی، ئەگەر ((ژمارە)) جیاوازە، ئەتوانین ئەوە بڵێین كە چی و كامیان لە پێشەوەیە، ئایا یەكی یان ٣ یان ٢، بەلاّم لە روانگەی ئەوەی كە ژمارەیەكی تێكەڵە،(٥) یەك لە پێشەوەیە، بەلاّم لە روانگەی ئەوەوە كە((گشتایەتی و شێوە)) لە پێشەوەیە، ژمارە لە پیشەوەیە، چونكە هەریەك لە یەكیەكان بەشێك لە ژمارەی هەروەك مادەكەن، لە كاتێكدا كە ژمارە هەروەك شێوەیە، و هەروەهابە شێوەیەك لە شێوەكان، گۆشەی وەستاو لە پێش گۆشەی داخراوەوەیە، چونكە بە پێی دیاری كردن و پێناسە(یان مانا) لەودا گوونجێنراوە، بەلاّم بە شێوەیەك لە شێوەكان هەم گۆشەی داخراو لە پێشەوەیە ، چونكە ئەمیش بەشێكە لەو گۆشەی وەستاوە كە لە گۆشە داخراوەكاندا دابەش ئەبێت، كەواتە(١٠) لەروانگەی مادەوە، گۆشەی داخراو و توخم و یەك، لە پێشەوەن، بەلاّم بە جۆرێك و بە پێی شێوە و ناوەرۆك و هەروەك مانا، گۆشەی وەستاو و گشتی تێكەڵ لە**

مادە و شێوە، لەپێش ئەبن، چونکە شتی تێکەڵ لە هەردووک لەوانە لە شێوەو ناوەرۆکی پێناسە لە پێشترە، هەرچەندە لە دروست بوون و پێکهاتندا لە دواوەیە.

هەنووکە یەک، لە چ روانگەیەکەوە بنەمایە؟ ئەمان ئەڵێن، لەبەر ئەوەی دابەش ناکرێت، بەڵام گشتایەتی و هەروەها بەشەکێتی و توخمیش(١٥) دابەش نەخوازن، بەڵام بنەمایەتیان لەروناگەی جیاوازەوەیە، یەکێک بە پێی مانایەو ئەوی تر بە پێی کات، هەنوکە یەک( یان ١) بە پێی کام یەک لەو روانگانە، بنەمایە؟ چونکە، بەو شێوەیەی کە گووترا هەم گۆشەی وەستا وادێتە بەر چاو کە لە پێش گۆشەی داخراوەوە بێت و هەم ئەمیشیان لە پێش ئەوەوە، و هەریەک لەوانەش هەم یەکێکە، لێرەوەیە کە ئەمان(واتە ئەفلاتوونیەکان.و.ف) یەک، بە هەر دوو روانگەکە بە بنەما ئەزانن، بەڵام شتێکی لەم شێوەیە مەحاڵە، چونکە گشتێکی هەروەک شێوەو ناوەرۆک((یەکێکە))، بەڵام بەشەکێتی و توخم هەروەک لەت و مادە یەکێکن(٢٠)، چونکە هەریەک لەوانە(واتە یەک و ژمارە.و.ف) بە جۆرێک لە جۆرەکان یەکێکە، بەڵام لە راستیدا هەریەک لەوانە هێزەکیانە بەو شێوەیە (واتە بەلایەنی کەمەوە ئەگەر ژمارە یەک یەکییە، نەک هەروەک کەڵەکە بوویەک، بەڵکو هەر ژمارەیەک پێکهاتووە لە((یەک))گەلێکی بەدەر لە ((یەک))ەکانی ژمارەیەکی تر، وەک چۆن کە ئەمان ئەڵێن)، بەڵام لە کردارێتی دا(یان پەرەپێدانی کامڵدا) هەریەک لەو دووانە (یەک) نیە، بەڵام هۆکاری ئەو هەڵەیەی کە بۆ ئەمان رووی دا، ئەمەیە کە مەبەستەکەیان، لەروانگەی بیرکاری و هەروەها لەروانگەی مانا گشتیەکانەوە، هاوکات بەدواداچوونیان بۆ ئەکرد،(٢٥) بە شێوەیەک کە لەروناگەی ئەو دانەیەیان(واتە بیرکاری) یەک و بنەمایان هەروەک خاڵ جێگیر ئەکرد، چونکە یەک، خاڵێکی بێ شوێنە، هەنووکە ئەمانیش، رێک هەروەک هەندێک کەسی تر، بوونەوەرەکانیان(ta onta) لە بچووکترین بەشەکانەوە ئەخستە سەریەک، لەبەر ئەمە ((یەک))ەکان ئەبنە مادەی ژمارەکان و لە هەمان کاتدا لە پێش ٢ ەوەیە، جارێکی تر لەدوایەوەیە،(٣٠) بە هۆی ئەوەی کە ٢ یەک گشت، و یەک یەکی و یەک شێوە بێت، بەڵام هەربەم شێوەیە لەو رووەوە کە ئەمان لە گەڕان بەدوای گشتێکدا بوون، لە یەکیە هەڵگیراوەکەی (سەر ژمارەش) هەربەم شێوەیە، هەروەک بەشێک لە ژمارە، قسەیان ئەکرد، بەڵام مەحاڵە کە ئەم دولایەنە هاوکات بەیەک و هەمان شتەوە پەیوست بن.

بەڵام ئەگەر(( ١ لەخۆیدا)) یان (نایدیالی) ئەبێت ((بێ شوێن atheton)) بێت،(لەبەر ئەوەی لەگەڵ ((یەکەکانی تردا)) جیاوازی نیە مەگەر ئەوەی کە بنەمایە) ،و٢ دابەشخوازە، بەڵام ٢ بەم شێوەیە نیە، کەواتە یەک ئەبێت لە ٢ بۆ(٣٥) ١ یەک لەخۆیدا

وەکیەك تر بێت، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیەیە، ئەم یەك((واتە ١ لەخۆیدا))یش بۆ یەك، وەکیەك تر ئەبێت تا بۆ ٢، لەبەر ئەمە هەریەك لە یەکەکان، لە ٢دا ئەبێت لەپێش ٢ موەوە بن، بەڵام ئەمان قایل بەمە نین، بەلایەنی کەمەوە ئەمانە یەکەمجار ٢ ئەهێننە بوون.

١٠٨٥a

هەربەم شێوەیە ئەگەر ٢ لەخۆیدا، و ٣لەخۆیداش یەکێك بن، ئەوکات هەردووك پێکەوە یەك ٢ دروست ئەکەن، هەنوکە ئەم ٢ وە لە چ شتێکەوە پێك دێت؟

"وەرزی نۆیەم"

# (درێژەی ڕەخنە لەو بڕوایانەی پەیوەستن بە ژمارەوە)

لەوێوە کە لە نێوان ژمارەکاندا پەیوەندیەك بوونی نیە، بەڵکو یەك "لە دوای یەکی" یان "لەپاش یەکی" یەکیەکان بوونی هەیە، کە لە نێوانیاندا ((نێوانێك)) بوونی نیە،- وەك ئەوانەی کە لە ٢ یان لە ٣ دان-ئەم گوومانە دێتە ئاراوە کە ئایا لە ((یەك لەخۆیدا))ش یەك لەدوای یەکی بوونی هەیە، یان نا، و ئایا لەم یەك لەدوای یەکیە ٢ لە پێشەوەیە یان یەکێك لەو دوو یەکییە.

دژوارییەکان لەم شێوەیەش لەبارەی ڕەگەزەکانی پاش ژمارەشەوە ڕوو ئەدەن: لەبارەی هێڵ، ئاست و تەن، چونکە هەندێك ئەمانە لە جۆرە گەورە یان بچووکەکان دروست ئەکەن،(١٠) بۆنموونە درێژییەکان لە((درێژایی)) و ((کورتی)) و ئاستەکان لە ((پانی)) و((باریکی)) و کێش((لە قووڵی))و((هاوئاستی)). ئەمانە بەلآم لە جۆرە گەورەو بچووکەکانن، بەلآم لە ڕوانگەی بنەماوە هاوشێوەی ((یەك)) بۆ ئەم شتانە، تاکە جیاوازەکانی ئەمان بڕواگەلێکی جیاوازیان هەیە، بەلآم لەبارەی ئەمانەوە هەزاران جۆر مەحاڵێتی و دروست کراوی و دژایەتی لەگەڵ ئەگەرە ئەقڵیەکاندا ڕوون ئەبنەوە(١٥)، چونکە یەکەمجار ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە شکڵە ئەندازەییەکان (واتە هێڵ و ئاست و تەن.و.ف) بەشێوەیەکی ڕەها لەیەك بوونیان هەیە، ئەگەرنا بنەماکەیان بە شێوەیەك دابینکەری یەکتری ئەبن کە ((پان)) و((باریك))لەهەمان کاتدا((درێژ))و((کورت))بێت، بەلآم ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئاست: هێڵ،و تەن: ئاست، ئەبێت، بەدەر لەمەش، گۆشەکان(٢٠) و شکڵەکان و ئەوانەی کە لەم جۆرەن، چۆن توانرێت ڕوون بکرێنەوە؟

دووەم هەمان شت نەبێتە ئەنجام کە لەبارەی ژمارەوە بەدەست هات، چونکە ئەمان (واتە شکڵە ئەندازەییەکان.و.ف)یش کردارانەن یان دەرکەوتەی گەورەیین، بەڵام گەورەیی لەوانەوە نایەتە بوون، بە شێوەیەک کە لە ((راست))و((لار))یشەوە نایەتە بوون، و تەنەکانیش لە((نەرم))و((تووڕە)) نایەنە بوون.

گومانی هاوبەشی نێوان هەموو ئەم بڕوایانە ڕێک وەک ئەو گوومانەیە کە لەبارەی جۆرەکانی یەک ڕەگەزەوە ڕوو ئەدات (٢٥) ،کاتێک کە کەسێک گشتایەتیەکان قبوڵ بکات، واتە: ئایا ئەمە((ئاژەڵ لەخۆیدا))یە، کە لە گیانەوەردا بوونی هەیە یان بەدەر لە((ئاژەڵ لەخۆیدا))یە، چونکە ئەگەر ئەو گشتەی کە بوونی هەیە((جیاوان))نەبێت، هیچ جۆرە گوومانێک نایەتە ئاراوە، بەڵام ئەگەر، بەو شێوەیەی کە قایلانی ئەم بڕوایە ئەیڵێن، یەک و ژمارەکان جیاواز بن، ئەو گوومانە بە ئاسانی چارەسەر ناکرێت، (ئەگەر واژەی (( بەئاسانی نابێت)) بەمانای((مەحاڵ))نەبێت) ، لەبەر ئەوە(٣٠) کاتێک کە کەسێک بیر لە یەک لە٢ یان بە شێوەیەکی گشتی لە ژمارەدا ئەکاتەوە، ئایا بیر لە یەک ((لەخۆیدا یان ئایدیاڵیەتێک)) ئەکاتەوە یان لە شتێکی تر؟

هەنووکە هەندێک لە گەورەییەکان (ئەندازەییەکان)) لە مادەیەکی لەم شێوەیە ئەهێننە بوون، و ئەوانی تر لە خاڵ (لەبەر ئەوە ئەمان خاڵ نەک یەک بەڵکو بە شتێکی هەروەک یەک یان داناوە) و مادەیەکی تر کە هەروەک زۆرێتی یە، بەڵام خودی زۆرێتی نیە، ( ئەم گەورەییە ئەندازەییانە دروست ئەکات)، بەڵام لەم بارەیەشەوە گومانێکی کەم دژوارتر هەر بوونی هەیە(٣٥) چونکە ئەگەر مادە ((یەک))ێک بێت، ئەوکات هێڵ و ئاست و تەن هەمان ئەبن (چونکە لەهەمان مادەکان یەک و هەمان شت دێتە بوون) بەڵام ئەگەر مادەکان زیاتر بن،–واتە یەکێک بۆ هێڵ و ئەوی تر بۆ ئاست و یەکێکی تر بۆ تەن– ئەوکات یان دابینکەری یەک دەبوون یان نا ، کەواتە ئەنجامەکانیش لەم بارەیەشەوە هەمان ئەبن، چونکە یان ئاست خاوەنی هێڵ نیە، یان خۆی هێڵێکە.

بەگشتی، لە روون کردنەوەی ئەم خاڵەدا هەوڵ نادرێت کە(٥) چۆن زۆرێتی ژمارە لە یەکەوە دروست بکرێت، بەڵام بە هەر جۆرێکیش لەم بارەیەوە قسان بکرێت، هەمان ئەو دژوارییانە ڕوو ئەدەن ،هەروەک لای کەسانێک کە ژمارەیان لە یەک و ٢ی دیاری نەکراو((duados aoristos)) ئەهێنایە بوون.

چونکە یەکێک ژمارەی لە زۆرێتییەوە کە هەڵگیراوی گشتایەتیەکە ئەهێنێتە بوون و نەک لە زۆرێتیەکی دیاری کراو، و ئەوی تر لە زۆرێتیەکی دیاری کراو، ئەویش لەیەکەمین زۆرێتی(١٠)(چونکە بە بڕوای ئەمان ٢ یەکەمین زۆرێتییە)، بە شێوەیەک کە

ئەتوانرێت بووترێت جیاوازییەک لە نێوان ئەم دوو بڕوایەدا نیە، بەڵکو هەمان دژوارییەکان و گوومانەکانی لەخۆ گرتووە، واتە: تێکەڵ کردن یان خستنە پاڵ یەک، یان پێکهێنان یان شتێکی لەم جۆرە.

لێرەدا بەتایبەتی ئەبێت گەڕان بەدوی ئەوەدا بکرێت کە ئەگەر هەر((یەک))یەک یەکێکە، سەرچاوەکەی چیە، چونکە هەر ((یەک))یەک بە تەواوی((خۆی لەخۆیدا))نیە، کەواتە پێویستانە سەرچاوەی ئەو یەک لەخۆیدا(١٥)یەک زۆرێتی یان یەک بەشێکە لە زۆرێتیەکە، هەنووکە ئەم گووتەیە کە یەک جۆرێکە لە زۆرێتی، مەحاڵە، چونکە دابەش ناکرێت، بەڵام ئەم بڕوایە کە سەرچاوەی بەشەکێتی لە زۆرێتیەوەیە چەندین دژواری تری لەخۆ گرتووە، چونکە ئەوکات هەریەک لە بەشەکان بیگوومان دابەشنەخوازە، یان زۆرێتیەکە و((یەک)و دابەشخواز ئەبێت، و یەک و زۆرێتی ناتوانن توخم(٢٠) بن، چونکە سەرچاوەی هەریەک((یەک))ی ناتوانێت زۆرێتی و یەک بێت، هەبەم شێوەیە قایلی ئەم بڕوایە ئیشێکی تر ناکات جگە لەوەی کە ژمارەیەکی تر بهێنێتە ناوەوە، چونکە زۆرێتی زۆرێتی دابەشنەبووەکان خۆی ژمارەیەکە.

هەربەم شێوەیە لە قایلی ئەم بڕوایەدا ئەبێت بەدوای شتێکدا بگەڕێن کە ئایا ژمارە بێسنورە یان سنوردار، چونکە وا دەرئەکەوێت کە یەکەمجار زۆرێتییەکی سنوردار هەبووە کە(٢٥) لەوەوە و لەو یەکەوە، یەکیە بێسنوورەکان هاتوونەتە بوون، بەڵام((زۆرێتی لە خۆیدا))بەدەر لە زۆرێتی بێسنور. کەواتە ئەمە چۆن زۆرێتیەکە کە هاورێیە لەگەڵ یەکدا، ((توخمی ژمارەیە))؟

بەم شێوەیە ئەتوانین لەبارەی خاڵیشەوە بەدوای ئەوەدا بگەڕێین و توخمێک کە ئەمان گەورەییەکان لەوانەوە ئەهێننە بوون چونکە ئەمە بە هەموو شێوەیەک تاقانەو و تەنیا خاڵ نیە(٣٠) بەلایەنی کەمەوە(ئەتوانین بپرسین) کە سەرچاوەی هەریەک لەخاڵەکانی تر چیە؟ ئەم سەرچاوەیە بەدڵنیاییەوە یەک دووری و هاورێ لەگەڵ ((خاڵ لەخۆیدا)) نیە، بەڵام بەشەکانی دووریەکەیش مەحاڵ وەک (بەشەکانی) زۆرێتی کە ((یەکیەکان)) لەوانەوە دێنە بوون، بەش گەلێکی دابەشنەبوو بن، چونکە ژمارە لە دابەش نەخوازەکانەوە تێکەڵ ئەبێت، بەڵام گەورەییەکان بەم شێوەیە نین.

١٠٨٦a

هەموو ئەمانە و بەڵگەگلێکی تری لەم جۆرە(٣٥) ئەوە ئاشکرا ئەکەن کە ژمارە و گەورەییەکان مەحاڵە خاوەنی جیاوازی ( واتە جیا لە شتەکان بن.و.ف)،بەڵام هەربەم شێوەیە ناهەماهەنگی نێوان یەکەمین خوازیارانی تیۆریەی پەیوەست بە ژمارە، نیشانەی

ئەوەیە کە خودی ئەو مەسەلانەی کە راستەقینە نین بوونەتە هۆکاری سەرلێشێواوییەکانی بڕواکانیان، بەڵام کەسانێك کە تەنها شتەکانی بیرکاری لەپاڵ هەست پێکراوەکاندا جێگیر کردووە، بەڵام تێبینی دژوارییەکان و دروست کراوە بەدەرەکان لە تیۆریەی ئایدیەکان، لە باوەڕهێنان بە ژمارەی ئایدیاڵی، هەڵگەڕاونەتەوە و لەجیاتی ئەوە ژمارە بیرکارییەکانیان جێگیر کردووە، بەڵام ئەوانی تر کە ئەیانویست ئایدیەکان لەهەمان کاتدا بکەن بە ژمارەکان، لەم خاڵە بێ ئاگا بوون، کە ئەگەر کەسێك بنەمایانە قبوڵ بکات، چ وەڵامێك بەم پرسیارە ئەدەنەوە، کە ژمارەی بیرکاری چۆن لەپاڵ ژمارەی ئایدیاڵیدا بوونی دەبێت، ژمارەی ئایدیاڵی و ژمارەی بیرکارییان ئەویش لە گووتاردا، کردووە بە یەکێك و هەمان، چونکە لە کرداردا ژمارەی بیرکاری لەکایەکە لائەبرێت، چونکە ئەو گریمانانەی کە ئەمان لێیانەوە قسان ئەکەن ، تایبەتن بەوان و گریمانە بیرکارییەکان نین، بەڵام یەکەمین باوەڕپێهێنەری ئەم مەسەلەیە کە((ئایدیەکان)) بوونیان هەیە و ئایدیەکان ژمارەکانن و هەروەها شتەکانی بیرکاری بوونیان هەیە، بە شێوەیەکی ئاقڵانە لیکیان جیا کردەوە، لەبەر ئەوە ئەنجام ئەوەیە کە هەموو ئەمانە لە روانگەیەکەوە بەدروستی قسەیان کردووە، بەڵام بەگشتی قسەکانیان دروست نیە، و خودی ئەمانیش لەم بارەیەوە((هاوڕان–هاوگووتەن)) کە قسەکانیان یەکێك نین، بەڵکو دژن، هۆکارەکەی ئەوەیە کە گریمانەکان و بنەماکانی ئەمان هەڵەیە، بە دەست پێشخەرییە نادروستەکان قسەکردنی دروست ، دژوارە، بە شێوەیەك کە((ئاپیخارموس)) ئەڵێت: ((هەر ئەوەندەی کە قسەیەك کرا، هەر لەو کاتەدا ئاشکرا ئەبێت کە دروست نیە)).

هەنووکە مەسەلە پەیوەستەکانی ژمارە، بە ئەندازەیەکی پێویست پێڕاگەیشتن و توێژینەوەیان لەسەر کرا، کەسێك کە وەڵامی دراوەتەوە، ئەتوانێت لە رێگەی قسەکردنەوە زیاتر وەڵام بدرێتەوە بەڵام کەسێك کە وەڵامی نەدراوەتەوە، هیچ شتێك ناتوانێت زیاتر وەڵامی بدرێتەوە.

بەڵام لەبارەی بنەماکان لەگەڵ بنەما یەکەمینەکان و هۆکارە یەکەمینەکان و توخمەکان، گووتەی کەسانێك کە تەنیا لە لێواری ناوەڕۆکە هەست پێکراوەکانەوە توێژینەوە و سنووریان دیاری کردووە، هەندێکی لە گووتارەکانی لێوارەکانی سروشتدا بەیان کراوە، و هەندێکی تر پەیوەست بە توێژینەوە هەنووکەییەکەی ئێمەوە نین، بەڵام بڕوای کەسانێك کە قایلن بە بوونی ناوەڕۆکگەلێکی تری جیاوازن لەپاڵ ناوەڕۆکە هەست پێکراوەکاندا، کەواتە لەوەی کە گووترا ئەبێت بخرێنە ژێر توێژینەوە.

هەنووکە لەوێوە کە کەسانێك ئەڵێن تەنها ژمارەکان- ئەویش ژمارە بیرکارییەکان- ئەخەنە ژێر توێژینەوەو پێراگەیشتن (٣٠)، ئەبێت دواتر بخرێنە ژێر توێژینەوە، بەڵام لە بارەی ئەوانەوە کە قایل بە تیۆریەی ئایدیەکانن، ئەبێت هاوکات سەرقاڵی شێوازی روانگەکەیان و ئەو کەم و کورپیانەی کە لە لێوارەکانیانەوە بەدەست دێت، بین، چونکە ئەمان هاوکات ئایدیەکان هەروەك ناوەرۆکە گشتیەکان جێگیر ئەکەن و جارێکی تر هەروەك جیاوازەکان و هەروەها هەروەك تاك شتەکان (یان لایەنە بەشەکیەکان)، ئەوەی کە مەسەلەیەکی لەم شێوەیە مەحاڵە پێشتر توێژینەوەو پێراگەیشتنی لەسەر کراوە،(٣٥)بەڵام هۆکاری ئەوەی کە کەسانێك ئەڵێن ناوەرۆکەکان گشتایەتین، هەردوو لایەنەکە لەیەك شتدا پێکەوە کۆ ئەکەنەوە، ئەمەیە کە ئەمان ناوەرۆکەکان لەگەڵ هەست پێکراوەکاندا بەیەکێك نازانن، ئەمان وایان دائەنا کە تاك شتەکانی دوونیای هەست پێکراوەکان بەردەوام لە گووزەردان ( و ئەیانووت) کە هیچ شتێك لەوانەوە بە جێ نەماوە، بەڵام گشتێك لە پاڵیاندا بوونی هەیە کە شتێکی جیا لەوانە، ئەو حاڵەتە، بەو شێوەیەی کە لەگووتارەکەی پێشوودا گووتمان،

١٠٨٦b

یەکەمجار((سوقرات)) لە رێگای پێناسەوە هێنایە کایەوە بەڵام ئەو گشتێکی لە تاك شتەکان جیا نەکردەوە، و بەهەموو شێوەیەکیش لێك جودای نەدەبینین، (٥) ئەم خاڵە لە خودی مەسەلەکانەوە ڕوون ئەبێتەوە، چونکە ناسین بە بێ گشتایەتیەکان بەدەست نایەت، بەڵام جیاکردنەوەی(گشتایەتیەکانیش.و.ف) هۆکاری هاتنە ئارای دژواری گەلێکە کە لەبارەی ئایدیەکانەوە دێنە ئاراوە، بەڵام ((ئەوانی تر)) ئەم مانایەیان بە پێویست ئەزانی کە ئەگەر بڕیار وایە یەك جۆر ناوەرۆك لەپاڵ و جیا لە ناوەرۆکە هەست پێکراوە لەگووزەرەکاندا بونیان هەبێت، (ئەو ناوەرۆکانە) ناوەرۆکە جیاوازەکان بن، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوەرۆك گەلێکی تریان نەبوو(١٠) ئەو ناوەرۆکانەی کە ئەبنە هەڵگیراوی گشتایەتیەکان، بە شێوەیەك خستنیانە ڕوو کە خاوەنی بوونی جیاوازی بن، بە شێوەیەك کە ئەنجامەکە بەم شێوەیە بوو کە گشتایەتیەکان((tas katholou)) و تاك شتەکان((tas kath hekaston)) تارادەیەك یەك و هەمان سروشتەکانن، هەنووکە ئەم مەسەلەیە بەخودی خۆی یەکێك لەو دژوارییانەیە کە لەو بڕوایانەی کە قسەمان تیایاندا کرد، گوونجێنراوە.

"وەرزی دەیەم"

# ( دژایەتی لەگەڵ تیۆریەی بوونی (( بەجیا )) یان (( جیاوازییە گشتایەتیەکان ))... )

هەنووکە لە لێوارەکانی خاڵێکەوە قسە ئەکەین کە هەم بۆ خوازیارانی ئایدیەکان بووەتە مایەی سەرگەرداني و هەم بۆ نکۆڵی لێکەرەکانی(١٥)، و لەسەرەتاوە، لە نێوان مەسەلە دژوارەکاندا پێشتر بەیان کرابوو، لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێك قبوڵ نەکات کە ناوەرۆکەکان جیان- ئەویش بە شێوەیەك کە ئەگووترێت، تاکەکانی بوونەوەرەکان بە جیا بوونیان هەیە- لەو شێوەیەدا ناوەرۆك بەو مانایەی کە ئێمە مەبەستمانە، لەناو ئەبات، بەڵام ئەگەر کەسێك ((ناوەرۆکە جیاوازەکان-جیاکان))گریمانە بکات (بگریمێنێت)، ئەوکات(٢٠)توخمەکان و بنەماکانیان چۆن گریمانە ئەکات؟ چونکە ئەگەر بەشێك(تاك شتێك) بن نە گشتێك، ژمارەی بوونەوەرەکان بەهەمان ژمارەی توخمەکان ئەبن، و توخمەکان((ناسێنراو-بناس)) نین، چونکە وادابنێین کە((حونجەکان)) لە ریزی ناوەرۆکەکان و پیتەکان لەودا، لەریزی توخمەکانی ئەو ناوەرۆکانە بن، لەو شێوەیەدا بێگومان ئەبێت تەنیا یەك حونجەی ((با)) بەدوای ئەوەوە لەهەر حونجەیەکی ترەوە تەنیا یەکێك بوونی هەبێت،(٢٥) واتە ئەگەر ئەوان گشتی و بەپێی شێوە هەمان نەبن، بەڵکو هەریەك ژمارەییانە یەکێك و یەك((ئەم شت)) بێت نەك هاوناو، (بەدەر لەمە ئەمان (واتە ئەفلاتوونیەکان.و.ف)هەر ((هەبوو لەخۆیدایەك auto estin واتە هەر بوونەوەرێکی ئایدیالی) بە ((یەك))ێك گریمانە ئەکەن) هەنووکە ئەگەر ئەم مەسەلەیە لەبارەی ((حونجەکانەوەsullabai )) راست بێت، لەبارەی بەشەکانی بوونیشیانەوە (واتە لەبارەی پیتەکانیشەوە.و.ف) راست ئەبێت، کەواتە نە زیاتر لە((یەك)){ئەلف} بوونی

دەبێت و نە لە هیچ یەك لە پیتەکانی تر، رێك بەهەمان بەڵگە کە(٣٠) هاوشێوەی ئەوە لەبارەی حونجەکانەوە، خودی هەر لەتێك(حونجەیەك) ناتوانێت بەدەر لە یەك دانە بێت، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئەوکات بونەوەر گەلێکی تری بەدەر لە توخمەکان(یان پیتەکان) بونیان نابێت، بەڵکو تەنیا توخمەکانن کە بوونیان دەبێت.

هەربەم شێوەیە توخمەکانیش ((ناسێنراو-بناس)) نابن، چونکە گشتی نین، لەکاتێکدا کە ناسین پەیوەستە بە گشتایەتیەوە، ئەم مەسەلەیە لە گریمانەکان و سەلماندنەکانەوە ڕوون ئەبێتەوە، چونکە هیچ هەڵهێنجاندنێکی پێوانەیی- بەدەر لەوەی کە گۆشەکانی(٣٥)((ئەم شێگۆشەیە)) یەکسانە بە دوو گۆشەی وەستاو- نایەتە بوون، مەگەر ئەوەی کە گۆشەکانی هەر سێگۆشەیەك بەرامبەر بە دوو گۆشەی وەستاو بن، یان ئەوەی کە((ئەم مرۆڤ)ە ئاژەڵە، (نابێت بکرێتە بابەتی هەڵهێنجانی پێوانەیی و جێگیر بکرێت) مەگەر ئەوەی کە هەر مرۆڤێك ئاژەڵ بێت.

بەڵام بەو شێوەیەی کە بنەماکان گشتی بن، ئەوکات یان ناوەرۆکە تێکەڵەکانیشیان گشتی دەبن، یان ((نا-ناوەرۆك )) لە پێش ناوەرۆکەوە ئەبێت، چونکە گشتێك ناوەرۆك نیە،

١٠٧٨a

بەڵام توخم و بنەمایە، و توخم یان بنەما لە پێش ئەوەوەن کە ئەمان بنەما و توخمی ئەون، ئەنجامە ئەقڵانیەکەی هەموو ئەمانە بەم شێوەیە ئەبێت کە، هەرکاتێك (٥) ئایدیەکان لە توخمەکان بهێننە بوون و لەهەمان کاتدا بانگەشەی ئەوە بکەن کە لەپاڵ ئەو ناوەرۆکانەی کە خاوەنی هەمان شێوەن، ئایدیەکان، واتە شتێکی جیاواز(جیا)، بوونی هەیە.بەڵام ئەگەر- هەربەم شێوەیە کە لەبارەی هەموو توخمەکانی گوتارەوە تێبینیمان کرد-هیچ بەربەستێك نیە لەوەی کە زۆرێك لە ((ئەلفەکان))و((ب)) اکان بوونیان هەبێت، و لەپاڵ(١٠) ئەم زۆرانەدا ((ئەلف لەخۆیدا)) یان((ب لەخۆیدا))(واتە ئایدیالی)) بوونیان نەبێت، ئەوکات هەرلەبەر ئەمە،((حونجە گەلێکی ناکۆتا بوونیان دەبێت))، بەڵام لە نێوان ئەو بابەتانەی کە ڕوونکرانەوە ئەم مەسەلەیە کە هەر ((ناسێنراوێك-بناسێك)) پەیوەستە بە گشتێکەوە، بە شێوەیەك کە بێگومان بنەمای بونەوەرەکانیش ئەبێت گشتی بن ، نەك ناورۆکە جیاکان، ئەبێتە هۆی زۆرترین سەرگەردانی، بە بوونی ئەمە، ئەم گوتەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕاستە، و بە شێوەیەکی تریش ڕاست نیە، (١٥) چونکە ناسین، وەك چاوگی((ناسینەوە to epistasthai)) بە دوومانا دێت: لەلایەکەوە بەمانای هێز، و لەلایەکی ترەوە بەمانای

کردار، هەنووکە ((هێز یان تواناداریێتی)) ، کە هەروەك مادە، گشتی و دیاری نەکراوە، بابەتەکەشی گشتی و نادیاری کراوە، بەڵام((کرداریێتی)) دیاری کراوەوەو بابەتەکەشی هەر دیاری کراوە، چونکە یەك((ئەم شت))ە و بابەتەکەشی یەك((ئەم شت))ە، بەڵام بینین تەنیا دەرکەوتانە رەنگێکی گشتی ئەبینێت،(٢٠) چونکە ((ئەم رەنگە))کە ئەیبینێت، رەنگە، و هەروەها ((ئەم ئەلفە)) کە((نەحو-زان)) ئیشی لەسەر ئەکات، یەك ئەلفە، چونکە ئەگەر بنەماکان پێویست بکات کە گشتی بن، ئەوەیش کە لێیانەوە دێتە بوون بێگومان ئەبێت گشتی بێت،هەر بەو شێوەیەی کە لەبارەی بەڵگاندنەکانەوە بەم جۆرەیە، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئەوکات هیچ شتێکی جیاواز بوونی نابێت، بەڵام ڕوونە کە((ناسین)) لە لایەنێکەوە گشتی یەو(١٥) و لەلایەنێکی ترەوە وا نیە.

"وەرزی یەکەم"

# (( گووتەیەك لەبارەی ئەو تیۆریانەی کە دژەکان بە بنەما دەکەن ))

١٠٨٧a )

(٢٩) کەواتە بەسە کە لەبارەی ئەم جۆرە ناوەرۆکانە بەم ئەندازەیە قسە بکرێت، بەڵام هەنوکە هەموو ((فەیلەسوفەکانی رابردوو.و.ف)) بنەکان ((یان بنەما یەکەمینەکان tas arkhas))(٣٠) هەربە شێوەی پانتایی شتە سروشتیەکان، بەهەمان شێوەش لە پانتایی ناوەرۆکە نەجووڵاوەکانەوە، بە دژ دائەنێن، بەڵام لەوێوە کە مەحاڵە شتێك لە پێش بنەمای یەکەمینی هەموو شتەکانەوە بێت، هەربەم شێوەیە مەحاڵە کە ئەو بنەمایە، لەکاتێکدا کە شتێکی جیاوازە، بنەما بێت، ئەمە وەك ئەوە ئەمێنێتەوە کە کەسێك بڵێت((سپی)) بنەمایە، نە هەروەك شتێکی تر، بەڵکو هەروەك((سپی))، و بە بوونی ئەمەش هەڵگیراوی بابەتێکە، و سپی یە،(٣٥) یان ئەوەی کە شتێکی ترە، ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە ئەو(بابەتە)لە پێش ئەوەوە ئەبێت، بەدەر لەمەش هەموو شتەکان لە دژەکانەوە، هەروەك لە بابەتێکەوە، دێنە بوون، کەواتە لە دژەکاندا ((بەتایبەتی)) ئەبێت بابەتێك بوونی هەبێت، بەم شێوەیە هەموو دژەکان هەمیشە هەڵگیراوی بابەتێك ئەبن و هیچ یەك جیاواز یان بەجیاییەك بوونی نابێت، بەڵام وەك چۆن ئاشکرایە، هیچ دژێك بۆ ناوەرۆك نیە، و بەڵگەش بۆ ئەمە هەیە، کەواتە بنەمای هەموو شتەکان بەمانایەکی ورد هیچ یەك لە دژەکان نیە، بەڵکو شتێکی ترە.

١٠٨٧b

بەلام ئەمان (واتە ئەفلاتوونیەکان.و.ف) یەکێك لە دژە جیاوازەکان وەك ((مادە هیولی)) جێگیر ئەکەن (دائەنێن.و.ك) هەندێك ((نابەرامبەر))،بەو هۆیەی(٥) کە خاوەنی سروشتێکی زۆرێتیانەیە، مادە بۆ((یەك)) جێگیر ئەکەن و (دائەنێن.و.ك) و هەندێکی تر زۆرێتی بۆ ((یەك))بە مادە ئەژمار ئەکەن، چونکە هەندێك( واتە ئەفلاتوونیەکان) ژمارەکان لە((دوانێتی)) نابەرامبەر، واتە لە((گەورە))و((بچووك)) ئەهێننە بوون، و هەندێکی تر لە ((زۆرێتی)) بەلام لە هەردوو حاڵەتەکەدا بەیارمەتی ناوەڕۆکی((یەك)).

چونکە ئەو کەسەیش کە هەم ئەڵێت (١٠)((نابەرامبەر)) و((یەك)) توخمن، و((نابەرامبەر)) دوانێتیەکی تێکەڵ لە (( گەورە)) و ((بچووکە))لە ((نابەرامبەر))، واتە((گەورە))و((بچووك)) وەك بڵێی یەك شتن، قسان ئەکات، و ئەوە دیاری ناکات کە ئەوانە لە ڕووی ماناوە یەکێکن نەك لە ڕووی ژمارەوە.

بەلام ئەمان بنەماکان- کە پێیان ئەڵێن توخمەکان-یش بە جوانی ڕوون ناکەنەوە، هەندێك ئەڵێن کە ((گەورە)) و((بچووك))(١٥) هاوڕێ لەگەڵ ((یەك))دان،-هەر سێك- توخمە ژمارەکانن، کە ئەو دووانە مادە و ((یەك)) یش شێوەیە، بەلام هەندێکی تر قسە لە (( زۆر)) و((کەم)) ئەکەن، چونکە((گەورە))و((بچووك)) بە پێی سروشتەکەیان لە ((زلی))یەوە نزیکترن، و هەندێکیش هەم مانایەکی نۆمیانە[1] کە ئەوان لەخۆیانی ئەگرن(و بە توخمی ژمارەکانی ئەژمار ئەکەن) واتە ((زیاد-بوو to huperkhon و زیاد-کراو to huperkhomenon)) بەلام هیچ یەك لەم تیۆریانە بەو شێوەیە نین کە بتوانن لە ڕوانگەی هەندێك ئەنجامی زنجیرەییانەوە جیاوازییەك دروست بکەن، (٢٠) بەڵکو تەنیا لە ڕوانگەی کەم کوڕی مانا مەنتیقیەکانەوە جیاوازن، کە ئەمانیش لێیان هەڵدێن و لەبەرامبەریاندا خۆپارێزن، چونکە خۆشیان گریمانەگەلێکی مەنتیقی ئەخەنە ڕوو، بەدەر لەوەی کە: ئەگەر بە پێی ئەم بەڵگەیە،((زیاد-بوو، زیاد-کراو)) بنەما بن، نەك((گەورە))و((بچووك))، ئەوکات ئەبێت ژمارە لە پێش ٢ ەوەە لە توخمەکانەوە دروست ببێت، چونکە هەردوو گوتەکە ((گشتی ترن))،(واتە هەم ژمارە گشتی ترە لە ٢، و هەم زیاد-بوو و زیاد-کراو گشتی تر لە((گەورە)) و ((بچووك))ن.و.ف) بەلام هەنووکە یەکێکیان ئەڵێن و ئەوی تریان ناڵێن.

بەلام هەندێکیش ((جیاوان)) و (( ئەوی تر)) ((to heteron kai to allon)) لەبەرامبەر((یەك))یەکانەوە جێگیر ئەکەن (دائەنێن.و.ك) و هەندێکیش زۆرێتی لەبەرامبەر

---

[1] مرۆڤانە.و.ك.

یەکیەوە دائەنێن، هەنوکە ئەگەر، بەو شێوەیەی کە خواستی ئەمانە، بوونەوەرەکان لە دژەکانەوە دێنە بوون، و ((یەك))یش یان هیچ دژێکی نیە، یان ئەگەریش بکرێت (دژێکی ) هەبێت، (ئەو دژە) زۆرێتی یە. و هەروەها ئەگەر ((نابەرامبەر)) دژی ((بەرامبەر)) و ((جیاوان))، دژی ((هەمان))(٣٠) و(( ئەوی تر)) دژی((خود))ە، لەو شێوەیەدا قسەی کەسانێك کە((یەك)) لە بەرامبەر ((زۆرێتی)) دائەنێن گرنگیەکی زۆرتری هەیە، بەڵام تەنانەت بەڵگەکەی ئەمانیش بەس نیە، چونکە یەك ((کەمە))، چونکە زۆرێتی دژی ((کەمێتی-کەمینە)) و ((زۆر)) دژی((چەند))ە.

١٠٨٨a

ڕوونە کە یەك بەڵگەیە لەسەر ڕێژە، و بابەتەکەی ئەو لە هەر دوو بوارەکەدا شتێکی جیاوازە، بۆنموونە لە تێکەڵ کردنی ئاهەنگەکاندا (هارمۆنی) یەك لەسەر چوار دانگە، و لە(٣٥)گەورەییەکاندا پەنجە، یان پێ، یان شتێکی لەم شێوەیە، و لە ((کێش-وەزنەکان))دا ((ئەفاعیل)) یان بەشەکان (یان حونجەکان)ە، و لەبارەی قورسایشەوە کێشیکی[1] تری لەم شێوەیە بوونی هەیە، لەبارەی هەموو شتەکانەوە هەربەم شێوەیەیە، لە چۆنایەتیەکان چۆنایەتیەك و لە چەندایەتیەکانی چەندایەتیەك هەیە، (ڕێژەش دابەشنەخوازە، لەبارەی یەکەمیانەوە بە پێی جۆر، و لەبارەی دوەمیانەوە بە پێی هەست کردن) و ئەمە ئەوە پیشان ئەدات کە ((یەك)) ناوەرۆکێکی خۆلەخۆدا هەبوو نیە،(واتە خۆی لەخۆیدا نیە)، و بە پێی پێناسە یان ماناشەوە بەم شێوەیەیە، چونکە((یەك)) بەڵگەیە لەسەر زۆرێتی (٥) و ژمارە لەسەر زۆرێتیە ئەندازە گیراوەکە و زۆرێتی ڕێژەکان، (کەواتە ئەقڵانەیە کە ژمارە یەك نیە، چونکە ڕێژە زۆرێتیەك لە ڕێژەکان نیە، بەڵکو ڕێژە و((یەك)) بنەمان) بەڵام بۆ هەموو شتە ژمێردراوەکان، ڕێژە ئەبێت هەمیشە یەك و هەمان شت بێت، کە لەهەموو بوارەکاندا راستە، بۆ نموونە ئەگەر ئەوانە ئەسپەکانن، ڕێژە یەك ئەسپ، و ئەگەر مرۆڤەکانن(ڕێژە) یەك مرۆڤە، و ئەگەر ئەوان(١٠) یەك مرۆڤ و یەك ئەسپ و یەك خودان، ئەوکات لەوانەیە ڕێژەکەیان (( بوونەوەی زیندوو)) و ژمارەکەیان(( بوونەوەرە زیندووەکان)) بێت، بەڵام ئەگەر شتەکان (( مرۆڤ)) ، ((سپی)) و((هەنگاو نەر)) بن، بۆ ئەوان بەکەمی ژمارەیەك بوونی دەبێت، چونکە هەموو ئەوانە بە شتێکەوە پەیوەستن کە لە ڕووی ژمارەوە یەکێکە، بە بوونی ئەمەش ژمارەکەیان ژمارەی ((ڕەگەزەکان)) یان ناو لێنانێکی تری لەم شێوەیە ئەبێت.

---

[1] مەبەست لە وەزنی شیعرە(کێش).و.ك

(١٥) بەڵام کەسانێك کە ((نابەرامبەر to anison)) هەروەك یەك((یەکی)) و ٢ لە تێکەڵەیەك لە((گەورە)) و((بچووك)) دروست ئەکەن ،بەجۆرێك قسە ئەکەن کە زۆر لە ئەگەرەکانەوە دوورە، چونکە ئەو شتانەی کە ناو بران بۆ ژمارەکان و گەورەییەکان زیاتر کردارانــدن و دەرکەوتانــەن تــا بابــەت بــن- واتــە ((زۆر))و((چــەند)) بــۆ ژمــارە، و((گەورە))و((بچووك)) بۆ زل- هەربەو شێوەیە کە تاك و جووت و(٢٠) نەرم و تورە، و راست و لار، هەربەم شێوەیە هەڵەیەکی تر ئەرواتە سەر ئەم هەڵەیە، و ئەوەش ئەوەیە کە ((گەورە)) و((بچووك)) و هــەمو ئــەو شــتانەی کــە لــەم جــۆرەن و بەناچــاری زیــادکراون (ســەرخراون) و ســەرخراویش لــە هــەموو گووتەکانــدا بەکــەمترین شــێوە سروشــتێك یــان ناوەرۆکێکــە، و لــەپاش چــەندایەتی و چۆنایەتیەوەیە، وەك چــۆن کــە گــووترا،((خــستنە سەر-زیادکردن) (دەرکەوتەیەکە)(٢٥) بۆ چەندایەتی، نەك مادەکەی، چونکە شتێکی جیاکراوەی ترە، کە بە هاوبەشی مادە زیادکراوەکە بە شێوەیەکی گشتی و بەشەکیانە و جۆرەکیانە لەودا جێگیر ئەبێت، چونکە هیچ شتێك نە گەورەیە وە نە بچووکەو نە زۆرە و نە چەند، و نە بە شێوەیەکی گشتی زیادکراوە، ئەگەر کە شتێکی تر لەگەڵیدا جیاواز نەبێت، کە ئەو نیسبەت بەم زۆر یان کەم، گەورە یان بچووك یان زیاد کراوە،(٣٠) نیشانەی ئەوەی کە زیادکراو بەکەمترین شێوە یەك ناوەرۆك یان یەك بوونەوەرە، ئەمەیە کە تەنیا بۆ ئەو نە دروست بوونێك بەدەست دێت و نە لەناوچوونێك و نەجووڵەیەك، بەو شێوەیەی کە زیادکردن و کەمکردن ژبۆ چەندایەتی و، گۆران بۆ چۆنایەتی، و جووڵە بۆ شوێن، و دروست بوونی و لەناوچوونی ڕەهـا بـۆ نـاوەرۆك بـوونی هەیـە، بـەڵام ئـەم مەسەلانە بۆ((خستنەسەر=زیادکردن)) بوونیان نیە، چونکە یەکێك لە دوو شتەکە، بێ ئەوەی بجووڵێت، هەندێ جار گەورەتر و هەندێ جار بچووکتر یان بەرامبەر، ئەگەر ئەوی تر(٣٥)بە پێی چەندایەتی جووڵێنرابێت، هەربەم شێوەیە مادەی هەر تاك شتێك، و لەبەر ئەمە هەر ناوەرۆکێك، ئەبێت هێزەکیانە لە هەمان جۆر بێت کە ئەو تاك شتەیە، بەڵام زیادکراو نە هێزەکیانە ناوەرۆکە وە نەکردارەکیانە.

١٠٨٨b

کەواتە بێمانـاو مەحاڵـە، کـە نـا-نـاوەرۆك، ببێتـە تـوخمی نـاوەرۆك و لـە پـێش ئەویشەوە جێگیر بکرێت، چونکە هەموو گووتراوەکان لە پاش ناوەرۆکەوەن،(٥) بەڵام هەربـەم شـێوەیە تـوخمی هـەڵگیراوی شـتانێك کـە وەك تـوخمی ئـەوان جێگیر نـابن، و هەنووکـە ئـەوەی کـە ((زۆر))و((چـەند))یـش بـە جیـا و هاوکـات هـەڵگیراوی ژمـارە بـن، و هــەروەها((درێــژ))و((کــورت)) ببنــە هــەڵگیراوی هێــڵ، و ئاســتیش هــەم ((پانــە))و

هەم((باریك))ە، ئەگەر زۆرێتیەك بوونی هەیە كە لەتێكی، واتە((چەند)) هەمیشە هەڵگیراو بێت، وەك ٢(چونكە زۆرێتی ئەگەر ٢ بێت، ١چەندی لەودا ئەبێت)،(١٠) ئەوكات ئەبێت زۆرێتیەك بوونی هەبێت كە بە شێوەیەكی ڕەها ((زۆر))ە، بۆنموونە ١٠ زۆر ئەبێت،(ئەگەر شتێكی لەو زۆرتر بوونی نەبێت) یان١٠٠٠٠، هەنووكە ئەگەر چۆن بەم شێوەیە ژمارە ئەتوانێت لە ((چەند)) و ((زۆر))ەوە دروست بكرێت؟

چونكە یان هەردووك ئەبێت ببنە هەڵگیراوی ئەو، یان هیچ یەك لەو دووانە، بەڵام هەنووكە لە ڕاستیدا یەكێك یان ئەوی تریان ئەبێتە هەڵگیراوی ئەوی تریان.

"وەرزی دووەم"

# ( درێژەی وەرزەکەی پێشوو و ڕەخنە لە تیۆریەی ژمارەی ئەفلاتوون )

هەنووکە ئەبێت بە شێوەیەکی ڕەها توێژینەوە بکرێت کە ئایا شتە جاویدانەکان، ئەگەری هەیە لە توخمەکانەوە تێکەڵ بن(١٥) چونکە(ئەگەر بەم شێوەیە بێت) ئەوکات خاوەنی مادە دەبن، چونکە هەر شتێك کە لە توخمەکانەوە پێك دێت، تێکەڵە، لەبەر ئەمە ئەگەر ئەوەی کە لە شتێکەوە هاتبێتە بوون پەیوەستە بەو شتەوە، چ هەمیشە بوونی هەبێت، یان ،هاتبێتە بوون، وەك پێویستیەك ئەبێت لەو شتەی کە پەیوستە بەوەوە(واتە مانەوەی پەیوەستە بەوەوە) و هەروەها ئەگەر هەر شتێك لەو شتە دێتە بوون کە لایەنە هێزەکیەکەی ئەو شتەیە کە ئەبێت پێی (چونکە لەوانەیە لە شتێکەوە هاتبێتە بوون کە هێزەکیانە ئەو نەبووە و بە هیچ شێوەیەکیش بوونی نەبووە) و((بەتوانا=یان بەهێز dunaton))یش لەوانەیە ((بکردارێت)) یان ((نەکردارێت))، کەواتە ئەوکات(٢٠) ژمارە یان هەر شتێکی تر کە خاوەنی مادەیە، هەرچەندیش کە هەمیشەیی بێت، ئەگەری ئەوەی هەیە کە نەبێت، ڕێك بەو شێوەیەی کە شتێك سالأنێکی زۆرە بوونی هەیە و بەهەمان شێوەیەیە کە بوونی نەبێت،و بەهەمان شێوە شتێکیش کە یەك ڕۆژەیە. و ئەگەر بەم شێوەیەیە، کەواتە ئەو شتەی کە کاتێکی بێسنور بوونی هەیە، لەوانەیە بوونی نەبێت، لەبەر ئەمە ئەو جۆرە شتانە ناتوانن جاویدان بن، واتە ئەگەر ئەوەی کە ئەگەری هەیە، نەبێت، جاویدان نیە،وەك چۆن لە گووتارەکانی پێشوودا پەرژامانە سەری،(٢٥) بەلأم ئەگەر ئەوەی کە هەنووکە گوترا-واتە ئەوەی کە هیچ ناوەرۆکێك جاویدان نیە،

مەگەر تا ئەوشوێنەی کە کردارێتیە-بەگشتی دروست بێت، و ئەگەر توخمەکانیش مادەی ناوەڕۆکن، کەواتە هیچ ناوەڕۆکێك ناتوانێت بوونی هەبێت، کە هەروەك ((لەتە لەناودا بووەکان-خوودیەکان)) لەوانەوە پێك هاتبوون.

بەڵام کەسانێکیش هەن کە توخمی هاوڕێ لەگەڵ یەك، ناو ئەنێن بە ٢ی دیاری نەکراو، بەڵام لە((نابەرامبەر)) بە شێوەیەکی ئاقڵانە تووڕەن،(٣٠) هۆکاری ئەم مەسەلەیەش ئەنجامە مەحاڵە بەدەر لە((نابەرامبەر))ەکانە، بەڵام ئەمان تەنیا ئەو ئەندازە لە دژوارییەکان لەناو ئەبەن،

١٠٩٨a

کە وەك پێویست لە گووتەی کەسانێك ئەو ئەنجامە بەدەست دێت کە((نابەرامبەر)) و زیادکراو ئەکەن بە توخم، بەڵام هەموو ئەو دژوارییانەی کە جیا لەم بڕوایەن، وەك پێویستیەکیش پەیوەست ئەبن بەمەوە، چ ئەوەی کە ئەمان لەو توخمانەوە دروستی ئەکەن ژمارەی ئایدیالی بێت و چ ژمارەی بیرکارییانە بێت.(٣٥) هەنووکە هۆکاری لادانی ئەمانە لەبەر ئەم هۆیانە زۆرە، بەڵام گرنگترین هۆکاری دروست بوونی گوومان بە شێوەیەکی کۆنە، چونکە ئەمان وایان دائەنا کە هەموو بوونەوەرەکان یەکێك، واتە((بوونەوەر لەخۆیدا auto to on)) بوون، مەگەر ئەوەی کە کەسەکە بەم گووتەیەی ((پارمێنیدێس))هەم هاوڕا بێت و هەم شیکاریشی بکات و هەم ڕەتیشی بکاتەوە:

((چونکە هیچ کات ناتوانرێت مل بەوەوە بنێین کە ((نا-بوونەوەر=نەبوو)) هەیە، (٥) بەڵام پێویستە پێشان بدەن کە((نا-بوونەوەر))هەیە، چونکە تەنیا بەم شێوەیە- واتە لەم بوونەوەرەو هەروەها شتێکی تر-بوونەوەرەکان، ئەگەر زۆر بن، ئەیانتوانی بێنە بوون، بە بوونی ئەمەش، سەرەتا ئەگەر((بوونەوەر)) ماناگەلێکی زۆری هەیە (چونکە هەندێ جار بەڵگەیە لەسەر ناوەڕۆك،و هەندێ جار لەسەر چۆنایەتی، و هەندێ جار لەسەر چەندایەتی و هەروەها لەسەر گووتراوەکانی تریش))، کەواتە(١٠) هەموو بوونەوەرەکان لە چ جۆرە((یەکی)) یەك ئەبن، ئەگەر ((نا-بوونەوەر)) بوونی نەبێت؟ ئایا ناوەڕۆکەکان(یەکەکان)) ئەبن، یان دەرکەوتەکان یان کرداراندنەکان، و باقی گووتراوەکانی تریش هەربەم شێوەیە، یان هەموویان پێکەوە؟ و ئەوکات ئایا((ئەم شت)) و ((ئەمە وەك)) و((ئەمەندە)) و هەموو ئەو گووتراوانەی تر کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بەڵگەن لەسەر((بوونەوەرێك))، ((یەك)) دەبوون؟ بەڵام ئەمە بێ مانایی و زیاتر مەحاڵیشە کە سروشتێکی تاقانە ببێتە هۆی ئەوەی کە((بوونەوەر)) بەشێك لە ((ئەم شتە)) و

بەشێك لە((ئەمە وەك)) و بەشێك لە((ئەمەندە))(١٥) و بەشێك لە شوێنێکی دیاری کراودا بێت.

پاشان و دووەم، ئەوکات بوونەوەرە ((خۆ لەسەر پێکان)) لە چ جۆرە((نا-بوونەوەر))و((بوونەوەر))ێك ئەبن؟ چونکە بە جۆر گەلێکی زۆر قسان لەسەر((نا-بوونەوەر))و((بوونەوەر)) ئەکرێت، بۆ نموونە لەلایەکەوە((نا-مرۆڤ)) بەمانایەك ((ئەمە شتە نەبوون))ە، بەلام لەلایەکی ترەوە((ناراستەوخۆ)) بەمانای((نە-وەك ئەمە بوون))ە، بەلام((نە سێ بست[1] بوون))ە بەمانای((ئەمەندە نەبوون))ە، هەنووکە زۆربەی بوونەوەرەکان لە چ جۆرە((بوونەوەر)) یان ((نا-بوونەوەر))ێکەوە دێنە بون؟ بەلام بکەری ئەم قسەیە ئەیەوێت بڵێت(٢٠) کە مەبەستی لە((نا-بوونەوەر)) کە لێیەوە هاوڕی لەگەڵ یەك، زۆربەی بونەوەرەکان پێك دێن،((درۆ))و سروشتێکی لەم شێوەیەیە، بەم هۆیەشەوە ئەگووترێت کە ئەبێت شتی درۆ بەگریمانە دابنێین، وەك ئەندازیار کە هێلێك بە هەنگاوێك ئەگریمێنێت،و لەکاتێکدا کە درێژیەکەشی هەنگاوێك نیە، بەلام مەحاڵیشە کە بەم شێوەیە بێت، چونکە(٢٥) نە ئەندازیار شتێکی درۆ ئەگریمێنێت،(چونکە ئەم پێشەکیە لە پێوانەدا نەگوونجێنراوە) و نە بوونەوەرەکان لەم جۆرە نابوونەوەرەوە پێك دێن، یان لەناو ئەچن، بەلام لەوێوە کە((نا-بوونەوەر)) لە لایەنگەلێکی جۆراوجۆرەوە بەهەمان شێوەو ئەندازەی گوتراوەکان، بەدەست دێت، و بەدەر لەمەش ((درۆ)) و ((هێن))یش بەجۆرێك لە جۆرەکان بە((نابوونەوەر)) ئەگووترێنەوە، و لەدوای ئەم دووەمینەوەیە (واتە لەدوای هێزەوە.و.ف) کە دروست بوون تازە دێتە کایەوە، بۆنموونە مرۆڤ لە((نا-مرۆڤ))ێك کە هێزەکیانە مرۆڤە، دێتە بوون،(٣٠) و ((سپی)) لە((نا-سپی)) کە هێزەکیانە سپی یە، و لەبوارەکانی تریشدا هەر بەهەمان شێوە، چ دروست بوو یەك شت بێت و چ زۆر.

پشکنین، بەئاشکرا لەبارەی ئەمەوەیە کە((بوونەوەر))ی ناونراو بە پێی ناوەرۆکەکان، چۆن زۆرە؟ چونکە((دروست کەرەکان)) ژمارەکان و هێڵە تەنەکانن، هەنووکە بێ مانایە کە چۆن زۆرێتی ((بوونەوەر)) هەروەك ((شتێك to ti)) ، پشکنینی بۆ ئەکرێت،(٣٥) بەلام ئەوەی کە چۆن چۆنایەتیەکان یان چەندایەتیەکان، زۆرن، پشکنینی بۆ ناکرێت، چونکە بە دڵنیاییەوە نە٢ی دیاری نەکراو و نە((گەورە)) و ((بچووك)) هۆکاری ئەوە ئەبن

[1] لەراستیدا ئەرستۆ لێرەدا باسی پێوانەیەك ئەکات کە لە ئانیشکەوە تا مەچەك لەخۆ ئەگرێت،بەلام من بۆ زیاتر روون بوونەوە بست بەکار ئەهێنم،وە شتێ واش لە مەسەلەکە ناگۆرێت.

کە دوو سپی یان ڕەنگی زۆر یان تامەکان یان شکڵەکان بوونیان هەبێت، چونکە ئەوکات ئەمانەش ژمارە و یەکی دەبوون، بەڵام ئەگەر ئەمان بەردەوامیان بەم پشکنینە بدایە، هۆکاری(زۆریتی)ش لە ناوەرۆکەکاندا بەدەست ئەهات، چونکە هۆکار هەمان یان شتێکی هاوشێوەیە.

١٠٨٩a

هەرئەم لادانە بوویە هۆی ئەوەی کە ئەمان لە پشکنینی بەدوای بەرامبەرکێی((بونەوەر))و((یەك))(٥) کە بوونەوەرەکان لەوەوە بەیارمەتی بونەوەرە و یەکەوە دێنە بوون، گریمانەی((زیادکرن))یان-نابەرامبەر-بکەن، کە نە دژ وە نە ڕەتکەرەوەی بوونەوەر و یەکە، بەڵکو سروشتێکی تاقانەیە لە بونەوەرەکان، ڕێك هەروەك((شتێك))و چۆنایەتیەك، ئەمان دەبوو پشکنینیان بۆ ئەوە بکردایە کە چۆن زیادکراوەکان زۆرن، بەڵام یەك، نین، بەڵام هەنووکە ئەمان بەدوای ئەوەوەن کە چۆن ((یەك)) گەلێکی زۆر لە پاڵ ((یەکی یەکەمین-سەرەتا))دا بوونیان هەیە، بەڵام ئیدی پشکنین و بەدوادا گەڕان ناکەن، کە چۆن نابەرامبەر گەلێکی زۆر لەپاڵ ئەو یەکدانە ((نابەرامبەر))ەدا بەدەست دێن، بە بوونی ئەمە، ئەمانە بەکار ئەهێنن و لە ((گەورە)) و((بچووك)) ،((زۆر)) و ((چەند)) (کە سەرچاوەی ژمارەکانن) و((درێژ))و((کورت))(کە سەرچاوەی هێڵەکانن) و((پان))و((باریك)(کە سەرچاوەی ئاستن) و((قوڵ))(کە سەرچاوەی تەنەکانن) قسە ئەکەن، و لە زیادکراوەکانیش زیاد لە جۆرەکان قسان ئەکەن،(١٥) کەواتە هۆکاری زۆر بوون ئەم زیادکراوانە چیە؟

هەنووکە پێویستە کە، بەو شێوەیەی کە ئێمە ئەڵێین،لەبارەی هەرتاك شتیکەوە گریمانەی بوونەوەرێکی هێزەکی ئەکەن، بەڵام قایل بووی بەم تیۆرە ئەم ڕوون کردنەوەیەشی زیادکردووە کە ئەوەی هێزەکیانە یەك((ئەم))و ناوەرۆکە، چیە؟ بەڵام بوونەوەرێکی((لەخۆیدا)) نیە، واتە ئەوەی کە ئەو زیاد کراوە، ڕێك بەو شێوەیەیە کە گووترابێت ((چۆنایەتی))ە، بەڵام(زیادکراو) نە هێزەکیانە ((یەك)) یان ((بوونەوەر))ە، نە ڕەتکەرەوەی (یەك)ە وەنە بونەوەر،(٢٠) بەڵکو شتێکە لە بوونەوەرەکان، و زۆر پێویستر بوو کە بەو شێوەیەی کە گووترا، ئەو گەریدەی ئەوەی بووایە کە بوونەوەرەکان چۆن زۆرن، نەك پشکنین لەبارەی ئەو شتانە بکات کە یەك و لە هەمان گووتراودان، واتە نەك ئەوەی کە چۆن ناوەرۆکە زۆرەکان و چۆنایەتی گەلێکی زۆر بوونیان هەیە، بەڵکو ئەوەی کە چۆن بوونەوەرەکان (بە شێوەیەکی گشتی) زۆرن، چونکە هەندێك لەشتەکان ناوەرۆکەکانن، هەندێکیش لە بنەمای دەرکەوتەکان یان کردارەندنەکانن، و هەندێکیش

زیادکراوەکانن، هەنووکە لەبارەی باقی گووتراوەکانی تریشەوە(٢٥)(واتە بەدەر لە ناوەرۆکەکان.و.ف) نیگەرانیەکی تر بوونی هەیە، کە ئەوان چۆن ((زۆرن))، چونکە (ئەتوانرێت ئەوە بگووترێت کە)) لەبەر ئەوەی ئەوان بە جیا بوونیان نیە، لەو ڕووەوە کە بابەتەکە زۆرە یان (زۆر ئەبێت)، چۆنایەتیەکان و چەندایەتیەکان زۆر ئەبن، بە بوونی ئەمەش ئەبێت بۆ هەریەك لە ((گووتراوەکان)) مادەیەك بوونی هەبێت، جگە لەوەی کە مەحاڵە(کە ئەم مادەیە) جیا لە ناوەرۆکەکان بوونی هەبێت، بەڵام لەبارەی ((ئەم شتە-کانەوە)) بەڵگەیەك بوونی هەیە کە چۆن((ئەم شتە لێرەدا)) زۆرە، ئەگەر شتێکیش هەم یەك ((ئەم شتە))و هەم سروشتێکی لەو جۆرە نەبێت (واتە سروشتێکی لەجۆری ئایدیەکان.و.ف)، بەڵام سەرگەردانیەك یان گوومانێك کە لێرەوە ئەزموون ئەکرێت، زیاتر ئەمەیە کە چۆن ناوەرۆکەکان کردارێتیانە زۆرن و یەك دانە نین.

بەڵام هەربەم شێوەیە ئەگەر((ئەم شتە)) و چەندایەتی هەمان نین، بە ئێمە ناگووترێت کە چۆن و بۆ بوونەوەرەکان زۆرن، بەڵکو (تەنیا ئەگووترێت) کە چۆن چەندایەتیەکان زۆرن، چونکە هەر ژمارەیەك بەڵگەیە لەسەر چەندایەتیەك،(٣٥) و یەك، ئەگەر بەڵگە لەسەر یەك ڕێژە نەبێت، بەڵگەیە لەسەر شتێك کە بە پێی چەندایەتی دابەشخوازە، هەنووکە ئەگەر چەندایەتی لەگەڵ ((چیەتی to ti estin)) جیاوازە، بە ئێمە ناگووترێت کە ((چیەتی)) لە چ ڕوویەکەوە و چۆن، زۆرە، بەڵام ئەگەر ئەوان (واتە چەندایەتی و چەندی.و.ف) هەمان بن، ئەوە کە قایلە پێیان ئەبێت لەبەرامبەر ناهاوتاییە زۆرەکاندا خۆگر بێت.

١٠٩٠a

بەڵام لەبارەی ژمارەکانەوە ئەتوانرێت پشت بە تێبینیەك ببەسترێت کە لە کوێوە ئەبێت بگەینە ئەو بڕوایەی کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك بوونیان هەیە، چونکە بۆ کەسێك کە باوەڕی بە ئایدیەکان هەیە،(ژمارەکان) بەجۆرێك لە هۆکارەکان بۆ ((کایناتەکان ousin)) ئەخەنە ڕوو،(٥) واتە لە ڕاستیدا ئەگەر هەریەك لە ژمارەکان یەك ئایدیەیە(idea)، و ئایدیە بە شێوەیەك لە شێوەکان هۆکاری بوونایەتی شتەکانی ترە، ئەم گریمانە بنەماییەیان لێوە قبوڵ ئەکرێت، بەڵام لە بارەی کەسێکەوە کە باوەڕی بەم مەسەلەیە نیە، لەبەر ئەوە دژوارییە ئەروونی و خودییەکانی تیۆریەی ئایدیەکان ئەبینێت (بە شێوەیەك کە ڕێك بەم هۆیەوە نە ژمارەکان، بەڵکو تەنیا ژمارە بیرکارییەکان ئەهێنێتە ناوکایەکەوە)(١٠) لەکوێوە ئەتوانین یان ئەبێت باوەڕمان وابێت کە ئەم جۆرە ژمارانە بونیان هەیە و ئەم(ژمارانە) بۆ شتەکانی تر بە کەڵکی چی دێن؟ کەسێك کە قایلە

بە بوونایەتی ئەو، بانگەشەی ئەوە ناکات کە ئەو هۆکارە شتێك بێت (بەڵکو ئەڵێت کە ئەوە شتێکە کە هەروەك سروشتێك لەخۆیدا بوونی هەیە) و وادێتە بەرچاو کە هۆکارەکە بەم شێوەیە بێت، چونکە بنەمای یاساکانی ژمێریاری،(١٥) وەك چۆن گوترا، هەموویان لەبارەی هەست پێکراوەکانەوە راستن.

## "وەرزی سێهەم"

# ( درێژەی ڕەخنە لە تیۆریەی ژمارەکان )

١٠٩٠a ١٦

هەنووکە کەسانێك کە لەو باوەڕەدان ئایدیەکان بوونیان هەیە(و بەهەمان شێوە) بریتین لە ژمارەکان، و(بە پێی شێوازەکانیان لە هێنانە دەرەوەی هەریەك لە چەمکە گشتیەکان و جیا لە بوارە لاوەکیە فراوانەکانیان) واداشەنێن کە هەریەك لە چەمکە گشتیەکان یەك((یەك))یە، بەلایەتی کەمەوە هەوڵ ئەدەن بە شێوەیەك دەری ببڕن کە بۆچی ژمارەکان بوونیان هەیە، بەڵام لەوێوە کە بەڵگەکانی ئەمان نەوەك پێویست باوەڕ پێهێنەرە و نە ئەگەریان هەیە، (٢٠) لەوانە نیە بگووترێت کە بەو هۆیە ژمارەکان بوونیان هەیە، بەڵام((پیتاگۆریەکان)) بە تێبینی کردنی ئەوەی کە زۆرێك لە دەرکەوتەی ژمارەکان لە تەنە هەست پێکراوەکاندا بوونیان هەیە، بوونەوەرەکانیان لە ژمارەکانەوە ئەزانی، بەڵام گریمانەکەیان ئەوە نەبوو کە ژمارەکان جیان، بەڵکو لەسەر ئەو گوومانە بوون کە خواستگەی بونەوەرەکان ژمارەکانن، بەلاو بۆچی؟ چونکە دەرکەوتەی ژمارەکان لە تێکهەڵکێشی هارمۆنی ولە ئاسمانەکاندا و(٢٥) لەزۆر شوێنی تردا بوونی هەیە.

بەڵام بۆ کەسانێك کە ئەڵێن تەنیا ژمارە بیرکاریەکان بوونیان هەیە، گووتەیەکی لەو شێوەیە بە پێی گریمانە بوونیادیەکان ئەگەری نیە، بەڵکو تەنیا گووتراوە کە زانستەکان ناتوانن پەیوەست بن بە هەست پێکراوەکانەوە، بەڵام ئێمە ئەڵێن کە پەیوەست ئەبن، بە شێوەیەك کە پێشتر ئەمەمان ڕوون کردەوە، هەربەم شێوەیە ڕوونە کە شتەکانی بیرکاری بە جیا بوونیان نیە، چونکە ئەگەر لە((جیا-کان)) بوونایە، دەرکەوتەکانیان لە تەنەکاندا

بوونیان نەدەبوو، بەڵام(( پیتاگۆریەکان)) لەم روانگەیەکەوە لەو ئەگەرەدا نین کە قسەیان بۆ دروست بکرێت، بەلأم لەم روانگەیەوە کە تەنە سروشتیەکان لە ژمارەکانەوە پێك دێن، واتە لەو شتانەی کە نەخاوەنی ستایل و نەخاوەنی قورساییِن، شتانێکی خاوەن سوکی و قورسی دروست ئەکەن، وادێتە بەرچاو کە لەبارەی ئاسمان (یان جیهان)ی تر و تەن گەلێکی ترەوە قسان ئەکەن، نەك لەبارەی تەنە هەست پێکراوەکانەوە (٣٥) بەلأم کەسانێك کە ژمارە جیا ئەکەنەوە، بەو هۆیەوە ( بوون و جیاواز بوونی ژمارە گریمانە ئەکەن) کە یاسا سەرەتاییەکانی ژمارە لەبارەی هەست پێکراوەکانەوە راست ناکەن،

١٠٩٠b

لەکاتێکدا کە گووتراوە (یاسەکانی)ی بیرکاری راستەقینە و شایەنی خۆشەویستی رۆحن، و لەبارەی گەورەییەکانی بیرکاریشەوە هەر بەم شێوەیەیە.

کەواتە روونە کە بەڵگەی دژی ئەم تیۆریە، لایەنە دژەکەی ئەو بەیان ئەکات، و کەسانێك کە قایل بەو تیۆرەن ئەبێت ئەو کەم و کوڕیانەش کە هەنووکە هاتنە ئاراوە، چارەسەر بکەن، واتە ئەوەی کە (ئەبێت ئەوە بسەلمێنن کە) بە چ هۆیەك-لەکاتێکدا کە ژمارەکان بەهیچ شێوەیەك لە هەست پێکراوەکاندا بوونیان نیە- دەرکەوتەکانیان ئەبێت (دەبێت ) لەهەست پێکراوەکاندا بوونیان هەبێت.

(٥) بەلأم هەن کەسانێك کە لەم ڕووەوە کە خاڵ کۆتایی و سنوری هێڵە، و هێڵیش بۆ ئاست و ئاستیش بۆ تەن (بەم شێوەیەیە)ن لەو باوەڕەدان کە بوونی سروشت گەلێکی لەو جۆرە پێویستە، ئێمە ئەبێت پێداچوونەوە لەسەر ئەم بەڵگەیەش بکەین و ببینین کە ئەوەك زۆر لاواز بن، چونکە یەکەم، کۆتاییەکان بە هیچ شێوەیەك ناوەرۆك نین، بەڵکو هەموویان(ئەوان) زیاتر((سنوورن))،(١٠)( وەك بەرێگادا چوون و بەشێوەیەکی گشتی جووڵە، خاوەنی سنوورێکە، و بەم شێوەیە بە پێی ئەو تیۆریە هەریەك لەمانە یەك((ئەم شت)) و جۆرێك ناوەرۆك ئەبێت، بەلأم ئەمە بێ ماناییە) دووەم، ئەگەریش ئەوانە ناوەرۆك بن، هەموو ئەوانە ناوەرۆك گەلێکی لەجۆری ((ئەم هەست پێکراوە لاوەکیان)) ئەبن، چونکە بەڵگاندن لەبارەی ئەمانەوە بەیان کرابوو، کەواتە بە چ هۆیەك ئەوانە بە جیا بوونیان دەبێت؟

هەربەم شێوەیە ئەگەر کەسێکی بەپەلە باوەڕشی پێ هێنرابێت، ئەتوانرێت لەروانگەی(١٥) ژمارەوە بەگشتی و هەروەها لەروانگەی شتانێکی بیرکارییەوە پشکنین و دۆزینەوە بکرێت کە ئەوان بە هیچ جۆرێك پەیوەندیەکیان پێکەوە نابێت، واتە ئەو پێشینە لەگەڵ پاشینە،چونکە ئەگەریش ژمارە بوونی نەبێت، بە بوونی ئەم گەورەییانە

بۆ کەسانێك کە رازین کە تەنیا شتە بیرکاریەکان بوونیان هەیە، بوونیان دەبێت، و ئەگەریش ئەم ((گەورەییانە)) بوونیان نەبێت، رۆح و تەنە هەست پێکراوەکان بوونیان دەبێت، لەسەر بنەمای دیاردە بینراوەکانەوە وانایەتە بەرچاو کە سروشت، وەك مەرگەساتێك(٢٠)ی ماندوو کەر، زنجیرەیەك لە رووداوە پەرتەوازەکان بێت، بەلأم کەسانێك کە باوەڕیان بە ئایدیەکان هەیە، لەم کێشەیەدا ماونەتەوە، چونکە ئەمان گەورەییەکان لە مادە وژمارەوە ئەهێننە بوون، واتە هێڵەکان لە ٢ و تارادەیەك ئاستەکان لە ٣ و تەنەکان لە ٤، یان لە ژمارەکانی ترەوە، چونکە هیچ جیاوازییەکی نیە، بەلأم ئەم گەورەییانە ئایدیەکان ئەبن؟ (٢٥) و(ئایا) شێوازی بوونایەتی ئەوان چیە، و چ کاریگەرییەکیان لەسەر کاییناتەکان هەیە؟ و هەربەم شێوەیە کە شتە بیرکاریەکان هیچ جۆرە کاریگەرییەکیان نیە، ئەمانیش هیچ جۆرە کاریگەریەکیان لەسەر کاییناتەکان نابێت؟ بەلأم هیچ یاسایەکی سەرەتایی بیرکاریش ئەوە پشت راست ناکاتەوە، مەگەر ئەوەی کە کەسێك بیەوێت بابەتەکانی بیرکاری بگۆڕێت و بڕوا تایبەتەکانی خۆی بهێنێتە ناوەوە، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا دژوار نیە کە گریمانەگەلێك؛(٣٠) باهەر جۆرێك بن، قبوڵ بکەن، و گەورەیان بکەن و لەوانەوە ئەنجام گەلێك ورێنە بکەن( یان بچنن).

هەنووکە ئەم کەسانە بە تەواوی هەڵە ئەکەن، کە لە هەوڵی ئەوەدان شتەکانی بیرکاری بە ئایدیەکانەوە بلکێنن، بەلأم کەسانێك کە بۆ یەکەجار دوو جۆر ژمارە ئەهێننە ناوەوە- واتە ژمارەیەك بۆ ئایدیەکان و دانەیەکی تری بیرکارییانە- بە هیچ شێوەیەك نە بەیانیان کردووە و نە ئەتوانن بڵێن کە ئەوە وەك نێوانێك لەنێوان ژمارەی ئایدیاڵی و ژمارەی هەست پێکراودا جێگیر ئەکەن، ئەگەر (ژمارەی بیرکاری) لە((گەورە))و((بچووك)) هاتبێتە بوون، وەك ئەو دانەیە، واتە هەمان ژمارە ئایدیاڵی ئەبێت،

١٠٩١a

(چونکە لە چ ((گەورە) و((بچووك))یەکی تر ئەتوانێت بێتە بوون؟ ئەو(ئەفلاتوون) گەورەییەکانی لە((گەورە)) و((بچووك)) ئەهێنایە بوون) بەلأم ئەگەر ئەو لە شتێکی تر قسان ئەکات، توخم گەلێکی جیاوازتر ئەهێنێتە ناوکایەکەوە، بەلأم ئەگەر بنەمای هەریەك لەو دوو جۆرە ژمارە یەك جۆری-١- بێت، ئەوکات یەك شتێکی هاوبەش ئەبێت لەنێوان هەردووکیاندا، و ئەبێت توێژینەوە لەسەر ئەوە بکەین کە ئەم شتانە (زۆر-ەکان) زۆرن، لەکاتێکدا کە، بە بڕوای ئەو هاوکات، ژمارە ناتوانێت بە شێوەیەکی تر(٥) بێتە بوون جگە لە-١- و یەك ((٢ی دیاری نەکراو)).

بەلاّم هەموو ئەم بەڵگانە ((نائەقلانین))، و هەم خۆیان لەگەڵ خۆیاندا و هەم لەگەڵ مەزەندەی مەنتیقیەکاندا، و وادێتە بەرچاو کە لەواندا ئێمە ڕووبەڕووی ئەفسانەی((سیمودیدێس))ین، چونکە ئەفسانەیەکی دوور و درێژ دێتە بوون، -وەك قسەی دوور و درێژی کۆیلەکان لەو ئەفسانەیەدا- کە مرۆڤ ناتوانێت قسەیەکی تەندروست بکات، (١٠) وادێتە بەرچاو کە تەنانەت خودی تۆخمەکانیش واتە ((گەورە)) و ((بچووك)) لەوەیدا کە بێنە ناو کایەکەو بخرێنە ڕوو هاواریان بەرز بوویەوە، چونکە ئەوان بە هیچ شێوەیەك ناتوانن ژمارەکان بهێننە بوون، مەگەر ئەوانەی کە بەیارمەتی ((دووهێندبوونی)) یەکەوە دێنە بوون.

بەلاّم هەربەم شێوەیە گریمانەی دروست بوون بۆ بوونەوەرە جاویدانەکان بێمانا و بگرە زیاتریشە، یەکێك لە مەحاڵێتیەکان، هەنووکە لەم بارەیەوە کە ئایا((پیتاگۆریەکان)) بۆ ئەوانە رازین بە دروست بوو یان نا، پێویستی بەگوومانێك نیە، چونکە ئەمان بە ئاشکرا ئەڵێن کە لەبەر ئەوەی((یەك))هاتە کایەکەوەو وەستا-چ لە ئاستەکانەوە،چ لە پەیکەرەکانەوە، یان لە تۆوەکانەوە، یان لە شتێکەوە کە خۆیان لەدەربرینی دا سەرگەردانن- ئەوکات بەپەلە لەتێکی((بێسنوور)) هاتە ناوەوە و بەیارمەتی((سنووردار))، سنووردار کرا، بەلاّم لەوێوە کە ئەمان دوونیایەکیان خستۆتە سەر پێ و ئەیانەوێت بە شێوەیەکی سروشتی قسە بکەن- و دادپەروەرانە ئەوەیە کە ئێمە لەبارەی تیۆریە سروشتیەکانیانەوە وردبینی بکەین- باشترە کە ئەوانە لەوەی کە قسەیان لەسەر بکەین وەلا بنێین، (٢٠) چونکە ئێمە لەبارەی بنەمای شتە نەجوولاوەکانەوە پشکنین ئەکەین، و لەبەر ئەمە ئەبێت لەبارەی دروست بوونی ئەم جۆرە ژمارانە توێژینەوە بکەین.

## "وەرزی چوارەم"

# ( بنەما یەکەمین و چاکەکان. )

هەنووکە ئەمان[1] ئەڵێن کە ژمارەی تاك ((دروست بوونی))نیە، و ئەمە بە ڕوونی دیارە کە بەو مانایەیە کە ژمارەی جووت خاوەنی دروست بوون ئەبێت، بەڵام هەندێك کەس ژمارەی جوت یەکەمجار بە دروست بوو لە ((نابەرامبەریەکان))(٢٥) واتە لە((گەورە))و ((بچووك))- لەکاتێکدا کە بەرامبەر بن- ئەزانن، کەواتە نابەرامبەرەکان پێش ئەوەی کە بەرامبەر بن وەك پێویستیەك پەیوەست ئەبن بەوانەوە، بەڵام ئەگەر هەمیشە بەرامبەر بوونایە، ئیدی پێش ئەوە نابەرامبەر نەدەبوون، (چونکە لە((هەمیشە)) شتێکی ((زیاد لەوە)) بوونی نیە.) لەبەر ئەمە ڕوونە کە لەبەر تێڕوانینی مەنتیقی نیە کە ئەمان دروست بوونی ژمارەکان ئەهێننە بوون.

بەڵام لەوێدا گومانێك-و بۆ کەسێك کە گومانەکە بە ئاسان ئەزانێت، تەنانەت سەرزەنشتێك(٣٠)- دێتە کایەوە، کە چۆن لە نێوان توخمەکان و بنەماکان لەگەڵ ((چاکەو جوانی))دا پەیوەندێك بوونی هەیە، گومانەکە ئەمەیە کە ئایا لە نێوان ئەو توخمانەدا شتێکی لەو جۆرە کە دەرخواستی ئێمەیە- کاتێك کە لە خودی چاکە(واتە چاکە لەخۆیدا) و((باشترین لەخۆیدا auto to agathon kai to ariston)) قسە ئەکەین- بوونی هەیە یان نا، بەڵکو هەردووك لەوانە یەکەمجار ئەبێت لەدوای(توخمەکان)ەوە دروست بووبن، وا دەرئەکەوێت کە ((توێژەرانێك)) کە لە بارەی

---

[1] واتە ئەفلاتوونیەکان و تارادەیەکیش هەندێك لە پیتاگۆرییەکان.

خوودکانـەوە تویژینـەوە ئەکـەن، و هەنـدیک لـە فەیلەسـووفە هەنوکەییـەکان لـە نکـۆڵی کردنـی ئـەم مەسـەلەیەدا هـاوڕان(٣٥)، بـەڵکو ئـەڵێن کـە هـەم((چاکە))و هـەم((جـوان)) یەکەمجار لەدوای ((بەرفراوان بوونی)) سروشتی بوونەوەرەکانەوە هاتوونەتە بوون،

١٠٩١b

بەڵام ئەم بەکار هێنانە بۆ خۆ پاراستن لەدژوارییەك ئەنجام ئەدەن، کە بۆ کەسانێك ڕوو ئەدات-وەك هەندێك- ئەڵێن کە((یەك)) یەك بنەمایە، بەڵام ئەم دژوارییە نەك لەو ڕووەوە دێتـە کایـەوە ((چاکە)) بە بنەمایەکی هەروەك سیفەتێکی خودی ئەخەنە پاڵ، بەڵکو لەو ڕووەوە (ئەخرێتە ڕوو) کە ئەمان وەك بنەمایەك سەیری یەك ئەکەن- ئەویش بنەمایەکی هەروەك توخم- و ژمارەش لە یەك ئەهێننە بوون، شاعیرەکانی کۆنیش لەو ڕوانگەیـەوە هـاوڕای ئـەو بڕوایـەن کـە ئـەڵێن(٥) نـە بوونـەوەرە سـەرەتاییەکانی، وەك ((نوکتا-شەو)) و ((ئورانوس-ئاسمان))،((خائوس)) یان ((ئوکێئانوس-خودای جۆری دەریا))، بەڵکو((زیۆس)) [1]فەرمانڕەوایی دوونیای ئەکرد، بەڵام ئەو شاعیرانە لەو ڕووەوە کە فـەرمانڕەوایانی ئـەم بوونەوەرانـە ئـەم جیهانـە ئـەگۆڕن وتێکـی ئـەدەن، گەیشتن بـە بڕوایـەکی لـەم شـێوەیە، پاشـان کەسـانێك لەمانـە (کـە تێکەیـشتنە شـاعیرانەی و ئەقڵانیـەکانیان) تێکـەڵ بەیـەکتر کـرد، و لـەبارەی هـەموو شـتەکانەوە ئەفسانەییانە نەئەدوان،(بۆ نموونە(١٠) فێرێکودێس)) و هەندێك کەسی تر ((بیووی یەکەمین))یان بە باشترین ئەزانی،((مۆغان)) و بلیمەتەکانی تریش هەربەم شێوەیە، وەك((ئێمپێدوکلیس)) و((ئاناکساگۆراس)) کە ئەویان((سۆز -ئیشق)) و ئەمیان((ئەقڵی))ی بە بنـەما ئـەزانی، بـەڵام لـەو کەسـانەی کـە قایـل بـە بوونی ناوەرۆکـە نەجووڵاوەکان بـوون، هەنـدێك ئـەڵێن کـە((یـەك لەخۆیـدا)) ((چـاکە لـە خۆیـدا))یـە، بـەڵام نـاوەرۆکی(١٥) ئەوانـەیان بەتایبـەتی بە((یەك)) ئەزانی.

کەواتە گوومانەکە ئەمەیە کە کام یەك لەم دوو قسەیە ئەبێت قبوڵ بکەین، چونکە سەیرە کە ئەگـەر بـە ((یەکەمین)) و((جاویدان)) و((خۆ پەسـەندترین autarkestatos)) پێش هەموو شتێك خودی ئەم سیفەتە، واتـە ((خۆپەسـەندی و هێمنایـەتی))، پەیوەسـت نەبێت بە((چاکە))یەکەوە ، چونکە بەدەر لەمەش بە هیچ هۆیەکی تر خۆپەسـەند و فەنا بـوو نیـە، مەگـەر بـەو هۆیـەوە کـە((چـاك))ە، بـەو شـێوەیەی کـە لەوانەیـە ڕاسـتە ئەگـەر بگووترێت (٢٠) کە ئەم بنەمایە بەم جۆرەیە، بەڵام ئەوەی کە بڵێین یەك، یان ئەگەر ئەو

[1] خودای خوداکان لای یۆنانیە کۆنەکان کە لای ڕۆمیەکان(ژووپیتەری مەزن)بوو.

نەبێت، توخمێك ئەم بنەمایەیە، ئەویش توخمێك لەژمارەکان- مەحاڵە، چونکە زۆرێك لە دژوارییەکانەوە لەوەوە ئەزموون ئەکرێن، کە هەندێك بە هۆی خۆپاریزی لەوانەوە نکۆڵی لەم بڕوایە ئەکەن، واتە ئەوکەسانەی کە رازین بەوەی کە یەك، بنەمای یەکەم و توخمە، بەڵام بۆ ژمارەی بیرکاری(٢٥)چونکە (بەپێی ئەو تیۆرە) ئەوکات هەموو یەکیەکان دەبوون بەهەمان جۆر لە ((چاکە))، و کەڵەکەیەکی زۆر لە((چاکە))کان پێك دەهات. هەربەم شێوەیە ئەگەر((ئایدیەکان)) ژمارە بن، ئەوکات هەموو ئایدیەکان، جۆرێك لە چاکە دەبوون، بەڵام(ئەگەر) کەسێك وادابنێت کە بۆ هەر شتێك کە ئەیەوێت((ئایدیەیەك)) بوونی هەیە، ئەگەر تەنیا ئایدیەیەك لە چاکەکانیش بوونیان هەبێت، ئەوکات ئایدیەکانی تریش ناوەرۆك نابن، بەڵام ئەگەر ئایدیەی ناوەرۆکەکانیش بوونیان هەبێت، ئەوکات هەموو گیانەوەرەکان و گیاکان، و هەموو شتەکانی تر لە ئایدیەی چاکەکاندا دەبوون.

بەم شێوەیە ئەنجامەکە دەبێتە ئەم هەموو بێ مانابیە، و هەروەها ئەم بێمانابیە کە توخمی دژ، چ زۆر بێت و چ ((نابەرامبەر))-واتە ((گەورە))و((بچووك))- ئەبێت بە ((خراپی لەخۆیدا to kakon auto))، بەم هۆیەوەیە کە یەك نەفەر خۆ لەوە ئەپارێزێت لەوەی کە ئەم ((چاکە))بلکێنێت بە((یەك))ەوە، چونکە ئەنجامە پێویستەکەی ئەوەیە کە، لەبەر ئەوەی دروست بوون لە دژەکاندا ڕوو ئەدات، ((خراپەی))سروشت زۆرێتیە، (٣٥)بەڵام ئەوانی تر ئەڵێن کە ((نابەرامبەر)) سروشتی مرۆڤە، کەواتە ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە هەموو بوونەوەرەکان لە خراپەدا پشکیان هەیە جگە لە یەك، ئەویش ((یەك لەخۆیدا)) و ژمارەکانیش لەودا بە شێوەیەکی((پەتی تر))پشکیان هەیە تا گەورەییەکان و هەروەها خراپە پانتایی چاکەیە،

١٠٩٢a

و ئەم چاکەیەش پشکە لە شتێك و لێ دروست کراوی ئەو شتەیە کە لەناوبەری ئەوە، چونکە دژ لەناوبەری دژە، و ئەگەر، بەو شێوەیەی کە گووتمان، مادە ئەو شتەیە کە هەر تاك شتێك لە ڕووی هێزەوە ئەوە،-بۆ نموونە مادەی ئاگر کردارێتیەکەیەتی، و ئاگر هێزەکیە،-(٥) ئەوکات خراپە خۆی چاکەییە بەڵام هێزەکییانە.

هەموو ئەمانە بەو هۆیەوە ئەبنە ئەنجام کە لە لایەکەوە ئەمان هەر بنەمایەك بە یەك توخم ئەزانن، و لەلایەکی ترەوە دژەکان ئەکەن بە بنەما و هەروەها بەو هۆیەوە کە یەك ناکەنە بنەما، و ژمارەکانیش هەم بەیەکەمین ناوەرۆکەکان و((جیا-کان)) و ئایدیەکان ئەگریمێنن.

## "وەرزی پێنجەم"

# ( ئایا دروست بوونی ژمارەکان بەهۆی ناوەرۆکەکانە ؟ )

کەواتە ئەگەریش جێگیر کردنی چاکە لەنێوان بنەماکان، و هەم جێگیر کردنی ئەوان بەم شێوەیە، مەحاڵە(۱۰) ڕوونە کە نە بنەماکان بە دروستی ئەخرێنە ڕوو، وە نە ناوەرۆك گەلێکی یەکەمین، بەلاّم گریمانەی ئەو کەسەیش دروست نیە کە بنەماکانی دوونیای((گشت)) لەگەڵ بنەماکانی گیانەوەران و گیاکان وەك یەك بزانێت، بەم هۆیەوە کە لە شتە نادیاری کراو و ناکامڵەکانەوە هەمیشە شتانێکی کامڵتر دێنە بوون، و لە چ ڕوویەکە ئەلێت کە لە بارەی یەکەمین بنەماکانیشەوە بارودۆخەکە هەر بەم شێوەیەیە، بە شێوەیەك کە لەو شێوەیەدا تەنانەت ((یەك لەخۆیدا))یش نابێتە(۱۵) یەك بوونەوەر، چونکە تەنانەت لەم جیهانەشدا ئەو بنەمایانەی کە گیانەوەرەکان و گیاکان لێیانەوە دروست بوون، کامڵن، چونکە مرۆڤە کە مرۆڤی ئەبێت، و ((تۆوی یەکەمین)) نیە، هەربەم شێوەیە بێمانایە کە((شوێن))یش هاوکات لە تەنە بیرکاریەکانەوە بهێننە بوون (چونکە شوێن تایبەتە بە هەر تاك شتێکەوە، و بەم هۆیەوە شتەکان بە پێی شوێن جیان، بەلاّم شتەکانی بیرکاری لە((شوێنێکدا)) نین)(۲۰) و بڵێن کە ئەوان لە((شوێنێکدان))، لەگەڵ ئەوەشدا نەڵێن کە((شوێن))ی ئەوانە چیە.

بەلاّم کەسانێکیش کە ئەڵێن بوونەوەرەکان پێکهاتوون لە توخمەکان و یەکەمین شتەکان لە نێوان بوونەوەرەکاندا ژمارەکانن، پێش هەمووان دەبێت دیاریان بکردایە کە چۆن شتێك لە شتێکی ترەوە دێتە بون، و پاشان بیانووتایە کە بە چ شێوەیەك ژمارە لە((بنەما))وە دێتە بوون، ئایا لە ڕێگای تێکەڵ کردنەوە؟ بەلاّم هەموو شتێك کە تێکەڵ

ناکریت، و هەروەها دروست بوو لە (تێکەڵ کردن)(٢٥) شتێکە کە جیاوازە لەگەڵ ئەو شتەدا کە تێکەڵ ئەکرێت، ئەوکات یەك نە جیا دەبوو وەنە سروشتێکی جیاو جیاواز دەبوو، بەڵام ئەمان ئەیانەوێت بەم شێوەیە بێت، بەڵام ئایا ئەم ئیشە ئەبێت لە ڕێگای تێکەڵ کردنەوە ئەنجام بدرێت، وەك حوونجەکان ((لەتە پیتەکان))؟ لەو شێوەیەدا توخمەکان بە ناچاری ئەبێت خاوەنی شکڵ بوونایە، و بیرکەرەوەش بە جیا بیری لە ((یەك)) و((زۆر)) ئەکردەوە،کەواتە ژمارەش بەم شێوەیە دەبوو، یەك ((و))(+) زۆر، یان یەك ((و))(+) نابەرامبەر.

و لەبەر ئەوەی((لە شتێکەوە بوون))(٣٠) لە لایەکەوە بەم مانایەیە کە شتێك لە شتێکەوە کە ((لەناودابووی)) ئەوە، هەیە و لەلایەکی ترەوە بەم مانایەش نیە،(لە شتێکەوە بوون)ی ژمارە بەکام یەك لەم دوومانایە دێت؟ چونکە ئەم مەسەلەیە کە شتێك لە شتێکەوە دێتە بوون کە ((لەناودابووی)) ئەوە، تەنیا لەبارەی شتانێکەوە بەدەست دێت کە خاوەنی دروست بوونە،

١٠٩٢b

یان ئایا(ژمارە) لەو جۆرانەیە کە بۆ نموونە شتێك لە((تۆو))ێکەوە دێتە بوون؟ ئایا مەحاڵە کە شتێك لە شتێکی دابەشنەبووەوەوە دروست بکرێت، یان ئەوەی کە(ژمارە) ئایا لە دژێکەوە کە پایەدار نیە دێتە بوون؟ بەڵام ئەو شتانەی کە بەم شێوەیە بوونیان هەیە، هەربەم شێوەیە لە شتێکی ترەوە دێنە بوون کە پایەدارە(٣٥) بەڵام لەوێوە کە یەك نەفەر یەك هەروەك دژی زۆر ئەمێنێتە ناو کایەکەوە، و ئەوی تر هەروەك دژی ((نابەرامبەر))- لەکاتێکدا کە یەك هەروەك((بەرامبەر)) ناوزەد ئەکات- کەواتە ژمارە بەو شێوەیەیە کە لە دژەکانەوە هاتبێتە بوون، لەبەر ئەمە شتێکی تر هەیە کە ژمارە لەو لەشتێکی جیاواز لەو( واتە دژی ئەو) بوونی هەیە یان هاتووەتە بوون، بەگشتی ،بە هیچ شێوەیەك چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە هەموو ئەو شتانەی کە لە دژەکانەوە دێنە بوون یان خاوەنی دژ گەلێکن،(٥) لەناو ئەچن- تەنانەت ئەگەریش تەواو لە دژەوە بێنە بوون- بەڵام ژمارە لەناو ناچێت؟ لەم بارەیەوە شتێکی وا نەگووتراوە، بە بوونی ئەم دژە، چ ((لەناودابووی)) شتێك بێت و چ ((لەناودابوو enuparkhonton)) نەبێت، ئەو شتە لەناو ئەبات؟ بەهەمان جۆر کە ((نەبەرد)) ((پێکەوە بەستراو)) لەناو ئەبات، بە بوونی ئەمە نابێت بەو شێوەیە بکات، چونکە ئەمە دژی ئەو نیە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە بە هیچ شێوەیەك ئەوە دیاری نەکراوە کە ژمارەکان بە چ شێوەیەك هۆکاری ناوەرۆکەکان و بوونایەتیەکانن، ئایا بە هەمان شێوەی سنوورەکان

(بۆنموونە خاڵەکان کە سنووری گەورەییەکانن(١٠) و هەربەو شێوەیە کە((پوروتوس)) وای دائەنا کە چ ژمارەیەك بۆ شتێك بێت، بۆنموونە ئەم ژمارەیە بۆ مرۆڤ و ئەم ژمارەیە بۆ ئەسپ، بەو شێوەیەی کە ئەو لە ووردە بەردەکان هاوشێوەی بوونەوەرەکانی بە زیندوویی رائەگرت، وەك کەسانێك کە ژمارەکانیان لە شێوەی سێ گۆشە و چوارگۆشە لێ ئەکرد) یان بەوهۆیەوە (ژمارەکان هۆکارەکانن.و.ف) کە هەماهەنگی مۆسیقی گوونجاویەکی لەگەڵ ژمارەکاندا هەیە(١٥) و مرۆڤ و شتەکانی تریش هەربەم شێوەیە؟ بەڵام دەرکەوتەکان- بۆ نموونە سپی ،شیرین و گەرم- چۆن ژمارەن، بەڵام ئەوەی کە ژمارەکان نە ناوەرۆکن و نە هۆکاری شتەکان، مەسەلەیەکی ڕوونە، چونکە گوونجاوی ناوەرۆك، بەڵام ژمارە مادەیە، بۆ نموونە مادە بەم شێوەیە ناوەرۆکی گۆشت ویان ئێسقانە،کە((سێ بەش ئاگر و دوو بەش خاك))بوونی هەیە، و ژمارە، هەرچی بێت، هەمیشە ژمارەی شتانێکە(٢٠)چ ئەم شتە ئاگرینە وچ خاك و چ ((یەك-گەلێك))، بەڵام ناوەرۆك واتە ئەوەی کە ئەم ڕێژە دیاری کراوە نیسبەت بەو ڕێژە دیاری کراوە بە پێی پێکەوە بوویی لە شتێکدا، بەڵام ئەمە ئیدی ژمارە نیە، بەڵکو((گوونجاوی))یەکە لە پێکەوە بوویی ژمارە، چ ئەمانە جەستەیی بن، و چ هەرجۆرێکی تر.

کەواتە ژمارە- نە ژمارە بە شێوەیەکی گشتی و نە ژمارەی یەکی- نە هۆکاری دروست کەر (یان بکەری) و نەمادە، و نە مانا و شێوەی(٢٥) شتەکانە، بەڵام هەر بەم شێوەیە ((لەبەر ئەو)) (واتە هۆکاری ئامانجی)یش نیە.

"وەرزی شەشەم"

## ( بەدواداچوونی رەخنە لە تیۆریەی ژمارە )

بەلاٚم هەربەم شێوەیە ئەتوانرێت ئەم گوومانە بهێنینە ئاراوە، کە چ چاکەیەك لە لایەن ژمارەکانەوە ئەبێت بە نسیبی ((شتەکان))، لەو ڕووەوە کە تێکەڵکردنی ئەوانە لەناو ژمارەدایە، چ لە ژمارەیەکی((خۆش گوونجاو eulogistos))چ لە ژمارەی تاك، چونکە شەربەتی هەنگووین بە هیچ شێوەیەك خاوێنرتر نیە ئەگەر بە نیسبەت((سێ سێ جار))[1] تێکەڵ بکرێت، بەڵکو(٣٠) زۆر سوودمەندتر ئەگەر بە هیچ نیسبەتێك تێکهەڵکێش نەکرێت بەلاٚم شلەکە ڕوون بێت، و لەجیاتی ئەوەی کە بە ڕێژەیەك تێکەڵ بکرێت بەلاٚم کەمێك لێل بێت، هەربەم شێوەیە پێکەوە بوون بە یارمەتی خستنە سەر یان زیادکردنی ژمارەکانەوە بەیان ئەکرێت، نەك بە یارمەتی خودی ژمارەکانەوە، بۆ نموونە ٢+٣ بەلاٚم نەك ٢×٣ ئەبێت بتوانێت بە یارمەتی ١ و بەرهەمی لێکدانی ٥×5×4 ئەندازەی بگیرێت، لەبەر ئەمە ((فاکتەر)) لەهەمواندا ئەبێت ،هەمان بێت، لەبەر ئەمە ژمارەی ئاگر ناتوانێت ٦×3×5×2 و هاوکات ئەو ژمارەیە ئاو ٢×٣ بێت.

١٠٩٢a

بەلاٚم ئەگەر هەموو شتەکان وپێویستیانە لە ژمارەکاندا بەشدارن، بێگومان ئەنجامەکە ئەوە ئەبێت کە زۆرێك لە شتەکان هەمانن، و هەمان ژمارەش هەم بەم شتەشەوە پەیوەستە و هەم بە شتێکی تریشەوە، کەواتە ئەیا ژمارە هۆکارە و بەم

---

[1] چونکە پیتاگۆرییەکان مەبەستیان لەم سێ بەش ئاوو سێ بەش هەنگوین))ە بووە.

هۆیەوە شتەکان بوونیان هەیە، یان ئەمە مەسەلەیەکی ڕوون نیە؟ بۆ نموونە ژمارەیەك بۆ جوولەی خۆرەتاو بوونی هەیە، و دیسانەوە ژمارەیەکیش بۆ جوڵەی مانگ(٥) و هەروەها بۆ ژیانی هەریەك لە گیانەوەرەکان، هەنووکە چ بەربەستێك ئەبێت کە هەندێك لە ژمارەکان چوارگۆشە بن و هەندێکیش خشتەك، هەندێك یەکسان بن و هەندێك دووهێند؟ هیچ شتێك بەربەستی ئەوە نابێت، بەڵکو پێویستە کە هەمووان لەم بازنەیەدا بسوڕێنەوە، ئەگەر هەموو شتەکان ئەبێت لە ژمارەدا پشکیان هەبێت، و هەروەها ئەبێت ئەگەری هەبێت (١٠) کە شتە جیاوازەکان لە ژێر هەمان ژمارەوە جێگیر بن، لەبەر ئەمە ئەگەر بۆ هەندێك لە شتەکان هەمان ژمارە ڕوو بدات، ئەوکات ئەوان پێکەوە هەمان ئەبوون، بۆ نموونە خۆر و مانگ هەمان دەبوون، بەڵام بۆ چی ئەوانە(واتە ژمارەکان) ئەبێت هۆکارەکان بن؟ حەوت ژمارەی دەنگدار هەن، چەنگ خاوەنی حەوت تاڵە، سورەییا حەوت ئەستێرەیە، گیانەوەرەکان (بەلایەنی کەمەوە،هەندێکیشیان نا)لە حەوت ساڵیدا ددانەکانیان ئەکەوێت،(١٥) و حەوت قارەمان هێرشیان کردە سەر شاری((سێبێس))هەنووکە ئایا ئەوەی کە ژمارە خاوەنی ئەم جۆرە سروشتەیە، هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەو حەوت قارەمانە بووبن یان سوورەیا خاوەنی حەوت ئەستێرە بێت؟ یان ئەمانە بەو هۆیەوە حەوت قارەمان بوو کە شاری((سێبێس)) حەوت دەروازەی هەبووە، یان بە هۆیەکی ترەوە؟((سورەییاش خاوەنی حەوت ئەستێرەیە) چونکە ئێمە ئەوان بەم شێوەیە ئەژمێرین و لە((ورچی گەورەدا)) دوانزە ئەستێرە ئەژمێرین، بەڵام ئەوانی تر لە هەر دووکیاندا ئەستێرەگەلێکی زۆرتر ئەژمێرن، و هەروەها(٢٠) ئەڵێن لەوێوە کە پیتەکانی{کسی گەورە} {پسی گەورە} {زێتای گەورە} هاوئاوازیەکی مۆسیقین، و ئەوەی کە سێ هاوئاوازی بوونیان هەیە،کەواتە ئەڵێن،پیتە بێدەنگەکان دووهێندەکانیش هەم "سێ"ن، بەڵام ئەوەی کە لەوانەیە کە لەمانەوە هەزاران بەدەست بێن، ئەمان بە هیچ شێوەیەك نیگەران ناکات،(چونکە لەوانەیە کە یەك نیشانە هەم بۆ p) و هەم بۆ((گامای گەورە)) بەدەست بێت) بەڵام ئەگەر بڵێن،(ئەمانە بەو هۆیە بوونیان هەیە) کە هەریەك لەم پیتانە دووبەرامبەری پیتەکانی ترن، و هیچ پیتێکی تر بەم شێوەیە نیە، و هۆکاری ئەویش هەم ئەمەیە کە بۆ ئەوانە سێ شوێن(لە دەمدا) بوونی هەیە، و لەهەریەك لەم شوێنانەدا پیتێك لەگەڵ (S، سیگما))یەکدا پەیوەست ئەبن، و ڕێك بەم هۆیەیە کە تەنیا سێ پیتی بێدەنگ بەدەست دێن، و نەك بەو هۆیەی کە(٢٥) کە سێ هاوئاوازی مۆسیقی بوونیان هەیە، چونکە هاوئاوازیە مۆسیقیەکان لە ڕاستیدا زیاتر لەمەن، بەڵام لێرەدا پیتێکی بێدەنگی دووهێند، ناتوانێت بوونی هەبێت.ئەم کەسانە

هەروەك((هۆمەرناسە كۆنەكان)) كەهاوشێوەییە كەمەكان ئەبینن، بەڵام هاوشێوەییە گەورەكان لەبەر چاوو ناگرن.

١٠٩٣b

هەندێك كەسیش هەم ئەڵێن كە ئەم جۆرە بوارانە زۆرن، بۆ نموونە ((نۆتە نێوانیەكان)) بەرامبەر بە ٨ و ٩ ن، و شیعری شۆرشگێری خاوەنی حەڤدە حوونەجەیە كە بەرامبەر بە كۆمەڵەی ئەم دوو نۆتەیە.(٣٠)لە برگەكەی لای راستدا خاوەنی نۆ و لەلای چەپەوە خاوەنی هەشت حونجەیە، و هەروەها ئەڵێن كە ماوەی نێوان پیتەكان لە a ئالفا تا((ئۆمێگا)) بەرامبەرە بە ماوەی ((لە ژێرترین)) تا ((لەسەر ترین) ئاواز لە شمشاڵدا، كە ژمارەی ئەم دانەیە یەكسانە لەگەڵ ژمارەی گشت سیستەمی بۆشایی دا،(١٥) بەڵام ئەم خاڵە ئەبێت لەبەر چاو بگرین كە كەسێك لەم جۆرە پێوانەیەدا بە هیچ شێوەیەك دووچاری گوومان نابێت، نە لە گووتنی ئەوانە ونە لە وەرگرتن و دۆزینەوەیان، لە بواری شتە جاویدانەكاندا، چونكە ئەوان لە پانتایی شتە لەناو چووەكانیشدا بەدەست دێن.

بەڵام لەبارەی سروشتە ستایش كراوەكەی ژمارەكان و دژەكانیان، و بە شێوەیەكی گشتی لەبارەی شتە بیركاریەكانەوە، بەو جۆرە كە هەندێك كەس قایلن پێی، و ئەوانە وەك هۆكارە سروشتیەكان جیگیر ئەكەن، وادێتە بەرچاو كە ئەگەر بەم شێوەیە لەبارەیانەوە توێژینەوە بكرێت(١٠) هەمووان لە ناو ئەچن و لەبەر چاو وون ئەبن، چونكە بە پێی هیچ یەك لەمانا دیاری كراوەكان بۆ بنەماكان، لەوانەوە هیچ كامیان((هۆكار))نین، بە بوونی ئەمە ئەمان بە شێوەیەك ڕوون ئەكەنەوە كە ((چاكە)) پەیوەست ئەبێت بە ژمارەكانەوە، و((تاك، راستەوخۆ، چوارگۆشە)) و توانای هەندێك لە ژمارەكان لە ریزەكانی خشتەی ((جوان))دا جێگیرن، چونكە وەرزەكانی ساڵیش هاومانای جۆرێك لە ژمارەكانن،(١٥) و هەروەها ئەو نموونانەی تر كە ئەمان لە بنەما گشتیەكانی بیركاری دا كۆی ئەكەنەوە، هەموویان هەربەم هێزەن، لەبەر ئەمە هەموویان لە رێكەوتەكانن، چونكە ((دەركەوت)انەن، بەڵام هەموو ئەو نموونانە، پەیوەندی یان پێكەوە هەیە، و تەنیا لە روانگەی گونجاویەوە یەكێكن، چونكە لە هەر گووتراوەیەك لە((بوونەوەر))هاوشێوەیی یان گونجاوییەك (analgon) بوونی هەیە، هەربەم شێوەیە كە((راست)) لە درێژی دایە، بە هەمان شێوە((هەموار)) لە پانتایی یان ئاستەوەیە، و لەوانەیە ((تاك)) لە ژمارەو((سپی)) لە ڕەنگدا بێت.

بەڵام هەربەم شێوەیە ژمارە ئایدیاڵیەکان (یان بوونەوەر لە ئایدیەکاندا) هۆکاری هەماهەنگی ئاهەنگەکان و شت گەلێکی لەم جۆرە نین، (چونکە تەنانەت ژمارە ئایدیاڵییە یەکسانیش بە پێی جۆر پێکەوە جیاوازن، چونکە ((یەك))ایەتیەکەی ئەوانیش بەم شێوەیەیە) لەبەر ئەمە بەلایەنی کەمەوە بەم هۆیەوە پێویستیەك بە گریمانەی ئایدیەکان نیە.

هەنووکە ئەمانەن ئەو ئەنجامانەی کە لەم تیۆرانەوە ئەگیرێن، و تەنانەت(٢٥) زیاتریش ئەتوانرێت کۆ بکرێنەوە،بەڵام خودی ئەم مەسەلەیە کە ئەمان لەبارەی دروست بوونی ژمارەکانەوە دووچاری گەلێك گرفتاری بون، و بە هیچ شێوەیەك نەیانتوانیوە بابەتەکان پێکەوە ببەستنەوە،گریمانەیەکی یەك لاکەرەوە نایەتە بەرچاو- وەك چۆن هەندێك ئەڵێن- شتە بیرکاریەکان نە جیا لە هەست پێکراوەکان بوونیان هەیە و نە ئەوەی کە ئەوان ((بنەما))(یان بنەما یەکەمیەکان tas arkhas)بن.